وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان بەڕێوەبەرایەتی
گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **ئانا کارنینا (رۆمان)**
- **نووسینی: لیۆن تۆلستۆی**
- **وەرگێڕانی لە فارسییەوە:** ئەمین گەردیگلانی
- **نەخشەسازی ناوەوە:** ڕێدار جەعفەر
- **بەرگ: هۆگر سدیق**
- **نرخ: هەردوو بەرگ (پازدە هەزار دینار)**
- **چاپی یەکەم** ٢٠١١
- **تیراژ:** دانە
- **چاپخانە:** چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٦٦٠)ی ساڵی (٢٠١١) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٦٦٧)**

**ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی**

**رۆشنبیری لەسەر ئەو ماڵپەڕە بخوێنەوە**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**www .Kurdchap.com**

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێرست

# یەك

پرێنسس ئیشچر باتسکایا لەسەر ئەو باوەڕە بوو زەماوەند بەر لە چلەی ڕۆژوو، کە نزیکەی پێنج حەوتووی مابوو، نابێ بەڕێوەبچێت، چونکە هەتا ئەو کاتە نەیاندەتوانی نیوەی جیازییەکەش ئامادەبکەن. لەلایەکی تریشەوە نەیدەتوانی هەق بە لەڤین نەدات و هەتا چلە چاوەڕوان رایگرێت. هەروەها پوورە پیر و کەلاکەکەی پرێنس ئیشچر باتسکی زۆر ناساخ بوو و لەوانەبوو بەم زووانە بمرێت و بە بۆنەی پرسە و تازیەبارییەوە زەماوەندەکە وەدوا بکەوێت. بەو هۆیە بڕیاریاندا، کە جیازییەکە بکەن بە دوو بەشەوە. جیازییەکی چکۆڵە و یەکی گەورە. بەو شێوەیە پرێنسس رەزایەتیدا، کە زەماوەندەکە بەر لە چلە بەڕێوەبچێت. هاتە سەر ئەوەی کە بەشە چکۆڵەی جیازییەکە سەرەتا ئامادەبکەن و بەشەکەی تریشی دواتر بنێرن بۆ گوند، زۆریش لە دەستی لەڤین دڵمەند بوو، چونکە بە هیچ جۆرێك نەیدەتوانی وەڵامێکی جیددی لێوەرگرێت، کە بۆ ئەو کارە رازییە یان نا. ئەو بڕیارەش بە تایبەت لەو لایەنەوە زۆرباش کەوتبوو، کە بووك و زاوا دوای زەماوەندەکە لەڕێوە بەرەو گوند وەڕێدەکەوتن و لەوێش هیچ پێویستییەکیان بەو جیازییە نەبوو، کە دایاننابوو بۆ دوایی.

لەڤین هەروا لەنێو خەیاڵ و خولیا شیرینەکانی خۆیدا بوو، ئەوەندە شادبوو وەیدەزانی هەموو عالەم چاویان تێبڕیوە و ئامانجی گەورە و گرانیان دابینکردنی هۆکاری بەختەوەرییەکانی ئەوە و پێویست ناکات خەم بۆ شتێك بخوات یان بیر لە شتێك بکاتەوە، دەوروبەرییەکان هەموو کارەکانیان بۆ راستەوپاستە دەکرد و قۆڵیان لێهەڵماڵیبوو. تەنانەت هیچ گەڵاڵە و ئامانجێکی بۆ ژیانی داهاتووی لەبەر چاو نەگرتبوو و بڕیاری ئەوەشی دابووە دەستی کەسوکارەکانی، چونکە دەیزانی کە هەموو کارەکانی بە جوانترین شێوە بۆ جێبەجێدەکەن. سرگی ئیڤانڤیچ و ستیپان ئارکادیچ و پرێنسی گەورە رێنوێنییان دەکرد، کە چ بکات و هەرچی ئەوان پێشنیاریان پێدەکرد بێ سێ و دوو بەقسەی دەکردن. براکەی وامی بۆ وەرگرت، پرێنسی گەورە داوای لێکرد کە دوای زەماوەندەکە لە مۆسکۆ نەمێنێ و بڕواتەوە بۆ گوندەکەیان، ستیپان ئارکادیچیش پێشنیاری پێکردبوو بچێت بۆ دەرەوەی وڵات و ئەو قسەی

هەموویانی بەدڵ بوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت «لێگەرێ هەرکارێکی پێیان خۆشە با بیکەن. من بەختەوەرم و ئەوان هەرکارێك بکەن ناتوانن بەختەوەرییەکەم زیاد و کەم بکەن.» کاتێ پێشنیارەکەی ستیپان ئارکادیچی بە کیتی گوت کە گوتبووی بچن بۆ هەندەران، سەری سوورِما کە دیتی کیتی رازی نییە و چاوەڕوانییەکی دیاریکراوی لە ژیانی داهاتوویان هەبوو. ئەو دەیزانی لەڤین لە دێ کاروباری هەیە و زۆریش دڵگەرمە لەسەری. کیتی، ئەو جۆرەی کە لەڤین دەیدی، نەك هەر لەو کارانەی ئەو، یانی وەرزێری سەری دەرنەدەچوو، بەڵکوو حەزیشی نەدەکرد سەری لێیدەرچێت. بەڵام ئەوە نەدەبووە هۆی ئەوەی ئەو ئیشانە بە گرینگ نەزانێت و دەشیزانی کە ماڵەکەی لە لادێیە و دڵی پێوە نەبوو بچێت بۆ هەندەران، چونکە لەوێ تاقەتی نەدەهێنا و حەزی دەکرد هەتا زووە بچێت بۆ جێگایەك کە ماڵی هەمیشەییی خۆی دەبێت. ئەو حەزە ئاشکرا و روونەی کیتی لەڤینی تووشی واقوڕمان کرد. بەڵام چونکە هیچ لایەکیان بۆ ئەو جیاواز نەبوو لەڕێوە داوای لە ستیپان ئارکادیچ کرد بچێت بۆ گوندەکەیان و بەو سەلیقە کەم وێنەیەی خۆی کاروبارەکان ئەو جۆرەی پێویستە راستەوپاستە بکات. وەك ئەوەی ئەو کارە بە ئەرکی سەرشانی ئەو بزانێت.

ستیپان ئارکادیچ چوو بۆ گوند و هەموو کاروبارەکانی بەڕێوەبرد و بۆ هاتنی ئەو بووك و زاوا گەنجە هەموو پێویستییەکانی ئامادەکرد. کاتی گەڕانەوە بە لەڤینی گوت: گوێبگرە بزانە دەڵێم چی، تۆ بەڵگەیەکت هەیە کە نیشاندەری ئەوە بێ بۆ ددانپێدانان چوویەتە کەنیسە؟

ـ نا، بۆچی؟

ـ چونکە بەبێ ئەو بەڵگەنامەیە زەماوەند مەحاڵە.

لەڤین بە سەرسووڕمانەوە گوتی: هەی هوو... من وادیارە هەشت نۆ ساڵە هەر پێم نەناوەتە کلیساوە. هەر بیریشم لێنەکردۆتەوە.

ستیپان ئارکادیچ بە پێکەنینەوە گوتی: هەی ئافەریم هەی! جا بە منیش دەڵێی نیهیلیزم. بەڵام چ بکەین، چارەیەکمان نییە، دەبێ بچیتە کەنیسە بۆ ددان پێدانان، بۆ ئەو کارەش دەبێ ماوەیەك ئەرکی ئایینی بەجێ بێنی و لە رێوڕەسمی نوێژدا بەشداری بکەیت.

ـ بەڵام کەنگێ؟ تەنیا چوار رۆژمان دەرفەت ماوە.

ستیپان ئارکادیچ ئەو کارەشی جێبەجێ کرد و لەڤین دەستیکرد بە بەڕێوەبردنی ئەرکی ئایینی. بۆ لەڤین چوونە کلێسە و بەشداریکردن لە رێوڕەسمی ئایینیدا زۆر دژوار بوو، ئەگەرچی رێزی بۆ دین و بیروباوەڕی هەموو کەس دادەنا، بەڵام خۆی ئیمانێکی دروست و حیسابیی

نەبوو. ئێستا بە دڵنەرمییەوە کە ئەوی سەبارەت بە هەموو شتێك هەستیار کردبوو، ئەم ناچاری و خۆڕانانە نەك زۆر دژوار بوو بۆی، بەڵکوو بە شتێکی مەحاڵیشی دەزانی. لە هەڕەتی گەشانەوە و شکۆی ژیانیدا ناچاربوو یان درۆبکات یان کفر. دەیدی کە نە دەتوانێ ئەمەیان بکات نە ئەوی تر. هەرچەندی پرسیاری لە ستیپان ئارکادیچ دەکرد کە ئایا ناتوانێ بەبێ بەشداریکردن لەو ڕێوڕەسمانەدا بەڵگەنامەکە بە دەست بێنێت، ستیڤا دەیگوت مەحاڵە.

ـ باشە خۆ هیچت لێنایە. تەنیا دوو ڕۆژ دەخایێنێ. قەشەش پیاوێکی مێهرەبان و تێگەیشتووە. وات ئەو ددانە بۆ دەکێشێ بەخۆت نازانی.

لەڤین لە یەکەم ڕێوڕەسمی نوێژدا لە کلێسە شۆر و حاڵێکی لە دڵی خۆیدا دییەوە کە لە تەمەنی شازدە حەڤدە ساڵاندا ڕۆح و گیانی داگرتبوو. بەڵام لەڕێوە بەو ئاکامە گەیشت کە شتێکی وا بۆ ئەو مەحاڵە. هەوڵیدا تەواوی ئەو ڕێوڕەسمانەش وەك هاتوچۆ و میوانداریی‌یەکانیان بە شتێکی پووچ و بێ مانا و ناچاری بهێنێتە ئەژمار، بەڵام بۆی دەرکەوت کە ئەم کارە لەگەڵ ڕۆح و هەستی ئەو یەکناگرێتەوە. لەڤین وەك زۆربەی هاوچەرخانی پێوەندییەکی زۆر لێڵی لەگەڵ ئایین هەبوو. نەیدەتوانی ئیمانی هەبێت و لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕی قایمی نەبوو، لەوەش دڵنیا نەبوو کە قسەی قەشەکان هەموو وڕێنە بێت. بەو هۆیەی کە نەیدەتوانی ئەوەی دەیکات بە ڕاستی بە گرینگی بزانێت و لە لایەکی تریشەوە نەیدەتوانی ئەوانە بە تەشریفاتێکی پڕوپووچ بزانێت و کەمتەرخەمانە چاوی لێبکات، لە تەواوی ماوەی نوێژەکەیدا دەتگوت لەسەر ئاورە و هەستی بە شەرمەزاری دەکرد کە کارێك دەکات خۆشی تێیناگات و دڵی خەبەری پێدابوو کە شتێکی نەشیاو و درۆیینە.

کاتی ڕێوڕەسمی نوێژەکە هێندێ جار گوێی بۆ دۆعاکە ڕادەگرت و هەوڵیدەدا مانایەکیان لێهەڵکرێنێ کە زۆر لە بیروباوەڕەکانی دوورنەبێت و هێندێ جار دەیدی کە واتای ئەوانە لەگەڵ بیروباوەڕی سازگار نییە و دەبێ ئەوانە ڕەت بکاتەوە، هەوڵیشی دەدا گوێی نەداتێ و خۆی بە بیرەوەری و خولیا و ڕوانگەکانی خۆیەوە خەریك بکات و ئەم خولیا و بیرەوەری و ڕوانگانە، جگە لەوەی ئەوی لە کلێسە بێکار ڕاگرتبوو، بە ڕوونییەکی نائاساییەوە لە بیرگەیدا هەڵدەقوڵان.

هەتا کۆتاییی ڕێوڕەسمی عیشای ڕەببانی و نوێژی عەسر و شێوان لە کلیسا مایەوە و ڕۆژی دوایی بەیانی زووتر لە کاتی ئاسایی هەستا و بێ ئەوەی ناشتایی بخوات، سەعات هەشت چوو بۆ کلێسە تاکوو نوێژی بەیانی بەجێ بێنێت و لەلای قەشە ددان بە تاوانەکانیدا بنێ.

کلێسە جگە لە سەربازێکی دەرۆزەکەر و دوو پیرێژەن و مجێورەکان هیچ کەسی تری لێنەبوو.

مجێوری لاو کە هەردوو لاتەراقی لە ژێر عەبا تەنکەکەیەوە بەجوانی دیاربوو هات بەرەوپیری و بەپەلە رۆیشت بۆ پشت مێزی پاڵ دیوارەکە و دەستیکرد بە دۆعا خوێندن. هەر لەو کاتەدا کە مجێورەکە دۆعای دەخوێند و بەتایبەت ئەم رستەیەی «خودایە روحمان پێبکەی» هێندە بەردەوام و خێرا خێرا دووپات دەکردەوە کە دەبوو بە «خو رومانکەی.» لەڤین هەستی دەکرد دەرگای زەینی داخراو و لاکومۆر کراوە و لێدانی لە پەستا و پاڵپێوەنانی بێهودەیە و ئاکامێکی جگە لە شێواوی و خۆ خەڵەتاندن نابێت. بەو هۆیە لە پشت سەری مجێورەکە راوەستابوو و بێ ئەوەی گوێ بۆ دۆعای رابگرێت یان سەرنجی ماناکەی بدات، سەرقاڵی فیکر و خەیاڵەکانی خۆی بوو. دوێنێی وەبیرهاتەوە کە لەگەڵ کیتی لە پشت مێزی قوژبنی هۆدەکە دانیشتبوون و لە دڵی خۆیدا دەیگوت «دەستی چەندە بە روونی دەدوێ.» دەکرێ بڵێین وەك هەمیشە لە کات و ساتێکی ئەوتۆدا کە قسەیەکیان نەبوو بیکەن، کیتی دەستی لەسەر مێزەکە دادەنا و پەنجەکانی دەقووچاند و لێکی دەکردنەوە و خۆشی پێکەنینی بەو کارەی خۆی دەهات. لەڤین وەبیری هاتەوە کە ئەو دەستانەی ماچکردووە و بە وردی سەرنجی شوێن و هێڵەکانی لەپی دەستی دابوو کە یەکیان دەگرتەوە. دیسان کەوتەوە بیری «خورومانکەی» و خاچی خۆی کێشا و چاوی لە جوولانی نەرمی پشتی خایەمەکە کرد کە بە نەرمی دادەهاتەوە و کڕنۆشی دەبرد و خۆشی بە دوای ئەودا پشتی کۆم دەکردەوە. «پاشان ئەو (کیتی) دەستی گرتم و چاوی لە جوولانی هێڵەکانی لەپی دەستم کرد و گوتی: چەندە دەستێکی جوانت هەیە!» وەخۆ هاتەوە و چاوی لە دەستی خۆی و دەستی خرپنەی مجێورەکە کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی «بەڵێ، ئێستا ئیتر تەواودەبێت.» کە گوێی بۆ دۆعاکە شل کرد دیسان بەخۆی گوت «نا، وادیارە سەر لەنوێ دەستی پێکردەوە، نا، خەریکە تەواودەبێت. وا خۆی کووڕ کردۆتەوە خەریکە لووتی بگاتە عەرزی. هەمیشە کاتی تەواوبون بەو شێوەیە کڕنۆشی دەبرد.

مجێورەکە گەلایەکی سێ رۆبڵیی بە نهێنی وەرگرت و بە لەز لەنێو سەرقۆڵە مەخمەرەکەیدا شاردییەوە و گوتی ئەوەی پێویست بێ دەینووسێت، پاشان بە جزمەی تازەوە بەسەر سەنگفەرشی پڕ لە تەتەڵەی تەرکی چۆڵی کلێسەدا گورج و گۆڵ هەنگاوی هەڵێنا و بە تەپوکوت رۆیشت بۆ پشت مێحرابەکە. دوای خولەکێك سەری کێشا دەرێ و بە ئاماژە بانگی لەڤینی کرد و بیرۆکەیەك کە هەتا ئەو کاتە لە زەینی لەڤیندا قەتیس مابوو، سەری هەڵدا و دەیویست کەلاوڕێژ بکات بەڵام لەڤین بە پەلە لە مێشکی خۆی

کردییە دەریّ و لەبەر خۆیەوە گوتی: «هەرچۆنێك بێت جۆر دەبێت.» بەرەو پلیکانی شوێن کۆمبێژان هەنگاوی نا، بە پێپلیکانەکاندا وەسەر کەوت و بۆ لای ڕاست بایدایەوە و چاوی بە قەشە کەوت. قەشەی پیر کە پیاوێکی ریش تەنکی ماشوبرنجی بوو بە چاوانی ماندوو و مێهرەبانەوە لە پشت رەحلەکە راوەستابوو و لاپەڕەی کتێبی دۆعای هەڵدەدایەوە. کە چاوی بە لەڤین کەوت سەری بە ئاستەم دانەواند و لەڕێوە دەستیکرد بە دۆعا کردن و بە ئاوازێکی ئاسایی دەنگی بەرزکردەوە. کاتێك دۆعاکەی تەواوبوو کڕنۆشێکی برد کە خەریکبوو لووتی لە عەرزی بکەوێت و پاشان سەری بۆ لای لەڤین سووڕاند و ئاماژەی بە مەسیحی لەخاچدراو کرد و گوتی:

ـ مەسیح ئەگەرچی نادیارە بەڵام لێرە هەنتەشی هەیە و گوێی لە ددانپێدانانی ئێوە دەبێت و دۆعاکەتان قەبووڵ دەکات. ئایا بڕوات بە یاساکانی کلیسای پیرۆز هەیە؟ ـ کە ئەوەی گوت و چاوی لەسەر لەڤین هەڵگرت، دەستی لە ژێر ئەو تەنزیلە پانەدا لەسەریەك دانا کە لە پشت ملییەوە بە هەردوو لادا هاتبووە خوارێ وسینگی داپۆشیبوو.

لەڤین بە دەنگێك کە زایەڵەی زۆر لە گوێی خۆیدا ناخۆش هات گوتی: من شك و گومانم هەیە و ئێستاش دڕدۆنگی سەبارەت بە هەموو شێتك بیر و دەروونی داگرتووم ـ ئەوەی گوت و بێدەنگ بوو.

قەشە تاوێك مات بوو تاکوو بزانێ دیسان قسە دەکات، پاشان چاوی قووچاند و بە راوێژی تایبەت بەخۆی و توند و تووڕە وەك خەڵکی ولادێمیر گوتی: شك و دڕدۆنگی بە هۆی لاوازیی خووخدەی مرۆڤەوەیە، بەڵام ئێمە دەبێ دۆعا بکەین تاکوو خودا بە رەحمەتی بێپایانی خۆی ئەو تواناییەمان پێعەتا بکات ـ بێ ئەوەی چرکەیەك دەمی راوەستێ، وەك ئەوەی هەوڵ بدات کە ساتێك لەو وەختە بەفیڕۆ نەچێت لە درێژەی قسەکانیدا پرسیی: تووشی چ تاوانێکی گرینگ بوویت؟

ـ تاوانی گەورەی من دڕدۆنگییە. بۆ هەموو شتێك تووشی گومان دەبم و زیاتر کاتم لە شك و دوودڵێدا تێپەڕ دەکەم.

قەشە وشەکانی پێشووی خۆی دووپاتکردەوە: شك و دڕدۆنگی بە هۆی لاوازیی خووخدەی مرۆڤەوەیە. زیاتر لە چیدا تووشی شك و گومان دەبیت؟

ـ لە هەموو شتێکدا ـ بێ ئیختیار گوتیشی: هێندێ جار تەنانەت شکم لە بوونی خوداش دەبێت ـ بە درکاندنی ئەو قسە زل و رەقە ترسی لێنیشت. بەڵام وەك ئەوە دەچوو قسەکەی زۆری قەشە نەڕەنجاندبێت.

قەشە خێرا و بە بزەیەکی کەمڕەنگەوە گوتی: بەڵام دەبێ چ گومانێکت لە بوونی خودا هەبێ.

لەڤین بێدەنگ بوو.

قەشە بەو دەمتەڕییە ئاساییەی خۆیەوە درێژەی پێدا: کاتێك چاوت بەو مەخلووقاتە دەکەوێت چۆن دەتوانی شکت لە بوونی خالق هەبێت؟ کێ ئەو ئاسمانە بەرینەی بەو هەموو ئەستێرە جوانەوە خولقاندووە؟ کێ زەویی بەو هەموو جوانیانەی رازاندۆتەوە؟ ـ چاوێکی پرپرسیاری لە لەڤین کرد و دیسان پرسیی: ئەوانە بەبێ بوونی خولقێنەر چۆن دەگونجێ؟ لەڤین هەستی دەکرد کە چوونە نێو باسی فەلسەفییەوە لەگەڵ قەشە شیاو نییە و تەنیا بۆ ئەوەی وەڵامێکی دابێتەوە گوتی: نازانم.

قەشە بە سەرسووڕمانێکی کەیفسازانەوە گوتی: نازانی؟ کەوایە چۆن دەتوانی گومانت هەبێت کە خودا عالەمی خولقاندووە؟

لەڤین گوتی: تێناگەم ـ سوورهەڵگەڕا و چونکە هەستی دەکرد کە قسەکەی گەوجانەیە و بۆ ئەو بارودۆخەی ئەویش نەدەبوو گەوجانە بێت.

ـ لە دەرگانەی خودا بپاڕێوە و داوای لێبکە نیازت بەجێ بێنێ. تەنانەت باوکانی کلیسەش گومانیان بووە و بە پاڕانەوە و لالانەوە داوایان لە خودا کردووە کە دڵنیاییان پێببەخشێ. وەسوەسەی شەیتان زۆر بەهێزە و ئێمە نابێ خۆمانی بە دەستەوە بدەین ـ جارێکی تر بەپەلە دووپاتی کردەوە: بپاڕێوە و داوای بڕوا و دڵنیایی لە خودا بکە.

قەشە وەك ئەوەی لە گۆمی فیکر و خەیاڵ رۆچووبێت ماوەیەك بێدەنگ بوو.

پاشان بە بزەیەکەوە گوتیشی: بیستوومە دەتهەوێ لەگەڵ کچی پرێنس ئیشچر باتسکی زەماوەند بکەی، کە کچێکی پاکە و یەکێکە لە ئیماندارانی ناوچەی کلیسایی من و زۆر زۆر کچی چاکە.

لەڤین بەو قسەیەی قەشە سوورهەڵگەڕا و وەڵامی دایەوە: بەڵێ ـ لە دڵی خۆشیدا گوتی «بۆ لە کاتی بیستنی ددانپێدانانندا ئەو پرسیارە دەکات؟»

قەشە وەك ئەوەی وەڵامی فیکرەکەی ئەوی دابێتەوە، گوتی: تۆ دەتهەوێ ژن بێنی و خودا عەولادت پێببەخشێ و بەرەت لێبکەوێتەوە. وانییە؟ ـ بە لۆمەوە بەڵام زۆر بە نەرمی گوتیشی: ئێستا ئەگەر نەتوانن لە ئاخافتندا بە سەر وەسوەسەی شەیتاندا زاڵ بن کە بەرەو رێگای کفر و بێدینی راتاندەکێشێ، چۆن جگەرگۆشەکانتان پەروەردە دەکەن؟ ئەگەر ئێوە منداڵی خۆتان خۆشدەوێ تەنیا سامان و شانازی و زەرقوبەرقیان بۆ بە ئاوات ناخوازن، بەڵکوو ئارەزووتان ئەوەیە کە دڵ و گیانی بە نووری حەقیقەت روون بێتەوە و رزگار بێت. وانییە؟ کاتێك زارۆکە دڵپاکەتان لێتان دەپرسێ کە باوکەگیان ئەو شتانەی کە لەو دنیایەدا شەیدایان کردووم وەك خاك و ئاو و خۆر و گوڵ و سەوزەڵانی کێ خولقاندوونی، چ وەڵامێکی

دەدەیتەوە؟ دەڵێی نازانم؟ خۆت دەبینی خودای مەزن بە دلۆڤانیی بێپایانی خۆی ئەوانەی بۆ ئێوە روونکردۆتەوە و ئێوە ناتوانن خۆی لێببوێرن و نەیبینن. یان منداڵەکەتان لێتان دەپرسێ دوای مردن چیم بەسەر دێ، ئەگەر نەزانن چۆنیان وەڵام دەدەنەوە؟ یانی ئەو دەدەنەدەست فێڵ و تەڵەکەکانی دنیا و پیلان و دەهۆی شەیتان؟ ئەوە کارێکی باش نییە ـ ئەمەی گوت و ئیتر زمانی نەگەڕا و سەری بۆ لایەك خوار کردەوە و بە چاوی مێهرەبان و چاکەخوازی خۆی لە لەڤین راما.

ئەمجارە لەڤین وەڵامی نەدایەوە: نەك لەبەرئەوەی نەیهەوێ لەگەڵ قەشە سەری باسەکە بکاتەوە، بەڵکوو بەو هۆیەی کە هیچ کەس هەتا ئەو رۆژە پرسیاری ئاوای لێنەکردبوو و بەو هۆیەش کە بە خۆی دەگوت هەتا ئەو کاتەی منداڵەکانم پرسیاری ئاوام لێدەکەن دەرفەت زۆرە و هەتا ئەو کاتە بیری لێدەکاتەوە کە چۆنیان وەڵام بداتەوە.

قەشە درێژەی بە قسەکانیدا: ئێوە پێ دەنێنە قۆناخێکی ژیانەوە کە دەبێ رێگای خۆتان هەڵبژێرن و بۆ بڕینی ئەو رێگایەش دەبێ خۆڕاگر و بەبڕشت بن ـ بەو ئاکامەش گەیشت: داوا لە خودا بکە بە رەحمەتی بێپایانی خۆی یارمەتیت بدات و لە تاوانەکانت خۆش بێ ـ بەو قسانە باری تاوانی لەسەر شانی لابرد: بەشکوو گەورەمان و خودامان، عیسای مەسیح بە رەحمەتی بێپایان و ئەشقی بێسنووری خۆی لە ئێمە بەندەکانی و لە تۆ و منداڵەکانت خۆش بێت... ـ لە کۆتاییدا تەبەڕوکی پێدا و مەرەخەسی کرد.

لەڤین ئەو رۆژە کە هاتەوە بۆ ماڵێ زۆر شاد و بەکەیف بوو چونکە لەو تەنگانەیە رزگاری بووبوو، ئەویش بە جۆرێك کە ناچار نەبووبوو درۆبکات. جگە لەوەش ئەو مانایە بە شێوەیەکی تەمومژاوی لە دالغەیدا مابۆوە و وتەکانی ئەو پیاوە پیرە چاکەخواز و مێهرەبانە بە پێچەوانەی بووچوونەکانی پێشووی هیچی وڕێنە نەبوون. وتەکانی قەشە شتێکی تێدابوو کە ئەو دەبوو بیری لێبکاتەوە و نهێنی و رازەکانی بۆخۆی روون بکاتەوە.

بەخۆی دەگوت «هەڵبەت ئێستا نا، کات زۆرە.» ئەو ئێستا زیاتر لە رابردوو هەستی دەکرد کە شتێکی نادیار و ناپاك هەیە و لە بواری ئایینیشدا هەروایە، بە روونی ئەوانەی دەدی بە خەڵکەوە و حەزی پێنەدەکرد و لەبەرئەوە سێڤیاژێسکیی هاوڕێی سەرکۆنە دەکرد.

ئەو شەوەی لەگەڵ دەزگیرانەکەی و لەلای دالی تێپەڕ کرد و دڵخۆش بوو، لەگەڵ باسکردنی شادییەکەی خۆی بۆ ستیپان ئارکادیچ گوتی شادییەکەی وەکوو شادیی سەگێکی دەستەمۆ وایە کە فێریان کردبێت بە نێو میلەیەکی بازنەییدا باز بدات و بۆی دەرکەوتبێ دوای ئەو

کارەی کە چاوەڕوانن ئەنجامی بدات لە خۆشیانا بلووریێنێ و کلکەسووتێ بکات و دەستبکات بە هەڵبەزدابەز بەسەر مێز و کورسیەکاندا و لە پەنجێرەوە باز بدات.

## دوو

ڕۆژی زەماوەند، لەڤین، بەپێی داب (کە پرێنسسی گەورە و داریا ئەلکساندرۆڤنا زۆر پێداگر بوون لەسەری) چاوی بە دەزگیرانەکەی نەکەوت و نانی نیوەڕۆی لەگەڵ سێ پیاوی رەبەن خوارد کە هاتبوون بۆ دیدەنیی. ئەو سێ کەسە بریتی بوون لە سرگی ئیڤانڤیچ و کاتاڤۆسۆڤ[1] کە لە هاوڕێیانی دەورانی زانکۆی بوو و ئێستا مامۆستای زانستی سروشتی بوو. لەڤین لە شەقام تووشی بووبوو و بە زۆر لەگەڵ خۆیدا هێنابووی بۆ هۆتێل، چیریکۆڤیش[2] کە برازاوا بوو لە مۆسکۆ قازی بوو و پێکەوە دەچوون بۆ راوی ورچ. زۆر بە شادی و کەیفخۆشی نانی نیوەڕۆیان خوارد. سرگی ئیڤانڤیچ زۆر کەیفخۆش بوو. تیتاڵی بە قسە نائاساییەکانی کاتاڤۆسۆڤ دەکرد و پێیڕادەبوارد. کاتاڤۆسۆڤیش کە دەیدی قسەکانی گوێگریان هەیە و سەرنجی دەدرێتێ بە شێوەیەکی خۆمانە هەڵسوکەوتی دەکرد. چیریکۆڤ بە دڵپاکی و نەشەوە لایەنگریی لە هەمووان دەکرد.

کاتاڤۆسۆڤ بە شێوەیەکی مامۆستایانە کە لە زانکۆ خووی پێگرتبوو کاتێ قسەی دەکرد وشەکانی درێژ دەکردەوە، گوتی: بەڵام کۆنستانتینی هاوڕێمان زۆر لاوێکی هێژا و بێوێنەیە. هەڵبەت من باسی پێشووی دەکەم چونکە لە دەستمان چوو. ئەو کاتە هۆگری زانست بوو و کاتێك بڕوانامەی زانکۆی وەرگرت خووخدەیەکی مرۆڤانەی هەبوو، بەڵام ئێستا نیوەی توانایی مێشکییەکانی بۆ هەڵخەڵەتاندن بەکار دێنێت و بە نیوەکەی تریشی دەیهەوێت ئەو هەڵخەڵەتاندنەی روون بکاتەوە.

سرگی ئیڤانڤیچ گوتی: من هیچ کەسم نەدیوە بەقەد ئێوە دژی ژنهێنان بێت.

ـ نا، من دژی ژنهێنان نیم. تەنیا لایەنگری دابەشکردنی کارم. کەسانێك کە هیچ کارێکیان لە خۆیان نەگرتووە دەبێ منداڵ دروست بکەن و خەڵکانی تریش دەبێ بۆ فێرکاری و فەرهەنگ و

1- Katavossov

2- Tchirikov

بەختەوەریی منداڵەکانی ئەوان هەوڵ بدەن. ئەوە بۆچوونێکە کە من بۆ ئەو مەسەلەیە هەمە. بەشێکی زۆر لە ناشارەزایان ئەو چەشنە تێکۆشانە لێکناکەنەوە، بەڵام من لەو تاقمە کەسانە نیم.

لەڤین گوتی: زۆر دڵخۆش دەبم ئەگەر هەواڵی ئاشقبوونی ئێوە ببیستم! تکاتان لێدەکەم بۆ رێورەسمی زەماوەندەکەتان بانگهێشتنم بکەن.

ـ من هەر ئێستاش ئاشقم.

ـ بەڵێ ئاشقی جەستە نەرمی تێکەڵـ رووی لە براکەی کرد و گوتی: میخاییل ڤاسیلی سیمیڤۆنیچ سەرقاڵی نووسینی کتێبێکە سەبارەت بە خۆراك و...

ـ باشە، باشترەکان تێکەڵ نەکەین. چکارتان بەوەیە کتێبەکە سەبارەت بە چییە؟ گرینگ ئەوەیە کە من بەراستی ئاشقێکی جەستە نەرمی تێکەڵم.

ـ بەڵام ئەوە نابێتە بەرگری ئەوەیکە ژنێکت خۆش نەوێ.

ـ لەشنەرمی نابێتە بەرگر، ژن دەبێتە بەرگر.

ـ ئاخەر بۆچی؟

ـ دەیبینی، ئێوە هۆگری کاری کشتوکاڵن، ئاشقی راون... جارێ پەلە مەکە، دەیبینی...

چیریکۆڤ گوتی: راستت دەوێ ئەمڕۆ ئارخیپ هاتبوو، دەیگوت پرۆودنۆ[٣] زۆری بزنەکێوی لێیە و تەنانەت دوو ورچیشی لەوێ دیوە.

لەڤین گوتی: چاکە، بەڵام من کارم بەسەر ئەوەوە نییە، ئێوە بە تەنیا راویان بکەن.

سرگی ئیڤانڤیچ گوتی: بۆ ئەوە راست دەکات، دوای ئەوە دەبێ ماڵئاوایی لە راوە ورچ بکات. ژنەکەی ئیجازەی پێنادات.

لەڤین پێکەنی. هێنایە بەرچاوی خۆی کە ژنەکەی ئیجازەی پێنادات، ئەوەی زۆر بەلاوە شیرین بوو، حەزیشی دەکرد هەتا ئاخری تەمەنی چاوپۆشی لە ورچەڕاو بکات.

چیریکۆڤ گوتی: بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا زۆر حەیفە ئێوە لە راوی ئەو دوو ورچەدا بەشدار نەبن. دوایین جارت لەبیرە لە خاپیلۆوڤا[٤]؟ ئەگەر ئەمجارەش بهاتبایەی راوەکە زۆر خۆش دەبوو.

لەڤین نەیدەویست ئەو لە چێژی ئەو خەیاڵە بێبەش بکات کە لەوانەیە شیرینتر بێ لە هاوڕێیەتی لەگەڵ کیتی. بۆیە هیچی نەگوت.

---

3- Proudno

4- Khapilova

سرگی ئیڤانڤیچ گوتی: بیهۆ نییه که ئەم دابی ماڵئاواییی کردنه له ژیانی رەبەنی ریشەی داکوتاوه. پیاو هەرچەنده به زەماوەندکردن بەختەوەر بێ، ئازادی شتێکی تره.

ـ بەڵام قەبووڵی بکه که ئەم هەستەی ***زاوا***، له شانۆنامەی گۆگۆلدا، که دەیویست له پەنجەرەوه دەربازبێت، له دڵی تۆشدا هەیه.

کاتاڤۆسۆڤ گوتی: حەتمەن هەیه بەڵام قەبووڵکردنەکەی باسێکی تره ـ ئەوەی گوت و دای له قاقای پێکەنین.

چیریکۆڤ به پێکەنینەوه گوتی: چاکه، پەنجەرەکه ئاوەڵایه.... وەرەن با هەر ئێستا بچین بۆ تڤێر. یەکێك له ورچەکان دێڵه. دەتوانین راست بچینه لای کۆنەکەی. بەڕاستیمه، دەتوانین به شەمەندەفەری سەعات پێنج برۆین. ئەوانه لێرەن لێیان بگەڕێن چییان پێخۆشه بیکەن.

لەڤین به پێکەنینەوه گوتی: سوێند دەخۆم که بۆ ماڵئاواییکردن له ئازادی شوێنەواری چکۆلەترین داخم له دڵدا نییه.

کاتاڤۆسۆڤ گوتی: بەڵێ، ئێستا له دڵتدا فەرتەنه و گێژاوێکه که ناتوانی شوێنەواری هیچ شتێك بدۆزییەوه. راوەسته با ماوەیەکی پێبچێت و وەخۆبێیتەوه جا دەزانی پووتێك چەند سیەیه.

ـ نا، من هەر ئێستا ئەگەر له پاڵ هەست و... (نەیدەویست لەلای ئەوان باسی ئەشقەکەی بکات)... به مراد گەیشتنمدا رێژەیەك داخی له دەستدانی ئازادیم له دڵدا بووبووایه تێدەگەیشتم... بەڵام به پێچەوانه، چێژ لەو بێ بەش بوونه له ئازادی وەردەگرم.

کاتاڤۆسۆڤ گوتی: نەخێر وادیاره حاڵی شڕه. هیچ هیوایەکیش بۆ رزگاریی نییه. دەی کەوایه با به هیوای رزگاربوونی بخۆینەوه. یان واچاکه هەر ئەوەندەی ئارەزوو بۆ بخوازین که یەك له سەدی خولیا و حەزەکانی بێنه دی. ئەوەش بەختەوەرییەکه که لەم دنیایەدا کەس نەیدیوه.

میوانەکان دوای فراوێن رۆیشتن بۆ ئەوەی جلەکانیان بگۆڕن و خۆیان ئامادەبکەن بۆ بەشداری کردن له رێوڕەسمی مارەبڕین.

لەڤین که تەنیا کەوت و قسەی ئەو سەڵته پیاوانەی وەبیر خۆی هێنایەوه جارێکی تر گەڕایەوه بۆ نێو دڵی تاکوو بزانێ بەڕاستی ئەو داخەی ئەوان باسیان دەکرد بۆ ئازادیی خۆی لەوێدا دەیدۆزێتەوه؟ بەڵام له هەمبەر ئەو پرسیارەدا تەنیا زەردەیەکی گرت «ئازادی؟ ئازادی بۆچی؟ بەختەوەری تەنیا لەوەدایه که کەسێکت خۆشبوێ و ئاواتی ئاواتی ئەو بێ و بیروڕاشت بیروڕای ئەو بێت، که ئەوەش ئازادی نییه، بەختەوەرییه.»

لە ناکاو بانگێك بە گوێی دڵی گەیشت «بەڵام من فیکر و بیری ئەو دەناسم و لە حەز و ئاواتەکانی دەگەم و لەگەڵ هەستەکانی ئەو ئاشنام؟» بزە لەسەر لێوی رەوی و بە گۆمی خەیاڵدا رۆچوو. لە ناکاو هەستێکی سەیر لە دڵیدا سەری هەڵدا و ترس و دڕدۆنگی دەروونی داگرت. دڕدۆنگی سەبارەت بە هەموو شتێك.

بەخۆی گوت «ئەگەر خۆشینەوێم چ بکەم؟ ئەگەر تەنیا بە هۆی چێژی مێردکردنەوە ببێتە ژنم چی؟ ئەی ئەگەر خۆشی نەزانێ چدەکات؟ لەوانەیە وەخۆ بێتەوە و دوای ئەوەی زەماوەندەکە سەریگرت بۆی دەربکەوێت کە خۆشیناوێم و ناتوانێ خۆشیبوێم.» فیکری سەیر و خراپ سەبارەت بە کیتی زەینی داگرت. رق و ئێرەیی ڤرۆنسکی لە دڵیدا سەری هەڵدا و هەر ئەو گوڕ و تینەی ساڵی رابردوو ناخی هەڵدەچۆقاند و دەتگوت هەر دوێشەو لەگەڵ ڤرۆنسکی دیتوویەتی. تووشی شك و گومان بوو کە نەکا هەموو شتێکی پێنەگوتبێ.

بەپەلە هەستا سەرپێ. هیوابڕاوانە بەخۆی گوت «نا، وانییە. دەچم بۆ لای و لێیدەپرسم. بۆ دوایین جار پێیدەڵێم: ئێمە ئازادین. یانی چاکتر وایە هەتا درەنگ نەبووە دەست راگرین. هەموو شتێك لە نامردادی و ناوزڕان و پەیمانشکاندن باشترە!» بە دڵێکی لێوڕێژ لە ناهومێدی و رق سەبارەت بە خۆی و بە ئەو و بە هەموو عالەم لە هوتێلەکە هاتەدەرێ و رۆیشت بۆ ماڵی ئەوان.

هیچ کەس چاوەڕوانی نەبوو، لە ژوورێکی پشتەوە چاوی بە کیتی کەوت، کیتی لەسەر یەغدانێك دانیشتبوو و دەستووری بە خزمەتکارێك دەدا کە خەریکی قەدکردن و رێکوپێك کردنی کۆمایەك جلوبەرگی رەنگاوڕەنگ بوو کە لە تەرکی ژوورەکە و سەر کورسییەکان کەوتبوون.

کیتی کە چاوی بە لەڤین کەوت قریشکاندی و لە خۆشیانا روخساری گەشایەوە و بە زەردەخەنەیەکی شیرینەوە گوتی: ئا، چۆن، تۆ... چۆن ئێوە... (هەتا دوێنێ هێندێ جار «تۆ» و هێندێ جاریش «ئێوە»ی پێدەگوت) چاوەڕێ نەبووم بێی. خەریکم جلەکانم جیا دەکەمەوە بزانم کامەیان بە کێ بدەم و...

لەڤین بە روخسارێکی پەرۆشەوە چاوی لە خزمەتکارەکە کرد و گوتی: ئەها، زۆر چاکە!

کیتی بە خزمەتکارەکەی گوت: دوونیاشا، تۆ بڕۆ، ئەگەر پێویست بوو خۆم بانگت دەکەم ـ کە خزمەتکارەکەی رۆیشتە دەرێ ئەمجارە بە خاترجەمی و گوتنی «تۆ»هات بۆ لای و گوتی: چیبووە؟ ـ تێگەیشت کە لەڤین خەمبار و نائاسابیە و پەرۆشییەك سەرتاپای داگرتووە، بۆیە ترسێك دڵی کیتیی رێککگوشی.

لەڤین بەرەورووی راوەستابوو، بە روانینێکی پڕ لە پاڕانەوە و دەنگێکی تژی لە هیوابڕاوی گوتی: کیتی! من تووشی ئازارێکی زۆر قورس بووم، ناتوانم ئەو ئازارە بە تەنیا تامڵ بکەمـ

هەر لەو سەرەتایەوە سیمای راستویژی ئەو شوێنەواری شەیدایی و ئەشقی پێوە دیاربوو و دەیدی کە ئەوەی لە دڵیدایە ناتوانیٚ دەریبڕێت، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستی بەوە بوو کە کیتی دڵنیای بکات. گوتی: من هاتووم پێتبڵێم کە هێشتا درەنگ نەبووە. ئەو کارانەی کراوە هێشتا دەتوانین چاوپۆشیی لێبکەین و نەهێڵین لەوە خراپتر بیٚ.

ـ چۆن؟ تێناگەم تۆ دەڵێیچی؟ چبووە؟

ـ هەر ئەوەی کە هەزار جارم گوتووە و ناتوانم بیری لێنەکەمەوە... ئەوەی کە من شایانی تۆ نیم. تۆ چۆن دەتوانی خۆت رازی بکەی کە شوو بکەی بە من؟ بیری لێبکەوە. بە هەڵە چووی. جوان بیری لێبکەوە. تۆ ناتوانی منت خۆش بوویٚ... ـ بیٚ ئەوەی چاو لە چاوی کیتی بکات درێژەی بە قسەکانیدا: ئەگەر... واچاکە بڵێی... دەزانم من نامراد دەبم. لێگەڕیٚ خەڵکی هەرچی دەیلێن با بیلێن. هەموو شتێك لەوە چاکترە پەشیمان ببیتەوە... ئێستا کە وەخت ماوە وا باشترە...

کیتی بە رەنگی پەڕیو و دڵی پڕ لە ترسەوە وەڵامی دایەوە: من هیچ تێناگەم، یانیچی؟ دەتەویٚ تێکی بدەیەوە؟... یانی نابیٚ؟...

ـ بەڵیٚ، ئەگەر تۆ منت خۆشنەویٚ...

کیتی زۆری لە دڵ گران هات و سوورهەڵگەڕا، دەنگی بەرزکردەوە: تۆ شێت بووی!

بەڵام روخساری لەڤین هێندە بەزەییبزوێن بوو کە ئەو زویربوونەکەی خۆی لەبیرچۆوە و جلوبەرگی سەر کورسییەکەی فڕێدا خواریٚ و لە پەنایدا دانیشت و گوتی:

ـ تۆ بیر لە چی دەکەیتەوە؟ ئەوی لە دڵتدایە پێم بڵیٚ.

ـ من بیر لەوە دەکەمەوە، کە تۆ ناتوانی منت خۆش بویٚ. بۆچی دەبیٚ منت خۆشبویٚ، لەبەر کوێم؟

کیتی گوتی: خودایەگیان، من چ بکەم؟ دەستیکرد بە گریان.

لەڤین هەناسەیەکی هەڵکێشا و دەنگی هەڵبڕی: پەککوو چیمکرد! ـ لەبەر دەمیدا چۆکی دادا و دەستیکرد بە ماچکردنی دەستە ناسکەکانی کیتی.

پێنج دەقیقە دواتر کە پرێنسسی گەورە هاتەژووریٚ دیتی پێکەوە بە خۆشی و ئاشتی دانیشتوون. کیتی دڵنیای کردبوو کە خۆشیدەویٚ و هەروەها لە وەڵامی ئەوەشدا کە بۆچی دەبیٚ ئەوی خۆشبویٚ بۆی روونکردبۆوە و پێیگوتبوو کە بۆیە خۆشیدەویٚ چونکە بە روونی دڵ و ناخی دەخوێنێتەوە و تێیدەگات و دەشزانیٚ کە ئەو (یانی لەڤین) زۆر بەڕێز و شیرینە لەلای و

ناچارە خۆشیبویٚ و هەرچییەك کە ئە حەزی پێبکات دەبیٚ ئەمیش حەزی پێبکات و نابیٚ تووشی دڕدۆنگی بێت، دەبیٚ بە باشیشی بزانێت. ئەو قسانە زۆر روونکردنەوەیەکی باش بوون بۆ لەڤین و لە دڵی نیشتن. کاتێك پرێنسس هاتەژووریٚ ئەوان لەسەر یەغدانەکە لە پەنا یەك دانیشتبوون و کراسەکانیان قەد دەکرد و لەسەر ئەوە کەوتبوونە چەلەحانیٚ کە کیتی دەیویست کراسێکی شەگەڵاتی بدات بە دوونیاشا و ئەوەش راست ئەو کراسە بوو کە رۆژی خوازبێنییەکە لەبەریدا بووبوو. لەڤین پێداگریی دەکرد کە نابیٚ ئەم کراسە بە هیچ کەس بدات و کراسێکی کەهوویان لەگەڵدا بوو ئەوەیان بدات بە دوونیاشا.

ـ تۆ چۆن لەوە ناگەی، دوونیاشا سەوزە و قژڕەشە و ئەو کراسەی پێناکەویٚ. من حیسابی هەموو ئەوانەم کردووە.

پرێنسسی گەورە کاتێك زانیی لەڤین بۆچی هاتووە هێندێك بە گاڵتە و بە شێوەیەکی جیددی خۆی تووڕە کرد و سەری خستە سەری و لەڤینی ناردەوە بۆ هۆتێل کە لیباس لەبەر بکات و مزاحیمی خۆڕازاندنەوەی کیتی نەبێت چونکە شارێل بەم زووانە دێت.

پێیگوت: کیتی بە بیٚ ئەو قسانەش چەند رۆژە هیچی بۆ ناخورێت و لاواز بووە تۆش بەو قسە هەڵیتوپڵیتانەت زیاتری دەشێوێنی. برۆ گیانەکەم، برۆ کۆیکەوە داشقەی توورت.

لەڤین، شەرمەزار و خەمبار، سەری داخست و لەگەڵ ئەوەی خۆی بە خەتابار دەزانی بە دڵێکی ئارام و خەیاڵێکی ئاسوودەوە گەڕایەوە بۆ هۆتێل. سرگی ئیڤانڤیچی برای و داریا ئەلکساندرۆڤنا و ستیپان ئارکادیچ لیباسی جەژنیان لەبەرکردبوو و خۆیان رازاندبۆوە و چاوەڕوانی بوون تاکوو لە هەمبەر وێنەی پیرۆزدا تەبەڕووکی بدەنیٚ، درەنگوەخت بوو و دەبوو داریا ئەلکساندرۆڤنا سەرێك لە ماڵەکەی هەڵێنیٚ تاکوو کوڕەکەی بەرێت بۆ ماڵی بووك کە بە سەری لوول و چەورەوە چاوەڕیٚ بوو، چونکە ئەو دەبوو لەنێو فایتوونەکەدا وێنەی پیرۆزی بەرەوڕوو راگریٚ. پاشان دەبوو فایتوونێك بنێرن بۆ ماڵی برازاوا و گوتی فایتوونێکی تر کە سرگی ئیڤانڤیچ دەبات بگەڕێتەوە. وەلحاسڵ زۆر مەسەلە و کێشەی جۆراوجۆری تر. شتێکێش روون و ئاشکرا بوو ئەویش ئەوەبوو کە بە هیچ شێوەیەك کات بە فیڕۆ نەدات چونکە سەعات بووبووە شەش و نیو.

تەبەڕووك لە هەمبەر وێنەی پیرۆزدا شتێکی زۆر خۆش و بێوێنە بوو. ستیپان ئارکادیچ بە شێوەیەکی شکۆمەندانە بەڵام زۆر گاڵتەجارانە لە پاڵ ژنەکەیدا راوەستابوو و وێنەی پیرۆزی بە دەستەوە گرتبوو، بە لەڤینی گوت کە سیٚ جار لە هەمبەر وێنەکەدا کڕنۆش بەرێت، پاشان بە بزەیەکی پڕ لە خۆشەویستی بەڵام رشقنجارانەوە تەبەڕووکی پێدا و سیٚ جار روخساری ماچکرد و

داریا ئەلکساندرۆڤناش ئەو کارەی کرد و بەپەلە ڕۆیشت و دیسان تووشی کێشەی ناردن و هێنانی فایتوون بۆوە کە پێشتر جارێکی پێیڕاگەیاندبوون بەڵام دیسان دامابوو بە دەستیانەوە.

ـ باشە، ئێستا ئەو کارە دەکەین: تۆ بە فایتوونەکەی خۆمان بڕۆ بە دوای ئەودا و سرگی ئیڤانۆڤیچ ئەگەر گەورەیی بنوێنن لە پێشدا بڕۆن و فایتوونەکە زوو بنێرنەوە.

ـ بەڵێ بەسەر چاو، ئێستا دەڕۆم.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: منیش لەڕێوە لەگەڵیدا دەگەڕێمەوە.شتەکان هەموو بەڕێ کراون؟

لەڤین وەڵامی دایەوە: هەموو شتێکمان ناردووە ـ بە کۆزمای گوت کە جلەکانی پێلەبەر بکات.

## سێ

خەڵکێکی زۆر و بەتایبەت ژنان لە دەوری ئەو کلیسایەی کە بۆ زەماوەندەکە چراخان کرابوو ئاپۆرەیان دابوو. ئەوانەی کە نەیانتوانیبوو بچنە نێو کلیساکەوە لە پشت پەنجێرەکان کۆ بووبوونەوە و پاڵیان بە یەکترەوە دەنا و خەریکی کێشە و دەمەقاڵێ بوون و لە کەلێنی لاجامەکانەوە چاویان لە ژوورێ دەکرد.

ژەندرمەکان زیاتر لە بیست فایتوونیان لەسەر شەقامەکە ریز کردبوو. ئەفسەرێکی پۆلیس یۆنیفۆرمێکی بە بریقوباقی لەبەردا بوو، بێ ئەوەی گوێ بەو سەرما توندە بدات لەبەر دەرگای چوونە ژوورەوەی کلیساکەدا راوەستابوو. بەردەوام فایتوون و هێلینگە دەهاتن و هێندێ جار ژنانی رازاوە و خۆلەگوڵداو داوێنی کراسەکەیان بەلادا دەکرد و هێندێ جاریش پیاوان کڵاوی سەربازی گرۆڤەری خۆیان لە سەریان دادەگرت و بە نەرمی دادەبەزین و دەچوونە نێو کلیساکەوە. ئێستا دوو چلچرا لەنێو کەنیسەکەدا هەڵکرابوون و لەبەر هەموو وێنە پیرۆزەکانیشدا دەیان مۆم داییسابوون. شۆقدانەوەی تیشك لەسەر تەختی سووری پەردەکان کە بە وێنە رازابوونەوە و دەوری مێحرابەکان بە تۆڕ و تەنزیل و تەتەڵەی زێڕین و وێنەی لە قەتحەی رەنگاوڕەنگگیراو و بریقەی زێوینی چلچرا و شەمدانەکان چاویان وەشەوارە دەخست، تەتەڵەی تەرکی کەنیسە و مافوورە و ئاڵای سەر سەکۆی کۆمبێژان و قاڵدرمەکان و کتێبە کۆن و رەشهەڵگەڕاوەکان و عابای قۆڵ فشوفۆڵی قەشە هەموویان لە تیشك و شۆقدا دەدرەوشانەوە. لای راستی کلێسە زۆر باش گەرم داهاتبوو و جمەی دەهات. لەنێو ئاپۆرەی ئەو میوانانەدا کە فراکی رەشیان لەبەرکردبوو و بۆینباخی سپییان لە ملدا بوو،

لەنێو یۆنیفۆرمی کەڵبەدوون کراو و جلوبەرگی مەخمەر و ئەتڵەسی و پرچ و کەزیەی بەگوڵ خەملاّو و شانومل و باسکی رووت و بەفرین و نەرموشل و دەستی داپۆشراو بە دەستەوانە دەنگی ژاوەژاو و قرموقاڵ بەرزبووبۆوە و لە ژێر گومبەزیی کەنسیەکەدا دەبوو بە زایەڵە و هۆی سەرسوورمان. هەرجارێك کە دەرگاکە دەکرایەوە و جیڕەی گوێدڕی لاولاوەکەی هەڵدەستا، ژاوەژاوەکە دەخەوت و هەموو بۆ لای دەرگاکە ئاوڕیان دەدایەوە و چاوەڕێ بوون بووك و زاوا بێنە ژووری. بەڵام دەرگاکە تا ئێستا دە جار کرابۆوە و هەرجارەی کەسێك یان چەند کەس میوانی وەدرەنگ کەوتوو دەهاتنە ژووری و دەچوونە کوڕی میوانەکانی لای راستەوە. یان ژنێکی تەماشاچی کە ئەفسەرێکی پۆلیسی فریودابوو یان دڵی نەرم کردبوو دەهاتەژووری و دەچووە ریزی ئاپۆرەی غەوارەکانی لای چەپەوە. خزم و ئاشنایان و بێگانەکان هەموو ئێستا قۆناخەکانی چاوەڕوانییان تێپەڕاندبوو.

سەرەتا پێیانوابوو هەر ئەو کاتە بووك و زاوا دێن و ئەو وەدرەنگ کەوتنەیان بەلاوە گرینگ نەبوو. پاشان لە پەستا چاویان لەلای دەرگاکە دەکرد و تووشی دڵەوڕێزە بووبوون کە نەکا رووداوێك قەومابێ. وردە وردە وایلێهات خەم و دڵەخورپە هەمووانی داگرت و میوانەکان و خزموکەس هەوڵیان دەدا وابنوێنن کە خەمی بووك و زاوایان نییە و تەنیا بیر لە قسەوباسەکانی خۆیان دەکەنەوە.

جانکوشی گەورە لەبەر بێتاقەتی وادەکۆخی کە شووشەی پەنجەرەکان دەلەرزینەوە و دەتگوت دەیهەوێ بە گوێیان هەڵێنێ کە کات زۆر بە نرخە. لە شوێنی کۆمبێژانەوە هێندێ جار ئاوازێکی تاقیکردنەوە بەرگوێ دەکەوت و هێندێ جاریش دەنگی مووشەی گۆرانیبێژێك کە تاقەتی بەسەر چووبوو. قەشە لە پەستا جانکوش یان یاریدەدەرەکەی ئەوی دەنارد تاکوو بپرسن بووك و زاوا گەیشتوون یان نا، خۆشی بە عابای بنەوەش و رازاوە و پشتێنی گوڵدۆزی کراوەوە بەردەوام دەچووە پشت دەرگای تەنشتی و چاوەڕێیی بووك و زاوا بوو. ئاخری یەکێك لە ژنەکان چاوی لە کاتژمێرەکە کرد و گوتی: ئیتر بەڕاستی سەیرە. ـ میوانەکانیش هەموو شڵەژان و دەستیان کرد بە دەربڕینی ناڕەزایەتی و سەرسوورمانی خۆیان. یەکێك لە برازاواکان چوو تاکوو بزانێ چیقەوماوە. کیتی لەمێژ بوو ئامادەبوو، کراسی سپیی لەبەرکردبوو و تۆڕی درێژ و تاجی بەهارنارنجی لەسەر نابوو، لەگەڵ ژنێك کە بۆ مارەکردن وەکیلی دایکی بوو و ناتالی لۆوڤای خوشکیشی کە لە تالارەکە راوەستابوو و لە پەنجێرەکەوە چاوی لە دەرێ دەکرد، نیو سەعات بوو بێهوودە چاوەڕێ بوو هەواڵی گەیشتنی زاوا لە لاوێك وەرگرێت کە لەو رێوڕەسمەدا هاوڕێیەتی.

بەڵام لەڤین لەو کاتەدا پانتۆڵ لەپێ بەڵام بەبێ جلیقە و فراك لە وەتاغی هۆتیلەکەدا دەهات و دەچوو بە دڵەڕاوکێیەکی زۆرەوە لە پەستا سەری لە دەرگاکەوە دەکێشا دەرێ و چاوی لە ڕێڕەوەکەوە دەکرد بەڵام ئەو کەسەی چاوڕەوانی بوو نەدەگەیشتە دالانەکە و بە ناهومێدی دەگەڕایەوە و لەبەردەمی ستیپان ئارکادیچ کە بێموبالاتانە جگەرەی دەکێشا بێسەبرانە دەستی هەڵدەتەکاند و پەککوو پەککووی بوو.

دەیگوت: یانی تا ئێستا کەسێك بووە کە ئاوا بکەوێتە تەنگژەیەکی گەوجانە و بێ ماناوە؟

ستیپان ئارکادیچ بە نەرمی زەردەی دەگرت و هەقی پێدەدا: بەڵێ، بەڕاستی بێ مانایە. بەڵام زۆر خۆت سەخڵەت مەکە و لەسەرەخۆ بە، دەیهێنن.

لەڤین لەگەڵ ئەوەی دەیویست ددان بە خۆیدا بگرێ گوتی: ئاخەر چۆن دەبێ؟ پەککوو، ئاخ لە دەست ئەو هێلەگە بەر ئاوەڵا قۆڕانە! خۆ ئاوا نابێ ـ ئەوەی دەگوت و چاوی لە بەرۆکی چرچولۆچی کراسەکەی دەکرد و پەشێوانە دەنگی هەڵدەبڕی: ئێستا ئەگەر جانتاکانیان ناردبێ بۆ وێستگەی شەمەندەفەر قوڕی کوێ بەسەرما بکەم؟

ـ ئەو کاتە هێلەگەکەی من لەبەر بکە.

ـ دەبوو زۆر زووتر ئەو کارەم بکردبایە.

ـ نا، خۆت نەکەیتە مەڵحەکە باشە... پەلە مەکە! جێبەجێدەبێ.

کێشەکە لەوەوە دەستی پێکردبوو کاتێك لەڤین ویستبووی جلەکانی لەبەر بکات کۆزمای پێشخزمەتی، فراك و هێلەك و هەموو شتێکی هێنابوو.

لەڤین بەسەر سووڕمانەوە پرسیبووی: ئەی کراس کوا؟

کوزما بە بزەیەکی ئاسوودەوە گوتبووی: کراس ئەوە لەبەرتدایە.

کوزمای پیر کە بیری لەوە نەکردبۆوە کە کراسێکی خاوێن دانێ، چونکە دەستووری پێدرابوو کە هەموو کەلوپەلەکان بپێچێتەوە و بیاننێرێ بۆ ماڵی ئیشچر باتسکی، چونکە بووك و زاوا هەر ئەو شەوە لەوێوە دەچوون بۆ دێ، ئەویش دەستیکرد بە پێچانەوەی کەلوپەلەکان و هەمووی بەڕێ کردبوون و تەنیا فراك و جلیقەکەی بۆ دانابوو. بەڵام ئەو کراسە لە بەیانییەوە لەڤین لەبەری دابوو و هەمووی چرچولۆچ بووبوو، لەگەڵ جلیسقە بەرئاوەڵایانەی کە بووبوونە داب نەدەکرا لەبەری بکات. ماڵی ئیشچر باتسکی زۆر دوور بوو و نەدەکرا کەسێك بنێرێت بۆ ئەوێ. ناچار کەسێکی نارد کراسی تازەی بۆ بکرێت. پێشخزمەتەکە

گەڕایەوە و گوتی دووکان هەموو داخراون. یەکشەممە بوو کەسێکیان نارد بۆ ماڵی ستیپان ئارکادیچ و کراسێکیان هێنا، بەڵام کراسەکە زۆر فش و قوڵە بوو. ئاخری ناچاربوون پێشخزمەتێك بنێرن بۆ ماڵی ئیشچر باتسکی تاکوو بارگەوبنەکە بکاتەوە. هەموو لە کلێسە چاوەڕوان بوون و ئەویش وەکوو دڕندەیەکی یەخسیر لە قەفەسدا دەهات و دەچوو، لە دەرگاکەوە سەری دەکێشا و بە ترس و ناهومێدییەوە وەبیر ئەو قسانە دەکەوتەوە کە بە کیتیی گوتبوو و دڵەدوا بوو لەوەی کە ئێستا دەبێ چۆن بیر بکاتەوە.

ئاخری کوزمای تاواتبار بە هەناسەبڕکێ خۆی کرد بە ژووریدا و کراسی بۆ هێنا.

گوتی: راست لە کاتی خۆیدا گەیشتم، خەریکبوون جانتاکانیان دەخستە سەر عارەبانە و بیبەن بۆ وێستگە.

لەڤین سێ خولەك دواتر، بێ ئەوەی چاو لە کاتژمێرەکەی بکات و بەو کارە خوێ لە زامی خۆی بپرژێنێ بە دالانەکەدا هەڵات و لە هوتێلەکە چووەدەرێ.

ستیپان ئارکادیچ کە بە شێنەیی بە دوایدا دەڕۆیشت بە پێکەنینەوە گوتی: کار بەپەلە پێکنایە. لەسەرخۆ بە، پێت دەڵێم جێبەجێدەبێ.

## چوار

کاتێك لەڤین لەبەر دەرگانەی کلێسە چوو بۆ پێشوازیی بووك و پێکەوە چوونە نێو کلێسەکەوە خەڵك خۆبەخۆ بەیەکتریان دەگوت: هاتن! چاو لە زاوا بکە! کامەیە؟ ـ ئەو جحێڵەیانە؟ ـ چاو لە بووك بکە! ئەی بەستەزمانە، رەنگی بە رووەوە نەماوە.

ستیپان ئارکادیچ هۆی وەدرەنگ کەوتنەکەی بۆ ژنەکەی باسکرد و میوانەکان بە پێکەنینەوە لەگەڵ یەکتر کەوتنە سرتوخورت. لەڤین ئاگای لە هیچ کەس و هیچ شتێك نەبوو و چاوی لەسەر بووك هەڵنەدەگرت.

هەموو دەیانگوت لەم رۆژانەی دواییدا ناحەز بووە و جلی بووکێنیی پێناکەوێ و بە شێوەی ئاسایی جوانتر بوو. بەڵام لەڤین ئەوی بە چاوێکی تر دەدی. چاوی لە پرچە درێژ و بە گوڵ خەملاوەکەی و ئەو تۆڕە ناسك و جوان و درێژە بە گوڵی سپی نەخشێندراوەی دەکرد، ملیوانە چیندار و درێژ و راستڕاوەستاوەکەی کە گەردنە زەرد و کێلەکەی بە بێگەردییەکی کچانەوە لە دوولاوە داپۆشیبوو، بەڵام لە پێشەوە پێسیری ئاوەڵا

و بەرۆکی بەفرینی هێندە جوان و بێوێنە بوو لەڤین دیویست سەد چاوی هەبێ و لێیبڕوانێ. قەدی زۆر باریك بوو و بالاَبەرزەکەی لە بەرچاوی لەڤین لە هەموو کاتێك جوانتر بوو. بەڵام نەك بەو هۆیەی کە ئەو گوڵ و تۆڕ و کراسە کە لە پاریسەوە بۆیان هێنابوو جوانییەکەی ئەوی چەند قات کردبێ، بەڵکوو بەو هۆیەی کە شکۆ و رازاوەیی ئەو جوانکارییە دەستکردە حاڵەتی روخساری شیرینی و نیگا گەرمەکەی و سادەیی لێوەکانی تێکنەدابوو و ئەو پاکی و راستییەی خۆی هەروا پێوەمابوو.

کیتی بە پێکەنینەوە پێیگوت: پێم وابوو هەڵاتووی کە خۆت دەربازبکەی.

ـ لەڤین سوورهەڵگەڕا و گوتی: ئەوەی بەسەرم هات هێندە قوڕ و بێتام بوو پێم عەیبە هەر باسیشی بکەمـ ناچار ئاوڕی دایەوە بۆ لای سرگی ئیڤانڤیچ کە خەریکبوو لێینزیك دەبۆوە.

سرگی ئیڤانڤیچ کە بە پێکەنینەوە سەری دەلەقاند گوتی: بەو نەقڵ و بەسەرهاتەی کراسەکەتەوە بەڕاستی شایانی ئەوەیە ئافەریمت پێبڵێم!

لەڤین کە تێنەدەگەیشت براکەی دەڵێچی سەرسەری وەڵامی دایەوە: بەڵێ، بەڵێ!

ستیپان ئارکادیچ کەوای دەنواند شڵەژاوە گوتی: دەی، کوسیتا، ئیتر دەبێ بڕیاربدەی. کێشەیەکی زۆر گرینگ هاتۆتە پێشێ. تۆ ئێستا لە بارودۆخێکدای کە دەتوانی لە هەموو گرینگایەتییەکانی تێبگەی. لە من دەپرسن کە مۆمی نیوەسووتاو داگیرسێنم یان مۆمی نوێ؟ دە رۆبڵیان جیاوازی هەیە ـ کە ئەوەی گوت لێوانی بە زەردەیەك کرایەوە و درێژەی پێدا: من لەجیاتی تۆ وەڵامم دانەوە بەڵام دەترسم تۆ لەگەڵ بڕیارەکەی من هاوڕا نەبی.

لەڤین تێگەیشت کە ستیپان ئارکادیچ گاڵتە دەکات بەڵام نەیتوانی زەردە بگرێت.

ـ دەی بڵێ، مۆمی نیوەسووتاو یان نوێ؟ مەسەلەکە ئەوەیە!

ـ بەڵێ، بەڵێ، مۆمی نوێ!

ستیپان ئارکادیچ بە پێکەنینەوە گوتی: باشە، زۆر خۆشحاڵم کە کێشەکە چارەسەر کرا ـ کە لەڤین گێژوویژ چاوی لە ئەو کرد و رۆیشت بۆ لای کیتی لە چیریکۆڤی روانی و گوتی: بەڵام پیاوان لە بارودۆخێکی ئەوتۆدا زۆر دەبەنگ دەبن.

کۆنتس نۆردستۆن هاتە پێشێ و بە کیتیی گوت: کیتی وریابە یەکەم هەنگاو تۆ بینێ سەر فەرشەکە ـ چاوێکیشی لە لەڤین کرد و گوتی: بەڕاستی ئافەرین!

ماریا دمیتریوڤنا میمکی پیری کیتی پرسیی: چۆن؟ ناترسی؟

پرێنسس ناتالی لۆوڤا خوشکی کیتی گوتی: تۆ سەرمات نییە؟ رەنگت چۆن هەڵبزڕکاوە؟ پەلە مەکە، سەرت دانەوێنە ـ قۆڵە نەرموشل و جوانەکانی خۆی هەڵێنا و گوڵ و خشڵی سەری بۆ رێکوپێك کرد.

دالی هاتە پێشیٚ و دەیویست شتێك بلێ بەڵام نەیتوانی و دەستیکرد بە گریان، پاشان بە زۆری زەردەیەکی گرت:

کیتیش وەك لەڤین دەتگوت گێژوویژە لە خەڵکی دەڕوانی. کاتێك قسەیان لەگەڵ دەکرد جگە لە پێکەنین نەیدەتوانی هیچ وەڵامێك بداتەوە" پێکەنینێکی شیرینکامانە ئێستا لەسەر روخساری بە شێوەیەکی سروشتی خۆی دەنواند.

لەو جەنگەیەدا جانکوش و راهیب و مجێورەکانی کەنیسە جلوبەرگی تایبەتیان لەبەرکردبوو و قەشە و جانکوشی گەورە رۆیشتن بۆ لای رەحلێکی پێچکە بڵێند کە لە نزیك مێحرابەکە داندرابوو. قەشە رووی دەمی لە لەڤین بوو شتێکی گوت کە لەڤین تێنەگەیشت.

برازاوا بە لەڤینی گوت: دەستی بووك بگرە و برۆنە پێشیٚ.

لەڤین ماوەیەکی درێژ نەیدەزانی چ بکا. هەتا ماوەیەك کار و هەڵسوکەوتەکانیان بۆ راست دەکردەوە، چونکە نەیدەزانی بە کامە دەستی کیتی بگرێت، ئاخری خەریکبوون ناهومێد دەبوون و دەیانویست وازی لێبێنن کە تێگەیشت بێ ئەوەی باری راوەستانەکەی خۆی بگۆڕێت دەبێ بە دەستی راستەی خۆی دەستی راستەی کیتی بگرێت، قەشە چەند هەنگاو لە پێشیانەوە رۆیشت و لە پشت رەحلەکە راوەستا. کۆڕی خزم و کەسانیش بە دەم چپە و سرتەوە بە دوایاندا رۆیشتن و خشەخشی داوێنی کراس و تەنوورەکانیان کلیساکەی داگرتبوو. نەفەرێك داهاتەوە و دووچکەی درێژی کراسەکەی بووکی رێکوپێك کرد کە لە دووی دەخشا. بێدەنگییەك باڵی بەسەر کلیساکەدا کێشابوو کە تەنانەت ترپەی تکانی فرمێسکی مۆمەکان دەبیستران.

قەشەی پیر کە کڵاوێکی تایبەتی لەسەر نابوو و قژە سپی و لوولەکەی کە دەتگوت چۆڕی شیرە لە پشت گوێچکەی رێکوپێکی کردبوو و دەدرەوشایەوە، دەستە کز و چرچەکانی لە ژێر عابا قورسە زێوینەکەی هێنایە دەرێ کە خاچێکی زێڕینی بە نێو پشتەکەیدا دووریبوو، چاوی لە کتێبی سەر رەحلەکە کرد و لەوە دەچوو بە دوای شتێکدا بگەڕێ.

ستیپان ئارکادیچ بە پارێزەوە لێی نزیکبۆوە و شتێکی بە گوێیدا چپاند و چاوێکی لە لەڤین قرتاند و دیسان گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی.

قەشە دوو مۆمی هەڵکرد کە بە شێوەی پەیکەرەی گوڵ و دەوەن دروست کرابوون و هەردووکیانی بە دەستی چەپەوە گرت و خواری کردبوونەوە کە دڵۆپ دڵۆپ فرمێسکیان دەتکایە خوارێ و رووی لە بووك و زاوا کرد. ئەوە راست ئەو قەشەیە بوو کە لەڤین لەلای ئەو ددانی بە تاوانەکانیدا نابوو. بە چاوی کز و روانینێکی خەمارییەوە لە بووك و زاوای روانی و

هەناسەیەکی هەڵکێشا و دەستی راستەی لە ژێر عاباکەی هێنایە دەرێ و تەبەڕووکی پێدان، پاشان زۆر بە ئەسپایی و مێهرەبانی لەپی دەستی بە سەری دانەواوی کیتیدا هێنا و مۆمەکانی دایە دەستیان و بخوورسۆزەکەی هەڵگرت و بە کاوەخۆ لێیان دوورکەوتەوە.

لەڤین ملی وەرسووڕاند و چاوی لە بووك کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی «یانی بەڕاستی ئەوە هەقیقەتی هەیە؟» لە سەرەوە لایەکی دەموچاوی دەدی و بە جووڵانی بە ئەستەمی لێو و برژۆڵیدا تێگەیشت کە کیتی هەست بە روانینەکەی دەکات و دەزانێ چاوی تێبڕیوە. کیتی سەری بۆ لای ئەو نەسووڕاند بەڵام ملیوانە درێژ و چیندارەکەی بەحاڵ جووڵایەوە و هەتا بناگوێ ناسك و کاڵوکرچەکەی هاتە سەرێ. تێگەیشت کە هەناسەی لە سینگیدا کۆکردۆتەوە و دەستی بە دەستکێش شاراوەی کە مۆمەکەی پێگرتووە دەلەرزێ.

دڵەوڕێزەی بۆ کراسەکەی و درەنگگەیشتنە کلیسا و ئاخافتن لەگەڵ خزمان و ناسیاوان و نارەزایەتی دەربڕینیان و ئەو بارودۆخە قۆڕ و نالەبارەی تووشی بووبوو، هەمووی لە ناکاو دوایی هات و هەستی بە شادی کرد و بۆ ئەو شادییەی خۆی ترسی لێنیشت.

جانکوشی گەورە، کە پیاوێکی کەڵەگەت و خوێنشیرین بووشاڵێکی پان و زێوینی لە ملی هاڵاندبوو و قژە لوولە بە دوو لادا شانەکراوەکەی راست راوەستابوو. بە چالاکی هەنگاوێکی بۆ پێشەوەنا و بە بزووتنێکی ئاسایی شاڵەکەی دەوری گەردنی بە دوو قامك بەرزکردەوە و بەرەو رووی قەشە راوەستا.

ـ خودایە، بەرەکەتمان پێعەتا بفەرموو! ـ لەبزە شکۆمەندەکەی و وشە داناردانارەکانی بە ئەسپایی یەك لە دوای یەك هەوای دەلەراندەوە و پانتاییی کلێساکەی دادەگرت.

قەشەی پیر کە هەروا خەریکی هەڵدانەوەی کتێبی سەرڕەحلەکە بوو زۆر بە نەرمی و لەسەرخۆ و بە راوێژێکی ئارام وەڵامی دایەوە: پیرۆز و متفەرکبێ ناوی خودای مەزنمان، ئەمڕۆ و هەمیشە و هەتا دنیا بەدنیایە ـ ئاوازێکی بەرز و هەوایەکی خۆش لەلای کومبێژانەوە هەستا و نێو کلیساکەی هەر لە پەنجەرەکەوە هەتا ژێرتاقی گومبەزەکانی پڕکرد و ماوەیەك لە پانتاییی هۆڵەکەدا بوو بە زایەڵە و پاشان بێدەنگ بوو.

وەك هەمیشە دەستیانکرد بە دۆعاکردن لە دەرگای یەزدان و بۆ ئاشتی و رزگاری لە گێژاوی تاوان و بۆ سەرکەوتنی شۆڕای کلیسا و بۆ سلامەتیی ئیمپڕاتۆڕ و هەروەها بۆ دوو بەندەی خودا کۆنستانتین و کاترینا کە ئەمڕۆ بە پێوەندێکی پیرۆز بەیەك گەیشتن.

ـ هەروەها لە دەرگای یەزدانی مەزن داواکارین کە ئەشقی پاك و سەفای کامڵ بەو بووك و زاوایە عەتا بکات و لە یارمەتیی خۆی بێ بەش یان نەکات ـ وەك ئەوە وابوو کە تەواوی کلیسا بە دەنگی جانکوشی گەورە هەناسە بکێشن.

لەڤین گوێی بۆ ئەو وشانە راگرتبوو و ئەو دۆعایە شوێنی لەسەر دڵی دادەنا و ترس و دڕدۆنگییەکانی پێشووی خۆی وەبیردەهاتەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی «چۆن لەوە گەیشتوون کە من پێویستم بە یارمەتییە؟ من چی دەزانم؟ بەبێ یارمەتیش لەو کارە سامناکەدا چیم لەدەست دێ؟ جگە لە یارمەتی پێویستم بە هیچ شتێکی تر نییە.»

کاتێك جانکوشی گەورە کۆتاییی بە پاڕانەوەکەی هێنا قەشە دەست بە کتێبەوە رووی لە بووك و زاوا کرد و بە دەنگێکی نەرم و راوێژێکی خۆشەوە گوتی: ئەی خودای هەرمان، کە لێکهەڵبڕاوان بەیەك دەگەیەنیتەوە و دەیانکەی بە یەك، هەلی پێوەندیی پتەوی ئەوین بۆ ئەوان دەڕەخسێنی، ئەی یەزدانی مەزن کە ئیسحاق و رەبکات پیرۆز کرد و وادەی دوارۆژێکی باشت پێدان، ئەو بەندانەی خۆت کۆنستانتین و یەکاتریناش پیرۆز بکە و لە هەموو بوارێکی ژیاندا خێریان وەرێ بێنە. خودای بەخشەندە و دلۆڤان لە دەرگانەی تۆ دەپاڕێینەوە و دۆعا دەکەین کە پیرۆز بێ ناوی باوك و کوڕ و رۆحی پاکی خودا، ئەمڕۆ و هەمیشە و هەتا دنیا بەدنیایە. ئا... ئامین ـ دیسان ئاوازی کۆمبێژانی نادیار پانتای کلیساکەی داگرتەوە.

لەڤین لە دڵی خۆیدا گوتی: «لێکهەڵبڕاوان بەیەك دەگەیێنی و دەیانکەی بە یەك... ئەم وشانە چ مانایەکی قووڵیان هەیە و چەندە لەگەڵ هەستی ئەم کاتەی من سازگارن. یانی ئەویش ئەم هەستەی من لە دڵیدایە؟»

سەری وەرسووڕاند و دیتی کیتی چاوی لێدەکات.

حاڵەتی ئەو روانینە جۆرێکبوو کە بۆی دەرکەوت ئەو قسانە وەك ئەو شوێنی لەسەر دڵی کیتیش داناوە. بەڵام ئەو هەستەی ئەو راست نەبوو. کیتی لە مانای ئەو وشانەی نەگەیشتبوو و تەنانەت گوێشی بۆ رانەگرتبوو. تاقە هەستێك کە گیانی ئەوی داگرتبوو ئەوەندە بەهێز بوو و بەردەوام بەهێزتریش دەبوو کە نەیدەتوانی گوێیان بۆ بگرێ و مانایەکیان لێهەڵکرێنێ. ئەمەش هەستی شادییەك بوو کە دەیدی ئەوەی مانگ و نیوێك بوو هەڵیدەچۆقاند و لە ماوەی ئەم شەش حەوتووەدا دڵی پڕکردبوو لە شادی یان ئازاری دابوو ئێستا بە تەواوی پێیگەیشتبوو. ئەو رۆژە کە کراسە شەگەڵاتییەکەی لەبەردابوو و لە تەلاری ماڵەکەیان لە شەقامی ئاربات بێ ئەوەی لە ئەلفەوە بێتە بێ دڵی خۆی پێشکەش کرد، لەو رۆژەوە و لەو کاتەدا کەلێنێکی قووڵ لە گیانیدا وەدی هات کە ئەوی

لە رابردوو دابڕی و کەوتە سەر ڕێبازی ژیانێکی تەواو جیاواز کە هەتا ئەو کاتە نەیناسیبوو، ئەگەرچی لە دنیای ڕاستەقینەدا هەر ئەو ژیانە کۆنەکەی پێشوو بوو کە گرتبوویەبەر. ئەم شەش حەوتووە پیرۆزترین و لە ڕاستیدا پڕ ئازارترین دەورانی ژیانی بوو. تەواوی ژیانی و هەموو هیوا و تاسەکانی لە وجوودی ئەو پیاوەدا کۆ بووبۆوە کە ئەو هێشتا ئاگای لە بیروباوەڕ و حاڵی نەبوو و تەنیا هەستی دڵی، کە تەنانەت لەو پیاوەش نەناسراوتر بوو بۆی و هێندێ جار لەوی نزیك دەکردەوە و هێندێ جاریش دووری دەخستەوە، بە ئەوەوە پێوەندی دەدا. لەگەڵ ئەوەشدا هەر لە بارودۆخی ژیانی پێشوویدا بوو. درێژەی بە ژینی ڕابردووی خۆی دەدا و لە خۆی و کەمتەرخەمی و بێموبالاتییەك کە نەیدەتوانی بە سەریدا زاڵبێت و بە ژیانی ڕابردوویەوە گرێ دەدا. کەمتەرخەمی سەبارەت بە هەموو شتەکان و خووخدە و کەسانێك کە خۆشی دەویستن و خۆشیان دەویست، سەبارەت بە دایکی کە ئەم کەمتەرخەمییەی ئەو تووشی پەژارەی کردبوو و باوکە دڵۆڤان و دڵنەرم و لەسەرەخۆکەشی کە لە هەموو کەسی خۆشتر دەویست ترسی لێنیشتبوو. هێندێ جار لەو کەمتەرخەمییەی خۆی دەترسا و هێندێ جاریش لەوەی کە بووبووە هۆی ئەو کەمتەرخەمییەی، هەستی بە شادی دەکرد. نەیدەتوانی جگە لە ژیان لەگەڵ ئەو کەسە هیچ شتێکی تری بوێت یان بیر لە شتێك بکاتەوە. بەڵام ئەو ژیانە تازە هێشتا پێکنەهاتبوو و ئەو تەنانەت بە ڕوونی نەیهێنابووە بەرچاوی خۆی. تەنیا چاوەڕوانی و ترس و خۆشی لە دڵیدا بوو سەبارەت بەو شتە تازە و نەناسراوە. ئێستاش لەم ساتەدا، چاوەڕوانی و نەناسیاوی و پەشیمانی لە حاشاکردن لەو ژیانەی پێشووی هەمووی کۆتاییی پێدەهات و ژیانی تازە دەستی پێدەکرد. ئەم ژیانە نوێیە بەهۆی نەناسیاوییەکەیەوە ناچاربوو لێیبترسێ. بەڵام ترسناك بوون یان نەبوون، لە شەش حەوتوو لەمەوبەرەوە لە گیانیدا سەری هەڵدابوو و ئێستا تەنیا ئەو شتەی لە ڕۆحیدا گونجابوو لەم ڕێوڕەسمەدا پیرۆز دەکرا.

قەشە دیسان هاتەوە بۆ لای ڕەحلەکە و بە ئەسپایی ئەنگوستیلە ناسکەکەی کیتیی هەڵگرت و دەستی لەڤینی گرت و ئەنگوستیلەکەی کردە قامکی و گوتی: بەندەی خودا کۆنستانتین لەگەڵ کەنیزی خودا یەکاترینا پێوەندێکی هەتا هەتایی دەبەستن ـ ئەنگوستیلە زلەکەی لەڤینیشی لە قامکە ناسك و شلکەکانی کیتی کرد کە لە ڕادەبەدەر شووش و ناسك بوو و دیسان ئەو وشانەی پێشووی دووپاتکردەوە.

ئەو دوو دەزگیرانە چەند جار ویستیان تێبگەن کە چیبکەن بەڵام هەموو جارێك تووشی هەڵە دەبوون و قەشە بە سرتە ڕێنوێنیی دەکردن. ئاخری قەشە ئەو کارەی پێویست بوو کردی. بە ئەنگوستیلەکانەوە خاچی هەردووکیانی کێشا و دیسان ئەنگوستیلە گەورەکەیدا بە کیتی و

چکۆڵەکەیدا بە لەڤین و دیسان هەردووکیان پەشۆکان و تووشی هەڵە بوون و دووجار دەستاودەستیان بە ئەنگوستیلەکان کرد و ئاخری ئەو کارەی کە دەبوو بیکەن نەیانکرد.

دالی و چیریکۆڤ و ستیپان ئارکادیچ هاتنە پێشێ و دەستیان گرتن تاکوو ئەو کارەی کە شیاوە بەڕێوەی بەرن. ئاکامی کارەکە ئاڵۆزی و سرتوخورت و بزەبوو بەڵام ئەو رۆخۆشییە نەرم و پڕشکۆیە بووك و زاوای شلویێ نەکرد و بە پێچەوانە ئەو پەشۆکان و لێتێکچوونەی دەستیان وای لێکردن جیدیتر و رووخۆشتر لە پێشوو چاو لە چاوی یەکتر ببڕن. بە جۆرێك کە ستیپان ئارکادیچ، کاتێك پێیگوتن کە هەرکام ئەنگوستیلەی خۆیان لە قامك بکەنەوە بێ ئیختیار بزە لە لێوی تارا. هەستی کرد کە هەر چەشنە بزەیەك وەك سووکایەتی وایە بۆ پیرۆزیی ئەو هەستە پاك و نوێیەی ئەوان.

قەشە دوای گۆڕینەوەی ئەنگوستیلەکان دەستی کردەوە بە دۆعا کردن: خودایە، تۆ ئەوانت لە رۆژی بەرێوە بە ژن و پیاو ئافراندووە و ژنت بۆ یارمەتیی پیاو و خستنەوەی بەرە و بەردەوامیی مرۆڤ خولقاند. خودایە، تۆ بووی کە حەقیقەتت بۆ بەندەکانی خۆت و باوکانی ئێمە ئاشکرا کرد و بە هۆی پێغەمبەرانی خۆتەوە بەرە لە دوای بەرە پێتگەیاندن، بە چاوی کەرەم لەو بەندانەی خۆت کۆنستانتین و یەکاترینێش بڕوانە و پێوەندەکەیان لە ئیمان و یەکدڵی و حەقیقەت و ئەشقدا قایم و پتەو بکە...

لەڤین زیاتر هەستی دەکرد کە هەموو ئەندێشەکانی سەبارەت بە ژیانی هاوبەش و خولیاکانی لەمەڕ رێکخستنی ژیانییەوە هەمووی خەیاڵی منداڵانە بوون و زەماوەند شتێکە کە ئەو هەتا ئەو کاتە تێینەگەیشتووە و ئەمڕۆش ئەگەرچی ئەو کارە وەڕاست گەڕاوە، زیاتر لە رابردوو تووشی ئاڵۆزی و سەرلێشێواویی کردبوو. تووشی دڵەکوتەیەك بووبوو و جارلەگەڵ جار دڵی بە پڕتاو لێیدەدا و فرمێسك لە چاوانیدا قەتیسما و لە هەمبەر ئەو گریانەدا توانایی خۆڕاگریی نەما.

## پێنج

هەموو ناودارانی مۆسکۆ لە خزمان و ناسیاوان لە کلێسە ئامادەبوون. لە ماوەی رێوڕەسمی دیاریکردنی ئاییندا، پانتای کلێساکە یەکپارچە پڕشنگ و رووناکی بوو و لەنێو ژنان و کچاندا، کە هەموو خۆیان لە تەپڵی گوڵێ دابوو و پیاوانیش کە هەموو بۆینباخی سپی و فراك و یۆنیفۆرمیان لەبەردا بوو سرتوخورت و ئاخافتن بەردەوام بوو، بەڵام زۆر بە هیواشی

قسەیان دەکرد و ڕێزی شوێنەکەیان لەبەر بوو، قسەکانیش زیاتر لە لایەن پیاوانەوە دادەمەزرا چونکە ژنان نوقمی ڕوانینی وردەکارییەکانی ڕێوڕەسمە ئایینییەکە بوون کە هەمیشە شوێنی لەسەر دڵیان دادەنا.

لەنێو ئەو تاقمەدا کە نزیکبوون لە بووک و زاوا، دوو کەسیان خوشکی کیتی بوون: یەکیان دالی و ئەوی دیکەشیان خوشکی ناوبجی پرێنسس ناتالی لڤوڤای شۆخوشەنگ و لەسەرەخۆ بوو کە لە هەندەرانەوە هاتبۆوە.

خاتوو کارسۆنسکایا دەیگوت: ئەو سەیرە! ئەو مارییە بۆچی بۆ زەماوەند جلوبەرگی بنەوشی لەبەرکردووە؟ دەڵێی هاتووە بۆ کۆڕی پرسە و سەرەخۆشی؟

خاتوو درۆبتسکایا وەڵامی دایەوە: بەو ڕەنگی ڕوخسارەیەوە جگە لەوە چاری نییە، بەڵام ئەوەم پێ سەیرە ڕێوڕەسمەکەیان خستۆتە شەوێ" لەوانەیە ببێتە چاولێکەری.

کارسۆنسکایا هەناسەیەکی هەڵکێشا و وەڵامی دایەوە: شەوانە خۆشترە. زەماوەندەکەی منیش شەوێ بەڕێوەچوو ـ وەبیری هاتەوە کە ئەو ڕۆژە هەموو شتێك چەندە خۆش و شیرین بوو و مێردەکەی بە هۆی شەیدایی و دڵدۆڕاوییەوە گەلحۆی دەنواند و ئەمڕۆشی چەندە لەگەڵ ئەو ڕۆژە جیاوازە.

کۆنت سینیاڤین[5] کە بە چاوێکی تایبەت لە پرێنسس چارسکایا[6]ی شۆخوشەنگی دەڕوانی گوتی: دەڵێن ئەگەر پیاوێك زیاتر لە دە جار ببێتە برازاوا قەت خۆی نابێتە زاوا. من دەمویست بۆ دەیەم جار ئەو ئەرکە وەئەستۆ بگرم تاکوو لەو ئاریشەیە ڕزگار بم. بەڵام درەنگ وەخۆ کەوتم.

پرێنسس چارسکایا لە وەڵامی ئەودا تەنیا زەردەیەکی گرت. چاوی لە کیتی بڕیبوو و بیری لەوە دەکردەوە کە خۆشی کەنگێ و چۆن وەکوو کیتی لە پاڵ کۆنتدا ڕادەوەستێ تاکوو گاڵتەجاڕییەکەی ئەمڕۆی وەبیر بێتەوە.

ئیشچر باتسکی چاوی لە خاتوو نیکۆلایڤا[7] کرد کە قەرەواشێکی دەرباری و خاتوونێکی بەساڵاچوو بوو، گوتی: ویستوویەتی تاجەکە لەسەر شینیۆنی بووك دابنێ بۆ ئەوەی بەختەوەری بکات[8].

---

5- Sinyavin

6- Tcharskaya

7- Nikolayeya

٨- باو بوو کە برازاواکان لە ماوەی بەشێك ڕێوڕەسمی مارەبڕیندا تاجیان لەسەر سەری بووك و زاوا ڕادەگرت و ئەگەر تاجەکە بێ ئیختیار بکەوتایەتە سەر سەریان، لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە مزگێنی بەختەوەری پێوەیە.

خاتوو نیکۆلایڤا کە لەمێژ بوو بڕیاری دابوو ئەگەر بێوەپیاوێکی پیر کە هەوڵی دەدا دڵی لێبستێنێ زەماوەندی لەگەڵ بکات، حەزدەکا ڕێوڕەسمێکی زۆر سادە بەڕێوەبەرن گوتی: ڕاستت دەوێ شینیۆن زۆر شتێکی بێ مانایە! من قەت حەزم لەو داب و چاولێکەرییانە نییە.

سرگی ئیڤانڤیچ لەگەڵ داریا ئەلکساندرۆڤنا قسەی دەکرد و بە گاڵتە دەیویست پێیبسەلمێنێ کە دابی چوونە سەفەر دوای ڕێوڕەسمی شایی و زەماوەند بەو هۆیە پەرەی ساندووە کە بووك و زاوا هەمیشە بۆ ئەو کارەی کردوویانە هێندێك شەرم دەکەن.

ـ براکەت جێیخۆیەتی شانازی بکات. کیتی لە ڕادەبەدەر شیرین و دەلالە. من پێموایە ئێوە ئێرەیی پێدەبەن.

سرگی ئیڤانڤیچ وەڵامی دایەوە: داریا دیمیتریۆڤنا، من لەمێژە ئەو هەلومەرجەم تێپەڕاندووە ـ ئەوەی گوت و ڕوخساری حاڵەتێکی جیددیی بە خۆوە گرت و شوێنەواری پەژارەی تێدا وەدیار کەوت.

ستیپان ئارکادیچ خەریکی گێڕانەوەی نەقڵێك بوو کە بۆ جیابوونەوە سازی کردبوو، ژنخوشکەکەشی گوێی بۆ شل کردبوو.

ژنخوشکی کە چاوی لە دەمی ئابلۆنسکی بوو گوتی: دەبێ نیوە تاجەکەی بۆ دروست بکەین.

کۆنتس نۆردستۆن بە پرێنسس لۆوڤای گوت: زۆر بە داخەوە کیتی ئەو جوانییەی جارانی نەماوە. لەگەڵ ئەوەشدا هەر تاڵەموویەکی سەدی وەك لەڤین دێنێ. وانییە؟

پرێنسس لۆوڤا وەڵامی دایەوە: نا، من زۆرم خۆشدەوێ. هەڵبەت نەك لەبەرئەوەی لە داهاتوودا دەبێتە مێردی خوشکم. بەڵکوو لەبەرئەوەی زۆر پیاوێکی ساکار و بێدەغەڵەیە. چونکە زۆر لە سەرەخۆیە و بەوەشدا دیارە کە لەم بارودۆخە هەستیارەدا ویقاری سروشتیی لە دەست نەداوە و وەك هێندێکەس نەشڵەژاوە کە گەلحۆ بنوێنێ. هەڵسوکەوتی ناسروشتیشی نییە و دیارە ئەو ڕێوڕەسمە شوێنێکی قووڵی لەسەر ڕۆحی داناوە.

ـ وادیارە ئەو زەماوەندە بۆ ئێوە چاوەڕوان نەکراو نەبووە.

ـ دەکرێ بڵێین نەبووە. کیتی هەمیشە ئەوی خۆشویستووە.

ـ چاکە، با بزانین کامیان لە پێشدا پێ دەنێتە سەر فەڕشەکە. من کیتیم حاڵی کردووە.

لۆوڤا وەڵامی دایەوە: جیاوازیی نییە. ئێمە ژنان هەموومان کەوی و سەرلە پێناوین. ئەوەش لە ڕۆح و زاتماندایە.

ـ بەڵام من بە ئانقەست بەر لە ڤاسیلی پێمنایە سەر فەڕشەکە. تۆ چی دالی؟

دالی لە تەنیشت ئەوان راوەستابوو و گوێی لە قسەکانیان بوو بەڵام وەڵامی نەدایەوە. هەستی شادییەك رۆحی لەخۆیەوە پێچابوو، چاوی پڕ بووبوو لە فرمێسك و زاری بکردایەتەوە لە قولپەی گریانی دەدا. زۆری ئەو پێوەندییەی کیتی و لەڤین بەدڵ بوو. شایی لە دڵیدا دەگەڕا. شووکردنەکەی خۆی وەبیرهاتەوە و چاوێکی لە ستیپان ئارکادیچ کرد کە شادی و نەشە لە سەروڕووی دەباری و خەمەکانی ئێستای لەبیرچۆوە، تەنیا بیری لە یەکەم ئەشقی خۆی دەکردەوە کە پاك و بێگەرد بوو. ئەو نەك هەر زەماوەندەکەی خۆی بەڵکوو هی هەموو ژنانی خزم و ناسیاوی لەبیربوو. ئەوانی هەر لەو کاتە هەڵکەوتە و پڕشکۆیەدا هێنایە بەرچاوی خۆی، ئەو کاتەی کە ئەوانیش وەکوو کیتی، بە دڵێکی پڕ لە ئەوین و ترس و هیواوە لە ژێر تاجی بووکێنیدا راوەستابوون و روویان لە ژیانی رابردوویان وەرگێڕابوو و پێیان دەنایە هەرێمی نادیاری داهاتووەوە. لەنێو ئەو بووکانەدا کە یادیان لە دڵیدا زیندوو بووبۆوە بیری لە ئانای خۆشەویستی دەکردەوە کە گریمانەی جیابوونەوەکەی کەمتاکورتێك بیستبوو. ئەویش رۆژێك بەو پاکییەوە بە تارایەکی رازاوە و بەهارنارنجەوە لە ژێر تاجێکی وەکوو ئەم تاجەدا راوەستابوو و ئەمڕۆش لە چ حاڵێکدا بوو.

تەنیا خوشکان و خزمان نەبوون کە لە رێوڕەسمی مارەبڕیندا بەشداربوون و بە وردی دەیانڕوانی، بەڵکوو ژنانی بێگانەش بۆ تەماشاکردن هاتبوون و بە هەیەجان و دڵەخورپەوە و موو بەموو هەڵسوکەوت و حاڵەتی سیمای بووك و زاوایان خستبووە ژێر چاوەدێری تاکوو هیچ پاژ و خاڵێکی رێوڕەسمەکەیان لە دەست دەرنەچێت و بە تووڕەیی گوێیان لە قسەی پیاوان دەخەواند کە نەقڵیان دەگێڕایەوە و بیروڕایان دەردەبڕی و تەنانەت هەر گوێشیان لێنەبوو.

ـ بۆ ئاوا دەگری؟ رەنگە بە زۆر دابێتیان بە شوو؟

ـ چۆن دەکرێ رازی نەبێ شوو بە پیاوێکی ئاوا جوانچاك بکات. دەڵێی پرێنسسە، وانییە؟

ـ ئەوە خوشکیەتی کە جلوبەرگی ئەتڵەسیی سپیی لەبەرکردووە؟ گوێت لێیە جانکوش چۆن دەنەڕێنێ: ژن دەبێ لە مێردەکەی بترسێت و لە قسەی دەرنەچێت.

ـ ئەوانە دەستەی چوودۆڤسکین[9] کە ئاواز دەچڕن؟

ـ نا، سەر بە شۆڕای ناوەندیی کەنیسەن.

---

9- Tchoudovski

ـ لە نۆکەرەکەیم پرسی: وادیارە لەڕێوە دەیبات بۆ گوندەکەیان. دەڵێن زۆر دەوڵەمەندە. هەر لەبەر ئەوش کچەکەیان پێداوە.

ـ نا، هەردووکیان زۆر باشن و دەڵێی خودا بۆ یەکتری داناون.

ـ بڕوانە، خاتوو ماریا ڤاسیلییڤنا[10] تۆ ئەو هەموو دەمەقاڵێیەت کرد کە کراسی کارنالین دابی نەماوە، چاوی لێکە، ئەو ژنەی کە کراسی خەنەیی لەبەرکردووە، دەڵێی ژنە باڵوێزە. چەندەش جوانە!

ـ ئەیەڕۆ، تۆ تەماشای بووك بکە، چەندە نازەنینە. هێند جوانە دەڵێی کۆترە. هەرچی دەیڵێن با بیڵێن، ئێمە ژنان چەند چارەڕەشین، دڵم بە خۆمان دەسووتێ.

ئەوانە هەمووی قسەی ئەو تەماشاچییانە بوون کە توانیبوویان بچنە نێو کلیساکەوە.

## شەش

کاتێك ڕێورەسمی مارەبڕین کۆتایی پێهات، مجێورێك پەڕۆیەکی هەوریشمینی گوڵێڕەنگی لەنێو کلیساکە و لەبەر ڕەحلەکەدا ڕاخست. کۆڕی کۆمبێژان دەستیان کرد بە چڕینی سروودێکی ناسك و ئاڵۆز کە لەودا گۆرانیبێژانی "باس" و "تێرۆن" بۆ یەکیان دەساندەوە و قەشە سەری بۆ لای بووك و زاوا سووڕاند و داوای لێکردن بچنە سەر پەڕۆ گوڵڕەنگەکە. ئەگەرچی هەردووکیان زۆریان بیستبوو کە بەپێی ئەو باوەڕە ڕەشۆکیانەیە هەرکامیان لە پێشدا پێبنێتە سەر فەرشەکە دەبێتە بەڕێوەبەری بنەماڵە و زاڵدەبێ بەسەر ئەوی دیکەدا، کاتێك کە ئەو چەند هەنگاوەیان هەڵێنایەوە هیچ کامیان ئەوەیان لە بیرنەبوو. تەنانەت گوێیان لە قسە و بیروڕای دەوروبەرییان و مشتومڕەکانیشیان نەبوو کە هەرکەسەی شتێکی دەگوت. هێندێك لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە دیتوویانە لە پێشدا لەڤین پێی ناوەتە سەر فەرشەکە و تاقمێکی تر دڵنیابوون کە هەردووکیان پێکەوە چوونەتە سەری.

دوای چەند پرسیاری ئاسایی کە حەزدەکەن ژیانی هاوبەش پێکبێنن و یان بەڵێنی زەماوەندیان بە کەسێکی تر نەداوە و وەڵامێك کە لە گوێی خۆشیاندا زایەڵەیەکی غەریبی هەبوو ڕێورەسمی دۆعایەکی

---

10- Maria Vassilievna

تر دەستی پێکرد. کیتی گوێی بۆ وشەی دۆعاکە ڕاگرتبوو و هەوڵی دەدا لە ماناکەیان بگات. بەڵام نەیدەتوانی. هەرچەندە ڕێوڕەسمەکە بەرەو پێشەوە دەچوو هەستێکی پڕ لە شادی و ڕوون و پڕشکۆ گیانی کیتیی دادەگرت، بەجۆرێك کە کەلاوریژی دەکرد و سەرنج و بیرکردنەوەکانی دەئالۆزاند.

دیسان دۆعایان خوێند: خودایە پاکی و هەبیسییان پێعەتا بفەرموو، هەناوی ئەو وەبەرهێن و پیرۆز بکە و چاو و دڵیان بە دیتنی کوڕان و کچانی زۆر ڕووناك بکەوە و شادی بخە دڵیانەوە ـ وەبیریان هێنانەوە کە خودا ژنی لە پەراسووی ئادەم ئافراندووە و بەو هۆیە پیاو دایك و باوکی خۆی بەجێ دێڵێ و لەگەڵ ژنەکەی ئاوێتە دەبێ، هەر وەکوو ڕۆحێك لە دوو جەستەدا. ئەوەش ڕازێکی گەورەیە ـ دۆعاشیان کرد کە خودا عەولادی زۆریان پێعەتا بکات و پێوەندەکەیان پیرۆز و مەبارەك بکات، هەر وەك ئیسحاق و ڕەبکا و یۆسف و زلێخا و مووسا و سەفووڕا خودا تەمەنی درێژی پێبەخشین تاکوو نەوە و نەدیدەی خۆیان ببینن. کیتی کە ئەو قسانەی بیست لە دڵی خۆیدا گوتی «ئەوانە هەمووی جوانن! نابێ جگە لەوەش بێ.» بزەیەکی شیرین لەسەر ڕوخسارە جوان و پڕترووسکەکەی درەوشایەوە و بێ ئیختیار شوێنی لەسەر هەموو ئامادەبووان دانا.

کاتێك قەشە گوتی تاجیان لەسەر بکەن کەسێك لەنێو کۆڕەکەدا گوتی: بە تەواوی لەسەری بنێ! ئیشچر باتسکی بە دەستی لەرزۆك و دەستکێشی سێ قۆپچەوە تاجەکەی دوور لە سەری کیتی ڕاگرتبوو.

کیتی بە پێکەنینەوە لەسەرەخۆ گوتی: لە سەرمینێ!

لەڤین سەری وەرسووڕاند و چاوی لێکرد و سەری لەو پڕشنگی شادییە سووڕما کە ڕوخساری کیتیی داگرتبوو و ئەم هەستە بێ ئیختیار ئەویشی داگرت و ڕوخساری ئەویش وەك ڕوخساری کیتی درەوشایەوە.

لەگەڵ ئەوەی یەکێك لە سیپارەکانی پێغەمبەرانیان خوێندەوە و دوایین ئایەتی ئینجیل بە دەنگی بەرز و گڕی جانکوش پانتای کلیساکەی داگرت و بە تایبەت تەماشاچییانی غەوارە بە تامەزرۆییەوە چاوەڕوانی بیستنی بوون، شادیی خستە دڵی بووك و زاواوە. کاتێکیش بە پەرداخی پەل شەڕابی سوور و گەرم و ئاویان خواردەوە دڵیان لێوڕێژ بوو لە شادی و کە قەشە عەباکەی خۆی لادا و دەستی هەردووکیانی گرت، دەنگی گڕی گۆرانیبێژێك بە هەوایەکی خۆش کلیساکەی داگرت «ئەشعیا دڵشادبە!» کە بووك و زاوایان بە دەوری ڕەحلەکەدا گێڕا شادییەکەیان بەوپەڕی خۆی گەیشت. ئیشچر باتسکی و چیریکۆڤیش کە تاجەکانیان لەسەر

سەریان ڕاگرتبوو و بە دووچکەی درێژی داوێنی بووك پێدەکەنین کە لە دووی دەکشا و جاروبار دەکەوتە ژێر پێیان خۆشیان نەیاندەزانی بۆچی شاد و بەنەشەن و هێندێ جار لە بووك و زاوا وەدوا دەکەوتن و کە قەشە دەچووە پێشێ و بووك و زاوا ڕادەوەستان خۆیان دەدا بە پشتیاندا. ترووسکەی شادی کە ڕوخساری کیتیی داگرتبوو دەتگوت هەموو ئامادەبووانی نێو کلیساکەشی داگرتووە. لەبەر چاوی لەڤین تەنانەت قەشە و جانکوشیش وەك خۆی شاد و بە نەشە بوون.

قەشە کاتێك گوتی تاجەکانیان لەسەر لابەن، دوایین دۆعایان خوێند و پیرۆزباییی پێگوتن. لەڤین چاوێکی لە کیتی کرد و قەلافەتی جۆرێك هاتە بەرچاوی کە هەتا ئەو کاتە قەتی ئاوا نەدیتبوو. درەوشانەوەی تازەی بەختەوەری ڕوخساری لە جاران سەرنجراکێشتر کردبوو. لەڤین حەزی دەکرد شتێك بڵێ بەڵام نەیدەزانی ڕێوڕەسمەکە تەواوبووە یان نا. قەشە لە دەست ئەو دڕدۆنگییە ڕزگاری کرد. بزەیەکی نەرم لێوە مێهرەبانەکانی لێکئاوەڵا کرد. مۆمەکانی لە دەستیان وەرگرت و زۆر لەسەرەخۆ گوتی: ژنەکەت ماچ بکە و تۆش مێردەکەت ماچ بکە.

لەڤین زۆر بە پارێزەوە و بە ئەسپایی لێوانی پڕبزەی کیتیی ماچکرد و باوەشی کردەوە تاکوو لە ئامێزی بگرێ و نزیکیی سەیری ئەو کە تازە بوو بەلایەوە، بە دەستی هەستی پێدەکرد، پاشان بە دڵێکی شادەوە لە کلیسا چووەدەرێ. باوەڕی نەدەکرد، نەیدەتوانی بڕوا بکات کە ئەوانە خەون نییە و ڕاستەقینەیە. تەنیا کاتێك کە ڕوانینی پڕ لە واقوڕمان و شەرمێونی یەکتریان دی باوەڕیان کرد، چونکە هەستی کرد کە ئێستا بوونەتە گیانێك لە دوو جەستەدا.

هەر ئەو شەوە دوای شێو خواردن بەرەو دێ وەرێکەوتن.

## حەوت

ڤرۆنسکی و ئانا سێمانگ بوو پێکەوە لە ئەورووپا دەسووڕانەوە. وێنیز و ڕۆم و ناپل گەڕابوون و تازە گەیشتبوونە شارۆچکەیەك کە دەیانویست ماوەیەك لەوێ بمێننەوە.

سەرکاری پێشخزمەتەکان کە ژنێکی جوان و لەبار بوو و قژە پڕ و ڕۆنلێدراوەکەی لە پشتی سەرییەوە کردبوویە دوو کەرتەوە و فراکی لەبەردا بوو و بەروانەکەیەکی سپی و فش و ناسك بەرۆك و کراسەکەی ڕازاندبۆوە و ڕیزێك پەێکەرەی ورد و ناسکی بە زریزەیەکەوە لە سەر زگە خڕەکەی هەڵواسیبوو و سەرنجی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا، دەستی لە گیرفانی نابوو، وەك ئەوەی

خۆی بنوێنێ و بازاڕ گەرمی بکات بە نازەوە چاوی چکۆڵە دەکردەوە و بە خۆشیرین کردنێکی وشکەوە وەڵامی پیاوێکی دەدایەوە کە بەرەوڕووی راوەستابوو. کە گوێی لە ترپەی هەنگاو بوو لەوبەری دالانی هۆتێلەکەوە بە پلیکانەکاندا سەردەکەوتن ئاوڕی دایەوە و کە چاوانی بە کۆنتی رووسی کەوت، هەر ئەو کەسەی کە باشترین ژووری هۆتێلەکەی گرتبوو، بە رێزەوە دەستی لە گیرفانی دەرهێنا و کڕنۆشێکی کرد و گوتی کە راسپاردەیەك هاتووە و هەڤاڵی هێناوە کە کاری ئیجارەی کۆشکەکە سەری گرتووە و راوێژکار ئامادەیە گرێبەستەکە واژۆ بکات.

ڤرۆنسکی گوتی: ئەها، زۆر چاکە، زۆرم پێخۆشە! خاتوون لێرەیە یان نا؟

پێشخزمەت وەڵامی دایەوە: خاتوون تەشریفی بردبوو بۆ پیاسەکردن بەڵام ئێستا گەڕاوەتە.

ڤرۆنسکی کڵاوە نەرم و شەپکە پانەکەی لە سەری داگرت و بە دەسرەیەك ئارەقەی ناوچاوان و سەری سڕی کە هێشتبوویە و هەتا نیوەی گوێچکەی داپۆشیبوو و بۆ لای دواوە لایدابوو تاکوو تاسییەکەی بشارێتەوە. پەشۆکاوانە چاوێکی لەو پیاوە کرد کە هێشتا لەوێ راوەستابوو و تەماشای دەکرد، دەیویست تێپەڕێت و بڕوات.

سەر پێشخزمەت گوتی: ئەم پیاوە رووسییە و لە ئێوە دەگەڕێ.

ڤرۆنسکی زۆر بە وەڕەزییەوە، لەوەی کە نەیدەتوانی بچێتە شوێنێك و ئاشنا و رۆشنا لێیقوت نەبنەوە بە ئاواتی نەدۆزینەوەی کەرەسەیەکی رابواردن کە بتوانێ یەکهاوی بوونی ژیانی قەرەبوو بکاتەوە، چاوێکی تری لەو پیاوە کرد کە چووبووە دواوە و دوورتر راوەستابوو، لە ساتێکدا trووسکەی شادی لە چاوی هەردووکیاندا درەوشایەوە.

ـ گالنیشچێڤ!

ـ ڤرۆنسکی!

بەڕاستی گالنیشچێڤ بوو، هاوڕێی فێرگەی سەربازیی. ئەم گالنیشچێڤە لە فێرگە لایەنگری داروەستەی لیبراڵەکان بوو، بە جلی مەدەنییەوە لە فێرگە دەهاتەدەرێ و هیچ خزمەتێکی بە ئەرتەش نەدەکرد. ئەوان دوای فێرگە لە یەکتر دابڕان و دواتریش تەنیا جارێك چاویان بە یەکتر کەوتەوە.

لەم دیدارەدا ڤرۆنسکی بۆی دەرکەوتبوو کە گالنیشچێڤ رێبازی لیبراڵە توندئاژۆکانی هەڵبژاردووە و دەیهەوێ بە چاوی سووکایەتی لە کار و پلەوپایەی ئەو (یانی ڤرۆنسکی) بڕوانێ. بەو هۆیە زۆر بە ساردی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکرد و زۆر بە چاوێکی سووك تەماشای دەکرد، ئەمەش کارێك بوو کە زۆری لێشارەزا بوو و مانای ئەو کارەشی ئەوەبوو: «شێوەی ژیانی منت بە دڵ بێ یان بە دڵ نەبێ بۆ من هیچ جیاوازییەکی نییە، بەڵام ئەگەر

دەتهەویٚ لەگەڵ من هەستی و دانیشی دەبیٚ ریٚزم بۆ دانیٚی.» گالنیشچیٚڤ بە چاویٚکی سووك و بیٚموبالاتانە دەیڕوانییە راویٚژ و کردەوەی و ڤرۆنسکی، ئەم دیدارە لە رواڵەتدا دەبوو ئەوان بە جاریٚ لە یەکتر بتاریٚنیٚ. بەڵام ئیٚستا بە دیتنی یەکتر ترووسکەی شادی لە چاویاندا درەوشایەوە و هاواری شادییان لیٚهەستا. ڤرۆنسکی بڕوای نەدەکرد بە دیتنی گالنیشچیٚڤ تا ئەو رادەیە خۆشحاڵ بیٚت بەڵام ویٚدەچوو ئاگای لە قووڵاییی خەم و خەفەتەکانی خۆی نەبیٚت. شویٚنیٚکی ناخۆش کە دوایین دیداریان لەسەر دڵی دانابوو لە بیری بردەوە و بە روویەکی خۆشەوە چوو بۆ لای و بۆ تەوقە دەستی بولای هاوڕیٚی پیٚشووی خۆی بردە پیٚشیٚ. ئەو شادی و رووخۆشییە لە روخساری گالنیشچیٚڤدا جیٚگای دڵگرانییەکەی سەرەتای گرتەوە.

ڤرۆنسکی بە زەردەیەکی دۆستانەوە ددانە سپی و قایمەکانی وەدیارخست و گوتی: زۆر بە دیتنت خۆشحاڵم!

ـ بۆ نەچنییە ژووریٚ؟ دەی، ئیٚستا خەریکی چیی؟

ـ من دوو ساڵە لیٚرەم، کار دەکەم.

ڤرۆنسکی بە هۆگرییەکی زۆرەوە گوتی: دوو ساڵ! با بچینە ژووریٚ!

بەجیٚی ئەوەی بۆ شاردنەوەی قسەکانی بە رووسی قسە بکات، بەپیٚی خدەی رووسەکان بە زمانی فەرەنسی گوتی: تۆ لەگەڵ خاتوو کارنینا ئاشنایەتیت هەیە؟ ئیٚمە پیٚکەوە هاتووین بۆ سەفەر. من دەچم بۆ لای ئەو ـ ئەوەی گوت و بە وردی چاوی لە روخساری گالنیشچیٚڤ بڕی.

گالنیشچیٚڤ بە خویٚنساردییەوە وەڵامی دایەوە: سەیرە، نەمزانیبوو (ئەگەرچی دەشیزانی) گوتیشی: لەمیٚژە هاتووی؟

ڤرۆنسکی جاریٚکی تر لە روخساری دۆستەکەی ورد بۆوە و وەڵامیدایەوە: من؟ سیٚ رۆژە هاتووم.

ڤرۆنسکی حاڵەتی روخساری گالنیشچیٚڤی بۆ دەرکەوت و لە دڵی خۆیدا گوتی «بەڵیٚ، وادیارە مرۆڤیٚکی باشە و ئەو جۆرەی کە شیاوە لەگەڵ مەسەلەکان بەرەوڕوو دەبیٚت.» تیٚگەیشت کە دۆستەکەی بە ئانقەست مەبەستی باسەکەی گۆڕیوە و بەخۆی گوت «بەڵیٚ، دەکریٚ بە ئانای بناسیٚنم. دەزانیٚ چۆن لەگەڵ مەسەلەکە بەرەوڕوو بیٚ.»

ڤرۆنسکی لەو سیٚ مانگەدا کە لەگەڵ ئانا لە هەندەران گوزەراندبووی، هەرجاریٚك کە تووشی کەسانیٚکی ناسیاو دەبوو، ئەو مەسەلەیە لەبەر دەمیدا زەق دەبۆوە کە بۆچوونی ئەو کەسە سەبارەت بە ئانا چۆن دەبیٚ و زۆر جار بۆچوونی پیاوەکانی بە شتیٚکی «شیاو» دەهاتە بەرچاو. بەڵام ئەگەر لە ئەو و لەو کەسانەی کە لەگەڵ مەسەلەکە بە شیٚوەیەکی «شیاو»

بەرەوڕوو بووبوون پرسیارت بکردایە کە شیاوبوونی ئەو بۆچوونە لەچیدایە نە ئەو دەیزانی چ وەڵامێك بداتەوە نە کەسەکانی تر.

لە راستیدا بە بڕوای ڤرۆنسکی باش لەگەڵ مەسەلەکە بەرەوڕوو دەبوون و بەهیچ جۆرێك تێینەدەگەیشتن و بە گشتی لەگەڵیدا هەر بەو شێوەیە هەڵسوکەوتیان دەکرد کە مرۆڤە عاملاو و راهێنراوەکان لەگەڵ کێشەی دژوار کە رێگە چارەیەکیان هەیە و لە ژیاندا لە هەموو لایەکەوە تووشیان دەبێت هەڵسوکەوت دەکەن، یانی بە شێوەیەکی ماقووڵانە پارێزی لێدەکەن و بۆ ئاماژەکردن و پرسیاری نابەجێ و لە دڵگران سەبارەت بە ئەوان خۆ دەبوێرن. واش دەنوێنن کە لە گرینگایەتی و مانای بارودۆخەکە بە جوانی تێدەگەن، قەبووڵیانە و تەنانەت پەسەندی دەکەن بەڵام باسکردنی بە شتێکی نابەجێ و شوورەیی دەزانن.

ڤرۆنسکی لەڕێوە تێگەیشت کە گالنیشچێڤ یەکێك لەو کەسانەیە و بەم هۆیەش لە دوولایەنەوە بەو دیدارەی ئەو خۆشحاڵ بوو. بەڕاستیش هەڵسوکەوتی گالنیشچێڤ لەگەڵ ئانا، کاتێك بە یەکی ناساندن، جۆرێك بوو کە ڤرۆنسکی چاوەڕوانیی نەدەکرد. دیاربوو ئەو بەبێ هەوڵدان خۆی لە هەموو باسێك دەبوێرێ کە لەوانەیە بە جێیەکی ناسك بگات.

ئەو پێشتر ئانای نەدیتبوو و سەری لەو جوانی و سادەییەی هەڵسوکەوتی لەو بارودۆخە تایبەتەدا سووڕما. کاتێك ڤرۆنسکی لەگەڵ دۆستەکەی چوو بۆ لای ئانا سوورهەڵگەڕا و ئەو شەرمە منداڵانەیە کە روخسارە کراوە و جوانەکەی داگرت شوێنی لەسەر گالنیشچێڤیش دانا و گەشایەوە. بەڵام ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر سەرنجی راکێشا ئەوە بوو کە ئانا لەڕێوە و وەك بڵێی بە ئانقەست، بۆ ئەوەی میوانەکەیان خراپ بیرنەکاتەوە بە ڤرۆنسکیی گوت «ئەلکسی» و داوای لێکرد کە پێکەوە بچن بۆ ماڵە تازەکەیان کە لەوێ «پالاتسۆ» (کۆشك)یان پێدەگوت. ئەو کردەوەی ئانا کە نیشاندەری بارودۆخی نائاسایی و سادە و ساکاری ئەو بوو شوێنێکی باشی لەسەر دڵی گالنیشچێڤ دانا. گالنیشچێڤ کە هەردووکیان واتە ڤرۆنسکی و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی دەناسی بە دیتنی ئاکاری خاکەڕایانە و گورجی و نەشەی ئانا هەستیکرد کە بە تەواوی لە حاڵوباڵی دەگات. پێی وابوو ئەوەی کە ئانا خۆی بە هیچ شێوەیەك تێیناگات ئەو تێیدەگات ـ یانی ئەوەی کە چۆن دەتوانێ دوای ئەوەی قوڕی بەسەری مێردەکەیدا کردووە و ئەوی لەگەڵ کوڕەکەی بەجێ هێشتووە و ناوی خۆی زڕاندووە، ئاوا شاد و دڵخۆش و بەختەوەر بێ و گورج و بەگوڕ و بە دەماخ بێت.

گالنیشچێڤ گوتی: بەڵێ، شی کردنەوەکەی لە ڕێنوێنی جیهانگەردیدا هاتووە ـ مەبەستی ئەو کۆشکە بوو کە ڤرۆنسکی دەیویست بەکرێی بگرێت: تابلۆیەکی تینتۆرێتۆی[11] تێدایە و لە بەرهەمەکانی ئەم دواییانەیەتی.

ڤرۆنسکی رووی لە ئانا کرد و گوتی: دەزانی، هەواکەی زۆر خۆشە. وەرە با بەپێیان بچین بۆ ئەوێ و جارێکی تر چاومان پێیبکەوێت.

ئانا گوتی: زۆر چاکە، ئەوا دەچم کڵاوەکەم دێنم ـ لە نزیك دەرگا ئاوەڵاکە راوەستا و چاوێکی پڕپرسیاری لە ڤرۆنسکی کرد و دیسان روخساری سوورهەڵگەڕا. پرسیی: گوتت هەواکەی گەرمە؟

ڤرۆنسکی بە روانینەکەیدا تێگەیشت کە نازانێ ئەو (یانی ڤرۆنسکی) حەزدەکات کە هەڵسوکەوتی لەگەڵ گالنیشچێڤ چۆن بێ و دەترسا ئاکاری لەگەڵ ئەودا بەو جۆرە نەبووبێت کە ئەو بە شیاوی دەزانێ.

ڤرۆنسکی دوای روانینێکی گەرم و تیژامانێکی ئاشقانە لە روخساری ئانا گوتی: نا، زۆریش نا.

ئانا پێیوابوو لە مەبەستەکەی ڤرۆنسکی گەیشتووە و لەوەش گرینگتر ئەوەبوو کە ڤرۆنسکی لێیڕازییە. زەردەیەکی گرت و گورج و خێرا لە دەرگاکە چووەدەرێ.

هاوڕێکان چاوێکیان لە یەکتری کرد. شوێنەواری شڵەژان لە روخساری هەردووکیاندا خۆی دەنواند. وەك ئەوە وابوو کە گالنیشچێڤ، کە بە ئاشکرا تاریفی ئانای دەکرد دەیویست سەبارەت بە ئانا شتێك بڵێ بەڵام دەترسا قسەیەکی نەشیاو لە زاری بێتە دەرێ و ڤرۆنسکیش دەیویست شتێك بڵێ و هەر لەوە دەترسا.

ئاخری ڤرۆنسکی بە مەبەستی ئەوەی سەری قسە بکاەوە گوتی: دەی، ئاووا! کەوایە تۆ بوویە دانیشتووی ئێرە ـ کە وەبیریشی هاتەوە بیستبووی کە گالنیشچێڤ خەریکی نووسینی کتێبێکە گوتیشی: هەر خەریکی ئەو کارەی؟

گالنیشچێڤ وەڵامی دایەوە: بەڵێ، خەریکی نووسینی بەشی دووهەمیم ـ زۆری ئەو پرسیارەی ڤرۆنسکی پێخۆش بوو و لە خۆشیانا سوورهەڵگەڕا. لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: یانی ئەگەر راستییەکەیت دەوێ هێشتا نەمنووسیوە، خەریکی ئامادەکردنی چوارچێوە و دەسپێکەکەیم. بەڵگەی بۆ کۆدەکەمەوە. ئەم بەشەی دووهەم زۆر پڕ وردەکارییە و دەکرێ

---

11- Tintoretto

بلّێیت هەموو مەسەلەکان لەخۆ دەگرێت. ئێمەی رووسی نامانهەوێ تێبگەین کە میراتگرانی بیزانسین ـ بە شۆر و شەوقێکی زۆرەوە بە وردی دەستیکرد بە روونکردنەوەی مەسەلەکە.

ڤرۆنسکی سەرەتا دڵگران بوو چونکە سەبارەت بە بەشی یەکەمی ئەو بەرهەمە، کە نووسەرەکەی بە ناسیاو دادەنا و لەمەڕ ئەوەوە قسەی دەکرد هیچی نەدەزانی، بەڵام دواتر کە گالنیشچێڤ دەستیکرد بە روونکردنەوەی بیرۆکەکانی خۆی، ڤرۆنسکی دیتی کە دەتوانێ پێوشوێنی باسەکە بگرێ، ئەگەرچی لەگەڵ ناوەرۆکی ئەو کتێبەش ئاشنا نەبوو بەڵام بە هۆگرییەوە گوێی بۆ شل کردبوو چونکە گالنیشچێڤ زۆر زۆر زمانپاراو و راوێژخۆش بوو. بەڵام ڤرۆنسکی سەری سووڕما کە دیتی گالنیشچێڤ لە کاتی شیکردنەوەی مەبەستەکەیدا تووشی هەیەجانێکی سەیر بووە و تا رادەیەك رقیشی هەستاوە، بۆیە زۆری پێناخۆش بوو. لە دەربڕینی مەبەستەکەیدا هەتا زیاتر دەچووە پێشێ چاوانی زیاتر ترووسکەی دەهات و بە تووڕەییەکی زیاترەوە دەیگوڕاند بەسەر نەیارە خەیاڵییەکانیدا و حاڵەتی روخساری ترسناکتر و رەنجاوتر دەبوو. کە منداڵیی گالنیشچێڤی وەبیردەهاتەوە و ئەو کاتە کوڕێکی لاواز و گورجوگۆڵ و نەجیم و دڵپاك بوو و هەمیشەش لە پۆلەکەیاندا یەکەم بوو، بە هیچ شێوەیەك نەیدەتوانی لە هۆکاری ئەو شێواوییەی تێبگات و پەسندی بکات. بەتایبەت لەوە دڵگران بوو کە گالنیشچێڤ کە خۆی لە رەچەڵەکێکی رێزدار و هێژا بوو خۆی لە ریزی ئەو قەڵەم بەدەستانە دادەنا کە دەیانڕەنجاند و ئەو زۆریان لێتووڕە و دڵمەند بوو. یانی ئەوە کارێکی شیاو بوو؟ ڤرۆنسکی ئەوەی پێخوش نەبوو بەڵام جگە لەوەش هەستی دەکرد کە گالنیشچێڤ مرۆڤێکی بەختەوەر نییە و دڵی پێیدەسووتا. روخساری گرژ و تووڕەی کە تا رادەیەك سەرنجڕاکێش بوو و شوێنەواری چارەڕەشی و تەنانەت ئاڵۆزیی فیکر و هۆشی پێوە دیاربوو، کاتێك ئاناش هاتەوە ئاگای لێنەبوو و هەروا بە شۆر و تاڵووکەوە درێژەی بە دەربڕینی بیر و بۆچوونەکانی خۆی دا.

کاتێك ئانا کڵاو لەسەر و چارۆکە لە کۆڵ هاتەژوورێ و دەستە ناسکەکانی لەسەر چەتری هەتاوی دەگێڕا و لە پەنای ئەودا راوەستا، ڤرۆنسکی هەستی بە ئۆخژنێك کرد و خۆی لە چنگ روانینی پڕشکایەتی گالنیشچێڤ دەرباز کرد کە وەك سنگ لەسەر ناوچاوانی چەقیبوو، بەشەیداییەکی تازەوە چاوی لە هاودەمی شۆخوشەنگ و خۆشەویستی خۆی کرد کە هەستی دەکرد ئەشقی ئەو لە گیان و دڵ و ژیانی ئاژین بووە. گالنیشچێڤ زۆر بە زەحمەت وەخۆ هاتەوە و سەرەتا خەمبار و جاڕز بوو بەڵام ئانا، کە لەوکاتەدا دەرهەق بە هەموو کەس مێهرەبان و لاوێنەر بوو، زۆر زوو بە هەڵسوکەوتی سادە و دڵڕفێنی خۆی ئەوی وەنەشە هێنا. چەند بابەتی بۆ وتووێژ تاقی کردەوە و ئاخری هانیدا سەبارەت بە هونەری وێنەگەری بدوێ کە

گالنیشچێڤ لەو بارەوە زۆر زمان پاراوانە قسەی دەکرد و زۆر بە وردی گوێی بۆ شل کرد. ئەوان بە پیاسەکردن گەیشتنە ئەو کۆشکەی کە دەیانویست بەکرێی بگرن و چاویان لێکرد.

لە کاتی گەڕانەوەدا ئانا بە گالنیشچێڤی گوت: شتێکم زۆر پێخۆشە ئەویش ئەوەیە ئەلکسی لەم ماڵەدا کارگەیەکی وێنەگەریی باشی دەبێت ـ رووی لە ڤرۆنسکی کرد و گوتیشی: تۆ حەتمەن دەبێ ئەو ژوورە بۆ کاری خۆت تەرخان بکەی ـ ئەو قسانەشی بە زمانی رووسی دەکرد و بە ئەوی دەگوت «تۆ» چونکە تێگەیشتبوو کە گالنیشچێڤ لەم دەورانەی دوورەپەرێزیدا یەکێك لە دۆستە نزیکەکانیان دەبێت و لە هەنتەشی ئەودا پێویست بە خۆڕانان و رواڵەتسازی ناکات.

گالنیشچێڤ بە توندی رووی لە ڤرۆنسکی کرد و پرسیی: ئەرێ تۆ شێوەکاری دەکەی؟

ڤرۆنسکی سوورهەڵگەڕا و گوتی: بەڵێ، پێشتر شێوەکاریم دەکرد و ئێستاش کەمتاکورتێ خۆی لێدەدەم.

ئانا بە دڵشادی و پێکەنینەوە گوتی: بەڵێ، زۆریش شارەزایە. هەڵبەت من لەوبارەوە شایانی داوەری نیم، تەنیا وەك خاوەنڕایەك بیروڕای خۆم دەردەبڕم.

## هەشت

ئانا لە سەرەتای ئازادی و وەدەستهێنانەوەی لەشساخیدا هێندە دڵخۆش و بە نەشە بوو کە گەشابۆوە و هەستی دەکرد ژیانی لێوڕێژ بووە لە خۆشی و شادی و ئەو حاڵەی خۆشی بە تاوانێکی قورس دەزانی. بەڵام کە بیری لە مێردە نامرادەکەشی دەکردەوە ئەو خۆشی و بەختەوەرییەی ئێستای لێتاڵ نەدەبوو. وەبیرهاتنەوەی ئەو نەگبەت و ئاپۆرە لە لایەکەوە هێندە رەش بوو کە نەیدەتوانی بیری لێبکاتەوە و لە لایەکی تریشەوە خۆشی و شیرینکاوییەکانی ئەو ئازادییە بە رادەیەك بوو کە هەموو خەمێکی لەبیربردبۆوە و رێگایەکی بۆ پەشیمانبوونەوە نەهێشتبۆوە. بیرەوەریی ئەو بەسەرهاتانەی دوای نەخۆشییەکەی لەگەڵی بەرەوڕوو بووبوو: ئاشتبوونەوە لەگەڵ مێردەکەی و وازهێنان لە ڤرۆنسکی، بیستنی هەواڵی برینداربوونی ڤرۆنسکی و هاتنی بۆ ماڵەکەی و خۆئامادەکردن بۆ تەڵاق و بەجێ هێشتنی ماڵی مێردەکەی و دەستبەردان لە مێرد و کوڕ، ئەوانە هەمووی کاموسێك بوون کە تازە لە دەرەوەی وڵات،

کاتێك لەگەڵ ڤرۆنسکی تەنیا کەوت رۆحی لە دەستیان رزگار بوو. بیرەوەریی دەردێك کە بە مێردەکەی دابوو هەستێکی لە دڵیدا گووراندبوو کە وەك هەستی بێزاربوونی نوقمبوویەك دەچوو، دەرهەق بە نوقمبوویەکی تر کە بۆ رزگاربوون خۆی بە ئەوەوە هەڵواسیبێ و ئەو بە زۆر لە کۆڵ خۆی کردبێتەوە و لە خۆی دوور خستبێتەوە. نوقمبووی دووهەم خنکابوو، ئەو حاڵە هەڵبەت زۆر دڵتەزێن بوو بەڵام جگە لەوە هیچ رێگایەك نەبوو بۆ رزگاربوون و وا باشبوو بیر لەو شتە تاڵ و رەشانە نەکاتەوە.

لە سەرەتای جیابوونەوەکەیدا بیرۆکەیەك سەبارەت بە کارەکەی بە زەینی گەیشت کە بووە هۆی ئاسوودەبوونی دڵی و ئێستا کە بیری لە رابردوو دەکردەوە ئەو بیرۆکەیە کە لە مێشکیدا سەری هەڵدەدایەوە، لە دڵی خۆیدا دەیگوت «من ناچاربوومە هۆی نامرادبوونی ئەو پیاوە، بەڵام نامرادبوونی ئەو شادی نەکردم. خۆشم ئازار دەکێشم و هەتا کۆتاییی تەمەنیشم هەر دەبێ ئاوا ئازار بکێشم. من ئەوەی لە دنیادا خۆشەویستترین بوو لە لام دەستم لێداشت. چاوپۆشیم لە خۆشناوی و لە کوڕەکەم کرد. من کارێکی خراپم کردووە و بەو هۆیەش خۆم بە شیاوی بەختەوەری نازانم. تەڵاق وەرناگرم و هەمیشە باری بەدناوی و ناوزڕان بە شان دەکێشم و خەمی دووریی کوڕەکەم ئازارم دەدات.»

ئەگەرچی سادقانە پێشوازیی لە ئازار دەکرد بەڵام ئازاری نەدەکێشا. ئاگای لە ناوزڕانی خۆی نەبوو، چونکە هەردووکیان زۆر بە پارێزەوە دەگەڕان و خۆیان لە ژنانی رووسیی دانیشتووی هەندەران دەبوارد و لەگەڵیان بەرەوڕوو نەدەبوون. قەت خۆیان نەدەخستە بارودۆخێکەوە کە ببێتە هۆی ئابڕووچوونیان. لە هەر شوێنێك کە لەگەڵ کەسانێك هەڵسوکەوتیان دەکرد وایان دەنواند کە بارودۆخی ژیانیان لە هەموو لایەنێکەوە زۆر لەوان باشترە و باشتریش تێدەگەن. دابڕان لە کوڕە جگەرگۆشەکەی لە سەرەتاوە زۆری ئازار نەدەدا. کۆرپەکەشیان، یانی کچەکەی ڤرۆنسکی، هێندە شیرین بوو لەوکاتەوە کە ئانا هەستی بە خۆشەویستیی ئەو کردبوو و بووبووە گوڵەجەرگەی دایك و بابی کەمتر کوڕەکەی وەبیردەهاتەوە.

لەو کاتەوە کە لەشساخیی خۆی وەدەست هێنابۆوە حەزکردن بە ژیان لە مێشکیدا پەرەی سەندبوو و بارودۆخی ژیانی هێندە تازە و شیرین بوو کە ئانا بە هۆی بەختەوەریی خۆیەوە هەستی بە تاوانێکی قورس دەکرد. هەتا زیاتر ڤرۆنسکیی دەناسی زیاتر هۆگری دەبوو و ئەشقی لە دڵیدا جێی دەگرت. هەستی دەکرد زۆری ڤرۆنسکی خۆشدەوێ و ئەویش هەروا دڵ و

گیانی لەگەڵ ئەم بوو. کە دەیدی بە تەواوی دڵی ئەوی داگیرکردووە هەستی بە شادییەکی بەردەوام دەکرد. بۆیە حەزی نەدەکرد ساتێك لێی دوور بکەوێتەوە.

خولقوخووی ڤرۆنسکی کە ئانا جارلەگەڵ جار زیاتر تێیدەگەیشت بۆ ئەو شیرینییەکی لەڕادەبەدەری پێوە بوو. قەلافەتیشی بە جلوبەرگی مەدەنییەوە گۆڕابوو و لەبەر چاوی ئانا کە بە چاوێکی ئاشقانەوە دەیدی زۆر جوان و لەبەر دڵان بوو. وتە و کردەوە و هزری ئەو هەمووی بەرزی و پاکی بوو. ئەوەندەی خۆش دەویست و شەیدای بوو کە هێندێ جار خۆشی ترسی لێدەنیشت. هەرچی سەرنجی دەدا نەیدەتوانی شتێکی ناحەز لە ئاکار و وجوودیدا بدۆزێتەوە و نەشیدەوێرا ئەو راستییە دەربڕێت کە ژنێکی سووکە و شیاوی ئەو نییە. لەوە دەترسا کە لە حاڵی ئەو ئاگاداربێت و بە ئاسانی وازی لێبێنێ. ئێستاش لە هەموو شتێك زیاتر لەوە دەترسا کە ڤرۆنسکی بەجێی بێڵێ و لە ئەشقی ئەو بێبەش بێ، ئەگەرچی هیچ بنۆسێك نەبوو بۆ ئەو نامرادییە. نەیدەتوانی دەرهەق بە ڤرۆنسکی سەبارەت بە پێوەندیی لەگەڵ ئەو هەقنەناس و بێئەمەگ بێت و هەروەها نەشیدەتوانی ئەمەگ و پێزانینی خۆی بە ڤرۆنسکی نیشان بدات. بە بڕوای ئەو ڤرۆنسکی مرخ و توانایەکی تایبەتی هەبوو بۆ کاروباری دەوڵەتی و لەو ڕێگایەشدا دەیتوانی ڕۆڵێکی بەرچاو لە ئەستۆ بگرێ و حەز و هیوای ناوبانگ دەرکردنی خۆی لە ڕێگای ئەشقی ئەودا کردبووە قوربانی و قەت چکۆڵەترین گلەییی لە دەم نەهاتبووە دەرێ کە بۆنی داخ و پەشیمانیی لێبێ. ڤرۆنسکی ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتری ڕێز بۆ دادەنا و ئاشقانە خۆشی دەویست و ترسی ئەوەی کە نەوەك ئانا هەست بە ئالۆزیی بارودۆخی خۆی بکات و دڵگران بێ، بۆ ساتێك نەیدەهێشت ئۆقرە بگرێ. ئەو کە زۆر پیاوێکی سەرەڕۆ بوو نەك هەر قەتی دژایەتی لەگەڵ ئانا نەدەکرد بەڵکوو هیچ ئیرادەیەکی لە خۆی نیشان نەدەدا و وەك ئەوە وابوو کە تەنیا بیر لەوە بکاتەوە و خەمی ئەوەی هەبێت کە ئاواتەکانی ئەو پێشبینی بکات و دڵی رابگرێت، ئاناش نەیدەتوانی ئەمەگی ئەو کردەوە و گەورەییەی ئەوی لە چاودا نەبێت. ئەگەرچی هەر ئەو سەرنجە تایبەتە و ئەو کەش و بارودۆخی خەمخۆرییەی ڤرۆنسکی کە ئەوی گەمارۆ دابوو هێندێ جار هەستی دەکرد زۆر بارێکی قورس و گرانە لەسەر شانی.

بەڵام ڤرۆنسکی لەگەڵ ئەوەشدا کە بە ئاواتی خۆی گەیشتبوو، ئەو ئاواتەی کە ماوەیەکی دوور و درێژ چاوەڕوانی بوو، هەستی بە بەختەوەرییەکی بێخەوش نەدەکرد. زۆر زوو بەو ئاکامە گەیشت کە گەیشتن بە ئاواتەکەی ئەگەرچی چاوەڕێ بوو کێوێك بەختەوەری بێ کەچی بەقەد دەنکە کایەك بەختەوەریی پێنەبەخشیبوو. ئەم بەکاو گەیشتنە هەڵەیەکی بۆ روونکردەوە کە خەڵك هەمیشە تووشی دەبن و پێیان وایە گەیشتن بە ئارەزووەکانیان بەختەوەرییە. کاتێك ژیانی خوی لەگەڵ ئانا

لێك گرێدا و جلوبەرگی مەدەنیی لەبەرکرد سەرەتا چێژی ئازادی کە لە رابردوودا لەگەڵی ئاشنا نەبوو و هەروەها ئازادیی ئەوینی بە گشتی چێشت و زۆر دڵخۆش بوو، بەڵام ئەو دڵخۆشییە زۆری نەخایاند. زۆر زوو هەستی کرد گڕی ئارەزوو لە دڵیدا و پشکۆی تاسە و تامەزرۆیی لە ناخیدا خەریکە دادەمرکێت و دڵی تەنگ دەبوو. بێ ئیختیار ئاوێتەی حەز و هەوەسی زووتێپەڕ دەبوو و ئەوەی بە خواستێکی راستەقینە و ئامانجێکی راست دەزانی. روژی شازدە کاتژمێر کاری دەکرد، چونکە ئەوان لە دەرەوەی وڵات تووشی هیچ قەید و بەندێك نەدەبوون و کاتیان نەدەگیرا، چونکە بارودۆخی ژیانی کۆمەڵایەتییان وەك پترزبۆرگ نەبوو کە بە هۆی بۆنە و میوانداریییەوە فریای هیچ کارێك نەکەون و لێرە کاتی ئازادیان زۆر بوو. تەنانەت بیری لەو چێژ و رابواردنانە نەدەکردەوە کە لە سەفەرەکانی پێشوویدا خۆی پێوە سەرقاڵ دەکرد، چونکە تەنیا جارێك ئەو رابواردنەی تاقی کردبۆوە و بووبووە هۆی پەرۆشی و دڵگرانیی ئانا و بە هیچ شێوەیەك نەدەکرا بۆ چێژی خواردنی شێوێکی درەنگوەخت لەگەڵ دۆستەکانی دڵی ئانا بڕەنجێنێ. هاموشۆ کردن لەگەڵ گەوران و ناودارانی بیانی و رووسیش بە هۆی لێڵیی پێوەندییەکەی لەگەڵ ئانا، نەدەگونجا. دیتنی شوێنە مێژوویی و دیدەنییەکانیش، ئەگەرچی هەمووی دیتبوو بەڵام بۆ ئەو کە لاوێکی تێگەیشتوو و زانای رووس بوو ئەو گرینگایەتییە بێ مانایەی کە بۆ ئینگلیزییەکانی هەبوو بۆ ئەوی نەبوو.

بەو پێیە وەك جانەوەرێکی برسی کە هەرچی تووشی دەبێ بە هیوای دۆزینەوەی خۆراك قەپاڵی پێدا دەکات، نەخوازراوانە هێندێ جار رووی لە سیاسەت دەکرد و هێندێ جاریش دەبووە هۆگری کتێب و تابلۆی تازە.

چونکە لە مێرمنداڵییەوە مرخ و توانایی شێوەکاریی هەبوو، هەروەها نەشیدەزانی پارەکانی چۆن خەرج بکات، دەستیکرد بە کۆکردنەوەی گراوێر و ئاخری رووی لە شێوەکاری کرد و ئەو تاسە و حەزە چەقبەستووەی ناخی کە دەیویست بەجێی بێنێ، هەمووی لەسەر دانا.

مرخی تێگەیشتن لە هونەری هەبوو و بە زەوق و سەلیقەوە لە رووی تابلۆ شێوەکارییەکانەوە وەك ئەسڵەکەی وێنەی دەکێشایەوە و پێیوابوو ئەوەی بۆ بوونە وێنەگەر پێویستە هەیەتی. دوای ماوەیەك دوودڵی لەنێوان شێوەکاریی ئایینی و مێژوویی و رئالیستی کە کامیان هەڵبژێرێ، دەستی بەکار کرد. لەگەڵ هیچ کام لەو بوارانە نامۆ نەبوو و ئیلهامی لە هەموویان وەردەگرت، بەڵام نەیدەتوانی لەوە بگات کە لەوانەیە هیچ کەس نەزانێ هونەری شێوەکاری لە چەند شێواز پێکهاتووە و راستەوخۆ ئیلهام لەو سووژێتانە وەرگرێ کە لە ناخی خۆیدا حەشار دراون و کاری بەسەر ئەوەوە نەبێ کە ئەوەی دەیکێشێتەوە سەر بەکام شێوازی

ناسراوی شێوەکارییە. بەوەدا کە نەیدەزانی و راستەوخۆش ئیلهامی لە ژیان وەرنەدەگرت و ناڕاستەوخۆ لە ژێر کاریگەریی شوێنەوارە هونەرییەکاندا بوو، زۆر بە ئاسانی خەریکی چاولێکەری بوو و زۆر زوو بەجێیەك گەیشت کە ئەوەی دەیکێشایەوە راست شێوەی سەرمەشقەکانی دەدا.

بەر لە هەموو شتێك هۆگریی بە قوتابخانەی پڕ لە جوانکاری و سەرنجڕاکێشی فەڕەنسی هەبوو و دەستی پێکرد، پاشان دیمەنی روخساری ئانای بە جلوبەرگی ئیتالیاییەوە کێشایەوە و بە بڕوای خۆی و هەموو ئەوانەش کە دیتبوویان بە کارێکی سەرکەوتوانەیان دەزانی.

## نۆ

کۆشکی کۆن و چۆڵ و هۆڵ، بە بنمیچی بەرز و گەچبڕیی رازاوە و دیواری نەخشێنراو و تەرکی سەنگفەڕشکراو و پەنجەرەی بەرز بە پەردەی گرانبابییەوە کە پارچەکەی لە ئارمووشی قورسی زێڕین بوو، تاقە و سەرکۆماجەکان هەموو بە گوڵدانی جوان رازابوونەوە و دەرگاکانیش هەموو کەندەکاری کرابوون و تەلارە تاریکەکانی هەموو تابلۆی شێوەکاریی بەنرخ بە دیوارەکانیاندا هەڵواسرابوو. ئەو قەسرە کۆنە دوای ئەوەی هاتنە نێوی بەو شکۆیەی کە هەیبوو وەژارەیەکی شیرینی خستە دڵی ڤرۆنسکییەوە کە ئەو ئیتر مالیك و راوچییەکی لەکار کەوتووی رووسی نییە. بەڵکوو هونەردۆست و هەونەرپەروەرێکی رووناکبیرە و خۆشی لە هونەر بێبەهرە نییە و شێوەکارێکی بێقەدرە کە خۆی بە هونەرەکەیەوە رانانێ و لەبەر خاتری ئەوینی دڵدارەکەی لە کۆمەڵگا و دۆست و هاوڕێیانی خۆی دابڕاوە و پارێزیان لێدەکات.

رۆڵێك کە ڤرۆنسکی دوای هاتنی بۆ کۆشکەکە بۆخۆی هەڵبژاردبوو سەرکەوتنی باشی بە دواوە بوو، چونکە بە هۆی پیاوەتیی گالنیشچێڤەوە لەگەڵ چەند کەسی سەیر و سەرنجڕاکێش ناسیاوی پەیدا کرد و سەرەتا هەتا ماوەیەك دڵخۆش و ئاسوودە بوو. لە ژێر چاوەدێریی مامۆستایەکی شێوەکاریی ئیتالیاییدا وێنەگەلێکی لە سرووشت رەسم کرد و سەبارەت بە ژیانی سەدەکانی ناوەڕاستی ئیتالیا متالای دەکرد، لەم دواییانەدا بەڕادەیەك هۆگری ئەو ژیانەی سەدەکانی ناوەڕاست بووبوو کە تەنانەت کڵاوەکەشی بە شێوەی سەدەکانی ناوەڕاست لەسەر دەنا و تەرگەکەشی وەك ئەوان بە شانیدا دەدا و ئەو کارەشی زۆر لێدەکاڵایەوە. رۆژێك کە گالنیشچێڤ

هات بۆسەردانی ڤرۆنسکی پێیگوت: ئێمە لێرە دەژین و ئاگامان لە هیچ شتێك نییە ـ ڕۆژنامەیەکی ڕووسی کە هەر ئەو ڕۆژە بە دەستی گەیشتبوو دایە دەستی و لێیپرسی: تۆ تابلۆی میخائیلۆڤت دیوە؟ ـ وتارێکیشی سەبارەت بە شێوەکارێکی ڕووسیی دانیشتووی ئەو شارە پێنیشان دا. ئەو شێوەکارە تازە تابلۆیەکی تەواوکردبوو کە ماوەیەکی زۆر بوو باسی کەوتبووە سەر زاروزمانی خەڵك و پێشفرۆش کرابوو. نووسەر لەو وتارەدا ڕەخنەی لە کۆڕی زانیاری و دەوڵەت گرتبوو کە هونەرمەندێکی ئاوا پەنجە ڕەنگین خەڵات ناکەن و هیچ یارمەتییەکیشی نادەن.

گالنیشچێڤ گوتی: تابلۆکەیم دیتووە، هەڵبەت مرۆڤێکی لێهاتووە و خاوەن مرخیشە بەڵام لارێ بووە. ئەو سەبارەت بە مەسیح و شێوەکاریی ئایینی وەك ئیڤانۆڤ و ئیشتراوس و ڕێنان بیردەکاتەوە[12].

ئانا پرسیی: مەبەستی تابلۆکەی چییە؟

ـ مەسیح لە هەمبەر پیلاتۆسدا. مەسیحی بە قەڵافەتێکی جوولەکانەوە کێشاوەتەوە و کەڵکی لە هەموو زانیارییەکانی قوتابخانەی نوێی ڕیئالیستی وەرگرتووە.

بەو پرسیارە سەبارەت بە مەبەستی تابلۆکە باسەکەیان کێشایە سەر بابەتێك کە زۆری حەز پێدەکرد و دەستیکرد بە شرۆڤەکردنی بیروڕای خۆی:

ـ نازانم چۆن دەتوانن ئاوا نالەبارانە بە هەڵە بچن؟ بیچمی مەسیح لە بەرهەمی هونەریی مامۆستایانی دێریندا ئێستا دیاریی داوە و خاوەن بارێکی مەعنەویی تایبەتە. ئێستا ئەگەر ئەوانە ناخوازن بیچمی خودا بەڵکوو بیچمی سەرەڕۆیەکی شۆڕشگێڕ یان حەکیمێکی زوورهان ڕەسم بکەن دەبێ یارمەتی لە مێژوو وەربگرن و روخساری سوقرات یان بنیامین فرەنکلین یان شارلووت کۆردەی بکێشنەوە، نەك مەسیح. ئەوانە ڕاست ئەو بیچمە هەڵدەبژێرن کە نابێ بۆ هونەر بەکاری بێنن و پاشان...

ڤرۆنسکی پرسیی: دەی، یانی ڕاستە ئەم میخائیلۆڤە ئاوا ئاتاجە؟ـ پێیوابوو کە وەك هونەرپەروەرێکی ڕووسی، ئەرکی سەرشانییەتی کە یارمەتیی ئەو هونەرمەندە بدات، جا کارەکەی چاك بێ یان خراپ.

---

١٢- شێوەکاری ڕووسی ئا. ئا. ئیڤانۆڤ ساڵی ١٨٥٨ لە پترزبۆرگ وێنەیەکی گەورەی کێشایەوە کە مەسیحی لە هەمبەر خەڵکدا نیشان دەدا. بیرمەندی ئاڵمانی دەیوید ئیشتراوس (١٨٧٤ ـ ١٨٠٨) و فەیلەسووفی فەڕەنسی ئیرنێست ڕێنان (١٨٩٢ ـ ١٨٢٢) و کەسانیتریش هەوڵیان دەدا مەسیح لە ئاسمان بێننە خوارێ و ڕواڵەتی مرۆڤانەی پێببەخشن و بیهێننە نێو مێژووەوە. تۆلستۆی لەگەڵ بواری ئەو هونەرە نوێیە تا ڕادەیەك هاوڕا بوو.

ـ ناكرێ بڵێین لێیقەوماوە. لە كێشانەوەی دیمەنی روخساردا شارەزایە. دیتووتە وێنەی ڤاسیل چیكڤای كێشاوەتەوە یان نا، بەڵام وادیارە ئیتر نایهەوێ وێنەی روخسار بكێشێتەوە و رەنگە هەر بەو هۆیەش تووشی دەستەنگی بووبێ. من لەسەر ئەو باوەڕەم كە...

ڤرۆنسكی گوتی: ناكرێ داوای لێبكەین وێنەی روخساری ئانا بكێشێتەوە.

ئانا گوتی: بۆ وێنەی روخساری من؟ من دوای ئەو وێنەیەی كە تۆ لێت كێشاومەتەوە كاری هیچ وێنەگەرێكی ترم قەبووڵ نییە. وا چاكە تابلۆیەك لە ئانی بكێشێتەوە (ئانی ناوی كچۆڵەكەیان بوو.) ئەوەی گوت و لە پەنجەرەكەوە چاوی لە دەرێ كرد و دیتی دایەنی كچەكەی كە ژنێكی شوخۆشەنگی ئیتالیایی بوو منداڵ بە باوەشە دەرۆیشت بۆ نێو باخەكە. گوتی: فەرموون تەماشا بكەن! ـ هەر خێراش ئاوڕی دایەوە و چاوێكی لە ڤرۆنسكی كرد. ئەو جوانە ئیتالیاییەی كە ڤرۆنسكی وێنەی روخساری رەسم دەكرد ترسێكی شاراوەی خستبووە دڵی ئاناوە. ڤرۆنسكی لە رووی روخساری ئەوەوە وێنەكەی دەكێشایەوە و چۆنێتی و جوانییەكەی كە تایبەتی سەدەكانی ناوەڕاست بوو، زۆری كەوتبووە بەردڵ و ئانا نەیدەوێرا دانی پێدا بنێ كە دەترسێ ئێرەیی بەو دایەنە بەرێت و هەر بەو هۆیەش لە رادەبەدەر لەگەڵ ئەو و كوڕە چكۆڵەكەی دلۆڤان بوو هەردووكیانی دەلاواندەوە.

ڤرۆنسكیش لە پەنجێرەكەوە چاوی لە دەرێ كرد و پاشان لە چاوی ئانای روانی، هەر خێراش رووی وەرگێڕا و بە گالنیشچێڤی گوت: ئێستا تۆ ئەو میخائیلۆڤە دەناسی؟

ـ دیتوومە، بەڵام مرۆڤێكی سەیر و سەمەرەیە. خوێندەواریشی نییە. دەزانی یەكێك لەو شڕودڕانەیە كە تازە سەری هەڵداوە و لەوجۆرە بوونەوەرانەش لەم سەردەمەدا یەكجار زۆرن. لەو بەناو بیربازانەیە كە هەرلە سەرەتای كارەوە بێئیمانن و حاشا لە بوونی خودا دەكەن و وا بارهاتوون تەنیا باوەڕیان بەوەیە كە دەیبینن ـ گالنیشچێڤ قسەی دەكرد، سەرنجی نەدەدا، یان نەیدەویست سەرنج بدات و بزانێ كە ئانا و ڤرۆنسكیش دەیانهەوێ قسە بكەن. دەیگوت: پێشتر، بیرباز كەسانێك بوون كە بەر لە هەموو شتێك دیندار و لەسەربڕوا بە یاسا و ئاكاری جوان بار دەهاتن و پاشان خەباتیان دەكرد و دوای تامڵ كردنی ئازارێكی زۆر بە بیربازی دەگەیشتن، بەڵام ئەمڕۆ بیربازی زگماك سەریان هەڵداوە و هەتا كاتی گەورەبوون ئاگایان لە یاسای ئەخلاق و ئایین نییە و نازانن كە سەردەمێك ئەو یاسا و رێسایە بەسەر كرداری خەڵكدا حاكم بووە و هەر لە سەرەتای كارەوە حاشا لە هەموو شتێك دەكەن و وەكوو كێوی باردێن. ئەویش لەو جۆرە كەسانەیە. دەڵێن باوكی لە شوێنێك سەرپێشخزمەت بووە. بۆیە نەخوێندەوار ماوەتەوە. كاتێك هاتە نێو كۆڕی زانیاری و ناوی دەركرد، چونكە مرۆڤێكی وریا و

بەهۆش بوو کەوتە بیری ئەوەی فێری خوێندن و نووسین بێت و دەستیکرد بە خوێندنەوەی گۆڤاران و پێیوابوو گۆڤارەکان سەرچاوەی زانیارین. دەزانی بەر لەوانە، کەسێك ئەگەر بیویستبایە فێری خوێندن و نووسین بیٚ، وایدانێین فەرەنسییەك، لە نووسەرە کلاسیکەکانەوە دەستی پێدەکرد. بەرهەمی هەموو نووسەرە قەدیمییەکان و نووسەرە خواناس و تراژێدیانووس و مێژووزان و فەیلەسووفەکانی دەخوێندەوە. دەزانی هەرچی بەرهەمی فیکریی پێشینیان هەبووایە و بە دەستی بگەیشتبایە متالاّی دەکرد. بەلاّم لێرە راست رووی کردۆتە بەرهەمی نووسەرە بێدینەکان و زۆر زوو پوختەی زانستە لادینییەکەی ئەوان فێر بووە و بۆتە لادینێکی خەست. خالّی گرینگیش ئەوەیە ئەم چەشنە مرۆڤانە، بیست سالّ لەمەوبەر لەو جۆرە کتێبانەدا دیاردەی بەربەرەکانێیان لەگەلّ گەورە پیاوانی بواری ئیمان دیتبوو و بە چەشنێك چاوکراوەیی گەیشتن کە چەند سەدە بوو هاتبووە کایەوە و هەر بەو خەبات و بەرخۆدانەشدا بۆی دەرکەوت جگە لەوەی ئەوان بەڕاستی دەزانن بیر و بۆچوونی دیکەش هەن. بەلاّم ئەمڕۆ ئەوان راست هەلّدەکوتنە سەر کتێبگەلێك و دەیانخوێننەوە کە تەنانەت هزری پێشینیان بە شیاوی ئەوە نازنن کە باسیشی بکرێت و هەر لە سەرەتای رێگاوە باس لەوە دەکەن کە هیچ شتێك بوونی نییە و تەنیا گۆڕان و گەشەکردن هەیە و هەلّبژاردنی شیاو و خەبات و شەڕ لە پێناوی مانەوە و ئەو شتانە. من لە وتارەکەی خۆمدا...

ئانا کە ماوەیەك بوو لەگەلّ ڤرۆنسکی خەریکی ئاماژە و نیگا گۆڕینەوە بوون دەیزانی کە ڤرۆنسکی گرنگی بە خوێندەواریی ئەو وێنەگەرە نادات و تەنیا دەیهەویٚ تابلۆیەکی پێبکێشێتەوە و لەو رێگایەوە یارمەتیی بدات. زۆر خێرا و بە تێڕادیوی قسەکەی پێبڕی کە گەرم داهاتبوو و گوتی: دەزانی چی، وەرن با بچین چاومان پێیبکەویٚ.

گالنیشچێڤ وەخۆ هاتەوە و بە تامەزرۆییەوە رازی بوو، بەلاّم چونکە کابرای شێوەکار مالّەکەی لە گەڕەکێکی دوور بوو بڕیاریاندا فایتوونێك بگرن.

سەعاتێك دواتر ئانا لەپالّ گالنیشچێڤەوە و بەرەوڕووی ڤرۆنسکی لەنێو فایتوونەدا دانیشتبوو و لە مالّێکی تازە دروستکراوی ناحەز نزیك دەبوونەوە کە لە گەڕەکێکی دوور هەلّکەوتبوو. بە دیتنی ژنێکی پێشخزمەت کە بەرەوپیریان هات زانییان کە میخائیلۆڤ ئیجازە دەدا خەلّك بۆ سەردان و دیتنی تابلۆکانی بچنە کارگاکەی بەلاّم ئێستا چۆتە مالّەکەی خۆی کە هەر لە تەنیشت کارگاکەی هەلّکەوتبوو. ئەوان کارتەکەی خۆیان دایە دەست خزمەتکارەکە و ناردیان بۆ لای میخائیلۆڤ و داوایان لێکرد کە ئیجازە بدات چاو لە تابلۆکانی بکەن.

# ده

کاتێك کارتی کۆنت ڤرۆنسکی و گالنیشچێڤیان بۆ هێنا، میخائیلۆڤی شێوەکار وەك هەمیشە سەرقاڵی کاربوو. بەیانی لە گارگاکەی لەسەر تابلۆیەگی گەورە کاری کردبوو. کاتێکیش هاتەوە بۆ ماڵێ لە ژنەکەی تووڕە بوو کە نەیتوانیبوو لەگەڵ ژنی خاوەن ماڵەکەیان پێك بێت کە داوای کرێماڵەکەی دەکرد.

دوای دەمەقاڵێیەکی زۆر ئاخری پێیگوت: بیست جارم پێگوتووی چەنەی لەگەڵ لێمەدە. تۆ بەبێ قسەکردنیش هەر گەمژەی. جا کاتێکیش کە بە زمانی ئیتالیایی دەدوێی کەر لە تۆ ئاقڵترە.

ـ خەتای من چییە؟ کرێکەت وەدوا مەخە. ئەگەر پارەم هەبوایە خۆ....

میخائیلۆڤ کە بوغز گەرووی گرتبوو گوتی: بیکە بۆخاتری خودا دەستم لە کۆڵ بکەوەـ دەستی بە گوێی خۆیەوە گرت و هەستا رۆیشت بۆ ژوورەکەی کە بە دیوارێك لە ژوورەکانی تر جیاواز کرابۆوە و دەرگاکەی لە خۆی پێوەدا و لە دڵی خۆیدا گوتی «بەڕاستی بێئەقڵە!» لە پشت مێزەکە دانیشت و خوانچەی کارەکەی کردەوە و بە شۆر و شەوقەوە دەستیکرد بە تەواوکردنی ئەو تابلۆ نیوەچڵەی پێشتر کێشابوویەوە.

ئەو کاتانەی هەستی دەکرد تووشی تەنگانە بووە و ژانی ژیان بڕستی لێبڕیوە زیاتر لە هەموو کاتێك حەزی دەکرد خۆی بە وێنەکێشانەوە سەرقاڵ بکات. بە تایبەت کاتێك کە لەگەڵ ژنەکەی تووشی کێشە و دەمەقاڵێ دەبوو. لەو کاتانەشدا کارەکەی لە هەموو وەختێك سەرکوتووانەتر بوو. لەگەڵ وێنەکێشانەوە لە دڵی خۆیدا دەیگوت «پەککوو، خۆزگە بمتوانیبایە هەڵێم بۆ جێگایەك و خۆم دەربازبکەم!» وێنەی پیاوێکی دەکێشایەوە کە لەبەر تووڕەیی شێت بووبوو. پێشتریش ئەو وێنەیەی کێشابۆوە بەڵام لێیڕازی نەبوو. «نا، ئەوی دیکە لەمەیان باشتر بوو... لەکوێیە؟» چوو بۆ لای ژنەکەی و بە نێوچاوانێکی گرژەوە و بێ ئەوەی چاو لە چاوی بکات لە کچە گەورەکەی پرسی ئەو کاغەزەی پێیداون لەکوێیە. ئەو کاغەزەی کە بە دڵی نەبووبوو و فڕێی دابوو دۆزییانەوە بەڵام فرمێسکی شەمعی بەسەردا تکابوو و پەڵە و لکەی

ڕۆنی مۆمەکە چەور و چڵکنی کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا وێنەکەی هەڵگرت و لەسەر مێزەکە بەرەوڕووی خۆی دانینا و دوورکەوتەوە، چاوی چکۆڵە کردەوە و بە وردی سەرنجیدا. لە ناکاو دڵخۆشانە دەستی هەڵتەکاند و بە خۆی گوت «ئەها، ئاوا زۆر باشە!» هەر خێراش دەستیدا قەڵەم و بە توندی دەستیکرد بە وێنەکێشانەوە. ئەو پەڵەی مۆمە بە دەموچاوی سەر کاغەزەکەوە دەتگوت گیانی بەبەردا کردووە. لە ناکاو حاڵەتی توندی جگەرەفرۆشێکی هاتە بەرچاو کە جگەرەی بەرگی لێدەکڕی و چەنەی دەتگوت چەکوشە و هەر ئەو چەنەیەی بۆ پیاوە ڕەقهەستاوەکەی وێنەکەی خۆی کێشایەوە. لە خۆشیانا دای لە قاقای پێکەنین. ئەو ڕوخسارەی کێشابوویەوە حاڵەتە بێگیانەکەی پێشووی نەمابوو کە خولقاوی زەینی خۆی بوو، لە ناکاو ڕۆحی بە بەردا کرا و وایلێهات کە ئیتر نەدەگۆڕدرا. ڕوخسارێکی زیندوو بوو و بە روونی هەموو شتێکی دیاربوو، روون و ئاشکرا. دەکرا تەواوی وێنەکە بە پێودانی ئەو ڕوخسارە دەرهێنی. دەکرا و تەنانەت پێویست بوو کە لاقەکانیشی لێك بڵاوتر بکات و جۆری ڕاگرتنی دەستی چەپەشی بە تەواوی بگۆڕێت و قژیشی بۆ هەڵداتەوە. بەڵام بەو چاکسازییانە دەستی لە دەموچاوی نەدا و تەنیا ئەوەی کە داپۆشیبوو لەسەری سڕییەوە. دەکرا بڵێی ئەو پەردانەی لەسەر لادا کە دەموچاوەکە لە پشت ئەوانەوە لێڵی دەنواند. بە هەر جووڵانێکی قەڵەمەکەی دەستی، تەواوی دەموچاوەکەی بەو گورجی و پتەوییەوە کە فرمێسکی مۆمەکە بە ڕێکەوت پێیدابوو جوانتر وەدیار دەخست. خەریکبوو زۆر بە وردی و پارێزەوە وێنەکەی تەواودەکرد کە کارتەکەی ڤرۆنسکییان بۆ هێنا.

ـ ئێستا، هەر ئێستا! چوو بۆ لای ژنەکەی، شەرمنانە و بەدەم بزەوە زۆر بە نەرمی پێیگوت: باشە، بەسە ئیتر ساشا. خۆت سەغڵەت مەکە، تۆ خەتاباری و منیش بێخەتا نیم. هەمووی جێبەجێدەکەم ـ دوای ئەوەی لەگەڵی ئاشت بۆوە و باڵتە زەیتوونییە ملیوانە مەخمەرەکەی خۆی لەبەرکرد و کڵاوەکەی لەسەر نا، ڕۆیشتەوە بۆ کارگاکەی. وێنەکەی کە زۆر جوان بە دەستییەوە هاتبوو بە تەواوی لەبیرچووبۆوە. ئێستا دڵخۆش بوو و تا ڕادەیەکیش شڵەژابوو کە ئەو رووسیە دەوڵەمەند و جێکەوتووانە بە فایتوونەوە هاتبوون و دەیانویست چاو لە کارگاکەی بکەن.

ئەو زۆری دڵ بە تابلۆکەی خۆشبوو کە ئێستا لەسەر سێپەکێك داندرابوو، لە قووڵاییی دڵیشییەوە لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە تا ئێستا هیچ کەس تابلۆی ئاوای نەکێشاوەتەوە و پێیوانەبوو کە ئەم تابلۆیە لە هەموو ئاسەوارەکانی ڕافائل چاکترە، بەڵام دەیزانی ئەوەی

ویستوویەتی بەو تابلۆیە بە بینەری بگەیێنیٚ، گەیاندوویەتی و تا ئێستا لە کاری هیچ کەسدا نەدیتراوە. ئەو بڕوایەکی پتەوی بەو بابەتە هەبوو. زۆر لەمەوبەر، هەر لەو کاتەوە دەستی کردبوو بە کێشانەوەی ئەو وێنەیە، ئەو شتەی دەزانی. هەر بۆیە داوەریی خەڵك هەر کەس بووایە، سەبارەت بە تابلۆکەی، زۆر بەلایەوە گرینگ بوو و شوێنێکی قورسی لەسەر قووڵاییی گیانی دادەنا. دەربڕینی هەر بیروڕایەك، ئەگەر زۆر کەمبایەخیش بووایە پێیوابوو زۆر بە وردبینی و داوەرانە تێیدەگەن و دەزانن چیی لە پاژەکانی ئەو تابلۆیەدا شادرۆتەوە کە ئاوا دڵی پێیخوشە. ئەو هەمیشە داوەری کارەکانی خۆی بە خاوەنی تێگەیشتنێکی قووڵ، قووڵتر لە تواناییی تێگەیشتنی خۆی دەزانی و هەمیشە ئەو چاوەڕوانییەی لێیان هەبوو کە شتیوا لە تابلۆکانیدا بدۆزنەوە کە خۆی لێیان بێئاگایە و زۆر جار پێیوابوو کە لە بیروڕا دەربڕینی بینەری ئاسەوارەکانیدا ئەو خاڵە تازە دۆزراوانە دەبینیٚ.

بە هەنگاوی توند و خێرا گەیشتە بەردەرگای کارگاکەی و چاوی بە ئانا کەوت کە لە ژێر سێبەری هەیوانی پێشخانەکە راوەستابوو و گوێی بۆ گالنیشچێڤ شل کردبوو کە زۆر بە گەرموگوڕی قسەی لەگەڵ دەکرد، بەڵام دیاربوو حەزدەکات کە لە نزیکترەوە چاوی پێیبکەویٚ. بە دیتنی شۆقێکی کز کە لە روخساری ئانا درابوو، سەرەڕای ئەوەی شڵەژابوو واقیوڕما. ئەو خۆی نەیزانی کە چۆن لەگەڵ نزیکبوونەوە لێیان ئەو شۆقەی لەسەر روخساری ئانا دیتی و تێیگەیشت، هەر وەکوو چەناگەی پیاوە جگەرەفرۆشەکە، لە توێیەکی دالغەی خۆیدا شاردییەوە تاکوو هەرکاتێك پێویستی پێیهەبوو لەو قوژبنەی مێشکی دەریهێنیٚ. ئانا و ڤرۆنسکی کە چاویان بە میخائیلۆڤ کەوت تەواو سارد بوونەوە، قسەکانی گالنیشچێڤیان وەبیرهاتەوە و بە دیتنی خۆی زیاتر بە خۆیاندا شکانەوە. پیاوێکی دەستە و قەڵەو و گورجوگۆڵ و بە تالۆوکە، بەو کڵاوە قاوەییە و باڵتەی زەیتوونی و پانتۆڵی دەلینگتەنگەوە، کە ماوەیەکی زۆر بوو پانتۆڵی دەرەلینگ فش بووبووە مۆد، بەتایبەت دەموچاوی پان و روخساری ناحەزی کە شەرمێونی و حەزی پارێزگاری لە گەورەیی خۆی پێوە دیاربوو، شوێنکی زۆر ناخۆشی لەسەر دانان.

گوتی: تکا دەکەم فەرموون ـ لەگەڵ ئەوەی هەوڵی دەدا خۆی ساردوسڕ و بەهەوا نیشان بدات هاتە نێو دالانەکەوە و کلیلی لە گیرفانی دەرهێنا و دەرگاکەی کردەوە.

# یازده

میخائیلۆڤی وێنەگەر، کە پێینایە نێو کارگاکەی خۆیەوە چاوێکی تری لە میوانەکان کرد و شێوەی روخساری ڤرۆنسکی، بەتایبەت یەسقانی لاڕوومەتی ئەوی جارێکی تر لە زەینی خۆیدا لێکدایەوە. لەگەڵ ئەوەدا کە زەینی وێنەگەرانەی بەردەوام لە کاردا بوو و بۆ نموونە دەگەڕا و سەرەڕای ئەوەش دڵەکوتەکەی لەگەڵ نزیکبوونەوەی کاتی داوەری جارلەگەڵ جار زیاتر دەبوو بەپەلە و وردبینانە دیاردەی ورد و بە زەحمەت دیاری وێنەیەکی لەو سێ کەسە لە مێشکی خۆیدا دەگووراند. ئەوەیان (گالنیشچێڤ) پیاوێکی رووسیە و دانیشتووی ئەو شارەیە. میخائیلۆڤ نە ناوی بنەماڵەیی ئەوی لەبیربوو و نە دەشیزانی ئەوی لە کوێ دیوە و چیی پێگوتووە. تەنیا شێوەی دەکرد، هەروەك چۆن تەواوی ئەو رواڵەت و دەموچاوانەی کە پێشتر دیبوونی هەمووی لە دالغەیدا راگرتبوو. بەڵام دەیزانی ئەویش یەکێك لەو روخسارانەیە کە ئەو لە ئەرشیڤی مەزنی زەینی خۆیدا هەڵیگرتبوو. ئەو ئەرشیڤە تایبەتی ئەو روخسارانە بوو کە قۆڕساخی و سامێکی درۆیین و لێڵییەکی کەمڕەنگییان پێوە دیاربوو. قژی درێژ و ناوچاوانی پانی ویقارێکی رواڵەتیی بە روخساری بەخشیبوو بەڵام سووکەڵە ترس و دڵەوڕێزەیەکی منداڵانە لە بێخی دەمولووتە باریکەکەیدا کۆ بووبۆوە. بە بڕوای میخائیلۆڤ کارنینا و ڤرۆنسکی زۆر وێدەچوو لەو ناودارە دەوڵەمەندە رووسییانە بن کە وەکوو هەموو رووسییە زەنگینەکانی تر سەریان لە هونەر دەرناچێت بەڵام وادەنوێنن کە هونەردۆستن و رێز بۆ هونەرمەندان دادەنێن. لە دڵی خۆیدا گوتی «ڕەنگە تا ئێستا هەموو شوێنەوارە کەوناراکانی ئیتالیایان دیبێ و گەیشتوونە ئەوەی کە کارگای وێنەگەرەکانی ئەمڕۆش ببینن، یانی سەردانی فلان کلاوچیی ئاڵمانی و فیسار وێنەگەری حەپۆلی ئینگلیزیی پیڕەوی قوتابخانەی رافائلیان کردووە و بۆ کودانی گەشتەکەیان هاتوون بۆ لای منیش. ئەم چەشنە هونەردۆستە درۆکامینانەی (کە هەرچەندە زیرەکتر بن دەبێ زیاتر خۆیان لێلابدەی) باش دەناسی. ئەوان تەنیا بەو مەبەستە سەردانی کارگای وێنەگەرانی ئەمڕۆیان دەکرد کە خۆی پێوەڕانێن و بڵێن کە هونەری ئەمڕۆ شتێکی بێبایەخە و هەتا زیاتری لێورد دەبیتەوە باشترت بۆ دەردەکەوێ کە لاسایی کردنەوەی مامۆستایانی گەورەی رابردووە. ئەو چاوەڕوانیی ئەوەی لێدەکردن و هەر ئەوەشی لە بیچم و ئەدگاریاندا دەدی، بە هەنگاونانە بێقەید و بێمۆبالاتەکانیاندا

کاتی ئاخافتن لەگەڵ یەکتری و تەماشاکردنی پەیکەرە گەورە و چکۆڵەکانی نێو کارگاکەدا ئەوەی بۆ دەرکەوت و بە چۆنێتیی گەڕانی ئازادانەیان بە نێو کارگاکەیدا چاوەڕێ بوو پەردە لەسەر تابلۆ تازەکەی هەڵدەنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا خەریکی هەڵدانەوەی لاپەڕەی شێوەکارییەکانی بوو یان هەڵدەستا و پەردەی پەنجێرەکانی لادەدا و پەردەی لەسەر تابلۆکانی لادەدا و دڵیشی بە پرتاو لێیدەدا و جارلەگەڵ جار دڵەکوتەکەی توندتر دەبوو، ئەگەرچی لە ناخەوە هەموو رووسییە ناودار و دەوڵەمەندەکانی بە کەر و گەوج دەزانی بەڵام بۆ ئانا و ڤرۆنسکی وانەبوو.

بە گورجی خۆی لادا و تابلۆکەی نیشاندان و گوتی: فەرموون. بڕوانن، «عیسای مەسیح لەلای پیلاتووس» بە پێی وتەکانی ئینجیلی مەتی بەشی بیست و حەوتەم. ـ کە ئەوەی گوت هەستی کرد کە لەبەر هەیەجان لێوی دەلەرزێ. لە تابلۆکە دوورکەوتەوە و لە پشتسەری ئەوانەوە راوەستا. لە ماوەی ئەو چەند چرکەیەدا کە میوانەکان چاویان لە تابلۆکە دەکرد، میخائیلۆڤیش لەوانی دەڕوانی و هەوڵی دەدا کە بە چاوێکی بێموبالاتانە و نامۆ تەماشایان بکات... بەڵام ئێستا لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە راستترین و باشترین را ئەو میوانانە دەریدەبڕن و چاوەڕێ بوو هەر ئەو داوەرانەی کە ساتێك لەمەوبەر بە چاوی سووك تەماشای دەکردن، بەڕای خۆیان کارەکەی هەڵسەنگێنن. تەواوی بیر و خەیاڵەکانی سەبارەت بەم پەردەیە لەبیربردەوە کە ماوەی سێ ساڵ بوو خەریکی کێشانەوەی بوو. ئەو بایەخانەی کە بە بڕوای خۆی نەدەبوو سەبارەت بە ئەوان دڕدۆنگ بێ هەمووی لەبیرچووبۆوە. کە بە چاوی نامۆ و بێلایەنی ئەوان لە بەرهەمەکەی خۆی دەڕوانی، هیچ شاز و جوانییەکی تێدا نەدەدی. لە پێشەوە ئەدگاری پڕ لە داخ و پەژارەی پیلاتووسی دەدی و روخساری پاك و جوامێرانەی مەسیح و تۆزێ دوورتریش دەموچاوی زیوان و خزمەتکارەکانی پیلاتووس و روخساری یوحەننا کە چاوی لە پێشخۆی بڕیبوو تاکوو بزانێ چی روو دەدات. یەك بەیەکی ئەو روخسارانە دوای گەڕانێکی زۆر و هەڵە و چاکسازیی بێژومار، بە داهێنانی تایبەتی ئەو کەسانە لە زەینی خۆیدا گەشەی پێدابوو و پەروەردەی کردبوو، بۆ ئەویش پڕبوو لە ئازار و چێژ، هەموو ئەوانەش چەند جاریان جێگۆڕکێ پێکرابوو تاکوو لەگەڵ چوارچێوەی تابلۆکە رێك و تەکووز بن و هەموو رەنگ و سایەکانی بە زەحمەتێکی زۆر داڕشتبوو، ئەو ئێستا لە روانگەی ئەوانەوە چاوی لە تابلۆکە دەکرد و بە شتێکی بێبایەخی دەهاتە بەرچاو کە هەزار جار پاتە بووبۆوە. روخساری مەسیح کە بە بڕوای ئەو لە هەموویان باشتر و ناوەندی تابلۆکە بوو، کاتێك ئەوەی بۆ دەرکەوت لە خۆشیانا خەریکبوو باڵ بگرێت، ئێستا کە ئەوەی لە روانگەی ئەوانەوە دەدی هیچ جوانی و هونەرێکی پێوە نەبوو. کاری خۆی بە لاسایی کردنەوەی مامۆستایانەی مەسیحییەکان و مامۆستایانی وەك تێیسینیەن و رافائیل و

ڕۆبنس و سەربازان و پیلاتووسەکان دەزانی (وێنەکە مامۆستایانەش نەبوو چونکە ئێستا زۆری کەموکووڕی تێدا دۆزیبۆوە.) ئەوانە هەمووی کەمبایەخ و کۆن بوون و لەگەڵ ئەوەدا خراپیش کێشرابۆوە، بەڵام ئەوەندە بوو رەنگین و رووبازاڕی بوو. ئەو داوەرانە ئەگەر لەلای خۆی لە رووی نەزاکەت و خۆڕازانەوە بۆرە تاریفێکیان لێدەکرد هەقیانبوو کارەکەی بە بێبایەخ بزانن و پاشملە پێی پێبکەنن و دڵیان پێیبسووتێ.

تاملێ کردنی ئەو بێدەنگییەیان زۆر دژوار بوو (ئەگەرچی خولەکێکی زیاتر نەخایاندبوو). بۆ ئەوەی ئەو بێدەنگییە بشکێنێ و هەیەجانی خۆی بشارێتەوە، لە خۆی نووسا و رووی لە گالنیشچێڤ کرد و بە دڵەدواییەوە جارێك چاوی لە ئانا دەکرد و جارێك لە ڤرۆنسکی و دەیویست چاوپۆشی لە چکۆلەترین حاڵەتی دەموچاویان نەکات و پێیگوت: پێموایە پێشتر شانازیی زیارەتی ئێوەم هەبووە.

گالنیشچێڤ بەبێ کەمترین داخ و پەشیمانی چاوی لەسەر تابلۆکە هەڵگرت و لە ئەوی روانی و خاترجەمانە گوتی: بەڵێ، ئێمە لە یانەی رۆسی[13] یەکترمان دیت، لە بیرتان نییە؟ هەر ئەو شەوەی کە کچە ئیتالیاییەکە «ڕاشلینۆی» بۆ میوانەکان دەچڕی.

بەڵام کە تێگەیشت میخائیلۆڤ چاوەڕوانی دەربڕینی بیروڕایەتی لەسەر تابلۆکانی گوتی: تابلۆکەی ئێوە لە چاو دوایین جار کە چاوم پێیکەوت زۆری فەرق هەیە و گەشەی گردووە. من ئێستاش وەك ئەوجارە زۆرم ئەدگاری پیلاتووس پێ سەیرە. پیاو ئەو کەسایەتییەی نێو تابلۆکەی تۆی وەك پیاوێکی رۆحسووك و خێرخواز دێتە بەرچاو کە لە ناخی دڵەوە راپسێردراوە و خۆشی نازانێ چی دەکات. بەڵام بە بڕوای من...

ڕوخساری بێئۆقرەی میخائیلۆڤ لە ناکاو کرایەوە و چاوانی ترووسکەی هات. دەیویست شتێك بڵێ بەڵام هەیەجان ڕێی پێنەدەدا و کۆخی یانی سینگی ساف دەکات. هەرچەندیش کە توانایی هەڵسەنگاندنی هونەری گالنیشچێڤی بە کەمبایەخ دەزانی و بیروڕا دەربڕین بەجێی ئەو سەبارەت بە سەداقەتی ئەدگاری پیلاتووس کە راسپاردە بوو و هیچی لەسەر نەبوو، بەلایەوە بایەخی نەبوو، ئەگەرچی جێی خۆی بوو کە لە یەکەم بیروڕا دەربڕینی بێبایەخی ئەو تواشاچییە زویربێ، چونکە لەمەڕ گرینگترین لایەنەکانی ئەو تابلۆیەوە هیچ نەگوترابوو، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا میخائیلۆڤ دڵی بە قسەکانی گالنیشچێڤ خۆش بوو. خۆشی سەبارەت بە پیلاتووس هەر ئەو بیروڕایەی هەبوو کە گالنیشچێڤ دەریبڕیبوو. ئەوەش کە ئەو

---

13- Rossi

بیروڕایە یەکێك لەو ملۆینان بیروڕایە بوو کە میخائیلۆڤ دڵینابوو هەموویان ڕاستن، بەڵام لە گرینگایەتیی بیروڕاکەی گالنیشچێڤی کەم نەکردەوە. ئەو بە هۆی ئەو بیروڕا دەربڕینەوە گالنیشچێڤی کەوتە بەردڵ و شادی لە دڵی گەڕا و خەمەکانی تاران. تابلۆکەی لە ناکاو گیانی وەبەر هات و پێچەڵاوپووچییەکی پەیدا کرد کە بە زمان باس ناکرێ. میخائیلۆڤ دیسان هەوڵیدا روونی بکاتەوە کە پیلاتووسی هەروا لەبەر چاو گرتووە بەڵام لێوانی دەلەرزین و ئیختیاری لە دەستی خۆیدا نەمابوو و نەیدەتوانی بدوێ. ڤرۆنسکی و ئاناش شتێکیان گوت و زۆر لەسەرەخۆ، بەو جۆرەی کە تواشاچییان لە پێشانگای شێوەکاری قسە دەکەن، چونکە لە لایەکەوە نایانهەوێ هونەرمەندەکە زویربکەن و لە لایەکی تریشەوە دەترسن وڕێنەیەك لە دەمیان دەرپەڕێ و ئەو کارەش زۆر جار کاتی بیروڕا دەربڕین سەبارەت بە هونەر روودەدات. میخائیلۆڤ پێیوابوو تابلۆکە شوێنێکی باشی لەسەر ئەوان داناوە. لێیان نزیکبۆوە.

ئانا گوتی: روخساری مەسیح شوێنێکی سەیر لەسەر بینەر دادەنێ ـ حاڵەتی روخساری زیاتر لە شتەکانی تر سەرنجی راکێشابوو و هەستی دەکرد کە ئەو روخسارە ناوەندی تابلۆکەیە و هەر بەو هۆیەش تاریفکردنی تابلۆکەی زۆر پێخۆش بوو. ئانا پاشان گوتی: دیارە بەزەییی بە پیلاتووسدا دێ.

ئەمەش دیسان لەو ملۆینان بیروڕایە بوو کە سەبارەت بە ئەدگاری مەسیح دەربڕی. روخساری مەسیح دەبێ سۆز و بەزەییی پێوە بووبێ چونکە ئەشقی پێوەبوو، سەفایەکی ئاسمانی و خەبابەت بۆ مردن و ئاگاداربوون لە بێهوودەییی ئاخافتن. هەڵبەت ئەدگاری پیلاتووس حاڵەتی راسپاردەییی پێوە دیاربوو و روخساری مەسیحیش رەحم و بەزەیی، چونکە ئەو هێنانەبەرچاوی جەستەیە و ئەمیش رسکانی رۆح. ئەمانە هەمووی و زۆر فیکر و خەیاڵی تر وەك برووسکە لە زەینی میخائیلۆڤدا دەدرەوشایەوە و دیسان شوێنەواری شادی لە روخساریدا وەدیار کەوت.

گالنیشچێڤ گوتی: چەندە مامۆستایانە کێشراوەتەوە، پانتاییی دەورەکەشی چەند زۆرە. هەر دەڵەی بۆ ئەوە دەبێ بە دەوریدا بگەڕێی ـ ئەو بەو قسانە بە ئاشکرا دەیویست بڵێ ئەو ناوەڕۆك و ئەندێشە و بیرانەی پشت دەموچاوەکانی بە دڵ نییە.

ڤرۆنسکی رووی لە گالنیشچێڤ کرد و گوتی: بەڵێ، زۆر مامۆستایانە کێشراوەتەوە. ئەو دەموچاوانەی پەراوێزی ژێر نەخشەکە زۆر جوان دیار و سەرنجڕاکێشن! بەوە دەڵێن تەکنیك ـ ئەوەش ئاماژەیەك بوو بە وتووێژی پێشووی لەگەڵ گالنیشچێڤ و ناهومێدبوونی خۆی لە وەدەست هێنانی شارەزایی لە تەکنیکدا.

گالنیشچێڤ و ئانا گوتیان: بەڵێ، بەڵێ، سەیرە! ـ سەرەڕای ئەو بارودۆخە خۆش و لەبارەی کە بەسەر شوێنەکەدا زاڵ بوو ئەم بیروڕا دەربڕینەی ڤرۆنسکی سەبارەت بە تەکنیك دڵی میخائیلۆڤی

ڕەنجاند، بە جۆرێك کە بە تووڕەیی نێوچاوی تێکنا و مۆڕەیەکی لێکرد. دەیزانی کە مەبەست لە تەکنیك توانایی زانستییانەی شێوەکاری و وێنەگەرییە و وەلانانی یەکجارەکیی ناوەڕۆك. هەر وەك لە تاریف و پێداهەڵکوتنەکانی ئەمڕۆدا، بۆی دەرکەوتبوو کە تەکنیك لە هەمبەر بایەخی ناوەکیی بەرهەمدا رادەگرن، وەك ئەوەش وابوو کە شتێکی خراپ بە باش دانێی. دەیزانی کە پارێز و وردبینی زۆر پێویستە تاکوو کاتی لادانی پەردە لەسەر ناوەڕۆك، ناوەرۆکەکە تووشی ئارشیە نەبێت و هەروەها هەڵگرتنی هەموو ئەو تۆێکڵانەی کە دەوری کاکڵیان داوە کارێکی سانا نییە. بەڵام هونەری وێنەگەری هیچ تەکنیکێکی تێدا نییە. ئەگەر منداڵۆچکەیەك یان ئاشپەزەکەی بیانتوانیبایە ئەوەی ئەو دەیبینیٚ بیدۆزێتەوە، ئەوانیش دەیانتوانی ئەوەی دەیبینن بینوێنن و تویکڵی سەرکاکڵەکە لاببەن. بەڵام دەستڕەنگینترین و بە ئەزموونترین وێنەگەری بەناو خاوەن تەکنیك ئەگەر ئەو دیوارەی ناوەرۆکی شاردۆتەوە بۆی نەڕوخێنن تەنیا بە تەکنیکی خۆی ناتوانیٚ ناوەڕۆك بنوێنیٚ و بەرهەمێك بخولقێنیٚ. جگە لەوەش دەیدی ئەگەر باسکردنی تەکنیك بلوایە ئافەرین پێگوتن لەمەڕ تەکنیکەوە نابەجیٚ دەبوو. هەموو ئەو وێنانەی دەیکێشایەوە یان پێشتر کێشابوویەوە و عەیب و ئیرادێکیش کە بە هۆی کەمتەرخەمییەوە کاتی هەڵگرتنی پەردەی درۆیین لەسەر کاکڵی هەقیقەت روون و بەرچاو بوو، بە بیٚ زایەکردن هەموو بەرهەمەکە بۆ ئەوە نەدەبوو چاکسازیی بۆ بکرێت. دەکریٚ بڵێین هەموو روخسارەکان شوێنەواری سڕینەوەی رەنگی هەڵەیان پێوە دیاربوو کە تابلۆکەی خراپ کردبوو.

گالنیشچێڤ گوتی: ئەگەر ئیجازە بدەی دەمهەویٚ شتێك بڵێم...

میخائیلۆڤ بە بزەیەکی سەرزارەکییەوە گوتی: من زۆر زۆرم پێخۆشە و تکاتان لێدەکەم بفەرموون.

ـ دەمهەویٚ بڵێم مەسیحی ئێوە مرۆڤێکە کە خۆ دەکوتیٚ بۆ لای خودا، ئەویش نەك خودایەك کە شێوەی مرۆڤی بۆ خۆی هەڵبژاردووە. دەزانم مەبەستی ئێوە هەر ئەوە بووە.

میخائیلۆڤ بە ناوچاوانێکی گرژەوە گوتی: من ناتوانم وێنەی مەسیحێك بکێشمەوە کە لە رۆحمدا هیچ شوێن و پێگەیەکی نییە.

ـ بەڵیٚ، بەڵام ئەگەر وایە ئیجازە بدە با بیری خۆمت بۆ بەیان بکەم... تابلۆکەی تۆ هێندە باشە کە بیروڕا دەربڕینی من ناتوانیٚ هیچ زیانێکی پێبگەیەنیٚ. جگە لەوەش ئەمە بیروڕای خۆمە. تۆ دەکریٚ بیروڕات جیاواز بیٚ. ناوەرۆکی تابلۆکەی تۆ شتێکی دیکەیە. بەڵام تابلۆکەی ئیڤانۆڤ چی ئەگەر ئەو بیویستبایە مەسیح هەتا پلەی کەسایەتییەکی مێژوویی دابەزێنیٚ وا باشتر دەبوو بابەتێکی مێژوویی دیکە بۆ بەرهەمەکەی هەڵبژێریٚ.

ـ بەڵام ئەگەر ئەمە بە شکۆترین بابەت بیٚ کە لە هەمبەر هونەردا هەڵکەوتووە دەڵێی چی؟

ـ ئەگەر بگەڕێ بابەتی تر دەدۆزێتەوە. بەڵام مەسەلەکە ئەوەیە هونەر باس و بەڵگەهێنانەوە هەڵناخرێنێ. بەڵام کە چاو لە تابلۆکەی ئیڤانۆڤ دەکەین بڕوادار بین یان بێبڕوا ئەو پرسیارە دێتەپێشێ کە ئەو مەسیحەی لەسەری کێشراوەتەوە خودایە یان خودا نییە؟ شوێنێکی توندیش کە ئەو تابلۆیە لەسەر بینەری دادەنێ لەنێو دەچێ.

میخائیلۆڤ گوتی: ئاخەر لەبەرچی؟ بە بڕوای من بۆ مرۆڤە خاوەن ژیارەکان هیچ جێیەك بۆ باس و گومان نامێنێتەوە.

گالنیشچێڤ لەگەڵ ئەو بیروڕایە هاوڕا نەبوو و بە پێداگریکردن لەسەر قسەی خۆی کە دەیگوت دەبێ بەرهەمێکی هونەری شوێنێکی یەکدەست لەسەر بینەر دابنێ میخائیلۆڤی بۆڕ دا.

میخائیلۆڤ تووشی تەنگژە هاتبوو بەڵام نەیدەتوانی بۆ بەرگری کردن لە بیروڕای خۆی زمانی بگەڕێ.

## دوازدە

ئانا و ڤرۆنسکی ماوەیەك بوو چاویان لە یەکتر دەکرد و ئەو چەنەوەرییەی هاوڕێکەیان بەدڵ نەبوو. ئاخری ڤرۆنسکی گوێی بە خانەخوێ نەدا و رۆیشت بۆ لای تابلۆیەکی تر کە یەکێکی چکۆڵە بوو.

هەردووکیان بەیەك دەنگ گوتیان: هاە چەند جوانە، بەڕاستی جوانە! بێ وێنەیە! زۆر جوانە!

میخائیلۆڤ لەبەر خۆیەوە گوتی: «چییان دیوە کە ئەوەندەیان کەوتۆتە بەردڵ؟» ئەو خۆی ئەو تابلۆیەی لە بیرنەمابوو کە سێ ساڵ لەمەوبەر کێشابوویەوە. تەواوی ئەو رەنج و ئازارانەی کە لە ماوەی ئەو سێ مانگەدا کە شەو و رۆژ پێوەی سەرقاڵ بوو و هەموو ئەو چێژانەش کە ئەو کارە پێیدابوو هیچی لە بیرنەمابوو. ئەم تابلۆیەشی وەکوو هەموو تابلۆکانی دیکە دوای تەواوکردنی لەبیربردبۆوە. تەنانەت حەزی نەدەکرد چاویشی لێبکات و ئەوەشی تەنیا لەبەرئەوە لە کارگاکەی خویدا دانابوو کە چاوەڕێ بوو پیاوێکی ئینگلیزی لێی بکرێ.

گوتی: ئەوە گەڵایەکە و هیچی تر. زۆریش لەمەوبەر کێشاومەتەوە.

گالنیشچێڤ، کە دیاربوو جوانیی تابلۆکە سەرنجی ئەویشی راکێشاوە گوتی: تیەح، چەند جوانە!

دوو کوڕی چکۆڵە بوون لە ژێر سێبەری دارە بییەك خەریکی ماسی گرتن بوون. گەورەکەیان تازە قولاپەکەی فڕێدابووە نێو ئاوەکەوە و بە سەرنجێکی وردەوە دەیویست لەو

بنچکەی بکاتەوە کە پێوەی گیر بووبوو، دیاربوو هەموو بیریشی لەسەر ئەو کارەیە. ئەوی چکۆلەتریشیان لەسەر سەوزەڵانییەکە راکشابوو و سەری قژ زێڕین و ئاڵۆزاوی کردبووە سەر دەستی و بە چاوی شین و پڕخەیاڵەوە لە ئاوەکە رامابوو. بیری لە چی دەکردەوە؟

میخائیلۆڤ کە دیتی تەماشاچییان ئاوا تەمەزرۆیانە چاو لە تابلۆکە دەکەن، کەوتە هەیەجان و شادی لە دڵی گەڕا. بەڵام دەترسا، حەزیشی نەدەکرد دڵ بە رابردوو خۆش بکات و لەگەڵ ئەوەشدا کە تاریفاتەکەیان شادی دەکرد دەیویست سەرنجی تواشاچییەکانی بۆ لای تابلۆکانی تر راکێشێ.

ڤرۆنسکی لێیپرسی ئەو تابلۆیە دەفرۆشی یان نا؟ بەڵام بەو شادی و شۆرەی تواشاچییەکانی خستبوویانە دڵییەوە باسکردنی پارە زۆر لە دڵی گران هات.

بە دڵتەنگییەوە نێوچاوانی تێکنا و وەڵامی دایەوە: ئەوانە بۆ فرۆشتن لێرە داندراون.

کاتێك تواشاچییەکان رۆیشتن، میخائیلۆڤ لە هەمبەر تابلۆی مەسیح و پیلاتووسدا دانیشت و ئەوەی ئەوان گوتبوویان یان نەیانگوتبوو هەمووی لە زەینی خویدا لێکدایەوە. سەیریش ئەوەبوو ئەو هەستەی کە لە هەنتەشی ئەواندا و کاتێك کە هەولی دەدا لە روانگەی ئەوانەوە چاو لە تابلۆکە بکات و زۆر گرینگ بوو بەلایەوە، لە ناکاو گرینگایەتییەکەی خۆی لە دەست دابوو. دیسان بە چاوی هونەرمەندانەی خۆیەوە لە تابلۆکەی روانی و بەو ئاکامە گەیشت کە گرینگایەتیی هەیە و ئەم دڵنیابوونەش بۆ توانایی و حەولی داهێنان زور پێویستە و لە هەموو حەز و وازێکی تری دووردەخاتەوە و تەنیا لە هەلومەرجێکی ئەوتۆشدا دەیتوانی چالاکی بنوێنێ.

لاقی مەسیح لەسەر تابلۆی پرسپکتیڤ زۆر کورت بووبۆوە. دەستیدایە پالێتی رەنگ و دەستیکرد بە کێشانەوە. لەگەڵ چاککردنی لاقی مەسیح چاوی لە دەموچاوی یووحەننا دەکرد کە لە دواوەی دیمەنەکە راوەستابوو و تواشاچییان سەرنجیان پێنەدابوو، بەڵام خۆی دەیزانی کە زۆر بە جوانی دایڕشتووە. ئەوەش کە ئەو روخسارە سەرنجی رانەدەکێشا دیارە کەموکووڕیی هەبوو. کاتێك لاقی مەسیحی تەواوکرد دەیویست بچێتەسەر یوحەننا بەڵام لەڕادەبەدەر تووشی هەیەجان بووبوو. ئەو لە دوولایەنەوە بە یەکئەندازە لەو کارە وەڕەز بوو، یەکیان ئەو کاتانە بوو کە دڵسارد دەبۆوە و وازی لە کار نەبوو و ئەوی تریش کاتێك بوو کە لەڕادەبەدەر شاد بوو و بە چاوێکی موووقەڵێشانە هەموو شتێکی دەدی. کاتی تێپەڕین لە دڵساردی و گەیشتن بەوپەڕی ئیلهام وەرگرتن، قۆناخێك بوو کە کارەکەی بە دەستەوە دەهات. بەڵام ئەمڕۆ راوەستا و پەردەیەکی بە دەستەوە گرت و ماوەیەکی زۆر بە بزەیەکی پڕ لە تامەزرۆییەوە

چاوی لە روخساری یوحەننا بڕی. ئاخری وەك ئەوەی خەمبارانە و بە دڵتەنگی خۆی لە تابلۆکە دوور خستبێتەوە پەردەکەی دابەسەر تابلۆکەدا و شەکەت بەڵام دڵخۆش رۆیشتەوە بۆ ماڵێ.

ڤرۆنسکی و ئانا و گالنیشچێڤ کاتی گەڕانەوە زۆر شاد و دڵخۆش بوون. سەبارەت بە میخائیلۆڤ و تابلۆکانی دەدوان. کە دەیانگوت زەوق، مەبەستیان لە توانایی زاتی و دەکرێ بڵێی جەستەییی ئەوەبوو کە بەریبوو لە هەست و ئەندێشە و لە زەینی ئەواندا هەموو ئەوانەی لە وجوودی ئەو هونەرمەندەدا بوو دەیگرتەوە و بەردەوام لە وتووێژەکانیاندا دووپاتیان دەکردەوە، بەجۆرێك کە ناچاربوون بۆ ناو لێنانی ئەو شتانەی کە نەیاندەزانی چییە بەڵام دەیانویست باسی بکەن و بەکاریان دەهێنا. دەیانگوت کە زەوقی ئەو وێنەگەرە شکی تێدانییە بەڵام ئەو زەوقە بە هۆی نەبوونی فێرکاریی پێویست گەشەی نەکردبوو، ئەو نەبوونی فێرکارییەش چارەڕەشییەك بوو کە هیچ کام لە هونەرمەندانی رووسیا لێی بێبەش نەبوون. بەڵام تابلۆی کوڕەکان شوێنی لەسەر دانابوون و بەردەوام باسیان دەکرد.

ڤرۆنسکی دەیکوت: بەڕاستی زۆر شتی چاك بوو. چۆن توانیبووی شتێکی ئاوا بکێشێتەوە، چەندەش ساکارانە! ئەو تەنانەت خۆشی نازانێ کارەکەی چەندە بە نرخە، ئەو تابلۆیە بۆ ئەوە نابێ وەپشت گوێی بخەی و نەیکڕی.

## سێزدە

میخائیلۆڤ تابلۆکەی خۆی بە ڤرۆنسکی فرۆشت و بەڵێنی پێدان کە تابلۆیەکیش لە روخساری ئانا بکێشێتەوە. لە رۆژی دیاریکراویشدا هات و دەستی بە کێشانەوەی کرد.

دوای پێنج کەڕەت هاتن وێنەکە بەجێیەك گەیشت کە هەمووانی تووشی واقوڕمان کرد. بەتایبەت ڤرۆنسکی نەك بە هۆی وێچوونەکەیەوە بەڵکوو لەبەر جوانییەکەی سەری سووڕمابوو. ئەوەشی پێ سەیر بوو کە میخائیلۆڤ چۆن توانیبووی ئاوا لە جوانییەکەی ئانا بگات. ڤرۆنسکی لە دڵی خۆیدا گوتی «پیاو دەبێ ئانا وەك من بناسێت و خۆشیبوێ تاکوو بتوانێ ئەو دیمەنە شیرینەی رۆحی بدۆزێتەوە.» کەچێ خۆشی تازە بە دیتنی ئەو تابلۆیە لە دیمەنی شیرین و دڵڕفێنی ئانا گەیشتبوو، بەڵام ئەو حاڵەتە رۆحییە هێندە سروشتی و سادقانەی دەنواند کە ئەو و دەوروبەرییەکانیش پێیانوابوو لە قەدیمەوە لەگەڵی ئاشنان.

باسی ئەو تابلۆیەی دەکرد کە خۆی دەیکێشایەوە و دەیگوت: من ماوەیەکی زۆرە حەول دەدەم، بەڵام بە دەستمەوە نایە، بەڵام ئەو چاوێکی لێکرد و کێشایەوە. تەکنیك یانی ئەوە!

گالنیشچێڤ دڵخۆشیی دایەوە: تۆش بەو جێیە دەگەیـ بە بڕوای ئەو ڤرۆنسکی خاوەن زەوق و خوێندەوار و تێگەیشتوو بوو، ئەوەش لە هەموو شتێك گرینگتر بوو، دەبووە هۆی ئەوەش کە مرۆڤ لە روانگەیەکی بەرزترەوە چاو لە هونەر بکات. هۆیەکی تری دڵنیابوونی گالنیشچێڤ ئەوەبوو کە خوی پێویستی بە دڵگەرمی و هاوفیکری ڤرۆنسکی هەبوو بۆ نووسینی وتار و ئەندێشەکانی، هەستیشی دەکرد کە پشتیوانی و دڵگەرمی دەبێ دوولایەنە بێ.

میخائیلۆڤ لە ماڵێکی نامۆ و بەتایبەت لەو قەسرەدا و لەلای ڤرۆنسکی بووبووە مرۆڤێکی تر و لەگەڵ ئەوەی لە کارگاکەی خۆی بوو زۆر جیاواز بوو. لەڕادەبەدەرە بەئەدەب و شەرمێون بوو، هەڵسوکەوتیشی زۆر نامۆی دەنواند. دەتگوت لە هاونشینیی ئەو کەسانە دەترسێ کە لە دڵەوە بە سووکیان دەزانێ. بە ڤرۆنسکیی دەگوت حەزرەتی هێژا و ئەگەرچی ئەو و ئانا داوایان لێدەکرد نانیان لەگەڵ بخوات بەڵام نەدەچوو و تەنیا لە کاتی خۆیدا بۆ کێشانەوەی وێنەکە دەچوو. ئانا زۆری رێز بۆ دادەنا و دیاربوو قەدری هونەرەکەی ئەوی بۆ کێشانەوەی ئەو وێنەیە لەچاودایە. ڤرۆنسکی دەیویست ئەو سنووری نامۆییە بشکێنێ و زیاتری لێ نزیك ببێتەوە، حەزی دەکرد ئەو هونەرمەندە بیروڕای خۆی سەبارەت بە تابلۆکانی دەربڕێ. گالنیشچێڤ هیچ هەلێکی بەفیڕۆ نەدەدا و هەوڵی دەدا لە بواری هونەردا ئەندێشە رەسەنەکانی پێبسەلمێنێ. بەڵام میخائیلۆڤ لەمەڕ هەموویانەوە ساردوسڕانە هەڵسوکەوتی دەکرد. ئانا بە سەرنجەکانیدا هەستی دەکرد کە حەزدەکات قسە لەگەڵ ئەو بکات. بەڵام خۆ لە قسەکردن لەگەڵ ئەو دەبوێرێ. کاتی ئاخافتن لەگەڵ ڤرۆنسکی کە دەچوونە سەر باسی هونەر زۆر لاسارانە بێدەنگ دەبوو، کاتێکیش تابلۆکانی ڤرۆنسکییان پێنیشان دەدا هەروا بلەوەز و چەق رادەوەستا و متەقی نەدەکرد. دیاربوو حەز بە قسەکردنی گالنیشچێڤیش ناکات و وەڵامی نەدەدایەوە.

لەسەریەك کە میخائیلۆڤیان لە نزیکەوە ناسی و بۆیان دەرکەوت کە مرۆڤێکی وشك و لەخۆڕازییە و لەگەڵ ئەوان دانووی ناکوڵێ، لێیوەڕز بوون و دوای چەند کەڕەت هاتنی بۆ ماڵیان و کە کاری تابلۆکە کۆتاییی پێهات، ئەو ئیتر نەهاتەوە بۆ ماڵیان و ئەوانیش خۆشحاڵ بوون کە چاویان پێیناکەوێ.

گالنیشچێڤ یەکەم کەس بوو کە ئەو ئەندێشەیەی زەینی هەموویانی دەربڕی و گوتی: میخائیلۆڤ ئیرەییی بە ڤرۆنسکی دەبرد.

ـ وایە، بەڵام با نەڵێین ئێرەیی چونکە مرۆڤێکی خاوەن زەوقە، بەڵام ناتوانێ قەبوولّی بکات کە ڤرۆنسکی لە دەربار خاوەنی پلەوپایەیە و دەوڵەمەندە و تەنانەت کۆنتیشە (ئەو جۆرە مرۆڤانە هەموویان لە پاکی و نەجیبی بێزارن) و بێ ئەوەی خۆی تووشی زەحمەتی زۆر بکات هەر ئەو کارەی ئەو، لەوانەیە چاکتریش، بە دەستییەوە بێت کە ئەو تەواوی ژیانی خۆی بۆ تەرخان کردووە. لە هەمووشی گرینگتر ڤرۆنسکی خاوەنی فەرهەنگێکە کە ئەو بە جارێشیدا ناڕوا.

ڤرۆنسکی لەسەر میخائیلۆڤ هاتە جواب بەڵام لە دڵەوە بڕوای بەو قسەیەی گالنیشچێڤ هەبوو، چونکە پێیوابوو هەرکەسێك کە لەو بارودۆخەی ئەودا نەبێت و پلەوپایەی کۆمەڵایەتیشی لە خوار ئەوەوە بێت هەقیەتی ئێرەییی پێبەرێت.

دوو تابلۆ لە روخساری ئانا، لە رووی یەك مۆدێلی زیندووەوە، بە پەڕەمووچی ئەو و میخائیلۆڤ کێشرابۆوە و دەبوو جیاوازیی نێوان ئەو دوو وێنەگەرەی بۆ دەربخات بەڵام ئەو هیچ جیاوازییەکی نەدەدی. تەنیا ئەو کاتەی کە میخائیلۆڤ وێنەکەی خۆی تەواوکرد ئەو ئیتر دەستی بۆ تابلۆکەی خۆی نەبرد و گوتی ئەو کارە ئیتر پێویست ناکات و شتێکی زیادییە، بەڵام درێژەی بە کێشانەوەی ئەو تابلۆیەدا کە سەبارەت بە ژیانی سەدەکانی ناوەڕاست بوو، خۆی و گالنیشچێڤ و بەتایبەت ئاناش لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە زۆر باشە و زیاتر شێوەی بەرهەمی مامۆستا بەناوبانگ و قەدیمییەکان دەدا نەك تابلۆکانی میخائیلۆڤ.

بەڵام میخائیلۆڤ، ئەگەرچی روخساری ئانا بەجارێ شەیدا و ئاڵفتەی کردبوو، کاتێك دانیشتنەکان تەواوبوون و ئیتر پێویست نەبوو گوێ بۆ قسە و چەنەوەرییەکانی گالنیشچێڤ بگرێ کە باسی هونەری دەکرد و دەیتوانی وێنەکەی ڤرۆنسکی لەبیربەرێتەوە، لەوان خۆشحاڵتر بوو. دەیزانی ناکرێ ڤرۆنسکی لەو کارە دڵسارد بکاتەوە، گوتی وێنەکێشان نابێ تەنیا بۆ بێتاقەتی و خۆسەرقاڵ کردن بێ. دەشیزانی ئەو و هەموو هونەردۆستانی کەمتەرخەم و ساناگر بە تەواوی هەقیانە کە هەرچی پێیان خۆشبێ بیکێشنەوە بەڵام ئەو چاوی بەراییی نەدەدا ئەوانە ببینێ. ئەگەر کەسێك حەزدەکات بووکەڵە بە مۆم دروست بکات و خۆشیبوێت و رایمووسێ کەس ناتوانێ بەرگری لێبکات. بەڵام ئەگەر ئەو کەسە بێت لەبەر چاوی ئاشقێکی دڵدۆڕاو دانیشێ و دەستبکات بە ماچکردن و لاواندنەوەی ئەو بووکۆکە مۆمینەیە حەتمەن ئەو دڵدارە رقی لێیهەڵدەستێ و لە کارەکەی بێزار دەبێ. میخائیلۆڤیش بە دیتنی وێنەکەی ڤرۆنسکی راست ئەو حاڵەی بوو. وێنەکانی ڤرۆنسکی بۆ ئەو قۆڕیش بوون و رقیشی هەڵدەستاند، لەلایەکی تریشەوە بەزەییی پێیدا دەهات و پێیوابوو سووکایەتییە بە هونەر.

شەیدایی و حەزی ڤرۆنسکی بۆ وێنەگەری و هەروەها بۆ سەدەکانی ناوەڕاست زۆری نەخایاند. زەوقی وێنەگەرییەکەی ئەو دنە بوو کە بتوانێ تابلۆکەی خۆی تەواوبکات و دەستی لێهەڵگرت. هەستی کرد کەموکووڕییەکانی تابلۆکەی کە سەرەتا زۆریان لەچاو نەدەدا ئەگەر درێژەی پێبدات زیاتر زەق دەبنەوە. کاری ئەویش وەك کاری گالنیشچێڤ وابوو. گالنیشچێڤیش هەستی دەکرد قسەی بۆ گوتن پێنییە و بەردەوام خۆی فریودەدات و ئەندێشەکانی هێشتا بە باشی پوختە نەبوون و فیکری خۆی هەروەك دایکێك کە پیزە لە هەناوی خۆیدا پەروەردە دەکات و پێیدەگەیێنێ، ئەویش ئاوا خەریکی کۆکردنەوەی بەڵگە و بنۆس بوو. ئەوەش گالنیشچێڤی لە دین دەرکردبوو و ئازاری دەدا، بەڵام ڤرۆنسکی ئازاری بۆ تامڵنەدەکرا و بەتایبەت نەیدەتوانی رقی لە خۆی هەستێ. زۆر بە لەخۆڕادیوییەوە کە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی بوو، بێ ئەوەی بە پێویستی بزانێ کە شرۆڤەی بکات یان بۆ کارەکەی خۆی روونکردنەوەی هەبێ، زۆر بە سانایی دەستی لە وێنەگەری هەڵگرت.

بەڵام ژیانی ئەو و ئانا، کە ئەو دڵساردبوونەوەی مێردەکەی تووشی سەرسووڕمانی کردبوو، بەبێ ئەو سەرگەرمییە، لەو شارەی ئیتالیا وای تووشی دڵتەنگی کردن کە لەناکاو ئەو قەسرە لەبەر چاویان ئەوەندە کۆن و گەمار خۆی نواند لەوانەبوو شێت بن. پەڵەی سەر پەردە کۆن و پڕتووکاوەکان و درزی دیوار و گەچبڕیی قرنجاوی بنمیچەکان هێندە لەبەر چاویان دزێو دیاربوو دەتگوت لە بەندیخانەدان. سەردانی بەردەوامی گالنیشچێڤ و مامۆستای ئیتالیایی و موسافیری ئەڵمانی هێندە ناخۆش و خەفەتهێن بوو کە بە پێویستیان زانی ژیانی خۆیان بگۆڕن. بڕیاریاندا بگەڕێنەوە بۆ رووسیا و لە گوندێك نیشتەجێ بن. ڤرۆنسکی دەیویست بەشە میراتەکەی خۆی لە پترزبۆرگ لە براکەی بستێنێ و ئاناش حەزی دەکرد چاوی بە کوڕەکەی بکەوێت. بڕیاریان هێنا سەر ئەوەی بچنە مڵکە گەورەکەی بنەماڵەی ڤرۆنسکی و هاوین لەوێ تێپەڕبکەن.

## چاردە

سێ مانگ بەسەر زەماوەندەکەی لەڤیندا تێپەڕیبوو. ئەو بەختەوەر بوو بەڵام نەك بەو جۆرەی کە بیری لێدەکردەوە. رۆژ لە دوای رۆژ تووشی دڵساردی دەبوو و خولیاکانی رابردووی دەفەوتان و شەیدایی و تاسەی نوێ و چاوەڕواننەکراو لە بەردەمیدا سەریان هەڵدەدا. لەڤین

بەختەوەر بوو بەڵام کە ژیانی هاوبەشی دەستپێکرد دیتی کە ئەم ژیانە بە هیچ جۆرێك ئەوە نییە وا لە خەیاڵیدا پێوەی ژیابوو و خەونی پێوە دیبوو. ئەو ساتبەسات هەستی وەك هەستی کەسێك وابوو کە دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر چاوی پڕهیوای لە گەمییەك دەبڕێ کە بەسەر رووبەری شین و رووناکی زەریاچەیەکەوە نەرم و لەسەرەخۆ دەخوشێ، لەپڕ چاو بکاتەوە ببینێ خۆی سواری گەمییەکە بووە. دەیدی کە دانیشتن لەنێو گەمییەکەدا و بە هێوری خوشین بەسەر ئاوەکەدا تەنیا رواڵەتی کارەکەیە و دەبێ بەردەوام وریا بێت و ساتێك لە بیری نەچێتەوە کە بۆ کوێ دەچێت و لەسەر دەریایەکی بێبن و بێسنوورەوە و دەبێ سەوڵ لێبدات و ئەوەش بۆ دەستی نەخاراو و بێئەزموون زۆر کارێکی قورس و ناخۆشە. دەیدی کە لە دوورەوە دەستی لەسەر ئاور گرتووە و دەنگی دەهۆڵ لە دوور خوشە و تەماشاکردن لە دوورەوە ئاسانە و سواری گەمیە ئەگەرچی زور خۆشە، بەڵام زۆریش دژوار و پڕ مەترسییە.

ئەو کاتەی سەڵت بوو، زۆر جار چاوی بە ژیانی ژن و مێردایەتیی خەڵك دەکەوت و کێشە و دەمەقاڵێ و دەردەسەرییەکانی ئەوانی دەدی و لە دڵەوە زەردەیەکی پڕسووکایەتی دەنیشتە سەر لێوی. دڵنیابوو کە ژیانی ژن و مێردایەتیی داهاتووی خۆی نەك لەو چەشنە ئاریشە و گرفتانەی تێدا نابێ، بەڵکوو رواڵەتەکەشی دەبێ لێوڕێژ بێ لە شادی و جوانی و بە تەواوی لەگەڵ ژیانی خەڵکی جیاواز بێ. لەپڕ بۆی دەرکەوتبوو کە بەجێی هەموو ئەوانە ژیانی لەگەڵ ژنەکەی نەك ژیانێکی تایبەت و جیاواز نەبوو، بەڵکوو بە پێچەوانە، پڕاوپڕ بوو لە وردە کێشە کە لە رابردوودا بە هیچی نەدەزانین و ئێستا بە پێچەوانەی ویستی خۆی گرینگایەتییەکی نائاسایی و حاشاهەڵنەگری لێکەوتبۆوە و دەیدی چارەسەری ئەو وردە ئاریشە و کێشەگەلە، بە پێچەوانەی ئەو شتەی لە رابردوودا بیری لێدەکردەوە زۆریش ئاسان نییە. ئەگەرچی لەڤین پێیوابوو بە وردی و بە روونی لە هەموو گرفت و دژوارییەکانی ژیانی ژن و مێردایەتی دەگات، بێ ئیختیار وەك هەموو پیاوان پێیوابوو ژیانی ژن و مێردایەتی تەنیا هەر چێژی ئەوینە، کە ئەویش نابێ هیچ کۆسپ و لەمپەرێك ببێتە بەرگری و ئەو دەردەسەرییە چکۆلانانە نابێ مرۆڤ بە لاڕێدا بەرن. پێیوابوو ئەو دەبێ باری ئەرکی خۆی لە کۆڵ بنێت و رەنج و تاڵییەکانی ئەو ژیانە وەك شەربەتێکی سازگار بنۆشێ و لە ژێر سێبەری ئەو ئەشقە شیرینەدا بحەسێتەوە. ژنەکەشی تەنیا خۆشەویستی ئەو بێ. بەڵام ئەویش وەك هەموو پیاوان لە بیری دەچۆوە کە ژنیش پێویستی بە کارکردنە. پێی سەیر بوو کە چۆن ئەو کیتییە کە سەرتاپای شێعر و جوانی بوو دەیتوانی، نەك دوای چەن حەوتوو، بەڵکوو هەر لە رۆژانی یەکەمی ژیانی ژن و مێردایەتییەوە لە بیری دابینکردنی قەنەفە و دۆشەکدا بێ بۆ میوانانی لەڕێوە هاتوو، لە بیری موجوعمە و خوان و ئاشپەز و فراوێن و ئەو جۆرە

شتانەدا بێ و هەوڵ بدات بۆ دابینکردنیان و ئەو شتانەی مووبەموو لەبیربێ. هێشتا نەیگوێستبۆوە سەری لەو بڕیارەی کیتی سووڕما کە رازی نەبوو بۆ سەفەری هەندەران و بە باشی زانی بێن بۆ گوند. وەك ئەوە وابوو کە ئەو، واتە کیتی دەیزانی کە جگە لە ئەوین پێویستی بە چ شتێکی ترە لە ژیاندا و دەیتوانی جگە لە ئەوین بیر لە شتێکی دیکەش بکاتەوە. ئەوەش لەو کاتەدا رەنجاندبووی و ئێستاش هەوڵ و پەرۆشییەکانی کیتی بۆ شتە کەم هەمیەتەکانی زویری کردبوو. بەڵام دەیدی کە کیتی پێویستی بەو شتانەیە و چونکە زۆری خۆشدەویست نەیدەتوانی ئەو هەوڵانەی ئەوی بە دڵ نەبێ ئەگەرچی نەیدەزانی بۆ لە دڵەوە تۆزێ پێکەنینی پێیدێ. بەوە پێدەکەنی کە کیتی ئەو قەنەفانەی لە مۆسکۆوە بۆیان ناردبوو بە شێوەیەك لە تەلارەکە دایدەنان و ژووری خۆی و ژووری ئەوی بە مۆدێکی نوێ دەڕازاندەوە، یان پەردەکانی بە فلان شێوە هەڵدەواسی یان ژووری میوانانی داهاتوو و دالی و شوێنی نیشتەجێبوونی خزمەتکارە تازەکەی ئەوی بەو جۆرەی کە خۆی بە باشی دەزانی دابین دەکرد، بەوە پێدەکەنی کە دەستووری بە ئاشپەز دەدا بۆ فراوێن چی لێبنێت یان لەگەڵ ئاگافیا میخائیلۆڤنا تووشی دەمەقاڵێ دەبوو و خۆی چاوەدێری لە هەماری خۆراك و دانەوێڵە دەکرد. دەیدی کە ئاشپەزی پیر دەگرژییەوە و رێزی بۆ دادەنا و گوێی بۆ دەستوورە نابەجێکانی شل دەکرد، دەیدی کە ئاگافیا میخائیلۆڤنا دەچێ لە ماڵی فیکرەوە و بە روویەکی ناخۆشەوە سەری دەلەقێنێ کە ئەو خاتوونە جحێڵە سەبارەت بە کاروباری هەماری خۆراك و دانەوێڵە دەستوور دەدات، دەیدی کە کیتی بە چاوی فرمێسکتێزاو و دەمبەپێکەنین دەهات بۆ لای و دەیگوت کە ماشای خزمەتکاری عادەتی گرتووە و بە چاوی کچێکی گەنجی ماڵێ چاوی لێدەکات کە کەس گوێ بە دەستوورەکانی نادات و ئەو کاتانەش لەبەر چاوی لەڤین زۆر سەرنجڕاکێش بوو. ئەوانە هەمووی بە بڕوای ئەو جۆرێك سەرگەرمی و لەگەڵ ئەوەشدا خۆش و سەیر و سەمەرە بوون، هەر بەو هۆیەش بە باشی دەزانی کە بارودۆخەکە بکەوێتەوە سەر رەواڵی رابردوو.

ئەو ئاگای لەو گۆڕانە بوو کە لە هەستی کیتیدا پێك هاتووە. پێشتر هێندێ جار ئیشتیای کەلەرم و کواس یان شیرینیی دەکرد و نەیدەتوانی ئەوەی حەزی لێیەتی بیخوات، بەڵام ئێستا دەیتوانی ئەوەی حەزی لێیەتی راسپێرێ بۆی ئامادەبکەن و هەرچەندی پێی خۆشە شیرینی بکڕێ و بە کەیفی خۆی پارە خەرج بکات و هەرچەشنە پیراشکی یان خواردەمەنییەکی ئیشتیای لێبوو دەستوور بدات بۆی ساز بکەن.

ئێستا بە دڵخۆشییەوە خولیای هاتنی دالی و منداڵەکانی کەوتبووە سەری، بەتایبەت بەو هۆیەی کە دەیتوانی هەرچەندی منداڵەکان حەزیان لێیە راسپێرێ پیراشکی و شیرینی بکڕن و لە بیری

ئەوەشدا بوو کە دالّی مالّ و ژیانەکەی دەبینیّ و دلّخۆشانە ئافەرینی پیّ دەلّیّ. بەڕێوەبردنی کاروباری مالّیّ وای لیّکردبوو، کە نەیدەتوانی گرینگی پێنەدات و وازی لیّ بێنیّ و خۆشی نەیدەزانی بۆ؟ بە شێوەی خۆماك هەستی دەکرد کە بەهار نزیکبۆتەوە و دەیزانی بارانەڕۆژ و تەڕ و تووشییان لە پێشدایە و هەرچۆنێکە دەبیّ هەولّ بدات هێلانەیەك بۆ خۆی چیّ بکات و بیڕازێنێتەوە. زۆر لە چێکردنی ئەو هێلانەیەش بەپەلە بوو و لە پێشدا دەبوو ئەو کارە فێربیّ.

پەرۆشیی کیتی لە هەمبەر ئەو ئاریشە کەمبایەخانەدا راست بە پێچەوانەی لەڤین بوو کە بیری لە بەختەوەریی مەزنی دەورانی سەرەتای زەماوەندەکەی دەکردەوە، ئەوە بۆ ئەو جۆرێك دلّساردیی پێوە بوو بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا ئەو دلّەدواییە شیرینانەی کە لەڤین لە ماناکەیان نەدەگەیشت بەلاّم ناچاربوو چێژیان لیّوەرگرێت، سەرچاوەی یەکێك لە شەیداییە نوێیەکانی دەهاتە ئەژمار.

یەکێکی تر لە دلّساردییەکانی کە لەگەلّ ئەوەشدا ناخۆش نەبوو کێشە و دەمقرەکانیان بوو. لەڤین قەت نەیدەتوانی بیهێنێتە بەرچاوی خۆی کە لەنێوان ئەو و ژنەکەیدا جگە لە نەرمی و ئەوین و رێز شتێکی تر بوونی هەبیّ، بەلاّم لە ناکاو هەر لەو رۆژانەی سەرەتاوە تووشی قرەو شەڕەدەندووکەیەك بوون و کیتی گوتی کە ئەوی خۆشناویّ و جگە لە خۆی کەسی ناویّ و دەستیکرد بە گریان و هیوابڕاوانە دەستی هەلّتەکاند.

ئەو یەکەم کێشەیەش بەو هۆیەوە بوو کە لەڤین چووبوو بۆ مەزرایەکی نویّ و نیو سەعات درەنگتر لە کاتی رۆژان گەڕابۆوە بۆ مالّیّ، چونکە ویستبووی بە کوێرەڕێیەکەدا نێوبڕ لیّبدات و زووتر بگاتەوە مالّیّ بەلاّم رێگای لیّ تێکچووبوو. کاتی گەڕانەوە بیری تەنیا لەلای کیتی و ئەشق و بەختەوەریی خۆی بوو، هەرچی لە مالّیّ نزیکتر دەبۆوە سۆز و خۆشەویستی و شەیداییەکەی زیاتر لە دلّیدا گەشەی دەکرد. کە گەیشتەوە مالّیّ بەپەلە خۆیکرد بە ژووریدا و شەیداییەکەی تەنانەت زیاتر لەوکاتە بوو کە بە هەلّەداوان خۆی دەگەیاندە مالّی ئیشچر باتسکی تاکوو خوازبێنیی لیّبکات. بەلاّم لەناکاو لەگەلّ نێوچاوانی گرژی کیتی بەرەوڕوو بوو و دیتی ژنەکەی دەمولووتی وەها پێکدا داوە کە قەتی ئاوا نەدیبوو. ویستی ماچی بکات. بەلاّم کیتی ئەوی لە خۆی دوور خستەوە.

ـ چییە؟ ئەوە بۆ وادەکەی؟

ـ تۆ گوێت لە هیچ کەس نییە، خۆت شاد و لیّو بەبزەی! ـ کە ئەوەی گوت دەیویست لەبزی ئارام و تالّ بیّ، بەلاّم هەرکە زاری کردەوە سێلاّوی تانە و سەرکۆنە لە دەمی داڕژا. نیوسەعات بێجوولّە لە پشت پەنجەرە چاوی لە رێگاکە بڕیبوو و ئێرەیی و گومانێکی بیّ مانا

مێشك و دڵی هەڵگوڵۆفیبوو. ئەو کاتە بوو کە لەڤین ئەوەی کاتی هاتنەدەرێ لە کەنیسە دوای ڕێوەڕسمی مارەبڕین تێنەگەیشتبوو، تێگەیشت. بۆی دەرکەوت کە ئەو تەنیا لە کیتی نزیك نییە، بەڵکوو وەها ئاوێتەی بووە کە نازانێ لەکوێ ئەو کۆتاییی دێت و لەکوێ خۆی دەست پێدەکات. کە هەستی بەو کەلێنە کرد کە خەریکە دەکەوێتە ژیانییەوە خەمێك دایگرت و کزە لە دڵییەوە هەستا. سەرەتا زویربوو بەڵام هەر خێرا تێگەیشت کە نابێ لێیزیز بێ چونکە کیتی هەر خۆی بوو. سەرەتا هەستی وەك هەستی کەسێکوابوو کە لە پشتەوە زەبرێکی قورسیان لێدابێ و بە تووڕەیی و بۆ تۆڵە کردنەوە وەردەگەڕێتەوە تاکوو خەتابارەکە بدۆزێتەوە بەڵام لە پڕ بۆی دەردەکەوێ کە خۆی بووە و ناغافڵ خۆی لە جێیەك کوتاوە، بۆیە رقهەستان شتێکی بێجێیە و دەبێ ژانەکە تامڵ بکات و شوێنە ژانپێگەیشتووەکەی لەبیربەرێتەوە.

دواتر قەت ئاوا بە قووڵی لەو مانایە نەگەیشت، بەڵام هەر لەم یەکەم جارەدا هەتا ماوەیەکی زۆر وەخۆ نەهاتەوە. کاردانەوەی سروشتیی ئەوە بوو کە بەرەڤانی لە خۆی بکات و بیسەلمێنێ کە بێتاوانە و خەتابار رووبەڕووەکەیەتی. بەڵام سەلماندنی تاوانی کیتی رقەکەی ئەستوورتر کرد و کەلێنێك کە بووبووە هۆی ئەو کێشەیەی نێوانیان قووڵتری کرد. دڵی پێیدەگوت باری تاوانەکە لە کۆڵی خۆی بکاتەوە و بە کۆڵی کیتییدا بدات. بانگێکی تریش کە بەهێزتر بوو وای لێدەکرد کە هەرچی زووتر کارێك بکات و نەهێڵێ ئەو کەلێنەی نێوانیان قووڵتر بێت و هەوڵ بدات پڕی بکاتەوە و رێك و تەکووزی بکات. باری تاوانێکی نەکردوو لە ئەستۆگرتن زۆر ناخوش بوو بەڵام سەلماندنی بێتاوانی و خستنە ئەستۆی ئازیزی خۆت زۆر دژوارە و دەبێ دڵت وەك بەرد وابێ کە بتوانی ئەو کارە بکەیت. وەکوو نەخۆشێکی نیوە خەوتوو و کەلەلا کە دەیهەوێ شوێنە پڕ ژانەکەی لە خۆی بکاتەوە و تووڕی هەڵدات، بەڵام کاتێك وە ئاگادێت دەبینێ شوێنە بەژانەکەی لەشی وجوودی خۆیەتی. دەبێ هەوڵ بدات و شوێنە بەژانەکەی بشێلێ و لەپاڵیی بکات بۆ ئەوەی ژانەکە هێوربکاتەوە و بتوانێ تامڵی بکات، ئەویش هەوڵی دەدا کە ئەو کارە بکات.

ئاشتبوونەوە. کیتی تێگەیشت کە خەتای کردووە بەڵام ددانی بە خەتاکەیدا نەنا، بە پێچەوانە، بە مێهرەبانییەوە باوەشی بۆ گرتەوە و شیرینایی ئەشقەکەیان بوو بە دووبەرانبەر و پێکەوە شیلەی ئەو ئەشقە تازەیان چێشت. بەلام ئەوە نەبووە لەمپەرێك کە ئەو جۆرە گرژییانە روو نەدەن، تەنانەت زیاتریش بوو و بە بیانووی چاوەڕوان نەکراو و هیچەکەوپووچەکە زوو زوو لە یەکتر دەتۆران. ئەو کێشە و دەمەقاڵێیانەش زیاتر بەو هۆیە رووی دەدا کە ئەوان هێشتا نەیاندەزانی چ شتێك بۆ هەرکامیان گرینگە و هەر بەو هۆیەش لەو ماوەیدا زۆربەی کاتەکان لە یەکتر لووتەلا بوون. کاتێك کە یەکیان

لووتی هەڵدەمەساند و ئەوی تریان رووخۆش بوو ئاشتیی نێوانیان تێك نەدەچوو، بەڵام کاتێك کە هەردووکیان رقیان هەڵدەستا و خۆیان دەخواردەوە کێشەکەیان لەسەر شتێکی ئەوەندە سووك و بێ مانا ساز دەبوو کە دواتر وەبیریان نەدەهاتەوە لەسەرچی بووە. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك کە هەردووکیان شاد و دڵخۆش دەبوون بەختەوەرییەکەیان دەبووە دوو بەرانبەر، ئەگەرچی ئەو رۆژانەی سەرەتای ژیانی ژن و مێردایەتییان پڕبوو لە ئاڵۆزی و دژواری.

لە تەواوی ئەو ماوەیەی سەرەتای ژیانی هاوبەشیان ئاریشەیەکی قورس لەنێوانیاندا نەبوو. ژیانیان وەك کایەی منداڵان وابوو، دەتگوت زنجیرێك ئەوانی پێکەوە بەستۆتەوە و هەرجارە لەلایەکەوە دەکێشرێت. بە گشتی مانگی هەنگوینی ئەوان، یانی مانگی دوای زەماوەندەکەیان، کە لەڤین بە پێی دابونەریت زۆری چاوەڕوانی لێیهەبوو، نەك هەر هەنگوینی نەبوو بەڵکوو لە روانگەی ئەوانەوە دژوارترین و پڕ سووکایەتی ترین دەورانی ژیانیان بوو. ئەوان هەردووکیان دواتر بە شێوەیەکی یەکسان هەوڵیان دەدا کە شوێنەواری ناحەزی و پڕشوورەییی ئەو دەورانە هەرزەکارییە لە زەینیاندا بسڕنەوە و وردە وردە خەریکبوون وەخۆ دەهاتنەوە و ئیتر لاساری و دەرهەڵبوونیان وەلا دەنا.

تەنیا لە مانگی سێهەمی دوای زەماوەندەکەیاندا بوو کە مانگێك چوون بۆ مۆسکۆ و کاتێك گەڕانەوە وەك مێو و رۆنیان لێهات.

## پازدە

تازە لە مۆسکۆ گەڕابوونەوە و ئەو خەڵوەتە پڕبوو لە چێژ و ئەوین بۆیان. لەڤین لە وەتاغی کارەکەی لە پشت مێزی نووسین دانیشتبوو و خەریکی نووسین بوو، کیتیش هەر ئەو کراسە بنەوشە تۆخەی لەبەردا بوو کە رۆژانی سەرەتای زەماوەندەکەیان لەبەری دەکرد، بۆیە بەلای لەڤینەوە زیندووکەرەوەی بیرەوەرییەکی شیرین بوو، هەر بۆیە زۆری بەدڵ بوو، لەسەر ئەو قەنەفە قایشەش دانیشتبوو کە هەمیشە لە ژووری کاری باوك و باپیری لەڤین داندرابوو. خەریکی گوڵدۆزی بوو. لەڤین بیری دەکردەوە و دەینووسی و بەردەوام بە دڵخۆشییەوە هەستی بە حوزووری کیتی دەکرد لە پەنای خۆیدا. ئەو نە دەستی لە خوێندنەوە هەڵگرتبوو و نە پێڕاگەیشتنی کاروباری مڵکەکەی و نە نووسینی ئەو کتێبەی کە دەیویست شێوازە نوێیەکەی

خۆی سەبارەت بە کشتوکاڵ لەودا روون بکاتەوە. بەڵام هەرچەندە لە رابردوودا ئەو متاڵا و ئەندێشانەی لە بەراوەرد لەگەڵ تاریکییەك کە سەرتاپای ژیانی داگرتبوو زۆر کەمڕەنگ و هیچی دەنواند، هەر بەو رادەیەش ئێستا لە هەمبەر دوورنوێنی داهاتووی کە پڕشنگی بەختەوەری رووناکی کردبۆوە زۆر کەمڕەنگ بوون. درێژەی بە موتاڵای خۆی دەدا، بەڵام هەستی دەکرد کە تیشکی سەرنجی لەسەر شتێکی تر گیرساوەتەوە و لە ئاکامدا بیروڕای لەسەر ئەو مەسەلەیە بە تەواوی گۆڕانی بەسەردا هاتووە و رووناکتر بۆتەوە. لە رابردوودا ئەو کارە بۆ ئەو بیانوویەك بوو بۆ دەربازبوون لە ئازاری ژیان و هەستی دەکرد کە بەبێ ئەو کارە ژیانی بە گەرووی شەوەزەنگدا رۆ دەچێ، بەڵام ئێستا پێویستی بەو کار و متاڵایە هەبوو تاکوو ژیانی یەکسەر لە تیشکێکی تیژ و یەکهاویدا ئەوق نەبێ. چونکە دیسان دەستبەکاربوو و ئەوەی نووسیبووی پێیدا هاتەوە، بە دڵخۆشییەوە بۆی دەرکەوت کە کارەکەی بەڕاستی بایەخی ئەوەی هەیە کە کاتی خۆی بۆ تەرخان بکات. ئەم کارەی بە شتێکی تازە و بەکەڵك زانی. زۆربەی بیر و خەیاڵەکانی رابردووی وەك هاتەران پاتەران و قسەی زیادی هاتە بەرچاو، کە لە بیری خویدا سەرلەنوێ بە هەموو مەسەلەکانی خۆیدا هاتەوە زۆر شوێنی بەتاڵی تێدا دۆزییەوە. ئێستا خەریکی نووسینی بەشێکی نوێ بوو سەبارەت بە هۆکاری کەمداهاتبوونی کشتوکاڵی رووسیا. دەیویست بیسەلمێنێ کە هەژاریی رووسیا نەك هەر بە هۆی دابەشکردنی مڵك و شێوەی بەرێوەهێنان هەڵەیە، بەڵکوو بەو هۆیەیە کە ژیاری بیانی، بەتایبەت بە شێوەی رێکارە پێوەندییەکان و تۆڕی هێڵاسن لە ساڵانی دواییدا بە شێوەیەکی دەستکرد لە ژیاری رووسیا متوربەکراوە و کۆبوونەوەی داهات لە شارەکان و زۆربوونی زەرق و بەرق کە لەو کەوتۆتەوە، بۆتە هۆی پێشکەوتنی پیشەسازی لە کاری کشتوکاڵ و هاتنە ئارای کڕین و فرۆشتنی بڕوامەندانە و بوورسبازی کە هاوڕێی هەمیشەیی ئەوە. لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە کاتێك سامانی گەلێك بە شێوەیەکی ئاسایی گەشە بکات ئەو دیاردانە هەموویان دوای ئەوەی کارێکی باش و بەکەڵك لە بواری کشتوکاڵدا بەرێوەچووبێ و کشتوکاڵ لە بارودۆخێکی لەبار و لانیکەم دیاریکراودا گەشەی سەندبێ دێتە ئاراوە. بڕوای وابوو کە سامانی وڵات دەبێ بەرەبەرە گەشە بکات و بەتایبەت جۆرێك بێت کە لقەکانی تری سامان نابێ لە گەشەی کشتوکاڵ خێراتر بێ و بەپێی گەشەی کشتوکاڵی دیاریکراو دەبێ رێگا پێوەندیدارەکان بە رادەیەکی دیاریکراو گەشەیان کردبێ و بە سەرنجدان لە کەڵکی نابەجێی ئێمە لە خاکی دامەزراندنی تۆڕی هێڵاسن کە پێویستییەکی نەك ئابووری بەڵکوو سیاسی و کارێکی نابەجێ

و ناوەخت بووە و بەجێی ئەوەی ببێتە هۆی گەشەکردنی کشتوکاڵ کە چاوەڕوانیمان لێیهەیە، یارمەتیی گەشەی بوارەکانی تری پیشەسازی و کڕین و فرۆشتنی بڕوامەندانەی داوە و بۆتە هۆی چەقبەستنی گەشەی کشتوکاڵ و لە ئاکامدا هەروەك گەشەکردنی یەکلایەنە و ناوەختی ئەمدانی گیانلەبەرێك دەبێتە کۆسپ و گرفت بۆ ئەوەی گەشە نەکات، گەشەکردنی کڕین و فرۆشتنی بڕوامەندانە و تۆڕی ڕێگاوبانەکان و زوربوونی ئێجبارییانەی چالاکیی پیشەسازیش چونکە لە ئەورووپا بەجێ و لە کاتی خۆیاندا زۆریش پێویستن، بەڵام لە رووسیا بۆ گەشەی گشتیی سامان زیانبار بوون، چونکە بوونەتە هۆی ئەوەی کە مەسەلەی گرینگی ئێستامان یانی پڕ داهات بوونی کشتوکاڵ وەلا بنرێ.

لەگەڵ ئەوەی لەڤین بەکاری نووسینەوە سەرقاڵ بوو، کیتی لە بیری ئەوەدابوو کە سەرنجی مێردەکەی لە هەمبەر پرێنس چارسکیی لاودا زۆر نائاسایی بوو کە شەوی بەر لە وەرێکەوتنی ئەوان زۆر رووهەڵماڵدراوانە خۆشەویستی خۆی بۆ ئەو (یانی بۆ کیتی) دەربڕیبوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: «سەیرە، یانی دڵپیسی دەکات؟ خودایە مێردەکەم چەندە شیرین و مێهرەبان و بێ ئەقڵە.» بە هەستێکی خاوەندارێتییەوە کە بۆخۆی شتێکی تازە بوو چاوی لە پشت مل و لاملە سوورەکەی کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی «نا، دڵپیسیم لێدەکات. خۆزگە بیزانیبایە کە ئەو پیاوانە بۆ من لەگەڵ پیۆتێری ئاشپەز هیچ جیاوازییەکیان نییە. ئەگەرچی حەیفە بەرگریی لێبکەم و نەهێڵم ئەو کارە بکات، بەڵام قەیناکا، کات زۆرە. حەتمەن دەبێ چاو لە روخساری بکەم. یانی هەست دەکات کە من چاوی لێدەکەم؟ حەزدەکەم ئاوڕ بداتەوە.... دەمهەوێ، زوو کە ئاوڕ بدەوە!» چاوانی زیت کردەوە و دەیویست بەو کارە قورسایی روانینەکەی زیاتر بکات.

لەڤین لە ژێر لێوەوە گوتی: بەڵێ، ئەوانە تەواوی شیلەی گیانی خەڵکیان کێشاوە و بریقوباقێکی درۆیینەیان سازکردووە ـ دەستی لە نووسین هەڵگرت و قەڵەمەکەی دانا، کە هەستی دەکرد کیتی چاوی لێدەکات، بە پێکەنینەوە ئاوڕی دایەوە و هەستا، گوتی: چبووە؟

کیتی لە دڵی خۆیدا گوتی «ئاوڕی دایەوە.»

گوتی: هیچ تەنیا دەمویست ئاوڕێك بدەیتەوە ـ چاوی لێکرد و دەیویست بزانێ تووڕە بووە لەبەرئەوەی لە کاریان کردووە یان نا.

لەڤین بە بزەیەکی شیرینەوە هات بۆ لای و گوتی: چەندە خۆشە ئاوا بە تەنیاین! لانیکەم بۆ من زۆر خۆشە.

ـ منیش زۆرم پێخۆشە. لێرە ناڕۆم، بەتایبەت بۆ مۆسکۆ هەر ناچم.

ـ بیرت لەچی دەکردەوە؟

کیتی لێوی وەك خونچە کۆکردەوە و گوتی: من، لە بیری ئەوەدا بووم کە... نا، لێیگەڕێ، بڕۆوە سەرکارەکەت. مەهێڵە هۆش وفیکرت ئاڵۆز بێ. منیش ئەو چەند کونە دەردێنم. دیتووتە؟

مقەستەکەی هەڵگرت و دەستیکرد بە بڕین.

لەڤین لە پاڵیدا دانیشت و لەگەڵ ئەوەی چاوی لە نووکی مقەستەکە بوو کە بە شێوەیەکی بازەنەیی پەڕۆکەی کون دەکرد، گوتی:

ـ نا، پێمبڵێ دەی، بیرت لەچی دەکردەوە؟

ـ ئەها... بیرم لەچی دەکردەوە؟ لە مۆسکۆ، لە پشت ملی تۆ.

لەڤین دەستی ماچکرد و گوتی: ئەم هەستی بەختەوەرییە چییە کە ئاوا رۆح و گیانی داگرتووم؟ سروشتی نییە. ژیان لە رادەبەدەر شیرینە.

ـ بە پێچەوانە، من پێموایە ژیان هەتا شیرینتر بێ سروشتی ترە.

لەڤین سەری کیتی بە نەرمی وەرسووڕاند و گوتی: ئەوەچییە؟ پەلکەت هۆنیوەتەوە؟

ـ بەڵێ، هۆنیومەتەوە، چاوی لێکە. بەڵام نا، دەبێ کار بکەی. هەستە بڕۆ.

بەڵام ئیتر درێژەی بە موتاڵا نەدا و کاتێك کۆزما هاتەژوورێ و گوتی چایی ئامادەیە، ئەوان وەك ئەوەی تووشی تاوانێك بووبێتن بەخێرایی لێك دوورکەوتنەوە.

لەڤین لە کۆزمیچی پرسی: کەس لە شارەوە نەهات؟

ـ هەر ئێستا هاتن و خەریکن بارەکان دادەگرن.

کیتی کە خەریکبوو دەچووەدەرێ گوتی: زوو وەرە، دەنا خۆم بە تەنیا نامەکان دەخوێنمەوە. پاشانیش دەخوازم پێکەوە پیانۆ بژەنین.

لەڤین تۆزێ راوەستا تاکوو کتێب و نامیلکەکانی بخاتە ئەو جانتایەوە کە کیتی بۆی کڕیبوو، پاشان دەستی لەسەر ئەو دەستشۆرییە نوێیە شۆرد کە هەموو کەلوپەلە تازەکانی لەگەڵ کیتی هاتبوون و پێکەنینی بە بیر و خەیاڵی خۆی دەهات و بۆ حاشاکردن لەو بیرانەی سەری هەڵدەتەکاند. شتێکی وەك پەشیمانی ئازاری دەدا. خاوبوونەوەیەکی پڕشوورەیی و خۆی گوتەنی کاپووا[١٤] لە ژیانیدا سەری هەڵدابوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەمجۆرە ژیانە باش نییە.

---

١٤- کاپووا (Capua) شارێکە لە ئیتالیا نزیك ناپل کە بە وتەی لیڤی (شسخپ) لەشکری هایبنال لە شەڕی دووهەم لە شەڕەکانی کارتاژی زستانیان لەوێ تێپەڕ کرد و ژیانێکی خوش و ئاسوودە و پڕ لە بێکاری

زۆری نەماوە بۆ سێمانگ و من هێشتا هیچ کارێکم نەکردووە کە لە کار بچێ. ئەمڕۆ تازە بەشێوەیەکی جیددی دەستبەکاربووبووم و ئەویش چۆن؟ دەستمپێنەکرد و وەلام نا! تەنانەت وازم لە موتالاّی هەمیشەییم هێناوە و بەکاری کشتوکالّیش راناگەم، نە بە پێیان دەچم بۆ مەزراکانی دەوروبەر و نە بە سواریش بۆ مەزرا دوورەدەستەکان. هێندێ جار ئۆقرە ناگرم و دلّنیایە بە تەنیا بەجێی بهێلّم. هێندێ جار دەبینم تاقەتی نییە. من پێم وابوو ژیان بەر لە زەماوەندکردن بە هەر شێوەیەك بێ تێپەڕ دەبێ و پیاو زۆری بیر لێناکاتەوە بەلاّم دوای زەماوەندکردن ژیانی راستەقینە دەستپێدەکات.

ئێستا سێمانگ بەسەر زەماوەندەکەمدا تێپەڕیوە و من قەت ئاوا بێکار و بێبار کاتم بە فیڕۆ نەداوە. نا، ئاوا نابێ. دەبێ دەست پێبکەم. روون و ئاشکرایە کە ئەو خەتای نییە. بە هیچ شێوەیەکیش ناکرێ سەرکۆنەی بکەم. منم کە دەبێ خۆڕاگر بم و سەربەستیی پیاوانەی خۆم بپارێزم. دەنا لەوانەیە بەم جۆرە خوو بە تەوەزەلی و لەشگرانی بگرم و ئەو عادەتە ناحەزە فێری ئەویش بکەم... دیارە کە ئەو خەتای نییە.

بەلاّم مرۆڤی نارازی زۆر بە دژواری دەتوانێ کەسێکی تر لۆمە نەکات و تاوانی ناقابیلبوونی خۆی نەخاتە ئەستۆی نزیکترین کەسی. زۆر بە لێلّی بە زەینیدا هات کە کیتی هیچ تاوانێکی نییە (ناتوانی هیچ تاوانێکی بدەیتە پالّ.) تاوان لە بارهێنانەکەیدا کە هەرزە و سەرسەرییانە بووە (ئاخ لە دەست ئەو چارسکییە گەوجە! من دەزانم، کیتی حەزی دەکرد بەلاّم نەیدەتوانی ئەو بەخۆدا بشکێنێتەوە و دەمکوتی بکات.) جگە لە هۆگری بە کاروباری مالّێ (هۆگری بە بەڕێوەبردنی مالّ نکوولّیی لێنەدەکرا) و لەبەرکردنی جلوبەرگی جوان و گولّدۆزیکراویش هیچ هۆگرییەکی بە کاری جیددی نییە. نە هۆگریی بە کارەکەی من، یانی کشتوکالّ و کاری مووژیکەکان هەیە، نە بە مۆسیقا، کە ژەنیارێکی باشیشە، نە خوێندنەوەی کتێب، هیچ کارێك ناکات و نارازیش نییە.» لەڤین ئەو حالّەوبالّەی بەدلّ نەبوو و هێشتا نەیدەزانی کە ژنەکەی خەریکە خۆی بۆ دەورانێك لە تێکۆشان ئامادەدەکات کە زۆر زوو کاتی دێت و ئەو لەو دەورانەدا دەبێ هاوسەری مێردەکەی و خاتوونی مالّێ و لەگەلّ ئەوەدا ژنێکی دووگیان و پاشان دایکێکی مندالّەبەر و راهێنەری مندالاّن بێ. ئەو نەیدەزانی کە کیتی بە

---

خاوی کردنەوە و سپای ڕوم تێکیشکاندن. تۆلستۆی لە ڕۆژنامەی خۆیدا ئەم وشە نوێیەی بۆ وەسفی دەورانی ئاسوودەیی و ڕابواردن بەکار هێناوە.

شێوەیەکی خۆماك لەوە دەگات و خۆی بۆ ئەو کارە پڕ لە ترس و دڵەخرپەیە ئامادەدەکات. هەر بەو هۆیەش کاتەکانی بێخەیاڵی و چێژوەرگرتن لە ئەوین کە لەودا هەوڵی دەدا و دڵشادانە هێلانەی داهاتووی خۆی چێ دەکرد، بە شتێکی نارەوا نازانێت و بە هۆی ئەوەوە خۆی سەرکۆنە ناکات.

## شازده

کاتێك لەڤین هاتەسەرێ ژنەکەی لە پشت سەماوەرە زێوینەکە و لە پاڵ کەلوپەلی چاییی تازە دەمکراودا دانیشتبوو، ئاگافیا میخائیلۆڤنای بەساڵاچووشی لە پشت مێزێکی بچکۆلانە دانیشاندبوو و پەرداخێکی چایی بۆ تێکردبوو و خەریکی خوێندنەوەی نامەیەکی دالی بوو کە بەردەوام نامەیان بۆ یەکتر دەنارد.

ئاگافیا میخائیلۆڤنا بە زەردەیەکی دۆستانەوە چاوی لە کیتی کرد و بە لەڤینی گوت: بڕوانە، خێزانت منی لێرە دانیشاندووە. دەستووری داوە لەلای دانیشم.

لەڤین لە قسەکانی ئاگافیا میخائیلۆڤنادا کۆتاییی کێشەیەکی تاڵی خوێندەوە کە لەو دواییانەدا لەنێوان ئەو پیرێژنە و ژنەکەیدا رووی دابوو. دەیدی کە سەرەڕای داخ و خەمێکی قورس کە ژنەکەی، یانی خاتوونی تازە، بۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات و بەڕێوەبردنی کاروباری ماڵێ لەسەر دڵی ئەو پیرێژنە سەرسپییەی دانابوو ئێستا توانیویەتی سەرکەوتن بەدەست بێنێ و دڵی بەرانبەرەکەشی بێنێتەوەجێ.

کیتی نامەیەکی خەتناخۆش و نەخوێندەوارانەی دایەدەستی و گوتی: هانێ خەریکبووم نامەکەتم دەخوێندەوە. وادیارە هی ئەو ژنەیە کە براکەت... هەموویم نەخوێندەوە. ئەوانەش هی باوکم و دایکم و دالییە. تۆ دەزانی دالی گریشا و تانیای بردووە بۆ کۆڕێکی سەمای منداڵان کە لە ماڵی سارماتسکی بەڕێوەچووە. تانیا جلوبەرگی مارکێزی لەبەردا بووە.

بەڵام لەڤین ئیتر گوێی بۆ رانەگرت. رەنگی سوورهەڵگەڕابوو و نامەکەی ماریا نیکۆلایڤنا گراوی پێشووی براکەی وەرگرت و دەستیکرد بە خوێندنەوەی. ئەمە نامەی دووهەمی ماریا نیکۆلایڤنا بوو. ئەو لە نامەکەی پێشوودا نووسیبووی کە براکەی ئەوی بەبێ هیچ خەتا و

تاوانێك له خۆی تاراندووه و به سایلۆجییه‌کی دڵته‌زێنه‌وه نووسیبووشی که ئه‌و ئه‌گه‌رچی ئێستا دیسان له ده‌ستودوو که‌وتووه به‌ڵام هیچ داواکارییه‌کی لێینییه و هیچ شتێکی ناوێ، ته‌نیا خه‌می نیکۆلای دیمیتریچ ئازاری ده‌دات که به‌بێ په‌ره‌ستار و بنه‌وان تووشی به‌ڵایه‌ك ده‌بێت و داوای له له‌ڤین کردبوو ئاگای لێبێ. ئێستا له‌و نامه‌یه‌دا شتێکی تری نووسیبوو. نووسیبووی که دیسان له مۆسکۆ نیکۆلای دیمێتریچی دیوه‌ته‌وه و له‌گه‌ڵیدا چووه بۆ شارێك که براکه‌ی له‌وێ کارێکی فه‌رمانگه‌ی په‌یدا کردووه، به‌ڵام نیکۆلای دیمیتریچ له‌وێ له‌گه‌ڵ سه‌رۆکی فه‌رمانگه‌که به‌شه‌ڕ هاتووه و گه‌ڕاوه‌ته‌وه بۆ مۆسکۆ، له نیوه‌ی ڕێگاش وا نه‌خۆش که‌وتووه که به‌حاڵ ڕۆحی تێدا ماوه. نووسیبووی «سه‌ری زمان و بنی زمانی ناوی ئێوه‌یه و ئاشته‌بای خودای به جه‌رگه‌وه نه‌ماوه.»

کیتی به پێکه‌نینه‌وه ڕووی تێکرد و گوتی: دیوته دالی چیی بۆ تۆ نووسیوه ـ به‌ڵام که چاوی به ڕوخساری مێرده‌که‌ی که‌وت و دیتی ڕه‌نگی تێکچووه قسه‌که‌ی ته‌واو نه‌کرد.

ـ چییه، چیبووه؟

ـ نووسیویه‌تی نیکۆلای برام خه‌ریکه ده‌مرێ. من ده‌ڕۆم.

کیتی له ناکاو ڕه‌نگی هه‌ڵبزڕکا. بیری تانیا به لیباسی مارکێزه‌وه و خه‌یاڵی دالیی له‌بیرچووه.

گوتی: که‌نگێ ده‌ڕۆی؟

ـ سبه‌ینێ.

کیتی گوتی: منیش دێم. ده‌کرێ؟

له‌ڤین به لۆمه‌وه گوتی: کیتی ئه‌وه چ قسه‌یه‌که ده‌یکه‌ی؟

کیتی که دیتی مێرده‌که‌ی ئاوا به نابه‌دڵی و ته‌نانه‌ت به تووڕه‌ییش له‌گه‌ڵ ئه‌و پێشنیاره‌ی به‌ره‌وڕوو بوو ئه‌وه‌نده‌ی دیکه ڕه‌نگی بزڕکا و زیز بوو. گوتی: چۆن ئه‌وه چ قسه‌یه‌که؟ بۆ نه‌یه‌م؟ خۆ مزاحیمی تۆ نابم. من...

له‌ڤین گوتی: من براکه‌م له حاڵی گیانکه‌شتدایه بۆیه ده‌چم، تۆ بۆ دێی؟....

ـ من بۆ دێم؟ هه‌ر به‌و هۆیه‌ی که تۆ ده‌چی.

له‌ڤین له دڵی خۆیدا گوتی: «له کاتێکی ئاوادا که تا ئه‌وڕاده‌یه بۆ من گرینگه، ئه‌و هه‌ر له بیری ته‌نیایی و بێتاقه‌تیی خۆیدایه.» ئه‌و په‌ڵپگرتنه‌ی ژنه‌که‌ی بۆ سه‌فه‌رێکی ئاوا گرینگ ئیمان هه‌رده‌ی کرد.

به له‌بزێکی تونده‌وه گوتی: شتیوا هه‌ر نابێ.

ئاگافیا میخائیلۆڤنا که دیتی خەریکه تووشی شەڕەدەندووکه دەبن بە ئارامی پەرداخه چاییەکەی دانا و لە ژوورەکه هاتەدەرێ. کیتی تەنانەت ئاگای لە ڕۆیشتنی ئەو نەبوو. لەبزی مێردەکەی کاتی دەربڕینی ئەو قسانە بۆیە زۆری ڕەنجاند کە دیاربوو بڕوا بە قسەکەی ئەو ناکات.

به قین و تووڕەییەوە گوتی: پێمگوتی ئەگەر بچی منیش دێم و حەتمەن دێم. بۆ شتی وا هەر نابێ؟

لەڤین کە هەوڵی دەدا لەسەرەخۆ بێ گوتی: چونکە مەعلووم نییە دەچم بۆکوێ و بارودۆخی ڕێگاوبان چۆنە و دەبێ لە چ میوانخانەیەك بخەوم.

ـ گرینگ نییە. من پێویستم بە هیچ نییە و تۆ هەرکوێیەك بتوانی بچی و لێیبخەوی منیش دەتوانم.

ـ هەر ئەوەیکە ئەو ژنە لەوێیە و تۆ ناتوانی لەگەڵی بەرەوڕوو بی خۆی هۆیەکی گەورەیە.

ـ من نازانم و ناشمهەوێ بزانم کە کێ لەوێیە و ئەوێ چجۆرە شوێنێکە. هەر ئەوەندە دەزانم کە هێوەرەکەم بە گیانەڵڵاوەیە و مێردەکەم دەبێ لە ژوور سەری بێت و منیش لەگەڵ مێردەکەمدا دەچم تاکوو....

کیتی، تووڕە مەبە، بەڵام تۆزێ بیری لێبکەوە. ئەو کارە هێندە گرینگە کە کاتێك بیری لێدەکەمەوە کە تۆ هەستی تەنیایی و خەمی خۆتی لەگەڵ تێکەڵ دەکەی زۆر خەمگین دەبم. چاکە ئەگەر تاقەتی ئەو تەنیاییەت نییە و وەڕەز دەبێ، باشە بچۆ بۆ مۆسکۆ.

کیتی گوتی: ئەوەتا، تۆ هەمیشە ویستی دزێو و بیری پڕسووکایەتی دەدەیتە پاڵم ـ دەنگی فرمێسکی ڕەنجان و ڕقی تێدا هەڵدەقولا: هیچم نییە. نە هەست بە جاڕزی دەکەم و نە شتێکی تر... تەنیا لەسەر ئەو باوەڕەم کە کاتێك مێردەکەم دلتەنگ و خەمبارە بە ئەرکی سەرشانی خۆمی دەزانم کە پشتی بەرنەدەم. بەڵام تۆ بەئانقەست دەتهەوێ دڵم بشکێنی و ناخوازی لە مەبەستم بگەی...

لەڤین لەجێی خۆی هەستا و بە تووڕەیی گوڕاندی: نا، ئەوە ئیتر زۆر تاڵ و ترسناکە و ژیانی بەندایەتی بەو شێوەیە تامڵ ناکرێت ـ بەڵام هەر لەو کاتەدا هەستیکرد کە زەبری تووڕەییەکەی خەریکه لە خۆی دەکەوێ.

کیتی هەستا سەرپێ و بەدەم ڕۆیشتنەوە بۆ ژووری میوانداری گوتی: کەوایە تۆ بۆ ژنت هێنا؟ ئەگەر ژنت نەهێنایە نەدەبوویە بەندە! کوێرا؟ ئەگەر ئاوا زوو پەشیمان بوویەوە بۆ ژنت هێنا؟

کاتێك لەڤین چوو بۆ لای، کیتی زوورەزوور دەگریا.

لەڤین دەستیکرد بە قسەکردن لەگەڵیدا و هەوڵیدا وشەی وا بدوزێتەوە کە نەك قانعی بکات بەڵکوو هێوری بکاتەوە. بەڵام کیتی گوێی بۆ نەدەگرت و قسەکانی ئەوی بەدڵ نەبوو. لەڤین دانەوی و بە زۆری دەستی کیتی گرت کە رایدەپسکاند، دەستی ماچکرد و پاشان بسکی و دیسان دەستی و کیتی هەروا بێدەنگ بوو. بەڵام کاتێك لەڤین بە هەردوو دەستی سەری گرت و روخساری ئەوی بۆ لای خۆی بەرزکردەوە، کیتی وەخۆ هاتەوە و توزێ فرمێسکی هەڵوەراند و ئاشت بۆوە.

بڕیارياندا رۆژی دوایی پێکەوە وەڕێ بکەون. لەڤین بە ژنەکەی گوت کە بڕوای پێدەکات کە تەنیا بە قەستی یارمەتی دەیهەوێ لەگەڵیدا بچێت. قەبووڵی کرد کە بوونی ماریا نیکۆلایڤنا لەلای براکەی شتێکی نەشیاو نییە. بەڵام بە حاڵێکەوە دەچوو بۆ ئەو سەفەرە کە لە دڵەوە رقی لە خۆی و لە ئەو هەستا بوو. لە ئەو ناڕازی بوو کە ناتوانێ خۆی خاترجەم بکات کە لەکاتی پێویستدا ئازادی بکات و دڵپیسیی لێنەکات (سەری لەوەش سووڕ مابوو کە هەتا ئەم دواییيانە باوەڕی نەدەکرد کە کیتی خۆشیبوێ و بڕوای بەو بەختەوەرییەی خۆی نەدەکرد، ئێستاش لەوە ناڕازی بوو کە کیتی لەڕادەبەدەر خۆشیدەوێ.) لە خۆشی ناڕازی بوو کە نەیتوانیبوو قسەی خۆی بەرێتەسەرێ و لە دڵەوە نەیدەتوانی بە خۆی بسەلمێنێ کە دیداری ژنەکەی لەگەڵ ژنێك کە پەرستاری لە براکەی دەکات گرینگ نییە، بۆیە یەککەوتنی ئەوان ترسی خستبووە دڵییەوە. بیرکردنەوە لە ژنەکەی، کیتییە خۆشەویستەکەی، ئەگەر تەنانەت بۆ چەند چرکەش بێ لەگەڵ ئەو ژنە لە ژوورێکدا تووشی ترس و دڵەوڕێزەی دەکرد و لەرزی بە ئەندامیدا دەهێنا.

## حەڤدە

میوانخانەی ئەو شارە کە نیکۆلای لەڤین لە یەکێك لە ژوورەکانیدا کەوتبوو، یەکێك لە میوانخانەکانی شار بوو کە بە پێی مۆدی نوێ و لە هەموو باریکەوە تەواو و بە شیاوترین قەستی پاکوخاوێنی و ئاسوودەیی و تەنانەت زوریش رازاوە سازکرابوو، بەڵام چونکە موسافیر زۆر دەهاتن لەوێ دەمانەوە و دەڕۆیشتن بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر وەك میوانخانەی نێوڕێی

لێهاتبوو کە خاوەنەکانیان بە مودێڕنی دەزانن، کەچی زۆر زوو لە مسافیرخانە کۆن و پیس و شێدارەکان خراپتریان بەسەر دێ. ئەو میوانخانەیەش بەو دەردە چووبوو. ئەو سەربازەی کە یۆنیفۆرمێکی چڵکنی لەبەردا بوو و لەبەر دەرگاکە راوەستابوو جگەرەی دەکێشا و ئەرکی دەرگاوانیی لە ئەستۆ بوو، پلیکانێکی چۆدەنیی ناحەز و تاریك و تەنگەبەر کە راست و بەبێ پێگۆڕکە دەچوو بۆ نهۆمی سەروو، هەروەها پێشخزمەتێکی رووهەڵماڵدراو کە فراکێکی چڵکنی لەبەردا بوو و زۆر لەوە دەچوو تاقەتی کاری نەبێ، تەلاری گشتیش کە تۆز و خۆڵ دایگرتبوو و چەپکە گوڵێکی دەستکردی تەپوتۆزاوی لەسەر مێزەکەی بوو و سەرتاپای دارو دیوارەکانی چڵك و پیسایی و شپرێویی لێدەباری، پاشان جموجۆڵێکی تازە کە لە دیاردەکانی ژیاری نوێ بوو فیز و هەوایەکی قۆڕەدەماخانەی پێوە دیاربوو، هەموویان دەستیاندایە دەست یەك و ئەو ژن و مێردە گەنجەیان تووشی دڵتەنگی و خەمۆکی کرد، بەتایبەت بەو هۆیەی کە ئەوان بە چاوێکی تر لەو میوانخانەیان روانیبوو و هەستێکی تر لە دڵیاندا بوو و بە هیچ شێوەیەك چاوەڕوانیی شتێکی ئاوا کرێت و پیسیان نەکردبوو.

بەپێی باوی خۆیان لێیان پرسین کە چ جۆرە ژوورێکیان دەوێ (یانی کرێکەی چەندە بێ) و بۆیان دەرکەوت کە تەنانەت ژوورێکی باش و خاڵییان نییە. یەکێك لەو چەندە ژوورە خاوێنەی مابوو یەکیان بازرەسێکی هێلاسن گرتبووی و دووهەمی پارێزەرێکی خەڵکی مۆسکۆ و سێهەمی پرێنسسێك بە ناوی ئاستافییڤا[15]کە لە لادێوە هاتبوو. جگە لە ژوورێکی پیس و شپرێو هەموو ئەوانیدیکە گیرابوون، بەڵام بەڵێنیان پێدان کە ژووری تەنیشتیان هەتا شەوێ خاڵی دەکرێ. لەڤین کە دیتی ئەوەی چاوەڕوانیی دەکرد بۆی هاتۆتە پێشێ، بیر و خەیاڵی براکەی ئاراوقارای لێهەڵگرتبوو و تووڕە و بێتاقەت بە هۆی ئەوەوە کە ناتوانێ راست بچێت بۆ لای براکەی و دەبێ لە بیری پەیداکردنی جێگادا بێ بۆ ژنەکەی، کەوتە پێش کیتی و بردی بۆ ژوورێك کە چۆڵ بوو و نابوویانە ئیختیاریانەوە.

کیتی بە چاوێکی شوورەییتێزاو و تاوانبارانەوە لە مێردەکەی روانی و گوتی: تۆ برۆ، برۆ!

لەڤین هیچی نەگوت و لە ژوورەکە هاتەدەرێ و راست لە چەقی دەرگاکەدا لووتی بە لووتی ماریا نیکۆلایڤنادا تەقی کە لە هاتنیان ئاگادارکرابوو بەڵام لە رووی هەڵنەدەهات خۆ بکات بە ژوورەکەیاندا. هەروا کراسە پەشمینەکەی لەبەردا بوو و هەروا شان و ملی رووت و روخساری هاولاوی و مێهرەبان و گەمژانە بوو، بەڵام هێندێك قەڵەو بووبوو.

---

15- Astafieva

ـ دەی، چبووە؟ حاڵی چۆنە؟

ـ زۆر خراپ. ناتوانێ هەستێ. هەر چاوەڕوانی ئێوەیە. ئەو.... یانی چاوەڕێی تۆ و خانمەکەتانە...

لەڤین سەرەتا تێنەگەیشت هۆی پەرۆشییەکەی چییە، بەڵام ژنە خێرا بۆی روونکردەوە.

گوتی: من دەڕۆم. دەچم بۆ ئاشپەزخانە. زۆری پێخۆش دەبێ. بیستوویە کە هاتوون. نیکولای دیمیتریچ لە هەندەران لەگەڵی ئاشنابووە و دەیناسێ. هەر لە بیریێتی.

لەڤین تێگەیشت کە مەبەستی ژنەکەیەتی و نەیزانی چ وەڵامێك بداتەوە.

گوتی: باشە، با بڕۆین، با بڕۆین.

بەڵام هەرکە هەنگاوێکی هەڵێنایەوە دەرگای ژوورەکە کرایەوە و کیتی چاوێکی لە دەرێ کرد. لەڤین لە شەرمانا و هەروەها لە داخی ژنەکەی کە ئەم بارودۆخە ناخۆشەی بۆ خۆی و بۆ ئەو رێك خستبوو سوورهەڵگەڕا. بەڵام ماریا نیکۆلایڤنا لەویش سوورتر هەڵگەڕا. بەردەوام خۆی کۆدەکردەوە و مات و کزەڵۆکە خۆی کوشمەڵە دەکرد و وەها سوور بووبۆوە کە هێندەی نەمابوو دەستبکات بە گریان. دوو سووچی لەچکەکەی بە هەردوو دەستی گرتبوو و بە قامکە شووش و نینۆخ سوورەکانی هەڵیدەگولۆفی و نەیدەزانی چ بکات یان چ بڵێت.

لەڤین سەرەتا دیتی کە کیتی بە چ سەرنجێکی ورد و چنۆکانەوە لەو ژنە دەڕوانێ و بە بوونەوەرێکی ترسناك و سووکی دەزانێ و بەڕاستی تێیناگات، بەڵام ئەو روانینەی تەنیا چرکەیەکی خایاند.

کیتی رووی لە مێردەکەی و پاشان لەو ژنە کرد و پرسیی: دەی، چبووە، خەبەر چییە؟ حاڵی چۆنە؟

لەڤین بە رقەوە چاوی لە پیاوێك کرد کە لەوکاتەدا بە هەنگاوێکی شلەوە بەلایاندا تێدەپەڕی و دیاریشبوو کاری بەسەر ئەمانەوە نییە، گوتی: باشە بیبڕەوە، ئەو داڵانە جێی قسەکردن نییە.

کیتی رووی لە ماریا نیکۆلایڤنا کرد کە رەنگی هاتبۆوە سەرخۆ و گوتی: باشە وەرە ژووری ـ کە چاویشی بە روخساری ترستێگەڕاو و هەڵبزڕکاوی مێردەکەی کەوت گوتی: نا، بڕۆن، بڕۆن و پاشان بنێرن بە دوای مندا ـ بەپەلە دەرگاکەی پێوەدا و رۆیشتەوە ژووری، لەڤینیش رۆیشت بۆ لای بڕا کەلەلاکەی.

ئەو قەت چاوەڕوانی ئەوە نەبوو براکەی ئاوا ببینێ. چاوەڕێی ئەو حاڵەتە فریودەرە بوو کە بیستبووی سیلدارەکان زۆر جار پێیانەوە دیارە و پاییز ئەو کاتەی براکەی هاتبوو بۆ سەردانی

بە روونی ئەوەی پێوەی دیاربوو، لەڤین بەهیوا بوو ئێستاش هەر ئاوای ببینێ. چاوەڕێ بوو دیاردەی ئەو نەخۆشینە بە ئەدگار و ئەندامی براکەیەوە ببینێ و وەك ژێی کەوان وێك هاتبێ و رەنگی مردووی لێنیشتبێ. چاوەڕێ بوو دیسان ئەو ترسە هەست و دڵی داگرێتەوە و خەفەتی مەرگی براکەی کە پێشتریش لە ناخ و مێشکیدا چەکەرە کردبوو، ئێستا زۆر سەخت و دژوارتر بووبێ و خۆی بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵ ئەو خەمە قورسە ئامادەکردبوو. بەڵام ئەوەی دیتی شتێکی تر بوو.

لە ژوورێکی چکۆڵەدا کە بۆگەن هەواکەی قورس کردبوو و تف و بەڵغەمی وشکەوە بوو لایەکی دیوارە رەنگکراوەکەی داپۆشیبوو و لە پشت تیغەکەوە ژوورەکەی کردبوو بە دوو بەشەوە دەنگی قسەکردن دەهات، لەسەر تەختێك کە شتێکی مابوو بگاتە بنمیچە نزم و بۆرهەڵگەڕاوەکە، جەستەی پیاوێك لە ژێر بەتانییەکدا کەوتبوو و دەستێکی لەسەر بەتانییەکە بوو. دەستی هێندە گەورە و پان بوو دەتگوت خەپەیە و مەعلووم نەبوو بە چ شێوەیەك بەو قۆڵ و مەچەکەیەوە بەندبووە کە دەتگوت کلکە تەشییە و هەتا نزیك هەنیشکی یەك ئەندازە بوو. سەری کەوتبووە سەر لایەکی بالیفەکە و لەڤین چاوی بە قژە تەنکەکەی کەوت کە لە ئارەقەدا خووسابوو و بە لاجانگ و ناوچاوانییەوە نووسابوو کە بریقەی دەهات و پێستی تەوێڵی بە یەسقانی کاسە سەرییەوە چەسپ بووبوو و دەتگوت تێیهەڵکێشراوە.

لەڤین لە دڵی خویدا گوتی: «یانی دەبێ ئەو جەندەکە ترسناکە نیکۆلای برام بێ؟» کە هاتە پێشێ و روخساری دی تەمی گومانی رەوییەوە. لەگەڵ ئەوەدا کە رەنگ و روخساری زۆر گۆڕابوو و بەڕاستی رەنگی مردووی لێنیشتبوو بە دیتنی چاوە کز و بەقووڵدا چووەکانی کە لە ئەوی دەڕوانی هەر بە ئاستەم هەستی پێبکردبایە کە لێوی لە ژێر سمێڵە بەیەکەوە نووساوەکەیدا دەبزوێ لەو هەقیقەتە تاڵە دەگەیشت کە ئەو تەرمە بێگیانە برا هێشتا زیندووەکەی خۆیەتی.

چاوانی بە بریقەیەکی کز و پڕ لە سەرکۆنەوە لە برا تازە هاتووەکەی بڕیبوو و هەر بەو روانینەوە لەڕێوە پێوەندیی نێوان ئەو دوو زیندووە دامەزرا. لەڤین لەڕێوە تیری تانە و سەرکۆنەی لەو سەرنجە ماتەی براکەیدا دی و ژاراوی پەشیمانی سەبارەت بە بەختەوەریی خۆی لە دڵیدا کفارەی کرد.

کاتێك کۆنستانتین لەڤین دەستی بێهێزی گوشی نیکۆلای بزەیەکی هاتێ. ئەو بزەیەش زۆر کەمڕەنگ بوو و بەحاڵ هەستی پێدەکرا، بەڵام تیژیی روانینەکەی بەو بزەیە نەرم بۆوە.

بە زەحمەتێکی زۆرەوە گوتی: تۆ چاوەڕوان نەبووی من ئاوا ببینی؟

لەڤین زمانی کەوتە تەتەڵەکردن و گوتی: بەڵێ.. نا. بۆ زووتر ئاگادارت نەکردم؟... کاتی زەماوەندەکەم وڵاتت لێگەڕام و سۆراخم گرتی.

ناچاربوو قسە بکات بۆ ئەوەی بێدەنگ نەبێ و نەشیدەزانی چی بڵێ، بەتایبەت ئەوەیکە براکەی هیچ وەڵامێکی نەدەدایەوە و زەق زەق تێیدەڕوانی و فرمێسك بە چاویدا دەهاتە خوارێ. دیاربوو کە مانای دانەبەدانەی وشەکانی لێکدەداتەوە. لەڤین بە براکەی گوت کە خێزانیشی لەگەڵی هاتووە. نیکۆلای خۆشحاڵیی خۆی دەربڕی بەڵام گوتی دەترسێ و ناوێرێ چاوی پێی بکەوێ. ماوەیەك هەردووکیان بێدەنگ بوون. لەپڕ نیکۆلای تەکانێکی خوارد و دەستیکرد بە قسەکردن. لەڤین بە ڕەنگوڕووی براکەیدا وای بۆچوو کە مەبەستێکی گرینگ و مانادار باس بکات بەڵام نیکۆلای دەستیکرد بە باسکردنی لەشساخیی خۆی. لە دەست پزیشکەکان سکاڵای بوو، بۆ ئەوەش بەداخەوە بوو کە پزیشکە بەناوبانگەکانی مۆسکۆ لەوێ نین، بەو قسانەیدا لەڤین تێگەیشت کە براکەی هێشتا ورەی لەدەست نەداوە و هیوادارە.

لەڤین کەڵکی لە یەکەم چرکەی بێدەنگی وەرگرت و بۆ ئەوەی تەنانەت ئەگەر بۆ خولەکێکیش بێ خۆی لەو هەستە پڕ ئازارە دەربازبکات، هەستا و گوتی کە دەچێ ژنەکەی دێنێ.

نیکۆلای گوتی: باشە، کەوایە منیش پێیان دەڵێم ئێرە تۆزێ خاوێن بکەونەوە. زۆر پیس بووە و پێموایە بۆگەن ژوورەکەی داگرتووە. ماشا، دەستێك بە ژوورەکەدا بێنە ـ بەچاوێکی پڕ لە پرسیارەوە لە براکەی ڕوانی و گوتیشی: زوو خاوێنی بکەوە و بڕۆ دەرێ.

لەڤین بێدەنگ سەری داخست و ڕۆیشت. چووەدەرێ و لە داڵانەکە ڕاوەستا. بە براکەی گوتبوو کە ژنەکەی دێنێ بەڵام ئێستا کە بیری کردەوە خۆی ئەو هەستە تاڵ و ناخۆشەی لەلا دروست بووە و دڵی گیراوە، واچاکە هەوڵ بدات و بە کیتی بسەلمێنێ کە نەچێ بۆ ژووری براکەی. لە دڵی خۆیدا گوتی: «بۆچی ئەویش وەك خۆم تووشی ئەو ئازارە بکەم؟»

کیتی بە ڕوخسارێکی ترستێزاوەوە گوتی: دەی، چبوو؟ چۆنە؟

لەڤین گوتی: پەککوو، هەر باسی مەکە، زۆر ناجۆرە زۆر! بۆچی هاتی؟

کیتی تۆزێ بێدەنگ بوو و شەرمنانە و لە ڕووی دڵسۆزییەوە چاوی لە مێردەکەی کرد، پاشان چووە پێشێ و بە هەردوو دەستی قۆڵی گرت و گوتی:

ـ کوسیتا، بمبە بۆ لای. ئەگەر دوو کەس بین ئاسانترە. تۆ بمبە بۆ لای، بمبە بۆ لای و خۆت بڕۆ. تکات لێدەکەم. تۆ دەبێ بزانی دیتنی تۆ بەو حاڵەوە و نەدیتنی ئەو بۆ من زۆر دژوارە.

ئەگەر من بچمە ژوور سەری رەنگە بتوانم بۆ تۆش و بۆ ئەویش بەکەڵك بم ـ بە جۆرێك تکای لە مێردەکەی دەکرد و لەبەری دەپاڕایەوە کە دەتگوت تەواوی بەختەوەریی ژیانی بەو دیتنەی نیکۆلایەوە بەندە: تکات لێدەکەم، ئیجازەم پێبدە.

لەڤین ناچار رازی بوو، بەڵام کە وەخۆ هاتەوە و کێشەی بەرەوڕوو بوونی و ئاشنابوونی کیتی و ماریا نیکۆلایڤنای لەبیرچۆوە لەگەڵ کیتی رۆیشتن بۆ ژوور سەری براکەی.

کیتی بەردەوام چاوی لە مێردەکەی بوو و بە هێوری هەنگاوی هەڵدێنایەوە، بە روخسارێکی بوێرانە و پڕ لە هەستی هاودەردییەوە چووە ژووری نەخۆشەکە. زۆر بە هێواشی گەڕایەوە و دەرگاکەی پێوەدا. بە هەنگاوی نەرم و خێرا جۆرێك لە سەرینای نەخۆشەکە نزیکبۆوە کە ئەو ناچار نەبێ سەری وەرسووڕێنێ و لەڕێوە دەستە رەقەڵە و گەورەکانی نیکۆلای بە دەستە ناسك و نەرموشلەکەی خۆی گرت و گوشیی، بە گەرموگوڕی و هەست و هاودەردییەکی تایبەتی ژیانەوە کەوتە قسە لەگەڵیدا.

گوتی: ئێمە لە سۆدن چاومان بە یەکتر کەوت و پێکەوە ئاشنابووین. تەنانەت بیریشت لێنەدەکردەوە رۆژێك دەبم بە براژنت.

نیکولای دیمیتریچ کە بە دیتنی ئەو زەردەیەك نیشتبووە سەر لێوی گوتی:

ئەگەر بەبێ ئەو پێشەکییە بتدیبایەم نەتدەناسیم.

ـ با، دەمناسیی. بەڵام کارێکی باشت کرد ئاگادارت کردین. رۆژ نەبوو کۆستیا یادت نەکات و نیگەرانی حاڵت نەبێ.

بەڵام ئەو شۆر و شەوقەی کە رۆح و دڵی نیکۆلای داگرتبوو زۆری نەخایاند.

هێشتا کیتی قسەکەی تەواو نەکردبوو کە دیسان تاڵی و تیری سەرکۆنە و ئێرەیی کە نەخۆش و کەلەلا دەرهەق بە لەشساخان لە دڵیاندایە، لە چاوانی نیکۆلایدا خۆی نواند.

کیتی رووی لە چاوە زیتەکانی وەرگێڕا و لە دەوروبەری خۆی روانی . گوتی: پێمواییە لێرە زۆر ناخۆشت لێدەگوزەرێ و لە بارودۆخێکی ناخۆش دایـ رووی لە مێردەکەی کرد و گوتی: دەبێ داوا لە بەڕێوەبەری میوانخانەکە بکەین ژوورێکی باشتری بداتێ و لە ئێمەش نزیکتر بێ.

# هەژدە

لەڤین نەیداتوانی بە ئاسوودەیی چاو لە براکەی بکات و نەشیدەتوانی لەبەر چاوی ئەو هێدی و لەسەرەخۆ بێت و بە شێوەیەکی ئاسایی هەڵسوکەوت بکات. کاتێك چووە ژووری نەخۆشەکە بەرچاوی تاریك داهات و خەمێك دڵی ڕێککگوشی. هیچی نەدەدی و وا چاوی لە ڕەشەوە دەهات نەیدەزانی براکەی چدەکات و حاڵی چۆنە. بۆگەنێکی ناخۆش سینگ و گەرووی گرت و دەیدی براکەی لەنێو چڵك و پیساییدا جینگڵ دەدات و بە سەروگیانی پیس و دژوێنەوە کەلەلا کەوتووە و دەناڵێنێ، هەستیشی دەکرد کە هیچ یارمەتییەکی لە دەست نایە. بە زەینیشیدا نەدەهات کە فیکرێك بکاتەوە و تێبگات کە برا نەخۆشەکەی چی دەکێشێ و بیهێنێتە بەرچاوی خۆی کە ئەندامی لەڕ و لاوازی لە ژێر بەتانییەکەدا چۆن ڕازاوە و کاتێك خۆی کوشمەڵە دەکات لاقوقول و پشت و سمت و ڕانی کە تەنیا پێست و یەسقانەکەی ماوە چۆن وەك ژێی کەوان وێك دێن و بلێی نەکرێ مشوورێکی بخۆن و بارودۆخێکی ئاسوودەتری بۆ دابین بکەن؟ ئەگەر ئەو کارە نالوێ، ناکرێ کارێك بکەن کە کەمتر ئازار بکێشێ؟ کاتێك بیری کردەوە و لەو ئازار و ژانە قورسانە گەیشت مۆچرکێکی بە لەشیدا هات. بەو ئاکامەش گەیشت کە نە دەلوێ وادەی مەرگەکەی بخرێتە دواوە و نە کارێکیان بۆ هێدیبوونی ژانەکەی لەدەست دێ. بەڵام ئەوەش زۆر تاڵ و دڵتەزێن بوو کە هیچ یارمەتییەکی لە دەست نایە و لەوەش کە ئەو بێتواناییەی بە خۆی سەلماندبوو زۆر دڵگران بوو و ڕقی لە خۆی هەستابوو. هەر بەو هۆیەش هەستی بە ئازار دەکرد. مانەوە لە ژووری نەخۆشەکە زۆر زۆر پڕ ئازار بوو، چوونە دەرێ و بەجێ هێشتنیشی پڕئازارتر. نەیدەتوانی تەنیایی تامڵ بکات و هەر بەو هۆیەش بەردەوام بە بیانووی جۆراوجۆر لە ژوورەکە دەچووەدەرێ و دەهاتەوە.

بەڵام کیتی وا نەبوو. بیر و هەست و هەڵسوکەوتی جۆرێکی تر بوو. کاتێك چاوی بە هێوەرە نەخۆشەکەی کەوت زۆری دڵ پێیسووتا، بەڵام دڵسۆزی لە ڕۆحی ژنانەی ئەودا بە هیچ

شێوەیەك ئەو هەستی ترس و نەفرەتەی وەدی نەدەهێنا کە لە گیانی مێردەکەیدا وەدی هێنابوو، بەڵکوو بە پێویستی زانی دەستبەکاربێت و سەر لە هەموو دەرد و ئازارەکانی دەرهێنێ و قۆڵ بۆ یارمەتیدانی هەڵماڵێ. چونکە چکۆلەترین گومان و دوودڵی لە گیانیدا نەبوو، سووریش بوو لەسەر ئەوەی کە یارمەتیی بدات بۆیە خاترجەم بوو کە دەتوانێ و بەبێ راوەستان خۆی لێهەڵکرد. هەر ئەو لایەنە چووکانەی کە بیر لێکردنەوەیان مێردەکەی تۆقاندبوو، لەرێوە سەرنجی ئەوی بۆ لای خۆی راکێشا. ناردی بە دوای پزیشك و نۆشداردا. دەستووری دا بە ماریا نیکۆلایڤنا و خزمەتکارێك کە لەگەڵ خۆی هێنابووی تاکوو ژوورەکە بماڵن و تۆزتەکێنی بکەن و تەرك و دیوارەکانی بشۆنەوە، خۆشی یارمەتییدان و کەلوپەلەکانی ئەمبارەوبار دەکرد و بەعزە شتێکی دەشۆرد یان مەلافەیەکی لە ژێر دۆشەکە و بەتانییەکەیدا رادەخست. دەستووری دا هێندێ شت بێنن بۆ ژووری شووبرا نەخۆشەکەی و هێندێ شتیش بەرنە دەرێ. خۆشی چەند جار بێ ئەوەی سەرنجی کەسانی نێو دالانەکە راکێشێ کە تووشی دەبوون، دەچووە ژوورەکەی خۆی و مەلافە و بەرگە بالنج و خاولێی دەهێنا.

پێشخزمەتێك کە لە تەلاری گشتی و لەسەر مێزی نانخواردنی چەند ئەندازیار کاری دەکرد لەڤین چەند جاری بانگکرد و پێشخزمەتەکە بە روویەکی ترشەوە دەهات بەڵام نەیدەتوانی لامحوومی لە دەستووری بکات، چونکە دەستوورەکەی هێندە پێداگرانە و بە رووخۆشی و مێهرەبانییەوە دەدا کە بە هیچ شێوەیەك نەیدەتوانی خۆی لێببوێرێ و بەرێوەی نەبات. لەڤین ئەوانەی بە چاوێکی گەشبینانەوە نەدەدی و بە دڵی نەبوو. بڕواشی نەدەکرد ئەو کارانە بۆ نەخۆشەکە ئاکامێکی باشی هەبێ. زیاتر لەوە ترسی لێنیشتبوو کە براکەی رقی هەستێ و دۆ و دۆشاو تێکەڵ بکات. بەڵام نیکۆلای ئەگەرچی بە رواڵەت بێموبالاتی دەنواند بەڵام رقی هەڵنەدەستا، تەنیا هەستی بە شەرمەزاری دەکرد، بەڵام لەسەریەك وەك ئەوە وابوو کە بە وردی سەرنجی کارەکانی کیتی بدات. لەڤین، کە کیتی ناردبووی بە دوای پزیشکدا، گەرایەوە و کە هاتەژوورێ دیتی برا نەخۆشەکەی خەریکە بە دەستووری کیتی جلەکانی ژێرەوە دەگۆرێ.

بڕبڕەی مشارئاسای پشتە سپییەکەی و یەسقانی دەرپەڕیوی شانی و پەراسووە رەقو تەقەکانی رووت بوون و ماریا نیکولایڤنا و پێشخزمەت حەولیان دەدا باسکە شل و داکەوتووەکەی بکەن بە نێو قۆڵی کراسەکەیدا و نەیاندەتوانی بە ئاسانی پێی لەبەر بکەن. کیتی کە خەریکبوو بەپەلە دەرگاکە لە لەڤین دابخات چاوی لەوان نەدەکرد. بەڵام بە بیستنی نالەی نەخۆشەکە هەڵات بۆ لای.

گوتی: زووکەن، دەی خێرابن.

نیکۆلای بە تووڕەیی گوتی: مەیەن، من خۆم...

ماریا نیکۆلایڤنا پرسیی: ئەوە دەڵێیچی؟

بەڵام کیتی بیستبووی و تێگەیشتبوو کە ناخوازێت لەلای ئەو خۆی رووت بکاتەوە و پێی عەیبە.

کیتی لەگەڵ ئەوەی دەستی شل و رەقەڵەی نیکۆلای گرتبوو دەیویست بیکات بە نێو قۆڵەکەدا گوتی: من چاوت لێناکەم، چاوت لێناکەم ـ هەروەها گوتیشی: ماریا نیکولایڤنا تۆ بڕۆ ئەولاوە.

بە مێردەکەی خۆشی گوت: ئەرك نەبێ لەنێو جانتا دەستییەکەی مندا شووشەیەکی چکۆڵەی تێدایە بچۆ بیهێنە. خۆ دەزانی، لە گیرفانی لاتەنیشتەکەیدایە. بچۆ بیهێنە و هەتا دێیتەوە هەموو شتێك جێبەجێدەکەین.

لەڤین کە شووشەکەی هێنا و هاتەوە دیتی نەخۆشەکەیان بە جوانی راکشاندۆتەوە و هەموو کەلوپەل و شتەکانی دەوروپشتی گوڕاون. بەجێی بۆگەنەکە بۆنی سرکە و گوڵاو ژوورەکەی داگرتبوو، کیتی لێوی کۆکردبۆوە و روومەتە سوورهەڵگەڕاوەکانی هەڵماساندبوو و بە لوولەیەکی باریك عەترەکەی لە دار و دیوارەکە دەپڕژاند. پیسایی و تەپووتۆز ئاسەواری نەمابوو، لە ژێر چرپاکەشدا فەرشێکیان راخستبوو. شووشەی دەوا و دەرمان و گۆزەڵەیەك ئاو و پەرداخێکیان لەسەر مێزەکە بە رێکوپێکی دانابوو، هەروەها چەند مەلافەی سپی و گولڵدۆزی کراوی دەستکاری کیتی لەسەر مێزەکە قەد کرابوون کە دواتر پێویستیان پێیان دەبوو. لەسەر مێزێکی تریش کە لە پاڵ چرپای نەخۆشەکەدا بوو پەرداخێکی پڕ لە ساردی و مۆمێك و دەوایەکی خڕ داندرابوو. نەخۆشەکەش بە دەموچاوی شۆراو و سەری شانەکراوەوە کراسێکی خاوێنی لەبەردا بوو کە ملیوانە سپییەکەی ملی باریك و بنێسی لەخۆ گرتبوو، لەنێو مەلافەی خاوێندا خەوتبوو و چەند باڵنجیان خستبووە ژێر سەری و شوێنەواری هیواداریییەکی تازە بە روخسارییەوە دیاربوو و چاوی لەسەر کیتی هەڵنەدەگرت.

پزیشکێك کە لەڤین چووبوو بە دوایدا و لەگەڵ خۆی هێنابووی هەر ئەوە بوو وا نیکۆلای لەڤین پشکنینەکەی بەدڵ نەبوو. پزیشك گوێیانەکەی هەڵگرت و نای بە سینگی نەخۆشەکەوە و گوێی بۆ کوتەکوتی دڵی راگرت و سەری لەقاند. دەوای بۆ نووسی و زۆر بە وردیش حاڵیی کردن کە دەواکانی بە چ شێوەیەك پێبدەن و پاشان بۆشی روونکردنەوە کە بۆ

خواردن چیی بدەنێ و لە خواردنی چ شتێك پارێز بکات. گوتی هێلکەی کاڵ یان نیوەکوڵاو و ئاوی گازدار و شیری تازەی نەکوڵاوی بدەنێ. کاتێك دوکتۆر ڕۆیشت نەخۆشەکە شتێکی بە براکەی گوت، بەڵام لەڤین تەنیا لە دوایین وشەکانی تێگەیشت: «کاتیای تۆ»، بەڵام بە شێوەی ڕوانینی چاوانی براکەیدا بۆی دەرکەوت کە تاریفی کردووە. ئەویش وەك لەڤین بە کیتی گوتبوو «کاتیا».

گوتی: من حاڵم باشتر بووە. ئەگەر لەلای ئێوە بوایەم زۆر لەمێژ بوو چاك بووبوومەوە. بەخێر بێن! ـ دەستی کیتیی گرت و بردی بۆ لای دەمی خۆی بەڵام وەك ئەوەی بترسێ کە نەوەك کیتی پێیناخۆش بێ لێوی لە دەستی بدرێ، تەنیا دەستێکی بە پشتی دەستیدا هێنا و بەریدا. کیتی دەستی ئەوی گرت و گوشیی.

نیکۆلای گوتی: تکایە لەسەر لاشانی چەپەم بمخەوێنن و بڕۆن ئێوەش بخەون.

هیچ کەس لە مەبەستی نەگەیشت، تەنیا کیتی لێیحاڵی بوو و هۆیەکەشی ئەوەبوو کە بەردەوام لە بیری ویست و پێداویستییەکانی ئەودا بوو.

بە مێردەکەی گوت: لەسەر ئەو لاتەنیشتەی تری. ئەم ماوەیە هەر بەسەر ئەو لایەیدا خەوتووە. وەریگێڕە سەر ئەو بارەی تر. پێویست ناکا پێشخزمەت بانگ بکەیـ ڕووی لە ماریا نیکۆلایڤنا کرد و گوتی: من ناتوانم، تۆش ناتوانی؟

ماریا نیکۆلایڤنا گوتی: دەترسم.

ئەگەرچی لەڤین نەیدەوێرا جەستەی ترسناکی براکەی لە باوەش بکات و دەست لەو ئەندامە دەردەدارەی ژێر پەتووەکە بدات کە دەیویست لە بیری بەرێتەوە، پێملی قسەی ژنەکەی بوو و دەستیکرد بە ژێر لاشە لاوازەکەیدا و ئەگەرچی زۆر بە قەوەت بوو بەڵام ئەندامی کەلەلای براکەی هێندە قورس بوو واقیوڕما. لەگەڵ ئەوەی خەریکی وەرگێڕانی بوو هەستی کرد نیکۆلای دەستی گەورە و ڕەقەڵی لە دەوری ملی هاڵاندووە، کیتی خێرا بالیفەکەی هەڵگێڕایەوە و دەستێکی پێدادا و خستییە ژێرسەری نەخۆشەکە و تووکەسەری تەنکی کە دیسان ئارەقە خووساندبووی و بە لاجانگییەوە نووسابوو، بە جوانی لەسەر باڵنجەکەی دانا.

نیکۆلای دەستی براکەی گرت و بەرینەدا. لەڤین هەستی دەکرد کە دەیهەوێ شتێك لە دەستی بکات کە ئاوا گرتوویەتی و دەیکێشێ. بە دڵێکی ترستێگەڕاوەوە خۆی بۆ شل کرد. نیکۆلای دەستی براکەی برد بۆ لای دەمی و ماچی کرد. لەڤین دای لە پڕمەی گریان و ئازای ئەندامی دەلەرزی و توانایی نەبوو قسە بکات و لە ژوورەکە چووەدەرێ.

# نۆزده

ئەو شەوە لەڤین لەگەڵ ژنەکەی دانیشتبوون و قسەیان دەکرد و سەبارەت بە ئەو لە دڵی خۆیدا گوتی «لە زانایان و بیرمەندانت شاردەوە و بۆ منداڵانت ئاشکرا فەرموو».[١٦]

لەڤین بەو هۆیە بیری لە کەلامی ئینجیل نەدەکردەوە کە خۆی بە زانا و بیرمەند بزانێ، بەڵام لێی روون بوو کە لە ژنەکەی و لە ئاگافیا میخائیلۆڤنا زاناترە و هەروەها دڵنیابوو کاتێك کە لە بیری مەرگدا بوو بە گیان و دڵ بیری لێدەکردەوە. هەروەها دەشیزانی کە زۆربەی گەورەپیاوانی بیرمەند کە ئەو لەو بارەوە فیکر و بیرۆکەی دەخوێندنەوە بە وردی سەرنجی ئەو مەبەستەیان دابوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا یەك لە سەدی ئەوەی ژنەکەی و ئاگافیا میخائیلۆڤنا دەیانزانی تێینەدەگەیشتن. هەرچەندیش ئەو دوو ژنە، یانی ئاگافیا میخائیلۆڤنا و کیتی، یان نیکۆلای گوتەنی، کاتیا (کە ئێستا لەڤین خۆشی زۆری پێخۆش بوو و هەر بەو ناوە بانگی دەرکرد.) پێکەوە جیاواز بوون و لەو خاڵەدا بە تەواوی لەیەك دەچوون. بێگومان هەردووکیان دەیانزانی ژیان چییە و مەرگ چییە، ئەگەرچی نەیاندەتوانی لەو بارەوە وەڵامی پرسیارەکانی لەڤین بدەنەوە و تەنانەت سەریان لەو مەتەڵە دەرنەدەچوو، هیچ کام شکیان لە گرینگیی ئەو مەسەلەیە نەبوو و نەك هەر بە شێوەیەکی یەکسان بیریان لێدەکردەوە بەڵکوو بیروڕاشیان لەو بارەوە لەگەڵ ملۆینان کەسی تر یەکێك بوو. هۆی ئەوەیکە ئەوان دڵنیابوون مەرگ چییە، ئەوەبوو کە بەبێ گومان و دوودڵی دەیانزانی کە چۆن بە نەخۆش و کەلەلایەك رابگەن و نەدەترسان. لەڤین و زۆر کەسانی تر ئەگەرچی سەبارەت بە مەرگ زۆریان دەزانی دیاربوو لەگەڵ مەرگ نامۆن چونکە لە مەرگ دەترسان و نەیاندەزانی کاتێك کەسێك بێسەر و زمان دەکەوێ دەبێ چ بکەن. کاتێك لەڤین لەگەڵ براکەی تەنیا دەکەوت تۆقیوانە چاوی تێدەبڕی و بەلایەوە دادەنیشت و بە ترسێکی زیاترەوە چاوەڕوان دەما و جگە لەوە هیچ کارێکی تری لە دەست نەدەهات.

ئەوانەش هیچ، نەیدەزانی چی بڵێ و چۆن بڕوانێ و چۆن بەڕێدا بڕوات. باسی مەسەلەیەك کە پێوەندیی بە ئەوەوە نەبوو زۆر لەبەرچاوی جاڕزکەرانە بوو و نەشدەگونجا. باسی مەرگ و بابەتی

---

١٦- ئینجیلی مەتی، بەشی یازدەهەم، ئایەتی بیست و پێنج

خەماویش شتێکی بێجێ بوو. نەدەکرا بێدەنگیش بێ و متەق نەکات. «ئەگەر چاوی لێبکەم دەترسم پێبوابێ بە کونچکاوییەوە دەمهەوێ گیانکەشتی ببینم. ئەگەر چاوی لێنەکەم، پێبوایە بیر لە شتێکی تر دەکەمەوە. ئەگەر بە پێدزکە بڕۆم تووڕە دەبێ. ئەگەر بەری پێشم تەخت دانێم و هەنگاو بنێم دڵم بڕوایی نادا.» کیتی وەك دیاربوو نە بیری دەکردەوە و نە دەرفەتی بوو بیر لە خۆشی بکاتەوە. بیری لە ئەو دەکردەوە، چونکە دڵی خەبەری پێدابوو و کارەکان هەموو مەیسەر دەبوون. باسی خۆشی دەکرد و باسی زەماوەندەکەشی. پێدەکەنی بەڵام لە ناخەوە دڵی پێیدەسووتا، دەیلاواندەوە و باسی ئەو نەخۆشانەی بۆ دەکرد کە چاك بووبوونەوە و دەرد و عەلەمیان لێبڕابوو. ماناشی ئەوە بوو کە دەیزانی. هۆیەکەشی ئەوەبوو کاری ئەو و ئاگافیا میخائیلۆڤنا خۆماك نەبوو، هۆشێکی دڕندانە و بە دوور لە ئاوەزمەندی ڕێنوێنیان نەبوو، هەروەها هەردووکیان سەرەڕای ماریجەکردن بە دەوا و هێدیکردنەوەی ژان و ئازار هیچ شتێکی تریان بۆ ئەو نەخۆشە کەلەلایە نەدەویست کە لە دەوا و دەرمان گرینگتر بێ. شتێك کە لە هیچ لایەنێکەوە لەگەڵ بارودۆخی ماڵێ یەکی نەدەگرتەوە. ئاگافیا میخائیلۆڤنا کاتێك باسی مردنی مووژیکە پیرەکەی دەکرد گوتبووی «شوکور بۆ خودا، بەر لە مەرگی قەشە هات بۆ لای و دۆعای لەسەر خوێند و سەرانشۆی کرد. خودا ئەو جۆرە مەرگە بە نسیب بەندەکانی بکات.» کاتیاش ڕاست بەو شێوەیە، سەرەڕای زەحمەتێك کە بۆ دابینکردنی جلوبەرگی ژێرەوە و مەلافەی خاوێن و ساردی و جێگا و پێخەفی نەرم و ئاسوودە دەیکێشا، هەر لە یەکەم ڕۆژەوە توانیی بە ناچاری بۆ ڕێوڕەسمی کلیسا دڵی نەرم بکات و هەروەها پێملی بکات کە نان و شەڕاب لە دەستی قەشە وەرگرێ و بە ڕۆنی پیرۆز سەرانشۆی بکەن.

لەڤین شەوێ کاتێك لە ژووری برا نەخۆشەکەیەوە گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆیان دانیشت و ملی بە خوزدا گرت و نەیدەزانی چ بکات. نەك هەر نەیدەتوانی بیر لە شێوخواردن و خەوتن و کارە گرینگەکانی بکاتەوە، بەڵکوو لەڕووی هەڵنەدەهات لەگەڵ ژنەکەشی بدوێ، کە چاوی بە چاوی دەکەوت هەستی بە شەرمەزاری دەکرد. بە پێچەوانە کیتی زیاتر لە باری ئاسایی هەوڵی دەدا و تەنانەت جارلەگەڵ جار هەیەجانی زیاتر دەبوو. دەستووریدا شێو بێنن. خۆی بوخچە و نوێنەکانی کردەوە و یارمەتیی دان کە جێوبانەکە ڕاخەن و لە بیری نەچوو کە گەردی دژە مێروو لە ژوورەکە پرژێنێ و زۆر وریابوو و زۆر بە خێرایی بیری دەکردەوە و بڕیاری دەدا. حاڵی هەر لە حاڵی ئەو پیاوانە دەچوو کە بەر لە ململانێیەکی قورس یان لە کاتی پڕمەترسی و دژواری ژیان و جارێکی تر لە ژیاندا هەوڵ دەدەن توانایی و بایەخی خۆیان بنوێنن و تێدەگەن کە ڕابردوویان بە فیڕۆ تێنەپەڕیوە و ئەوانی بۆ ئەو کاتە پڕهەیەجانە ئامادەکردووە.

کارەکانی هەموو سەرکەوتووانە بەڕێوەچوون و هێشتا شەو لە نیوە لاینەدابوو کە هەموو کەلوپەل و بارگەوبنەیان بە ڕێکوپێکی دانا و ژووری میوانخانەکەیان وەك ماڵەکەی خۆیان رازاندەوە: جێوبانیان راختبوو و شانە و ئاوێنە و خاولی هەموویان لە شوێنی خۆیان بە ڕێکوپێکی داندران.

لەڤین پێیوابوو لەو بارودۆخەدا خواردن و خەوتن و تەنانەت قسەکردنیش تاوانێکی قورسە و هەستی دەکرد کە هەرکارێك بکات شیاو نییە. بەڵام کیتی کەلوپەلی خۆڕازاندەوە و ئارایشتی خۆی خستەکار و بە جۆرێك ئەو کارەی بەڕێوەدەبرد کە هیچ شتێکی ناخۆش و ئازاردەری پێوە دیارنەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا دەمیان بۆ خواردن نەدەچوو و ماوەیەك نەیاندەتوانی بخەون و تەنانەت بچنە سەر پێخەفەکەیان.

کیتی ربدۆشامبری لەبەرکردبوو و لەبەر ئاوێنە نیوقەدەکە دانیشتبوو و کەزیە نەرم و بۆنخۆشەکانی بە شانەیەکی دەنك ورد شانە دەکرد، گوتی: زۆر خۆشحاڵم کە توانیم رازیی بکەم سبەینێ بهێڵێ وسڵی بدەن. هیچ کات نەمدیوە کەسێك بە رۆن وسڵ بدەن. بەڵام دەزانم، دایکم دەیگوت لەگەڵ ئەو وسڵە دۆعا بۆ شیفای نەخۆشەکە دەکەن.

لەڤین کە چاوی لە خەتی قژی و سەرە خڕ و جوانەکەی دەکرد و هەر جارێك شانەکەی پێدا دێنا خەتەکەی ون دەبوو گوتی: تۆ بەڕاستی پێتوایە چاك دەبێتەوە؟

کیتی لەگەڵ ئەوەی لە بەینی قژە نەرمەکەیەوە چاوی لە مێردەکەی دەکرد گوتی: من لە پزیشکەکەم پرسی، گوتی: تەنیا سێ رۆژی تر دەژی. بەڵام ئەوانە خۆ تێیناگەن. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر خۆشحاڵم کە توانیم تۆزێ دڵخۆشی بکەم ـ بە حاڵەتێکی تایبەت و تۆزێ فێڵبازانەوە کە هەمیشە کاتێك باسی مەزهەبی دەکرد روخساری دادەگرت گوتی: ئێمە کوا سەرمان لە کاری خودا دەردەچێ؟

دوای ئەو قسانەی کە لە دەورانی دەزگیرانەتیدا سەبارەت بە مەزهەب هێنابوویانە گوڕێ ئیتر ئەو باسە لەلایەن هیچ کامیانەوە دانەمەزرابوو. بەڵام کیتی لە ڕێوڕەسمە ئایینییەکاندا بەشداریی دەکرد و بەردەوام دەچوو بۆ کەنیسە و خەریکی دۆعا و پاڕانەوە دەبوو، هەمیشەش هێمنانە و زۆر بە دڵنیاییەوە پێیوابوو کارێکی گرینگ و پڕبایەخ ئەنجامدەدات. ئەو بە پێچەوانەی لەڤین دڵنیابوو کە مێردەکەی وەك خۆی مەسیحییەکی دیندارە و تەنانەت لە خۆشی چاکترە و تەواوی ئەوانەش کە بە دەمیدا دەهات نەقڵ و نەزیلە و قسەی قۆڕی پیاوانە بوو کە زۆربەیان خوویان پێگرتووە و زۆری

گویّ نەدەدایە و بە دڵییەوە نەدەگرت، وەك ئەوەی کە سەبارەت بە گوڵدۆزی و دروومانی ئینگلیزییانەی ئەو دەیگوت. لەڤین دەیگوت: ژنی ماقووڵ هەوڵ دەدا کون و دڕاوەکان پینە بکات و بیانچنێتەوە کەچی ئەو پارچەی ساغ و تازە کونکون دەکات.

لەڤین دەیگوت: بەڵێ، ئەو ژنەتیوە، ماریا نیکۆلایڤنا، نەیدەتوانی بە جوانی کارەکان بەڕێوەبەریّ،.... دەبیّ دان بەوەشدا بنێم کە زۆر خۆشحاڵم تۆ هاتی. تۆ سەرتاپات پاکی و پاقژییە، بەجۆرێك کە... ـ دەستی ژنەکەی گرت بەڵام ماچی نەکرد. (ماچکردنی دەستی ژنەکەی لە شوێنێکی ئاوا و لە کاتێکدا کە ئاوا مەرگیان لیّ نزیکبوو وەك شتێکی نەشیاوی دەهاتە بەرچاو.)، تەنیا تۆزیّ دەستی گوشی و وەك ئەوەی خۆی بە خەتابار بزانیّ چاوی لە چاوە جوان و پڕترووسکەکانی بڕی.

ـ ئەگەر بە تەنیا بوایەی زۆر پڕئازار دەبوو بۆت ـ ئەوەی گوت و دەستی هەڵێناوە پرچە بە پەلکەگیراوەکانی لە پشت سەری کۆکردەوە و بە قردیلەیەك توندی کرد و روومەتە سوورهەڵگەڕاوەکانی کەوتنە پشت قۆڵە نەرم و شلەکانی. پاشان درێژەی پێدا: نا، ماریا نیکۆلایڤنا نەیدەزانی چ بکات، بەڵام من لە سۆدن زۆر شت فێر بووم.

ـ مەگین ئەویش لەو جۆرە نەخۆشانەی لێبوو؟

ـ زۆر لەوانە خراپتر!

ئەوەی بۆ من زۆر جیّی داخە و کزە لە دڵمەوە دێنیّ ئەوەیە کە لاوە و دڵ بە دنیایە.... تۆ رەنگە نەزانی چ لاوێکی جوانچاك بوو، بەڵام من ئەو کاتە لە قسەکانی نەدەگەیشتم.

ـ بە پێچەوانە، زۆر چاکیش دەزانم. پێموایە ئەگەر من و ئەو پێکەوە بوایەین زۆر باش لە قسەی یەکتر تێدەگەیشتین ـ کە ئەو قسەیە لە زاری دەرپەڕی سوورهەڵگەڕا، چاوێکی لە مێردەکەی کرد و فرمێسك لە چاویدا قەتیس ما.

لەڤین هەناسەیەکی هەڵکێشا و خەمبارانە وەڵامی دایەوە: بەڵیّ، ئەگەر پێکەوە بوونایە. ئەو بەڕاستی یەکێك لەو چەشنە مرۆڤانەیە کە وەك دەڵێن بۆ ئەم دنیایە نابیّ.

کیتی چاوێکی لە سەعاتە چکۆڵە و ناسکەکەی کرد و گوتی: بەڵام ئێمە رۆژانێکی زۆر دژوارمان لەبەرە. با بخەوین.

# بیست

ڕۆژی دوایی ڕێوڕەسمی وسڵی ڕۆن و نان و شەڕابیان بەڕێوەبرد. لەڤین لەو ڕێوڕەسمەدا بە شۆر و هۆگرییەوە دۆعای دەخوێند و دەپاڕایەوە. چاوی لەسەر ئەو پەیکەرە پیرۆزە هەڵنەدەگرت کە لەسەر مێزێکی یاری دایاننابوو و خاولییەکیان بەسەردا کێشابوو، ترووسکەی شۆر و پاڕانەوە و هیوایەك لەنێویاندا دەدرەوشایەوە کە لەڤین بە دیتنی لەوانەبوو زەندەقی بچێت. دەیزانی ماڵئاوایی لە ژیان، کە ئەو زۆری دڵ پێی خۆش نەبوو، بەم لالانەوە و هیوا بە سۆزەوە زۆر دژوارتر دەبێ بۆی. لەڤین براکەی خۆی باش دەناسی و فیکر و بیری دەخوێندەوە. دەیزانی کە لادینیی ئەو جۆرێك نەبوو کە بێئیمانی بۆ ئەو ئاسانتر بێ، بەڵکوو بەو هۆیە بوو کە دۆزینەوەی زانستە نوێیەکان بۆ ڕوونکردنەوەی دیاردەکانی عالەم، بەرەبەرە ئیمانی لە دڵی دەرهاویشتبوو و بەو هۆیە دەیزانی ئەم گەڕانەوەیە بەرەو ڕێگای ئیمان نە بە پێی یاساوڕێسا بوو نە ئاکامی بیر و ئەندێشە، بەڵکوو بە هۆی تاماحەوە بوو، هانەی ئەویش هیوایەکی شێتانە بوو بۆ چاکبوونەوە. لەڤین هەروەها دەیزانی کە کیتی بە گێڕانەوەی نەقڵی شیفا و چاکبوونەوەی سەیر و سەمەرەی نەخۆش و لەپێکەوتووان دەیهەوێ ورەی بخاتە دڵەوە. لەڤین هەموو ئەوانەی دەزانی، دیتنی چاوی پڕ پاڕانەوە و هیوای براکەی و ئەو دەستە ڕەقەڵانەی کە بە زەحمەت دەیتوانێ بەرزیان بکاتەوە تاکوو خاچی ناوچاوانە بزرکاو و زەردهەڵگەڕاوەکەی پێبکێشێ و یەسکی زۆپ و دەرپەڕیوی شانی و سیخەسیخی سەر سینگی کە ئیتر نەیدەتوانی گڕی ژیانی پێببەخشێتەوە و برا نەخۆشەکەی بۆ ئەو ژیانەوەیە دەپاڕایەوە، بووبوونە خەمێکی قورس لەسەر دڵی و لەوانەبوو لە ناخەوە دڵ و گیانی هەڵتەکێنن. کاتی وسڵی نیکۆلای، لەڤینیش دەپاڕایەوە و ئەوەش کارێك بوو کە ئەو ئەگەرچی بڕوای پێینەبوو، بەڵام هەزار جاری کردبوو. ڕووی لە دەرگای خودا دەکرد و دەیگوت: خودایە، ئەگەر بوونت هەیە کارێك بکە ئەم مرۆڤە نەخۆش و لەشبەبارە چاك بێتەوە و (ئەو کارەی گەلێك جار کردبوو) ئەویش و منیش ڕزگار بکە!

دوای وسڵی ڕۆنەکە حاڵی نیکۆلای هاتەوە سەرخۆ و باشتر بوو. سەعاتێك تێپەڕی و تەنانەت جارێك نەکۆخی. زەردەی دەگرت و دەستی کیتیی ماچ دەکرد و بەدەم گریانەوە سپاسی لێدەکرد و دەیگوت کە چاك بۆتەوە و هیچ کوێی ژان ناکات. ئیشتیای کراوەتەوە و

هەست دەکات هێز و گوڕی هاتۆتەوەبەر. تەنانەت کاتێك شۆرباویان بۆ هێنا خۆی هەستا دانیشت و دوای خواردنی شۆرباوەکە داوای کوتلێتی کرد. ئەگەرچی هێشتا لێیناهومێد بوون و بە دیتنی دەیانزانی کە چاکبوونەوەی مەحاڵە، بەڵام کیتی و لەڤین لەو کاتەدا هەستیان بە بەختەوەری و دڵخۆشی دەکرد و گەشابوونەوە، بەڵام هەروا دڵیان لە قرتو فرتدا بوو، دەتگوت بڕوا بە چاوی خۆیان ناکەن و دەترسن بەهەڵە چووبێتن.

بو یەك دەتریقانەوە و بە سرتە دەیانگوت: حاڵی باشترە؟ ـ بەڵێ زۆر باشە. ـ زۆر سەیرە ـ سەیریش نییە. ـ هەرچییەك بێ، شوکور حاڵی باشتر بووە!

بەڵام ئەو فکر و خەیاڵانە زۆری نەخایاند. نیکۆلای بە ئارامی خەوی لێکەوت و دوای نیوسەعات پیرانی کۆخە وەخەبەری هێنا و لە ناکاو هیوای لە دڵی خۆی و دەوروبەرییەکانی تاراند. هەقیقەتی رەنج و هیوا و تەنانەت بیرەوەریی هیواکانی رابردووشی لە دڵی کیتی و لەڤین و خۆشیدا پووچەڵ کردەوە.

نیکۆلای بێ ئەوەی بیر لەو شتە بکاتەوە کە نیوسەعات لەمەوبەر بڕوای پێیهەبوو، بەجۆرێك کە دەتگوت لێیشەرمەزارە، داوای لێکردن کە ئەو شووشە چکۆڵەی بدەنێ کە پڕبوو لە یۆد و زارکەکەی کاغەرێکی گرمۆڵەکراوی تێئاخنرابوو، تاکوو بۆنی پێوەبکات. لەڤین شووشەکەی پێدا، نیکۆلای هەر بەو سەرنجە هیوادارانەیەوە کە کاتی وسڵدانەکە لە وێنەی پیرۆزی بڕیبوو، لە براکەی روانی و داوای لێکرد کە رێز بۆ وتەکەی دوکتۆر دابنێ سەبارەت بە بۆنپێوەکردنی یۆد و بە راستی بزانێ.

کە لەڤین بە ناچاری قسەی دوکتۆرەکەی سەلماند نیکۆلای چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد و بە دەنگێکی گڕ پرسیی: کاتیا لێرە نییە؟ چاکە، کەوایە دەتوانین قسە بکەین... بۆ دڵخۆشیی ئەو بوو کە من ئەو یارییانەم وەڕێخست. ئەو ژنێکی شیرین و دڵپاکە. بەڵام من و تۆ نابێ خۆمان هەڵخەڵەتێنین. من تەنیا لەسەر ئەو بڕوایەی خۆمم ـ شووشەکەی بە دەستە رەقەڵەکانی گرت و دەستیکرد بە بۆن پێوەکردنی.

سەعات هەشت بوو و لەڤین لەگەڵ ژنەکەی لە ژوورەکەی خۆیان دانیشتبوون و چاییان دەخواردەوە کە ماریا نیکۆلایڤنا بە هەناسەبڕکێ هات بۆ لایان و بە رەنگێکی هەڵبزڕکاو و لێوەلەرێوە گوتی: کەوتۆتە گیانەڵڵا. زۆر دەترسم. خەریکە دەمرێ.

هەردووکیان هەڵاتن بۆ ژوورەکەی، نیکۆلای کەلەلا کەوتوو. کە گەیشتنە لای لەسەر تەختەکە خۆی کوشمەڵە کردبوو، سەری دانەواندبوو و هێزی دابووە سەر هەنیشکی.

لەڤین دوای تاوێ بێدەنگی بە ئەسپایی لێیپرسی: چۆنی؟

نیکۆلای زۆر بە دژواری و لەسەرەخۆ، کە دەتگوت وشەکان دانە دانە و بە زۆر لە گەرووی دەداتە دەرێ، گوتی: هەستدەکەم خەریکە دەمرم ـ سەری هەڵنەهێنا، تەنیا پێڵووی چاوی بەرزکردەوە، بەڵام چاوی بە روخساری براکەی کەوت. گوتی: کاتیا، تۆ بڕۆ.

لەڤین هەستا سەرپێ و بە لەبزێکی نەرم و فەرمانپێدەرانە پێیگوت لە ژوورەکە بڕواتە دەرێ.

نەخۆشەکە دیسان گوتی: خەریکم دەمرم.

لەڤین بە قەستی ئەوەی شتێکی گوتبێ گوتی: بۆ قسەی ئاوا دەکەی؟

دیسان قسەکەی پێشووی دووپاتکردەوە: چونکە خەریکم دەمرمـ وەك ئەوە وابوو کە ئەو قسەیەی بەدڵ بێ. پاشان: نەجاتم دەبێ.

ماریا نیکۆلایڤنا هاتەپێشێ و گوتی: واچاکە بخەوی. با زۆر ئازار نەکێشی.

نیکۆلای بە لەبزێکی گاڵتەجاڕانە و بە تووڕەییەوە گوتی: ئیتر زۆر ناخایێنێ. دەخەوم. بێدەنگ و لەسەرەخۆ، خەوی مەرگ. بەڵام ئەگەر وای بە باش دەزانن، بمخەوێنن.

لەڤین براکەی لەسەر پشت خەواند و لە پاڵیدا دانیشت، هەناسەی لە سینگیدا کۆکردەوە چاوی لە چاوی بڕی. نیکۆلای رەنگی مردووی لێنیشتبوو، چاوانی قووچاند و خەوت، بەڵام جارجار پێستی نێوچاوانی دەبزوا، وەك کەسێکی کە زۆر قووڵ و بە وردی خەریکی بیرکردنەوە بێ. لەڤینیش دەتگوت بێ ئیختیار هاوکات لەگەڵ ئەو بیردەکاتەوە و دەزانێ چی لە دڵی ئەودا رادەبرێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە هەوڵی دەدا و گوشاری بۆ زەینی خۆی دەهێنا، بە حاڵەتی روخساری ئارام و وشکی، بزواندنی پێستی نێوچاوانیدا بۆی دەرکەوت کە ئەوەی تا ئێستا تاریك ماوەتەوە بەلایەوە بۆ برا نەخۆش و لەشبەبارەکەی خەریکە روون دەبێتەوە.

نێکۆلای بە هێمنی و بە شێوەیەك کە قسەکانی بۆ راست نەدەبۆوە گوتی: بەڵێ، بەڵێ وایە. پەلە مەکەن ـ دیسان تۆزێك بێدەنگ بوو، پاشان بە لەبزێکی دڵخۆشیدەرانە و درێژکردنەوەی وشەکان وەك ئەوەی هەموو کێشە و گرفتەکانی چارەسەر بووبێ گوتی: راست وایە! ـ هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتیشی: ئاخ خودایە گیان!

ماریا نیکۆلایڤنا دەستی نایە سەر لاقی و بە هێواشی گوتی: خەریکە سارد دەبێتەوە.

نیکۆلای ماوەیەکی زۆر درێژ، لەڤین پێیوابوو زۆر درێژ بووە، جووڵەی نەکرد. بەڵام هێشتا زیندووبوو و جارجار هەناسەیەکی هەڵدەکێشا. لەڤین ئیتر تاقەتی بیرکردنەوەی نەمابوو. هەستی دەکرد کە ماوەیەکە لە برا کەلەلاکەی دوورکەوتۆتەوە. ئیتر نەیدەتوانی بیر لە مەرگ بکاتەوە، بەڵام

بەردەوام ئەو بیرە زەینی بەخۆیەوە خەریك کردبوو کە ئێستا، هەر ئێستا، دەبێ چ بکات؟ چیی لە دەست دێ؟ چاوانی بە مۆلەق وێستاوی براکەی بقووچێنێ؟ خەلاتیی بۆ بێنێ و تێیپێچێ؟ راسپێرێ تابووتی بۆ بێنن؟ بەلام سەیر لەوەدابوو کە هەستی دەکرد تەواو لەسەرەخۆیە. نە خەمی لە دلدایە و نە بە کۆچی براکەی هەست بە کەمایەسی دەکات و نە دلیشی پێیدەسووتێ. هەستی دەکرد ئێرەیی بە براکەی دەبات و بەو مردنە شتێك دەزانێ کە ئەو ناتوانێ بیزانێ.

هەروا ماوەیەك لە ژوور سەری دانیشت و چاوەڕوانی کۆتاییی کارەکە بوو. بەلام کۆتاییی پێنەدەهات. دەرگاکە کرایەوە و کیتی هاتەژوورێ. لەڤین هەستا تاکوو نەهێلێ بێتە ژوورێ، بەلام لەگەل هەستانی، دەنگی جوولانەوەی تەرمەکەی بیست.

نیکۆلای گوتی: مەڕۆ ـ دەستی بۆ لای ئەو راداشت. لەڤین دەستی خۆی دایە دەست براکەی و بە تووڕەیی ئاماژەی بە ژنەکەی کرد کە بڕواتە دەرێ.

دەستی براکەی بە دەستەوە گرت، نیوسەعات، سەعاتێك، دوو سەعات دانیشت. ئێستا ئیتر بیری لە مەرگ هەر نەدەکردەوە. بیری لەوە دەکردەوە کە ئێستا کیتی دەبێ چ بکات، مسافیری ژووری تەنیشت کێیە؟ پزیشکەکەی بلێی خانووبەرەی خۆی هەبێ؟ زۆری برسی بوو. خەوی دەهات. بە ئەسپایی دەستی لە دەستی براکەی دەرکێشا و بە نەرمی دەستی بە لاقیدا هێنا. لاقوقولی ساردوسڕ بوو بەلام هەناسەی دەکێشا. لەڤین دیسان ویستی بە ئەسپایی و لەسەر نووکی لاقی لە ژوورەکە بڕواتە دەرێ بەلام دیسان نیکۆلای جوولەیەکی کرد و گوتی: مەڕۆ

........................................................................

.................................

هەوا خەریکبوو رووناك دەبۆوە. نەخۆشەکە هەروا لە حالی خۆیدا بوو. لەڤین بە ئەسپایی دەستی لە دەستی براکەی دەرکێشا و بەبێ ئەوەی چاو لە چاوی بکات رۆیشت بۆ ژوورەکەی خۆی و خەوت. کاتێك خەبەری بۆوە بەجێی ئەوەی هەوالی مەرگی براکەی پێبگات کە چاوەڕێی بوو، تێگەیشت کە برا نەخۆشەکەی دیسان وەك هەوەلی لێهاتۆتەوە. دیسان دانیشتبوو و دەکۆخی و نانی دەخوارد. دیسان کەتبۆوە قسەکردن و ئیتر باسی مردنی نەدەکرد. دیسان هیوای چاکبوونەوە لە دلی گەڕابوو، لە پێشوو زیاتر تووڕە دەبوو و پیشی دەخواردەوە. کیتی و براکەی هیچیان نەیاندەتوانی دلخۆشیی بدەنەوە. چکۆلەترین بیانووی بۆ هەلکەوتایە قەلس دەبوو، جنێوی بە هەموو کەس دەدا و سەرکۆنەی دەکردن و داخی دلی خۆی پێدەڕشتن. دەیویست پزیشکێکی

ناوداری له مۆسکۆوه بۆ بێنن. هەرکەسێك له حاڵوباڵی بپرسیبایه به تووڕەیی و لالووتییەوه وەڵامی دەدایەوه: ئازار دەکێشم، ئیتر بۆم تاملّ ناکرێ و عەجمانم لێهەڵگیراوه.

تا دەهات ئازاری زیاتر دەبوو، بەتایبەت لەشی هێنده لەسەر جێگا تلیدابوو ئازای ئەندامی کوترابوو، بۆ هێورکردنەوەی ئەو ژان و ئازارەش هیچ کارێکیان له دەست نەدەهات. جارلەگەڵ جار زیاتر رقی له دەوروبەرییەکانی هەڵدەستا و هەرجارەی به بیانوویەك لۆمەی دەکردن، بەتایبەت بەو هۆیەی که له مۆسکۆوه پزیشکیان نەدەهێنا بۆ ماریجەکردنی. کیتی به هەموو شێوەیەك هەوڵی دەدا یارمەتیی بدات و دڵخۆشیی بداتەوه، بەڵام هەوڵەکانی هەمووی بێئاکام بوون. لەڤین دەیدی هاوسەرەکەی به جەسته لاواز بووه و به رۆحیش ئازار دەکێشێ، ئەگەرچی ناڕەزایەتیی دەرنەدەبڕی. ئەو شەوەی که داوای کردبوو براکەی بێت بۆ لای، ماڵئاوایی له ژیان و ئاگاداربوون له مەرگ له هەموو دڵەکاندا سەری هەڵدابوو، بەڵام ئەو ئاگاداربوونه ئێستا شلوێ بووبوو. هەموو دەیانزانی مەرگ نکوولّیی لێناکرێ و ئەم بەم زووانه ماڵئاوایی له ژیان دەکات و هەر ئێستاش بەحاڵ رۆحی لەبەردا ماوه. هەموویان تەنیا ئاواتێکیان هەبوو، ئەویش ئەوەبوو که هەرچی زووتر نەجاتی بێت، بەڵام هەموویان ئەو ئاواتەی خۆیان دەشاردەوه، دەواو دەرمانیان دەرخوارد دەدا و دەچوون به دوای دوکتۆردا و ئەو و خۆیان و یەکتریان فریودەدا. ئەوانه هەمووی درۆبوون، درۆیەکی دزێو و پرسووکایەتی و کفرئامێز. ئەم درۆیەش بۆ لەڤین بەتایبەت بەو هۆیه زۆر بەژان بوو که ئەو لاوه کەلەلا و لەشبەبارەی له هەمووان خۆشتر دەویست.

لەڤین که ماوەیەکی زۆر بوو له بیری ئەوەدابوو که بەرله مردنی نیکۆلای ئەو و سرگی ئیڤانڤیچ پێکەوه ئاشت بکاتەوه. نامەیەکی بۆ سرگی ئیڤانڤیچ نارد و کاتێك وەڵامەکەی هاتەوه بۆ نیکۆلای خوێندەوه. سرگی ئیڤانڤیچ نووسیبووی که خۆی ناتوانێ بێت، بەڵام غەمگینانه داوای لێبوردنی له براکەی کردبوو.

نیکۆلای هیچی نەگوت.

لەڤین پرسیی: چیی بۆ بنووسمەوه؟ هیوادارم لێیدڵمەند نەبی.

نیکۆلای، بەو پرسیاره شڵەژا و وەڵامی دایەوه: نا، لێی دڵمەند نیم، بۆی بنووسه دکتۆرێکم بۆ بنێرێ.

سێ رۆژی تاڵی تر تێپەڕی. نەخۆشەکەش هەروا له حاڵی خویدا بوو. ئێستا ئیتر هەرکەس چاوی پێیدەکەوت دڵی پێیدەسووتا و مەرگی بۆ به ئاوات دەخواست. هەر له پێشخزمەتەوه بگره هەتا بەڕێوەبەری میوانخانەکه و موسافیرەکان و پزیشك و ماریا نیکۆلایڤنا و تەنانەت

لەڤین و کیتیش ئاواتێکیان جگە لەوە نەبوو. تەنیا نەخۆشەکە خۆی بوو کە ئەو ئاواتەی لە دڵدا نەبوو، بە پێچەوانە رقی دەکرد و دەیگوڕاند کە بۆچی پزیشکێکی تر ناهێنن بۆ چارەسەری ئەو نەخۆشییەی. لە پەستا دەواکانی دەخوارد و باسی ژیانی دەکرد. تەنیا هێندێ جار ئەویش زۆر بە دەگمەن کاتێك کە مۆرفین ئازارەکانی لەشی هێور دەکردەوە و لەنێوان خەو و بەخەبەریدا ئەوەی کە زیاتر لە هەموو شتێك لە رۆحی خۆیدا هەستی پێدەکرد و دەریدەبڕی ئەمە بوو: ئای، خۆزگە نەجاتم بوایە ـ یان: گەنگێ نەجاتم دەبێ؟

ئەو ئازارانەی کە بەردەوام خۆی لە ئێسك و دەماری دەهاڵاند کاری خۆی دەکرد و ئەوی وا لێدەکرد بۆ مردن ئامادەبێت. بە هەربارێکدا دەخەوت نەیدەتوانی و ژان و ئازار ئۆقرەی لێدەبڕی، بۆ چرکەیەکیش خۆی لە بیرنەدەچۆوە و ئازایەك لە ئەندامی نەبوو کە ئازار نەکێشێ و ئاراوقارای لێهەڵنەگرێ. تەنانەت بیرەوەرییەکانیشی کە تایبەت بە جەستەی بوون و شوێنیان لەسەر لەشی دانابوو، کاتێك بیری لێدەکردنەوە ژانیان کەمتر لە ژانی لەشی نەبوو و بەجارێ ئاراوقارای لێهەڵدەگرت. دیتنی خزم و کەسان و قسەکانیان و بیرەوەرییەکانی خۆی هەمووی دەبوونە ژان و خۆیان لە گیان و هەناوی دەهاڵاند. دەوروبەرییەکانی هەستیان بەو حاڵە دەکرد و بێ ئیختیار لەلای ئەو نەیاندەوێرا قسەیەك بکەن و خۆیان لە هەڵسوکەوتی بەجۆرێك یان دەربڕینی ئارەزوویەك دەبوارد. تەواوی ژیانی بەو ئازار و ئاواتی نەجات بوونەوە بەند بوو.

دیاربوو گۆڕانێکی بەسەردا هاتووە و مەرگ بۆ ئەو وەك مزگێنیدەری بەختەوەری و گەیشتن بە ئاواتەکانی، خۆی دەنوێنێ. بەر لەوە هەرکام لە مگێز و خواستەکانی کە بە هۆی ئازار یان بێبەشبوون و شەکەتی و برسیەتی و تینوێتییەوە بوو، بە جینگڵ لەخۆدانێك وەلای دەنان و بڕێك چێژی پێدەبەخشی، بەڵام ئێستا ئازار و تاسە و بێبەشبوون بۆی نەدەبووە هۆی چێژوەرگرتن، بەڵکوو هەوڵدان بۆ گەیشتن بەو خواستانە خۆی ئازارێکی قورستری وەدیهێنابوو، هەر بۆیە هەموو تاسەو ویستەکانی لە حەزێکدا کۆ بووبۆوە ئەویش قوتاربوون لە دەست ئەو هەموو ئازارە و دەربازبوون لە مەکۆی ئەوان یانی جەستەی بوو، بەڵام بۆ دەربڕینی ئەو تاسە و ئاواتە و گەیشتن بە ئازادی هیچ وشەیەکی پێشك نەدەهات، بۆیە لەو بارەوە نەدەدوا و بە پێی عادەت دەیویست خواست و تاسەیەکی بۆ دەستەبەر بکەن کە ئیتر دەستەبەر کردنی نەدەلوا. دەیگوت: بمخەنە سەر ئەو لاتەنیشتەی ترم ـ هەر خێراش هاواری لێهەڵدەستا و دەیویست وەك پێشووی لێبکەنەوە، لەسەر هیچ بارێك خۆی نەدەگرت. یان دەیگوت: سووپم بۆ بێنن. ـ کاتێك سووپیشیان بۆ دەهێنا

دەیگوت: سووپ ناخۆم، لایبەن. شتێك بڵێن، بۆ قسەناکەن؟ ـ کە دەستیان دەکرد بە قسەکردن چاوی زەق دەکردەوە و بە بێزارییەوە وایدەنواند کە شەکەت و وەڕەزە.

کیتی دە رۆژ دوای هاتنی بۆ ئەو شارە نەخۆش کەوت. تووشی ژانەسەر بووبوو و دڵی لە خێڵەوە دەهات و بەیانی نەیدەتوانی لە جێوبانەکەی بێتە دەرێ.

دوکتۆر دوای پشکنین بۆی دەرکەوت کە نەخۆشییەکەی بە هۆی شەکەتی و هەیەجانی زۆرەوەیە و دەبێ پشوو بدات و دڵی خۆی نارەحەت نەکات.

بەڵام کیتی دوانیوەڕۆ هەستا و وەك هەمیشە بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکی خۆی چوو بۆ ژوور سەری نیکۆلای. کاتێك پێینایە ژوورەکەی نیکۆلای بە توندی چاوێکی لێکرد و کاتێك کیتی باسی نەخۆشیی خۆی کرد نیکۆلای بزەیەکی پڕسووکایەتی نیشتە سەرلێوی. ئەو رۆژە بەردەوام وڕێنەی کرد و ناڵاندی.

کیتی لێیپرسی: حاڵت چۆنە؟

بە زەحمەت وەڵامی دایەوە: زۆر خراپ، ئەو ژانە ئۆقرەی لێبڕیوم.

ـ کوێت ژان دەکات؟

ـ هەموو گیانم دێشێ.

ماریا نیکۆلایڤنا گوتی: ئەمڕۆ نەجاتی دەبێ. لێمڕوونە ـ ئەو قسەیەی بە سرتە چپاند بە گوێی کیتیدا بەڵام نیکۆلای هێندە لەسەر هەست بوو، هەروەك لەڤین تێگەیشتبوو، زانیی کە نیکۆلای گوێچکەی هەرزن هەڵدەگرێ و زۆر وێدەچوو ئەو سرتەیەی بیستبێ. لەڤین بە «وست» ماریای بێدەنگ کرد و چاوێکی لە برا نەخۆشەکەی کرد. نیکۆلای گوێی لێبوو بەڵام ئەو قسانە هیچ شوێنێکی لەسەر دانەنا. سەرنجەکانی هەروا سەرکۆنەئامێز و تەشەراوی بوون.

کاتێك ماریا نیکۆلایڤنا بە دوای لەڤیندا هات بۆ داڵانەکە لەڤین لێیپرسی: تۆ چووزانی ئەمڕۆ دەمرێ؟

ماریا نیکۆڵایڤنا گوتی: دەستی کردووە بە خۆپچڕین.

ـ چۆن خۆی دەپچڕێ؟

ـ ئاوا ـ چینی کراسە پەشمینەکەی خۆی بە چنگی گرت و کێشای.

لەڤین تێگەیشت کە برا چارەڕەشەکەی ئەو رۆژە بەردەوام چنگی لە جەستەی خۆی گیر دەکرد و دەیپچڕی. وەك ئەوەی بیهەوێ شتێکی لێدەرکێشێ.

پێشوێژییەکەی ماریا نیکۆلایڤنا وەڕاست گەڕا. لای ئێوارە ئیتر هێزی نەبوو دەستی هەڵێنێتەوە و چاوی زەقی لە خاڵێکی رووبەڕووی خۆی بڕیبوو، نە سەرنجی دەگوێستەوە

و نە چاوی دەترووکاند. تەنانەت کاتێك کیتی یان براکەی دادەنەوینەوە و چاویان لە چاوی دەکرد ئەو هەروا لە شوێنێکی نادیاری دەڕوانی و باری روانینەکەی نەدەگۆڕی. کیتی کەسێکی نارد بە دوای قەشەدا تاکوو بێت و دۆعای گیانکەنشتی لەسەر بخوێنێ و هێمنایەتی بە رۆحی ببەخشێ.

کاتێك کە قەشە دۆعای هێمنایەتیی لەسەر دەخوێند، هیچ دیاردەیەکی ژیان بە لەش و روخسارییەوە دیارنەبوو. چاوی قووچابوون. لەڤین و کیتی و ماریا نیکۆلایڤنا لەبەر چرپاکەیدا راوەستابوون. هێشتا دۆعاکە تەواو نەبووبوو نیکۆلای خۆی کێشاوە و لاقی رەپ کرد، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و چاوی هەڵێنا. قەشە دۆعاکەی تەواوکرد و خاچی بە نێو چاوانە ساردەکەی نێکۆلایدا کێشا و پاشان خاچەکەی لە قردێلە پانەکەی دەوری ملی پێچایەوە و دوای ئەوەی تۆزێ بێدەنگ راوەستا دەستی لەسەر دەستی زەلام و سارد و بێخوێنی مردووەکە دانا.

گوتی: نەجاتی بوو ـ دیویست بڕوا، بەڵام لەپڕ سمێڵی مردووەکە جووڵایەوە و لە بێدەنگیی ژوورەکەدا و لە ناخی سینگییەوە دەنگێکی روون وئاشکرا هاتە گوێی و بە نەرمی گوتی: هێشتا بە تەواوی نا.... بەڵام زۆرم نەماوە.

دوای خولەکێك روخساری سپی هەڵگەڕا و زەردەیەك لە ژێر سمێڵیدا خۆی نواند و ئەو ژنانەی کە لە دەوری کۆ بووبوونەوە، بۆ پێچانەوە و ئامادەکردنی بەپەلە خۆیان هەڵکرد.

دیتنی براکەی لە سەرەمەرگدا ئەو ترسە تاڵ و ئاڵۆزەی خستە رۆحی لەڤینەوە و لەگەڵ ئەوەشدا بیری مەرگێکی لە مێشکیدا زیندوو کردەوە کە ئەو پاییزە شەوەی براکەی هاتبوو بۆ سەردانی، مێشك و دڵی داگرت. ئەم هەستە ئێستا زۆر بەگوڕتر بوو، ئەویش نەیدەتوانی وەك ئەودەم لە مانای مەرگ تێبگات، بۆیە لەبەر چاوی زۆر ترسناکتر لە رابردوو بوو. بەڵام ئێستا نزیکبوون لە ژنەکەی نەیهێشت ئەو هەستە ببێتە هۆی هیوابڕاوی. ئەو ئەگەرچی مەرگ لەبەر دەمیدا بوو، بەڵام تینوگوڕی ژیان و ئەوینی هەست پێدەکرد. هەستی دەکرد کە ئەوین لەدوای ئەو هیوابڕاوییە دەربازی دەکات. هەستی دەکرد کە ئەوینەکەی لە ژێر گوشار و هەڕەشەی ناهومێدیدا گەرموگوڕتر و بێوێنەتر بووە و گەشەی سەندووە.

دوکتۆر بۆچوونەکەی خۆی سەبارەت بە بارودۆخی سلامەتیی کیتی پشتڕاست کردەوە و گوتی: نەخۆشییەکەی بە هۆی دووگیانییەوەیە.

# بیست و یەك

لەوکاتەوە کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لەگەڵ بێتسی و ستیپان ئارکادیچ قسەی کرد و بۆی دەرکەوت تەنیا شتێك کە لەویان دەوێ ئەویە کە لە کۆڵ ژنەکەی ببێتەوە و بە چاوپێکەوتنی خۆی ئازاری نەدات و ژنەکەشی جگە لەوە هیچی تری ناوێ، وەها تێکچوو و لە ناخەوە هەژا کە بە تەنیایی نەیدەتوانی بڕیاربدات و نەیدەزانی چ بکات. بۆیە خۆی دایەدەست کەسانێك کە بە تامەزرۆییەوە کارەکانی ئەویان گرتە ئەستۆ و ئەوەی ئەوان پێیان دەگوت قەبووڵی دەکرد و لە قسەیان دەرنەدەچوو. تەنیا کاتێك کە ئانا ماڵەکەی بەجێ هێشت و پەرستاری ئینگلیزی پەیامی بۆ ئەو (یانی بۆ کارنین) نارد و لێیپرسی کە دەبێ لەگەڵ ئەو نان بخوات یان بە تەنیا، لەپڕ راچڵەکی و بە روونی بارودۆخی خۆی بۆ دەرکەوت و خەمێکی قورس دڵی داگرت و هەستی کرد دنیا بە سەریدا رووخاوە.

لەویش بەژانتر و ناخۆشتر ئەمەبوو کە ئەو بە هیچ جۆرێك نەیدەتوانی رابردووی خۆی لەگەڵ ئەمڕۆ پێکەوە پێوەند بدات و ئاشتیان بکاتەوە. ئەو رابردووەی کە لەگەڵ ژنەکەی هەستی بە بەختەوەری دەکرد و نەیدەزانی خەم و ئاڵۆزی چییە. تێپەڕین لەو شیرینکامییە و ئاگاداربوون لە خەیانەتی ژنەکەی ئەگەرچی زۆر تاڵ و بەژان بوو، بەڵام گوزەرا بوو. ئەو بارودۆخە هەڵبەت زۆر تاڵ بوو بەڵام زۆر ئاڵۆز نەبوو. ئەگەر ژنەکەی ئەو کاتەی لە خەیانەتەکەی خۆی ئاگاداری کرد بەجێی بهێشتبایە وەك ئێستا خەم و دڵتەنگی داینەدەگرت، هەستی بە نامرادی دەکرد بەڵام ئیتر نەدەکەوتە نێو ئەم تەنگژە بێ مانایەی ئێستاوە. ئێستا بە هیچ شێوەیەك نەیدەتوانی رابردووی خۆی، دڵنەرمی و خۆشەویستی دەرهەق بە ژنە نەخۆشەکەی و کۆرپەیەك کە هی خوی نەبوو، لەگەڵ بارودۆخی ئێستای کە دەتگوت بۆ پاداشی ئەو هەموو چاوپۆشی و دڵگەورەییە، تەنیا و شەرمەزار و بێکەڵك بۆتە رشقنجاری خەڵك و سووکایەتیی پێدەکرێ، پێکەوە گرێ داتەوە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە ماوەی دوو رۆژی دوای رۆیشتنی ژنەکەی کاروباری دایرەکەی بەڕێوەدەبرد و خەڵك و نووسیارە تایبەتەکەی خۆی بانگ دەکرد. لە کومیسیۆندا بەشداریی

دەکرد و بە شێوەی ئاسایی بۆ خواردن دەچووە ژووری نانخواردن. بەبێ ئەوەی خۆشی بزانێ بۆچی، لەو دوو ڕۆژەدا بە تەواوی هێز و توانای خۆیەوە هەوڵیدەدا کە لەسەرەخۆ و کەمتەرخەم بنوێنێ. لێیان دەپرسی کە بۆ کەلوپەل و شتی نێو ژوورەکەی ئانا ئارکادیۆڤنا چ دەستوورێك دەدا، ئەویش وێڕای وەڵام دانەوە هەوڵی دەدا وابنوێنێ کە هیچ شتێکی نائاسایی نابینێت و تەواو خۆی سارد و بێموبالات نیشان دەدا و مەبەستەکەی خۆشی پێکابوو. هیچ کەس نەیدەتوانی شوێنەواری بێهیوایی لە روخسار و هەڵسوکەوتیدا ببینێ. بەڵام ڕۆژی دوایی، کاتێك کە کۆرنی سیاییی بەرگدرووی بۆ هێنا کە ئانا لە بیری چووبوو بیدات و گوتی کە حیسابداری بەرگدروەکە خۆی هاتووە، ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کابرای حیسابداری بانگکردە ژووری.

ـ لەوەی کە رووهەڵماڵدراوانە هاتم و موزاحیمی بەڕێزتان بووم داوای لێبوردن دەکەم، بەڵام ئەگەر دەتانهەوێ حیسابەکە لەگەڵ خاتوون خۆیدا بکەین تکایە کەرەم بفەرموون و ناونیشانەکەیمان بدەنێ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەروەك حیسابدار تێگەیشت، ماقما و خەیاڵ هەڵیگرت. لە ناکاو رووی وەرگێڕا و لە پشت مێزەکە دانیشت. بە هەردوو دەستی سەری خۆی گرت و ماوەیەکی زۆر هەروا مایەوە. چەند جار ویستی قسە بکات بەڵام هیچی نەگوت.

کۆرنی کە بۆی دەرکەوت ئەربابەکەی حاڵی تێکچووە بە حیسابداری بەرگدرووی گوت بڕوات و ڕۆژێکی تر بێتەوە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە تەنیا کەوت، وەخۆ هاتەوە و تێگەیشت کە ئیتر ناتوانێ ئاوا درێژە بە خۆگێلکردن بدات و وەك کەو سەر بکات بە ژێر بەفردا. گوتی فایتوونەکە بەڕێ بکەن بڕوات با مەحتەل نەبێ، دەستووریشیدا هیچ کەس ڕێنەدەن بچێتە ژووری و بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆش لە ژووری کارەکەی نەچووەدەرێ.

هەستی دەکرد کە ناتوانێ باری ئەو سووکایەتی و گوشارە تامڵ بکات کە لە هەموو لایەکەوە نیشتبووە سەر جەستە و ڕۆحی. روانینی ئەو حیسابدارە و کۆرنی و هەموو دەوروبەرییەکانیشی لەو دوو ڕۆژەدا کە تووشی دەبوون هەروا سارد و مانادار بوو. دەیدی کە ناتوانێ بەرگری لە بێزاریی خەڵك بکات، چونکە ئەو بێزارییە بە هۆی خراپیی ئەوەوە نەبوو (ئەگەر خراپ بوایە دەیتوانی هەوڵ بدات تاکوو باشتر بێ) بەڵکوو بەهۆی چارەڕەشی و ناوچاوانە رەشەکەیەوە بوو و چارەڕەشییەکەشی پڕشوورەیی و قیزەون بوو. هەستی دەکرد بە هۆی ئەوەوە بە چاوی سووك تەماشای دەکەن چونکە دڵی شکاوە و هەستی رووشاوە. هەستی دەکرد کە خەڵکی لەنێوی دەبەن، هەروەك چۆن سەگەل بێبەزەییانە سەگێکی زامار

دەخنکێنن کە لەبەر ژان و ئازار دەقورووسکێنێ و نووزەنووز دەکات. دەیزانی تەنیا ڕێگای دەربازبوون لە دەست ئەو خەڵکە و چزووی تیژی چاوانیان ئەوەیە کە برینەکانی خۆی بشارێتەوە و نەهێڵێ پێی خۆشبن، بۆیە لەم دوو ڕۆژەدا بێ ئیختیار ویستبووی ئەو کارە بکات بەڵام ئێستا هەستی دەکرد کە ئیتر توانایی ئەو کێشە و بەربەرەکانێ قورس و نابەرانبەرەی نییە.

کە بۆی دەردەکەوت تەکو تەنیا لەگەڵ خەمەکانی ماوەتەوە، ناهومێدی تەنگی بە ڕۆحی هەڵدەچنی. نەك هەر لە پترزبۆرگ بەڵکوو لە هیچ کوێ، هیچ کەسی نەبوو کە بتوانێ کوڵوکۆی دڵی لەلا هەڵڕێژێ و نەك وەکوو پیاوێکی دەوڵەت یان شارۆمەندێك، بەڵکوو مرۆڤێکی ئاسایی خەمی بۆ بخۆن و دڵخۆشیی بدەنەوە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ قوناخی دواناوەندی و زانکۆی سەرکەوتووانە کۆتاییی پێهێنا و بڕوانامە و میدالیای شانازیی وەرگرت و بە یارمەتیی مامی لەڕێوە لە کاری دەوڵەتدا دامەزرا و لە ماوەیەکی کورتدا درەوشایەوە و ناوبانگی دەکرد، هەر لەوکاتەشەوە بە هەموو توانایەوە هەوڵیدا و ناو و ناوبانگی بڵاو بۆوە. نە لە قوتابخانەی دواناوەندی و نە لە زانکۆ و نە دواتریش کە لە کاری دەوڵەتدا دامەزرا، لە هیچ کوێ و لەگەڵ هیچ کەس پێوەندیی دۆستانەی دانەمەزراند. براکەی، کە لەباری ڕۆحییەوە زۆری لێ نزیکبوو، لە وەزارەتی کاروباری دەرەوە کاری دەکرد و بەردەوام لە هەندەران بوو، ماوەیەك دوای ژنهێنانی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە وڵاتی غەریبایەتی کۆچی دواییی کرد.

ئەو کاتەی کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ پارێزگار بوو پووری ئانا کە ژنێکی دەوڵەمەند بوو لەو پارێزگایە دەژیا و ئەگەرچی پیاوێکی گەڕاوە بوو بەڵام وەك پارێزگارێکی لاو دەهاتە ئەژمار، پیرێژنەی پووری ئانا ئەوی لەگەڵ خوشکەزاکەی ئاشنا کرد و کارێکی کرد کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ناچاربێ یان بچێتە خوازبێنی ئانا یان ئەو پارێزگایە بەجێ بێڵێ. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ماوەیەك دوودڵ بوو. هەرچی سەری دێنا و دەبرد نەیدەزانی چ بکات و لەو کاتەدا هۆکاری هاندەر و بەرگری ئەو بۆ بڕیاردان وەکوو یەك وابوون. هیچ هۆیەکی ئەوتۆش نەبوو کە وای لێبکات لەو بڕیارەی خۆی پاشگەز بێتەوە. بەڵام پووری ئانا لە ڕێگای یەکێك لە ناسیاوانەوە تێیگەیاند کە داوا لە ئانا بکات ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێکبێنێ. ئەو چووە خوازبێنیی ئانا و تەواوی ئەشق و خۆشەویستی خۆی پێشکەش بە دەزگیرانەکەی کرد کە دەبووە هاوسەری داهاتووی.

خۆشەویستیی ئانا وای لێکرد کە ئیتر زۆر گوێ بە خەڵك نەدات و بە شێوەیەکی ساردوسڕانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکات، بەجۆرێك کە لەنێو دۆستان و ناسیاواندا دڵی کەسی بە خۆیەوە نەهێشتبوو. کەسانێکی زۆر هەبوون کە پێوەندیی کۆمەڵایەتی یان ئیدارییان لەگەڵێدا هەبوو بەڵام پێوەندیی دۆستانەی لەگەڵ هیچ کەسدا نەبوو. زۆر کەس هەبوون کە ئەو دەیتوانی بۆ شێو و فراوێن بانگهێشتنیان بکات بۆ ماڵەکەی، یان داوایان لێبکا لەو کاروبارانەدا کە هۆگریی پێیان هەیە یارمەتیی بدەن، یان پشتگیرییان لێبکات تاکوو سەرنجیان بۆ لای ئەو کەسانە راکێشرێ کە ئەو باوەڕی پێیان هەیە، یان بەبێ رووپامایی لەگەڵ ئەوان سەبارەت بە کاروباری خەڵك و دەوڵەت بکەوێتە ئاخافتن، بەڵام پێوەندیی لەگەڵ ئەو کەسانە بە پێی رێسا و خووخدە سنووردار بووبوو، تەنانەت نەیدەتوانی لێشی دەربازبێ و ئەو سنووره خۆکردە بپەڕێنێ. تەنیا یەکێك لە هاوڕێیانی دەورانی زانکۆی بوو کە دوای کۆتایی هاتنی زانکۆ بناغەی دۆستایەتیی لەگەڵ دامەزراندبۆوە و دەیتوانی لەلای ئەو بوخچەی دڵی بکاتەوە و سەبارەت بە خەمەکانی دەردەدڵی لەگەڵدا بکات. بەڵام ئەو هاوڕێیەشی بەڕێوەبەرایەتی فەرهەنگ و فێرکاریی پارێزگایەکی دوورەدەستی لە ئەستۆ بوو. لەنێو ئەو ناسیاوانەدا کە لە پترزبۆرگ نیشتەجێبوون بەرپرسی نووسینگە تایبەتەکەی و پزیشکەکەی لە هەمووانی لێنزیکتر بوون.

میخائیل ڤاسیلییڤیچ سلیۆدین، بەرپرسی نووسینگە تایبەتەکەی پیاوێکی زیرەك و دڵپاك و ئاکار جوان بوو، کارنین دەیزانی کە هۆگرییەکی زۆری پێیهەیە و خۆشیدەوێ، بەڵام هاوکاریی پێنج ساڵی رابردوویان لە بواری کاروباری فەرمانگەدا تخووبێکی کێشابوو کە نەیدەهێشت پێوەندیی دۆستانەیان گەرموگوڕ و خۆمانە بێت.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دوای ئەوەی ئەو نامانەی واژۆ کرد کە دەبوو واژۆیان بکات ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو. جارجار چاوی لە میخائیل ڤاسیلییڤیچ دەکرد و دەیویست سەری قسەی لەگەڵدا بکاتەوە بەڵام نەیدەتوانی. چەند جار ویستی بڵێ «تۆ زانیوتە چ بەڵایەکم بەسەر هاتووە؟» بەڵام ئاخری بە شێوەی ئاسایی گوتی: چاکە، تکایە ئەمانە ئامادەبکە ـ پاشان مەرەخەسی کرد.

ئەوەی دیکەش پزیشکەکەی بوو کە خۆشی دەویست. بەڵام هەردووکیان لەمێژ بوو بە پێی سازانێکی بێدەنگانە قەبووڵیان کردبوو کە هەردوولا کاریان هەیە و دەبێ بە پڕتاو کار بکەن.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بیری لەو خاتوونانە نەدەکردەوە کە ئاشنای بوون، بەتایبەت کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا. ئەو لە هەموو ژنان بە هۆی ژنبوونیانەوە دەترسا و لێیان بێزار بوو.

## بیست و دوو

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنای لەبیربردبۆوە، بەڵام کۆنتس ئەوی لە بیرنەبردبۆوە. کۆنتس لە کاتێکی زۆر تاڵی تەنیایی و هیوابڕاویدا هات بۆ لای و بەپەلە و هەڵەداوان خۆی کرد بە ژوورەکەیدا و دیتی کارنین وەك پێشوو بە هەردوو دەستی سەری گرتووە و هەنیشکی ناوەتە سەر مێزەکەی و دانیشتووە.

بە لەرز خۆی کرد بە وەتاغی کارەکەیدا و گوتی: ***ببوورە بەبێ ئیزن خۆم کرد بە ژووریدا*** ـ لەبەر شڵەژاوی و هەیەجان کەوتبووە هەناسەبڕکێ و بەپەلە هاتە بەر مێزەکەی و دەستی ئەوی توند بە هەردوو دەستی گوشی و چاوی جوان و پڕ لە خولیای خۆی لە چاوی کارنین بڕی و درێژەی پێدا: ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دۆستی بەڕێز، من هەموو شتێکم بیستووە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ نێوچاوانی تێکنا و هەستا سەرپێ و دەستی لە دەستی کۆنتس دەرکێشا و کورسییەکی بۆ هێنا پێشێ و گوتی:

ـ تکایە فەرموو دانیشە، خاتوو کۆنتس. من چونکە بڕێ ناساغم، پێمگوتبوون داوای لێبوردن لە دۆستان بکەن ـ کاتێك ئەوەی گوت لێوی دەلەرزین.

کۆنتس لێدیائیڤانۆڤنا بێ ئەوەی چاوی لەسەر هەڵگرێ دووپاتی کردەوە: دۆستی بەڕێز! ـ لە ناکاو دوو جەمسەری ناوەوەی برۆی هەڵکشان و لەسەر ناوچاوانی سێ سووچێکیان دروست کرد و روخسارە زەردەڵە ناحەزەکەی دەزێوتری نواند. بەڵام ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەستی کرد کە ئەو ژنە دڵی پێیدەسووتێ و هێندەی نەمابوو دەست بکات بە گریان. بۆیە دڵی رێککگوشرا و دەستی گۆشتنی ئەوی گرت و ماچی کرد.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا بە دەنگێکی پسپس و شڵەژاوانەوە گوتی: دۆستی بەڕێز، تۆ نابێ خۆت تەسلیمی خەم و کەسەر بکەی. تۆ خەمەکەت زۆر قورسە بەڵام دەبێ ددان بە خۆتا بگری.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەستی کۆنتسی بەردا، بەڵام هەروا کە چاوی لە چاوە پڕ فرمێسکەکانی بڕیبوو گوتی: من لەنێوچووم، تێکشکاوم، من ئیتر مرۆڤ نیم. من بۆیە هەست

دەکەم کەوتوومە بارودۆخێکی ترسناکەوە و لێمقەوماوە، چونکە لە هیچ کوێ و تەنانەت لە ناخی خۆشمدا هیچ پشتیوان و هیوایەکم بۆ نەماوەتەوە.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: پشتیوانت دەبێ. پێویستە لێیبگەڕێی، بەڵام نەك من، ئەگەرچی هیوادارم بڕوات بە راستی و دروستیی دۆستایەتییەکەم هەبێ. ئەوەی پشتیوانی ئێمەیە تامەزرۆیی و ئەوینە، ئەوینێك کە "ئەو" فێری کردووین. باری ئەو لەسەر شانی بەندەکانی قورسایی ناکاتـ کاتێك ئەوەی دەگوت تروسکەی شادی و نەشەیەکی رۆحی لە نیگایدا دەدرەوشایەوە کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ زۆر باشی پێئاشنابوو: ئەو دەستگیرۆییمان دەکات و پشتیوان و یارمەتیدەرمانە.

ئەگەرچی ئەو قسانەی کونتس بە هۆی هەیەجان و هەستی بەرزی خۆیەوە بوو، هەروەها لە سەرچاوەی ئەشق و دەروونی عیرفانیی ئەوەوە هەڵدەقوڵا، کە لەو سەردەمەدا لە پترزبۆرگ باو بوو. بە بڕوای ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ پووچ و بێهوودەی دەنواند، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەو قسانە بۆ ئەو خۆش و دڵبلاوێن بوون.

گوتی: من خوێڕی و بێوەرم، فەوتاوم. ئەو بارودۆخەم پێشبینی نەکردبوو و ئێستا نازانم قوڕی کوێ بەسەرما بکەم.

لیدیا ئیڤانۆڤنا دیسان گوتی: دۆستی بەڕێز!

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ درێژەی پێدا: خەم بۆ ئەو شتە ناخۆم کە لە دەستم داوە. نا، ئیتر هەر وەنازانم بووشە. بەڵام نازانم لەو بارودۆخەدا کە تێیکەوتووم چۆن لەنێو خەڵکدا سەرم هەڵبێ و هەست بە شەرمەزاری نەکەم. ئەگەرچی دەزانم شتێکی خراپە، بەڵام ناتوانم، نازانم چ بکەم.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا تامەزرۆیانە چاوی لە چاوی بڕی و گوتی: تۆ، تۆ نەبووی کە بەو کارە گەورەی خۆت دڵی من و هەمووانت گەشاندەوە و بەو لێبوردن و دڵفراوانییەت چاوپۆشیت لە تاوانبار کرد و گەورەیی خۆت سەلماند، بەڵکوو "ئەو" بوو کە لە دڵی تۆدا بوو و نایە دڵت کە ئەو کارە بکەی، هەر بەو هۆیەش تۆ نابێ بۆ کارێکی کە کردووتە هەست بە شەرمەزاری بکەی.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ نێوچاوانی گرژ کرد و پەنجەی لێکهەڵپێکا و تەقەتەقی وێخستن.

بە دەنگێکی جیکن گوتی: ئەگەر هەموو پاژەکانی ئەو کارەت بزانیبایە... کۆنتسی خۆشەویست، مرۆڤ خۆ دارو بەرد نییە و من هیدی لەوە زیاتر هێز و بڕستم نەماوە. ئەمڕۆ لە بەیانییەوە بە کارەکانی ماڵێ راگەیشتووم و بڕیارگەلێکم داوە کە هەموو بە هۆی ئەم تەنیاییە

تازەیەوە بووە (ددانی بە وشەی **بەهۆی** دانا). خزمەتکاران، پەرستار، سیاسییەکان... ئەم وردە ئاورانە بەجاریێ سووتاندیانم. من تاقەتی تاملکردنی ئەوانەم نەمابوو. دوێنێ کاتی نانخواردنی نیوەڕۆ... هێندەی نەمابوو هەستم بڕۆم و دەم لە نان نەدەم. ئیتر ناتوانم ئەو روانینانەی کوڕەکەم تامڵ بکەم. ئەو نەیپرسی مانای ئەو گۆڕانکارییانە چییە بەڵام دەیویست بپرسێ. من نەمدەتوانی خۆ لەبەر قورسایی روانینەکەیدا بگرم. ئەو دەترسا چاو لە چاوم بکات، بەڵام خۆ هەر ئەوە نەبوو...

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەیویست سیاییی بەرگدرووەکەی بۆ بگێڕێتەوە کە بۆیان هێنابوو بەڵام دەنگی لەرزی و ئۆناقێك گەرووی گرت. نەیدەتوانی بیر لەو سیاییەی کڵاوە تۆڕ و قردێلەی ئانا کە لەسەر کاغەزێکی کەهوو نووسرابوو بکاتەوە و دڵی بەخۆی نەسووتێ و داخ دڵی رێکنەگوشێ.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا گوتی: تێدەگەم دۆستی بەڕێز، زۆر باش تێدەگەم. من کێم کە بتوانم یارمەتیت بدەم و دڵخۆشیت بدەمەوە؟ لەگەڵ ئەوەشدا هاتووم. تەنیا بۆ ئەوەش هاتووم ئەگەر لە دەستم بێ یارمەتیت بدەم. رەنگە بتوانم باری ئەو خەمە هیچوپووچ و پڕسووکایەتییانە لەسەر شانت لابەرم... تێدەگەم کە تۆ پێویستت بە فکر و قسە و مشووری ژنانە هەیە. دەکرێ بەڕێوەبردنی کارەکانت بە من بسپێری؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هیچی نەگوت و تەنیا وەك سپاس و پێزانین دەستی ئەوی گوشی.

لیدیا ئیڤانۆڤنا گوتی: ئێمە پێکەوە ئاگاداری لە سریۆژا دەکەین. من بۆ کاری ناوماڵ زۆر بەتوانا نیم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قەبووڵی دەکەم و دەبمە بنەوانتان. پێویستیش ناکات سپاسم لێبکەی. ئەوە من نیم کە یارمەتیت دەدەم بەڵکوو....

ـ بەڵام ناتوانم سپاست لێنەکەم.

ـ دۆستی بەڕێز خۆت تەسلیمی ئەو هەستە مەکە کە باست کرد. بۆ دەبێ لەو شتە کە باڵاترین سەربەرزیی مەسیحە شەرمەزار بی؟ «***ئەوەی سووکایەتیی پێبکرێ سەربەرز دەبێ***». تۆ ناتوانی سپاس لە من بکەی. دەبێ شوکرانەبژێری ئەو بی و داوای یارمەتی لە ئەو بکەی. تەنیا لەگەڵ ئەودا ئێمە حەسانەوە و هێمنایەتی و ئەشق و ئۆخژن و رزگاری وەدەست دەێنین. ـ کە ئەوانەی گوت سەری بۆ ئاسمان بەرزکردەوە و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە بێدەنگییەکەیدا زانیی کە خەریکی دۆعاخوێندنە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئێستا گوێی بۆ قسەکانی لیدیا ئیڤانۆڤنا شل کردبوو وئاکار و هەڵسوکەوتی کە لە رابردوودا بە ناحەز و دزێوی دەزانی، ئێستا زۆر سروستی و دڵبلاوێن دەهاتە بەرچاوی.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئەو حاڵەی بەدڵ نەبوو کە بە هۆی تامەزرۆییەکی تازە سەرهەڵداوەوە بوو. ئەو پیاوێکی بەدین بوو و زیاتر لە روانگەی سیاسەتەوە لە مەزهەبی دەڕوانی، لەگەڵ ئەو رێبازە نوێیەش کە تاڕادەیەك لێکدانەوەی فێرکاریی مەسیحی بە رەوا دەزانی بەو هۆیە هاوڕا نەبوو چونکە رێگای بۆ باس و شرۆڤەکردن خۆش دەکرد. پێشتر لە هەمبەر ئەو رێبازەدا بە شێویەکی جیددی و ساردوسڕ و تەنانەت نەیارانەش هەڵسوکەوتی کردبوو و لەگەڵ کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤناش کە سەرنجی راکێشابوو دەمبە دمەی نەدەکرد و هەوڵی دەدا کە بە بێدەنگبوون وەڵامی پڕوپاگەندەکانی بداتەوە. بەڵام ئێستا سەرەتا تامەزرۆیانە گوێی بۆ قسەکانی راگرت و لە دڵێشەوە رەتی نەدەکردنەوە.

کاتێك کۆنتس دۆعاکەی تەواوکرد ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: زۆر زۆرت سپاس دەکەم. بۆ کارەکەشتان و بۆ وتەکانیشتان.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا جارێکی تر دەستی کارنینی بە هەردوو دەستی گرت و گوشیی.

کۆنتس دوای تۆزێ بێدەنگی زەردەیەکی گرت و بە قامکە نەرمەکانی فرمێسکی سەر روومەتی خۆی سڕی و گوتی: چاکە، دەستبەکاردەبم. دەچم بۆ لای سریۆژا، تەنیا لە کاتی تایبەتدا دێم بۆ لای ئێوە ـ ئەوەی گوت و هەستا لە ژوورەکە چووەدەرێ.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا چوو بۆ ژوورەکەی سریۆژا، بە گریانەوە و باوەشی پێداکرد و بە فرمێسکی خۆی دەموچاوی کوڕەی خووساند، بە دەم گریانەوە پێیگوت کە باوکی لە پیاوچاکانە و دایکیشی مردووە.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا، ئەو بەڵێنەی دابووی بردییەسەر و بەڕاستی کاروباری رێکخستنەوەی دووبارە و بەڕێوەبردنی ئەرکی بنەماڵەی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی وەئەستۆ گرت. ئەوەی کە گوتبووی لە کاروباری ماڵێدا زۆر بەکار نییە درۆی نەکردبوو. ئەو دەستوورانەی دەیدا بەبێ چاکسازی بەڕێوە نەدەچوون و کاری چاکسازییەکەشیان لە ئەستۆی کۆڕنی پێشخزمەتی تایبەتی کارنین بوو. ئەوبوو کە بێ ئەوەی هیچ کەس بزانێ ماڵەکەی بەڕێوەدێنا و کاتێك کە جلوبەرگی لەبەری ئەربابەکەی دەکرد بە شێنەیی ئەوەی پێویست بوو پێیڕادەگەیاند. لەگەڵ ئەوانەشدا یارمەتیی لیدیا ئیڤانۆڤنا زۆر بەجێ و شوێندانەر بوو. لەلایەکەوە بەهۆی رێز و خۆشەویستییەوە بەدڵ پشتیوانی لێدەکرد و لە لایەکی تریشەوە بەتایبەت هەوڵی دەدا و پێیوابوو بەرەو ئایینی مەسیح رێنوێنیی دەکات، یانی پێیوابوو ئەوی لەو بڕوا بێدینانەیە پاشگەز کردۆتەوە و کردوویەتی بە ئیماندارێکی خاوەن بڕوا و تامەزرۆی

ئەشقی مەسیح و باوەڕی تەواوی بە شرۆڤەی نوێی فێرکارییەکانی مەسیح هەیە کە لەم دوایییانەدا لە پترزبۆرگ پەرەی سەندبوو، ئەوەش دڵخۆشییەکی زۆر گەورە بوو بۆ کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا. ئیمانهێنان بە بەرهەقبوونی ئەو شرۆڤەیە بۆ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ سانا بوو. ئەو وەك لیدیا ئیڤانۆڤنا و کەسانی تر، کە لەگەڵیان هاوبڕوا بوون، توانایی خەیاڵێکی قووڵی نەبوو، یانی لەو مرخە زەینییە بێ بەش بوو کە شتە خەیاڵییەکان وەها راستەقینە دەنوێنێ کە دەبێ لەگەڵ ئەندێشەکانی تر و راستییەکان سازگار بن. ئەو لەو بۆچوونەدا هیچ شتێکی سەیروسەمەرە و نەگونجاوی نەدەدی کە ئەو مەرگەی بۆ بێبڕواکان هەیە بۆ ئەو نەبێ و بە هۆی بەرەکەتی ئیمانە کامڵەکەیەوە، کە کەماڵی ئەوی لە وجوودی خۆیدا بۆ دەرکەوتبوو، جێگای تاوانێك لە رۆحیدا نەمابێتەوە و لە ئاکامدا هەر لەم دنیایەدا رزگار دەبێ.

ڕاستییەکەی ئەوەبوو کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە شێوەیەکی تەمومژاوی لە بۆشی و ناڕاستیی ئەو بۆچوون و خەیاڵە گەیشتبوو و دەیزانی ئەو کاتەی کە بڕوای بە هێزێکی ئاسمانی نەبوو و بەپێی بڕیاری خۆی لە تاوانی ژنەکەی خۆشبوو و بەبێ واسیتە خۆی تەسلیمی هەستی دڵی کرد، هەستی بە سەفا و شیرینکامییەکی زیاتر کرد لە دڵی خۆیدا، تاکوو ئێستا کە ساتبەسات پێیوایە مەسیح لە رۆحیدایە و کاتی واژۆکردنی نامە ئیدارییەکان دەست و مێشکی بە ئیرادەی ئەو هەڵدەسووڕێ. بەڵام ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ناچاربوو ئاوا بیر بکاتەوە. چونکە خۆی ئەوەندە بە کەلەلا و بێهێز دەزانی و پێیوابوو پێویستی بە روانگەیەکی بەرز و نادیار هەیە تاکوو لەو بەرزاییەوە بتوانێ بە چاوی سووك لە خەڵکی بڕوانێ، کە ئەم رزگارییە ساختەیەی بە راستەقینە زانی و خۆی پێوە هەڵواسی.

## بیست و سێ

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا ئەو کاتەی کە کچێکی عازەب و بەگەشە و نەشە بوو دابوویان بە پیاوێکی ناوبەدەرەوە و رۆحسووك و زۆر دەوڵەمەند، بەڵام خۆشگوزەران و تۆلاز و داوێنتەڕ. مێردەکەی مانگێك دوای گوێستنەوەی لێیوەڕز بوو، خۆشەویستی و دڵنەرمییەکانی کچەی بە سووکایەتی و زمانێکی تاڵ و تەنانەت نەیارانەش وەڵام دەدایەوە، بەجۆرێك کە ئەو کەسانەی

ئاگایان لە ڕۆحسووکی و دڵنەرمیی کۆنت هەبوو و هەروەها هیچ کەموکوڕییەکیان لە کردەوەی کۆنتسی ڕووخۆش و خوێنشیریندا نەدەدی، سەریان لەو کارانەی مێردەکەی دەرنەدەچوو. لەوکاتە بەدواوە، ئەگەرچی باسی تەڵاق نەهاتبووە گۆڕێ بەڵام جیا لە یەکتری دەژیان و هەرکاتێ کۆنت چاوی بە ژنەکەی دەکەوت بە چاوی پڕسووکایەتی و دوژمنانە لێی دەڕوانی و هۆی ئەوەش بۆ هیچ کەس ڕوون نەبوو.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا لەمێژ بوو کە ئیتر خۆشەویستیی مێردەکەی لە دڵیدا نەمابوو، بەڵام لەوکاتەوە قەت دڵی لە ئەوین خاڵی نەبوو. جاریوابوو لە کاتێکدا ئاشقی چەند کەس، ژن یان پیاو دەبوو. دەکرێ بڵێین هەرکەسێك کە بە شێوەیەك بەدەر لە خەڵکی ئاسایی بووایە ئەو ئاشقی دەبوو. دڵی بە هەموو ئەو پرێنسس و پرێنسانە دەدا کە بە هۆی زەماوەندەوە دەبوونە بەشێك لە بنەماڵەی پاشایەتی. جارێکیان ئاشقی ئوسقۆفێکی گەورە بووبوو، هەروەها دڵی بە جانکوش و قەشەیەکیش دابوو. جارێکی تر ئاشقی ڕۆژنامەنووسێك و سێ وتەبێژی پانئیسلاویسم و کومیسارۆڤ[١٧] بووبوو. ئاشقی وەزیرێك و دوکتۆرێك و وتەبێژێکی ئاییني ئینگلیزیش بووبوو. ئێستاش ئەو دڵی بە کارنین دابوو. ئەو حەز لێکرددوویییانە هێندێ جار کەمڕەنگ دەبوون و هێندێ جاریش بەتینوگوڕ. بە هەموو چەشنەکانیش دڵی خۆی پێوە خەریك دەکرد و بەو ئەشقانەوە سەرگەرم دەبوو و نەدەبووە هۆی ئەوەی کە کۆنتس نەتوانێ پێوەندیی چڕوپڕی خۆی لەگەڵ کۆمەڵگای گەوران و دەربار درێژە پێبدات. دوای ئەو بەڵایەی کە بەسەر کارنین هات کۆنتس خستییە ژێر چاوەدێری و پشتیوانیی خۆی و لەو کاتەوە لە ماڵەکەی ئەودا قۆڵی بۆ ئەرك و کار هەڵماڵی و بۆ دابینکردنی هێمنایەتی و ئاسوودەییی ئەو هەوڵی دەدا، ئەوەشی بۆ دەرکەوتبوو کە ئەشقەکانی پێشووی هیچ کامیان ئەشقێکی ڕاستەقینە نەبوون و ئەو ئێستا بەڕاستی تەنیا ئاشق و شەیدای کارنین بوو. ئەو هەستەی ئێستا دەرهەق بە ئەو لە دڵیدا بوو هەستی دەکرد کە لە تەواوی ئەشقەکانی پێشووی بەتینتر و شیرینترە. کە ئەو هەستەی لەلای خۆی شرۆڤە دەکرد و لەگەڵ ئەشقەکانی تری هەڵیدەسەنگاند بە ڕوونی دەیدی کە ئەگەر کۆمیسارۆڤ گیانی تیزاری نەجات نەدایە قەتی خۆشنەدەویست، ئەگەر

---

١٧- Komissarov پیاوێك بوو کە بە زەبرێك دەمانچەی لە دەستی ئەو کەسە دەرهاویشت کە دەیویست ئەلکساندری دووهەم بکووژێ، بەم شێوەیە گیانی تێزاری نەجات دا.

مەسەلەی یەکگرتنی گەلی ئیسلاو نەبوایە هیچ هۆگرییەکی بە ریستیچ کودژیتسکی[18] نەدەبوو.

بەڵام ئێستا کارنینی تەنیا بەهۆی کەسایەتیی خۆیەوە خۆش دەویست، لەبەر رۆحە بەرز و مەزنەکەی کە نەیدەتوانی تێیبگات و دەنگە ناسکەکەشی کە زۆری کەیف پێیدەهات و حەزی دەکرد هەمیشە گوێی لە دەنگی بێ، هەروەها لەبەر سەرنجە ماندووەکەی و پێداگری و رانەگۆڕین و دەستی سپی و نەرمی کە دەمارەکانی هەستا بوون. ئەو نەك بە دیتنی کارنین دەگەشایەوە بەڵکوو لە روخساریدا بەشوێن شتێکدا دەگەڕا کە بەهۆی دیتنی ئەوەوە سەری هەڵدابوو. دەیویست نەك هەر بە قسە بەڵکوو بە تەواوی وجوودەوە سەرنجی کارنین بۆ لای خۆی راکێشێ و دڵی بڕفێنێ. ئێستا لەبەر خاتری ئەو زیاتر لە رابردوو خۆی دەڕازاندەوە. زۆر جار کە دەکەوتە گێژاوی ئەو خولیا و خەیاڵانەوە وەخۆ دەهاتەوە و لە دڵی خۆیدا دەیگوت چ دەبوو ئەگەر مێردی نەبووایە و ئەویش سەربەست و ئازاد رابیواردبایە. کاتێك کارنین دەهاتەژووری لیدیا سوورهەڵدەگەڕا و کاتێك کارنین قسەیەکی خۆشی دەکرد نەیدەتوانی ددان بە خۆیدا بگرێ و بزەی شادی نەکەوێتە سەر لێوی.

چەند رۆژ بوو کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا کەوتبووە گێژاوێکی سەیرەوە. ئاگاداریان کردبوو کە ئانا و ڤرۆنسکی لە پترزبۆرگن و دەبێ کارێك بکات کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ چاوی پێیان نەکەوێ، تەنانەت نابێ بهێڵێ ئەو هەواڵە ناخۆشەی پێبگات و بزانێ کە ئەو ژنە بەستۆکەیە لەگەڵ ئەو لە شارێك دەژی و لەوانەیە کتوپڕ لەگەڵی بەرەوڕوو بێ.

لیدیا ئیڤانۆڤنا لەلایەن ئاشنا و رۆشناکانییەوە ئاگادارکرابوو کە جووتەی نەگەویس (ئەو ناوەیان بەسەر ئانا و ڤرۆنسکیدا بڕیبوو) هێندێ کار و پیلانیان لە ژێر سەردایە، بۆیە هەوڵی دەدا رێوشوێنێك بۆ کارنین لەبەرچاو بگرێ کە لەگەڵ ئەوان بەرەوڕوو نەبێت و چاوی پێیان نەکەوێت. ئاجوودانێکی لاو کە دۆستی ڤرۆنسکی بوو حەولی دەدا بە هۆی لیدیا ئیڤانۆڤناوە جێپێی خۆی قایم بکات و دەستی لە جێیەك گیر بێ، لیدیا ئیڤانۆڤناش لە رێی ئەوەوە ئەو هەواڵانەی بەدەست دەگەیشت، گوتی کە ئەوان کاروبارەکانی پێتەختیان تەواوکردووە و سبەینێ لەم شارە دەڕۆن. لیدیا ئیڤانۆڤنا خەریکبوو دڵی ئاسوودە دەبوو کە بەیانیی رۆژی دوایی یادداشتێکیان بۆ هێنا و لەڕێوە دەستووخەتەکەی ناسییەوە و ترسی لێنیشت. دەستووخەتی ئانا کارنینا بوو. پاکەتی نامەکە کاغەزێکی ئەستوور بوو دەتگوت

---

١٨- Jovan Ristitch Kudzitsky سیاسەتوانی سێرب و قایمەقانی میلان ئۆبێرینڤیچ بوو بەربەرەکانیی لەگەڵ ئیمپڕاتووریی عوسمانی و ئوتریشیش دەکرد کە دەیانویست سێربستان داگیر بکەن.

گاردۆنە، کاغەزی نامەکەش زەرد بوو، سەرپەڕەکەی بە توغرایەکی گەورە رازاندبۆوە و بۆنێکی خۆشی لێدەهات.

ـ ئەو کاغەزە کێ هێنای؟

ـ پەیکی هوتێل.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا ماوەیەك نەیتوانی دانیشێ و نامەکە بخوێنێتەوە. لە ناخەوە وەها شڵەژا کە پشوو سوارییەکەی سەری هەڵدایەوە و کەوتە هەناسەبڕکێ. کە تۆزێ هاتەوە سەرخۆ دەستی کرد بە خوێندەوەی نامەکە کە بە زمانی فەڕەنسی نووسرابوو:

«خاتوو کۆنتس، پێموایە ئەو هەستە مەسیحاییەی کە رۆح و دڵی تۆی داگرتووە، ئەو خواست و بوێرییە بە من دەدات کە بتوانم ئەم نامەیەت بۆ بنووسم. بەڕاستی دووریی کوڕەکەم زۆرم ئازار دەدات و یەکجار زۆرم بیرکردووە، بۆیە تکات لێدەکەم ئیجازەم پێبدە بەر لە رۆیشتنم جارێکی تر چاوم پێیبکەوێ. بمبوورە کە بەو کارە بوومە هۆی ئەوەی بیرەوەریم لەلای تۆ زیندوو بێتەوە، تەنیا بەو هۆیە نامەکەم بۆ تۆ نووسی نەك ئەلکساندرڤیچ، چونکە نامەوێ بە زیندووکردنەوەی یادی خۆم برینی ئەو پیاوە بەرێزە بکولێنمەوە و ببمە هۆی ئازاری دووبارەی. چونکە دەزانم دۆستایەتییەکی گەرموگوڕتان هەیە و تۆ لە مەبەستم دەگەی. سریۆژا بنێرە بۆلام یان رێم پێبدە، لە کاتێکی دیاریکراودا و هەرکاتێك کە تۆ بە باشی دەزانی بێم بۆ لای. یان پێمبڵێ کەنگێ و لەکوێ دەتوانم لە دەرەوەی ماڵێ چاوم پێیبکەوێ. چونکە دەزانم جەنابت خاوەنی رۆحێکی گەورەی، ئەو کارەش کەوتۆتە دەست تۆ و لێمڕوونە کە دەست بە روومەوە نانێی. نازانی چەندەم بیرکردووە و خەریکە دڵم بۆی دەتۆقێ. هەر بۆیە زۆر زۆرت سپاس دەکەم و قەتم ئەو چاکەیەی تۆ لە بیرناچێتەوە.»

«ئانا»

هەموو شتێکی ئەو نامەیە رقی کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنای هەڵدەستاند: ناوەڕۆکی نامەکە و ئاماژەکردن بە گەورەیی و بەرێزی و هەروەها پێیوابوو ئەوپەڕی بێشەرمی و رووهەڵماڵدراوییە.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا گوتی: بڵێ نامەکە وەڵامی نییە.

بەبێ راوەستان گاردۆنی نامەنووسینی کردەوە و نامەیەکی بەم ناوەڕۆکەوە بۆ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ نووسی کە هیواداره سەعات یەك لە رێوڕەسمی سڵاودا لە دەربار چاوی پێیبکەوێ.

«پێویستە سەربارەت بە مەبەستێکی گرینگ قسەت لەگەڵ بکەم. کە چاوم پێتکەوت وادەکەی دادەنێین کە لەکوێ یەکتر ببینین. لە هەموو شتێك باشتر ئەوەیە کە بێی بۆ ماڵی ئێمە و پێیان دەڵێم چاییتان بۆ ئامادەبکەن. حەتمەن دەبێ بتبینم. ئەوەی کە خاچەکەمان لە

کۆڵ دەنێ، هێزی ئەوەشمان دەداتێ کە بیتوانین.» ئەو ئەم رستەیەی کۆتاییی بە نامەکە زیادکرد بۆ ئەوەی تۆزێ زەینی ئامادەبکات.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا رۆژ نەبوو دووسێ یادداشت بۆ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ نەنووسێ. ئەو ئەم شێوە پێوەندییەی لەگەڵ کارنین بەو هۆیە پێخۆش بوو کە جۆرێك نهێنی و داشاردنی رازی لەگەڵدا بوو، چونکە پێوەندیی ئاساییان ئەو راز و نهێنییانەی لەخۆ نەگرتبوو.

## بیست و چوار

ڕێوڕەسمی سڵاو لە کۆشك کۆتاییی پێهات. ئەو بانگهێشتنکراوانەی خەریکی رۆیشتن بوون چاویان بە یەکتر دەکەوت و لە قسە دەگیران، سەبارەت بە دوایین رووداوەکانی رۆژ و ئەو پلەوپایانەی بە ئەموئەو درابوون و هەروەها دامەزران و راگوێستنی کاربەدەستانی باڵا دەدوان.

پیرەپیاوێکی ریش سپی کە جلوبەرگی کەلبەدوون کراوی ڕێوڕەسمەکەی لەبەردابوو لە وەڵامی خاتوونێکی باڵابەرزی شۆخوشەنگدا کە یەکێك لە ژنانی دەربار بوو و سەبارەت بە گۆڕینی پلەوپایە گرینگەکان پرسیاری لێکردبوو گوتی: بە بڕوای جەنابت خاتوونی هێژا چ دەبوو کە کۆنتس ماریا باریسۆڤنا[19] بکرایەتە وەزیری بەرگری و پرێنسس ڤاتکۆڤسکایا[20] یان بۆ سەرۆکایەتیی ئەرتەش هەڵبژاردبایە.

خاتوونی دەربار بە بزەیەکەوە گوتی: منیش بووبووایەم بە ژینڕاڵی ئاجوودان.

ـ تۆ ئێستاش ئەو پلەوپایەت هەیە. جەنابت سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتیی هەموو کلێسەکانی. کارنینیش جێگرتانە.

پیاوێك کە لێیان نزیکبووبۆوە پیرەپیاو پێیگوت: سڵاو پرێنس! ـ تۆقەی لەگەڵ کرد و دەستی گوشی.

پرێنس پرسیی: باسی کارنینتان دەکرد؟

ـ ئەو و پووتیاتۆڤ[21] نیشانی ئەلکساندرنیۆڤسکییان وەرگرت.

ـ من پێم وابوو ئەو زۆر لەمەوبەر ئەو نیشانەی وەرگرتووە.

---

19- Borissovna

20- Vatkovskaya

21- Putyatov

ـ نا، چاوی لێکە ـ پیرە پیاو ئەوەی گوت و ئاماژەی بە کارنین کرد کە کڵاوێکی زەڕچنی لەسەر نابوو و جلوبەرگی ڕێوڕەسمی دەرباری و حەنبەڵی سووری تازە بە شانەوە لەبەر دەرگانەی تەلارەکە راوەستابوو، لەگەڵ یەکێك لە دەسترۆیشتووەکانی دەربار قسەی دەکرد. پاشان گوتی: بڕوانە چەندە دڵخۆش و رازییە، رووتوقووتی دڵخۆش! ـ سەرقۆزی بنئاڵۆز! قسەکەی خۆی بڕی تاکوو لەگەڵ ئەو ئاجوودانە جوانچاکە تەوقە بکات کە قەڵافەتێکی توندوتۆڵ و بەخۆوەی هەبوو.

ئاجوودان گوتی: نا، پیر بووە.

ـ بە هۆی دەردەسەرییەوە! ئێستا بەردەوام خەریکی دارشتنی گەڵاڵەیە و هەتا هەموو گەڵاڵەکانی موو بە موو بۆ بەرانبەرەکەی شی نەکاتەوە دەستی لەکۆڵ ناکاتەوە.

ـ چۆن دەفەرمووی پیر بووە؟ ***ژنان بۆی شێت و شەیدا بوون***، پێموایە کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا ئێرەیی بە ژنەکەی دەبا.

ـ ئەوە چ قسەیەکە؟ تکات لێدەکەم بە خراپە باسی کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا مەکەن.

ـ مەگین کارێکی خراپە حەز لە کارنین بکات؟

ـ راستە دەڵێن ئانا کارنینا لێرەیە؟

ـ بەڵێ، بەڵام لێرە لە دەربار، لە پترزبۆرگە. من دوێنێ چاوم پێیان کەوت لەگەڵ ئەلکسی ڤرۆنسکی لە شەقامی مۆرسکایا[22] بوون و ***دەستی یەکتریان گرتبوو و پیاسەیان دەکرد***.

ئاجوودان گوتی: ***ئەوە پیاوێکە کە***.....ـ بەڵام قسەکەی تەواو نەکرد و رێگاکەی بۆ یەکێك لە ئەندامی بنەماڵەی سەڵتەنەتی کردەوە کە دەیویست لەوێوە تێپەڕێ.

بەو شێوەیە بەردەوام پاشملە باسی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچیان دەکرد و لۆمەیان دەکرد و گاڵتەیان پێدەکرد. کەچی ئەو پێشی بە ئەندامێکی باڵای دەوڵەت گرتبوو و قسەی بۆ دەکرد و دیاربوو هەتا موو بە موو گەڵاڵەکانی خۆی بۆ شی نەکاتەوە ناهێڵێ بڕوات.

دەکرێ بڵێین لەوکاتەوە کە ژنەکەی بەجێی هێشتبوو تاڵترین رووداو کە لەوانەیە کاربەدەستێکی دەوڵەت تووشی بێت لە ئەو قەومابوو، ئەوەش هۆکارێك بوو بۆ راوەستان و نەچوونە پێشێ لە کاروباری دەوڵەتیدا. تووشی ئەو راوەستانە بووبوو، هەموو خەڵکیش ئەوەیان بۆ دەرکەوتبوو، ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ خۆی تەنیا کەسێك بوو کە نەیدەزانی هەتاوی خزمەتکردنی لە ئاوابوونە. هۆی ئەو بارودۆخە تاڵە و نامرادبوونیشی هی ئەوە نەبوو تووشی بە تووشی سترمۆڤەوە بووبوو، یان

22- Morskaya

ژنەکە ژاراوی تاڵی ناکامیی بە گەروودا کردبوو، یان تەنیا بە هۆی ئەوەوە بوو گەیشتبووە سنوورێك کە چارەنووس بۆی دیاریکردبوو. ئەوەش بەجێیەك گەیشتبوو کە هەمووان لێیان روون بوو کە ئیتر رێبازی کاری ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە خزمەتی دەوڵەتدا کوتاییی پێهاتووە. ئەو هێشتا خاوەنی پلەوپایەیەکی گرینگ بوو و ئەندامی زۆربەی کومیسیۆن و لیژنەکان بوو. بەڵام ئیتر گولۆڵەی کەوتبووە لێژی و هیچ کەس چاوەڕوانیی شتێکی تازەی لێنەدەکرد. ئەوەی دەیگوت و پێشنیاری دەکرد هیچ تازەییەکی پێوە دیارنەبوو و بەکەڵکی هیچ نەدەهات.

بەڵا م ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەستی بەوە نەدەکرد. بە پێچەوانە، چونکە راستەوخۆ لە کاری بەڕێوەبەرایەتیی دەوڵەتدا بەشدار نەبوو کەموکوڕی و چەوتییەکانی کاری خەڵکی بە باشی دەدیت و بە ئەرکی خۆی دەزانی کە قۆڵ بۆ چاکسازییان هەڵماڵێ. زۆر زوو دوای جیابوونەوە لە ژنەکەی دەستیکرد بە نووسینی یادداشتەکانی خۆی سەبارەت بە رەوشتی نوێی دادپرسی کە گەلێکی یادداشتی تر سەبارەت بە هەموو بەشەکانی بەڕێوەبەرایەتی لێکەوتەوە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لەو بارودۆخە پڕ لە ناهومێدییەی خوی لە بواری کاروباری دەوڵەتیدا نەك هەر ئاگادارنەبوو و گوێی پێنەدەدا، بەڵکوو زیاتر لە رابردوو لە کاروبارەکانی خۆی رازی بوو.

پۆلۆسی قەدیس دەڵێ: «ئەوەی ژنی هەیە لە بیری کارەکانی دنیادایە بۆ ئەوەی ژنەکەی دڵخۆش بکات، بەڵام ئەوەی رەبەنە لە بیری کارەکانی خودادایە تاکوو کارێکی وابکات کە خودا لێیڕازی بێت.» ئەلکسی ئەلکساندرڤیچیش کە ئێستا لە هەموو کارێکدا پەنای بۆ کەلامی پیرۆز دەبرد زۆر جار ئەو وتەیەی پۆلۆسی وەبیردەهاتەوە و پێیوابوو لەو کاتەوە تەنیا کەوتووە بەو گەلالانەی خۆی زیاتر لە پێشوو بۆ رەزای خودا خزمەت دەکات.

بێتاقەتیی ئاشکرای ئەو ئەندامەی دەوڵەت کە هەوڵی دەدا لە دەستی ئەو نەجاتی بێت کارنیینی شلوێ نەدەکرد. تەنیا کاتێك دەستی لە روونکردنەوەی گەلالەکەی خۆی هەڵگرت کە بەردەنگەکەی بۆ تێپەڕینی ئەندامێکی بنەماڵەی سەڵتەنەتی کشایە دواوە و لەو هەلە کەڵکی وەرگرت و فیزماڵکێکی لێدا و بۆی دەرچوو.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کاتێك تەنیا کەوت سەری داخست و گولۆڵەی بیرەکانی خۆی هەڵکردەوە و پاشان وەك گێژ و خول چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد و رۆیشت بۆ لای دەرگاکە و بەهیوا بوو کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا لەوێ ببینێتەوە.

چاوێکی لە قەڵافەتی توندوتۆڵ و ریشی رازاوە و بۆنخۆشی سەررووومەتی ئاجوودان و ملی سوری پرێنس کرد کە جلوبەرگی سلاو لەشولاری لە قالب دابوو و کارنین ناچاربوو بە پەنایاندا تێپەڕێ، لە دڵی خۆیدا گوتی «هەموویان چەند لەشساغ و بەهێزن! راستە دەڵێن لەم دنیایەدا هەموو شتێك لە خزمەتی شەیتاندایە.» دیسان بە لاچاوێك لە رانە بەهێز و توندوتۆڵەکانی ئاجوودانی روانی.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە هەنگاوی نەرم و قەڵافەتی شەکەت و قوڕساخی خۆی سەرێکی بۆ ئەو پیاوانە دانەواند کە باسی ئەویان دەکرد و چاوێکی لەلای دەرگاکە کرد تاکوو کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا ببینێتەوە.

پیرەپیاو کاتێك ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بەلایاندا تێپەڕی و بە ساردوسڕی سەری بۆ داخستن، بە چاوانی کە تررووسکەی شەیتانی لە بیبیلەکانیدا دەدرەوشایەوە ئاماژەی بە نیشان و میدالیای کارنین کرد کە تازە وەریگرتبوو و گوتی:

ـ ئا، ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، من هێشتا پیرۆزباییم پێنەگوتووی.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ وەڵامی دایەوە: سپاست دەکەم، ئەمڕۆ هەواکەی زۆر خۆشە ـ بەپێی خووخدەی ئاسایی خۆی ددانی بە وشەی زۆرخۆشەدا نا.

دەیزانی ئەوانە گاڵتەی پێدەکەن، بەڵام لەوە زیاتر چاوەڕوانیی لێیان نەبوو و لەگەڵ ئەو هەڵسوکەوتەی دەوروبەرییەکانی راهاتبوو.

کە چاوی بە کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا کەوت لە نزیك دەرگاکەوە وەدیار کەوت و شانو ملە زەردەڵەکەی لە ملیوانەی کراسەکەی هاتبووە دەرێ و چاوە جوان و پڕئەندێشەکانی ئەوی بۆ لای خۆی بانگ دەکرد، زەردەیەکی گرت کە ددانە سپییەکانی وەدەر کەوتن و رۆیشت بۆ لای.

لیدیا ئیڤانۆڤنا بۆ هەڵبژاردنی جلوبەرگەکانی، زۆری دەردەسەری تامڵ کردبوو، هەروەك بۆ هەموو جلوبەرگەکانی زۆری خۆی تووشی گرفت دەکرد. ئامانجی ئەو بۆ دوورین و لەبەرکردنی ئەو جلوبەرگانە، لەم دواییانەدا لەچاو سی ساڵی رابردوو زۆری گۆڕان بەسەردا هاتبوو. سی ساڵ لەمەوبەر دەیویست خۆی بە شێوەیەك بڕازێنێتەوە کە جوان و سەرنجڕاکێش بنوێنێ و هەتا زیاتریش خۆی جوان بکات باشترە. بەڵام ئێستا بە پێچەوانە، جوانکارییەکەی هێندە لەگەڵ تەمەن و بەژن و رواڵەتی ناسازگار بوو کە بەردەوام هەوڵی دەدا بەهەر شێوەیەك بێ کارێك بکات کە ئەم ناسازگارییە کەمتر لەچاو بدات. ئەم هەوڵانە بۆ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە ئاکام گەیشتبوو، چونکە کۆنتس لەبەر چاوی زۆر جوان و سەرنجڕاکێش بوو. لیدیا ئیڤانۆڤنا

لەنێو فەرتەنە و لێشاوی ئەو ناونیتکە و چزەبزانەدا کە خەریکبوون بەرەولای کارنین لرفەیان دەهات نەك تاقە رۆخ و کەناری چاکەخوازی، بەڵکوو ئەوینیش بوو.

بە نێو ئاپۆرەی روانینە تەشەراوییەکانیاندا تێدەپەڕی و بە شێوەیەکی سروشتی، هەروەك گیا کە بەرەو تیشك تەرزوتوول دەهاوێ، ئەویش ئاوا بەرەولای کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا خوشی.

کۆنتس چاوێکی لە نیشان و دەرەجەکانی کرد و گوتی: پیرۆزباییت پێ دەڵێم.

کارنین لەگەڵ شاردنەوەی بزە تامەزرۆیانەکەی، چاوی قووچاند و شانی هەڵتەکاند، وەك ئەوەی بیهەوێ بڵێ بەو جۆرە شتانە دڵخۆشە. کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا بە باشی دەیزانی کە ئەوە یەکێك لە گرینگترین هۆکاری دڵخۆشیی ئەوە، ئەگەرچی قەتی ددان پێدا نەدەنا.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا پرسیی: فریشتەکەمان حالّی چۆنە؟ ـ مەبەستی سریۆژا بوو.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ چاوانی هەڵێنا، برۆی هەڵتەکاند و گوتی: ناتوانم بڵێم بە تەواوی لێیڕازیم. سیتنیکۆڤ[٢٣]یش زۆری لێڕازی نییە و (سیتنیکۆڤ مامۆستایەك بوو کە فێرکاریی سریۆژای لە ئەستۆ بوو بەڵام نەك باری ئاینییەکەی.) دەستیکرد بە شیکردنەوەی بیروڕای خۆی سەبارەت بەو مەسەلەیەی کە جگە لە مەسەلە ئیدارییەکان زۆر هۆگری بوو، ئەویش راهێنانی کوڕەکەی بوو: هەروەك پێشتر گوتم ئەو (یانی سریۆژا) لە هەمبەر ئەو مەسەلانەدا کە دەبێ شوێن لەسەر رۆحی هەموو گەورە و منداڵێك دابنێ زۆر ساردو بێموبالاتە.

کاتێك ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە یارمەتیی لیدیا ئیڤانۆڤنا گەڕایەوە سەر ژیانی ئاسایی و تێکۆشانی رۆژانە، بە ئەرکی خۆی زانی کە بۆ راهێنان و عاملاندنی عەولادێك هەوڵ بدات کە بە ریشییەوە بووبوو. چونکە پێشتر قەتی کار بە مەسەلەکانی فێرکاری و راهێنان نەبوو، ماوەیەکی زۆر کاتی خۆی بۆ موتالاّکردن لەو بوارەدا تەرخان کرد و دوای ئەوەی زۆری کتێب لە بواری مرۆڤناسی و بارهێنان و فێرکاریدا خوێندەوە گەڵاڵەیەکی بۆ عاملاندنی ئەو دارشت و باشترین مامۆستای پترزبۆرگی بۆ گرت و دەستی بەکار کرد. بەردەوام هۆش و بیری خۆی بەو کارەوە خەریك دەکرد.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا بە شادی و نەشەیەکی زۆرەوە گوتی: بەڵێ، بەڵام دڵی؟ خاوەنی دڵێکی پاك و گەورەیە. من دڵی باوکیم لەودا دیتووە. منداڵێك کە خاوەنی ئەو دڵە بێ قەت خراپ نابێ.

ـ بەڵێ، رەنگە وابێ... هەتا ئەو جێیەی پێوەندیی بە منەوە هەیە ئەرکی خۆم بەجێ دێنم. ئەوەش تەنیا کارێکە کە لە دەستم دێ.

---

23- Sitnikov

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا دوای هێندێ بێدەنگبوون گوتی: وەرە بۆ ماڵی ئێمە، ئێمە دەبێ سەبارەت بە مەبەستێکی زۆر تاڵ قسە بکەین. من ئامادەبووم ئەوەی پێویستە بیبەخشم بە وشەرتەی هێندێك لە بیرەوەرییەکان لەلای تۆ زیندوو نەبنەوە، بەڵام هێندێ کەس هەن کە گوێیان بەو شتانە نابزوێ. نامەیەکی ئەو ژنەتیوەم بەدەست گەیشتووە. ئەو لێرەیە، لە پترزبۆرگ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە ناوی ژنەکەی هاتە گۆڕێ دڵی داخورپا. بەڵام کتوپڕ بێدەنگی و ماقمانێکی مەرگ ئاسایی کە نیشاندەری داماوییەکی تەواوبوو روخساری کردە یەك پارچە سەهۆڵ.

گوتی: من چاوەڕوانیی ئەوەم دەکرد.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا شڵەژاوانە چاوی لە روخساری کارنین کرد و فرمێسکی شەیدایی لە هەمبەر گەورەییی رۆحی دۆستەکەی، لە چاوانیدا قەتیسما.

## بیست و پێنج

کاتێك ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ پێینایە ژوورە دڵگر و چکۆلە و خۆشەکەوە کە پڕبوو لە جام و پەرداخی چینیی ئەنتیکە و دیوارەکانی بە تابلۆی وێنەی گەورانی ماڵباتی کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا رازابۆوە، خانەخوێ هێشتا نەهاتبوو. لە ژوورێکی تر خەریکی گۆڕینی جلەکانی بوو. لەسەر مێزێکی خڕ کە رووپۆشی بەسەردا درابوو پەرداخ و ژێرپیاڵەی چینی و رێزکراو بوون و چادانێکی زێوین لەسەر وەجاخێکی ئالکۆلی داندرابوو. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ وەك گێژوویژ چاوێکی لە دەوروبەری کرد و چاوی بەو تابلۆیانەدا گێڕا کە بە دیوارەکاندا هەڵواسرابوون و بەلایەوە تازە نەبوون، پاشان لە پاڵ مێزەکەدا دانیشت و ئەو ئینجیلەی لێککردەوە کە لەسەری داندرابوو. خشەخشی داوێنی کراسە هەوریشمینەکەی کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا هەودای خەیاڵی پساند.

کۆنتس بە بزەیەکەوە کە نیشاندەری شڵەژانی بوو بەپەلە هات و خۆی کرد بە بەینی قەنەفە و مێزەکەدا و گوتی: ئێستا پێکەوە بێخەمین و بەدەم چاییخواردنەوەوە قسەکانمان دەکەین.

کۆنتس دوای چەند قسە بۆ خۆشکردنی بوارەکە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و ئەو نامەیەی کە بە دەستی گەیشتبوو دایە دەستی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ.

کارنین نامەکەی خوێندەوە و ماوەیەکی زۆر متەقی نەکرد.

ئاخری سەری هەڵبڕی و شەرمنانە گوتی: من پێموانییە مافی ئەوەم هەبێ داواکارییەکەی ڕەت بکەمەوە.

ـ دۆستی بەڕێز، تۆ بە هیچشێوەیەك خراپە نابینی.

ـ بە پێچەوانە، من چاو لە هەر شوێنێك دەکەم تەنیا خراپە دەبینم. بەڵام پێتوایە ئەوە ئینساف بێ...

شوێنەواری دوودڵی و یاریخوازی روخساری داگرت و دیاربوو لەو کارەدا کە خۆی سەری لێی دەرنەدەچوو لە کەسێك دەگەڕا راوێژی لەگەڵ بکات و رێوشوێنی راستی پێنیشان بدات.

کۆنتس قسەکەی پێبڕی و گوتی: نا، هەرکارەی حەد و مەرزێکی هەیە. من تێدەگەم لارێبوونی داوێنپاکانە چییە ـ هەڵبەت ئەو قسەیەی بەڕاست نەبوو، چونکە قەتی نەدەتوانی لەوە بگات کە چی ژنان لە رێی داوێنپاکی هەتلە دەکات: بەڵام لە دڵڕەقی دەگەم. ئەویش دەرهەق بە چ کەسێك؟ دەرهەق بە تۆ! چۆن دەتوانێ لە شارێك بمێنێتەوە کە تۆ لەوێی؟ نا، وەك دەڵێن مرۆڤ سەدساڵیش بژی هێشتا شتی تازە فێردەبێ. منیش تازە گەورەیی رۆحی تۆ و سووکایەتیی ئەوم بۆ دەرکەوتووە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: کێ دەتوانێ یەکەم بەرد بهاوێت؟[٢٤] ـ دیاربوو لەو رۆڵە نارازی نییە کە لە ئەستۆیەتی: من لە تاوانی ئەو خۆش بووم. هەر بەو هۆیە ناتوانم لەو تامەزرۆییە بێ بەش ی بکەم کە سەرچاوەکەی ئەشقە. ئەویش دڵی هەیە و جگەرگۆشەی خۆی خۆش دەوێ...

ـ بەڵام ئاخر دۆستی بەڕێز، تۆ ئەوە بە ئەشق دەزانی؟ یانی ئەو ئەشقە پاك و راستە؟ ئەوە دەزانم کە تۆ زۆر دڵێکی گەورەت هەیە و هەمیشە هەروا بووی و رق لە دڵی خۆتدا راناگری و لە تاوانی خۆشبووی.... بەڵام ئێمە مافی ئەوەمان هەیە دەستدرێژی بکەینە سەر رۆحی ئەو فریشتەیەمان؟ ئەو پێیوایە دایکی مردووە. ئەو دۆعا دەکات کە خودا لە گوناحی دایکی خۆشبێ... ئاواش باشترە. ئێستاش... پێتوایە چۆن بیردەکاتەوە؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە دیاربوو قسەکانی ئەو دەسەلمێنێ گوتی: من بیرم لەوە نەکردبۆوە.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا بە هەردوو دەستی دەموچاوی خۆی گرت و بێدەنگ بوو. دۆعای دەخوێند.

دوای ئەوەی دۆعاکەی تەواوبوو دەستی لە روخساری کردەوە و گوتی: ئەگەر بیروڕای منت بوێ دەڵێم کە ئەو کارە مەکە. پێتوایە من تێناگەم چ ئازارێك دەکێشی؟ پێتوایە نازانم ئەو

---

٢٤- ئاماژەیە بە چیرۆکێکی ئینجیل.

ژنەتیوە چۆن دەیهەوێ زامی دڵت بکولێنێتەوە؟ ئێستا وای دانێین کە تۆ وەك هەمیشە خۆتت لەبیربردۆتەوە، ئاکامی ئەو کارە دەبێ بەچی؟ دەبێتە هۆی خەمی تازە بۆ تۆ و ئازاری رۆحی بۆ کوڕەکەت. وانییە؟ ئەگەر رێزەیەك هەستی ئینسانی لە وجوودی ئەو ژنەدا بووبایە نەدەبوو داواکارییەکی ئاوای هەبێ. نا، من هیچ گومانێکم نییە و تکا لە ئێوەش دەکەم کە ئەو کارە نەکەن و ئەگەر ئیجازەم پێبدەی بۆی دەنووسم.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ پێملبوو، کۆنتس ئەم نامەیەی خوارەوەی بە زمانی فەڕەنسی نووسی:

«خاتوونی بەڕێز، ژیاندنەوەی یادی ئێوە لە دڵی کوڕەکەتاندا لەوانەیە ببێتە هۆی سەرهەڵدانی هێندێ پرسیار لە زەینی ئەودا کە ئەگەر وەڵامیان پێبدرێتەوە شتێك لە دڵی ئەودا رەش هەڵدەگێڕێ کە دەبێ بۆ ئەو پیرۆز و پڕشنگدار بمێنێتەوە. بەو هۆیە تکاتان لێدەکەم ئەگەر مێردەکەت ناهێڵێ چاوت بە کوڕەکەتان بکەوێ وەك پڕشنگی لێکدانەوەی مەسیحانە لێیبڕوانە. لە خودای مەزن دەخوازم لە تاوانەکەت ببووریێ.

کۆنتس لیدیا»

ئەو نامەیە تیرێك بوو کە راست ئەو نیشانەیەی پێکا کە کۆنتس لیدیا لە خەلوەتدا بۆ خۆی لەبەرچاو گرتبوو و تەنانەت ئەوەی لە خۆشی دەشاردەوە، ئەویش دڵی ئانا بوو کە بەو تیرە پێکرا.

لەلایەکی ترەوە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کاتێك لە ماڵی لیدیا ئیڤانۆڤنا گەڕایەوە هەتا شەوێ نەیتوانی بپەرژێتە سەرکارە ئاساییەکانی رۆژانەی و ئەو هیمنایەتی و سەبرەی رۆحی پیاوێکی ئیماندار و رزگاری لە دڵی خۆیدا نەدۆزییەوە، کە پێشتر دەیدۆزییەوە.

یادی ژنەکەی کە زۆر بە خەتاباری دەزانی و ئەو یانی (ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ) لە هەمبەریدا، هەروەك لیدیا ئیڤانۆڤنا بەڕاستی دەیگوت، هەتا ئەو رادەیە پیرۆز بوو، نەدەبوو ئاوا بیشلەژێنێ. بەڵام کارنین ئۆقرەی لێهەڵگیرابوو نەیدەتوانی لەو کتێبە بگات کە دەیخوێندەوە و نەشیدەتوانی بیرەوەریی تاڵ و بەژانی پێوەندیی خۆی و ژنەکەی و ئەو هەڵانەی کە ئێستا پێیوابوو دەرهەق بە ئەو ئەنجامی داوە لە زەینی خۆی دەرهاوێ. بیرەوەریی ئەو رۆژەی کە لە کێبەرکێی ئەسپسواری دەگەڕانەوە و ژنەکەی ددانی پێدانابوو کە خەیانەتی پێکردووە و شێوەی هەڵسوکەوتیشی لەگەڵ ئەم ددانپێدانان و (بەتایبەت ئەوەیکە داوای لێکردبوو تەنیا لەبەر چاوی خەڵك ئابڕووی بپارێزێ.) پەشیمان بوونەوەیە زۆری ئازار دەدا. هەروەها ئەو نامەیەی وەبیرهاتەوە کە بۆ ژنەکەی نووسیبوو و خۆشبوون لە تاوانێك کە هیچ

کەس داوای لێنەکردبوو، جگە لەوەش دڵسۆزی بۆ زارۆکێك کە هی خۆی نەبوو، گوشاری بۆ مێشکی هێنابوو و لە ناخەوە هەڵیدەچۆقاند.

کە گەڕایەوە بۆ رابردووی خۆی و ئەو قسانەی کە ناشارەزایانە و دوای دوودڵییەکی زۆر ئەو کاتەی داوای لێکردبوو ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێکبێنێ، وەبیری هاتنەوە هەستی بە پەشیمانی کرد و شەرمێکی وەك ئەوە دڵی داگرت.

بەخۆی گوت «بەڵام تاوانی من چییە؟» ئەو پرسیارەش هەمیشە پرسیارێکی تری لەلا دروست دەکرد و ئەویش ئەوەبوو کە بێژی خەڵك، یان کەسانێکی وەك ڤرۆنسکی و ئابلۆنسکی، ئەو ئاجوودانانە کە خاوەنی رانو پووزی بەهێزن، هەستێکی جیا لەوەیان هەبێ و ژنەکانیان جۆرێکی تر خۆشبوێ و بە شێوەیەکی تر ژیانی هاوبەش پێکبێنن؟ تاقمێکی زۆریش لەو کەسانە کە قیتوقۆز و بەهێز و بڕوابەخۆ بوون و لە هەموو شوێنێك و هەمیشە سەرنجی وردی ئەویان بۆ لای خۆیان رادەکێشا، دەهاتنەوە بەرچاوی. هەوڵی دەدا کە ئەو بیر و خەیاڵانە لە مێشکی خۆی دەرباوێ و بەخۆی بسەلمێنێ کە ئەو نەك بۆ ژیانی بێبەقای ئەم جیهانە بەڵکوو بۆ حەیاتی هەرمانی ئەو دنیا زیندووە و گیانی مەکۆی ئەشق و سەفایە. بەڵام ئەوەی کە ئەو لەم ژیانە بێبەقا و بێبایەخەدا، هەروەك بیری لێدەکردەوە، تووشی تاوانێکی چکۆلە بووە و هێندەی بەلاوە گرانە کە دەڵێی رزگاربوونی خودایی کە بڕوای پێیهەبوو ئیتر بە هیچ کولۆجێ نالوێ. بەڵام ئەو وەسوەسە زۆری نەخایاند و زۆر زوو ئۆخژن و ئۆقرەیەك رۆحی داگرت کە بە یارمەتیی ئەو توانیی ئەوەی کە نایهەوێ وەبیری بێتەوە لە بیریان بەرێتەوە.

## بیست وشەش

سریۆژا رۆژێك بەر لە رۆژی لەدایکبوونی شاد و سوورهەڵگەڕاو لە پیاسەکردن و سەیران گەڕایەوە و باڵتە چیندارەکەی خۆی دایەدەست ئەو دەرگاوانە پیرە کەڵەگەتەی کە بە دانیشتنەوە سەری داخستبوو و بۆی دەگرژییەوە، گوتی: دەی، کاپیتۆنیچ، ئەو فەرمانبەرەی کە دەستی شکابوو و بۆیان لە ملی کردبوو ئەمڕۆ هات؟ باوەگیانم ئیجازەی چوونە ژوورەوەی پێدا؟

دەرگاوان بە روویەکی خۆشەوە چاوێکی لێقرتاند و گوتی: بەڵێ ئیجازەی پێدا. کە نووسیارەکەی رۆیشت من بە ئەربابم راگەیاند کە هاتووە. راوەستە با دەستەوانەکانت بۆ داکەنم.

ڕاهێنەرە پانئیسلاویستەکەی، کە لەبەر دەرگانەی پێشخانەکە راوەستابوو گوتی: سریۆژا، خۆت دەستەوانەکانت داکەنە.

بەڵام سریۆژا، ئەگەرچی دەنگی ناسکی راهێنەرەکەی بیست بەڵام گوێی نەدایە. راوەستابوو و دەستی نابووە سەرشانی دەرگاوانەکە و چاوی لە چاوی بڕیبوو.

ـ ئەی باوەگیانم داواکارییەکەی بۆ جێبەجێ کرد؟

دەرگاوان بە نیشانەی ئەرێ سەری لەقاند.

ئەو فەرمانبەرە دەستشکاوە کە بۆیان لە ملی کردبوو حەوت جار هاتبوو بۆ لای ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ و بەجۆرێك کە سەرنجی سریۆژا و دەرگاوانەکەی بۆ لای خۆی راکێشابوو. سریۆژا رۆژێك ئەوی لەبەر هەیوانی ماڵەکەیان دیتبوو و گوێی لێبووبوو دەناڵێنێ و لەبەر دەرگاوانەکە دەپاڕێتەوە ئیجازەی بداتێ بچێ بۆ لای ئەرباب و دەیگوت هێندەی نەماوە خۆی و منداڵەکەی بمرن.

سریۆژا ئەو فەرمانبەرەی جارێکی تر لە سەرسەرای ماڵەکەیان دیتبوو و دڵەدوای کارەکەی بوو.

پرسیی: دەی، بە دڵخۆشی رۆیشت؟

ـ ئەدی چۆن دڵخۆش نابێ؟ کاتێك هاتەدەرێ لە خوشیانا پێی وەعەرزی نەدەکەوت.

دوای تۆزێ بێدەنگی پرسیی: شتێکیان هێناوە؟

دەرگاوان سەری لەقاند و بە سرتە گوتی: بەڵێ قوربان، لە لایەن کۆنتسلیدیا ئیڤانۆڤناوە!

سریۆژا لەڕێوە تێگەیشت کە ئەوەی دەرگاوان دەڵێ دیارییەکە کە بۆ رۆژی لەدایکبوونی ئەو لە لایەن کۆنتسلیدیا ئیڤانۆڤناوە هێناویانە.

ـ شتیوا نەڵێی؟ ئەی لە کوێیە؟

ـ کۆڕنی بردی بۆ لای باوکەگیانت، دەبێ شتێکی زور جوان بێ.

ـ گەورەییەکەی چەندە دەبوو؟ ئەوەندە دەبوو؟

ـ تۆزێ چکۆڵەتر بوو، بەڵام زۆر شتی چاك بوو.

ـ یانی کێتب بوو؟

دەرگاوان کە گوێی لە ترپەی پێی راهێنەرەکەی سریۆژا بوو کە دەهات بۆ لایان دەستە ناسکەکەی کە دەستەوانەکەی بە تەواوی لێدانەماڵدرابوو بە ئەسپایی لە ژێر قاشییەکەی سەرشانی دەرهێنا و چاوێکی لێقرتاند و بەسەر ئاماژەی بە راهێنەرەکەی کرد و گوتی: نا، شتێکی تر بوو، بڕۆ، ڤاسیلی لۆکیچ بانگت دەکات.

سریۆژا بە بزەیەکی شیرین و پڕنەشەوە کە هەمیشە بەسەر سەختگیرییەکانی ڤاسیلی لۆکیچدا زاڵ دەبوو گوتی: ئەوە هاتم، ڤاسیلی لۆکیچ.

سریۆژا ئەوەندە شاد بوو و شتەکانیشی هێندە بەدڵ بوو کە نەیدەزانی ئەو هەواڵە خۆشەی بنەماڵەکەیان کە کاتی پیاسەکردن لە باخە هاوینییەکە لە خوشکەزای کۆنتسلیدیا ئیڤانۆڤنای بیستبوو لەگەڵ دەرگاوانەکە کە بە هاوڕێی خۆی دەزانی نەیهێنێتە گۆڕێ. ئەو هەواڵە خۆشە چونکە لەگەڵ چارەسەربوونی کێشەی فەرمانبەرە دەستشکاوەکە و گەیشتنی لەیستۆك یەك کەوت، زۆری بەلاوە خوش و گرینگ بوو. پێیوابوو ئەو رۆژە رۆژێکە کە هەمووان دەبێ دڵخۆش و رازی بن.

ـ تۆ دەزانی باوکەگیانت نیشانی ئەلکساندرنیۆڤسکیی وەرگرتووە؟

ـ بەڵێ دەزانم. چەند کەس هاتن پیرۆزباییی پێیبلێن؟

ـ زۆرکەس هاتن.

ـ دەی دڵی خۆشە؟

دەرگاوان بە لەبزێکی خێرا و راوێژێکی جیددییەوە گوتی: مەگین دەکرێ کەرەمی تیزار کەسێك دڵخۆش نەکات؟ ئەوەش نیشاندەری ئەوەیە کە شیاوی ئەو پلەوپایەیەن.

سریۆژا چاوی لە روخساری دەرگاوانەکە بڕی کە چکۆلەترین لایەنەکانی بۆ ئەو ئاشکرا بوو، بەتایبەت چەناگەی کە لەنێوان دوو ردێنی سپی و شۆڕەوەبوویدا هەڵکەوتبوو، جگە لەویش هیچ کەس ئەوی بەو شێوەیە نەدیتبوو، چونکە تەنیا ئەوبوو کە هەمیشە لە خوارەوە چاوی لێدەکرد. دوای هێندێك روانین خەیاڵ هەڵیگرت.

ـ ئەرێ بۆ ئێستا کچەکەت نایەت بۆ ئێرە؟ لەمێژە نەهاتووە.

کچی دەرگاوانەکە سەماکاری بالە بوو.

ـ لە رۆژەکانی حەوتوودا ناتوانێ بێت، ئەوانیش دەبێ دەرس بخوێنن. ئێوەش دەبێ دەرسەکانتان بخوێنن، قوربان. فەرموون.

سریۆژا کە چووە نێو ژوورەکەوە بەجێی ئەوەی خەریکی دەرسەکانی بێت لەگەڵ راهێنەرەکەی کەوتە قسەکردن و بیری دەکردەوە ئەو شتەی بۆیان هێناوە بە دیاری دەبێ ترۆمبیل بێ، لێیپرسی: تۆ پێتوایە چیبێت؟

بەڵام ڤاسیلی لۆکیچ تەنیا لە بیری ئەوەدا بوو کە ئەو دەرسی رێزمانەکەی ئامادەبکات چونکە مامۆستاکەی کاتژمێر دوو دەهات.

سریۆژا چووە پشت مێزی نووسینەکەی، کتێبی بە دەستەوە گرت و پرسیی: نا، ڤاسیلی لۆکیچ، تەنیا ئەوەم پێبڵێ، سەرتر لە نیشانی ئەلکساندرنیۆڤسکی چ نیشانێکە؟

ڤاسیلی لۆکیچ وەڵامی دایەوە کە سەرتر لە نیشانی ئەلکساندرنیۆڤسکی نیشانی ولادێمیرە.

ـ ئەی لەوە سەرتر؟

ـ سەرتر لە هەموویان نیشانی سێنت ئاندرێیە.

ـ ئەی سەرتر لە سێنت ئاندرێ؟

ـ نازانم.

ـ چۆن؟ تۆش نازانی؟ـ هەنیشکی لەسەر مێزەکە چەقاند و خەیاڵ هەڵیگرت.

خەیاڵەکانی جۆراوجۆر و پێچەڵاوپووچ بوون. لە خەیاڵیدا دەیدی کە باوکی بەجارێك نیشانی ولادێمیر و سێنتئاندرێی پێکەوە وەرگرتووە و هەر بەو هۆیەش ئەمڕۆ لەسەر دەرسەکانی زۆر لە رابردوو مێهرەبانتر دەبێ. ئەو خۆی کاتێك گەورە بێت هەموو نیشانەکان پێکەوە وەردەگرێت و تەنانەت ئەو نیشانانەی کە ئەمڕۆ هێشتا بوونیان نییە و دواتر سەرهەڵدەدەن لە سێنت ئاندرێشی تێدەپەڕێنن. هەر لەگەڵ پەیدابوونی نیشانێکی تازە ئەو شیاوی ئەوە دەبێت کە ئەو نیشانەی پێبدرێ.

بەو خەیاڵ پلاوانە زۆری کات بەفیڕۆدا و کاتێك مامۆستاکەی هات دەرسی کات و شوێن و چۆنێتیی لەبەر نەکردبوو، مامۆستاکەی نەك هەر لێی رازی نەبوو بەڵکوو زۆریش دڵگران بوو، ئەو خەم و دڵگرانییەی مامۆستا شوێنی لەسەر سریۆژا دانا. ئەو بۆ فێر نەبوونی دەرسەکەی خۆی بە خەتابار نەدەزانی، چونکە هەرچەندی هەوڵی دەدا فێر نەدەبوو. کاتێك مامۆستاکەی بۆی شی دەکردەوە قسەکەی ئەوی دەسەلماند و پێیوابوو تێگەیشتووە، بەڵام کاتێك بە تەنیا دەکەوت بە هیچ کلۆجێك وەبیری نەدەهاتەوە کە تێبگات چۆت وشەیەکی کورتی وەك «لە ناکاو» کە ماناکەی ئاوا بە ئاسانی تێیدەگەیشت، لەوانەیە ئاوەڵکرداری چۆنێتیی بەڕێوەچوونی کارێك بێت. لەگەڵ هەموو ئەوانەش بەداخەوە بوو کە بۆتە هۆی دڵگرانیی مامۆستاکەی و دەیویست بە شێوەیەك دڵخۆشیی بداتەوە.

کاتێك کە مامۆستاکەی بێدەنگ بووبوو و سەرقاڵی کتێبەکەی ئەو بوو، هەلەکەی بە لەبار زانی و لە ناکاو لێیپرسی: میخاییل ئیڤانڤیچ رۆژی لەدایکبوونی ئێوە کەنگێیە؟

ـ واچاکە بیرت لەلای دەرسەکەی خۆت بێ. رۆژی لەدایکبوونی مرۆڤی ئاقڵ هیچ گرنگایەتییەکی نییە.

ڕۆژی لەدایکبوونیش هەر وەکوو ڕۆژەکانی تر وایە و دەبێ کار بکەی.

سریۆژا بە وردی چاوی لە مامۆستاکەی دەکرد و لە ریشە تەنکەکەی و چاوێلکەکەی کە داخزابوو و لە جێبرینەکەی سەر لووتیشی زیاتر هاتبووە خوارێ. ڤاسیلی لۆکیچ وا بە گۆمی خەیاڵدا ڕۆچووبوو کە بیر و هۆشی لەلای مامۆستاکەی نەمابوو و نەیدەزانی دەڵێ چی. دەیزانی مامۆستاکەی ئەوەی دەیڵێ خۆشی بڕوای پێینییە. ئەوەی هەر لە لەبز و راوێژیدا بۆ دەرکەوت. لە دڵی خۆیدا دەیگوت«بەڵام بۆچی ئەوانە هەموو دەڵێی لە دەمی یەکتر تفیون و باسی شتە بێبایەخ و ناپێویستەکان دەکەن؟ بۆچی من لە خۆی دەتارێنێ و هیچ هۆگرییەکی بە من نییە؟» ئەوە پرسیارێك بوو کە لە دڵیدا بوو و هیچ وەڵامێکی بۆ نەدەدۆزییەوە.

## بیست و حەوت

دوای مامۆستاکەی نۆرەی دەرسی باوکی بوو. لە پشت مێزەکە چاوەڕوانی باوکی دانیشت و لەگەڵ کایەکردن بە قەڵەمتراشەکەی خەیاڵ هەڵیگرت. هەروەها ئەو شتانەی کە بە خەیاڵ پێوەی سەرقاڵ بوو ئەوەبوو کاتێك دەچێ بۆ پیاسەکردن دایکی بدۆزێتەوە. ئەو بڕوای بە مەرگ و بەتایبەت مەرگی دایکی نەبوو، ئەگەرچی لیدیا ئیڤانۆڤنا گوتبووی دایکی مردووە و باوکیشی قسەکەی ئەوی پشتڕاست کردبۆوە، بەڵام کاتێك دەچوو بۆ گەڕان و پیاسەکردن بەردەوام چاوی بۆ دایکی دەگێڕا. ژنێکی بەژنوباڵا جوان و ڕێکوپێك و کەزیەرەشی دەدی پێیوابوو دایکییەتی. هەرجارێك کە چاوی بە ژنێکی ئاوا دەکەوت دڵی دەکەوتە کوتەکوت و وەهەناسەبڕکێ دەکەوت و فرمێسك لە چاوانیدا قەتیس دەما، چاوەڕێ بوو ئەو خاتوونە بێت بۆ لای و تۆڕەکەی سەر روخساری لابدات. چاوەڕێ بوو روخساری وەدیاربکەوێت و زەردەی بۆ بگرێت و بە گەرمی لە باوەشی بگرێت و بۆنە خۆشەکەی بیلاوێنێتەوە. حەزی دەکرد هەست بە نەرمیی دەستەکانی بکات و فرمێسکی شادی هەڵوەرێنێ، هەروەك ئەو شەوەی کە لەبەر پێی دایکیدا تخێڵ بووبوو، دایکیشی ختیلکەی دابوو و ئەم بەدەم قاقای پێکەنین و تریقانەوەوە گازی لە دەستە سپی و سۆڵ و پڕ لە ئەنگوستیلەکەی گرتبوو. پاشان کە بە هەڵکەوت لە زمانی دایەنەکەی بیست کە دایکی نەمردووە و بۆیە لیدیا و باوکی گوتوویانە مردووە چونکە بۆتە ژنێکی خراپ و ئاکارناحەز (بەڵام ئەو بڕوای بەوەش نەدەکرد چونکە زۆری دایکی خوش

دەویست) هەروا وەك رابردوو چاوی بۆ دایکی دەگێرا و چاوەڕوانی بوو. هاوینی رابردوو ڕۆژێکیان لە باخەکەدا چاوی بە خاتوونێك کەوتبوو کە تۆرێکی بنەوشی بە سەردا دابوو و بە تووله‌ڕێی نێوان دارەکاندا دەهات بۆ لای ئەو، سریۆژا پێیوابوو دایکییەتی و دڵی کەوتبووە کوتەکوت و چاوی تێبڕیبوو. بەڵام ئەو ژنە بەرەولایەکی تر بایدابۆوە و لەبەر چاوی بزر بووبوو. سریۆژا ئەو ڕۆژە زیاتر لە هەموو کاتێك هەستی دەکرد دڵی لێوڕێژە لە ئەشق و تەنانەت خوشی لەبیرچووبۆوە و لە چاوەڕاوانیی باوکیدا هەموو مێزەکەی بە قەڵەمبڕەکەی تاشیبوو. چاوی پڕ ترووسکەی لە شوێنێکی نادیار بڕیبوو و بیری لە دایکی دەکردەوە.

ڤاسیلی لۆکیچ وەخۆی هێنایەوە و گوتی: باوکەگیانت هاتەوە.

سریۆژا لەجێی خۆی دەرپەڕی و رۆیشت بۆ لای باوکی و دەستی ماچکرد. چاوی لە روخساری کرد و بە هۆی وەرگرتنی نیشانی ئەلکساندرنیۆڤسکییەوە شوێنەواری نەشەی لە روخساریدا بەدی کرد.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لەسەر کورسیلە دەسکدارەکەی خۆی دانیشت و دەستیدا کتێبی تەورات، لێکیکردەوە و پرسیی: دەی پیاسەکردن خوش بوو؟ ـ ئەگەرچی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ زۆر جار بە سریۆژای گوتبوو کە هەموو مەسیحییەك دەبێ مێژووی مەزهەبەکان بە باشی بزانێ، خۆی لەمەڕ تەوراتەوە زۆر جار دەستەوداوێنی کتێبان دەبوو و سریۆژا ئەوەی بۆ دەرکەوتبوو.

سریۆژا لە بەرێکی مێزەکە دانیشت و دەستیکرد بە جووڵاندنی کورسییەکەی، ئەگەرچی ئەو کارە قەدەغە بوو، گوتی: بەڵێ، باوکەگیان زۆر خوش بوو. نادینکام دی (نادینکا خوشکەزای لیدیا ئیڤانۆڤنا بوو کە پووری بەخێوی دەکرد.) ئەو پێیگوتم کە نیشانێکی تازەیان بە ئێوە داوە. پێتخۆشە، باوکەگیان؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: بەر لە هەموو شتێك ئەو کورسییە مەلەقێنە. دوای ئەوەش پاداش هیچ نییە، ئەوی گرینگە کارە. من حەزدەکەم تۆ ئەوە بزانی. بۆ وێنە ئەگەر تۆ لەبەر پاداش زەحمەت بکێشی و دەرس بخوێنی، کارت لێدەبێتە بار. بەڵام ئەگەر ئەو کارەی پێتسپێردراوە بە عیشقەوە بیکەی هەر ئەو کارکردنە خۆی بۆ تۆ پاداشێکە ـ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە ئەوەی دەگوت ئەو ڕۆژەی وەبیرهاتەوە کە تەنیا بە هۆی ئەوەی ئەرکی سەرشانی بوو باری ئەو کارە قورسە واتە واژۆکردنی سەد و هەژدە نامەی تامڵ کردبوو.

چاوانی سریۆژا کە تروسکەی نەشە و خۆشەویستیی تێدا دەدرەوشایەوە خامۆش بوو و لە ژێر نیگای باوکیدا چاوی داخست. ئەمە هەر ئەو لەبزە بوو کە لە قەدیمەوە لەگەڵی ئاشنابوو و باوکی هەمیشە بۆ پێوەندیگرتن لەگەڵ کوڕەکەی بەو لەبزە دەدوا و سریۆژا ئیتر فێر بووبوو کە دەبێ خۆی لەگەڵ رابێنێ. سریۆژا هەستی دەکرد کە باوکی هەمیشە بەجۆرێك لەگەڵیدا دەدوا کە دەتگوت بەردەنگەکەی کوڕێکی خەیاڵییە و یەکێك لەوانەیە کە لەنێو کتێباندا هەن، بەڵام وەك سریۆژا نین. سریۆژاش لەبەر چاوی باوکی وایدەنواند کە یەکێك لەو کوڕێژگە خەیالییانەیە کە لەنێو کتێباندا هاتوون.

باوکی گوتی: هیوادارم لە قسەکانم تێبگەی.

سریۆژا واینواند کە یەکێك لە کوڕانی نێو کتێبانە و وەڵامی دایەوە: بەڵێ، باوکەگیان.

سریۆژا دەبوو چەند ئایەتی ئینجیلی لەبەر بێ و هەروەها سەرەتای تەوڕات دووپات بکاتەوە. سریۆژا ئایەتەکانی ئینجیل بە باشی فێر بووبوو، بەڵام لەو کاتەدا کە دەبوو بۆ باوکی بخوێنێتەوە چاوێکی لە ئێسکی ناوچاوانی کرد کە بە کەوانەیەکی توند لەگەڵ لاجانگی یەکدەکەوتەوە و هەر ئەوەش هۆش و زەینی دەشێواند، بەجۆرێك کە وشەی کۆتاییی ئایەتێك کە شێوەی وشەی سەرەتای ئایەتێکی تری دەدا لێیتێکەڵ دەبوون و بۆی نەدەچووەوە سەریەك. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لێیڕوون بوو کە سریۆژا ئەوەی دەیڵێ تێیناگات و ئەوەش ئیمان هەردەی کردبوو.

نێوچاوانی تێکنا و دەستیکرد بە روونکردنەوەی شتێك کە سریۆژا دەیان جار نەیتوانیبوو هیچی لەبەر بکات، چونکە زۆر بە روونی تێیدەگەیشت، راست ئەو جۆرەی کە «لەناکاو» ماناکەی بە روون و ئاشکرایی و «ئاوڵکرداری چۆنێتی» بوو. سریۆژا ترساوانە چاوی لە باوکی بوو و تەنیا بیری لە شتێك دەکردەوە: یانی باوکی ئەمجارەش وەکوو جاران داوای لێدەکات ئەوەی گوتویە دووپاتی بکاتەوە؟ بەڵام باوکی پێی دووپات نەکردەوە و دەستیکرد بە خوێندنەوەی تەوڕات. سریۆژا رووداوەکانی بە جوانی دەگێڕایەوە بەڵام کاتێك لێیان دەپرسی ئەم یان ئەو رووداوە هێمای چ شتێکە نەیدەزانی، ئەگەرچی چەند جاری لەسەر ئەو دەرسە تەمبێ کردبوو. جگە لەوەش لە جێیەك کە دەبوو ناوی پێغەمبەرەکانی پێش نووح بڵێ نەیدەتوانی هیچ وەڵامێك بداتەوە و دەکەوتە منجەمنج و دیسان دەستی دەکردەوە بە نینۆخ گیرکردن لە مێزەکە و لەقاندنی کورسییەکەی. لەو پێغەمبەرانە تەنیا یەکیانی دەناسی کە ناوی خنووخ بوو و بە زیندوویی بۆ ئاسمانیان بردبۆوە. پێشتر هەموو ناوەکانی لەبەر بوو بەڵام

ئێستا بە تەواوی هەموویانی لەبیرچووبۆوە، بەتایبەت بەو هۆیەی کە خنووخی زیاتر لە پێغەمبەرانی دەورانی کۆن خوش دەویست و فیکر و خەیاڵێکی دوور و درێژ کە ئێستا وای لێکردبوو هۆش و بیری لەسەر زریزەی ناسکی کاتژمێر و دوگمەی نیوەئاوەڵای هێلەگەکەی باوکی بگیرسێتەوە" خۆی دابووە دەست شەپۆلانی ئەو خەیاڵانە و لەگەڵ چیرۆکی بە زیندوویی بۆ ئاسمانچوونی خنووخ لە زەینی خۆیدا لێکی گرێ دەدان.

سریۆژا بڕوای بەو مەرگە نەدەکرد کە زۆر جاران بۆیان باس دەکرد. ئەو باوەڕی نەدەکرد کە ئەو کەسانەی ئەو خوشی دەوێن گیای مەرگ بن و بەتایبەت نەیدەتوانی باوەڕ بکات کە خۆی رۆژێك دەمرێ. ئەو شتە لە هزری ئەودا نەدەگونجا و بە شتێکی بێ مانای دەزانی. بەڵام پێیان دەگوت کە هەمووان دەمرن. پرسیاری لەو کەسانە دەکرد کە بڕوای پێیان هەبوو. دایەنەکەشی ئەگەرچی نابەدڵانە، بەڵام هەر ئەوەی دەگوت. بەڵام خنووخ نەمربوو، کەوایە هەمووان نامرن. سریۆژا لە دڵی خۆیدا دەیگوت «باشە بۆ نالوێ کە خودا هەمووان بە شیاو بزانێ و بە زیندوویی بیانبات بۆ ئاسمان؟» ئەو کەسانەی خراپ بوون و سریۆژا خۆشی نەدەویستن قەیناکا با بمرن، بەڵام مرۆڤە باشەکان وێدەچوو وەك خنووخ بە زیندوویی ببرێن بۆ ئاسمان.

ـ ئەی ـ پێغەمبەرەکانی پێش نووح کامانەن؟

ـ خنووخ، ئەنووش.

باوکی هەستا سەرپێ و گوتی: چاکە ئەوەت گوت. هیچ باش نییە سریۆژا، زۆریش خراپە. ئەگەر تۆ هەوڵ نەدەی ئەوەی بۆ مەسیحییەك پێویستە فێری بی دەبێ هۆگریت بەچی بێت؟ من لێتڕازی نیم و پیوتێر ئینگاتیچیش لێت رازی نییە (پیوتێر ئیگناتیچ مامۆستای گەورەی ئەوبوو)... من دەبێ تەمبێت بکەم.

باوکی و ماومۆستای گەورە لە سریۆژا رازی نەبوون و بەڕاستیش سریۆژا زۆری دڵ بە دەرسەکەی نەدەدا. بە هیچ جۆرێك نەدەکرا بڵێی منداڵێکی زەینکوێرە، بە پێچەوانە زۆر زیرەك و خاوەنمرختر لەو منداڵانە بوو کە مامۆستا بە بەهرەمەندی دادەنان. بە بڕوای کارنین سریۆژا نەیدەویست ئەوەی پێیدەڵێن فێری بێت. بەڵام لە راستیدا نەخواستن لە ئارادا نەبوو. ئەو نەیدەتوانی ئەم شتانە فێر بێت. بۆچیش نەیدەتوانی، هۆیەکەی ئەوەبوو کە رۆحی پێویستی بە شتێك بوو کە بۆ ئەو گرینگتر لەو بابەتانە بوو کە باوکی و مامۆستاکەی چاوەڕوانییان لێیبوو. ئەم دوو گورووپە بابەتە پێکەوە دژواز بوون و هەر بەو هۆیەش سریۆژا لەگەڵ فێرکارەکانی لە کێشەدا بوو.

سریۆژا تەنیا نۆ ساڵی تەمەن بوو. هێشتا منداڵ بوو. بەڵام لەگەڵ رۆحی خۆی ئاشنابوو، رۆحی خۆی خۆشدەویست و ئاگاداریی لێدەکرد، هەروەك چۆن پێڵوو ئاگاداری لە بیبیلەی چاو دەکات. بەبێ کلیلی خۆشەویستی هیچ کەس نەیدەتوانی سەر بە ماڵی دڵیدا بکات. فێرکارەکانی سکاڵایان بوو کە گوێ بە دەرس نادات و ناخوازێ فێربێ، بەڵام ئەو رۆحی تینووی زانایی بوو. ئەو لە کاپیتۆنیچ و دایەنەکەی و نادینکا و ڤاسیلی لۆکیچ شت فێردەبوو نەك لە مامۆستاکەی. ئەو ئاوەی کە باوکی و مامۆستاکەی دەیانویست ئاشی خۆیانی پێبگێڕن لەمێژ بوو رووی لە چۆمەڵێکی تر کردبوو و بەرداشی ئاشێکی تری دەگێڕا.

باوکی لەسەر ئەوەی دەچێ بۆ لای نادینکای خوشکەزای لیدیا ئیڤانۆڤنا، بە سەختی تەمبێی کرد. بەڵام ئەو تەمبێکردنە بە قازانجی سریۆژا تەواوبوو، چونکە ڤاسیلی لۆکیچ زۆر بە تاقەت بوو و فێری کرد کە ئاشی با دروست بکات. دانێکی تەواو تێپەڕی و لە بیر و خەیاڵی ئەوەدا بوو کە چۆن دەکرێ ئاشێك دروست بکات کە بتوانێ پەڕەکانی بگرێ و یان خۆی پێوە ببەستێت و لەگەڵی هەڵسووڕێ. سریۆژا هەتا شەوێ نەکەوتە بیری دایکی، بەڵام کاتێك ویستی بخەوێ وەبیری هاتەوە و بە زمانی خۆی دۆعای کرد کە دایکی سبەینێ، لە رۆژی لەدایکبوونیدا ئیتر خۆی لێنەشارێتەوە و بێتەوە بۆ لای.

ـ ڤاسیلی لۆکیچ، من هاوکات لەگەڵ دۆعای شەوانە، دۆعایەکی زیادیم کرد. ئەگەر گوتت ئەو دۆعایە چیبوو؟

ـ دۆعات کرد کە باشتر دەرس بخوێنی؟

ـ نا.

ـ بۆ لەیستۆك؟

ـ نا، پێموانییە بیزانی. بۆ شتێکی زۆر چاك، بەڵام رازێکە، ئەگەر خودا دۆعاکەم گیرا بکات دەیلێم. دەزانی چییە، ها؟

ڤاسیلی لۆکیچ کە بە دەگمەن زەردەی دەگرت، پێکەنی و گوتی: نا، بیرم بۆ هیچ ناچێ، خۆت بیلێ. بخەوە با مۆمەکە بکووژێنمەوە.

سریۆژا لە دڵەوە قاقایەکی کێشا و گوتی: کاتێك مۆمەکە بکووژێنێتەوە ئەوەی دۆعام بۆ کرد باشتری دەبینم. بڕوانە، خەریکبوو رازەکەی خۆمت بۆ بدرکێنم.

کاتێك مۆمەکەیان برد سریۆژا دەنگی دایکی بیست و خۆشی دیت. لە ژوور سەری ڕاوەستابوو و بە نیگا پڕ خۆشەویستییەکەی دەیلاواندەوە. بەڵام دواتر ئاشیبا هات و قەڵەمتراش و هەموو شتێکی لە زەینیدا تێکوەردا و خەوی لێکەوت.

## بیست و هەشت

ڤرۆنسکی و ئانا کە گەیشتنە پترزبۆرگ لە یەکێك لە باشترین هۆتێلەکانی شار نشتەجێ بوون: ڤرۆنسکی بەجیا لە یەکێك لە نهۆمەکانی خوارەوە ژوورێکی گرت و نهۆمی سەرووش کە جێیەکی گەورە و چوار وەتاغی بوو بۆ ئانا و کچەکەی و دایەنەکەی و خزمەتکارەکەی خۆی گرت.

ڤرۆنسکی یەکەم ڕۆژی گەڕانەوەی چوو بۆ سەردانی براکەی. لەوێ چاوی بە دایکی کەوت کە بۆ هێندێ کاروباری تایبەتی لە مۆسکۆوە هاتبوو. دایکی و براژنی بە شێوەی ئاسایی لەگەڵی بەرەوڕوو بوون. سەبارەت بە سەفەری هەندەران پرسیاریان لێکرد و هەواڵی ئاشنا و ڕۆشنا هاوبەشەکانیان لێپرسی، بەڵام لەمەڕ پێوەندیی ئەو و ئاناوە لە ئەلفەوە نەهاتنە بێ. بەڵام براکەی کە بەیانیی ڕۆژی دوایی هاتبوو بۆ لای حاڵی ئانای لێپرسی و ڤرۆنسکی ڕاشکاوانە پێیگوت کە پێوەندیی لەگەڵ ئانا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ژن و مێردایەتی نییە و هیوادارە کاروباری تەڵاقەکەی سەربگرێ و بە شێوەی فەرمی ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێکبێنێ، هەتا ئەو کاتەش وەکوو ژنی خۆی چاوی لێدەکات و داواشی لە براکەی کرد کە ئەو مەبەستە بە دایکی و ژنەکەی ڕاگەیێنێ.

گوتی: ئەگەر کۆمەڵگاش ئەو پێوەندە پەسند نەکات بۆ من گرینگ نییە، بەڵام ئەگەر بنەماڵەکەم بیانهەوێ حاشایان لێنەکەم دەبێ قەبووڵی بکەن کە ئانا ژنی منە و ڕێزی بۆ دانێن.

برا گەورەکەی کە هەمیشە ڕێزی بۆ بیروڕای برا چکۆلەکەی دادەنا، ئەمجار هەتا داوەریی کۆمەڵگا لەسەر ئەو بابەتە ئاگادار نەبووایە بەڕاستی نەیدەزانی دەتوانێ هەقی پێبدات یان نا. خۆی هیچ دژایەتییەکی لەگەڵ ئەو بابەتە نەبوو و لەگەڵ ڤرۆنسکی چوو بۆ سەردانی ئانا.

ڤرۆنسکی لەبەرچاوی براکەی، زۆر بەڕێزەوە و بە شێوەیەکی فەرمی هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئانا کرد و ئەوی بە دۆستی نزیکی خۆی دانا و لە کاتی قسەکردندا «ئێوە»ی پێدەگوت، بەڵام بێ ئەوەی بە ڕاشکاوانە شتێکی گوتبێ، واینواند کە براکەی لە چییەتیی پێوەندیی ئەوان ئاگادارە و باسی ئەوەی دەکرد کە ئانا لە گەڵیدا دەچێ بۆ مڵکەکەی.

ڤرۆنسکی لەگەڵ ئەوەدا کە لە بواری کۆمەڵگا و دابوو نەریتی ئەودا خاوەن ئەزموون بوو، سەباەت بە بارودۆخی تازەی خۆی زۆر لە هەڵەدا بوو. دەبوو تێبگەیشتایە کە دەرگاکانی کۆمەڵگا لەسەر ئەو و ئانا داخراوە، بەڵام ئێستا بۆچوونێکی لێڵ لە زەینیدا سەری هەڵدابوو و بەخۆی دەگوت کە ئەو چەشنە بیرکردنەوەیە کۆن و سواوە و ئەمڕۆ بەو پێشکەوتنانەوە کە لە کۆمەڵگادا گەشەی سەندووە ئیتر بیروڕای خەڵك گۆڕانی بەسەردا هاتووە و (ئێستا بێ ئەوەی خۆی بزانێ بووبووە لایەنگری هەموو پێشکەوتنێك) بە هیچ شێوەیەك بە شتێکی نەشیاوی نازانن و لەوانەیە لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا وەخۆیان بگرن. لە دڵی خۆیدا دەیگوت «هەڵبەت کۆڕ و کۆبوونەوەکانی دەربار وێناچێ ئانا وەخۆ بگرن بەڵام ئاشنا و رۆشناکان دەتوانن و لەسەریانە ئەو جۆرەی کە شیاوە لەو مەسەلەیە تێبگەن.

مرۆڤ دەتوانێ چەند کاتژمێر لەسەریەك بە شێوەیەك دانیشێ و لاقی لە ژێر خۆیدا کۆبکاتەوە، بەو شەرتەی ئەو بزانێ کە هەرکاتێك بخوازێ دەتوانێ باری دانیشتنەکەی بگۆڕێ و هیچ بەرگێڕەوەیەکی بۆ نییە. بەڵام ئەگەر بزانێ ناچارە لاقی لە ژێر خۆیدا کۆ بکاتەوە، ئەو کاتە ماسوولکەکانی لاقی دەگیرێن، مێروولە دەکەن و دەتەزێن. بۆیە لەو شوێنەدا کە مرۆڤ حەزدەکات رایانکێشێ هەست بە گوشار دەکات. ڤرۆنسکی سەبارەت بە کۆمەڵگاش ئەو هەستەی هەبوو. ئەگەرچی لە قووڵایی دڵیدا دەیزانی کە دەرگاکانی کۆمەڵگای لەسەر داخراوە، دەیویست تاقیی بکاتەوە و بزانێ کۆمەڵگا گۆڕان هەڵناگرێ و ناگونجێ کە وەخۆیان بگرێ. بەڵام زۆر زوو تێگەیشت کە کۆمەڵگا ئەگەرچی ئەو وەخۆ دەگرێ بەڵام ئانا دەتارێنێ. وەك ئەوە وابوو کە لە کایەی مشك و پشیلەدا ئەو دەستانەی بۆ ئەو بەرز دەبوونەوە، لەڕێوە بۆ ئانا دادەنەوینەوە.

یەکێك لە خاتوونەکانی کۆڕی ئەشراف لە پترزبۆرگ کە چاوی بە ڤرۆنسکی کەوت، کچەکەی خاڵی واتە پرێنسس بێتسی بوو.

بێتسی بە روویەکی خۆش و بە شادییەوە لەگەڵی بەرەوڕوو بوو و گوتی: ئاخری هاتنەوە! ئانا لەکوێیە؟ چەندەم پێخۆشە چاوم پێتانکەوت! لەکوێ نیشتەجێن؟ پێموایە دوای ئەو سەفەرە بێوێنەتان بۆ هەندەران ئێستا ئەم پترزبۆرگەی ئێمە زۆر لەبەر چاوتان دزێو و ناخۆش دەنوێنێ. کە دێتە بەرچاوم مانگی هەنگوینەکەتان چۆن لە رۆم تێپەڕاندووە کەیفی پێدەکەم! کاری تەڵاقەکە بە کوێ گەیشت؟ تەواوبوو؟

ڤرۆنسکی تێگەیشت کاتێك بێتسی زانیی تەڵاقەکە هێشتا سەری نەگرتوە، گڕی شادی و نەشەکەی دامرکایەوە.

ـ دەزانم دەکەومە بەر پڵاری تانە و سەرکۆنەم دەکەن بەڵام من دێم بۆ سەردانی ئانا. بەڵێ، حەتمەن دێم. زۆر لێرە دەمێننەوە؟

هەر بەڕاستیش ئەو ڕۆژە چوو بۆ سەردانی ئانا. بەڵام شێوەی لەبز و ڕاوێژی وەك ڕابردوو نەبوو. دیاربوو شانازی بەو بوێرییەی خۆیەوە دەکات و چاوەڕوانبوو ئانا قەدری ڕەسەنایەتی و بەردەوامیی دۆستایەتییەکەیان بزانێ. نزیکەی دە خولەك لەلای مایەوە و باسی هەواڵە تازەکانی کۆمەڵگای گەورانی ڕووسیای کرد و کاتی ماڵئاوایی گوتی:

ـ باسی تەڵاقت بۆ نەکردم. هەڵبەت من ئەوەم بەلاوە گرینگ نییە، بەڵام خاتوونە ماقووڵ و خانەدانەکان هەتا بە فەرمی ژیانی هاوبەش پێکنەهێنی ساردوسڕانە هەڵسوکەوتت لەگەڵدا دەکەن. *ئەمڕۆ ئەو شتانە **زۆر ساکار و ئاسایی بوونەتەوە.*** کەوایە ئێوە ڕۆژی هەینی دەڕۆن؟ حەیفێ ئیتر چاوم پێتان ناکەوێ!

ڤرۆنسکی بە لەبز و ڕاوێژی بێتسیدا تێگەیشت کە دەبێ چ چاوەڕوانییەکیان لە کۆمەڵگا هەبێ. بەڵام لە باری بنەماڵەکەی خۆیەوە هەوڵێکی تری دا. ئەو هیچ هیوایەکی بە دایکی نەبوو. دەیزانی کە دایکی سەرەتای ئاشنایەتییەکەیان زۆری ئانا کەوتبووە بەردڵ، بەڵام ئێستا بە هیچ کلۆجێ دڵی نەرم نەدەبوو چونکە ئانا بووبووە هۆی خراپکردنی داهاتووی کوڕەکەی. بەڵام زۆری هیوا بە ڤاریای براژنی هەبوو و پێیوابوو ئەو ئانا ناداتە بەر پڵاری تیروتانە و زۆر بە ساکاری و ڕاشکاوانە دێت بۆ سەردانی و ئەویش دەبات بۆ لای خۆی.

ڤرۆنسکی ڕۆژێ دوای هاتنیان بۆ پترزبۆرگ چوو بۆ سەردانی براژنی و کە بە تەنیا چاوی پێیکەوت مەبەستی خۆی زۆر بە ڕاشکاوانە لەگەڵیدا هێنایە گۆڕێ.

ڤاریا گوێی بۆ قسەکانی شل کرد و گوتی: ئەلکسی تۆ دەزانی چەندەم خۆشدەوێی و هەتا چ ڕادەیەك ئامادەم هەرکارێکی لە دەستم دێ بۆتی بکەم. بەڵام بێدەنگ بووم چونکە دەمزانی ناتوانم هیچ کەڵکێکم بۆ تۆ و ئانا ئارکادیۆڤنا هەبێـ لەگەڵ گوتنی ئەو ڕستەیە زۆری هەوڵدا کە ئانا ئارکادیۆڤنا بە لەبزێکی ڕوون و بژاردە دەربڕێ: تکات لێدەکەم پێتوانەبێ من ئەو کارەی ئێوەم بە کارێکی دزێو زانیوە. ڕەنگە ئەگەر من لە جێی ئەو بوایەم قەت نەمتوانیبایە ئەو کارە بکەمـ چاوێکی شەرمنانەی لە ڕوخساری خەمتێزاوی ئەو کرد و درێژەی پێدا: نامهەوێ و ناشتوانم بچمە نێو وردەکارییەکانەوە. بەڵام لێمگەڕێ با ڕاشکاوانە قسە بکەم. تۆ

دەتهەویٚ من بچم بۆ لای ئەو و هەروەها بانگی بکەم بۆ ماڵەکەی خۆم و بەو شێوەیە لە بەرچاوی کۆمەڵگا ئابڕووی تکاوی دووبارە بۆ دەستەبەر بکەمەوە. بەڵام تۆ دەبیٚ بزانی کە من ناتوانم کارێکی ئاوا بکەم. کچەکانم گەورە دەبن و من دەبیٚ لەبەرخاتری مێردەکەم لەو کۆمەڵگایەدا بژیم. من دەچم بۆ سەردانی ئانا ئارکادیۆڤنا و ئەو تێدەگات کە من ناتوانم بانگهێشتنی بکەم بۆ ماڵەکەی خۆم، یان دەبیٚ جۆرێك بانگهێشتنی بکەم دوور لە چاوی ئەو کەسانە بیٚ کە بە شێوەیەکی تر چاو لەو کێشەیە دەکەن و لەگەڵیان بەرەوڕوو نەبیٚ. ئەوەش دەبێتە هۆی ڕەنجانی دڵی ئانا. من ناتوانم دەستی بگرم و هەڵیبستێنمەوە...

ڤرۆنسکی بە خەمێکی زیاترەوە قسەکەی پێبڕی و گوتی: بەڵام ئەو لەو کەسانە زیاتر تووشی خلیسکان نەبووە کە هاتوچۆی ماڵتان دەکەن ـ کە تێگەیشت بڕیاری براژنی نەگۆڕە، هەستا بڕوا.

ڤاریا بە بزەیەکی شەرمەزارانەوە چاوی لە چاوی کرد و گوتی: ئەلکسی تووڕە مەبە. تکات لێدەکەم تێبگە کە من هیچ خەتایەکم نییە.

ڤرۆنسکی هەر بەو دڵگرانییەوە وەڵامی دایەوە: تووڕە نابم، بەڵام خەمەکەم پەرە دەستێنیٚ. خەمی ئەوەمە کە پێوەندیی دۆستایەتیی ئێمەش دەپسیٚ. چاکە، وایدانێین کە ناپسیٚ، بەڵام لاواز دەبیٚ. تۆ دەزانی کە من جگە لەوە ڕێگایەکی ترم نییە.

ئەوەی گوت و لە ماڵی براکەی هاتەدەریٚ.

ڤرۆنسکی بۆیدەرکەوت کە لەوە زیاتر هەوڵدان بێکەڵکە و ئەو دەبیٚ ئەم چەند ڕۆژەی لە پترزبۆرگە، وەك لە شارێکی غەریب بیٚ، رایبوێریٚ. خۆی لە هەموو کوڕ و کۆبوونەوەکانی رابردوو ببوێریٚ. تاکوو نەکەوێتە بەر تانە و سووکایەتی کە زۆری بەلاوە ناخۆش و پڕئازار بوو. نەدەگونجا باسی شتێك بێتە گۆڕیٚ و نەچێتەوە سەر ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، یان بچێتە کۆڕێك و لووتی بە لووتی ئەودا نەتەقیٚ. لانیکەم ڤرۆنسکی ئاوای بیردەکردەوە، وەکوو کەسێك کە قامکێکی بریندارە و پێیوایە هەر بجوولێتەوە برینەکەی لە جێیەك دەدریٚ و دەکولێتەوە.

مانەوەی ڤرۆنسکی لە پترزبۆرگ بەو هۆیە زۆری بەلاوە ناخۆش بوو کە بەردەوام دەیدی خولقوخووی ئانا تێکدەچیٚ، بیٚ ئەوەی سەری لێیدەرچیٚ. هێندیٚ جار پێیوابوو ئانا شێت و شەیدایەتی و هێندیٚ جاریش سارد دەبۆوە و رقی هەڵدەستا و وەها دڵڕەقانە هەڵسوکەوتی دەکرد کە نەیدەزانی چۆن لەگەڵیدا بدویٚ. بەردەوام شتێك ئازاری دەدا و شتێکی لێدەشاردەوە،

دەتگوت ئەو شوورەیی و سووکایەتییانەی ژیانی ڤرۆنسکیی تاڵ کردووە، بۆ ئەو (یانی ئانا). بەو وردبینی و هەستە ناسکەیەوە پڕئازارتر دەبێ و ئەو نایبینێ.

## بیست و نۆ

یەکێك لەو ئامانجانەی ئانا کە گەڕابۆوە بۆ رووسیا دیتنی کوڕەکەی بوو، لەو رۆژەوە کە لە ئیتالیاوە کەوتنە رێ، ئەم دیتنە بەردەوام تووشی هەیەجانی کردبوو. هەتا لە پترزبۆرگ نزیکتر دەبۆوە گرینگایەتیی ئەو دیدارە و دڵشادبوون بەو هۆیەوە زیاتر دڵ و گیانی دادەگرت. تەنانەت دەربەستی ئەوەش نەبوو کە چۆن دەتوانێ چاوی بە کوڕەکەی بکەوێ. پێیوابوو ئەگەر ئەو و کوڕەکەی لە شارێك بن هەرچۆنێك بێ چاویان بە یەکتر دەکەوێ. بەڵام کاتێك گەیشتە پترزبۆرگ بارودۆخی ئێستای خۆی لە کۆمەڵگادا بۆ روون بۆوە و تێگەیشت کە ئەو چاوپێکەوتنە زۆر کارێکی دژوارە.

دوو رۆژ بوو لە پترزبۆرگ بوو، ساتێك لە فیکر و خەیاڵی کوڕەکەی خافڵ نەبوو، بەڵام هێشتا چاوی پێی نەکەوتبوو. هەستی دەکرد کە هەقی نییە سەربکات بەماڵێکدا کە لەوانەیە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ببینێ. لەوانەبوو رێگاشی پێنەدەن بچێتە ژوورێ و سووکایەتیی پێبکەن. نووسینی نامە و پێوەندی گرتن لەگەڵ مێردەکەی زۆری بەلاوە دژوار بوو و تەنانەت بیر لێکردنەوەشی ئازاری دەدا: تەنیا کاتێك دەیتوانی هێوربێتەوە کە بیری لە مێردەکەی نەکردایەتەوە. دەتوانێ پرسیار بکات و بزانێ کوڕەکەی بۆ پیاسەکردن دەچێ بۆ کوێ و لەسەر رێگاکەی چاوی پێیبکەوێ، بەڵام ئەوە بۆ ئەو بەس نەبوو، چونکە وادە و بەڵێنی ئەو دیدارەی لەمێژ بوو بە خۆی دابوو، زۆر قسەی لە دڵدا بوو کە پێیبڵێ و زۆر تامەزۆیانە دەیویست لە باوەشی بگرێ و رایموسێ. دایەنی پێشووی سریۆژا دەیتوانی یارمەتیی بدات و زانیاری پێویستی بداتێ، بەڵام دایەنەکەی ئیتر لە ماڵی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ نەمابوو. بەدەم دڕدۆنگی و سۆراخگرتنی دایەنەکەوە دوو رۆژ تێپەڕی.

کە ئاگاداربوو لیدیا ئیڤانۆڤنا پێوەندیی نزیکی لەگەڵ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەیە، رۆژی سێهەم بڕیاریدا نامەیەکی بۆ بنووسێ ئەگەرچی زۆریشی بەلاوە ناخۆش بوو و دەیویست هەرچۆنێك بێ لەو نامەیەدا بنووسێ کە ئیجازەی دیتنی کوڕەکەی پێوەندیی بە کەرەم و گەورەییی

مێردەکەیەوە هەیە. دەیزانی ئەگەر نامەکە نیشان مێردەکەی بدەن، مێردەکەی ناچار دەبێ و هەروا درێژە بە رۆڵی گەورەیی و لێبووردەییی خۆی دەدا و دەستی بەڕووەوە نانێ.

پەیکێك کە نامەکەی گەیاندبوو وەڵامێکی زۆر ناخۆشی بۆ هێنایەوە: «نامەکەت وەڵامی نییە.» ئاناش بە هیچ شێوەیەك چاوەڕوانی ئەو وەڵامەی نەبوو. ئانا لە ماوەی تەمەنیدا قەت وەك ئەو ساتە هەستی بە سەرشۆڕی نەکردبوو کە نامەبەرەکەی بانگکرد و نامەبەر بۆی گێڕایەوە کە چۆن چاوەڕوان رایانگرتووە و پاشان پێیانگوتووە نامەکەت وەڵامی نییە.» هەستی بە زویری و شەرمەزاری دەکرد، بەڵام دەیدی کۆنتسلیدیا ئیڤانۆڤنا لە روانگەی خۆیەوە هەقیەتی. چونکە بە تەنیا باری ئەو خەمە قورسەی هەڵگرتبوو زۆری ئازار دەکێشا. ئانا نەیدەتوانی و نەشیدەویست خەمەکانی خۆی لەگەڵ ڤرۆنسکی بێنێتەگۆڕێ. دەیزانی ڤرۆنسکی، ئەگەرچی هۆکاری سەرەکیی بەدبەختییەکەی ئەو بوو، کەچی دیداری ئەو و کوڕەکەی بەلاوە گرینگ نەبوو. دەیزانی کە ڤرۆنسکی قەت ناتوانێ تێبگات کە چ خەمێکی قورس لەسەر دڵی کۆ بۆتەوە. دەیزانی ئەگەر پرێسکەی دڵی لەلای ئەو بکاتەوە و کولۆکۆی ناخی بۆ هەڵڕێژێ لەبزە ساردوسڕەکەی تووشی بێزاریی دەکات. ئەویش لە هەموو شتێك زیاتر لەو دنیایەدا لەوە دەترسا و بەو هۆیە ئەوەی پێوەندیی بە کوڕەکەیەوە هەبوو لە ئەوی دەشاردەوە.

ڕۆژێکی تەواو لە ژوورێ دانیشت و بیری لە رێگایەك دەکردەوە کە کوڕەکەی ببینێ و ئاخری بڕیاریدا نامەیەك بۆ مێردەکەی بنووسێ. خەریکی نووسینی نامەکە بوو کە نامەی کۆنتسیان بۆ هێنا. بێدەنگیی کۆنتس ئەوی تووشی سەرشۆڕی و گۆێڕایەڵی کردبوو، بەڵام ئەم نامەیە و ئەوەی بە نەنووسراوی لە نامەکەدا بەیان کرابوو وەهای رق هەستاند و قینی ئەو ژنە دەرهەق بە خۆشەویستی و سۆزی راستەقینەی ئەو بۆ کوڕەکەی ئەوەندە قێزەون هاتە بەرچاوی کە لە خەڵکیش بێزار بوو و تەنانەت هەستی تاوانەکەی خۆی وەلانا. بە خۆی گوت «ئەو ساردییە خۆڕانانە و یانیها خێرخوازە. ئەوانە تەنیا دەیانهەوێ من و کوڕەکەم ئازار بدەن و من خەریکم هەقیان پێدەدەم و سەریان بۆ دادەنەوێنم. نا، بە هیچ چەشنێك! ئەو ژنە زۆر لە من خراپترە. من هەرچییەك بم درۆزن نیم.» هەر خێراش بڕیاریدا، کە سبەینێی ئەو رۆژە، یانی رۆژی لەدایکبوونی سریۆژا، راست بڕوات بۆ ماڵی مێردەکەی، بەرتیل بدا بە خزمەتکارەکان و هەڵیانفریوێنێ و بە هەرجۆرێك بێ چاوی بە کوڕەکەی بکەوێ و ئەو کەلوپەلی جێژنۆکە فریودەرانەیە بشێوێنێ کە بۆتە هۆی ئازاری ئەو منداڵە چارەڕەشە.

چوو بۆ دووکانێکی لەیستۆکفرۆشی و دیارییەکی کڕی و بیری لە پیلانەکەی خۆی کردەوە. بڕیاریدا بەیانی زوو، سەعات هەشت، کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هێشتا لە پێخەف نەهاتۆتە دەرێ بچێت بۆ ماڵەکەی. پارەی ئامادەکرد کە بیدات بە دەرگاوان و پێشخزمەتەکان تاکوو

ئیجازەی پێبدەن بچێتە ژووری، بێ ئەوەی تۆڕەکە لە سەر و رووی لادا و بڵێ لەلایەن باوەپیارەی سریۆژاوە هاتووە پیرۆزبایی پێبڵێ و راسپێردراوە کە ئەو دیارییە لە پاڵ قەرەوێڵەکەی دانێ. تەنیا ئەو قسانەی کە دەیویست بە کوڕەکەی بڵێ ئامادەی نەکردبوو، چونکە لەو بارەوە هەرچی بیری کردەوە هیچی بە بیردا نەهات.

ڕۆژی دوایی سەعات هەشت لە هەمبەر دەرگای چوونە ژوورەوەی ماڵەکەی پێشووی خۆی لە فایتوون دابەزی. کاپیتۆنیچ کە هیشتا جلوبەرگی دەرگاوانی خۆی لەبەر نەکردبوو و باڵتە لەبەر و کاڵە لە پێ خەریکبوو لە پەنجێرەکەوە چاوی لە دەرێ دەکرد کە چاوی بە ژنێك کەوت کە روخساری لە ژێر تۆڕەکەدا دیارنەبوو و لە پشت دەرگاکە راوەستابوو، بە یارمەتیدەرەکەی خۆی گوت: بچۆ بزانە ئەو خاتوونە کاری بە کێیە؟

یارمەتیدەری دەرگاوان کە کوڕێکی گەنج بوو و ئانای نەدەناسی هێشتا بە تەواوی دەرگاکەی نەکردبۆوە کە ئانا خۆی کرد بە ژووریدا و گەلایەکی سێ رۆبڵیی لە دەستەوانەکەی دەرهێنا و بەپەلە دایە دەست کوڕە گەنجەکە و گوتی: سریۆژا... سرگی ئەلکسیچ ـ ئەوەی گوت و دەیویست سەرپێوەنێ و بڕواتە ژووری. بەڵام یارمەتیدەری دەرگاوان چاوێکی لە پارەکە کرد و ئەوی لەبەر دەرگا شووشەییەکەی دووهەم راگرت.

لێیپرسیی: کارت بەکێیە؟

ئانا گوێی لە قسەکەی نەبوو و وەڵامی نەدایەوە.

کاپیتۆنیچ کە دیتی ئەو خاتوونە نەناسیاوە پەرێشان و شێوەاوە خۆی هات بۆ لای و بێ ئەوەی پێشی پێبگرێت لێیپرسی چیت دەوێ؟

ئانا گوتی: لەلایەن پرێنس سکۆرۆدوومۆڤە[25]وە هاتووم و دەمهەوێ چاوم بە سرگی ئەلکسیچ بکەوێت.

دەرگاوان بە وردی لە ئانای روانی و گوتی: هێشتا لە خەو هەڵنەستاوە.

ئانا قەت چاوەڕوانی ئەوە نەبوو کە دیمەنی سەرسەرا، ماڵێك کە نۆ ساڵ تێیدا ژیابوو و گۆڕانی بەسەردا نەهاتبوو ئاوا شوێنی لەسەر دانێ. بیرەوەرییەکانی، شیرین، یان تاڵ، دانەدانە لە زەینیدا سەریان هەڵدایەوە و بۆ ساتێك لە بیری چۆوە کە بۆچی هاتووە.

---

25- Skorodoumov

کاپیتۆنیچ یارمەتییدا کە باڵتە کەڵپۆسەکەی داکەنێ و گوتی: تکایە هێندێ سەبر بفەرموون.

کاپیتۆنیچ لەگەڵ وەرگرتنی باڵتەکەی چاوێکی خێرای لە روخساری کرد و ناسییەوە، بێ ئەوەی زمانی بگەڕێ کڕنۆشێکی بۆ کرد و گوتی:

ـ فەرموون، خاتوونی هێژا! فەرموون.

ئانا ویستی شتێك بڵێ بەڵام دەنگی دەرنەهات و نەیتوانی قسە بکات. چاوێکی لە پیرەپیاو کرد کە پاڕانەوەی تاوانبارێکی پێوە دیاربوو و بە هەنگاوی خێرا بە پلیکانەکاندا وەسەر دەکەوت. کاپیتۆنیچ بە کۆمەکۆمە و کاڵە لەپێ کە نەیدەتوانی بە جوانی بە قاڵدرمەکاندا سەرکەوێ، بەپەلە بە دوای ئانادا دەهاتە سەرێ و هەوڵی دەدا پێیبگاتەوە.

ـ مامۆستا لەوێیە، رەنگە جلی لەبەردا نەبێ. ئیجازە بفەرموون با ئاگاداری بکەم.

ئانا کە نەیدەزانی پیرەپیاو دەڵێ چی هەروا بە تاڵووکە بە قاڵدرمە ئاشناکاندا وەسەر دەکەوت.

دەرگاوان بە هەناسەبڕکێوە گوتی: تکایە بەلای چەپدا تەشریف بەرن، ببوورن هێشتا خاوێنیان نەکردۆتەوە. ئەوان ئێستا لە هۆڵە چکۆڵەکەی پێشوون. ئیجازە بفەرموون، خاتوونی هێژا، تۆزێ سەبر بفەرموون با بزانم...

ـ بە پەنایدا تێپەڕی و کەلێنێکی بە دەرگای گەورەی ژوورەکەدا و چووە ژوورێ. ئانا چاوەڕێ راوەستا. دەرگاوان دیسان هاتەوە دەرێ و گوتی: هەر ئێستا لە خەو هەستاون.

هەر ئەو ساتەی دەرگاوان ئەو قسەیەی کرد ئانا دەنگی باوێشکێکی منداڵانەی بیست. هەر بەو دەنگی باوێشکەدا رۆڵەکەی خۆی ناسییەوە و ئەوی بە روونی و زیندوویی هێنایە بەرچاوی خۆی.

ئانا گوتی: لێمگەڕێ، لێمگەڕێ با بچمە ژوورێ!ـ خێراش لە دەرگا گەورەکەوە چووە ژوورێ. نزیك دەرگای دەستە راست قەرەوێڵەیەك داندرابوو کوڕێك لەسەری دانیشتبوو، قۆپچەی کراسەکەی کرابوونەوە و نێو شانە سپی و ناسکەکەی بۆ دواوە کۆم بووبۆوە و خۆی دەکێشایەوە و لەپەستا باوێشکی دەدا. لەگەڵ باوێشکەکە لێوانی گەیشتنەوە یەك و پاشان بە بزەیەکی پڕ لە خەوخۆشییەوە پێکەوە نووسان و دیسان هەر بەو بزە شیرینەوە بە ئەسپایی بەلادا هات و خۆیدایەوە دەست شیرینایی خەو.

ئانا بەبێ چرپە لێی چووەپێشێ و بە هێواشی گوتی: سریۆژا!

ئەو کاتەی ئانا لە کوڕەکەی هەڵبڕابوو و دوای ئەوەش بە هۆی ئەو گڕکانی خۆشەویستییەوە کە لەو ماوەیەدا لە دڵی هەڵدەقووڵا، ئەوی وەکوو کوڕێکی چوارساڵانە دەهاتە بەرچاو کە جوانترین و

شیرینترین ئەندام و تەمەن بوو بۆ جگەرگۆشەکەی. بەڵام ئێستا سریۆژا تەنانەت وەکوو رۆژی دابڕانەکەشی نەمابوو. زۆر گۆڕابوو و وەك منداڵێکی چوار ساڵان هەر نەدەچوو. باڵای کردبوو و دەموچاویشی کزتری دەنواند. ئەوەش چ مانایەکی هەبوو؟ بۆچی دەموچاوی ئاوا تێکقوپاوە و قژی ئاوا کورتە و دەستیشی درێژ بوون؟ لەچاو کاتی لێکهەڵبڕان چەندە گۆڕابوو! بەڵام خۆی بوو، سەرو پۆتراك و ملە نەرمەکەی و نێوشانی پان هەموو هەر خۆی بوو.

ئانا دانەوی و بە گوێیدا چرپاند: سریۆژا!

سریۆژا دیسان هەستا و خۆیدایە سەر هەنیشکی. سەری بە قژە ئاڵۆزاوەکەیەوە بۆ هەموو لایەك گێڕا و دەتگوت لە شتێك دەگەڕێ، چاوی هەڵێنا. ماوەیەك ئارام و واقوڕما و چاوی لە دایکی بڕی کە بێجووڵە بەرەوڕووی راوەستابوو. پاشان بە دڵخۆشییەوە زەردەیەکی گرت و پێڵووە خەواڵووەکانی دیسان لەسەریەك دانایەوە و خۆی نەك بە پشتدا، بەڵکوو بە رووودا خست و خۆی خستە باوەشی دایکیەوە.

ئانا کە لەبەر هەیەجان هەناسەی بۆ نەدەکێشرا جەستەی خرپنی کوڕەکەی توند لە باوەش گرت و گوتی: سریۆژا، کوڕە خۆشەویستەکەم!

سریۆژا خۆی لە باوەشیدا دەجووڵاندەوە تاکوو هەموو ئەندامی خۆی لە دەستی دایکی هەڵساوێ و بە دڵپڕییەوە گوتی: دایەگیان!

لێوبەبزە و خەواڵوو هەروا بە چاوی قووچاوەوە دەستە خرپنەکانی لەسەر بالیفەکەی هەڵێنا و نایە سەرشانی دایکی و خۆی لە باوەشی توند کرد، دایکی لە بۆنی شیرین و گەرمی خەو کە تایبەتی منداڵانە نوقم کرد و دەموچاوی خۆی لە سنیگ و شانوملی دایکی هەڵدەساوی.

چاوی هەڵێنا و گوتی: دەمزانی. ئەمڕۆ روژی ناودێرکردنی منە. دەمزانی دێی. ئێستا هەڵدەستم.

بەڵام لەگەڵ گوتنی ئەو قسەیە خەریکبوو دیسان خەوی لێدەکەوتەوە.

ئانا وەك تینوویەکی بە ئاو گەیشتوو چاوی لێنەدەترووکاند. دەیدی کە دوور لە چاوی ئەو چۆن باڵای کردووە و گۆڕاوە. لاقە گەورە و رووتەکانی کە ئێستا لە ژێر بەتانییەکە هاتبوونە دەرێ دەیناسین و نەیدەناسین، روومەتە قووپاوەکەی و تووکەسەری کە لەلاجە سەرییەوە کورت کرابۆوە و ئەو هەمیشە ماچی دەکرد ناسییەوە. هەموو ئەوانەی دەدی و بە نەرمی نەوازشتی دەکرد و نەیدەتوانی قسە بکات. ئۆناقێك گەرووی گرتبوو.

سریۆژا کە بە تەواوی خەو بەریدابوو پرسیی: بۆ دەگریی، دایەگیان؟ ـ پاشان بە دەنگێکی لەرزۆك و گریاناوییەوە دەنگی هەڵبڕی و دیسان پرسیی دایەگیان، بۆچی دەگریی؟

ئانا گریانەکەی قووت دایەوە و رووی کرد بەولاوە و گوتی: من؟ ئیتر ناگریم... لە خۆشیانا دەگریم. لەمێژە نەمدیوی، زۆرم بیرکردبووی! ـ دوای تۆزێ بێدەنگی گوتیشی: چاکە، ئێستا هەستە جلەکانت لەبەرکە ـ بەبێ ئەوەی دەستی بەردا لەسەر کورسیی پەنا چرپاکەی کە جلەکانی سریۆژای لەسەر بوو دانیشت.

بە دڵشادی و ساکارانە پرسیی: من کە لێرەنیم چۆن جلەکانت لەبەر دەکەی؟ چۆن... ـ بەڵام نەیتوانی درێژە بە قسەکانی بدا و رووی کرد بەولاوە.

ـ ئیتر دەست و دەموچاوم بە ئاوی سارد ناشۆم، باوکەگیان ناهێڵێ. تۆ ڤاسیلی لۆکیچت نەدیوە. ئێستا دێ. بڕوانە، لەسەر جلەکانی من دانیشتووی ـ دەستیکرد بە قاقاکێشان.

ئانا تۆزێ چاوی لێکرد و پێکەنی.

سریۆژا دەنگی هەڵبڕی: دایەگیان، خۆشەویستەکەم، بەقوربانی چاوت بم ـ دیسان خۆی خستەوە باوەشی و دەستی لە ملی هەڵپێکا. دەتگوت تازە دوای دیتنی پێکەنینەکەی، بە روونی تێگەیشتبوو کە چی رووی داوە. کڵاوەکەی لەسەری دایکی داگرت و گوتی: ئەوە لابە ـ کە بەبێ کڵاو دیتی، وەك ئەوەی تازە چاوی پێیکەوتبێ، دیسان دەستیکردەوە بە ماچکردنی.

ـ بەڵام تۆ چۆنت بیر لە من دەکردەوە؟ پێتوابوو من مردووم؟

ـ نا، باوەڕم نەدەکرد.

ـ راست دەکەی، باوەڕت نەدەکرد کوڕە شیرینەکەم؟

ـ نا، دەمزانی، دەمزانی ـ ئەوەش رستەیەك بوو کە زۆری بەدڵ بوو، پاشان دەستی کە قژی نەوازشت دەکرد گرتی و بە نەرمی بە دەمییەوە گوشی و ماچی کرد.

## سێ

لەو نێوانەدا ڤاسیلی لۆکیچ کە نەیدەزانی ئەو ژنە کێیە و سەرەتا تووشی سەرسوڕمان بووبوو، بە قسەکانیدا تێگەیشت کە ئەو دایکەیە وا حاشای لە مێردەکەی کردووە و کوڕ و ماڵەکەی بەجێ هێشتووە و ئەو نایناسێ" چونکە دوای رۆیشتنی ئانا لەو ماڵە دەستبەکاربووبوو، دوودڵ بوو کە بچێتە ژووریێ یان نا، نەشیدەزانی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئاگاداربکات یان نا. ئاخری بە خۆی گوت ئەرکی ئەو ئەمەیە کە سریۆژا لە کاتی دیاریکراودا

له خەو هەستێنێ و نابێ لەوە بکۆڵێتەوە ئەوانەی دێن کێن و چ کارێکیان هەیە، هەروەها ئەرکی ئەو نییە کە بۆیدەرکەوێ ئەو ژنە دایکی سریۆژایە یان کەسێکی دیکەیە و ئەو جگە لەو ئەرکەی پێیسپێردراوە نابێ کاری بەسەر هیچ شتێکی ترەوە هەبێ، بۆیە جلەکانی لەبەرکرد و رۆیشت بۆ لای دەرگاکە و کردیەوە.

بەڵام لاواندنەوەی دایکانە و لەبز و راوێژی قسەکردنیان و ئەوەی باسیان دەکرد، ئەوانە هەمووی لەو قەستەی خۆی پاشگەزیان کردەوە و نەچووە ژوورێ. سەری راوەشاند، هەناسەیەکی هەڵکێشا و دەرگاکەی پێوەدا. له دڵی خۆیدا گوتی: «دە خولەکی تریش سەبر دەکەم.» بە نەرمی کۆخی و فرمێسکی چاوی سڕی.

هەر لەوکاتەدا جموجۆڵ کەوتە نێو خزمەتکارەکانەوە. هەموو زانیبوویان خاتوون هاتۆتەوە و کاپیتۆنیچ رێگای پێداوە بێتە ماڵێ و خاتوون ئێستا لە ژووری ئاغازادەیە و ئەرباب هەموو رۆژێ بەرلە کاتژمێر نۆ خۆی دەچێ بۆ ژووری کوڕەکەی، هەموو خزمەتکارەکانیش دەیانزانی ئەو ژن و مێردە نابێ یەکتر ببینن و دەبێ بەرگری لەو رووبەڕووبوونە بکەن. کۆڕنی، پێشخزمەتی ئەرباب، هاتە خوارێ و چوو بۆ ژووری دەرگاوان و لێیپرسی چۆن و کێ رێگای داوە خاتوون بێتە ژوورێ؟ کە بۆیدەرکەوت کاپیتۆنیچ خۆی رێگای پێداوە و بردوویە بۆ ژووری منداڵەکەی دەستیکرد بە سەرکۆنەکردنی ئەو پیرەپیاوە. دەرگاوان لە ئەلفەوە نەهاتە بێ، بەڵام کاتێك کۆڕنی گوتی لەسەر ئەو کارە نابەجێیە جێی خۆیەتی لەسەر کارت لابەن، کاپیتۆنیچ بە تووڕەیی رۆیشت بۆ لای و لەگەڵ ئەوەی لەبەر دەمی دەستی رادەوەشاند گوتی: ئەگەر تۆ بوویتایە رێگات پێنەدەدا؟ دە ساڵ لەو ماڵەدا خزمەتم کردووە و جگە لە خاتوونی و مێهرەبانی هیچی ترم پێوە نەیدوە. دەمەوێ بزانم ئەگەر تۆ بووبای دەتوێرا بڵێی: فەرموو لێرە برۆ و ئیتر پێت بەملایەدا نەیەتەوە؟ تۆ وا چاکبوو ببیتە سیاسەتمەدار. تۆ وا چاکە لە بیری کاری خۆتدا بی و کەلوپەلەکانی ئەرباب پاشقل دەی و بە دزییەوە کەڵپۆسەکانی لەبەر بکەی.

کۆڕنی بە لەبزێکی پڕسووکایەتییەوە گوتی: هیچوپووچ! ـ سەری بۆ لای دایەنی سریۆژا وەرسووڕاند کە خەریکبوو دەهاتەژوورێ و گوتی: وەرە تۆ قازی بە و قەزاوەت بکە ماریا یەفیمۆڤنا[٢٦]، ئەم پیرەپیاوە رێگای بە خاتوون داوە بێتە ماڵێ و بە هیچ کەسی نەگوتووە. ئێستا ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەڵدەستێ و دەچێ بۆ ژووری کوڕەکەی.

---

26- Maria Yefimovna

دایەن گوتی: ئەیەڕۆ، قوڕ بەسەر نەخۆم. ئێستا تۆ کوڕنی ڤاسیلییڤیچ، واچاکە بچی و هەرچۆنێکە ئەرباب بخافڵێنی و لەقسەی بگری. منیش ئەوە دەچم، بەڵکوو بتوانم بەجۆرێك خاتوون بەرمە دەرێ. قوڕبەسەر خۆم!

کاتێك دایەن پێینایە ژوورەکەی سریۆژا، کوڕە خەریکبوو بۆ دایکی باس دەکرد کە چۆن کاتێك لەگەڵ نادینکا چوون بۆ خلیسکێن و لەسەر گردەکە سواری کاشە بوون و خزیونەتە خوارێ و سێتلیان داوە. دایکی تەنیا گوێی لە دەنگی دەبوو و چاوی لە دەموچاوی بوو کە شڵەژاویی پێوە دیاربوو، هەروەها هەستی بە گەرمایی دەستی دەکرد بەڵام دڵی لەلای قسەکانی نەبوو و نەیدەزانی دەڵێ چی. تەنیا هەستی دەکرد کات تێدەپەڕێ و دەبێ سریۆژا بەجێ بێڵێ و بڕوات، جگە لەوەش بیری لە هیچی تر نەدەکردەوە.

ترپەی پێی ڤاسیلی لۆکیچی بیست کە بە کۆخەکۆخ دەڕۆیشت بۆ لای دەرگاکەوە و هەروەها ترپەی پێی دایەنەکەی سریۆژاش کە نزیك دەبۆوە، بەڵام وەك پەیکەرە ویشك بووبوو و هێزی نەبوو قسەیەك بکات یان لەجێی خۆی هەستێ.

دایەن لە ئانا چووە پێشێ و گوتی: خاتوون گیان، بەقوربانت بم ـ دەست و شانی ماچکرد و گوتیشی: خودا بۆ ئەو منداڵە لە رۆژی لەدایکبوونیدا چ دیارییەکی ناردووە ئەیەڕۆ، هەر بە تۆزقاڵێش نەگۆڕاوی!

ئانا بۆ ساتێك وەخۆ هاتەوە و گوتی: ئەیەڕۆ، دایەگیان،نەمدەزانی تۆ لێرەی.

ـ ئانا ئارکادیۆڤنا، بەقوربانت بم، من لێرە نیم. لەلای کچەکەمم. تەنیا هاتووم پیرۆزبایی لە سریۆژا بکەم. دایەن لە ناکاو دای لە قوڵپەی گریان و دەستیکرد بە ماچکردنی دەستی ئانا.

ڕوخساری سریۆژا بە بریقەی چاوانی و گوڵبزەی سەرلێوی گەشابۆوە. دەستێکی لەسەر شانی دایکی دانابوو و دەستەکەی تریشی لەسەر شانی دایەنەکەی و لاقە قەڵەوەکانی دەکێشا بە فەرشەکەدا. زۆر شاد و دڵخوش بوو کە دیتی دایەنی لەگەڵ دایکی رووخۆش و مێهرەبانە.

ـ دایەگیان، ئەو زۆر دێ بۆ سەردانم. هەرکاتێکیش دێ...ـ بەڵام قسەکەی بڕی کە دیتی دایەنەکەی خەریکە بە گوێی دایکیدا دەچرپێنێ و شوێنەواری ترس و شتێکی وەك شەرم، کە لەگەڵ سیمای دایکی سازگار نەبوو روخساری داگرت.

دایکی لە سریۆژا نزیکبۆوە و گوتی: خۆشەویستەکەم!

نەیتوانی بڵێ «خوداحافیز» بەڵام بە روخساریدا دیاربوو کە دەیهەوێ بڕوات و ئەو لەوە دەگەیشت. دایکی گوتی: خۆشەویستەکەم، کۆتیکە نازدارەکەم! ـ کۆتیك ناوێك بوو کە دایکی لە کاتی منداڵیی سریۆژادا لەبەر خۆشەویستی بەو ناوە بانگی دەکرد: تۆ دایکی خۆت لە بیری نابەیتەوە؟ تۆ... بەڵام ئیتر نەیتوانی قسە بکات.

زۆر قسەی تر هەبوو کە دواتر وەبیری هاتەوە کە دەکرا بە کوڕەکەی بڵێ. بەڵام ئێستا هیچ شتێکی بە بیردا نەدەهات و نەیدەتوانی قسە بکات. بەڵام سریۆژا تەواوی ئەو قسانەی کە دایکی دەیویست پێیبڵێ خۆی تێدەگەیشت. زانیی کە دایکی دڵشکاو و نیگەرانە و ئەوی خۆش دەوێ. تەنانەت ئەوەی دایەنەکەشی سرتاندبووی بە گوێی دایکیدا تێگەیشتبوو. ئەو رستەی «هەموو رۆژێ کاتژمێر نۆ...»ی بیستبوو و زانیی کە مەبەستیان باوکییەتی و دایکی ناتوانێ لەگەڵ باوکی بەرەوڕوو بێت، لەوە دەگەیشت بەڵام شتێکی بۆ نەدەچۆوە سەریەك ئەویش شوێنەواری ترس و شەرمێك بوو کە روخساری دایکی داگرتبوو. سوور سوور دەیزانی کە دایکی خەتابار نییە بەڵام دەیدی کە دەترسێ و هەست بە شەرمەزارییەك دەکات. دەیویست پرسیارێك بکات بۆ ئەوەی ئەو دڕدۆنگییەی وەلاچێ بەڵام نەیدەوێرا. دەیدی کە دایکی ئازار دەکێشێ و دڵی پێیدەستووتێ. بە بێدەنگی خۆی لە باوەشی توند کرد و بە هێواشی گوتی:

ـ ئێستا زووە، مەڕۆ. ئەو وا زوو نایەت.

دایکی ئەوی لە خۆی دوور خستەوە بۆ ئەوەی بزانێ ئەوەی دەیڵێ بەڕاستی لە دڵەوە گوتوویە؟ بە حاڵەتی روخساریدا تێگەیشت و ترسێکی تێدا بەدی کرد کە نەك هەر باسی باوکی دەکرد، بەڵکوو وەك ئەوە وابوو کە لێیبپرسێ سەبارەت بە باوکی دەبێ چۆن بیر بکاتەوە.

گوتی: سریۆژا، کوڕە خۆشەویستەکەم، ئەوت خۆشبووێ. ئەو زۆر لە من باشتر و مێهرەبانترە. من دەرهەق بە ئەو تاوانم کردووە.

سریۆژا دەستیکرد بە گریان و هیوابڕاوانە دەنگی هەڵبڕی: هیچ کەس لە تۆ باشتر نییە!... بە هەردوو دەستی شانی دایکی گرت و بە هۆی گریانەوە هەموو گیانی دەلەرزی و بە هەموو هێز و قەوەتی بە خۆیەوە دەگوشی.

ئانا گوتی: خۆشەویستەکەم، رۆڵە نازدارەکەم! ـ دەستیکرد بە گریان، گریانێکی بێدەنگ و منداڵانە، وەکوو کوڕەکەی.

لەوکاتەدا دەرگاکە کرایەوە و ڤاسیلی لۆکیچ هاتەژووری. ترپەی هەنگاوێکی تر لە پشت دەرگاکەی دیکەوە هاتە گوێ و دایەن ترساوانە و بە سرتە گوتی: ئەرباب خەریکە دێ ـ بە هەڵەپڕووکێش کڵاوەکەی دایە دەست ئانا.

سریۆژا خۆیدا بەسەر قەرەوێڵەکەیدا و بە هەردوو دەستی دەموچاوی خۆی گرت و زۆرەزۆر دەستیکرد بە گریان. ئانا دەستی لەسەر دەموچاوی لابرد و روومەتە بە فرمێسك خووساوەکەی ماچکرد و بە هەنگاوی خێرا و بەپەلە لە ژوورەکە چووەدەرێ. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هات بۆ لای. کە چاوی پێی کەوت سەری داخست.

لەگەڵ ئەوەشدا کە ساتێك لەمەوبەر ئانا گوتبووی ئەو باشتر و مێهرەبانترە لە من دوای ئەوەی بە تووڕەیی چاوێکی لە مێردەکەی کرد کە هەموو دەموچاوی ئەوی بە حاڵەت و پاژەکانییەوە لەخۆ گرت، رق و بێزاری دەرهەق بە ئەو و ئێرەیی لەبەر خاتری کوڕەکەی بەسەریدا زاڵ بوو و خێراتر هەنگاوی هەڵێنایەوە و دەکرێ بڵێین بە هەڵەداوان لە ژوورەکە چووەدەرێ.

تەنانەت فریا نەکەوت ئەو لەیستۆکانەی شەوی رابردوو بە ئەشق و تامەزرۆییەوە کڕیبووی بیدا بە کوڕەکەی و هەروا لەگەڵ خۆی بردنییەوە.

## سی و یەك

ئەگەرچی ئانا لە قووڵاییی دڵەوە تاسەمەندی دیتنی کوڕەکەی بوو و لەمێژ بوو بیری لێدەکردەوە و خۆی بۆ ئامادەکردبوو، بە هیچ جۆرێك چاوەڕوان نەبوو کە ئاوا شوێنی لەسەر دانێ. کە گەڕایەوە بۆ هوتێل و تەنیا کەوت هەتا ماوەیەك نەیدەزانی بۆ لەوێیە. لە دڵی خۆیدا گوتی «هەموو شتێك کۆتاییی پێهات و من دیسان تەنیا مامەوە.» هەروا بە کڵاوەوە لەسەر کورسیلەی پاڵ سۆباکە دانیشت. چاوی لەو سەعاتە برینجییە بڕی کە لەسەر مێزی نێوان پەنجێرەکان داندرابوو و خەیاڵ هەڵیگرت.

خزمەتکاری فەڕەنسی کە لە هەندەرانەوە لەگەڵ خۆی هێنابووی هاتەژووری و داوای لێکرد کە جلەکانی بگۆڕێ. ئانا بە سەرسووڕمانەوە چاوی لێکرد و گوتی:

ـ باشە دوایی.

پێشخزمەت ویستی قاوە بێنێ.

ئانا وەڵامی دایەوە: باشە دوایی.

دایەنی ئیتالیایی هاتەژووریّ و کچەکەی هێنا بۆ لای کە پاکوخاوێن رازاندبوویەوە. کۆرپەیەکی خرپنە و باش پەروەردەکراو بوو، وەك هەمیشە کە چاوی بە دایکی کەوت لەپی دەستە رووتەکانی کە لەبەر قەڵەوی دەتگوت بە دەزوو بەستووتن، چاوی لە خواریّ کرد و بە دەمی بێددان و پڕپێکەنینەوە وەك ماسی دەستیکرد بە جینگڵ لەخۆدان و خشەخشی لە بەروانکە گوڵدۆزیکراو و لایەلێدراوەکەی هەستاند. چۆن دەگونجا بە دیتنی ئەو کۆرپە جوانە زەردە نەگریّ و ماچی نەکات؟ چۆن دەکرا قامکی نەهێنێتە پێشیّ تاکوو کۆرپەکەی لە خۆشیانا بقریشکێنیّ و بشنێتەوە بۆ باوەشی. نەیدەتوانی لێوانی خۆی نەباتە پێشیّ و کچۆڵەکەی بە قەستی ماچکردن بە دەمە چکۆڵەکەی نەیگریّ. ئانا هەموو ئەو کارانەی کرد و دەستە چکۆلە و خرپنەکانی گرت و لەسەر کۆشی خۆی دانا و روومەتی ناسك و بازۆڵە رووتەکانی ماچکرد، بەڵام بە دیتنی ئەو کۆرپەیە روونتر لە پێشوو بۆی دەرکەوت هەستێك کە سەبارەت بە ئەو لە دڵیدایە لە چاو خۆشەویستیی سریۆژا بۆ ئەوە نابیّ کە ناوی خۆشەویستیی لێبنیّ. هەموو شتێکی کچەکە شیرین بوو، بەڵام بە هۆیەك نەدەکەوتە بەردڵی. تەواوی تامەزرۆیی و ئەشقی لەسەر یەکەم منداڵی گیرسابۆوە، ئەگەرچی لە پیاوێك بوو کە خۆشی نەدەویست. منداڵی دووهەمی لە دژوارترین بارودۆخدا لەدایك بوو و ئانا یەك لە سەدی ئەو زەحمەتەی کە بۆ سریۆژای کێشابوو بۆ کچەکەی نەکێشابوو. بێجگە لەوەش کچەکەی دیارییەك بوو کە چاوەڕوانیی داهاتووی پێوە بوو بۆی، بەڵام سریۆژا ئیتر بۆخۆی نیوەپیاوێك بوو، ئەویش پیاوێکی خۆشەویست. فکر و هەستەکانی لە ناخیدا خەریکی بەربەرەکانیّ بوون. ئانا قسە و نیگاکانی ئەوی وەبیرهاتەوە و بە خۆی گوت «کوڕەکەم خۆشی دەوێم و لە بارودۆخی ژیانم تێدەگات و داوەریی لەسەر دەکات. ئەویش (ئانا) بۆ هەمیشە نەك بە لەش بەڵکوو بە رۆحیش لەو جیا بووبۆوە و جگە لە تەسلیمبوون هیچ چارەیەکی تری نەبوو.

ئانا منداڵەکەی دایەوە دەست دایەنەکەی و داوای لێکرد بچێتە دەریّ. پاشان میداڵەکەی ملی کە وێنەی سریۆژای تێگیرابوو، دەکریّ بڵێین هر لەو تەمەنەی خوشکە چکۆڵەکەیدا بوو، لە ملی خۆی داماڵی و هەستا کڵاوەکەی لەسەری داگرت و ئالبۆمێکی هەڵگرت کە لەسەر مێزێکی چکۆڵە داندرابوو و وێنەی کوڕەکەی تێدابوو لە تەمەنی جۆراوجۆردا. هەموو وێنەکانی لە ئالبۆمەکە دەرهێنا و تەنیا دوایین دانەیان کە لە هەموویان باشتر بوو تێیدا هێشتەوە. ئەو لەو وێنەیەدا کراسێکی سپیی لەبەردا بوو و لەسەر کورسیلەیەك کە دەتگوت

سواری ئەسپ بووە دانیشتبوو، نێوچاوانی تێکنابوو، بەڵام چاوانی پێدەکەنی. ئەوەش حاڵەتێکی تایبەتی ئەو و شیرینترین حاڵەتی روخساریشی بوو. بە دەستە چکۆڵە و چالاکەکەی و بە قامکە ناسك و سپییەکەی کە ئەو رۆژە زیاتر لە هەموو کاتێك عەسەبی و لەرزۆك بوون، چەند جار ویستی سووچی وێنەکە بگرێ بەڵام دەستی لە سووچەکەیان گیر نەدەبوو و نەیدەتوانی وێنەکە لە ئالبۆمەکە دەرکێشێ. چەقۆی کتێبهەڵدەرەوە لەسەر مێزەکە نەبوو، بەڵام وێنەیەکی تر لە پاڵ دەستیدا بوو (ئەویش یەکێك لە وێنەکانی ڤرۆنسکی بوو بە قژی درێژەوە و کڵاوەێکی گردی لەسەر نابوو کە لە رۆم گرتبوویان.) هەڵیگرت و بە یارمەتیی ئەو سووچی نایلۆنەکەی بەرزکردەوە و وێنەکەی سریۆژای دەرهێنا. چاوێکی لە وێنەکەی ڤرۆنسکی کرد و بەخۆی گوت «ئاخ، تەماشایکە!» لە ناکاو وەبیری هاتەوە کە هۆکاری خەمی ئەمڕۆکەشی ئەوبوو. ئەو رۆژە بەیانی تەنانەت جارێکیش بیری لە ئەو نەکردبۆوە، بەڵام ئێستا لە ناکاو کە روخساری پیاوانە و نەجیم و ئاشنا و دڵگەرمی ئەوی دی شەپۆلی ئەشقێکی چاوەڕواننەکراوی لە دڵی خۆیدا هەست پێکرد.

لە ناکاو وەك ئەوەی لۆمەی بکات لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڵام ئاخر ئەو لە کوێیە؟ بۆ من لەگەڵ ئەو هەموو داخ و دیقە بەجێ دێڵێ؟» لە بیریشی نەبوو کە خۆی بوو ئەوەی پێوەندیی بە کوڕەکەیەوە بوو لەوی دەشاردەوە. کەسێکی نارد بۆ لای و داوای لێکرد کە هەرچی زووتر بێت بۆ لای. دەیویست هەموو شتێکی پێبڵێ و بە دڵەکوتەیەکی زۆرەوە چاوەڕوان دانیشت و لە زەینی خۆیدا بە دوای وەشەیەکدا دەگەڕا کە بەکاری بێنێ و بیری لە خۆشەویستی دەربڕینەکانی ئەو دەکردەوە کە دەبێتە هۆی ئۆخژن و دڵدانەوەی. راسپێردراوەکە گەڕایەوە و وەڵامی هێنا کە ڤرۆنسکی میوانی هەیە، بەڵام زۆر زوو دەگاتێ و بە راسپاردەکەی گوتبوو لە ئانا بپرسێ دەتوانێ پرێنس یاشڤین لەگەڵ خۆیدا بێنێ کە هاتبوو بۆ پترزبۆرگ؟ ئانا لە دڵی خۆیدا گوتی «بە تەنیاش نایەت، ئەگەرچی لە دوێنێ نیوەڕۆوە چاوی پێمنەکەوتووە. ئەویش لەگەڵ یاشڤین دێ کە ناتوانم ئەوەی لە دڵمدایە پێیبڵێم.» لە ناکاو بیرێکی سەیر بە مێشکیدا هات: ئەگەر ئیتر خۆشی نەوێم، چ بکەم؟

کە رووداوەکانی چەند رۆژی رابردووی لە زەینی خۆیدا لێکدایەوە وایبۆچوو کە هەموو ئەوانە نیشاندەری ئەوەن کە ناهەقی نییە بیرێکی ئاوا تاڵ و ترسناك مێشکی دابگرێ. وەبیری هاتەوە کە دوێشەو شێوی لەگەڵ نەخواردبوو، هەروەها پێداگریی لەسەر ئەوەش کردبوو کە لە

پترزبۆرگ لە یەکتر جیا بن و ئەو ئێستاش نایەت و وەك ئەوەوایە کە نایهەوێ بە تەنیا لەگەڵی بەرەورِوو بێت و دەبێ حەتمەن کەسێکی لەگەڵ بێت.

بەخۆی گوت «بەڵام ئەو دەبێ پێمبڵێ. من دەبێ ئەوە بزانم. دەبێ بۆم مەعلووم بێ بۆ ئەوەی بزانم دەبێ چ بکەم.» ئەو قسانەی دەکرد ونەیدەتوانی بیهێنێتە بەرچاوی خۆی کاتێك ئەو وازی لێبێنێ تووشی چ بارودۆخێك دەبێ. پێیوابوو ڤرۆنسکی ئیتر خۆشی ناوێت، هەستی بە هیوابراوی دەکرد و لە ناخەوە ئۆقرەی لێهەڵگیرابوو. زەنگی لێدا کە خزمەتکارەکەی بێت، خۆشی هەستا و رۆیشت بۆ ژووری خۆجوانکردن. لەگەڵ گۆرِینی جلەکانی زیاتر لە پێشوو بە خۆی راگەیشت و هەوڵیدا خۆی برِازێنێتەوە. دەتگوت پێیوایە ئەگەر ڤرۆنسکی خۆشینەوێت و لێیسارد بێتەوە، ئەگەر بەو جلوبەرگ و جوانکاری و بسکە خاوەوە بیبنێ دیسان عاشقی دەبێتەوە.

زرِەی زەنگەکە هەستا و ئەو هێشتا ئامادە نەبووبوو.

کاتێك چووە ژووری میوانداری دیتی ڤرۆنسکی چاوی لێناکات بەڵام هەستی بە روانینی یاشڤین کرد. ڤرۆنسکی چاوی لە وێنەی کورِەکەی ئانا دەکرد کە لەسەر مێزە چکۆڵەکە بەجێی هێشتبوو، بۆیە هیچ لە بیری ئەوەدا نەبوو کە سەرنجی ئانا بدات.

ئانا دەستە ناسکەکەی بۆ تەوقە نایە دەستی زەلامی یاشڤین، کە حەپەسابوو (کە ئەو حاڵەتەش لەگەڵ قەڵافەتی زەلحۆرت و ئێسکگرانییەکەی ناسازگار بوو.) و گوتی: ئێمە یەکتر دەناسین. لە کاتی کێبەرکێی ئەسپسواریی پارەکەوە ـ بە توندی وێنەکانی سریۆژای لە دەستی ڤرۆنسکی راپسکاند و چاوێکی لێکرد، چاویشی ترووسکەیەکی مانادار لێهەستا و گوتی: بێنە بزانم! ـ دیسان رووی لە یاشڤین کرد و بە روویەکی خۆش و بە زەردەخەنەوە لێیپرسی: کێبەرکێی ئەمساڵ باش بوو؟ من ئەمساڵ لە رۆم چووم بۆ دیتنی کێبەرکێی ئەسپسواری سپریسی کۆرسۆ[27]. هەڵبەت ئێوە ژیانی دەرەوەی وڵاتتان پێخۆش نییە. من ئەگەرچی ئێوەم زۆر نەدیوە، بەڵام لەگەڵ حاڵوباڵی ئێوە ئاشنام و لە حەز و سەلیقەکانتان دەگەم.

یاشڤین سووچی چەپی سمێڵی بە ددان گەست و گوتی: زۆر بە داخەوەم. چونکە زۆربەی سەلیقەکانی من خراپن.

---

27- Korso

یاشڤین دوای ئەوەی ماوەیەك لەگەڵ ئانا قسەی کرد، تێگەیشت کە ڤرۆنسکی لە کاتژمێرەکەی دەڕوانێ. لە ئانای پرسی تا کەنگێ لە پترزبۆرگ دەمێنێتەوە؟ هەر بەو قەڵافەتە زەبەلاحەشەوە داهاتەوە و کڵاوەکەی هەڵگرتەوە.

ئانا بە پەرۆشییەوە لە ڤرۆنسکیی روانی و گوتی: لەوەناچێ زۆر بمێنینەوە!

یاشڤین گوتی: دەی کەوابێ ئیتر چاومان پێتان ناکەوێت؟ ـ هەستا و رووی لە ڤرۆنسکی کرد و لێیپرسی: تۆ بۆ نانی نیوەڕۆ لەکوێ دەبی؟

ـ بۆ نیوەڕۆ تۆش وەرەوە بۆ ئێرە. ئانا ئەوەی زۆر جیددی و قایم دەربڕی، دەتگوت رقی لەو پەرۆشییەی خۆی هەستاوە، بەڵام وەکوو هەموو جارێك کە لەلای کەسێکی تازە پێوەندیی خۆی لەگەڵ ڤرۆنسکی ئاشکرا دەکرد، سوورهەڵدەگەڕا: خواردنی ئێرە زۆریش تاریف هەڵناگرێ" بەڵام چاکییەکەی لەوەدایە کە چاوت بە ئەو دەکەوێ. ئەلکسی لەنێو هاوقەتارانیدا تۆی لە هەمووان خۆشتر دەوێ.

یاشڤین زەردەیەکی گرت و گوتی: زۆرم پێخۆشە. ڤرۆنسکی بە گرژینەوەکەیدا تێگەیشت کە ئانای کەوتۆتە بەردڵ.

یاشڤین کڕنۆشێکی کرد لە ژوورەکە چووەدەرێ. ڤرۆنسکی کەوتە دواوە. ئانا پێیگوت: تۆش دەڕۆی؟

ڤرۆنسکی وەڵامی دایەوە: هەر ئێستا وەدرەنگ کەوتووم ـ رووی لە یاشڤین کرد و گوتی: تۆ بڕۆ من پێتدەگەمەوە.

ئانا قۆڵی گرت و چاوی لە چاوی بڕی، تێیدەڕوانی و هەوڵی دەدا رستەیەك بدۆزێتەوە و پێیبڵێ بۆ ئەوەی لەلای خۆی رایگرێ.

ـ پەلە مەکە، دەبێ شتێکت پێبڵێم ـ دەستی گرت و بە سینگی خۆیەوە گوشی، گوتی: پێمبڵێ بزانم، پێت ناخۆش نییە خۆ بۆ نانی نێوەڕۆ خولکم کرد؟

ڤرۆنسکی بە بزەیەك کە ددانە سپی و رێکوپێکەکانی وەدیار کەوتن لەسەرخۆ گوتی: زۆر کارێکی باشت کرد! ـ دەستی ئانای گرت و ماچی کرد.

ئانا بە هەردوو دەستی، دەستی ڤرۆنسکیی گوشی و گوتی: ئەلکسی دەڵێی گۆڕاوی و لێمزیزی. ئەلکسی من لێرە زۆر ئازار دەکێشم. کەنگێ لێرە دەڕۆین؟

ـ زۆر زوو، زۆر زوو دەڕۆین! تۆ نازانی ژیانی ئێرە چەندە بۆ من دژوارە ـ ئەوەی گوت و دەستی لە دەستی ئانا دەرکێشا.

ئانا ڕەنجاوانە گوتی: باشە بڕۆ، بڕۆ ـ بەپەلەش لێی دووركەوتەوە.

## سی و دوو

كاتێك ڤرۆنسكی گەڕایەوە بۆ ماڵێ ئانا هێشتا نەهاتبۆوە. گوتیان تاوێك دوای ڕۆیشتنی ئەو خاتوونێك هاتووە و ئانا لەگەڵی ڕۆیشتووە. ئەوەی كە ئانا ڕۆیشتووە و نەیگوتووە بۆ كوێ دەچێ، ئەوەی هێشتا نەگەڕابۆوە، ئەوەی كە ئەو ڕۆژە بەیانیش چووە بۆ شوێنێك و پێینەگوتووە، دەچێ بۆ كوێ، هەموو ئەوانە و لەگەڵ ئەوانەشدا حاڵەتی نائاساییی ڕوخساری و ئاكاری ئاڵەتییانەی ئەو كاتەی كە لە هەنتەشی یاشڤیندا وێنەی كوڕەكەی لە دەستی ڕاپسكاندبوو، لە گۆمی خەیاڵدا ئەوقی كرد. بەخۆی گوت كە حەتمەن دەبێ قسەی لەگەڵدا بكات و ئەو مەسەلەیە ڕوون بكاتەوە. بەڵام ئانا بە تەنیا نەگەڕایەوە و پووری، واتە پرێنسس ئابلۆنسكایاشی لەگەڵ خۆی هێنابوو كە كچێكی قەیرە بوو. ئەویش ڕاست ئەو خاتوونە بوو كە ئەو ڕۆژە سەرلە بەیانی هاتبوو و ئانا لەگەڵیدا ڕۆیشتبوو بۆ نێو بازاڕ. ئانا دەتگوت ئاگای لە حاڵەتی نیگەرانی و پڕپرسیاری ڕوخساری ڤرۆنسكی نەبووە و بە نەشەیەكی زۆرەوە دەستیكرد بە باسكردنی گەڕانی ئەو ڕۆژە و لە بازاڕ چیی كڕیوە. ڤرۆنسكی دەیدی كە ئانا گۆڕانێكی تایبەتی بەسەردا هاتووە. چاوانی گەشی، كاتێك كە لەوی دەڕوانی، سەرنجێكی قووڵیان تێدا بەدی دەكرا و وتە و هەڵسوكەوتیشی ئەو هەڵەشەیی و نازە تایبەتەی پێوە دیاربوو كە لە سەرەتای ئاشنایەتی و نزیكییاندا شێت و شەیدای كردبوو. بەڵام ئێستا ترس و خەمی خستبووە دڵییەوە.

مێزی فراوێن بۆ چواركەس ئامادەكرابوو. هەموو ئامادەبوون كە بچن بۆ ژووری چكۆڵەی میوانداری كە تۆشكڤیچ هات و لەلایەن پرێنسس بێتسییەوە پەیامێكی بۆ ئانا هێنا. پرێنسس بێتسی داوای لێبووردنی كردبوو كە نەیتوانیوە بۆ خوداحافیزی بێت بۆ لایان. ناساغ بوو و داوای لە ئانا كردبوو كە لەنێوان كاتژمێر شەش و نیو و نۆدا بچێت بۆ سەردانی. ڤرۆنسكی كە بیستی بێتسی كاتی دیدارەكەی ئاوا بە وردی دیاریكردووە و دیاربوو كە بەرنامەیەكی داڕشتووە بۆ ئەوەی لەو كاتەدا ئانا لە ماڵی ئەوان چاوی بە هیچ كەس نەكەوێت، بۆیە چاوێكی لە ئانا كرد. بەڵام وێدەچوو ئانا سەرنجی ئەو خاڵەی هەر نەدابێ.

ئانا تەنانەت بە بزەیەکی کەمڕەنگەوە گوتی: بەداخەوە من ڕاست لەو سەعاتەی شەش و نیو و نۆدا ناتوانم بۆ هیچ شوێنێك بچم.

ـ پرێنسس دڵی لێت دێشێ.

ـ دەی منیش هەروا.

تۆشکڤیچ گوتی: حەتمەن دەچی گوێ لە ئاوازی پاتی بگری.

ـ پاتی؟ چاکبوو باست کرد. نەمدەزانی. ئەگەر بمتوانیبایە بلیتی لۆژ وەدەست بخەم، حەتمەن دەچووم.

تۆشکڤیچ گوتی: من دەتوانم بۆتان وەگیر بخەم.

ئانا گوتی: من زۆر زۆرتان سپاس دەکەم و ئەو چاکەیەتم لە بیرناچێ. بۆ نیوەڕۆ لێرە نامێنیتەوە؟

ڤرۆنسکی زۆری نەمابوو شانی لێهەڵتەکێنێ. بەڕاستی سەری لە کارەکانی ئانا دەرنەدەچوو. بۆچی ئەو پرێنسسە پیرەی لەگەڵ خۆی هێناوە؟ بۆچی بۆ نانی نیوەڕۆ تۆشکڤیچ گلدەداتەوە و لە هەمووشی سەیرتر بۆچی دەینارد بلیتی لۆژی بۆ بگرێ؟ چۆن دەیتوانی بیری لێبکاتەوە کە ئەو لەو بارودۆخەی ئێستایدا دەیهەوێ بچێ بۆ شوێنێك کە هەموو ئاشنا و ناسیاوەکانی لەوێن؟ بچێت بۆ گوێگرتن لە ئاوازی پاتی؟ بە توندی چاوێکی لێکرد، بەڵام ئانا بە ڕوانینێکی رووهەڵماڵدراوانە کە شادی و بێهیوایی تێیدا شانبەشان بوون، وەڵامی ڕوانینەکەی دایەوە و ڤرۆنسکی نەیتوانی لە مانای ئەو ڕوانینە بگات. کاتی نانخواردن ئانا هێندە بە نەشە بوو کە ڤرۆنسکیی تووشی دڕدۆنگییەکی تاڵ کردبوو. دەتگوت پێوەیە دڵی تۆشکڤیچ و یاشڤین بڕفێنێ. کاتێك لەسەر مێزی نانخواردن هەستان و تۆشکڤیچ چوو بۆ شانۆ تاکوو بلیتی لۆژ بۆ ئانا وەرگرێ و یاشڤین دەیویست جگەرەیەك بکێشێ، ڤرۆنسکی لەگەڵی چووە ژوورەکەی خۆی لە نهۆمی خوارێ، تاوێکی کەم لەگەڵ یاشڤین دانیشت و بەپەلە هاتەوە بۆ ژوورەکەی ئانا. ئانا لەو ماوە کورتەدا خێرا جلەکانی گۆڕیبوو و کراسێکی ئارمووشیی ڕوونی پەراوێز مەخمەری لەبەرکردبوو کە لە پاریس بە دوورینی دابوو و بۆیان ناردبۆوە. پێسیری کراسەکە زۆر گەورە بوو، بەجۆرێك کە سنگ و بەرۆکی رووت و ئاوەڵا بوو. پرچی بە تۆڕێك رازاندبۆوە و دەتگوت دەموچاوی لە قاڵب گیراوە و جوانی و سپی و سۆڵێیەکەی جوانتر خۆی دەنواند.

ڤرۆنسکی هەوڵی دەدا کە چاوی لێنەکات، گوتی: تۆ هەر بەڕاستی دەتهەوێ بچی بۆ شانۆ؟

ئانا کە دیتی دیسان ڤرۆنسکی چاو لە روخساری ناکات، بە زیزی گوتی: بۆ ئاوا تۆقیوانە پرسیار دەکەی؟ بۆ نابێ بچم بۆ شانۆ؟

وەك ئەوە وابوو كە لە مانای پرسیارەكەی ڤرۆنسكی نەگەیشتبێ.

ڤرۆنسكی نێوچاوانی تێكنا و گوتی: هەڵبەت هیچ هۆكارێك بۆ ئەوە نییە كە نەچی.

ئانا واینواند كە لە توانجەكەی نەگەیشتووە، بە دەم هەڵكێشانی دەستەوانە ملدرێژ و بۆنخۆشەكانییەوە گوتی: دەی منیش هەر ئەوە دەڵێم.

ڤرۆنسكی راست بەو لەبزە كە زەمانێك مێردەكەی قسەی لەگەڵدا كردبوو، دەدوا" وەك ئەوەی بیهەوێ وریایی پێبدات و لە مەترسییەك ئاگاداری بكاتەوە، گوتی: ئانا، تۆ خودا پێمبڵێ چبووە، بۆ ئاوا دەكەی؟

ـ تێناگەم دەڵێی چی، مەبەستت چییە؟

ـ تۆ خۆشت زۆر باش دەزانی كە نابێ بچیت.

ـ بۆ نابێ بچم؟ خۆ بە تەنیا ناچم. پرێنسس ڤارڤارا چووە جلەكانی بگۆڕێ، ئەو لەگەڵم دێت.

ڤرۆنسكی بە سەرسووڕمان و هیوابڕاوییەوە شانی هەڵتەكاند.

ـ هەر بەڕاستی تۆ نازانی كە... ـ بەڵام ئانا قسەكەی پێبڕێ و دەنگی هەڵبڕی: نا، نامەوێ بزانم! نامەوێ! لەو كارەی كردووشمە پەشیمان نیم. نا، نا سەد جار نا، ئەگەر بڕیاربووایە لە سەرەتاوە دەست بكەمەوە بە ژیان، دیسان ئەو كارەم دەكرد. بۆ ئێمە، یانی بۆ من و بۆ تۆ، تەنیا شتێك گرینگە، ئەویش ئەوەیە كە ئێمە یەكترمان خۆش دەوێ یان نا؟ هەموو فیكر و خەیاڵەكانی تر پووچ و بێجێن. بۆ ئێمە جیا لە یەكتر ژیان دەبەینەسەر؟ بۆ نابێ یەكتر ببینین؟ بۆ نابێ من بچم بۆ شانۆ؟ ـ چاوی كە بریقەیەكی كەمڕەنگی تێدا دەدرەوشایەوە، بە زمانی فەڕەنسی گوتیشی: من تۆم خۆش دەوێ و هەتا تۆ نەگۆڕێی من كارم بەسەر هیچ شێتكەوە نییە. بۆچی چاو لە من ناكەی؟

ڤرۆنسكی چاوی لێكرد. جوانیی روخسار و رازاوەیی بەژنو باڵای زۆر لێكدەكاڵانەوە و هەمیشە بەدڵی بوو، بەڵام ئێستا ئەو جوانی و رازاوەییە راست ئەو شتە بوو كە تووڕەی دەكرد.

ڤرۆنسكی بە زمانی فەڕەنسی گوتی: هەستی دڵی من قەت ناگۆڕدرێ، خۆشت ئەوە دەزانی، بەڵام تكات لێدەكەم مەچۆ. لێت دەپاڕێمەوە ـ لەبز و راوێژی نەرمی لالانەوەی پێوە دیاربوو، بەڵام روانینی ساردوسڕ بوو.

ئانا دەنگی ئەوی نەدەبیست بەڵام روانینە ساردەكەی دەدی و بە چاو وەڵامی دایەوە:

ـ من تكات لێدەكەم بۆم روون بكەیتەوە كە بۆ نابێ بچم؟

ـ چونكە ئەوە لەوانەیە بۆ تۆ... ـ بەڵام بێدەنگ بوو.

ـ هیچ تێناگەم. یاشڤین لەوانەیە ببێتە هۆی ئابڕوو بردنم؟ پرێنسس ڤارڤاراش لە خەڵکی خراپتر نییە. فەرموو ئەوە خۆشی هاتەوە.

**سی و سێ**

ڤرۆنسکی بۆ یەکەم جار دڵی لە ئانا پیس کرد و تەنانەت بە هۆی ئەوەی کە بە ئانقەست لە بارودۆخی خۆی نەدەگەیشت لە دڵەوە رقی لێی هەستابوو، چونکە نەشیدەزانی هۆی تووڕەییەکەی دەربڕێ، زیاتر لە ناخەوە هەستی دەکرد ئەو داخە خەریکە هەڵیدەچۆقێنێ. ئەگەر بیویستبایە ئەوەی لە دڵیدایە بە راشکاوی پێیبڵێ، دەیگوت «ئەگەر بەو شێوە و سەروسیمایەوە لەگەڵ پرێنسسێك کە هەموو دەیناسن بچیتە شانۆ و خۆت بنوێنی، نەك نیشاندەری ئەوەیە کە خۆت وەك ژنێکی نانەجیم و سووك وەدەر دەخەی، بەڵکوو جۆرێك بێڕێزی و سووکایەتی و لچهەڵقورتاندنە لە جەماوەر و هەروەها پشتهەڵکردنە لە کۆمەڵگا بۆ هەمیشە.»

بەڵام نەیدەتوانی ئەو قسەیە بکات. بە خۆی گوت «بەڵام چۆن دەبێ لەوە نەگات؟ بێژی چۆن بیر بکاتەوە؟» هەستی دەکرد خەریکە رێزی لە دڵیا خۆ لە کەمی دەدا و لەگەڵ ئەوەشدا زیاتری جوانییەکەی بۆ دەردەکەوت.

بە نێوچاوانێکی گرژەوە رۆیشتەوە بۆ ژوورەکەی خۆی و لە پەنا یاشڤین دانیشت کە لاقە درێژەکانی لەسەر کورسییەك راکێشابوو و کۆنیاك و ئاوی گازداری دەخواردەوە، دەستووریدا لەو خواردنەوانە بۆ ئەویش بێنن.

یاشڤین سەری بۆ لای وەرسووڕاند و چاوێکی لەنێو چاوانە تاڵ و عەبووسەکەی کرد و گوتی: تۆ باسی تیژڕەوی لاندۆڤسکێت[28] دەکرد. کە ئەسپێکی زۆر باشە و من بە باشی دەزانم کە بیکڕی. راستە کەفەڵی شل و داچۆڕاوە، بەڵام دەست و لاق و سەری قسەی لەسەر نییە. لەوە چاکتر چیت دەوێ؟

ڤرۆنسکی وەڵامی دایەوە: رەنگە بیکڕم.

باسی ئەسپ و ئەسپسواری مێشکی بە خۆیەوە خەریك کرد، بەڵام خولەکێکیش لە فیکری ئانا خافڵ نەدەبوو، بێ ئیختیار گوێی بۆ ترپەی ئەو هەنگاوانە شل دەکرد کە بە داڵانەکەدا تێدەپەڕین، سات بە سات چاوی لە کاتژمێری سەر سۆباکە دەکرد.

---

28- Landovsky

ـ ئانا ئارکادیۆڤنا فەرموویان بێمە خزمەتتان و عەرزتان بکەم کە تەشریفیان برد بۆ شانۆ.

یاشڤین پەرداخێکی تری کۆنیاك کردە نێو ئاوی گازدارەوە و نایبەسەرەیەوە. پاشان هەستا و دوگمەی لیباسەکانی هەڵپێکا.

گوتی: چاکە، ئیتر دەڕۆین؟ ـ کە ئەو قسەی دەکرد بزەیەکی کەمڕەنگ سمێڵی بزواند و بەو بزەیە دەیویست ڤرۆنسکی تێگەیێنێ کە هۆی پەرۆشییەکەی دەزانێ چییە، بەڵام هەمییەتی پێنادات.

ڤرۆنسکی بە روویەکی ناخۆشەوە وەڵامی دایەوە: من نایەم.

ـ بەڵام من دەبێ بڕۆم، وادەم داناوەـ پاشان لەگەڵ چوونەدەرێ لە وەتاغەکە گوتی: دەی، کەوایە خوداحافیز. بەڵام تۆش وەرە. مەگەر حەز ناکەی بێیتە لۆژ کورسییەکەی کراسینسکی لەو پێشەوە بگرەوە بۆ خۆت.

ـ نا من کارم هەیە.

یاشڤین کاتێك لە هوتێل چووەدەرێ لە دڵی خۆیدا دەیگوت «ژنهێنان ئەو دەردەسەرانەشی بە دواوەیە، بەڵام کاتێك بەرانبەرەکەت ژن نەبێ پیسترت لێدەقەومێ.»

ڤرۆنسکی کە بە تەنیا مایەوە لەسەر کورسییەکە هەستا و دەستیکرد بە پیاسەکردن بە نێو ژوورەکەدا.

بەخۆی دەگوت «با بزانم بەرنامەی ئەمڕۆ چییە؟ شەریکایەتیی ژمارە چوارە. براکەم و ژنەکەشی لەوێن. حەتمەن دایکیشم لەوێیە. یانی هەموو کەسایەتییەکانی پترزبۆرگ لەوێ کۆ بوونەتەوە.» پاشان هێنایە بەرچاوی خۆی «ئێستا دەبێ چووبێتە ژوورێ و باڵتە کەڵپۆسەکەی داکەندووە و لەبەر شۆقی چراکان دانیشتووە.» تۆشکڤیچ و یاشڤین و پرێنسس ڤارڤاراش لە دەوری دانیشتوون. من لێرە چیدەکەم؟ یانی من دەترسم یان ئاگاداریی ئەوم بە یاشڤین سپاردووە؟ هەرچۆنێکی لێکبدەیەوە کارێکی گەوجانەیە... ئاخر بۆ منی تووشی ئەو تەنگژەیە کردووە.» ئەوەی گوت و دەستی هەڵتەکاند.

بەو کارە دەستی لە مێزە چکۆڵەکە درا کە شووشەی ئاوی گازدار و بتریی کۆنیاکی لەسەر بوو و خەریکبوو بیخات. ویستی بیانگرێتەوە و نەهێڵێ بکەون بەڵام خستی، لە داخانا لەقەیەکی لە مێزەکەدا و قامکی نا بە زەنگەکەدا.

بە بیستنی زڕەی زەنگەکە پێشخزمەتەکەی هاتەژوورێ و ڤرۆنسکی تەشەرێکی پێدادا: ئەگەر دەتهەوێ لە خزمەت مندا بی دەبێ ئەرکی خۆت بزانی. زووکە ئەوانە کۆکەوە. وەتاغ دەبێ خاوێن و رێکوپێك بێ.

پێشخزمەت کە بە هیچشێوەیەك خۆی بە خەتابار نەدەزانی دەیویست بڵێ خۆ هیچ هەڵەیەکی نەکردووە، بەڵام کە چاوێکی لە ئەربابەکەی کرد بە حاڵەتی روخساریدا تێگەیشت کە دەبێ بێدەنگ بێ و زمانی نەگەڕێ. گورج و ئازا کەوتە سەرچۆك و خۆیکرد بە ژێر مێزەکەدا و لیوانە ساغ و شووشە شکاوەکانی کۆکردەوە.

ـ ئەوە کاری تۆ نییە، پێشخزمەتی هوتێلەکە بنێرە با کۆیان بکاتەوە. خۆت فراکەکەی من ئامادەبکە لەبەری دەکەم.

ڤرۆنسکی سەعات هەشت و نیو چووە نێو هۆڵی شانۆکەوە. لە نیوەی بەرنامەکەدا گەیشتێ. پیرەپیاوێك کە بەرپرسی وەرگرتنی باڵتە و کەلوپەل بوو باڵتەکەی لێوەرگرت و کە ناسییەوە پێیگوت «حەزرەتی مەزن» پێشی گوت کە پێویست ناکات بۆ باڵتەکەی ژومارە وەرگرێ، تەنیا بانگ لە فیۆدۆر بکات. دالانە رووناکەکە جگە لە پیرەپیاوەکە و دوو پێشخزمەتی باڵتە بەدەست کەسی تری لێنەبوو. لە کەلێنی دەرگا نیوەکراوەکەوە دەنگی ئۆرکێسترا دەهات کە بە نەرمی ستاکاتۆیان دەژەنی و دەنگی ژنێك رستەیەکی مۆسیقای بە وردی دەچڕی. دەرگاکە کرایەوە و پیرەپیاوی بەرپرسی دیوی جلان هاتەدەرێ و بەپەلە تێپەڕی و ڤرۆنسکی تێکستی گۆرانییەکەی بە جوانی بیست. بەڵام دەرگاکە لەڕێوە پێوەدرایەوە و ڤرۆنسکی کۆتاییی رستە شێعرەکە و کادانسی نەبیست. بەڵام بە دەنگی چەپڵەڕێزانی ئەو دیوی دەرگاکەدا تێگەیشت کە کادانسەکە کۆتاییی پێهاتووە. کاتێك گەیشتە تەلاری رووناك بە چلچرا و مەشغەڵی گازی گرمەوهەرا و چەپڵەڕێزان هەروا بەردەوام بوو. خاتوونی گۆرانیبێژ، کە شانوملی رووت و یاقووتی خەناوکەکەی بریقەی دەهات، بە پێکەنینەوە بەرەوڕووی تەماشاچییان داهاتبۆوە و بە یارمەتیی گۆرانیبێژی تێنۆر کە دەستی گرتبوو، ئەو چەپکە گوڵانەی کۆدەکردەوە کە تەماشاچییان بەسەر گولۆپی سەکۆکەدا بۆیان فڕێ دابوو و دەهات بۆ لای پیاوێك کە قژە رۆنلێدراو و بریقەدارەکەی لەنێوەڕاستدا لادابوو و دەستە درێژەکانی لەودیوی گولۆپی سەرسەکۆکەوە هێنابووە پێشێ و دەیویست شتێکی بداتێ، دەهاتە پێشێ و تەواوی تەماشاچییان لەنێوەڕاستی هۆڵەکە و لەسەر لۆژەکانەوە کەوتنە جموجۆڵ و بۆ پێشەوە کۆم بووبوونەوە و چەپڵە و بالۆرەیان لێدەدا. رێبەری ئۆرکێسترا لەسەر سەکۆ بەرزەکەوە یارمەتییدا تاکوو دیاریی پیاوە تەماشاچییەکە بە شوێنی خۆی بگەیێنێ و پاشان بۆینباخە سپییەکەی خۆی راستەوپاستە کرد. ڤرۆنسکی چووە نێو هۆڵەکەوە، راوەستا و دەستیکرد بە چاوگێڕان بە دەوروبەریدا. ئەمڕۆ کەمتر لە هەموو کاتێکی تر ئەم شوێنەی بەلاوە ئاشنابوو و

کەمتر سەرنجی سەکۆ و چەپڵە و هەرا و تەواوی ئەو رەوەی رەنگانەی تەماشاچییە نادڵگرەکانی نێو هۆڵی شانۆکەی دەدا کە جمەیان دەهات. لە لۆژەکان ئەو چەشنە خاتوونانەی جاران دانیشتبوون و لە پشت سەریشیانەوە وەك جاران ئەفسەرەکان، هەر ئەو ژنە جلوبەرگ رەنگینانە و پیاوە یۆنیفۆرم و پڕاك لەبەرانە کە خودا دەیزانی کێن و لە کوێوە هاتوون و ئاپۆرەی پیسی تەماشاچییانی تێکترینجاو لەسەر بانجێڵەکانی سەرێ. لەنێو ئەو ئاپۆرەی خەڵکە و لۆژەکان و کورسییەکانی ریزی پێشەوە، لە چل کەس زیاتر ژن و پیاوی ئاکارجوان وەبەرچاو نەدەکەوت. لەو قاقڕەدا سەرنجی ڤرۆنسکی لەڕێوە بۆ لای ئەوان راکێشرا و پێوەندیی لەگەڵ دامەزراندن.

کاتێك ڤرۆنسکی چووە ژوورێ پەردەی یەکەم تەواوبووبوو و هەر بەو هۆیەش نەچوو بۆ ئەو لۆژەی کە براکەی لێیدانیشتبوو، بەڵکوو خۆی گەیاندە ریزی یەکەم و لە پەنای سیرپووخۆڤسکۆی مایەوە، کە پشتی کردبووە پەردەکە و بە پێوە چۆکی نووشتاندبۆوە و بە دیوارەی سەکۆکە زەربی لێدەدا و کە لە دوورەوە چاوی بە ئەو کەوت بە زەردەیەکەوە بانگیکرد بۆ لای خۆی.

ڤرۆنسکی هێشتا ئانای نەدیبوو. بەڵام دەیزانی لە کوێوەیە و بەقەستی چاوی لەلای ئەو نەدەکرد. بێ ئەوەی لەو بگەڕێ وازر و ئاگاداری دەوروبەری خۆی بوو، بەڵام هەوڵی دەدا ئاکاری بە شێوەیەك بێ کە سەرنجی کەس رانەکێشێ. لە ترسی ئەوەی نەوەك خراپترین گریمانەی وەڕاست بگەڕێ بە لاچاوێك بۆ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەگەڕا. بەڵام بەختەوەرانە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئەو شەوە نەهاتبوو بۆ شانۆکە.

سیرپووخۆڤسکۆی گوتی: ئیتر رەنگوبۆی ئەرتەشت پێوە نەماوە، زیاتر لە دیپلۆمات و هونەرمەند یان لەوجۆرە شتانە دەچی.

ڤرۆنسکی زەردەیەکی گرت و بە هێمنی دووربینی شانۆی لە گیرفانی دەرهێنا و گوتی: بەڵێ، هەر گەیشتمەوە ماڵێ لەڕێوە فڕاکم لەبەرکرد و هاتم.

ـ دانی پێدا دەنێم کە ئێرەیی بە ژیانی ئێستای تۆ دەبەم ـ ئاماژەی بە ڤاکسیلەکەی کرد و درێژەی پێدا: لەوکاتەوە لە هەندەران گەڕاومەتەوە و ئەم جلوبەرگەم لەبەرکردووە ئاخ بۆ ئازادیم هەڵدەکێشم.

سیرپووخۆڤسکۆی لەمێژ بوو چاوپۆشیی لە هێنانەوەی ڤرۆنسکی بۆ نێو ئەرتەش کردبوو، بەڵام وەك رابردوو خۆشی دەویست و ئێستا زۆر مێهرەبان بوو لەگەڵیدا.

ـ حەیفێ درەنگ هاتی بەشی یەکەمت نەدی.

ڤرۆنسکی سەرسەرەکی گوێی بۆ راگرتبوو و دووربینەکەی لە لۆژەکانی نهۆمی یەکەمەوە بۆ دووهەم گوێستەوە کە گرینگایەتییەکی زیاتری هەبوو و دەستیکرد بە تەماشاکردنی لۆژەکان. لە پەنا خاتوونێکدا کە کلاوێکی مەندیل شێوەی لەسەر نابوو، پیرەپیاوێکی سەرتاس دانیشتبوو کە بە تووڕەیی چاوی لە شووشەی دووربینەکە دەکرد و دیاربوو پێیناخۆشە بەرەولای ئەوان گیراوە، لە ناکاو سەری ئانای دی کە بە جوانییەکی سەرنجڕاکێشەوە و بە تۆڕ و قردێلە و گوڵەسوورەوە دەتگوت دەموچاوی لە قەتحە گیراوە، بە پۆز و دەمارێکی شاهانەوە بزەی دەهاتێ. ئانا لە لۆژی پێنجەم دانیشتبوو و نزیکەی بیست هەنگاوی لێدوور بوو. لە ریزی پێشەوە دانیشتبوو و سەری بۆ لایەك خوار کردبۆوە و قسەی لەگەڵ یاشڤین دەکرد. حاڵەتی راگرتنی سەری و شانوملە جوان و ناسکەکەی و ترووسکەی هەیەجانی شاراوە لە چاوانیدا و گەشانەوەی روخساری، بێ سێ و دوو بیرەوەریی دیداری کۆڕی سەماکەی مۆسکۆی لە زەینیدا زیندوو کردەوە. بەڵام هەستی ئەمڕۆی ئەو سەبارەت بەو جوانییە لەگەڵ هەستی ئەو کاتەی زۆر زۆر جیاواز بوو. هەستی ئەمڕۆی هیچ شتێکی نهێنی و رەمزاویی پێوە نەبوو و هەر بەو هۆیەش جوانیی ئانا، ئەگەرچی زیاتر دڵی دەڕفاند، بەڵام لەلایەکی ترەوە چزەی لە رۆحی هەڵدەستاند و دەیڕەنجاند. ئانا بۆ لای ئەوی نەدەڕوانی بەڵام ڤرۆنسکی هەستی دەکرد کە ئەوی دیوە.

ڤرۆنسکی کە دووربینەکەی دیسان بردەوە سەر ئانا تێگەیشت کە پرێنسس ڤارڤارا سوورسوورهەڵگەڕاوە و بە پێکەنینێکی ساختەوە بەردەوام دەڕوانێتە لۆژەکەی تەنیشتیان. بەڵام دیتی ئانا باڕۆشەکەی بەستووە و پێی لە دیوارەی مەخمەری و سووری بەردەمی خۆی دەدا و چاوی لە شوێنێك بڕیوە، بەڵام هیچی نەدەدی و دیاربوو کە ناخوازێ ئەوەی لە لۆژی تەنیشتیان رادەبرێ، بیبینێ، روخساری یاشڤینیش راست وەك ئەو کاتە وابوو کە لە قوماردا دەیدۆڕاند. رووی گرژ کردبوو و سووچی چەپی سمێڵی خۆی دەکرۆشت و بە لاچاوێك و مۆڕەوە چاوی لە لۆژەکەی تەنیشتیان دەکرد.

لای چەپی لۆژەکە بنەماڵەی کارتاسۆڤی لێدانیشتبوو. ڤرۆنسکی ئەوانی دەناسی و دەیزانی کە ئانا لەگەڵ ئەوان ناسیاویی هەیە. خاتوو کارتاسۆڤ کە ژنێکی وردیلە و لاواز بوو پشتی لەوان کردبوو و لە لۆژەکەی خۆی راوەستابوو، خەریکبوو کەڕکەی لەسەر شانی راستەوپاستە دەکرد کە مێردەکەی بۆی گرتبوو. رەنگی بە رووەوە نەمابوو و روخساری تاڵی غەزەبی لێدەباری و بە هەیەجانەوە دەدوا. کارتاسۆڤ کە پیاوێکی

زەبەلاح بوو، سەرە بێتووکەکەی بەردەوام دەسووڕاند و چاوی لە ئانا دەکرد. چاوانی بە شوێن سەرنجی ئاناوە بوون و دیاربوو دەیویست کڕنۆشێکی بۆ بەرێت. بەڵام ئانا دیاربوو بەقەستی چاوی لێناکات و ئاوڕی بۆ دواوە دابۆوە شتێکی بە یاشڤین دەگوت کە سەرە بێتووکەکەی هێنابووە پێشێ. کارتاسۆڤ بێ ئەوەی کڕنۆشی بۆ بەرێ لە لۆژەکە هاتە خوارێ و چووەدەرێ.

ڤرۆنسکی نەیدەزانی چی لەنێوان ئانا و بنەماڵەکەی کارتاسۆڤدا رووی داوە، تەنیا بۆی دەرکەوتبوو کە هەرچییەك بووبێ بۆ ئانا سووکایەتیئامێز بووە. ئەو بە دیتنی ئەو شتانەدا کە روویاندەدا تێدەگەیشت، بەتایبەت بە ئەدگار و هەڵسوکەوتی ئانادا تێگەیشت کە بە هەموو توانایەوە هەوڵ دەدات ئەو رۆڵەی گرتوویەتە ئەستۆ هەتا کۆتایی درێژەی پێبدات و ئەم رۆڵی بەڕواڵەت لەسەرەخۆییەی بە جوانی دەگێڕا. هەرکەس کە ئانا و دەوروبەرییەکانی نەناسیبایە و بیبیستایە کە ژنان چۆن بە دڵسۆزی و رق و بێزاری و سەرسووڕمانەوە کردوویانەتە بەرلۆم کە ئاوا بە ئاشکرا و رووهەڵماڵدراوانە خۆی لە گوڵ داوە و هاتۆتە نێو کۆڕی نەجیمزادانەوە، ئافەرینی پێدەگوت و بە هیچ جۆرێك پێی وانەبوو هەستی کەسێکی لە دڵدایە کە ناوی بە خراپە زڕاوە و بۆتە بنێشتەخۆشکەی سەرزاران.

ڤرۆنسکی سوور دەیزانی کە رووداوێك قەوماوە و نەیدەزانی ئەو رووداوە بەڕاستی چبووە و بەو هۆیەوە تووشی رەنج و نیگەرانی بووبوو، بە هیوای وەدەستهێنانی هەواڵ چوو بۆ لۆژی براکەی. بە ئانقەست بەو رێڕەوەدا رۆیشت کە بەبەر لۆژەکەی ئانادا تێدەپەڕی. کاتی چوونەدەرێ تووشی فەرماندەی پێشووی هەنگەکەی بوو کە لەگەڵ دوو کەس لە ئاشناکانی قسەی دەکرد. ڤرۆنسکی بیستی کە چۆن بە دەنگی بەرز ناوی کارنینایان دێنا و گوێی لێبوو کە چۆن فەرماندەی هەنگەکەی بە تاڵووکە و بەدەنگی بەرز بانگیکرد و چاوێکی ماناداری لەو کەسانە کرد کە قسەیان دەکرد.

فەرماندەی هەنگ گوتی: دەی ڤرۆنسکی، تۆ کەنگێ دێی بۆ هەنگەکەمان؟ تۆ هاوڕێمانی و هەتا ژەمێك نەبیتە میوانمان ناهێڵین بەجێمان بهێڵی.

ڤرۆنسکی گوتی: زۆر بەداخەوەم. ئێستا دەرفەتم نییە، باشە بۆ جارێکی تر ـ ئەوەی گوت و بەپەلە بە قاڵدرمەکاندا وەسەر کەوت تاکوو بچێت بۆ لۆژی براکەی.

کۆنتسی پیر، دایکی ڤرۆنسکی، کە چینی پرچە ماشوبرینجییەکەی بریقەی دەهات لە لۆژی براکەی دانیشتبوو. ڤارڤارا و پرێنسس ساراکینا لە دالانی نهۆمی دووهەم تووشی بوون.

ڤاریا کە پرێنسسی هێنا بۆ لای کۆنتس دەستی شووبراکەی گوشی و خێرا دەستیکرد بە گێڕانەوەی باسێك کە ڤرۆنسکی دەیویست لێیئاگاداربێ. ڤاریا زۆر شڵەژابوو، بەجۆرێك کە ڤرۆنسکی زۆر کەمی ئاوا دیتبوو.

گوتی: من پێموایە ئەوە ئەوپەڕی سووکایەتییە. بەڕاستی زۆر کردەوەیەکی قێزەونە. خاتوو کارتاسۆڤا هەقی ئەوەی نەبوو کە خاتوو کارنینا....

ـ بۆ چی بووە؟ من ئاگادارنیم.

ـ چۆن؟ نەتبیستووە؟

ـ خۆت دەزانی کە هیچ کەس خەبەری ئاوا بە من نادات.

ـ پێموانییە هیچ کەس بەقەد ئەو کارتاسۆڤایە سووکوچرووك بێ:

ـ بۆچیی مەگین چیی کردووە؟

ـ مێردەکەم بۆی باسکردم... ئەو سووکایەتیی بە خاتوو کارنینا کردووە. وادیارە مێردەکەی لەودیوی دیوارەی لۆژەکەوە دەستیکردووە بە قسەکردن لەگەڵ ئانا کارنینا و کارتاسۆڤا کە ئەوەی دیوە لەگەڵ مێردەکەی دەمقرەیان لێ پەیدابووە و هەستاوە دەستیکردووە بە شیتەشیت و ئەوەی بە دەمیدا هاتووە بە خاتوو کارنینای گوتووە و لە لۆژەکە چۆتە دەرێ.

پرێنسس ساراکینا سەری لە دەرگای لۆژەکە هێنا دەرێ و گوتی: کۆنت، دایەگیانت بانگت دەکات.

ڤرۆنسکی کە دیتی دایکی ناتوانێ بزەی شادانەی خۆی بشارێتەوە، بە ساردوسڕی گوتی: سڵاو دایەگیان هاتم بۆ خزمەتتان.

کاتێك پرێنسس ساراکینا قسەکەی لەگەڵ کۆنتس کۆتاییی پێهات، چووە ئەولاوە و دایکی پێیگوت: ***بۆ ناچی دڵی خاتوو کارنینا وەدەست بێنی؟ ڤالویەلای وەرێخستووە، چونکە ئەو لەو لۆژەیە ئیتر هیچ کەس گوێ بۆ پاتی راناگرێ.***

ڤرۆنسکی نێوچاوانی تێکنا و گوتی: ***دایەگیان*** من خۆ تکام لە ئێوە کردبوو کە لەو بارەوە قسەی لەگەڵ نەکەن.

ـ من قسەیەك دەکەم کە هەمووان دەیکەن.

ڤرۆنسکی وەڵامی نەدایەوە و یەکدوو قسەی لەگەڵ پرێنسس ساراکینا کرد و لە لۆژەکە چووەدەرێ. کاتێك لە دەرگاکە دەچووەدەرێ لووتی بە لووتی براکەیدا تەقی.

براکەی گوتی: ئا، ئەلکسی! چ ژنێکی سووکوچرووکە! ژنەتیوە تەواو شێتو وێتە! هیچی تێدا نەهێشتۆتەوە... هەر ئێستا دەمویست بچم بۆ لای. وەرە با بە یەکەوە بچین.

ڤرۆنسکی گوێی پێنەدا و بەپەلە بە پلیکانەکاندا رۆیشتە خوارێ. هەستی دەکرد کە دەبێ کارێك بکات، بەڵام نەیدەزانی چ بکات. رقو دڵسۆزی سەبارەت بە ئانا کە تووشی ئەو کێشە و بارودۆخەی کردبوو خستبوویانە تەنگژە و فەرتەنەیەکی رۆحییەوە. رۆیشتە خوارێ و راست خۆی گەیاندە لۆژەی نهۆمی یەکەم کە ئانا لەوێ دانیشتبوو. لە دەرگانەی لۆژەکەدا چاوی بە سترمۆڤ کەوت کە راوەستابوو و لەگەڵ ئانا قسەی دەکرد.

ـ ئیتر هیچ گۆرانیبێژێکی تێنۆری نییە کە شیاوی گوێلێگرتن بێ. ***چونکە رەچەڵەکیان لە بن هاتووە.***

ڤرۆنسکی سەرێکی بۆ ئانا نەوی کرد، راوەستا و دەستیکرد بە قسەکردن لەگەڵ سترمۆڤ.

ئانا رووی لە ڤرۆنسکی کرد و بە لەبزێکی کە بەلای ڤرۆنسکییەوە تەشەراویی دەنواند گوتی: ئێوە وادیارە درەنگ گەیشتوون و باشترین ئاوازەکانت نەبیستووە.

ڤرۆنسکی چاوێکی ماناداری لێکرد و گوتی: من ئاوازناسێکی باش نیم.

ئانا زەردەیەکی گرت و گوتی: پرێنس یاشڤینیش هەروایە. ئەویش لەسەر ئەو باوەڕەیە کە دەنگی پاتی زۆر بەرزە.

ڕیزی بەرنامەکان کە پسوولەیەك بوو و ڤرۆنسکی لەسەر عەرزی هەڵیگرتبۆوە بە دەستە ناسك و دەستەوانە تێکراوەکەی گرتی و گوتی: «سپاست دەکەم.» هەر لەو کاتەدا لەپڕ دەموچاوە جوانەکەی سوورهەڵگەڕا، هەستا و رۆیشت بۆ ئەوسەری لۆژەکە.

ڤرۆنسکی لە ماوەی ئاوازی دووهەمدا کە دیتی لۆژەکەی ئانا چۆڵە، هەستا و لەگەڵ دەربڕینی نارەزایەتی لەلایەن تەماشاچییانەوە کە بۆ بیستنی دەنگی کاواتینی بێدەنگ بووبوون لە تالارەکەوە بەرزبۆوە. ئیتر رانەوەستا و راست رۆیشتەوە بۆ هوتێل.

کاتێك ئەو گەیشتەوە ئانا گەڕابۆوە. کە چووە ژوورەکەی ئانا، ئانا بە تاقیتەنیا بوو و جلەکانی هۆڵی شانۆی لەبەری دانەکەندبوو و لەسەر کورسیلەیەکی پاڵ دیوارەکە دانیشتبوو، چاوی بڕیبووە خاڵێکی نادیار. چاوێکی لێکرد و خێرا کەوتەوە سەر حاڵەتەکەی پێشوو.

ڤرۆنسکی گوتی: ئانا!

ئانا هەستا سەرپێ و بە دەنگێکی گڕو گریاناوی و رقهەستاوانە گوڕاندی: هەمووی خەتای تۆیە.

ـ من تکام لێکردی، لێت پاڕامەوە کە نەچی. من دەمزانی ناخۆش دەبێ بۆت...

ئانا گوڕاندی: ناخۆش دەبێ؟ ناخۆشی چی، ترسناك بوو. هەتا ئەو رۆژەی دەمرم ئەو کاتەم لە بیرناچێت. پێشی گوتم دانیشتن لای من بە شوورەیی دەزانێ.

ـ ئەوە قسەی ژنێکی هەرزەی نەفامە. بەڵام بۆ پیاو لەگەڵ ژنێکی گەمژە و ناهیر تێکەوێ؟...

من لەو هێمنایەتییەی تۆ بێزارم. تۆ نەدەبوایە منت تووشی ئەم بارودۆخە بکردایە. تۆ ئەگەر منت خوش بویستبایە....

ـ ئانا ئەوە چ پێوەندییەکی بە ئەشقی منەوە هەیە؟

ئانا بە نیگایەکی ترس لێنیشتووەوە چاوی لە چاوی بڕی و گوتی: بۆ، ئەگەر ئەو جۆرەی من تۆم خۆش دەوێ تۆش ئاوا منت خۆش بویستبایە، ئەگەر وەك من تۆش ئەم بارودۆخە ئازاری بدایەی...

ڤرۆنسکی دڵی پێیسووتا و هەر لەوکاتەدا لێشی دڵمەند بوو. متمانەی پێدا کە خۆشیدەوێ چونکە دەیدی کە تەنیا لەو رێگایەوە دەتوانێ ئارامی بکاتەوە و قسەی رەقی پێنەگوت بەڵام لە دڵەوە سەرکۆنەی دەکرد.

ئانا بە گیانودڵ ئەو قسانەی دەبیست کە بە نەرمونیانی دڵخۆشیی دەدایەوە و خاترجەمی دەکرد، بەڵام ڤرۆنسکی زۆری بەلاوە قۆڕ بوون و تەنانەت بە شەرمەزارییەوە دەریدەبڕین. رۆژی دوایی بە تەواوی ئاشت بوونەوە و رۆیشتن بۆ گوند.

# یەك

داریا ئەلکساندرۆڤنا لەگەڵ منداڵەکانی هاوینی لە پاکرۆسکۆی و لەلای کیتی لەڤینا تێپەڕ کرد. چونکە خانووبەرەی نێو مڵکەکەی خۆی وەکوو کاولاشی لێهاتبوو، لەڤین و ژنەکەی پێملیان کرد کە هاوین لەلای ئەوان بمێنێتەوە. ستیپان ئارکادیچ ئەوەی زۆر پێخۆش بوو. دەیگوت سەدحەیف کاری دایرە ناهێڵێ ئەویش هاوین لەلای ژن و منداڵەکانی بێت و لە گوند بیگوزەرێنێ و لەو خۆشییە گەورەیە بێبەش دەبێت و ناچارە لە مۆسکۆ بمێنێتەوە و جاروبار یەکدوو رۆژ دێت بۆ ئاوایی. هاوینی ئەوساڵە، جگە لە دالی ئابلۆنسکایا و منداڵەکانی و پەرەستارەکەیان و هەروەها پرێنسسی گەورە کە بە ئەرکی خۆی زانیبوو ئاگاداری لە کچە بێئەزموونەکەی بکات لەو ***بارودۆخە هەستیارەدا*** کە دووگیان بوو، ڤارنکای هەڤاڵی کیتیش، کە لە هەندەران لەگەڵی ئاشنابووبوو، بەڵێنی خۆی بردبووە سەر و کە بیستبووی کیتی زەماوەندی کردووە هاتبوو بۆ سەردانی. ئەوانە هەمووی بنەماڵە و ئاشنایانی کیتی بوون و لەڤین ئەگەرچی هەموویانی خۆش دەویست، تۆزێك دەکەوتە ژێر گوشاری داخ و پەژارەوە و دڵی بەخۆی دەسووتا کە کەسوکارەکەی خۆی ساردوسڕن و سیلەیڕەحمیان لە دڵدا نییە و خۆی گوتەنی، لە سێڵاوی کەسوکاری ژنەکەشیدا ئەوق بووە. ئەوساڵە هاوین لە خزموکەسانی تەنیا سرگی ئیڤانڤیچ هاتبوو بۆ سەردانی کە ئەویش برای هەقی نەبوو، بەڵکوو دایکبرای بوو و دەچۆوە سەر بنەماڵەی کازنیشۆڤ، بۆیە دەکرا بڵێی بەرەی لەڤین بەجارێ وشکاوی هاتبوو و کەسانی تر جێیان گرتبوونەوە.

ماڵەکەی کە لەمێژ بوو چۆڵوهۆڵ و بێمیوان و گیلان بوو، ئێستا وا قەرەباڵغ بووبوو کە ئیتر ژوورێکی خاڵی نەمابۆوە و پرێنسسی گەورە هەموو رۆژێ کاتێك لەسەر مێزەکە دادەنیشتن هەموو نەوەکانی دەبژارد و دوایین منالیان کە سێزدەهەمی بوو لەسەر مێزێکی چکۆڵە بەجیا دایدەنا و کیتی لە کاروبارەکانی ماڵێدا هەوڵی دەدا و دابینکردنی مریشك و قەل و مراوی و عەلەشیش بە ئەندازەی پێویست کارێکی سانا نەبوو کە بتوانێ ئەو هەموو زگە برسییەی پێتێر بکات.

هەموو ئەندامانی بنەماڵە لەسەر مێزی فراوێن دانیشتبوون و منداڵەکانی دالی و پەرەستارەکەیان و ڤارنکا خەریکی داڕشتنی گەلاڵەیەك بوون کە بۆ کۆکردنەوەی کارگ بچن بۆ کوێ. سرگی ئیڤانڤیچ کە هەمووان ڕێزیان بۆ زانیاری و تێگەیشتووییەکانی دادەنا هاتە نێو باسی قارچکەکەوە و بە قسەکانی هەمووانی تووشی سەرسووڕمان کرد.

چاوێکی لە ڤارنکا کرد و گوتی: منیش لەگەڵ خۆتان بەرن، زۆرم حەز لێیە قارچك کۆ بکەمەوە. پێموایە رابواردنێکی خۆشە.

ڤارنکا سوورهەڵگەڕا و وەڵامی دایەوە: دەیباشە وەرە. زۆریشمان پێخۆشە.

کیتی چاوێکی ماناداری لە دالی کرد و گوتی: پێشنیاری سرگی ئیڤانڤیچی وریا و زانا بە ڤارنکا بۆ ئەوەی بیبەن لەگەڵ خۆیان بۆ کۆکردنەوەی کارگ ئەو خەیاڵانەی وەڕاست گێڕا کە ماوەیەك بوو لە زەینی خۆیدا دەیهێنا و دەیبرد. لەڕێوە دەستیکرد بە قسەکردن لەگەڵ دایکی بۆ ئەوەی روانینە ماناداره‌کەی بە شێوەیەك بشارێتەوە و بەو چاوە تەماشای خوشکی نەکات.
سرگی ئیڤانڤیچ دوای نانی نیوەڕۆ بە پەرداخی قاوەکەیەوە لەبەر پەنجەرەی ژووری میوانداری دانیشت و چووەوەسەر درێژەی ئەو باسەی کە لەگەڵ براکەی دایمەزراندبوو، بەڵام چاوی لەسەر ئەو دەرگایە هەڵنەدەگرت کە منداڵەکان دەیانویست لەوێوە بڕۆن بۆ سەحرا. لەڤین لەسەر لێواری پەنجەرەکەوە لە نزیك براکەی دانیشت.

کیتی لە پاڵ مێردەکەیدا راوەستابوو، چاوەڕوانی کۆتاییهاتنی باسێك بوو کە حەزی نەدەکرد بەشداریی تێدا بکات و دیاربوو دەیویست شتێکی پێبڵێ.

سرگی ئیڤانڤیچ کە دیاربوو زۆر گوێی لە درێژەی باسەکە نییە، بە بزەیەکەوە چاوی لە کیتی کرد و بە براکەی گوت: تۆ لەو کاتەوە ژنت هێناوە لە زۆر بارانەوە باشتر بووی، بەڵام پێداگریی زۆرت لەسەر بەرەڤانی لە بیروڕا دژوازەکانت هەروا لەجێی خۆیەتی.

سرگی ئیڤانڤیچ کە چاوی بە منداڵەکان کەوت بە هەڵەداوان دەهاتنە ژووری، گوتی: وادیارە ئیتر کاتمان نییە درێژە بە باسەکەمان بدەین.

تانیا لە پێش هەموانەوە بوو و گۆرەوییەکانی هەتا لای چۆکی هەڵکێشابوو و قەرتاڵەیەکی بە دەستێکەوە گرتبوو، کڵاوەکەی سرگی ئیڤانڤیچیشی بە دەستەکەی ترەوە رایدەوەشاند و بە هەڵاتن دەچوو بۆ لای.

چاوانی کە لە چاوە جوانەکانی باوکی دەچوون دەدرەوشانەوە و بەبێ ئەوەی شەرم بکات هەڵات بۆ لای سرگی ئیڤانڤیچ، کڵاوەکەی بردە پێشێ و واینواند کە دەیهەوێ خۆی بیکاتە

سەری، بزەیەکی نەرم و شەرمێونانەی گرت و وای لە سرگی ئیڤانڤیچ کرد کە رووهەڵماڵدراوی و هەوەسەکەی دامرکێتەوە.

کە بە گرژینەوەی سرگی ئیڤانڤیچدا بۆی دەرکەوت ئیجازەی پێدەدا کڵاوەکەی لەسەرنێ، زۆر بە ئارامی کردییە سەری و گوتی: ڤارنکا چاوەڕوانی ئێوەیە.

ڤارنکا جلەکانی گۆڕیبوو و کراسێکی چیتی زەردی لەبەرکردبوو و لەچکەیەکی سپیی لەسەری پێچابوو.

سرگی ئیڤانڤیچ پاشماوەی قاوەکەی هەڵقووڕاند و دەسرە و قوتووی جگەرەکەی هەرکام لە گیرفانێکینا و گوتی: ئەوە هاتم، ئەوە هاتم ڤارڤارا ئاندرێیۆڤنا.

لەگەڵ هەستانی سرگی ئیڤانڤیچ کیتی بە مێردەکەی گوت: دیوتە ئەو ڤارنکایەی من چ کچێکی جوان و خوێنشیرینە! ـ ئەو قسەیەی واکرد کە سرگی ئیڤانڤیچ گوێی لێبوو و دیاربوو ئەویش مەبەستی هەر ئەوەبوو: جوانە و جوانییەکەشی شاهانەیە! ـ بە دەنگی بەرزیش گوتی: ڤارنکا، ئێوە دەچن بۆ نێو دارستانی ئاشەکە؟ ئێمەش دواتر دێین بۆلاتان.

پرێنسسی گەورە بە هەڵەداوان دەرپەڕییە دەرێ و گوتی: کیتی، تۆ بارودۆخی خۆت نازانی. چەند جارم پێگوتووی بە دەنگی بەرز قسە مەکە.

ڤارنکا کە دەنگی کیتی و لۆمەکردنی دایکی گوێ لێبوو بە هەنگاوی سووك و خێرا هاتە پێشێ. هەڵەشەبوون و سوورهەڵگەڕانی دەموچاوی نیشاندەری ئەوەبوو کە تووشی دڵەخورپە و ترسێکی گەورە بووە. کیتی دەیزانی ئەو ترس و دڵەخورپەیە بۆ چییە و بە وردی خستبوویە ژێر چاوەدێری. ڤارنکای تەنیا بەو مەبەستە بانگکردبوو تاکوو بۆ رووداوێکی گرینگ کە ئەم دوانیوەڕۆیە لەنێو دارستانەکە دەقەوما لە دڵەوە دۆعا بکات و تەبەڕۆکی بداتێ.

بەدەم ماچکردنەوە چرپاندی بە گوێیدا: ڤارنکا، من زۆر بەختەوەرم، بەڵام ئەگەر رووداوێك بقەومێ لەوەش بەختەوەرتر دەبم.

ڤارنکا تریق بۆوە و واینواند کە ئەوەی پێیگوتووە نەیبیستووە، لە لەڤینی پرسی: تۆش لەگەڵمان دێی؟

ـ دێم، بەڵام تەنیا هەتا لای خەرمانەکە و لەوێ دەمێنمەوە.

کیتی گوتی: جا بۆ لەوێ دەمێنیتەوە؟

ـ دەبێ چاوێك لە عارەبانە تازەکان بکەم و بیانبژێرم. تۆ دەچی بۆکوێ؟

ـ دەچم بۆبەر هەیوانەکە.

## دوو

ژنەکان هەموویان لە بەرهەیوانەکە کۆبووبوونەوە. ئەوان بە شێوەیەکی ئاسایی حەزیان دەکرد دوای نانی نیوەڕۆ لەوێ دانیشن، بەڵام ئەمڕۆ کاریشیان نەبوو. جگە لە دوورینی جلوبەرگی زارۆك و چنینی دەسرازە کە هەموویان پێوەی سەرقاڵ بوون، ئەمڕۆ لەوێ مرەباشیان دەکوڵاند و بە جۆرێك کە بۆ ئاگافیا میخائیلۆڤنا شتێکی تازە بوو، یانی بەبێ ئاوێتەکردنی ئاو. کیتی ئەو جۆرە مرەباکۆڵاندنەی لە ماڵی دایکی باو بوو دەیویست لێرەش تاقیی بکاتەوە. ئاگافیا میخائیلۆڤنا، کە پێشتر کوڵاندنی مرەبای لە ئەستۆ بوو، لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەو چەشنە مرەباکوڵاندنەی لە زووەوە لە ماڵی لەڤین باو بووە زۆر شتێکی باش بووە و هیچ کەس ئیرادی لێنەگرتووە. ئێستاش بەبێ سەرنج بەو داخوازییەی خاتوو کیتی ئاوی تێکەڵ شلیك و توودڕکەکە کردبوو، چونکە خاترجەم بوو کە بەبێ ئاو دروستکردنی مرەبا مەحاڵە. بۆیان دەرکەوتبوو نافەرمانیی کردووە و ئێستا مرەبای تووتڕکەکەیان لەبەرچاوی هەمووان دەکوڵاند تاکوو بە ئاگافیا میخائیلۆڤنا بسەلمێنن کە مرەبا بەبێ ئاو جوانتر دەردەچێ.

ئاگافیا میخائیلۆڤنا بە نێوچاوانێکی گرژ و عەبووس و قژی ئاڵۆزەوە مەنجەڵی بە قۆڵەکز و هەتا هەنیشك هەڵکراوەکانی لەسەر وەجاخەکە ئەمباروبار دەکرد و بە دڵگرانییەوە چاوی لە تووتڕکی نێو مەنجەڵەکە بڕیبوو و لە ناخی دڵەوە ئاواتەخواز بوو بە نەکوڵاوی توند بێتەوە. پرێنسسی گەورە هەستی دەکرد کە ئاگافیا میخائیلۆڤنا دەبێ زۆری لێدڵمەند بێت، چونکە پیرێژنە دەیزانی ئەو چەشنە مرەبا کوڵاندنە بە شێوەی نوێ بەپێی تەگبیری ئەو بووە، بۆیە هەوڵی دەدا وابنوێنێ کە سەرقاڵی کارێکی ترە و گوێ بە تووتڕك نادات و باسی مەبەستێکی تری دەکرد، بەڵام بە لاچاوێك لە مرەباکەی دەڕوانی.

درێژەی بە وتووێژەکەیاندا و گوتی: من بۆ جلوبەرگی خزمەتکارەکانم خۆم پارچە دەکڕم و زۆریش بە هەرزان ـ رووی قسەی لە ئاگافیا میخائیلۆڤنا کرد و گوتی: کاتی نەهاتووە

گیانەکەم، کەفەکەی بگرن؟ ـ دەستی کیتی گرت و گوتی: لێیگەڕێ ئەوە کاری تۆ نییە. لای ئەو وەجاخە گەرمە.

دالی هەستا و گوتی: لێیگەڕێ بۆ من ـ ئەسکوێیەکی هەڵگرت و زۆر بە ئەسپایی دەستیکرد بە گرتنی کەفی سەر مرەباکە و جارجار ئەسکوێکەی دەکێشا بە دەورییەکدا تاکوو ئەوەی پێوەی نووساوە لێیببێتەوە، دەورییەکەش بە کەفی رەنگاوڕەنگ و زەرد داپۆشرابوو و شەربەتی سوور وەکوو خوێن لەژێر دەورییەکەدا شۆلاوگەی بەستبوو. دالی وەبیر دەورانی منداڵیی خۆی کەوتەوە و لەوە سەری سووڕما کە گەورەکان بۆ ئەو کەفە خۆشەی سەر مرەبا ناخۆن، هەروەها بیری لەلای منداڵەکانی خۆی بوو کە چەندە تامەزرۆیانە کاتی خواردنی ژەمەخوێڕی دەیلێسنەوە.

پاشان هاتەوە سەر مەبەستی دیاری پێدانی خزمەتکاران کە تاوێك لەمەوبەر باسیان دەکرد و زۆری بە شتێکی باش و سەرنجڕاکێش دەزانی و گوتی: ستیڤا بڕوای وایە کە باشترین کار ئەوەیە کە پارەیان پێبدەین، بەڵام....

پرێنسسی گەورە و کیتی یەکدەنگ گوتیان: پارەی چی؟ ئەوانە دیارییان زۆر لەلا بایەخدارترە.

پرێنسسی گەروە گوتی: چاکە بڕوانن، من ساڵی رابردوو پارچەیەکی وەك پۆپرینمدا بە ماتریۆڤنا سیمۆنۆڤنای.

ـ لەبیرمە. بۆ جێژنی لەدایکبوونی ئێوە لەبەری کردبوو.

ـ زۆر پارچەیەکی جوان بوو. ساکار بوو بەڵام ماقووڵانە. ئەگەر بۆ ئەوم نەکڕیبایە حەزم دەکرد خۆم بیکەمە کراس. وەك کراسەکەی ڤارنکا، جوان و هەرزان.

دالی لەگەڵ ئەوەی خەریکبوو شیلەی مرەباکەی بە دەمی کەوچك دەچۆڕاندەوە، گوتی: چاکە، ئێستا وادیارە مرەباکە ئامادەیە.

پرێنسس گوتی: نا، لێیگەڕێ با تەواو خەست بێتەوە و کێشی بێت. ئاگافیا میخائیلۆڤنا، لێیگەڕێ با تۆزێکی تر بکوڵێ.

ئاگافیا میخائیلۆڤنا بە تووڕەیی گوتی: پەککوو لە دەست ئەو مێشانە، خەریکن چاومان دەرهێنن.

کیتی چاوی لە چۆلەکەیەك بڕیبوو کە لەسەر لاجامەی بەرهەیوانەکە نیشتبۆوە و دەنووکی لە قونچکی تووترکێك دەدا، لەناکاو گوتی: ئەیەڕۆ، چەندە جوانە! جەرگەکەم! تۆ خودا هەڵیمەفڕێنن!

دایکی گوتی: باشە، زۆر چاکە، بەڵام تۆ لە وەجاخەکە نزیك مەبەوە.

کیتی، وەك هەموو جارێك کە دەیانویست ئاگافیا میخائیلۆڤنا لە قسەکانیان تێنەگا، بە فەرەنسی گوتی: بەڵام سەبارەت بە ڤارنکا، دایەگیان. من ئەمڕۆ نازانی چەندە چاوەڕوانم کارەکە یەکلایی ببێتەوە. خۆ دەزانی مەبەستم چییە؟ ئاخ، چەندە خۆش دەبوو!

دالی گوتی: پەککوو لەو کیتییە بۆ رێکخستنی ژیانی هاوبەش چەند شارەزا و لێزانە! چەندە بەپارێز و شارەزاییەوە بە یەکیان دەگەیێنێ!...

ـ نا، دایەگیان، پێمبڵێ، ئێوە چۆن بیردەکەنەوە؟

ـ چۆن بیردەکەمەوە؟ ئەو (مەبەستی سرگی ئیڤانڤیچ بوو) هەمیشە دەیتوانی باشترین زاوای رووسیا بێتە ئەژمار. هەڵبەت ئیتر لاو نییە، لەگەڵ ئەوەشدا من دڵنیام کە ئێستاش زۆرن ئەوانەی بە ئاواتەوەن شووی پێبکەن... ڤارنکاش زۆر کچێکی باشە بەڵام ئەو دەیتوانی...

کیتی گوتی: نا دایەگیان، دەزانی بۆچی بۆ هیچ کامیان ناکرێ هاوسەرێکی تر لەبەرچاو بگری؟ ـ کە ئەوەی گوت دەستیکرد بە نووشتاندنەوەی یەك لەدوادی یەکی قامکەکانی و بژاردنی: یەکەم ڤارنکا زۆر کچێکی جوان و دڵڕفێنە.

دالی قسەکەی پشتڕاست کردەوە: راست دەکەی، ئەو زۆر ڤارنکای کەوتۆتە بەردڵ.

ـ دووهەم پلەوپایەی سرگی ئیڤانڤیچ لە کۆمەڵگادا هێندە بەرزە کە پێویست ناکات ژنەکەی خاوەن سامان یان لە بنەماڵەیەکی خانەدان بێ. ئەو تەنیا شتێکی دەوێ و ئەویش ژنێکی باش و دڵسۆز و حەیابەخۆیە.

دالی دیسان قسەکەی کیتی پشتڕاست کردەوە: بەڵێ، لەگەڵ ڤارنکا ژیانی هاوبەش پێکبێنێ دەحەسێتەوە.

ـ سێهەم ئەوەیە کە دەبێ خۆشیبوێ. خۆشیشی دەوێ... وەلحاسڵ زۆر خۆش دەبوو! چاوەڕێم لە دارستان بگەڕێنەوە. من هەر لەرێوە بە چاویاندا تێدەگەم. نازانی چەندە خۆشحاڵ دەبم! تۆ چۆن بیردەکەیەوە دالی؟

دایکی گوتی: باشە ئەوەندە خۆت بەوانەوە هیلاك مەکە، دڵەخورپە و هەیەجان بۆ تۆ باش نییە.

ـ هەیەجانیچی دایەگیان؟ من پێموایە سرگی ئیڤانڤیچ ئەمڕۆ پێشنیاری ژیانی هاوبەشی پێدەکات.

دالی کە خەیاڵ هەڵیگرتبوو بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: کاتێك پیاوێك پێشنیاری ژیانی هاوبەش بە کچێك دەکات، تووشی شێواوی و شڵەژانێکی سەیر دەبێ. تووشی شڵەژانیش دەبێت و ئەو کاتەش

که پێشنیارەکە دەکات زۆر کاتێکی خۆش و بێوێنەیە.... ـ رابردووی خۆی و ستیپان ئارکادیچی وەبیرهاتبۆوە: هەر دەڵێی دیوارێکت لەبەردەم دایە و کتوپڕ لادەچێت.

کیتی لە ناکاو پرسیی: دایەگیان، باوکم چۆنی پێشنیار بە تۆ کرد؟

پرێنسسی پیر گوتی: هیچ شتێکی نائاسایی نەبوو. زۆریش سادە بوو ـ لەگەڵ ئەوەشدا بە وەبیرهاتنەوەی ئەو کاتە روخساری سپی هەڵگەڕابوو.

ـ نا، بەڵام چۆن بوو؟ بەرلەوەی ئیجازەت هەبێ قسەی لەگەڵدا بکەی خۆشت دەویست یان نا؟

کیتی لەوەی کەی وەك ژنێکی خاوەن ماڵ و مێرد دەتوانێ لەگەڵ دایکی وەك دەستەخوشکێك سەبارەت بەو مەسەلە گرینگانەی ژیانی ژنان بدوێ، هەستی بە چێژ و خۆشییەکی تایبەت دەکرد.

ـ جا دیارە خۆشم دەویست. ئەو لە مڵکەکەمان دەهـات بۆ سەردانمان.

ـ بەڵام چۆنبوو پێوەندییەکەتان دامەزرا؟ دایەگیان.

ـ تۆ پێتوایە ئەو شتانە تۆ داتهێناوە؟ ئەوە لە قەدیمەوە بووە و هەر دەبێ. چاو و بزە خۆیان کاری خۆیان دەکەن.

دالی قسەکەی سەلماند: قسەکەت زۆر جوان بوو دایەگیان، هەر ئەوەیە چاو و بزە کاری خۆیان دەکەن!

ـ بەڵام ئەو چیی گوت بە ئێوە؟

ـ ئەی کۆستیا چیی بە تۆ گوت؟

کیتی گوتی: بە گەچ بۆی نووسیم. هەر دەڵێی تەمەنێك بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕیوە.

هەرسێکیان خەیاڵ هەلیگرتن. کیتی دوای تاوێك بێدەنگییەکەی شکاند. زستانی رابردووی بەر لە شووکردنەکەی وەبیرهاتەوە ڤرۆنسکی خەڵەتاندبووی.

گوتی: تەنیا شتێك هەیە ئەویش ئەشقی یەکەمی ڤارنکایە. من دەمویست بە شێوەیەك ئەوە بدەم بە گوێی سرگی ئیڤانڤیچدا کە ئامادەبێت ـ کیتی لە رێگای ئیلهامێکی رۆحی و سروشتییەوە ئەو فیکرە بە زەینیدا هات و درێژەی بە قسەکانیدا: پیاوان هەموو دڵپیسن و زۆر بە دژواری دەتوانن رابردووی ئێمە تامڵ بکەن.

دالی گوتی: هەموویان نا، تۆ لە چاو مێردەکەی خۆتەوە ئاوا دەڵێی. ئەو هێشتا بە بیستنی ناوی ڤرۆنسکی دەتاسێ، وانییە؟

کیتی نوقمی خەیاڵ، وەڵامی دایەوە: بەڵێ ـ تروسکەی بزەیەکی شیرین لە چاوانیدا درەوشایەوە.

پرێنسسی گەورە بۆ بەرەڤانی لەسەر پەستیی دایکانەی خۆی بەسەر کچەکانیدا هەستا و گوتی: بەڵام من تێناگەم. چ شتێکی رابردووی تۆ وێدەچێ دڵکرمۆڵی بکات؟ ئەوەی کە ڤرۆنسکی ویستوویەتی دڵی تۆ بەدەست بێنێ؟ کام کچ هەیە کە ئەو خوازبێنی و ئەشقانەی نەبووبێ؟

کیتی سوورهەڵگەڕا و گوتی: باشە، بەڵام ئێمە خۆ باسی ئەوە ناکەین.

دایکی درێژەی پێدا: نا، ئیجازە بدە. هەموو ئەوانە بەجێی خۆی، تۆ خۆت نەتهێشت لەگەڵ ڤرۆنسکی قسە بکەم. لەبیرتە؟

کیتی بە لەبزێکی ئازاراوییەوە گوتی: ئەیەڕۆ دایەگیان!

ـ رۆژگارەکە وایلێهاتووە پیاو ناوێرێ قسە لە قسەی کچاندا بکات، پێوەندیی تۆ لەگەڵ ئەو قەت وایلێنەدەهات لە چوارچێوەی شیاوی خۆی بترازێ. من خۆم پێشم پێدەگرت. بەڵام لەو قسانە گەڕێین کچم، هەیەجان و دڵەخورپە بۆ تۆ باش نییە. تکات لێدەکەم ئەوەت لە بیرنەچێ و هێمن و لەسەرەخۆ بە.

ـ من زۆر ئارام و لەسەرەخۆم دایەگیان.

دالی گوتی: کیتی بەختێکی باشی هەبوو و خودا ئانای بۆ گەیاند. بەڵام ئانا بە دەستی خۆی ئەو قوڕەی بۆ خۆی گرتەوە ـ خۆشی بەو فیکرەی هات بە زەینیدا تووشی سەرسووڕمان بوو و درێژەی پێدا: کارەکە راست پێچەوانە بۆوە. ئەو کاتە ئانا لەوپەڕی بەختەوەریدا بوو و کیتیش خۆی بە نێوچاوان رەش دەزانی. دیتووتە چۆن کارەکان چەواشە بوونەتەوە؟ من زۆر جار بیر لەو شتە دەکەمەوە.

دایکی کە نەیدەتوانی لە بیری بەرێتەوە کە کیتی ئاخری ڤرۆنسکیی وەلانا و شووی بە لەڤین کرد: پیاو قات بووە کە بیر لەوە دەکەیتەوە؟ ئەو ژنەتیوە رووڕەشە، ئاکار پیس و دلڕەقە!

کیتی بە دڵتەنگییەوە گوتی: ئەوە هیچ بابەتێکی تر نییە باسی بکەن لەوەتان هەڵپێچاوە؟ من بە هیچ جۆرێك بیری لێناکەمەوە و هەر ناشمهەوێ بیری لێبکەمەوە... کە ترپەی هەنگاوی ئاشنای مێردەکەی گوێ لێبوو بە پلیکانی هەیوانەکەدا دەهاتە سەرێ، دووپاتی کردەوە: حەز ناکەم هەر بیری لێبکەمەوە...

لەڤین گەیشتە بەرهەیوانەکە و پرسیی: چییە واناتەوێ بیری لێبکەیەوە؟

بەڵام هیچ کەس وەڵامی نەدایەوە و ئەویش ئیتر پرسیارەکەی دووپات نەکردەوە.

بە ناقایلییەوە چاوێکی لێکردن و کە زانیی سەبارەت بە مەبەستێك دەدوێن کە حەز ناکەن لە هەنتەشی ئەودا درێژەی پێبدەن گوتی: ببوورن کە پەڕیمە نێو کۆڕی ژنانەتانەوە.

بۆ ساتێك لەگەڵ ئاگافیا میخائیلۆڤنا پیرێژنی سەرسپی ماڵێ کە ناڕازی بوو لەوەی مرەبای تووتڕکەکەیان بەبێ ئاو کوڵاندووە، هەستی هاودەردیی دەبرد و دیتی بە هۆی

هورووژمی ئەو ئیشچر باتسکییە غەوارانەوە بۆ هەرێمی ژیانی دڵگران و بێزارە. لەگەڵ ئەوانەشدا زەردەیەکی گرت و ڕۆیشت بۆ لای کیتی.

هەر بەو چاوەی کە لەم ڕۆژانەدا لە کیتییان دەڕوانی تەماشای کرد و گوتی: دەی چۆنی؟

کیتی بە شیلەبزەیەکەوە گوتی: من، زۆر باشم. تۆ چۆنی؟

ـ دەزانی ئەو عەرابانە سێ هێندەی هیلینگە بار هەڵدەگرن، حەزدەکەی بچین بە دوای منداڵەکاندا؟ پێمگوتوون یەکێك لەو عەرابانە ئامادەبکەن.

پرێنسسی گەورە بە لۆمەوە گوتی: چۆن؟ دەتەوێ کیتی سواری عەرابە بکەی؟

ـ هێواش دەڕۆین پرێنسس، خەمت نەبێ.

لەڤین قەت وەکوو زاواکانی تر بە خەسووی نەدەگوت «دایەگیان» و پرێنسس ئەوەی بە دڵەوە گرتبوو. بەڵام لەڤین ئەگەرچی زۆری خەسووی خۆش دەویست بەڵام نەیدەتوانی بەو ناوەی دایکی خوالێخۆشبووی خەسووشی بانگ بکات.

کیتی گوتی: دایەگیان، ئێوەش لەگەڵمان وەرن.

پرێنسس گوتی: من حەز ناکەم چاوم بەو شێتبازارییەی ئێوە بکەوێ.

ـ باشە، من بە پێیان دەچم. ڕۆیشتن بە پێیان بۆ من زۆر باشە ـ هەستا و ڕۆیشت بۆ لای مێردەکەی و دەستی گرت.

پرێنسس گوتی: باشە، بەڵام بۆ هیچ کارێك نابێ زێدەڕەوی بکرێ.

لەڤین بە پێکەنینەوە بە ئاگافیا میخائیلۆڤنای گوت: دەی ئاگافیا میخائیلۆڤنا مرەباکەتان دروست کرد؟ ـ بۆ ئەوەی دڵی چاك بکاتەوە لێیپرسی: بەو شێوە نوێیە باشبوو یان نا؟

ـ ڕەنگە باشیش بێ، بەڵام بە بڕوای من زۆر دەکوڵێ.

کیتی کە لەڕێوە تێگەیشتبوو مەبەستی مێردەکەی چییە، بۆ سەلماندنی ویستەکەی ئەو، بە ئاگافیا میخائیلۆڤنای گوت: حەتمەن ئاوا باشتر دەبێ. ئاوا برش ناهێنێ. چونکە ئیتر سەهۆڵ نەماوە و جێگای فێنکیشمان بۆ ڕاگرتنی مرەبا نییە. بەڵام خەیارشۆر و ترشیاتەکانت ئەوەندە باشن کە دایکم دەڵێ قەتی شتی ئاوا خۆش نەخواردووە.ـ ئەوەی گوت و بە شیلەبزەیەکەوە لەچکەکەی سەری بۆ ڕاستەوپاستە کرد.

ئاگافیا میخائیلۆڤنا بە تووڕەیی چاوێکی لێکرد و گوتی: خاتوونی هێژا، پێویست ناکات دڵخۆشیم بدەیتەوە. هەر ئەوەندەی تۆ لەگەڵ ئەو دەبینم دڵم خۆشە. ئەو شێوە قسەکردنە دوور لە ئەدەبەی کە بەجێی «ئەوان» گوتبووی «ئەو» لە دڵی کیتی گرات هات.

ئاگافیا میخائیلۆڤنا تۆش لەگەڵمان وەرە دەچین بۆ کارگ. چونکە تۆ باشتر دەزانی کارگە باشەکان کامانەن و لەکوێ بیدۆزینەوە.

ئاگافیا میخائیلۆڤنا پێکەنی و سەری لەقاند. وەك ئەوەی بڵێ: حەزم دەکرد کە دڵم لێتان گەرد بگرێ، بەڵام ناتوانم.

پرێنسسی گەورە گوتی: تکایە ئەو کارەی پێمگوتن بیکەن. پەڕەیەك کاغەز بە شەڕابی شیرین بخوسێنن و لەسەر مرەباکەی دانێن. ئیتر بەبێ سەهۆڵ و جێگای فێنکیش برش ناهێنێ.

## سێ

کیتی زۆری پێخۆش بوو کە دەتوانێ تاوێ لەگەڵ مێردەکەی تەنیا بکەوێ، چونکە بۆی دەرکەوتبوو کاتێك لەڤین هاتبوو بۆ بەرهەیوانەکە و پرسیبووی باسی چی دەکەن و هیچ کەس وەڵامی نەدابۆوە، تەمی دڵتەنگی روخساری داگرتبوو کە وەك ئاوێنەیەکی بێغەور حالی دەروونی دەنواند.

کاتێك کە ئەوان بە پێیان لە پێش لە پێش ئەوانەوە دەڕۆیشتن و ئیتر لەماڵێوە دیارنەبوون و گەیشتنە ئەو رێچکە باریکەی کە گوڵە جۆ و دانی گژوگیای دیکەی پێدا بڵاو بووبۆوە کیتی زیاتر خۆی بە باسکی مێردەکەیدا هەڵواسی و بە خۆیەوە گوشی. لەڤین دڵتەنگییە زووتێپەڕەکەی خۆی لەبیربردبۆوە و ئێستا کە پێکەوە تەنیا کەوتبوون و بیری دووگیانییەکەی ئوقرەی لێهەڵگرتبوو، چێژێکی پاك و تازە و دوور لە هەوەس و هاودەم بوون لەگەڵ ژنە خۆشەویستەکەی دڵ و رۆحی داگرتبوو. هیچ قسەیەکیان بۆ گوتن شك نەدەبرد، بەڵام لەڤین حەزی دەکرد گوێی لە ئاوازی دەنگی ژنەکەی بێت کە وەك ئەندام و لەشولاری بە هۆی دووگیانییەوە گۆڕابوو. لە دەنگی و نیگاشیدا نەرمی و تۆکمەییی کەسانێکی پێوە دیاربوو کە بەردەوام لە بیری کارێکدان کە زۆری حەز پێدەکەن.

گوتی: ماندوو نەبووی؟ زیاتر خۆتم پێوە هەڵواسە.

ـ نا، من هێندە ئەو دەرفەتەم پێخۆشە کە لەگەڵ تۆم هەست بە هیچ ماندووبوون و بێتاقەتییەك ناکەم. ددانیشی پێدادەنێم لەلای ئەوان سەد هێندەش خۆش بگوزەرێ، دڵم هەر لەلای شەوانی زستانە کە دووبەدوو بووین و دەورمان قەرەباڵغ نەبوو.

لەڤین قۆڵی گوشی و گوتی: ئەو کاتە زۆر خۆش بوو، بەڵام ئێستا خۆشترە. ئەمیش خۆشە و ئەویش.

ـ دەزانی ئەو کاتەی هاتی بۆ بەرهەیوانەکە ئێمە باسی چیمان دەکرد؟

ـ باسی مرەبا؟

ـ ئەرێ باسی مرەبا بوو، بەڵام دواتر باسی ئەوەمان دەکرد کە پیاوان چۆن بە کچان دەڵێن و سازیان دەکەن.

لەڤین کە زیاتر گوێی بۆ ئاوازی دەنگی راداشتبوو نەك قسەکانی، گوتی: سەیرە! ـ بیری لەلای رێگاکە بوو کە ئێستا لەنێو دارستانەکەوە تێدەپەڕی، ئەویش هەوڵی دەدا بە جێگایەکی لەباردا بڕوات خۆ لە رێگای لێژ و کەندولەند ببوێرێ نەکا کیتی لاپا بکات و بکەوێت بە زەویدا.

کیتی درێژەی بە قسەکانیدا: سەبارەت بە سرگی ئیڤانڤیچ و ڤارنکا دەدواین. تۆ سەرنجت پێداوە؟... من زۆر حەزدەکەم ئەو کارە سەربگرێت. ـ چاوی لە چاوی بڕی و پرسی: تۆ لەوبارەوە چۆن بیردەکەیتەوە؟

لەڤین بە بزەیەکەوە وەڵامی دایەوە: نازانم بیر لە چی دەکەمەوە. سرگی ئیڤانڤیچ لەولایەنەوە بۆ من زۆر سەیرە، خۆ بۆم باسکردی...

ـ بەڵێ، ئاشقی کچێك بووە کە بە جحێڵی مردووە....

ـ هەڵبەت ئەو قسەیە باسی سەردەمێکە کە من منداڵ بووم. دواتر رووداوەکەم لە زاری خەڵکی بیست. ئەو کاتانەی ئەوم هەر لە بیرە. زۆر زۆر مێهرەبان بوو. لەو کاتەوە کاتێك لەگەڵ ئافرەتان بەرەوڕوو دەبێ دەیخەمە ژێر چاوەدێری. زۆر رووخۆشە لەگەڵیان. هێندێکیانی دەکەوێتە بەردڵ بەڵام پیاو واهەست دەکات ئەو مرۆڤبوونی ژنەکەی بەلاوە گرینگە و خوشی دەوێت نەك ژنبوونی.

ـ بەڵێ، بەڵام لەگەڵ ڤارنکا.... وێدەچێ زۆر جیددی بێ...

ـ بەڵێ، بەدوورنییە جیددیش بێت... بەڵام دەبێ بیناسی... مرۆڤێکی سەیرە. ژیانێکی زەینی و خەیاڵاویی هەیە. خاوەنی دڵێکی پاك و رۆحێکی بەرزە.

ـ مەگین عاشقبوون لەگەڵ دڵپاکی و رۆحبەرزی ناتەبایە و ناگونجێ؟

ـ نا، بەڵام هێندەی خوو بەو ژیانە زەینییە گرتووە کە ناتوانێ خۆی لەگەڵ راستییەکان رێك بخات. ڤارنکا، هەرچییەکە دنیاکەی دنیایەکی راستەقینەیە.

لەڤین ئیتر خووی بەوە گرتبوو کە بیر و بۆچوونەکانی خۆی بوێرانە دەربڕێت و ئیتر زەحمەتی بەخۆی نەدەدا کە دوای هەڵسەنگاندن و بیر لێکردنەوە بەیانی بکات. دەیزانی ژنەکەی لە کات و ساتی لێوڕێژ لە ئەشق و خۆشەویستیدا وەك ئەو کاتە بە جوانی لە مەبەستی دەگات و تەنیا ئاماژەیەکی بەسە.

ـ بەڵێ، بەڵام ئەو بەقەد من لەگەڵ راستییەکان تێکەڵ نییە. من باش تێدەگەم کە سرگی ئیڤانڤیچ هیچ کات ناتوانێ ژنێکی وەك منی خۆش بوێ. ڤارنکا سەرتاپای پاکییە...

ـ بە هەڵە چووی. ئەو زۆری تۆ خۆش دەوێ. منیش هەمیشە دڵخۆشم لەوەی کە خزموکەسانم تۆیان خۆشدەوێ...

ـ بەڵێ، ئەو دەرهەق بە من زۆر مێهرەبانە، بەڵام...

ـ بەڵام ئەو لەگەڵ نیکۆلنکای خوالێخۆشبوو زۆر جیاوازە ـ لەڤین بەو رستەیە کۆتاییی بە قسەی ژنەکەی هێنا، پاشان درێژەی پێدا: ئێوە زۆرتان یەکتر خۆش دەویست. بۆ بیشارمەوە؟ من هێندێ جار خۆم سەرکۆنە دەکەم و دەڵێم: ئاخری لە بیری دەبەیتەوە. ئاخ، نازانی چەندە مرۆڤێکی نابار بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە دڵەوە نزیکبوو!... ـ توزێ بێدەنگ بوو و گوتی: دەی، باسی چیمان دەکرد؟

کیتی قسەکەی ئەوی لە زمانی خۆیەوە دەربڕی: تۆ دەڵێی ئەو ناتوانێ ئاشق بێ.

لەڤین زەردەیەکی گرت و گوتی: نەك ئەوەی نەتوانێ ئاشق بێ، بەڵام ئەو هیچ کەمایەسییەکی نییە... من هەمیشە ئێرەییی پێدەبەم، تەنانەت ئێستاش کە ئاوا بەختەوەرم، لەگەڵ ئەوەشدا ئێرەییی پێدەبەم.

ـ ئەوەیکە ناتوانێ عاشق بێ ئێرەییی دەوێت؟

لەڤین بە پێکەنینەوە گوتی: ئێرەییەکەم بۆ ئەوە نییە کە ئەو لە من باشترە. ئەو بۆ خۆی دەژی. هەستی بەرپرسایەتی بەسەر ژیانیدا زاڵە. بەو هۆیە دەتوانێ رازی و دڵنیابێ.

کیتی بە بزەیەکی پڕخۆشەویستییەوە کە تەمی تەشەری پێوەبوو گوتی: تۆش؟

کیتی بە هیچ جۆرێك نەیدەتوانی ئەو فیکرەی کە بووبووە هۆی ئەو گرژینەوەیە، دەربڕێ. بەڵام قسەی کۆتاییی لەگەڵ خۆیدا ئەمەبوو کە مێردەکەی بە هۆی شەیداییەوە لە هەمبەر براکەیدا خۆی بە کەم دەزانی و لەو وتەیەی خۆیدا راستگۆ نییە. کیتی دەیزانی کە ئەم کەمایەسیی راستییە بە هۆی ئەو هۆگرییەوەیە کە بە براکەی هەیەتی و ئاکامی عەزاو ویژدانەکەشی ئەوەیە کە خۆی زۆر شیرینکام و بەختەوەرە و بەتایبەت بە هۆی حەزە

هەمیشەییەکەی لە ڕێگای پێگەیشتنی خۆیدا هەوڵ دەدا. ئەو ئەم ئاکارەی مێردەکەی زۆر بەدڵ بوو و بزەکەشی هەر بۆ ئەوە بوو.

هەر بەو بزەیەوە پرسیی: ئەی تۆ لە چی ناڕازیی؟

لەڤین کە دەیدی کیتی باوەڕی پێناکات چەندە لە خۆی ناڕازییە، خۆشحاڵ بوو و بێ ئیختیار وایلێدەکرد کە هۆی ناباوەڕییەکەی پێبدرکێنێ.

گوتی: من بەختەوەرم بەڵام لە خۆم رازی نیم.

ـ ئاخر تۆ ئەگەر بەختەوەری چۆن دەتوانی ناڕازی بی؟

ـ دەزانی چی؟ چۆنت پێبڵێم... ـ بێدەنگ بوو بۆ ئەوەی سەرکۆنەی بکات، کە بە گورجوگۆڵی بەسەر لقە دارێکی کەوتودا بازی دابوو گوتی: من لە ناخی دڵمەوە هیچ شتێکم ناوێ جگە لەوەی کە تۆ پێت لە هیچ شتێك هەڵنەکەوێ و نەکەوی بە زەویدا. ئاخر تۆ نابێ ئاوا باز بدەی. لەوەگەڕێین، کاتێك بیر لە خۆم دەکەمەوە و خۆم لەگەڵ خەڵك و بەتایبەت براکەم هەڵدەسەنگێنم بۆم دەردەکەوێ کە مرۆڤێکی باش نیم.

کیتی هەر بەو بزەیەوە درێژەی پێدا: بەڵام بۆچی؟ مەگین تۆش کار بۆ خەڵکی ناکەیت؟ ئەو مەزرایانەی دروستیان دەکەی، کشتوکاڵ، نووسین؟

ـ نا، من بەتایبەت ئێستا لە هەموو کاتێك زیاتر هەست بە خەتاباری دەکەم. هۆی ئەو خەتایەش تۆی ـ کە ئەوەی گوت قۆڵی گوشی: من سەرسەرەکی کار ناکەم. خۆزگە دەمتوانی ئەم کارانەم بەو ئەندازەیە خۆش بوێ کە تۆم خۆش دەوێ. بەڵام لەو دواییانەدا کار بۆ من وەکوو ئەرکێکی بەزۆری قورس و دژوارە.

کیتی پرسیی: ئەی بیروڕات سەبارەت بە باوکم چییە؟ ئەویش خراپە؟ چونکە هیچ دەروەستی ئەوەنییە کار بۆ خەڵکی بکات.

ـ ئەو؟ نا. پیاو دەبێ ساکاری و دڵپاکی و مێهرەبانی لە باوکی تۆوە فێربێت. ئێستا منیش ئەو شتانەم هەیە؟ من کار ناکەم و هەر بەو هۆیەش ئازار دەکێشم. هەمووی خەتای تۆیە. کاتێك تۆم نەبوو، بەتایبەت کاتێك ئەمە نەبوو...ـ کە ئەوەی گوت ئاماژەی بە زگی کیتی کرد و ئەویش لە مەبەستەکەی تێگەیشت:... تەواوی توانایی خۆم دەخستە کار. بەڵام ئێستا ناتوانم و بەو هۆیەوە وێژدانم نارەحەتە. کار بۆ من بارێکە و تەنیا خۆی پێوە رادەنێم...

کیتی گوتی: دەی حەزت دەکرد بتوانیبایە هەر ئێستا جێگای خۆت لەگەڵ سرگی ئیڤانۆڤیچ بگۆڕییەوە؟ حەزت دەکرد کار بۆ خەڵکی بکەیت و ئەو ئەرکە ئیجبارییەی خۆت بەدڵ بێت؟ کارەکەشت هەر ئاوا تەواوبێت؟

لەڤین گوتی: ئەوە هەرنا! جگە لەوەش من هێندە بەختەوەرم کە گێژ بووم و سەرم لە هیچ شتێك دەرناچێ. پاشان گوتیشی: ئێستا تۆ بەڕاستی پێتوایە سرگی ئیڤانڤیچ ڤارنکا ساز دەکات؟

ـ پێموایە و پێشم وانییە. بەڵام زۆرم پێخۆشە ئەو کارە بکات. ها، راوەستە ـ دانەوی و لە قەراغ رێگاکە لقێك گوڵی بەیبوونی هەڵکەند و گوتی: دەی، بیبژێرە سازی دەکات، سازی ناکات... ـ گوڵەکەی دایە دەست لەڤین.

لەڤین دەستیکرد بە لێکردنەوەی پەلکە ناسکەکانی و گوتی: سازی دەکات، سازی ناکات....

کیتی کە چاوی لە قامکی لەڤین بوو دەستی گرت و رایگرت و بە هەیەجانەوە گوتی: نا، نا! تۆ دوو پەلکت پێکەوە لێکردەوە.

لەڤین گوتی: دەی باشە بەجێی ئەوە ئەم پەلکە چکۆڵەیە حیساب ناکەم؟ ـ پەلکێکی چکۆڵە و ناسکی لێکردەوە: ئەوەتا، ئەوەش عەرابەکە، پێمان گەیشتەوە ـ پرێنسس دەنگی بەرزکردەوە: کیتی، ماندوو نەبووی؟

ـ نا، دایەگیان.

ـ ئەگەر ماندووبووی واچاکە سوار بی. بەشەرتێك ئەسپەکان کەوی بن و لەسەرەخۆ بڕۆن.

بەڵام ئەگەر سوار بوایەت بایی زەحمەتەکەی نەبوو، چونکە ئیتر گەیشتبوونێ و هەموویان پاشماوەی رێگاکە بە پێیان رۆیشتن.

## چوار

ڤارنکا، بەو لەچکە سپییەوە کە لە بسکە رەشەکەی پێچابوو، لەنێو پۆلی ئەو منداڵانەدا کە بە نەشە و رووخۆشانە ئاگادارییی لێدەکردن، بە ئاشکرا تووشی هەیەجان و دەست و لاق تێکەڵهاتن بووبوو، چونکە وێدەچوو پیاوی دڵخوازی، خۆشەویستیی خۆی بۆ دەربڕی، بۆیە زۆر جوانتر و دڵڕفێنتر بووبوو. سرگی ئیڤانڤیچ شان بە شانی دەڕۆیشت و بەردەوام لە دڵی خۆیدا ئافەرینی پێدەگوت. چاوی لێدەکرد و قسە شیرینەکانی و ئەو شتانەی کە سەبارەت بە ئەو بیستبووی و دەیزانی هەموویانی وەبیردەهاتەوە و هەرچی زیاتر تێدەپەڕی زیاتر بۆی دەردەکەوت کە ئەو هەستەی ئەو کچە لە ناخیدا گوورانددوویەتی هەستێکی تایبەت و زۆر لەمەوبەر و لە سەرەتای لاویدا و تەنیا جارێك دڵی داگرتووە. هەستی شادی و ئەوین بەردەوام

لە دڵیدا بڵێسەی دەسەند، کاتێك کارگێکی گەورەی دۆزییەوە کە لێواری چەترەکەی هەڵگەڕابۆوە و لاسکێکی ناسکی هەبوو، هەڵیکەند و خستییە نێو قەرتاڵەکەی ڤارنکاوە و چاوی لە چاوی کرد و دیتی کە شادییەکی پڕهەیەجان و شەرمێکی کچانە روخساری سوورهەڵگێڕاوە، بۆیە لە رووی هەڵنەهات هیچ بڵێت و تەنیا زەردەیەکی گرت کە نیشاندەری هەستی ناخی بوو.

لە دڵی خۆیدا گوتی: «واچاکە بەر لە بڕیاردان بیر بکەمەوە و وەك کوڕێکی هەرزەکار تەسلیمی هەست و دەستخەڕۆییەکی زوورتێپەڕ نەبم.»

گوتی: من دەڕۆم و بەجیا قارچك کۆدەکەمەوە، با بۆم مەعلووم بێ چەندە کۆدەکەمەوە- ئەوەی گوت و بە تەنیا، لەوێوە کە پەراوێزی دارستانەکە بوو و چیمەن و گیا وەك فەرشی هاورێشم لە ژێر هەنگاویاندا راخرابوون، بە نێو پیرەدارە کۆنەکاندا رۆیشت بەرەو نێوەراستی دارستانەکە، ساقەتەی خۆڵەمێشینی سپیدار و دەوەنی رەنگ تۆخی فندق لەنێوان کۆپەرەی دار تووسدا دیاربوون. سرگی ئیڤانڤیچ چل هەنگاوێك دوورکەوتەوە و لە پشت دەوەنێك کە گوڵی گوارەیی و پەلك چێژەیی بە لقەکانیدا شۆڕبووبوونەوە و دەیزانی لەوێوە نایبینن، راوەستا. بێدەنگییەکی قورس دەوروبەری داگرتبوو. تەنیا لە ژوور چڵەپۆپەی دارتووسێکەوە کە لە ژێریدا راوەستابوو پۆلە مێشێك وەك پلوورەی هەنگ بەردەوام ویزەویزیان دەهات و جاروباریش قیژە و قریشکەی مناڵەکان دەهات، لە ناکاو دەنگی نەرمی ڤارنکا لە قەراغ دارستانەکەوە گەیشتە گوێی کە بانگی لە گریشا دەکرد. بە بیستنی ئەو دەنگە بێ ئیختیار کەوتە پێکەنین. سرگی ئیڤانڤیچ، کە لەو پێکەنینەی خۆی ئاگاداربوو و بیری لە حاڵی خۆی کردەوە وەك خۆلۆمە کردن سەرێکی لەقاند و جگەرەیەکی بەرگی دەرهێنا بیکێشێ. ماوەیەك نەیتوانی شەمچەکە بە ساقەتەی دارتووزەکە هەڵبکات. رووکاری ناسکی تیخوڵی سپی دارەکە بە گۆگردی لقە شقارتەکەوە دەنووسا و لقەکە هەڵنەدەبوو. ئاخری لقێك هەڵبوو و دووکەڵی جگەرەکە وەك پەڵە هەورێکی شەپۆلدەر بەسەر دەونەکە و لقی داهاتووی دارتووزەکەدا بەرەو سەرێ و لای پێشەوە رۆیشت. سرگی ئیڤانڤیچ چاوی لەو پەڵە هەورە بزۆکە دەکرد و لەسەرەخۆ هەنگاوی دەنا و بیری لە حاڵی خۆی دەکردەوە.

بە خۆی گوت «بۆ نا؟ ئەگەر باس لە هەڵقولانی کتوپڕ یان سەودایەك بووایە، ئەگەر ئەو خواستە یەکلایەنە بوایە، کە دیارە دوولایەنەیە (بەڵێ، دەتوانم بڵێم دوولایەنەیە) هەستم دەکرد کە لەگەڵ رەوشتی ژیانی من سازگار نییە، ئەگەر هەستم بکردایە کە بە تەسلیمبوون، پشت

لە شەیدایی و ریسالەت و ئەرکی خۆم دەکەم لە ژیاندا... ئەو کارە نارەوا بوو. بەڵام وانییە. تەنیا بەهانەیەك کە دەتوانم بیهێنمەوە ئەوەیە کە کاتێك ماری مرد بەڵێنیم بەخۆم دا کە خۆشەویستی و یادی هەمیشە پیرۆز راگرم.» ئەو ئەوەی بە خۆی دەگوت بەڵام هەستی دەکرد کە مەسەلەکە بۆ خۆی هیچ گرینگایەتییەکی نییە و تەنیا وێدەچێ لەبەر چاوی خەڵك رەنگی شاعیرانەی خۆی بدۆڕێنێ. «بەڵام لەوە گەڕێین هەرچی بیری لێدەکەمەوە هۆیەکم بە دژی ئەو هەستەی خۆم بۆ نادۆزرێتەوە. ئەگەر بمویستبایە تەنیا لە رێی ئەقڵەوە هاوسەرێك هەڵبژێرم کەسم لەو چاکتر هەڵنەدەبژارد.»

ئەو ژن و کچانەی دەیناسین هەموویانی هێنا بەرچاوی خۆی و بەڕاستی هیچیانی لەو رادیەدا نەدەدی، ئەو تایبەتمەندییانەی کە دوای هەڵسەنگاندن و وەرد دانەوەی مەسەلەکە بە گەشبینییەوە بۆ هاوسەری خۆی لەبەر چاوی گرتبوو، هەموویانی لە ڤارنکادا دەدی. ڤارنکا شەنگە کچێکی جوان و جحێڵ و ناسك بوو، بەڵام هەرزەیی منداڵانە لە وجوودیدا نەبوو، ئەگەر ئەوی خۆش بویستبایە دڵدارییەکەی ئاگادارانە دەبوو، هەروەك چۆن لە ژنێکی جوان و رووسوور دەوەشێتەوە. ئەوە لایەنێکی مەسەلەکە. لایەنەکەی تریش ڤارنکا نەك لە کۆمەڵگای ئەشراف نەبوو، بەڵکوو بە ئاشکرا لێیان بێزار بوو، سەرەڕای ئەوانەش کۆمەڵگای دەناسی و لەگەڵ دابونەریت و ژیاری کومەڵ ئاشنابوو. هەڵگری تەواوی ئەو تایبەتمەندییانە بوو کە ئەو دەیویست و بیری لێدەکردەوە و ئەو هیچ کاتێك ژنێکی نەدەخواست کە بەری لەو تایبەتمەندییانە بێت. سێهەم ئەوەیکە پێبەندی ئایین بوو، بەڵام بیروبڕواکەی وەك کیتی بەبێ هەڵسەنگاندن و لە رووی دڵپاکی و لەسەرەخۆییەوە نەبوو، بەڵکوو ئیمان بناغەی ژیانی بوو. سرگی ئیڤانۆڤیچ تەنانەت تەواوی ئەو شتانەی کە بۆ هاوسەری خۆی لەبەر چاوی گرتبوو، هەمووی لەودا دەدی: ڤارنکا نە ماڵ و سامانی هەبوو نە کەسوکار. وەکوو کیتی خێڵی خزموکەسان و بنەماڵەکەی لەگەڵ خۆی بۆ ماڵی مێردەکەی نەدەهێنا و لە هەموو بارێکەوە سەر لە پێناوی مێردەکەی دەبوو و ئەوەش شتێك بوو کە سرگی ئیڤانۆڤیچ بۆ ژیانی بنەماڵەیی خۆی بە پێویستی دەزانی. ڤارنکا جگە لەوەی هەڵگری هەموو ئەو تایبەتمەندییانە بوو، لە ناخی دڵەوە ئەویشی خۆش دەویست. سرگی ئیڤانۆڤیچ خاکەڕا بوو بەڵام چاوی لە ئاست ئەو شتانە دەقونجاند، ڤارنکاشی زۆر خۆش دەویست. تەنیا خاڵێکی نەرێنی لەگۆڕێدا بوو، ئەویش تەمەنی خۆی بوو، بەڵام چونکە رەگەزی بنەماڵەکەیان زۆرژی بوون هێشتا تاڵێك مووی سپی نەکەوتبووە سەرییەوە و هیچ کەس پێیوانەبوو تەمەنی لە چلساڵ تێپەڕیوە. لە بیریشی بوو کە ڤارنکا گوتبووی تەنیا لە رووسیا پیاوان لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا خۆیان بە پیر

دەزانن و لە فەڕەنسا پیاوانی پەنجا ساڵە خۆیان لە تەمەنی کامڵبووندا دادەنێن و چل ساڵەکان خۆیان بە لاو دەزانن. بەڵام لە جێیەك کە ئەو لە دڵی خۆیدا خۆی وەك لاوێکی بیست ساڵان دادەنا، کەمی و زۆریی تەمەن کوا دەهاتنە ئەژمار؟ یانی ئەوە بە هۆی لاوییەوە نییە کە تاوێك لەمەوبەر، کاتێك لەولای دارستانەکەوە دەهاتەوە، بەژن و باڵای جوانی ڤارنکای بەو کراسە زەردەوە دی کە قوڵینە بەدەست و ئاسکئاسایی لەبەر پڕشنگی زێڕینی هەتاو بە ژێر پیرەدارێکی تووزدا دەڕۆیشت و لەنجەی دەکرد، دیمەنی جوانی لەگەڵ سەوزەڵانییەکە، کە لە ژێر ترووسکەی چەفتووری خۆرەتاودا، دەبریسکایەوە و ئاوێتەی یەك دەبوون و لەوپەڕی ئەوەوە لەگەڵ دارستانی چڕوپڕ کە ترووسکەکەی لە ئاسۆی مەیلەوکەهوودا مەحف دەبۆوە، تێکەڵ دەکرد، شادییەکی ئاوێتەی ئەوین دڵی ڕێککگوشی؟ حەز و مگێزێکی شیرین دڵی داگرت و هەستیکرد کە بڕیاری خۆی داوە. ڤارنکا هەڵترووشکابوو تاکوو کارگێك هەڵکەنێ، زۆر بە نەرمونیانی هەستا و چاوی لێکرد. سرگی ئیڤانڤیچ جگەرەکەی تووڕ هەڵدا و بە هەنگاوی گورج و خێرا ڕۆیشت بۆ لای.

# پێنج

«ڤارڤارا ئاندرێیۆڤنا، ئەو کاتەی هێشتا جحێڵ بووم، وێنەی خوازراوی ژنێکم لە خەیاڵی خۆمدا دەدی و پێم وابوو خۆشم دەوێ و ئەگەر بێتە هاوسەرم بەختەوەر دەبم. ساڵانێکی زۆر تێپەڕی و ئێستا بۆ یەکەم جار ئەوەی لێیدەگەڕام و ئاواتم بۆ دەخواست، لە تۆدا دیومەتەوە. خۆشمدەوێی و دڵم لێوڕێژە لە حەز و ئارەزووی ژیانی هاوبەش و هاتووم لە دەرگای دڵت دەدەم.»

سرگی ئیڤانڤیچ دە هەنگاوی مابوو بگاتە لای ڤارنکا و لە دڵی خۆیدا ئەو قسانەی دەکرد. ورانکا لەسەر عەرزەکە چۆکی دادابوو و کارگێکی بە دەستی شاردبۆوە بۆ ئەوەی گریشا هەڵێنەکەنێ و بانگی لە ماشای وردیلە دەکرد بێت هەڵیکەنێ.

بە دەنگێکی گەرم و مێهرەبان کە لە ناخی دڵییەوە هەڵدەستا گوتی: مناڵەکان وەرن، وەرن بۆ ئێرە. ئێرە زۆری گارگی ورد لێیە.

کە دیتی سرگی ئیڤانڤیچ خەریکە نزیك دەبێتەوە، هەروا بە دانیشتنەوە مایەوە و جۆری دانیشتنەکەشی نەگۆڕی، بەڵام لەبەرچاوی ئەو (یانی سرگی ئیڤانڤیچ هەموو شتێك نیشاندەری ئەوەبوو کە ڤارنکا نزیکبوونەوەی بەدڵ هەست پێدەکات و لەوەش خۆشحاڵە.

بەو لەچکە سپییەوە روخسارە جوان و شیرینەکەی کە بە گوڵبزە گەشابۆوە بۆ لای سرگی ئیڤانڤیچ سووڕاند و پرسیی: دەی، هیچت دۆزییەوە؟

سرگی ئیڤانڤیچ گوتی: نا، تاقە دەنکێکیشم نەدۆزییەوە. ئەی ئێوە؟

ڤارنکا بەلای منداڵەکانەوە سەرقاڵ بوو کە دەورەیان دابوو و وەڵامی نەدایەوە.

کارگێکی چکۆڵە کە لە ژێر لاسکی گیایەکی ویشکدا هەڵتۆقیبوو و لاسکە گیاکە چەتری نەرم و مەیلەوزەردی کارگە چکۆڵەکەی کردبوو بە دوو بەشەوە، نیشان ماشای وردیلەیدا و گوتی: وەرە، ئەمەش کارگێکی تر، لە پەنا ئەو لاسکە گیایەدایە ـ کە ماشا کارگەکەی کرد بە دوو لەتەوە و هەڵیگرت، ڤارنکا هەستا سەرپێ، منداڵەکانی بەجێ هێشت و هات بۆ لای سرگی ئیڤانڤیچ و گوتی: ئەو کارە دەورانی منداڵیم وەبیردێنێتەوە.

چەند هەنگاوێك بە بێدەنگی رۆیشتن. ڤارنکا دیتی کە سرگی ئیڤانڤیچ دیهەوێ شتێك بڵێ. تێگەیشت کە دەیهەوێ بڵێ چی و شادی و ترس و هەیەجان تووشی دڵەخورپەی کردبوو. هێندە دوورکەوتنەوە، کە هیچ کەس گوێی لە قسەکانیان نەدەبوو، بەڵام سرگی ئیڤانڤیچ هەروا بێدەنگ بوو. ڤارنکا واباش بوو هەر ئاوا بێدەنگ بێت. قسەکردن سەبارەت بەو شتەی دەیانویست بە یەکتری بڵێن دوای ئەو بێدەنگییە ئاسانتر دەبوو تا دوای باسکردنی کارگ. لەگەڵ ئەوانەشدا ڤارنکا، نەخوازراوانە و وەك بڵێی بە هەڵکەوت گوتی:

ـ کەوایە هیچت پەیدا نەکرد. هەڵبەت کارگ لەنێو دارستاندا کەمە و زیاتر دەوروبەری لێیەتی.

سرگی ئیڤانڤیچ هەناسەیەکی هەڵکێشا و وەڵامی نەدایەوە. داخی ئەوەی لێهات کە ڤارنکا دیسان باسی کارگی دامەزراندەوە. دەیویست دیسان بیهێنێتەوە سەر باسی دەورانی منداڵی، بەڵام دوای هێندێ بێدەنگی، بێ ئیختیار درێژەی بە قسەکانی ئەو دا و گوتی:

ـ من بیستوومە کارگی سپی زیاتر لە دەوروبەری دارستان هەڵدەتۆقێ بەڵام من لەگەڵ کارگە گولانە بۆم لێکناکرێتەوە.

چەند خولەکی تریشی خایاند. لە منداڵەکان دوورکەوتبوونەوە و ئێستا بە تەواوی تەنیا کەوتبوون. ڤارنکا دڵی بە پڕتاو لێیدەدا و گوێی لە ترپەکەی دەبوو، هەستی دەکرد روومەتی دەسۆڵێتەوە، رەنگی دەپەڕی و دیسان سوورهەڵدەگەڕا. دوای ئەو بارودۆخەی کە لەلای خاتوو ئیشتاڵ هەیبوو، شووکردن بە پیاوێکی وەك کازنیشۆڤ بۆ ئەو گەورەترین بەختەوەری بوو. جگە لەوەش تاڕادەیەك دڵنیابوو کە دڵی کەوتۆتە داوی کازنیشۆڤەوە و ئەو کارەش دەبوو هەر ئێستا یەکلایی

بێتەوە. دەترسا. ئەوەی سرگی ئیڤانڤیچ دەیگوت و نەیدەگوت هەردووکیان بۆ ئەو ترسێنەر بوون. دەبوو هەر ئێستا ئەو داخوازییە بدرکێنێ و ئەگەر لەم ساتەدا باسەکە نەهاتایەتە گۆڕێ ئیتر قەت هەڵنەدەکەوتەوە. سرگی ئیڤانڤیچیش ئەو هەستەی هەبوو. حاڵەتی روخسار و سوورهەڵگەڕان و چاوی شەرمتێگەڕاوی و هەموو جووڵان و هەڵسوکەوتێکی ڤارنکا بەلایەوە نیشاندەری ئەو چاوەڕوانییە کەسەربارەی بوو. کازنیشۆڤ ئەو حاڵەی دەدی و دڵی پێی دەسووتا. تەنانەت هەستی دەکرد ئێستا ئیتر بەو بێدەنگبوونەی خۆی خەریکە ئازاری ئەو کچە نازەنینە دەدات. هەموو ئەو هۆکارانەی کە بڕیارەکەی ئەویان دەسەلماند، بە پڕتاو لە زەینی خۆیدا وەردی دانەوە. ئەو قسانەی کە دەیویست داخوازییەکەی پێبدرکێنێ، دووپاتی کردەوە. بەڵام بەجێی ئەوەی ئەو وشانە بە زاریدا بێ مەعلووم نەبوو بە چ هۆیەك فیکرێکی چاوەڕواننەکراو بە مێشکیدا هات و لە ناکاو گوتی: جیاوازیی کارگی سپی و ئەو کارگانەی لە ژێر دەرختی توزدا هەڵدەتۆقێن چییە؟

ڤارنکا لەبەر شڵەژان و دڵەکوتە لێوی دەلەرزی. وەڵامی دایەوە: چەترەکەیان جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە، ئەو جیاوازییە تەنیا لە لاسکەکەیاندایە.

کە ئەو قسانەیان کرد هەردووکیان زانییان کە ئیتر کار لە کار ترازاوە و ئەوەی دەبوو بیڵێن ئیتر ناگوترێ، هەیەجانی ئەوان کە بەرلەوە بەوپەڕی توندی گەیشتبوو، وردە وردە دامرکایەوە.

سرگی ئیڤانڤیچ کە هێوربووبۆوە گوتی: لاسکی کارگەدارانە لە ریشی پیاوێکی رێشسپی دەچێ کە دوو رۆژ بێ نەیتاشیبێ.

ڤارنکا زەردەیەکی گرت و وەڵامی دایەوە: وایە ـ لەپڕ و بێ ئیختیار باری رۆیشتنەکەیان گۆڕی و بەرەولای منداڵەکان گەڕانەوە. ڤارڤارا ئاندرێیۆڤنا دڵێ بە خەمیش بوو و شەرمەزاریش. بەڵام سەرەڕای ئەوەش لە دڵەوە هەستی بە ئۆخژن دەکرد.

کازنیشۆڤ کە گەیشتەوە ماڵێ و خواستەکانی ناخی خۆی وەرد دایەوە، بۆی دەرکەوت بە هەڵەچووە و ناتوانێ جێگای ماری لە دڵی خۆیدا بە ئەوینێکی تر بسپێرێ.

لەڤین کاتێك دیتی منداڵەکان بە زاقوزووق و قریشکوهۆڕ بەرەولای ئەو و کیتی هەڵدێن، بۆ پارێزگاری لە کیتی چووە بەردەمی راوەستا و تەنانەت بە تووڕەییەوە دەنگی هەڵبڕی: هێواشتر رۆڵەگیان، هێواشتر!

بەدوای منداڵەکاندا ڤارڤارا ئاندرێیۆڤنا و سرگی ئیڤانڤیچیش لە دارستانەکە هاتنە دەرێ. کیتی بە پێویستی نەزانی پرسیار لە ڤارنکا بکات. بە حاڵەتی ئارام و تا رادەیەك شەرمتێگەڕاوی روخسارییاندا تێگەیشت کە ئاواتەکەی نەهاتۆتە دی.

که گەیشتنەوە ماڵێ مێردەکەی لێیپرسی: دەی، خەبەر چییە؟

کیتی بە بزە و لەبز و راوێژێك کە وەبیرهێنەرەوەی باوکی بوو و لەڤین زۆر جار بە چێژەوە ئەوەی دیتبوو گوتی: بێفایدە بوو. گاز لە قولاپەکە ناگرن.

ـ چۆن گاز ناگرن؟

کیتی گوتی: ئاوا ـ دەستی مێردەکەی گرت و بردی بۆ لای دەمی خۆی و بە لێوە قووچاوەکانییەوە نا و درێژەی بە قسەکانیدا: وەك ئەوەی دەستی ئوسقۆفی مەزن ماچ بکەن.

لەڤین بە پێکەنینەوە پرسیی: کامیان گاز ناگرن؟

ـ هیچ کامیان. کە دەبوو ئاوا بکەن...

ـ وریابە وەرزێڕەکان دێن.

ـ نا، ئەوان دیار نین.

## شەش

کاتی چاییخواردنەوەی منداڵەکان، گەورەکان لەبەر هەیوانەکە دانیشتبوون و جۆرێك دەدوان دەتگوت هیچ رووداوێك نەقەوماوە، ئەگەرچی هەمووان، بەتایبەت ڤارنکا و کازنیشۆڤ، چاکیان دەزانی چ رووداوێك قەوماوە و ئەگەرچی ناخۆش بووە بەڵام گرنگایەتییەکی زۆری هەبووە. حاڵی هەردووکیان وەك حاڵی ئەو منداڵە وابوو کە لە تاقیکاریدا دەرنەچووە و ناچارە ساڵێکی تریش هەر لەو پۆلەدا بمێنێتەوە، یان بە یەکجاری واز لە قوتابخانە بێنێ. حازریانیش کە هەموویان هەستیان دەکرد رووداوێك قەوماوە، تامەزرۆیانە هەرکام بە بارێك دەدوان. لەڤین و کیتی ئەو شەوە خۆیان زۆر بە بەختەوەر و شەیدای یەکتر دەزانی. شیرینکامییەکەیان و شەیداییەکەشیان لەگەڵ یادی ئەو کەسە نامرادانە ئاوێتە دەبوو کە ئاواتەخوازی بەختەوەرییەکی ئاوا بوون، بەڵام نامراد مابوونەوە و لە دڵەوە خەمیان بۆ دەخواردن و خۆشیی ئەو شەوەیان تارادەیەك بەو هۆیەوە شێوابوو.

پرێنسسی پیر گوتی: لەبیرتان بێ، بەڵنیتان دەدەمێ ئەلکساندر نایەت.

ئەو شەوە چاوەڕوانی ستیپان ئارکادیچ بوون کە بڕیار وابوو بە شەمەندەفەر بێت و پرنسی گەورەش نووسیبووی کە رەنگە لەگەڵ ئەودا بێت.

پرێنسس گوتیشی: هۆیەکەشی دەزانم. دەڵێن لەو سەرەتای ژیانی هاوبەشەوە بووك و زاوا دەبێ بە تەنیا بن.

کیتی گوتی: بەڵێ، باوکم ئەوەی کردۆتە بەهانە و نایەت بۆ سەردانمان. ئێمە هێشتا چاومان پێینەکەوتووە. بەڵام خۆ ئێمە ئیتر بووك و زاوا نیین. عومرێك بەسەر زەماوەندەکەماندا تێپەڕیوە.

پرێنسس خەمبارانە هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: با ئەوەتان پێبڵێم رۆڵەگیان ئەگەر ئەو نەیەت منیش دەڕۆمەوە.

کچەکانی هەردووکیان یەکدەنگ گوتیان: ئەوە چ قسەیەکە دایەگیان!

ـ بیری لێبکەنەوە. ئێستا لە چ بارودۆخێکدایە؟ حەتمەن ئێستا....

لە ناکاو پرێنسسی گەورە دەنگی لەرزی. کچەکان بێدەنگ بوون و چاوێکیان لە یەکتر کرد، دەتگوت بەو روانینە بە یەکتر دەڵێن «دایکم هەمیشە بەهانەیەك بۆ خەمخواردنی خۆی دەدۆزێتەوە.» ئەوان نەیاندەزانی هەرچەندیش لەلای کچەکانی خۆشی رابوێرێ و هەرچەندیش بوونی خۆی لەلای ئەوان بە پێویست بزانێ، لەو کاتەوە کە کچە پاشەبەرەکەیان شووی کردبوو هەستی دەکرد ماڵەکەیان چۆڵ بووە و دڵی بە خۆی و مێردەکەی دەسووتا و خەمێکی قورس لە دڵی بار بوو.

کیتی لە ناکاو لە ئاگافیا میخائیلۆڤنای پرسی کە بە حاڵەتێکی مات و مانادارەوە لەبەر دەمی راوەستابوو: چیت دەوێ، ئاگافیا میخائیلۆڤنا؟

ـ بۆ شێو... چ بکەین؟

دالی گوتی: چاکە، زۆر چاکە، تۆ بچۆ ئەوەی پێویستە بۆ شێو پێیان بڵێ و من دەچم بۆ لای گریشا دەرسەکەی پێ دەورە دەکەمەوە. دەنا هەتا شەوێ هەر خەریکی کایە و کلکەقنگی دەبێ.

لەڤین هەستا سەرپێ و گوتی: نا، دەرسەکەی لەسەر من. دالی، ئەوە من دەچم دەرسەکانی پێدەڵێم.

گریشا لە دوایین پۆلی سەرەتاییدا بوو، دەبوو لەو ماوەیەی پشووودانی هاویندا دەرسەکانیساڵی کۆتایی دەورە بکاتەوە. داریا ئەلکساندرۆڤنا کە لە مۆسکۆ لەگەڵ کوڕەکەی دەرسی لاتینیان دەخوێند، کاتێك هاتن بۆ ماڵی خوشکی لەو گوندە بڕیاریاندا لانیکەم رۆژی جارێك گرانترین دەرسەکان، واتە ماتماتیك و لاتین، لەگەڵ کوڕەکەی دەورە بکەنەوە. لەڤین بە دڵخوازی

خۆی ئەرکی دالیی وەئەستۆ گرت، بەڵام دالی چونکە جارێك گوێی بۆ دەرس پێگوتنەکەی لەڤین ڕاگرت، تێگەیشت کە کاری ئەو لەگەڵ کاری مامۆستا مۆسکۆییەکە جیاوازە، پێیناخۆش بوو و لەگەڵ ئەوەدا کە هەوڵی دەدا لەڤین زیز نەکات بە لەبزێکی قایمەوە پێداگریی کرد کە دەرس دەبێ لە ڕووی کتێبەکەوە بە شێوەی مامۆستا بگوترێتەوە و واچاکە خۆی ئەو کارە بکات. لەڤینیش کە لەدەست ستیپان ئارکادیچ تاڕادەیەك ڕقی هەستابوو کە چاوەدێریی دەرسی منداڵەکانی خستۆتە ئەستۆی دایکیان کە هیچی تێناگات و کاری مامۆستاکەشیانی بەدڵ نەبوو پێیوابوو شێوەی فێرکارییەکەی هەڵەیە و تێیناگات. بەڵام بەلێنی بە ژنخوشکەکەیدا کە دەرسەکانی بە شێوەیەکی زۆر باش لەگەڵ دەورە بکاتەوە و تەمرین بە گریشا بکات، هەر بەڕاستیش ئەمجار نەك بە شێوەی خۆی بەڵکوو بەپێی کتێبەکە کاری لەگەڵ کرد و ئەوەش بە هۆی ئەوەوە بوو کە تاقەتی کاری نەبوو و زۆر جار وەك ئەمڕۆ کاتی دەرسەکانی لە بیردەچۆوە.

گوتی: نا، دالی، تۆ دانیشە، من دەچم. خەمت نەبێ زۆر بە ڕێکوپێکی و لە ڕووی کتێبەوە پێیدەڵێم. تەنیا کاتێك کە ستیڤا هات ئێمە دەچین بۆ ڕاو و ئەو کاتە تۆ بەجێی من دەرسی پێبڵێ.

لەڤین ئەوەی گوت و ڕۆیشت بەلای دەرسەکەوە.

ڤارنکاش هەر ئەوەی بە کیتی گوت. ئەویش لەو ماڵە پڕ بەختەوەرییەی لەڤیندا کە هەموو شتێك ڕێکوپێك و بەجێ بوو توانیبووی بەکەڵك بێ.

گوتی: من شێوەکە ساز دەکەم. ئێوە دانیشن.ـ ئەوەی گوت و لەگەڵ ئاگافیا میخائیلۆڤنا ڕۆیشت.

کیتی گوتی: باشە، زۆر سپاس. ڕەنگە مریشکیان بۆ پەیدا نەبووبێ، بەڵام مریشکەکانی خۆمان هەن.

ڤارنکا گوتی: من و ئاگافیا میخائیلۆڤنا جێبەجێی دەکەین ـ پاشان لەگەڵی وەڕێکەوت.

پرێنسس گوتی: بەڕاستی کچێکی دڵسۆز و مێهرەبانە.

ـ نا، دایەگیان، مێهرەبانی چی، لەوپەڕی چاکیدایە، وێنەی نییە.

سرگی ئیڤانڤیچ کە دیاربوو نایهەوێ سەبارەت بە ڤارنکا قسە بکەن گوتی: دەی، کەوایە ئێوە ئەمشەو چاوەڕوانی ستیپان ئارکادیچ دەبن؟ ـ پاشان بە بزەیەکی ناسکەوە گوتیشی: زۆر بە زەحمەت دەتوانی دوو ئاوەڵزاوا بدۆزییەوە کە وەك مێردەکانی ئێوە بەقەد عەرز و ئاسمان جیاوازییان هەبێ. کەسێکی وەك ستیڤا بەنەشە و پڕجموجۆڵە و وەك ماسی چۆن لە ئاودا دەژی

ئەویش ئاوا بەبێ کۆمەڵگا ناژی، کەسێکی وەك کۆسیتای ئێوەش گورجوگۆڵ و چالاکە و زۆریش وردبینە. بەڵام هەر لەگەڵ پێ دەنێتە کۆمەڵگاوە یان لە جموجۆڵ دەکەوێ یان وەکوو ماسی کە کەوتبێتە وشکایی شێتانە هەڵبەزدابەز دەکات و جینگڵ دەدات.

پرێنسسی پیر رووی لە سرگی ئیڤانڤیچ کرد و گوتی: بەڵێ، زۆر کەمتەرخەم و بێفیکرە. خوداوراستان دەمویست داوا لە ئێوە بکەم قسەی لەگەڵ بکەن و بۆی روون بکەنەوە کە کیتی بە هیچ جۆرێك نابێ لێرە بمێنێتەوە و حەتمەن دەبێ بێت بۆ مۆسکۆ. ئەو دەڵێ دەنێرم بەدوای دوکتۆردا کە بێت بۆ ئێرە...

کیتی لەوەی کە دایکی سرگی ئیڤانڤیچی بۆ ئەو کارە هەڵدەبژارد، زۆر نارازی بوو، گوتی: دایەگیان، ئەو هەر کارێك پێویست بێت دەیکات و بۆ هەموو کارێك رەزایەت دەدات.

لە کاتی قسەکردنەکەیاندا پڕمەپڕمی ئەسپ و تەقوکوتی تایەی فایتوون لەلای رێگاوە بەرگوێ کەوت.

دالی هێشتا هەڵنەستابوو بچێت بۆ پێشوازیی مێردەکەی، لەڤین لە پەنجێرەی ئەو ژوورەوە کە گریشا دەرسی تێدا دەخوێند، بازیدا خوارێ و گریشاشی هەر لەو پەنجێرەوە هێنا خوارێ.

لەڤین لە ژێر بانجێڵەکەوە هەرای کرد: ستیڤایە ـ پاشان گوتیشی: دالی، ئێمە کارەکەمان تەواوبوو، خەمت نەبێ! ـ وەك منداڵ هەڵات بەرەوپیری فایتوونەکە.

گریشا بە دەنگی بەرز دەیگوت: is ea id ejus ejus ejus[٢٩] شاد و لێو بە بزە بە هەڵبەزدابەز و حیندرحۆ بەسەر جادەکەدا رۆیشت بەرەوپیری باوکی.

لەڤین کە لەبەر دەروازەی لای جادەکە راوەستابوو هەرای کرد: ستیڤا بە تەنیا نییە. حەتمەن پرێنسی گەورەش هاتووە. کیتی، تۆ لەو پلیکانانە مەیە خوارێ، چونکە زۆر رژدن، بەولای خانووبەرەکەدا دەور لێدە.

بەڵام لەڤین بەهەڵە چووبوو و ئەوەی لە پەنا ئابلۆنسکی دانیشتبوو پرێنسی پیر نەبوو. لەڤین لە فایتوونەکە چووە پێشێ دیتی کە ئەوکەسە لاوێکی قەڵەوە و جوانچاکە و کڵاوێکی سکاتلەندیی لەسەر ناوە و تەنزیلی درێژی کڵاوەکەی لە دواوە شۆڕبوونەتەوە. ئەو لاوە ڤاسنکا ڤسلۆڤسکی[٣٠] یەکێك لە خزمەکانی کیتی و دالی بوو و هەروەها یەکێك بوو لە لاوانی

---

٢٩- وتنی یەکێك لە راناوەکان بە شێوەی سێهەم کەسی تاك بە زمانی لاتینی.

30- Vacenka Veslovsky

وێچووی کۆمەڵگای نەجیمزادانی پترزبۆرگ و مۆسکۆ. ستیپان ئارکادیچ بۆ ناساندنی بە لەڤین گوتی: لاوێکی راست و دروستە و هەروەها راوچییەکی بێوێنەشە.

ڤسلۆڤسکی لەوەی کە جێی پرێنسی گەورەی گرتبۆوە و بووبووە هۆی ناکامبوونی خانەخوێکەی خۆی تووشی دڵگرانی نەبوو، بە روویەکی خۆش و بە نەشەوە چاکوخۆشی لەگەڵ لەڤین کرد و وەبیری هێنایەوە کە پێشتر لەگەڵی ئاشنابووە و گریشای هەڵێنا و بەسەر تانجییەکەدا کە ستیپان ئارکادیچ بۆ راو هێنابووی خستییە نێو فایتوونەکەوە.

لەڤین سواری فایتوونەکە نەبوو و بە پێیان بە دوایاندا هاتەوە. لەوە دڵگران بوو کە پرێنسی گەورە نەهاتووە. ئەو هەتا زیاتری خەزووری دەناسی زیاتر خۆشی دەویست، هەروەها ئەوەشی زۆر پێناخۆش بوو کە بەجێی پرێنسی گەورە ئەم ڤاسنکا ڤسلۆڤسکییە هاتبوو کە زۆر غەوارە بوو بەلایەوە و حەزی بە هاتنەکەی نەدەکرد. ئەو نامۆیی و هاتنە نابەجێیەی ئەو میوانە ناوەختە لەبەر چاوی لەڤین کاتێك زیاتر زەقبۆوە کە گەیشتە بەردەرکی ماڵێ و گەورە و بچووك هاتن بەرەوپیری میوانەکان و لەبەر دەرگاکە کۆ بوونەوە، هەروەها دیتی ڤسلۆڤسکی بە ئەتوار و خۆشیرین کردنێکی زۆر و ئاکارێکی ژنپەرستانە دەستی کیتیی ماچکرد.

ڤسلۆڤسکی جارێکی تر دەستی لەڤینی بە توندی گوشی و گوتی: چاکە ئێمە خزموکەسی یەکترین و ئاشنای قەدیمیشین.

ستیپان ئارکادیچ هێشتا بە تەواوی چاکوچۆنیی نەکردبوو رووی کردە لەڤین و لێیپرسی: دەی، بارودۆخی راو چۆنە؟ من و ڤاسنکا بە نیازی راو هاتووین بۆ ئێرە... چاولێکە دایەگیان، ئەمانە لەو کاتەوە تا ئێستا نەهاتوون بۆ مۆسکۆ... وەرە تانیا، ئەوەم بۆ تۆ هێناوە... تکایە بچۆ لەنێو فایتوونەکەدایە بیهێنە... ـ بە هەموو لایەکدا دەسووڕا و بە هەرکەسەی شتێکی دەگوت. رووی کردە ژنەکەی و گوتی: چەند جوان بووی، گەشاوییەتەوە، دۆلنکا! ـ دەستی کە بە دەستی خۆیەوە گرتبوو بۆ لاواندنەوە بە دەستەکەی تری نەرم دەیکێشا بە پشتی دەستیدا و دیسان ماچی دەکردەوە.

لەڤین کە تاوێك لەمەوبەر زۆر شاد و بەکەیف بوو ئێستا شێواو و بێنەشە دیاربوو و دەتگوت مەیموونەکەی تۆپیوە.

کە چاوی لە ستیپان ئارکادیچ کرد ژنەکەی خۆی دەلاوێنێتەوە و دەستی ماچ دەکات لە دڵی خۆیدا گوتی «داخۆ دوێشەو بەو لێوانە چ ژنێکی ماچکردبێ؟» چاوێکی لە دالی کرد و

رقی لەویش هەستا و بە خۆی گوت «ئەو خۆ باوەڕ بەو خۆشەویستی دەربڕین و خۆشیرینکردنە ناکات، کەوایە ئەو شادی و نەشەی لەبەر چییە؟ لە هەموویان بێزارم!»

لە پرێنسسی پیری دەڕوانی، کە هەتا تاوێك لەمەوبەر زۆری خوش دەویست، بەڵام ئێستا کە ئاوا خانەخوێیانە بەخێر هاتنی ئەم ڤاسنکایە دەکات کە زۆر کوڕێکی هەرزەیە و ئەم تەنزیلە قۆڕ و بێتامانەی بە کڵاوەکەیدا هەڵواسیوە، لەویش بێزار بووبوو.

تەنانەت ئاکاری سرگی ئیڤانڤیچیش، کە هاتبووە دەرێ و ئاوا دۆستانە لەگەڵ ستیپان ئارکادیچ بەرەوڕوو بوو ناحەز و دزێوی دەهاتە بەرچاو، چونکە دەیزانی براکەی حەز بە دیتنی ئابلۆنسکی ناکات و لە دڵەوە خۆشی ناوێ و ڕێزی بۆ دانانێ.

تەنانەت ڤارنکا، تەنانەت ئەویشی لەبەر چاو کەوتبوو، کە بەو ئاکارە لە خودا ترسانەیەوە لەگەڵ ئەو کوڕە بە گەرموگوڕی سڵاو و چاکوخۆشیی کرد و بەو ئاکامە گەیشت کە ئەویش تەنیا لە بیری دۆزینەوەی مێردێکدایە.

لە هەمووشیان نەگەویستر کیتی بوو کە لە خۆشی ئەو غەوارەیە، کە هاتنی خۆی بۆ گوند وەکوو جێژنێك بۆ خۆی و بۆ دیتران دەزانی و لە هەمووشی کرێتر بزەیەك بوو، کە لە وەڵامی بزەی ئەو میوانە ناوەختەدا نیشتە سەرلێوی.

هەموو بە دەنگەدەنگ و بە دەم قسەکردنەوە چوونە ژوورێ و کە دانیشتن لەڤین بە تەنیا بەجێی هێشتن و ڕۆیشتە دەرێ.

کیتی بۆی دەرکەوت کە مێردەکەی بە هۆیەك تێکچووە و لە دەرفەتێك دەگەڕا کە بە تەنیا قسەی لەگەڵ بکات، بەڵام کە ئەو دەرفەتەی بۆ هەڵکەوت لەڤین بەپەلە رووی وەرگێڕا و دوورکەوتەوە و گوتی دەبێ بڕوات بۆ نووسینگەکەی. لەمێژ بوو بەڕێوەبردنی کاروباری مڵکەکەی ئاوا بە گرینگ نەزانیبوو. لەڤین لە دڵی خۆیدا گوتی «ژیان بۆ ئەوانە هەمووی جێژن و رابواردنە، بەڵام لێرە پیاو دەبێ کار بکات و جێگای رابواردن نییە. کاروبارێك کە بۆ ئەوە نابن گوێیان لێبخەوێنی و بەبێ ئەوانیش ژیان مەحاڵە.»

## حەوت

لەڤین کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵێ کە ناردبوویان بە دوایدا و پێیان ڕاگەیاند کە شێو ئامادەیە، لەسەر پلیکانەکان کیتی و ئاگافیا میخائیلۆڤنای دی کە سەبارەت بە شەڕابێك کە دەبوو بیهێننە سەرمێزەکە چەلەحانێیان بوو.

گوتی: ئەم هەموو تەدارەك و گەورەکردنەوەی بۆچییە؟ هەر لەو شەڕابە ئاساییە بێنن باشە.

کیتی گوتی: نا، ستیڤا لەو شەڕابە ئاساییانە ناخواتەوە. کۆسیتا... ڕاوەستە ئەوە چبووە؟ ئەوەی گوت و بە دوایدا هەڵات. بەڵام لەڤین بێ ئەوەی گوێی بداتێ بە هەنگاوی خێرا خۆی کرد بە ژووری نانخواردندا و لەڕێوە تێکەڵ ئەو دەمەتەقێ گشتی و گەرموگوڕە بوو کە ڤاسنکا ڤسلۆڤسکی و ستێپان ئارکادیچ دایانمەزراندبوو.

ستێپان ئارکادیچ پرسیی: دەی، سبەینێ بچین بۆ راو یان نا؟

ڤسلۆڤسکی جێگای خۆی گۆڕی و لەسەر لایەکی کورسییەکە دانیشت و لاقێکی لە ژێر خۆیدا نووشتاندەوە و گوتی: بەڵێ، تکایە با بچین!

لەڤین کە چاوی لە لاقی ڤسلۆڤسکی بڕیبوو، بە ڕووخۆشییەکی درۆیینەوە کە بۆ کیتی ئاشنابوو و لەگەڵ ئاکاری سادقانەی سازگار نەبوو، پێیگوت: زۆریشم پێخۆشە. ئێوە ئەمساڵ چوون بۆ ڕاو؟ نازانم سوێسکە هەیە یان نا. بەڵام زیقاوڵە زۆرە. ئەگەر بشچین دەبێ زوو بڕۆین. ئێوە ماندوو نین؟ تۆ ستیڤا، خۆ ماندوو نیت؟

ـ منو ماندوویەتی؟ من هەر نازانم ماندوویەتی چییە. هەتا بەیانیش نەخەوم گوێم لێنییە. وەرن با بڕۆین بۆ پیاسەکردن.

ڤسلۆڤسکی قسەکەی ستیڤای بەدڵ بوو و گوتی: بەڵێ، با بچین. وەرن با ئەمشەو هەر نەخەوین، زۆر فیکرێکی باشە.

دالی بە ڕشقنجاڕییەکی کەمڕەنگەوە کە ئێستا دەکرێ بڵێین بووبووە لەبزی هەمیشەی لەگەڵ مێردەکەی، گوتی: ئێمە هەموو دەزانین کە تۆ دەتوانی هەتا بەیانی نەخەوی و نەهێڵی ئەوانی تریش بخەون. من ئەوا هەر لەئێستاوە خەوم دێ... ئەوە دەڕۆم و شێویش ناخۆم.

ستیپان ئارکادیچ هەستاو چوو بۆ لای ژنەکەی کە لەوبەری ئەو مێزە گەورەوە دانیشتبوو کە شێویان لەسەر دەخوارد، گوتی: نا، خۆشەویستەکەم، دۆلنکا گیان، مەڕۆ. زۆر شتم لە دڵدایە دەبێ بۆت بگێڕمەوە.

- پێموانییە قسەیەکی ئەوەندە گرینگت پێبێ!

- دەزانی چی، ڤسلۆڤسکی چووە چاوی بە ئانا کەوتووە. دیسانیش دەچێت. ئاخر لە ملکەکەیانەوە هەتا ئێرە هەفتا وێرست زیاتر نییە. منیش حەتمەن دەچم. ڤسلۆڤسکی وەرە بۆ ئێرە!

ڤاسنکا چوو بۆ لای ژنەکان و لە پەنای کیتی دانیشت.

داریا ئەلکساندرۆڤنا رووی تێکرد و گوتی: دەی تکات لێدەکەم بۆم باس بکە. چاوت پێیکەوت؟ حاڵی چۆن بوو؟

لەڤین لەوسەری مێزەکە مایەوە و لەگەڵ پرێنسس و ڤارنکا قسەی دەکرد و لەگەڵ ئەوەشدا دەیدی کە کیتی و دالی و ڤسلۆڤسکی زۆر بە تامولام قسە دەکەن و سرت و خورتیانە. جگە لە ئاخافتنە هێواشەکەیان دەیدی کە ژنەکەی هەرجارێك چاو لە روخساری ئەو لاوە جوانچاکە دەبڕێ، کە مەعلووم نەبوو باسی چییان بۆ دەکات کە ئاوا بە تاموخوێ و بە سرتە دەدوێ، شوێنەواری هەستێکی جیددی لە سیمایدا وەدیار دەکەوت و رەنگی تێکدەچوو.

ڤاسنکا باسی ڤرۆنسکی و ئانای دەکرد و دەیگوت: ماڵەکەیان لەڕادەبەدەر خۆشە. هەڵبەت من ئیجازەی داوەری بە خۆم نادەم بەڵام پیاو لە ماڵی ئەوان دەڵێی لە ماڵی خۆیەتی و هەست بە نامۆیی ناکات.

- ئێستا دەیانهەوێ چ بکەن؟

- وێدەچێ بۆ زستان بچنە مۆسکۆ.

ستیپان ئارکادیچ لە ڤاسنکای پرسی: زۆر خۆش دەبوو پێکەوە بچین بۆ ئەوێ. تۆ کەنگێ دەتەوێ بچی؟

- من مانگی ژوئیە لەگەڵ ئەوان دەبم.

ستیپان ئارکادیچ رووی لە ژنەکەی کرد و گوتی: تۆ چی؟ دەچی؟

دالی گوتی: من زۆر لەمێژە دەمهەوێ بچم و حەتمەن دەچم. من دەستەخوشکی ئەوم و زۆرم دڵ پێیدەسووتێ. ئانا زۆر ژنی چاکە. هەرکات تۆ لە ماڵێ نەبووی خۆم بە تەنیا دەچم و مزاحیمی کەس نابم. تەنانەت زۆریشم پێخۆشە کاتێك تۆ لە ماڵ نیی بچم.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: زۆر چاکە، ئەی تۆ، کیتی؟

کیتی سوورهەڵگەڕا و گوتی: من؟ من بۆ بچم؟ ـ ئەوەی گوت و چاوێکی لە مێردەکەی کرد....

ڤسلۆڤسکی لێیپرسی: تۆ ئاشنایەتیت لەگەڵ ئانا ئارکادیۆڤنا هەیە؟

کیتی زیاتر سوورهەڵگەڕا و گوتی: بەڵێـ هەستا و رۆیشت بۆ لای مێردەکەی.

گوتی: دەی، کەوایە سبەینێ دەچی بۆ راو؟

لەڤین لەو چەند خولەکەدا، بە تایبەت کاتێك دیتی ژنەکەی کاتی ئاخافتن لەگەڵ ڤسلۆڤسکی ئاوا سوورهەڵگەڕا، ئێرەییەکی لەڕادەبەدەر گیانی داگرت و دڵی کومۆڵ بوو. کە پرسیارەکەشی لێکرد لە خەیاڵی خۆیدا جۆرێکی تری لێکدایەوە. ئەگەرچی دواتر کە ئەو خەیاڵەی وەبیرهاتەوە، ئەو لێکدانەوەی خۆی زۆر پێ سەیر بوو، بەڵام ئێستا بەبێ دڕدۆنگی دەیزانی ژنەکەی بۆیە گرنگی بە چوون و نەچوونەکەی دەدا دەیهەوێ بزانێ مێردەکەی ئەو چێژە بە ڤسلۆڤسکی دەبەخشێ یان نا، چونکە گومان وای لێکردبوو کە پێیوابوو کیتی ئاشقی ئەو لاوە بووە.

لەڤین بە دەنگێکی گڕ، بە جۆرێك کە لە گوێی خۆیدا زۆر زایەڵەیەکی ناخۆشی هەبوو، گوتی: بەڵێ دەچم.

کیتی گوتی: من دەڵێم واباشترە رۆژێك لێرە، بمێننەوە. داڵی هێشتا بە تەواوی چاوی بە مێردەکەی نەکەوتووە.

لەڤین ئەمجارەیان ئاوا لە مانای قسەکەی کیتی گەیشت: لە منی دوور مەخەوە. بۆ من گرینگ نییە خۆت دەچی یان ناچی. بەڵام لە هاودەم بوونی ئەو لاوە جوانچاکەم بێبەش مەکە.

لەڤین بە روویەکی خۆشەوە وەڵامی دایەوە: باشە، ئەگەر تۆ واتپێخۆشە سبەینێ لێرە دەمێنینەوە.

ڤاسنکا کە نەیدەزانی بەو هاتنەی خۆی لەڤینی تووشی چ ئازارێك کردووە، لەسەر مێزەکە هەستا و بە دوای کیتیدا رۆیشت، بە دڵۆڤانی و زەردەخەنەوە قسەی لەگەڵ دەکرد و چاوی لێنەدەترووکاند، سەرنج و روانینەکانیشی لێوڕێژ بوون لە لاواندنەوە.

لەڤین ئەو نیگایانەی ڤسلۆڤسکیی دی. رەنگی بزرکاو خەریکبوو هەناسەی راوەستێ. خوێنی وەکوڵ هات و بە خۆی گوت «چۆن ئیجازە بە خۆی دەدا ئاوا چاو لە ژنەکەم بکات؟»

ڤاسنکا لەسەر کورسییەك دانیشت و دیسان بەپێی عادەت لاقی لە ژێر خۆیدا کۆکردەوە و گوتی: کەوایە سبەینێ؟ تکات لێدەکەم، کارێك بکەن سبەینێ بچین.

لەڤین لەڕادەبەدەر تووشی خانەگومانی بووبوو. ئەو ئێستا خۆی بە مێردێکی هەڵخەڵەتاو دەزانی کە ژنێکی تەورخراپی هەیە و ژنەکەی و گراوەکەی ئەویان تەنیا بۆ ئەوە دەوێ کە ئاسوودەیی ژیان و کەرستە و شمەکی رابواردنەکەیان بۆ دابین بکات... لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بە رووخۆشی و رێزەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ ڤاسنکا دەکرد و سەبارەت بە راو و تفەنگ و جزمە و ئەو جۆرە شتانە لەگەڵی دەدوا و قایل بوو کە رۆژی دوایی بچن بۆ راو.

بەڵام لەڤین نێوچاوانەکەی هێنای و پرێنسسی پیر بەو شێوەیە کۆتاییی بە ئازارەکانی هێنا و داوای لە کیتی کرد کە بڕوات بۆ ژوورەکەی خۆی و بخەوێت. بەڵام ئەوەش دیسان ئازارێکی تری لە رۆحی لەڤیندا رسکاند. ڤاسنکا کاتی خوداحافیزی لە خاتوونی خانەخوێ دیسان ویستی دەستی ماچ بکات بەڵام کیتی سوورهەڵگەڕا و دەستی خۆی کێشا دواوە و لە رووی ساویلکەییەوە و بە لەبزێکی تووڕە گوتی: ئەم کارە لەنێو ئێمەدا باو نییە. ـ کە پرێنسسی گەورە پاشان لەسەر ئەو کارەی سەرکۆنەی کرد.

لەڤین پێیوابوو خەتای کیتییە کە ئیجازەی داوە پێوەندییەکی ئاوا لەنێوانیاندا دروست بێت و دیسان بەوەش خەتاکەی زیاتر بووبوو کە ئاوا سایلۆحانە نیشانی دابوو کە حەز بەو پێوەندییانە ناکات.

ستیپان ئارکادیچ کە لەسەر شێو چەند پەرداخی شەڕاب خواردبۆوە و وەنەشە کەوتبوو گوتی: ئێستا کوا کاتی خەوتنە؟ ـ ئاماژەی بە مانگ کرد کە لە پشت سپیدارەکانەوە دەهاتە سەرێ و گوتی: بڕوانە، بڕوانە کیتی، بڕوانە چەندە جوانە! ـ رووی لە ڤاسنکاش کرد و گوتی: دەزانی ڤسلۆڤسکی، ئێستا کاتی ئەوەیە کە لەبەر پەنجێرەی جوانادا سێرێناد ساز بکەی. کیتی، دەزانی ڤاسنکا دەنگی زۆر خۆشە. لە رێگا هەتا گەیشتینە ئێرە هەر گۆرانیمان گوت. هێندێ نۆتەی رۆمانسیی هێناوە کە زۆر جوانن. دوودانەیان نوێن. خۆزگە لەگەڵ ڤارڤارا ئاندرێیۆڤنا دوو بەندیان بۆ بگوتبایەین.

کاتێك هەمووان چوونە ژوورەکانی خۆیان، ستیپان ئارکادیچ و ڤسلۆڤسکی ماوەیەکی زۆر لەنێو باخەکەدا پیاسەیان کرد و بە تووڵەڕێی نێو دارەکاندا هەنگاویان دەنا و گۆرانیی ئاشقانەیان دەگوت و زایەڵەی دەنگیان ئەو ناوەی داگرتبوو.

لەڤین کە لە ژووری خەوی ژنەکەی لەسەر کورسیلەیەکی دەسکدار دانیشتبوو و منجڕانە وەڵامی پرسیاری ژنەکەی نەدەدایەوە کە لێیدەپرسی هۆی ئەو گرژی و دڵتەنگییەی چییە. بە بیستنی دەنگی ئەو جووتەش نێوچاوانی تێکدەنا و وەك ژیشك وێك دەهات. بەڵام کاتێك کیتی شەرمنانە و لێو بەبزە لێیپرسی: رەنگە رقت لە هێندێك لە هەڵسوکەوتەکانی ڤسلۆڤسکی

هەستابێ؟ ـ کاسەی سەبری پڕ بوو و ئەوەی لەسەر دڵی بار بوو هەڵیڕشت. ئەو قسانەی دەیکرد دەبوونە هۆی سووکبوونی خۆی و هەر ئەوەش هێندەی تر رقی هەڵدەستاند.

لەڤین لە هەمبەر ژنەکەیدا راوەستابوو و چاوانی لە ژێر برۆ وێکهاتووەکانیدا برووقەیەکی ترسناکیان لێدەبۆوە و باسکە بەهێزەکانی توند بە سینگییەوە نووساندبوو و دەتگوت هەموو وزەی خۆی بۆ ددان بەخۆدا گرتن بەکار خستووە. حاڵەتی روخساری سەرەڕای ئەو تەمی دڵڕەقییەی دایگرتبوو، نیشاندەری ئازارێکی قووڵیش بوو، هەر ئەو ئازارەش بوو کیتیی وا لێکردبوو دڵی پێیبسووتێ. چەنە و لێوی دەلەرزین و بە دەنگێکی گڕ و تووڕەوە گوتی: تۆ دەبێ تێبگەی کە من دڵپیس نیم. چونکە ئەوە وشەیەکی قێزەونە. من ناتوانم دڵپیسیت لێبکەم و دڵم لێت کرمۆڵ بێت کە... من ناتوانم بڵێم کە چ هەستێك لە دڵمدایە، بەڵام دەزانم زۆر ترسناکە. من دڵپیسی ناکەم بەڵام هەست بە سووکایەتی و بێحورمەتی دەکەم کە کەسێك رووهەڵماڵدراوانە پێیوابێ کە تۆ... یان بەو چاوە لە تۆ...

کیتی، کە هەوڵی دەدا هەتا ئەو جێیەی دەتوانێ لە رووی ویژدانەوە ئەوەی ئەو شەوە گوترابوو یان هەڵسوکەوتێك رووی دابوو، هەموو بارێکی بە وردی وەبیر خۆی بهێنێتەوە گوتی: بەڵام ئاخر کام چاو؟...

کیتی لە قووڵاییی دڵیدا هەستی دەکرد راست لەو کاتەدا کە ڤاسنکا لە جێی خۆی هەستاوە و بەدوای ئەودا چووە بۆ ئەوسەری مێزەکە، دەبێ کارەکەی ناحەز بووبێت و لەڤین بەوە دڵی گەردی گرتووە، بەڵام نەیدەوێرا ئەو شتە تەنانەت لەلای خۆشی بدرکێنێ، چبگا بەوەی بە مێردەکەی بڵێت و برینەکەی بکولێنێتەوە.

ـ بەم بارودۆخەوە کە من هەمە چ شتێکم دەبێ لەبەر چاوی کەسێك هەوەسبزوێن بێ؟

لەڤین بە هەردوو دەستی سەری خۆی گرت و گوڕاندی: ئاه، دەبوو هەر هیچ نەڵێی... ئەوە قسەیە؟ یانی ئەگەر هەوەسبزوێن بوایەی...

کیتی بە چاوێکی پڕ لە دڵسۆزییەوە تێیڕوانی و گوتی: نا، کۆسیتا، پەلە مەکە، تۆ گوێ بگرە، نازانم تۆ چۆن بیردەکەیتەوە. لە جێیەك کە بۆ من هیچ پیاوێك بوونی نییە و جگە لە تۆ کەس بە پیاو نازانم! دەتەوێ، دەتەوێ ئیتر چاوم بە هیچ کەس نەکەوێ؟

ئەم خانەگومانییەی مێردەکەی سەرەتا زۆر پڕئازار بوو بۆی. لەوە دڵگران بوو کە لە چکۆلەترین و هەژارانەترین رابواردن بێبەشە، بەڵام ئێستا بە دڵ حەزی دەکرد نەك لە چکۆلەترین رابواردنی وەك ئەمە بەڵکوو لە هەموو شتێك چاوپۆشی بکات بۆ ئەوەی هێمنایەتی و دڵنیابوونی مێردەکەی دابین بکات و لەو رەنج و دڵەوڕێزەیە رزگاری بکات کە ئاوا ئازاری دەدات.

لەڤین بە دەنگێکی هێواش کە نیشاندەری داماوی بوو گوتی: هەوڵ بدە تێبگەی. ئەو کارێکی وای نەکردووە کە بەڕاستی بە کارێکی نەشیاوی بزانین جگە لەوەی کە لە ماڵەکەی مندا رووهەڵماڵدراوانە ئیجازە بە خۆی دەدات کە ئاوا خۆمانە هەڵسوکەوت بکات و وەك ماڵی خۆیان لاقی لەژێر خۆیدا کۆ بکاتەوە. من هەر ئەوەم زۆر پێناحەز و بێئەدەبانە بوو. ئەو ئەم کارەی خۆی بەوپەڕی دڵۆڤانی دەزانێ و من ناچارم لەگەڵی مێهرەبان بم.

کیتی، لەو خانەگومانییەی مێردەکەیدا ئەشق و خۆشەویستیی خۆی دەدی و لە ناخی دڵەوە چێژی لێوەردەگرت، گوتی: بەڵام کۆسیتا تۆ زۆری گەورە دەکەیتەوە.

ـ نا، لە هەموو خراپتر ئەوەیە کە تۆ، تۆیەك کە هەمیشە و بەتایبەت ئێستا، بۆ من پیرۆزترین کەسی و ئێمەش زۆر بەختەوەرین و بەختەوەرییەکەشمان ئاوا بێوێنەیە، ئێستا ئەو بەرەڵڵایە... نا، بەرەڵڵا نا، بۆ لەخۆڕا جنێوی پێبدەم؟ جا من چکارم پێیداوە؟ بەڵام ئاخر بەختەوەریی من، بەختەوەریی تۆش...

کیتی گوتی: دەزانی چی، تێدەگەم بۆ ئاوای لێهات.

ـ بۆ؟ بۆ؟

ـ دیتم کاتی شێوخواردن کە ئێمە قسەمان دەکرد چۆنت چاو لێدەکردین.

لەڤین بە لەبزێکی شڵەژاوانە گوتی: ئەرێ، بەڵێ، بەڵێ!

کیتی بۆی گێڕایەوە کە باسی چییان کردووە. کاتی ئەو قسانە چۆن تووشی هەیەجان بووە و کەوتۆتە هەناسەبڕکێ. لەڤین تۆزێ بێدەنگ بوو، پاشان سەرنجی روخسارە شڵەژاو و رەنگەپەڕیوەکەی دا و لەناکاو بە هەردوو دەستی سەری خۆی گرت.

ـ کاتیا، من زۆرم ئازاردای، خۆشەویستی دڵەکەم، بمبوورە. ئەو کارەی من زۆر شێتانە بوو! کاتیا من زۆر تاوانبارم. ئاخر چۆن دەبێ ئاوا گەوجانە بیر بکەمەوە و خۆم ئازار بدەم؟

ـ نا، من دڵم پێتدەسووتێ.

ـ بۆ من؟ بۆ من؟ من کێم؟ شێتێك!... تۆ چ تاوانێکت کردووە؟ بیر لێکردنەوەشی ترسناکە، چۆن دەکرێ بێگانەیەك بتوانێ بەختەوەریی ئێمە تێکبدات.

ـ وایە، هەر ئەوەشە کە من ئازار دەدات.

لەڤین دەستی ماچکرد و گوتی: نا، ئێستا بە پێچەوانە، من ئەم هاوینە ناهێڵم بڕواتەوە و باری مێهرەبانییەکانی لەسەر شانی قورسایی بکات. جا دەیبینی. سبەینێ... بەڵێ، هەروایە سبەینێ دەڕۆین.

## هەشت

بەیانی ڕۆژی دوایی، ژنەکان هێشتا لە خەو هەڵنەستابوون کە فایتوونێك و عەڕابەیەك لەبەر پلیکانەکانی ماڵێدا ڕاگیرابوون و لاسکا کە بەیانی زوو زانیبووی دەچن بۆ ڕاو، لە خۆشیانا هێندە بەملاو بەولادا هەڵاتبوو و لووراندبووی ماندووبووبوو و لە پەنا فایتوونەوانەکەدا هەڵتووتەکابوو، زۆر بێئۆقرە و ناڕازی لە درەنگکەوتنی ئەربابەکەی چاوی لەو دەرگایە بڕیبوو کە ڕاوچییەکان لەوێوە دەهاتنە دەرێ. ڤاسنکا ڤسلۆڤسکی لە پێش هەموویانەوە هاتەدەرێ. جووتێ جزمەی ملدرێژ و تازەی لەبەردا بوو کە هەتا ڕانە قەڵەوەکانی هاتبوو و کورتەکێکی سەوزی لەبەردا بوو، قایشەکەی نێوقەدیشی بۆنی چەرمی لێدەهات و هەر ئەو کڵاوە سکاتلەندییەشی لەسەر نابوو کە لە دواوە تەنزیلی پێدا شۆڕکردبۆوە. تفەنگێکی تازەی ئینگلیزیی بە دەستەوە گرتبوو کە قایشی پێوە نەبوو. لاسکا لەسەر فایتوونەکە بازیدا خوارێ و هەڵات بۆ لای و بە زمانی سەگانەی خۆی دەیویست لێیبپرسێ ئەی ئەوانی دیکە بۆ نایەنە دەرێ؟ بەڵام چونکە هیچ وەڵامێکی نەبیست گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی و چاوەڕوان هەڵتووتەکا. دیسان سەری بۆ لای دەرگاکە سووڕاند و گوێی قووت کردەوە و جووڵەی لە خۆی بڕی. ئاخری دەرگاکە جیڕەی لێوە هەستا و کرایەوە و کراك، پۆینتێری[31] بەڵەك و قوتی ستیپان ئارکادیچ وەك تێسکەی تفەنگ دەپەڕی و دەستیکرد بە هەڵبەزدابەز و هەڵسووڕان بە دەوری خۆیدا. بەدوای ئەویشدا ستیپان ئارکادیچ، تفەنگ بە دەستەوە و جگەرە بە لێوەوە لە دەرگاکە هاتەدەرێ. ستیپان ئارکادیچ بە لەبزێکی لاوێنەرانە و بە دەنگێکی بەرز گوتی: ئارام بە ئارام کراك! سەگەکەشی بازیدا بەردەمی، هەستا سەرپاشوو و دەستی خۆی لەسەر سنگی خاوەنەکەی دانا، بەجۆرێك کە چڕنووکی لە قایشی جانتاکەی شانی گیرا.

---

٣١- پۆینتێر بە ئینگلیزی یانی نیشاندەر و لە زاراوەی ڕاویشدا، بە سەگێك دەڵێن کە زەبەلاح و وریا و جۆرێك ڕاهێنراوە کە کاتێك بۆنی نێچیر دەکات جۆرێك رادەوەستێ و ملی هەڵدێنێ کە لمبۆزی ڕاست شوێنی نێچیرەکە نیشان دەدات.

ستیپان ئارکادیچ جووتێك شەکالی قایشی لە پێدا بوو، پانتۆڵێکی دڕاوی لە پێ کردبوو و بەلەکپێچی لە لاقی توند کردبوو و کوڵە باڵتەیەکی لەبەردا بوو، کڵاوێکی کۆنیشی لەسەر نابوو، بەڵام تفەنگێکی ساز و بێوێنەی بە دەستەوە گرتبوو، کە هێندە جوان بوو چاو لە دیتنی نەدەبێزرا و فانووسقە و جانتای چەرمینی راوەکەشی ئەگەرچی کۆن بوو بەڵام ماڵەکەی زۆر چاك و کەم وێنە بوو.

ڤاسنکا ڤسلۆڤسکی هەتا ئەو رۆژە نەیدەزانی کە راوچییەکان ئاوا خۆیان تەیار دەکەن، یانی بە کەوش و جلوبەرگی کۆنەوە دێن بەڵام کەلوپەلی راوەکەیان گرانبایی و بێوێنە بوون. بەڵام کە چاوی لەو کەوشە شیرۆخوێنانەی ئابلۆنسکی دەکرد و قەڵافەتی ئەربابانە و روخساری گەشاوەی دەدی، کە نیشاندەری زگهانکیی ئەو بوو، تازە لەو خاڵە گەیشت و بڕیاریدا کە لەوە بەدواوە بەو شێوەیە خۆی بۆ راو تەیار بکات.

پرسیی: دەی، ئەی خانەخوێکەمان لە کوێیە؟

ستیپان ئارکادیچ بە پێکەنینەوە گوتی: پیاو ژنی جحێڵی هەبێ، تەکلیفی لەسەر نییە.

ـ ژنی جحێڵ، ئەویش ئاوا جوان!

ـ خۆ جلی لەبەرکردبوو و ئامادەبوو. حەتمەن چووە بۆ دواجار چاو لە ژنە جوانەکەی بکات.

ستیپان ئارکادیچ چاکی بۆچووبوو. لەڤین دیسان چووبوو بۆ لای ژنەکەی تاکوو جارێکی تر دڵنیا بێ کە کیتی لەو شێتییەی شەوی رابردووی خۆش بووە، هەروەها تکای لێبکات و لێیبپاڕێتەوە کە زیاتر ئاگای لە خۆی بێت و زۆر لەو منداڵانە نزیك نەبێتەوە نەکا خۆ بە زگیدا بدەن، چونکە منداڵ خوێنگەرم و هاروهاجن و خۆیان لە هیچ شتێك ناپارێزن. جگە لەوەش دەیویست دیسان خاترجەم بێ کە ژنەکەی دڵی لێیعاجز نییە کە دوو رۆژ بە تەنیا بەجێی دێڵێ و هەروەها تکای لێبکات کە هەرچۆنێکە سبەینێ، تەنانەت ئەگەر دوو وشەش بێت، بە پەیکێکی سوارەدا بۆی بنێرێ، تاکوو لە حاڵوباڵی ئاگاداربێت.

کیتی، وەك هەمیشە لەوەی کە دوو رۆژ لە مێردەکەی دووردەبوو زۆر ناڕەحەت بوو، بەڵام کە چاوی بەو قەڵافەتە گورج و بەهێزەی کەوت بەو باڵتە درێژ و چەکمەی راوچێتییەوە، لەبەر چاوی زۆر بەهێزی دەنواند، هەروەهاترووسکەی شادیی لە چاوانیدا دی کە دیاربوو زۆر تاسەمەندی راوە، بۆیە لە هەمبەر دڵشادی و نەشەی ئەودا خەم ودڵتەنگییەکانی خۆی لەبیرچۆوە و زۆر بە سەرورووخۆشی خوداحافیزیی لێکرد.

لەڤین بەپەلە لە دەرگای ماڵیٚ هاتەدەریٚ و لەبەر هەیوانی سەر پێپلیکانەکانەوە گوتی: داوای لێبوردن دەکەم بەڕێزان، نانی نێوەڕۆمان لە بیرنەچووە؟ بۆ ئەسپە بۆرەتان لەلای راستەوە تێکردووە؟ باشە، قەیناکا. لاسکا بازدە سەریٚ. لە جێی خۆت وەرکەوە.

دامبان کە لەبەر پلیکانەکاندا چاوەڕیٚ بوو تاکوو لەڤین بێتە دەریٚ و لێی بپرسیٚ بەرانە یەختەکراوەکان چ لیٚ بکات، گوتی بیانکە نێو بەرغەلەکەوە، ـ پاشان رووی لە میوانەکان کرد و گوتی: داوای لێبوردن دەکەم، دیسان مزاحیمێکی تر.

لەڤین سواری فایتوونەکە بوو، خەریکبوو دانیشیٚ کە دیسان چاوی بە دارتاشە پەیمانکارەکە کەوت خەریکە دێت بۆ لای قالدرمەکان بۆیە بازیدایەوە خواریٚ.

ـ دوێشەو نەهاتی بۆ نووسینگەکەم و ئێستا سەرودڵم دەگری و دەتەویٚ وەدرەنگمان بخەیت، دەبڵیٚ بزانم چیت دەویٚ؟

ـ ئێجازە دەفەرمووی پێگوڕکەیەکی تر بە قالدرمەکان زیاد بکەین. تەنیا سیٚ پلیکان زیاد دەکەین بەلام بەجێی ئەوە زۆر خۆش و راحەتتر دەبن بۆ پێداسەرکەوتن.

لەڤین بە تووڕەیی گوتی: تۆ دەبوو ئەو قسەی پێمگوتی لە گوێت بگرتبایە. پێمگوتی سەرەتا دەستەکە لاتیلەکان بخەجیٚ پاشان پلیکانەکان دانیٚ. ئەو کارەت نەکرد بۆیە ئێستا بە دەستییەوە داماوی. هەر ئەو کارەی پێمگوتی بیکە. ئەوە تێکبدەوە و پلیکانێکی تر هەڵبەستە.

بڕیار وابوو ئەو پەیمانکارە باڵەخانەیەکی تر بە پاڵ باڵەخانە کۆنەکەوە ساز بکات و نەیدەتوانی پلیکانەکان بە جوانی هەڵبەستیٚ. تیرەکەکانی بەجیا بڕیبوو و حسابی لاتیل بوونەکەی نەکردبوو، بۆیە کاتی دانانی پلیکانەکان کورتیی دەهێنا و پلیکانەکان زۆر رژد دەبوون. ئێستا دەیویست هەروا بە خواروخێچی دایبنیٚ و بە خەیاڵی خۆی بە پێگۆڕکەیەك و سیٚ پلیکان ئەو رژدی و خواروخێچییەی چاك بکات.

ـ زۆر باشتر دەبیٚ قوربان.

ـ بیرت لێکردۆتەوە ئەگەر سیٚ پلیکانی پێزیاد بکەی دەگاتە کویٚ؟

پەیمانکار بە بزەیەکەوە و وەك ئەوەی ئاقڵێك گەوجێك بدوێنیٚ گوتی: بە سەدەقەت بم، راست دەگاتە پێگۆڕکەکەـ پاشان بە قسەیەك وەك ئەوەی بیهەویٚ ئەربابەکەی لە مەسەلەیەکی سادە تێبگەیێنیٚ، گوتیشی: پللە، بەپللە دەڕواتە سەریٚ هەتا دەگاتە لێواری پێگۆڕکەکە.

ـ ئاخر ئاوا دەبیٚ بێتە پێشیٚ دەنا هێندە رژد دەبیٚ کەس ناتوانیٚ هاتوچۆی بەسەدا بکات. حیسابی ئەوەت کردووە هەتا کویٚ دەڕوات؟

دارتاش منجرانە دووپاتی کردەوە: باشە، وایە. بەڵام لە خوارەوە پللە بە پللە دەکێشیتە دواوە هەتا دەگاتەوە سەرجێی خۆی.

ـ دەگاتە نێوقەدی دیوارەکە و ژێر میچەکە.

ـ ئاخەر بە قوربانت بم لەم خوارەوە حسابی بکە، دێتە پێشیّ و دێتە پێشیّ تا دەگاتە جێی خۆی، یانی لێواری پێگۆڕکەکە.

لەڤین شیشی تفەنگەکەی دەرکێشا و لەسەر عەرزەکە شکڵی پلیکانەکەی کێشایەوە و بۆی روونکردەوە.

ـ ئێستا تێگەیشتی؟

دارتاش لە ناکاو چاوانی بریقەی لێهەستا. دیاربوو ئاخری لە کێشەکە گەیشتبوو. گوتی: هەرچۆنێك بفەرموون. وادیارە ناچارین سەرلەنویّ پلیکانێکی تر ساز بکەین.

لەڤین گوڕاندی: ئێستا ئەو جۆرەی کە لە پێشدا پێمگوتبووی دروستی بکە ـ لەسەر فایتوونەکە دانیشت و گوتی: وەڕێکەوە. فیلیپ ئاگات لەو سەگانە بێت.

لەڤین ئێستا کێشە و گرفتەکانی بنەماڵە و دەردەسەریی ملکەکەی لە کۆڵ کەوتبوو، بۆیە شایی لە دڵی دەگەڕا و ئەوەندە دڵخۆش بوو لە خۆشیانا قسەی بۆ نەدەهات. جگە لەوەش هەیەجانێکی شیرین ئۆقرەی لێهەڵگرتبوو کە هەموو راوچییەکان کاتێك لە راوگە نزیك دەبنەوە ئاوا دڵ و گیانیان دادەگریّ.

تەنیا بیری لەوە دەکردەوە کە زەلکاوی کالپینکی بڵێی نێچیری لێبیّ؟ یان لاسکا و کراك بڵێی بتوانن ئابڕوویان بکڕنەوە؟ یان بڵێی خۆی بتوانیّ نێچیرێك بنگێویّ؟ هێندیّ جاریش ئاواتەخوازی ئەوەبوو کە لەلای ئەو کوڕە غەوارەیە ئابڕووی نەچێت و ئابلۆنسکی لە راودا دەستی لێنەستێنیّ.

ئابلۆنسکیش هەروابوو. ئەویش تاقەتی قسەکردنی نەبوو. تەنیا ڤاسنکا ڤسلۆڤسکی بوو کە بەردەوام قسەی دەکرد و قاقای دەکێشا. لەڤین کە گوێی بۆ قسەکانی دەگرت و وەبیری دەهاتەوە کە شەوی رابردوو چەندە دەرهەق بەو کوڕە بێئینساف بووە و لە خۆی و فیکرەکانی خۆی شەرمەزار دەبوو. ڤاسنکا بەڕاستی کوڕێکی باش بوو، ساکار و دڵپاك و سەروڕووخۆش بوو. لەڤین ئەگەر لە زەمانی سەڵتیدا بیناسیبایە حەتمەن لەگەڵی دەبووە دەستەبرا. هەڵسوکەوتی زۆر ساویلکانە و پێبەند بوون بە چێژ و خۆشییەکانی ژیان و ئاکاری لە رادەبەدەر خۆمانەی ئەوی بەدڵ نەبوو کە تایبەت بە دەمرووت و پۆپۆلییەکانی ئەو رۆژگارە بوو. دەتگوت ئەو نینۆخە درێژانە و کڵاوە سکاتلەندییەکەی و لەشولارە سەیروسەمەرەکەی خۆی بە دیاردەی ئەمرۆیی بوون و تەشەخوش دەزانیّ. بەڵام کە روحسووکی و دڵپاکییەکەی دەدی،

هەموو ئەوانەی لە بیردەچۆوە. عاملاندنی باش و زاراوە و دەموراوێژی کاتێك بە فەڕەنسی و ئینگلیزی قسەی دەکرد کە ئەو دوو زمانە تایبەتی کۆمەڵگای خانەدان و نەجیمزادانی خوێندەوار بوون، بووبووە هۆی ئەوەیکە لە دڵیدا جێی خۆی بکاتەوە.

ڤاسنکا ئەو ئەسپە دەشتەکییە دۆنرەگەزەی کەوتبووە بەردڵ کە لەلای چەپی فایتوونەکەوە خامووتی لە مل کرابوو و بەجارێ شەیدای بووبوو.

گوتی: سواری بەو ئەسپە دەشتەکییە و غاردان بەو دەشتەدا یەکجار خۆشە، وانییە؟

لە خەیاڵی ئەودا جلیتێن بەو ئەسپە دەشتەکییە زۆر خۆش و شاعیرانە بوو. بەڵام ساویلکەییی ئەو، بەتایبەت کاتێك کە لەگەڵ جوانیی روخسار و بزەی شیرین و ئاکاری نەرمونیانی یەك دەکەوت زۆر لە دڵەوە نزیکبوو. جا ئێستا بە هۆی وێکچوونی سروشتییان بوو، یان بە هۆی ئەوەبوو کە لەڤین هەوڵی دەدا ئەو دڵڕەقییەی شەوی پێشووی دەرهەق بە ئەو قەرەبوو بکاتەوە و هەر بەو هۆیەش هەموو شتێکی ئەوی بە باش و دڵگر دەزانی، لێشی روون بوو کە هاوڕێبوون لەگەڵیدا خۆش و چێژبەخشە.

نزیکەی سیوێرست رۆیشتبوون کە لە ناکاو ڤسلۆڤسکی بۆیدەرکەوت قوتووی جگەرەی بەرگ و جزدانی پارەکەی پێنییە. نەشیدەزانی لە رێگا ونی کردووە یان لەسەر مێزی ماڵێ لێیبەجێماوە. سێسەد و حەفتا رۆبڵی لە جزدانەکەیدا بوو و نەیدەتوانی چاوپۆشی لێبکات.

گوتی: دەزانی لەڤین، من پێم خۆشە بەو ئەسپە دۆنرەگەزەی ئێوە هەتا ماڵێ بچمەوە و بە پڕتاو دەگەڕێمەوە. چونکە دەزانم زۆر ئەسپسوارییەکی خۆش دەبێ ـ هەر خێراش راستەوەبوو دابەزێ.

لەڤین لە دڵی خۆیدا حسابی کرد کە کێشی ڤاسنکا لانیکەم شەش پوود[32] دەبێت و گوتی: نا، تو بۆ؟ فایتوونەوانەکە دەنێرم.

فایتوونەوان بە سواری ئەسپەکە گەڕایەوە بۆ ماڵێ و لەڤین خۆی لێخوڕینی فایتوونەکەی وەئەستۆ گرت.

---

٣٢ نزیکەی سەد کیلۆ.

# نۆ

ستیپان ئارکادیچ گوتی: دەی ئێستا بۆمان روون بکەوە دەبێ بە کاملادا برۆین.

ـ بەرنامەی سەفەرەکەمان ئەمەیە. لە پێشدا دەچین بۆ گڤۆزدێڤۆ[33]. زەلکاوەکەی ئەم لای گڤۆزدێڤۆ رەنگە چەند پۆر و سوێسکەی لێبێ. بەڵام زەلکاوەکەی ئەولای زۆری پۆر لێیە و هەروەها پڕیشە لە زیقاوڵە. ئێستا هەوا گەرمە و ئێمە لای ئێوارە دەگەینێ. هەتا ئەوێ بیست وێرست رێگامان لەبەرە. ئێوارە هێندێ راو دەکەین و شەوێ لەوێ دەمێنینەوە. راوی سەرەکیمان دەمێنێتەوە بۆ سبەینێ لە زەلکاوی گەورە.

ـ لە رێگا چی، هیچمان وەگیر ناکەوێ؟

ـ هەیە، بەڵام کاتەکەمان بەفیڕۆ دەچێ. هەواکەی گەرمە. دوو جێگا هەیە کە خراپ نییە بەڵام باوەڕ ناکەم شتێکی بەرچاومان وەگیر بکەوێت.

لەڤین خۆشی حەزی دەکرد سەرێك لەو راوگە چکۆڵانەش بدات، بەڵام ئەوانە لەگەڵماڵێ مەودایەکی ئەوتۆیان نەبوو و هەمیشە دەیتوانی بچێت و لەلایەکیشەوە ئەو راوگە چکۆڵانانە بۆ سێ راوچی لەبار و گونجاو نەبوون. بۆیە راستییەکەی وەلانا و گوتی کە ئەوێ شتێکی ئەوتۆی لێنییە. کە گەیشتنە زەلکاوێکی چکۆڵە لەڤین دەیویست بەلایدا تێپەڕن، بەڵام چاوانی وردبینی ستیپان ئارکادیچ کە راوچییەکی لەزەبر بوو، چاوی بە لایەکی کەوت کە لەسەر رێگاکەوە دیاربوو. تێگەیشت کە دەبێ راوگەی چاك بێ.

زەلکاوە چکۆڵەکەی نیشان دان و گوتی: سەرێك لەوێ نەدەین؟

ڤاسنکا ڤسلۆڤسکی کەوتە تکاو پاڕانەوە: لەڤین، تکات لێدەکەم، با بچین، نەتدیوە چەند جێی چاکە! لەڤینیش نەیتوانی رازی نەبێت.

هێشتا بە تەواوی دانەبەزیبوون کە سەگەکان بە پڕتاو هەڵاتن بۆ لای زەلکاوەکە.

33- Gvozdevo

ـ كراك! لاسكا!...

سەگەکان گەڕانەوە.

لەڤین کە دڵنیابوو جگە لەو چەند ڕەشبەشە کە لە ترسی کراك و لاسکا لەنێو گیا و دەوەنەکان دەرپەڕیبوون و بە حەواوە دەسووڕانەوە و زیقە و قیڕەیان ئەوناوەی داگرتبوو، هیچی تری لێنییە، گوتی: ئێرە بۆ سێ کەس جێگا نییە. من لێرە دەبم، ئێوە بچن.

ڤسلۆڤسکی گوتی: نا، لەڤین، وەرە با بچین، پێکەوە خۆشە.

ـ نا، بەڕاستیمە، زۆر چکۆڵەیە بۆ سێ کەس نابێ. لاسکا، بگەڕێوە. ئێوە خۆ دوو سەگتان ناوێ.

لەڤین لەلای فایتوونەکە راوەستابوو و بە ئێرەییەوە چاوی لە راوچییەکان دەکرد. ئەوان تەواوی زەلکاوەکە گەڕان جگە لە چەند ڕەشبەشە کە ڤاسنکا یەکیانی پێکا، هیچی تریان نەدۆزییەوە.

لەڤین گوتی: پێمنەگوتن؟ خۆ من خەمی زەلکاوەکەم نەبوو، ئەوە تەنیا کات بەفیڕۆدانە.

ڤاسنکا ڤسلۆڤسکی، کە تفەنگ و نێچیرەکەی بە دەستەوە گرتبوو، بە زەحمەت سواری فایتوونەکە بۆوە گوتی: ناخۆش نەبوو. دیتان چۆنم ئەمە پێکا؟ دەی، ئێستا کەنگێ دەگەینە راوگە حیسابییەکە؟

تەقەی تفەنگێك هات، ئەسپەکان لەناکاو سڵەمینەوە و لەڤین سەری لە قۆنداغی تفەنگەکەی درا. گوللەی یەکەم تەقیبوو و لەڤین وایبۆچوو کە دەبێ ڤاسنکا ڤسلۆڤسکی لەگەڵ ئەوەی ویستبووی هەردوو زامنی تفەنگەکەی بخەوێنێ، قامکی بە پەلەپیتکەکەیدا نابێ کە هێشتا زامن نەکرابوو، بۆیە تیرەکەی لەدەست دەرچووبوو لەبەردەمی خۆی دابوو، بەوەش باشبوو کەسی بریندار نەکرد. ستیپان ئارکادیچ سەری راوەشاند و وەك سەرکۆنەکردن پێیپێکەنی. بەڵام لەڤین ئیجازەی بە خۆی نەدا سەرکۆنەی بکات. چونکە سەرکۆنە کردن لەلایەن ئەوەوە وایدەنواند کە بە هۆی مەترسییەکەوە بووە کە لێی دەربازبووە و نێوچاوانی تۆزێ هەڵتۆقیوە. ڤسلۆڤسکیش هێندە ساویلکانە بۆ ئەو کارەی خۆی بە داخەوە بوو و پاشانیش هێندە سادقانە دەستیکرد بە پێکەنین کە تووشی ئەو هەڵە بووە و پێکەنینەکەشی ئەوەندە گیرۆ بوو کە لەڤین نەیتوانی دان بەخۆیدا بگرێت و پێنەکەنێ.

کاتێك گەیشتنە زەلکاوی دووهەم کە گەورەتر بوو و کاتی زیاتری دەویست لەڤین هەوڵیدا دیسان پێیان بسەلمێنێ کە دانەبەزن بەڵام ڤسلۆڤسکی دیسان دەستیکرد بە تکاو پاڕانەوە و پێملی کرد. ئەمجارەش چونکە زەلکاوەکە چکۆڵە بوو لەڤین وەك خانەخوێیەکی میواندۆست لەلای فایتوونەکە مایەوە.

لەگەڵ گەیشتنە نزیك زەلكاوەكە كراك دەرپەڕی و غاریدا بۆ لای بنچكەكان. ڤسلۆڤسكی كەوتە پێشەوە و بەدوای سەگەكەدا هەڵات. ستیپان ئاركادیچ هێشتا پێینەگەیشتبۆوە كە پۆڕێك هەڵفڕی. ڤسلۆڤسكی تەقەی لێكرد بەڵام نەیپێكا و پۆڕەكە لەولاترەوە لەنێو گیاوگژە چڕوپڕەكەدا نیشتەوە. ئەو پۆڕەیان بۆ ڤسلۆڤسكی بەجێ هێشت. كراك دیسان دۆزییەوە و بەرانبەری راوەستا و ڤسلۆڤسكی ئەویشی ئەنگاوت و گەڕایەوە بۆ لای فایتوونەكە، بە لەڤینی گوت: ئێستا تۆ بچۆ من ئاگام لە ئەسپەكان دەبێ.

جۆرێك ئێرەیی دڵی لەڤینی داگرت. هەوساری ئەسپەكانی دایەدەست ڤسلۆڤسكی و رویشت بۆ لای زەلكاوەكە.

لاسكا ماوەیەك دەیلووراند و دیاربوو لە دەستی ئەو زوڵمە دەینالاند كە لێیكرابوو. كە دیتی خاوەنەكەی داگەڕا بۆ لای زەلكاوەكە ئەویش بە پرتاو رۆیشت بۆ بەشێكی پڕدەوەن و چڕوپڕ كە وێدەچوو نێچیری لێبێت و لەڤین ئەو شوێنەی دەزانی و كراك هێشتا لێینزیك نەبووبۆوە.

ستیپان ئاركادیچ دەنگی هەڵبڕی: مەهێڵە، ئەوە بۆ بەرەڵڵات كردووە؟

لەڤین بە دیتنی سەگەكەی شادی لە دڵی گەڕا و بە دوایدا هەڵات، گوتی: ئەوەی دیكە هەڵیان ناستێنێ.

هەرچەندی لاسكا زیاتر لە دەوەن و چڕگەنەكە نزیك دەبۆوە تامەزرۆییی دۆزینەوەی نێچیر زیاتر گیانی دادەگرت. لە پشت ئاڤزێڵەكەوە ماسیگرەیەك كتوپڕ هەڵفڕی و سەرنجی لە شوێنی مەبەستەكە كلا بوو. جارێك بەرەوڕووی دەوەنەكان سووڕا و خەریكبوو دەوری دووهەم لێدا لە ناكاو خۆی راتەكاند و بێجوولە راوەستا.

لەڤین گوڕاندی: وەرە، وەرە ستیڤا! ـ هەستی دەكرد كە لێدانی دڵی خەریكە توندتر دەبێت، وەك ئەوە وابوو كە كتوپڕ لە بەینی گوێچكە قوتەكانیدا دەروویەك كرابێتەوە و ئەو توانایی ئەوەی نەبێت بزانێ مەوداكەی چەندەیە و دەنگەكان هەموویان بە نارێكوپێكی بەڵام بە روونی شوێن لەسەر هەستی دادەنێن. تەپوكوتی هەنگاونانی ستیپان ئاركادیچی دەبیست و پێیوابوو زرموكوتی پێی ئەسپە لە دوورەوە دێ. دەنگێكی وشكی بیست و لێواری وشكی كەندەڵانێك بە ریشەكانییەوە لە ژێر پێیدا لەبەریەك بچڕاو دادڕووخا. ئەو پێیوابوو شەقەی باڵی پۆڕە كە هەڵفڕیوە و لە پشت سەریشییەوە شڵپەشڵپێكی نائاشنای بیست كە نەیدەتوانی وەبیر خۆی بهێنێتەوە شپڵەی چییە.

زۆر بە پارێزەوە چوو بۆ لای سەگەکە.

ـ بیگرە.

پۆڕ نەبوو، بەڵکوو زیقاوڵەیەك بوو کە لە ترسی سەگەکە هەڵفڕی. لەڤین سێرەی لێگرت بەڵام راست لەوکاتەدا کە خەریکبوو قامك بە پەلەپیتکەدا بنێ شڵپو هۆڕەکە زیاتر بەرزبۆوە و لەگەڵ ئەویشدا ڤسلۆڤسکی دەنگی هات کە بە شێوەیەکی نائاسایی هاواری دەکرد و شتێکی دەگوت، لەڤین دیتی کە لە دواوە سێرەی لە زیقاوڵەکە گرتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گوللەکەی تەقاند. کە زانیی نەیپێکاوە، چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد و دیتی ئەسپەکان و فایتوونەکە لەسەر جادەکە نەماون، بەڵکوو چوونەتە نێو زەلکاوەکەوە و تێچەقیون.

ڤسلۆڤسکی ویستبووی چاو لە دەست و تفەنگیان بکات و بە فایتوونەکە هێندێ لە زەلکاوەکە نزیکبووبۆوە و تێچەقیبوو.

لەڤین لە ژێر لێوەوە گوتی: «نەحلەت لە شەیتان کە ئەوەی نارد!» پاشان گەڕایەوە بۆ لای فایتوونەکە کە لە زەلکاوەکە چەقیبوو، بە تووڕەیی بە ڤسلۆڤسکیی گوت: ئاخر تۆ بۆ هاتی بۆ ئەم لایەوە؟ ـ هەرای لە فایتوونەوانەکە کرد کە تازە گەڕابۆوە و قوتووی جگەرە و جزدانەکەی ڤسلۆڤسکیی هێنابوو و دەستیان کرد بە دەرکێشانی ئەسپەکان.

لەوەش رقی هەستابوو کە مزاحیمی تەقەکردنەکەی بووبوون و ئەسپەکانیشیان بەرەڵلای نێو ئەو زۆنگە کردبوو و تێچەقیبوون، لە هەموو ئەوانەش زیاتر دەرهێنانەوەی ئەسپەکان رقی هەستاندبوو کە دەبوو بیانکاتەوە و ستیپان ئارکادیچ و ڤسلۆڤسکی هیچ کامیان یارمەتیی ئەو و فایتوونەوانەکەیان نەدەدا. چونکە هیچ زانیارییەکیان سەبارەت بە خامووتی ئەسپەکان و کردنەوە و بەستنەوەی نەبوو. ڤسلۆڤسکی سوێندی دەخوارد کە زەوییەکە ویشك و برینگ بوو، بەڵام لەڤین سەرقاڵی کاری خۆی بوو و لەگەڵ فایتوونەوانەکە هەوڵیان دەدا ئەسپەکان بێننەوە دەرێ و هیچ وەڵامێکی پێنەدەدایەوە و گوێی بۆ نەدەگرت. بەڵام دواتر کە بە هۆی هەوڵدانەوە گەرم داهات دیتی ڤسلۆڤسکی پاشکۆی فایتوونەکەی گرتووە و بەهێز و قەوەتی خۆی دەیکێشێ، ئەوەندەش بەگوڕ و تینەوە دەیکێشا کە هێنایە دەرێ. لەڤین لە دڵی خۆیدا خۆی سەرکۆنە کرد کە بە هۆی خەیاڵی شەوی رابردووەوە ساردوسڕانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردووە و هەوڵیدا بە رووخۆشی و مۆڤەتی زۆر ئەو ساردوسڕییە قەرەبوو بکاتەوە. کاتێك هەموو شتێك هاتەوە سەرباری خۆی و فایتوون و عارەبانە هەردووکیان لەسەر جادەکە ئامادەی وەڕێکەوتن بوون، لەڤین دەستووریدا فراوێن بێنن.

ڤسلۆڤسکی دیسان گوربزە و کەیفخۆشییەکەی گوڵی کردبوو. قرتەی لە مریشکی دووهەمیش بڕی و بۆ قسەی خۆش و حەنەکبێژی پەندێکی فەڕەنسیی هێنایەوە و گوتی: ***ئیشتیای باش و ویژدانی ئاسوودە،*** ئەو مریشکەم بەردڵ کەوت، چاکە ئیتر بەدبەختییەکانمان تەواوبوون، ئێستا ئیتر کارەکانمان بە خۆشی و باشی دەچنە پێشێ. بەڵام ئێستا من بۆ قەرەبووی خەتاکانم دەبێ لە جیگای لێخوڕەکە دانیشم. وانییە؟ ـ کە لەڤین پێیگوت لێگەڕێ با فایتوونەوان کاری خۆی بکات، هەوسارەکەی بەرنەدا و وەڵامی دایەوە: نا، نا، زۆر زۆر لێخوڕی چاکم، شا فایتوونەوانی واچاکی نییە! جا بزانن ئەوەندە بە نەرمی لێیدەخوڕم وەبزانن لەسەر تەختی ڕەوان دانیشتوون! نا، من دەبێ خەتاکانی خۆم قەرەبوو بکەمەوە، زۆر جێگای فایتوونەوانم پێخۆشە ـ ئەوەی گوت و وەڕێ کەوت.

لەڤین دەترسا ئەسپەکان ئازار بدات و ماندوویان بکات، بەتایبەت کۆتەڵی لای چەپ کە لێخوڕینەکەی زۆر دژوار بوو. بەڵام ناچار پێملی نەشە و شادییەکانی بوو و گوێی بۆ گۆرانی و نەقڵەکانی ڤسلوڤسکی شل کرد کە لە ماوەی ڕێگادا بەردەوام دەیگوت و دەیگێڕایەوە، لە شانۆی لێخوڕینی شێوەی ئینگلیزیانی دەڕوانی کە فایتوونێکی ***چوارئەسپە*** بوو. دوای فراوێن هەمووان شاد و سەرخۆش گەیشتنە زەلکاوی گڤۆزدیڤۆ.

## دە

ڤاسنکا ئەسپەکانی هێندە بە پڕتاو لێدەخوڕی کە زۆر زووتر لەو کاتەی چاوەڕوانییان دەکرد گەیشتن. بەجۆرێك کە هێشتا هەوا گەرم بوو.

کە گەیشتنە ئەو زەلکاوەی کە ڕاوگەیەکی باش و ئامانجی سەرەکییان بوو، لەڤین نەخوازراوانە لە فیکری ئەوەدابوو کە چۆن خۆی لە چنگ ڤاسنکا ڕزگار بکات و بتوانێ بەبێ کۆسپ و مێملێ دەستبکات بە ڕاو کردن. دیاربوو ستیپان ئارکادیچیش هەر ئەو خواستەی هەیە و لەڤین شوێنەواری ئەو نیگەرانی و دڵەوڕێزەیەی لە ڕوخساریدا بەدی کرد کە هەمیشە بەر لە دەستپێکردنی ڕاو لە ڕوخساری ڕاوچیی ڕاستەقینەدا دەبیندرێ و لەگەڵ فیلێکی ساویلکانە کە تایبەتی خۆی بوو ئاوێتە بووبوو.

ـ دەی، دەبێ چ بکەین؟ ئەم زەجاوە وادیارە زۆر راوگەی چاکە. چاو لەو باشووانە بکەن! ـ ئەوەی گوت و ئاماژەی بەو دوو باشووە کرد کە بەسەر دارە سمڵەکانەوە دەسووڕانەوە و گوتیشی: هەرشوێنێك باشووی لێبێ حەتمەن زۆری نێچیر لێیە.

لەڤین بە نێوچاوانێکی گرژەوە چەکمەکانی لەپێ کرد و لەگەڵ ئەوەی چاوی لە چەخماخی تفەنگەکەی دەکرد گوتی: دیتووتانە هاوڕێیان ـ پەڵەیەکی سەوزی تۆخی لەنێو سەوزەڵانییە بەرفرەوانە نیوەدووراوەکەدا نیشان دان کە لەلای راستی رۆخی رووبارەکە هەڵکەوتبوو و گوتی: ئەو دارسۆتەکەتان دیوە؟ زەلکاوەکە لەوێوە دەست پێدەکات، راست لە رووبەڕوومانەوە، دیتووتانە. ئەو جێیەی کە لەو بەشانەی تر سەوزترە. لێرەوە دەڕوا هەتا دەگاتە لای ئەسپەکان. پەنا دەوەن و کەندەڵان و گیاسندەکان دەبێ زیقاوڵەی لێبێ. دەورانده‌وری دارەکە و نێو دەوەنەکان و هەتا دەگاتە لای ئاشەکەش. هۆوێتان دیتووە، ئەو لاوەچە چکۆڵە، ئەوێ زۆر چاکترە. جارێکیان لەوێ حەڤدە دانە زیقاوڵەم راو کرد. ئێمە دوو سەگمان پێیە و لێرەوە بە دوولادا دەڕۆین و لێك جیا دەبینەوە و لەلای دیواری ئاشەکە یەکدەگرینەوە.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: دەی کێ بەلای راستدا دەڕوات و کێ بەلای چەپدا؟ لای راست بەربڵاوترە. ئەو دادەنێم بۆ ئەو دووانەتان، منیش بەلای چەپدا دەڕۆم. ـ ئەو قسەیەشی ئەوەندە ساکارانە دەربڕی کە دەتگوت هیچ خەیاڵێکی لەسەردا نییە.

ڤاسنکا قسەکەی ستیڤای بە دڵ بوو، گوتی: زۆر باشە! لێی دەبەینەوە. با بڕۆین، با بڕۆین!

لەڤین چاری نەبوو جگە لەوەی رازی بێت. وەڕێ کەوتن.

کە گەیشتنە قەراغ زەجاوەکە، سەگەکان بە ملومۆکردن بەرەو شوێنێك ملیان پێوەنا کە گڵەکەی زەردێکی مەیلەو سوور بوو. لەڤین لەگەڵ شێوەی گەڕان و مڵومۆی لاسکا ئاشنابوو کە زۆر بە پارێز و دڕدۆنگییەوە دەڕۆیشتە پێشێ. بۆیە ساتبە سات چاوەڕێ بوو پۆلێك زیقاوڵە هەڵفڕێنێ.

لەڤین بە دەنگێکی هێواش وەك ئەوەی سرتە بکات، بە هاوڕێکەی گوت: ڤسلۆڤسکی، وەرە بۆ لای منەوە، وەرە بۆ ئێرەوە ـ ڤسلۆڤسکی بە دوایدا دەهات و کە بە نێو زەجاوەکەدا دەڕۆیشت زڵچەزڵچی چەکمەکانی دەهات، چونکە دوای ئەو گوللەی کە لە کاسپێنکی لە دەستی دەرچوو لەڤین بێ ئیختیار پارێزی لە ئاستی لوولەی تفەنگەکەی ڤسلۆڤسکی دەکرد و تارادەیەك لێیدەترسا.

ـ نا، نامەوێ بەردەستت بگرم. تۆ چۆنت پێخۆشە بڕۆ، خەمی منت نەبێ.

ـ بەڵام، لەڤین نەخوازراوانە بیری لێدەکردەوە و قسەکەی کیتی وەبیردەهاتەوە کە کاتی خوداحافیزی پێیگوتبوو «وریا بن گوللەتان لە دەست دەرنەچێت و یەکتر بپێکن.» سەگەکان هەرکام بە شوێنی خۆیدا و بە مڵومۆکردن و تلماسانەوە لە نێچیرەکە نزیك دەبوونەوە. لەڤین هێندە گوێقولاغ و لەسەر هەست بوو کە هێندێ جار زڵچەی ژێر پاژنەی خۆی لێدەبووە فڕەی باڵی زیقاوڵە و تفەنگەکەی ئامادە راگرتبوو و بە دەستی توند قۆنداغەکەی گرتبوو.

تەتەق، تەتەق! شریخەی تفەنگ بوو کە لە پشتسەری لەڤینەوە بێدەنگیی پانتای زەلکاوەکەی شڵەژاند. ڤاسنکا بوو تەقەی لە پۆڵە مراوییە کێوییەك دەکرد کە زۆر دوور بەسەر زەلکاوەکەدا دەسوورانەوە، کە بەرەولای ئەوان دەهاتن و گوللەیان نەدەگەیشتێ. لەڤین هێشتا ئاوڕی نەدابۆوە کە زیقەی زیقاوڵەیەکی بیست و پاشان دووهەمی و سێهەمی و پاشان هەشتدانەی تر یەك لە دوای یەك لە شەقەی باڵیاندا.

ستیپان ئارکادیچ لەڕێوە و هەر لەوکاتەدا کە دەیویست بە باڵلێدان بەرزبێتەوە یەکیانی پێکا و باڵندەکە وەك کڵۆیەك تەپەی هات و کەوتە سەر سینگی تەڕی زەلکاوەکە. ئابلۆنسکی لەسەرەخۆ سێرەی لە زیقاوڵەیەکی تر گرت کە زۆر نەوی دەفڕی و بەرەولای دارسۆتەکەکە دەڕۆیشت، ئەو باڵندەیەش راست لەگەڵ تەقەی تفەنگەکە کەوتە خوارێ و دیتیان کە بە باڵەپڕژێ و بە لاق و بە باڵ هەڵاتن خۆ دەکوتێ تاکوو لە پشت لقوپۆپی دارێکی بڕاو خۆی حەشار بدات.

بەڵام لەڤین نێوچاوانەکەی واینەهێنا. تەقەی لە زیقاوڵەیەك کرد کە زۆری لێ نزیکبوو بەڵام نەیئەنگاوت. کاتێك بەرزبووبۆوە سێرەی لێگرت بەڵام هەر لەوکاتەدا زیقاوڵەیەکی تر لەبەردەمی هەڵفڕی و سەرنجی بۆ لای خۆی راکێشا، تەقەی لەویش کرد بەڵام بۆ جاری دووهەمیش نەیپێکا.

لەگەڵ ئەوەی خەریکی پڕکردنەوەی چەکەکانیان بوون زیقاوڵەیەکی تر هەڵفڕی و ڤسلۆڤسکی کە توانیبووی بۆ جاری دووهەم تفەنگەکەی پڕ بکاتەوە و دوو گوللەی ساچمەیی بە رووبەری زەلکاوەکەوە نا. ستیپان ئارکادیچ هەردوو نێچیرەکەی هەڵگرتەوە و بە چاوانی شاد و تروسکە تێگەڕاوەوە هات بۆ لای لەڤین و گرژییەوە.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: چاکە ئێستا لە یەکتر جیا دەبینەوە ـ بە لاقی چەپەی شەلی و ئامادە و تفەنگ بەدەست فیتوویەکی لێدا و سەگەکەی خۆی بانگکرد، ئەو بە لایەکدا رۆیشت و لەڤین و ڤسلۆڤسکیش روویان لە لایەکی تر کرد.

لەڤین بەپێی خووخدەی خۆی کاتێك کە تیری بەختا دەچوو و نەیدەنگاوت، رقی هەڵدەستا و ئیتر ئەو رۆژە تەواوی تیرەکانی بە خەتا دەچوون. ئەمرۆش لەو رۆژانە بوو. نێچیر زۆر و زەوەند بوو. زیقاوڵە یەك بەداوی یەکدا لەبەر پێی سەگەکان و راوچییەکان دەردەپەڕین و دەفڕین، لەڤینیش دەرفەتی ئەوەی بوو کە ئەو خەسارانە قەرەبوو بکاتەوە، بەڵام هەرچەندی تیری دەهاویشت زیاتر ئابڕووی لە لای ڤسلۆڤسکی دەچوو کە بەڕاست و بە چەپدا تەقەی دەکرد و نەیدەپێکا و پێشیٚ شلویٚ نەدەبوو، لەڤین ئۆقرەی لێهەڵگیرابوو و بەردەوام زیاتر ئاڵەتی دەبوو، تاوای لێهات بێڕاوەستان تەقەی دەکرد و بەهیوا نەبوو باڵندەیەك بپێکیٚ. دەتگوت لاسکاش لەو حاڵە گەیشتووە و گەڕان و مڵۆمۆ کردنەکەی وەك پێشوو بە گەرموگوڕییەوە نییە و بە سەرسووڕمان و لۆمەوە چاوی لە راوچییەکان دەکرد. تەقە لە دوای تەقە ئەو ناوەی دەهەژاند و دووکەڵی باڕووت سەر زەلکاوەکەی داگرتبوو و توربێنە گەورەکەیان کە تایبەتی راو بوو جگە لە دوو زیقاوڵەی سووك و چکۆڵە هیچی تری تێدا نەبوو، ئەوانیش یەکیان ڤسلۆڤسکی پێکابووی و ئەوی دیکەشیان هەردووکیان. هەر لەو کاتەدا لەوبەری زەلکاوەکەوە تەقە و شریخەی ستیپان ئارکادیچ، جاروبار دەهات و لەڤین پێیوابوو تیرێکی بەختا ناچێت، چونکە لە دوای هەر تەقەیەك دەنگی بەرز دەکردەوە و دەیگوت: کراك، کراك، برۆ بیهێنەوە!

ئەوەش جارلەگەڵ جار زیاتری رقی لەڤین هەڵدەستاند. زیقاوڵەکان بەردەوام بەسەر دارسۆتەکەکاندا دەسووڕانەوە و زیقەزیقی بێپسانەوەیان ئەو ناوەی داگرتبوو. ئەو مەلانەی کە پێشتر هەڵفڕیبوون و زۆریان باڵ لێدابوو لە نزیك راوچییەکان دەنیشتنەوە. بەجێی دوو باشوو کە لە سەرەتاوە بەسەر زەلکاوەکەدا دەسووڕانەوە، ئێستا دەیان باشوو قیژەیان دەهات و بەسەر دار و دەوەنی باتلاخەکەدا دەخوولانەوە و لەنگەریان دەگرت.

لەڤین و ڤسلۆڤسکی بە لایەکی زەلکاوەکەدا رۆیشتن و گەیشتنە ئەوسەری، کە کێڵگەی وەرزێڕەکان بوو زەوییەکە بەڕیزە درەختی سۆتەك لێك جیا کرابوونەوە و هێندیٚ لە ریزەکان گیایەکیان دوورابۆوە و هێندیٚ جێگاشی پێشێل کرابوو. دەکریٚ بڵێین نیوەی راستی دووردرابۆوە.

ئەگەرچی ئەو بەشەی نەدووردرابۆوە وێدەچوو کەمتری نێچیر لێبیٚ و زیاتر هیوایان بە بەشە دووراوەکان و ژێر قەرخ و مەلۆکان بوو. چونکە لەڤین بەڵێنی بە ستیپان ئارکادیچ دابوو کە بە نێو بەشە دووردراو و نەدووردراوەکاندا برۆنە پێشیٚ.

یەکێك لەو وەرزێڕانەی کە لە ژێر سێبەری هێلینگەیەکی بێئەسپدا دانیشتبوو هەرای کرد: هۆی راوچییەکان، وەرن بۆ ئێرە تۆزێ پشوو بدەن و گەرووتان تەڕکەنەوە.

لەڤین چاوێکی لەولایە کرد.

ورزێڕێکی ریشنی سوورهوولی بەنەشە بوو. هەرای کرد: وەرن، تۆزێ لەلامان دانیشن ـ پێدەکەنی و ددانە سپییەکانی وەدیار کەوتبوون. بەتلێکی سەوزی بەرزکردبۆوە و لەبەر خۆرەتاو بریقەی دەهات.

ڤسلۆڤسکی بە زمانی فەڕەنسی لە لەڤینی پرسی: ***دەڵێن چی؟***

لەڤین گوتی: بانگمان دەکەن بۆ خواردنەوەی ڤۆدکا. حەتمەن گیاجاڕەکەیان بەش کردووە. ـ بە لەبزێکی تاڕادەیەك فێڵبازانە گوتیشی: ئەگەر من لەجێی تۆ بووایەم دەچووم ـ هیواداریش بوو ڤسلۆڤسکی فریوی ڤۆدکاکەیان بخوات و بڕوات و لە کۆڵی بێتەوە.

ـ بۆ بانگمان دەکەن؟

ـ هەر ئاوا، سەرخۆشن، بەڕاستیمە، بچۆ، ناخۆش نییە.

***ـ با بچین، رەنگە خۆشبێت.***

لەڤین بە دەنگی بەرز گوتی: بچۆ، بچۆ، پاشان بە رێگای ئاشەکەدا بگەڕێوە ـ کە دیتی ڤسلۆڤسکی داهاتۆتەوە و لاقە شەکەتەکانی بە دوایدا نایەن و تفەنگەکەی دوور لە خۆی گرتووە، گەشایەوە. پاشان گتێکی گرت و بە لەقەلەق لە زەلکاوەکە چووەدەرێ و رۆیشت بۆ لای وەرزێڕەکان.

وەرزێڕەکە قاوی لە لەڤین کرد: تۆش وەرە، لەتێك پیراشکی مەیل بکە. فەرموو!

لەڤین زۆری حەزدەکرد پەرداخێك ڤۆدکا بخواتەوە و پەنجکێ نان بخاتە بەردڵی. خەریکبوو دەبوورایەوە و هەستی دەکرد کە لاقی بە دوایدا نایەن و بە زۆر لەو زۆنگ و لیتەیان دەردەکێشێ و بۆ ساتێك دوودڵ ما. بەڵام کە دیتی لاسکا راوەستاوە و گوێی قوت کردۆتەوە ماندوویی لەبیرچۆوە و بە هەنگاوی سووك و خێرا بە نێو زجاوەکەدا رۆیشت و چوو بۆ لای سەگەکەی. لەپڕ زیقاوڵەیەك لەبەر دەمی دەرپەڕی. لەڤین سێرەی لێگرت و ئەنگاوتی سەگەکە هەروا راوەستابوو. باڵندەیەکی تریش لەبەر پێی سەگەکە دەرپەڕی و باڵی گرت، لەڤین ئەویشی پێکا. بەڵام ئەو رۆژە بەختی خەوتبوو و دوای ئەوە ئیتر ئەوەی دەیتەقاند تیرەکەی بەخەتا دەچوو. کاتێك چوو تاکوو ئەو نێچیرەی پێکابووی هەڵیگرێتەوە نەیتوانی بیدۆزێتەوە. هەموو ئەو دەوروبەرە گەڕا بەڵام لاسکا بڕوای

نەدەکرد خاوەنەکەی باڵندەیەکی ئەنگاوتبێ، کاتێك خاوەنەکەی دەستووری پێدا بگەڕێ، واینواند کە ملۆمۆ دەکات بەڵام بڕوای نەدەکرد شتێك بدۆزێتەوە.

تیشکی کلومنجڕی خۆر هێشتا گەرم بوو. کراسەکەی لە ئارەقەدا خووسابوو بە گیانییەوە دەنووسا. جزمەی چەپەی پڕ بووبوو لە ئاو و قورس بووبوو و لەگەڵ هەنگاوهەڵێنانەوە جلقەی دەهات. نێوچاوانە بە دووکەڵ رەشبووەکەی ئارەقەی لێدەچۆڕا. دەمی تاڵ بوو، بۆنی باڕووت و ژەنگی کانزای لە لووتی دەهات و زیقەزیقی زیقاوڵەکان گوێیان پڕکردبوو. هەردوو لوولەی تفەنگەکەی گەرم داهاتبوون و نەتدەوێرا دەستیان لێبدەی. دڵی بە توندی و خێراخێرا لێیدەدا. دەستی دەلەرزی و لاقی بە دوایدا نەدەهاتن و چۆکی دەلەرزی. لەگەڵ ئەوەشدا هەنگاوی دەنا و لە پەستا تەقەی دەکرد. ئاخری کە دیتی بێفایدەیە و تیرەکانی بە شێوەیەکی پڕشوورەیی بە خەتا دەچن و نایئەنگێوێ، بە تووڕەیی تفەنگەکەی فڕێدا لایەك و کڵاوەکەی بە عەرزیدا دا.

بە خۆی گوت «نا، دەبێ ئیختیاری خۆم وەدەست بێنمەوە.» تفەنگ و کڵاوەکەی هەڵگرتەوە، بانگی لاسکای کرد و لە زەلکاوەکە چووەدەرێ. کە گەیشتە سەر وشکایی لەسەر تەپۆڵکێکی چکۆڵە دانیشت، چکمەکەی داکەند و ئاوەکەی لێخاڵی کرد. پاشان دیسان رۆیشتەوە بۆ گوێ باتلاخەکە و لە ئاوە لێڵ و قەوزاوییەکە هێندەی خواردەوە هەتا توونییەتیی شکا. لوولەی گەرم داهاتووی تفەنگەکەی تەڕکرد و دەست و دەموچاوی شۆرد. کە خۆی فێنك کردەوە رۆیشت بۆ ئەو شوێنەی کە زیقاوڵەیەکی لێنیشتبۆوە و بڕیاریدا خوێنسارد و لەسەرەخۆ بێت.

دەیویست خوێنسارد بێ بەڵام وەك پێشووی لێهاتەوە. بەر لەوەی سێرە بگرێت قامکی لە پەلەپیتکە دراو و تەقاندی. ئەمجارەیان نەك باشتر نەبوو بەڵکوو خراپتریش بوو. کاتێك لەگەڵ ستیپان ئارکادیچ گەیشتنە شوێنی یەکگرتنەوەیان تەنیا پێنج زیقاوڵە لە توربێنەکەیدا بوو.

بەر لە ستیپان ئارکادیچ چاوی بە سەگەکەی کەوت. کراك، لە ژێر پنج و ساقەتەی دار تووزێك دەرپەڕییە دەرێ و سەرتا پای بە قوڕ و لیتە و گەناوی زەلکاوەکە رەش داگەڕابوو، بەڵام شاد و سەرکەوتووانە دەستیکرد بە بۆنپێوەکردنی لاسکا. بە دوای لاسکادا قەڵافەتی بڕەداری ستیپان ئارکادیچ لە ژێر سێبەری دارەکەوە وەدیار کەوت. بە دەموچاوێکی سوور و ئارەقەکردوو و یەخەی ئاوەڵاوە هەروا بە لاقێکی دەشەلی و هات بەرەوپیری لەڤین.

بە پێکەنینەوە گوتی: دەی، چۆن بوو؟ زۆر گوێم لە تەقوتۆقت بوو.

ـ تۆ چۆن بووی؟ ـ بەڵام پرسیارەکەی بێجێ بوو چونکە توربێنەکەی ئابلۆنسکیی دی پڕپڕ بوو.
ـ خراپ نەبوو! ـ توربێنەکەی چاردە زیقاوڵەی تێدا بوو.
ستیپان ئارکادیچ گوتی: زەلکاوێکی بێوێنەیە ـ بە شێوەیەکی خاکەڕایانە و وەك ئەوەی بیهەوێ ئازایەتییەکەی خۆی کەمڕەنگ بکات گوتیشی: حەتمەن ڤاسنکا بەر دەستوباڵی گرتووی. دوو کەس بە سەگێکەوە ئاسان نییە.

## یازدە

کاتێك لەڤین و ستیپان ئارکادیچ گەیشتنە لای کۆختەی ئەو وەرزێڕەی کە لەڤین هەمیشە کاتی ڕاوکردن لەوێ دەمایەوە، ڤسلۆڤسکی لەوێ بوو. لەنێوەڕاستی ژوورەکە لەسەر کورسییەك دانیشتبوو و هەردوو دەستی توند پێوە گرتبوو، قاقای دەکێشا و سەربازێك کە ژنبرای خاوەنماڵەکە بوو خەریکبوو چەکمە قوڕاوییەکانی لە پێی دادەماڵی.
ـ من هەر ئێستا گەیشتم. ***ئەوانە زۆر مێهرەبانن.*** بیری لێبکەنەوە، ڤۆدکاشیان پێدام و نانو چاییش. نازانی چ نانێك بوو! شتیوا هەر نییە! ***ئەوەندە خۆش بوو کە شتیوام قەت نەخواردووە.*** ڤۆدکاکەشیان ئەوە هەر باسی مەکە. قەتم ڤۆدکای ئەوەندە خۆش نەخواردۆتەوە. ئەختوچاریشم کرد پارەیان وەرنەگرت. هەر دەڵێن «قابیلی نییە!» یان شتێکی لەو چەشنە.
سەربازەکە ئاخری چەکمەکانی بە گۆرەویی خووساوەوە لە پێی داماڵی و گوتی: چۆن دەبێ پارە وەرگرن؟ ئەوان میوانداریيان لە ئێوە کرد. خۆ ئەوان ڤۆدکافرۆش نین!
لەگەڵ ئەوەشدا کە کۆلیتەکە بە چەکمەی ڕاوچییان و دوو سەگە قوڕاوییەکەیان کە سەرتا پایان لە قوڕ و لیتە هەڵکێشا بوون و لەپەستا خۆیان ڕادەوەشاند، بەجارێ پیس بووبوو و بۆنی گەناوی باتلاخ و دووکەڵی باڕووت هەموو ژوورەکەی داگرتبوو، تێروپڕیان چایی خواردەوە و ئەگەرچی کارد و کەوچك لە گۆڕێدا نەبوو بەڵام شێوێکی باشیان خوارد و ئەوەندەیان کەیف پێکرد کە لە کەیفی ڕاوەکە نەدەمایەوە. پاشان خۆیان شۆرد و خاوێن بوونەوە و چوونە کادێنێکی خاڵی و ماڵدراو کە فایتوونەوانەکان لەوێ جێگایان بۆ ڕاخستبوون.
ئەگەرچی هەواکەی تاریك بووبوو، بەڵام هیچ کام لە ڕاوچییەکان خەویان نەدەهات و حەزیان نەدەکرد بخەون.

دوای ئەوەی ئاخافتنەکەیان ماوەیەك لە دەوری وەبیرهاتنەوەی بیرەوەری و چۆنێتیی راو و تیرەندازی و سفەتی سەگەکان و باسی راوەکانی پێشوو خولایەوە، ئاخری کەوتە سەر مەبەستێك کە هەموویان بە دڵیان بوو. کە ڤاسنکا لە پەستا و شەیدایانە سەبارەت بە جێیخەوەکەیان و بەرامەی ئالَف و شاعیرانەبوونی عارەبانە شکاوەکە (بەو هۆیە لەبەر چاوی شکاوی دەنواند چونکە تەوەرەی تایەکانی پێشەوەیان کردبۆوە.) و سەرو رووخۆشیی ئەو وەرزێڕانەی بە نان و ڤۆدکا میوانداریيان لێکردبوو و دیتنی ئەو سەگانە کە هەرکامیان لەلای لاقی خاوەنەکەی خۆی وەرکەوتبوو دەدوا، ئابلۆنسکی کەوتە باسی ئەو راوەی هاوینی رابردووی لە مڵکەکانی مالتووس[٣٤]. مالتووس یەکێك لە مالیکە بەناوبانگ و دەوڵەمەندەکانی هێلاسن بوو. ستیپان ئارکادیچ باسی چلۆنایەتیی ئەو زەلکاوانەی دەکرد کە ئەم مالتووسە لە پارێزگای تڤێر بە ئیجارەی گرتبوو، هەروەها باسی ئەوەی کرد کە ئەو مڵکە چۆنی ئاگاداری لێدەکریٚ و ئەو فایتوونە گەورە و چکۆلانەی کە راوچییەکان دەیبەن بۆ ئەویٚ و ئەو خێوەتەی کە بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ لە قەراغ زەلکاوەکە هەڵیاندابوو.

لەڤین لەسەر پێخەفە کایەکەی هەستا دانیشت و گوتی: من سەرم لەو کارانەی تۆ دەرناچێت. چۆن دەتوانی لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانە هەستی و دانیشی؟ من دەزانم فراوێن لەگەڵ شەڕابی لافیت زۆر بەلەزەتە، بەڵام هەر بەڕاستی تۆ لەو جۆرە زەرقوبەرق و خۆڕانانەی ئەو جۆرە کەسانە بێزار نابی؟ ئەو کەسانە وەك دەربەگەکانی قەدیم پارە و سامانی خۆیان لە رێگای وەهاوە بەدەست دێنن کە بەڕاستی پڕشوورەییە، بەڵام گویٚ بەو سووکایەتی و کارە ناحەزانەیان نادەن و هەر بەو پارە و سامانەی کە بە شێوەیەکی نامرۆڤانە وەدەستیان هێناوە سووکایەتییەکانی نێو کۆمەڵگایان دەکڕنەوە و ئابڕووی تکاویان وەدەست دێننەوە.

ڤاسنکا ڤسلۆڤسکی قسەکەی سەلماند: بەڕاستی وایە. راست دەکەی هەڵبەت ئابلۆنسکی بە هۆی دڵپاکی و رۆحسووکییەوە ئەو کارە دەکات، بەڵام پاشان خەڵکی دەڵێن: ئەگەر ئابلۆنسکی دەچێت...

ـ قەت شتیوا نییە... ـ لەڤین دیتی کە ئابلۆنسکی لەگەڵ گوتنی ئەو قسەیە پێدەکەنیٚ. ئابلۆنسکی گوتیشی: بەڵام من پێموایە لە هیچ کام لە بازرگان و خانەدان و دەوڵەمەندەکانی دیکە عەیبەلۆتر نییە. هەموویان هەروان بە کارکردن زیرەکی دەوڵەمەند دەبن.

---

34- Malthus

ـ بەڵێ، بەڵام چ کارێك؟ بە مەرایی کردن خەڵات وەرگرتن و فرۆشتنەوەی بە کار دەزانی؟
ـ بەڵێ کارە. بۆیە دەتوانین بڵێین کارە ئەگەر کەسانێکی وەك ئەوان نەبن. ڕێگاوبان دروست ناکرێن.
ـ بەڵێ، بەڵام هیچ کوێی لە کاری وەرزێڕ یان هزرڤانان ناچێت.
ـ وایە، بەڵام ئەوە کارە و کارەکەش دیارە دەستهاتی هەیە و ئاکامەکەشی دروستکرانی هێلاسنە. مەگین ئەوەی بڵێی هێلاسن شتێکی بێکەڵکە.
ـ نا، ئەوە باسێکی ترە. من دەزانم هێلاسن شتێکی بەکەڵکە، بەڵام هەر پارەیەك کارەکەی و داهاتەکەی پێکەوە گونجاو نەبێت، ناڕەوایە.
ـ ئەو گونجاوی و هاوڕێژییە کێ دیاریی دەکات؟
لەڤین کە دیتی ناتوانێ سنوری نێوان دروستی و نادروستی دەستنیشان بکات گوتی: وەدەستهێنانی پارە لە ڕێگای نادروست و فێڵوتەڵەکەوە، بۆ وێنە ئەو پارانەی کە بانکە تایبەتییەکان دەیقاپێنن، شەڕافەتمەندانە نییە. یان ئەو سامانە زۆر و زەوەندانەی کە بەبێ ئارەقڕشتن بەدەست هاتووە، وەکوو ئەو پارە بەلاشانەی کە لە سەردەمی دەربەگایەتی و بەخشینی زەوی و زاردا بە نسیبی تاقمێك دەبوو. ئەمانەش هەر شتێکی ئەو جۆرەن بەڵام شکڵەکەیان گۆڕاوە. ***ئەوانە نان بە نرخی رۆژ دەخۆن***. هێشتا دابی بەخشین و پێشکەشی لە برەو نەکەوتووە سەربەشایەتیی هێلاسن و بانك و لەوجۆرە شتانەیان داهێناوە، هەمووی هەر یەکن. پارەی خەوتوو.
ـ بەڵێ، رەنگە ئەوانە هەمووی وابن و قسەکەشت لەجێی خۆیدایە... کراك بسرەوە! ـ ستیپان ئارکادیچ لەنێوان قسەکانیدا لە سەگەکەی راخوڕی. کراك خۆی لە کاوکۆتەکە دەخشاند و دەیخوراند، ئالیکە وشکەکەی دەشێواند. دیاربوو ستیپان ئارکادیچ بڕوای تەواوی بە راستبوونی قسەکانی خۆی هەیە و هەر بەو هۆیەش شلوێ نەدەبوو و بێتاڵوکە قسەی دەکرد. گوتیشی: بەڵام تۆ سنووری نێوان کاری شەرافەتمەندانە و ناشەرافەتمەندانەت نەگوت چییە؟ ئەوەیە کە دەرماڵەی من لە بەرپرسی نووسینگەکەم زیاترە، ئەگەرچی لە کاردا ئەو لە من شارەزاترە، ئەوە ناشەرافەتمەندانەیە؟
ـ نازانم.
ـ دەی با جۆرێکی تر بۆت روون بکەمەوە، پارەیەك کە دوای لێدەرکردنی خەرجی وەبەرهێنان لە داهاتی مڵکەکە بۆت دەمێنێتەوە، یانی هەقدەستی تۆ بۆ بەڕێوەبردنی

کاروباری مڵکەکەت، وایدانێین ساڵانە پێنجهەزار رۆبڵە. بەڵام ئەو وەرزێڕەی خانەخوێمان ئەگەر خۆشی بکووژێ داهاتی لە پەنجا رۆبڵ زیاتر نابێت. ئەمەش هەر بەو رادەیە لە دروستی و شەرافەتمەندی بەدوورە کە مووچەی من لە چاو بەرپرسی نووسینگەکەم، یان زێدە داهاتی مالتووس لە چاو سەر کرێکارێکی هێلاسن. کەچی لە کۆمەڵگادا دەرهەق بەو کەسانە جۆرێك توندوتیژی دەبینین کە زۆر شتێکی بێبنەمایە و بە بڕوای من تەنیا لە رووی ئێرەییەوەیە....

ڤسلۆڤسکی گوتی: نا، من ئەوەم قەبوول نییە، ئەوە نابێتە ئێرەیی. ئەو چەشنە پارە وەدەستهێنانە ناپاکییەکی پێوەیە.

لەڤین درێژەی پێدا: نا، ئیجازە بدە. تۆ دەڵێی بێویژدانییە ئەگەر من پێنجهەزار رۆبڵ وەدەست بێنم و مووژیکێك پەنجا رۆبڵ. ئەوەش هەق بە تۆیە. دەزانم زوڵمە و منیش هەست بەو زوڵمە دەکەم. بەڵام...

ڤاسنکا گوتی: کەوایە راست دەکات. ئاخەر بۆچی ئێمە دەخۆین و دەخۆینەوە و دەچین بۆ راو و رابواردن و دەست لە رەش و سپی نادەین، ئەویش بەردەوام کار دەکات و هەتا کۆتایی تەمەنی دەبێ ئارەق بڕێژێت و خەریکی پاچەکۆڵە بێت؟ ـ دیاربوو یەکەم جارە کە ئاوا بە روونی بیر لەو مەسەلەیە دەکاتەوە و هەر بەو هۆیەش قسەکانی لە دڵەوە بوو.

ستیپان ئارکادیچ کە دەتگوت بە ئانقەست لەڤین هان دەدات گوتی: بەڵێ، تۆ هەستی پێدەکەی، بەڵام مڵکەکەی خۆتی پێنابەخشی.

لەم دواییەدا دەتگوت گرژییەکی شاراوە لەنێوان ئەو دوو ئاوەڵزاوایەدا سەریهەڵداوە. وەك وێدەچوو لەو کاتەوە بووبوونە ئاوەڵزاوا دەستیان بە جۆرێك ململانێ کردبێت لەسەر ئەوەی کامیان ژیانێکی باشتری پێکهێناوە و ئێستاش ئەو ململانێیە لە مشتومڕەکەیاندا رەنگی دابۆوە و خۆی دەنواند.

لەڤین وەڵامی دایەوە: من مڵکەکەی خۆم بۆیە نابەخشم چونکە هیچ کەس ئەو داواکارییەم لێناکات. ئەگەر بشمهەوێ ناتوانم، چونکە هیچ کەس نییە کە بیدەمێ.

ـ بیدە بە ئەم مووژیکە. ئەو دەستت ناگێڕێتەوە.

ـ بەڵام چۆنی پێبدەم؟ بچم پێشکەشنامە واژۆ بکەم؟

ـ من نازانم چۆن. بەڵام ئەگەر بڕوادار بی هەقت نییە....

من قەت بڕوادار نیم. بە پێچەوانە، هەست دەکەم کە هەقم نییە مڵکەکەم ببەخشم. چونکە ئەرکی زەوییەکەشم لەسەر شانە و هی بنەماڵەکەشم.

ـ نا، ئیجازە بدە. ئەگەر ئەو نایەکسانییە زوڵمە بۆ کارێك ناکەی لەنێو بچێت؟

ـ چۆن کار ناکەم؟ دەیکەم، بەڵام بە باری نەرێنی. یانی هەوڵ نادەم ئەو مەودایەی لەنێوان و من و ئەودا هەیە زیاتر بێت.

ـ نا، نەبوو، داوای لێبوردن دەکەم، ئەو قسەیەی تۆ زیاتر لە سەفسەتە دەچێت.

ڤسلۆڤسکی وتەکەی پشتڕاست کردەوە: بەڵێ ڕوونکردنەوەیەکی تەموومژاوییە ـ ڕووی لە مووژیکەکە کرد کە دەرگای کادێنەکەی بە جیڕەجیڕ کردەوە و هاتەژوورێ، گوتی: ئێ، خاوەنماڵ! بۆ هێشتا نەخەوتووی؟

ـ کوڕە قوربان، خەوی چی؟ پێم وابوو ئەربابەکان خەوتوون. بەڵام گوێم لە دەمەتەقێکەیان بوو. من دەبێ قولاپێك لێرەیە هەڵیگرم ـ بە پێخاوسی و بە پارێزەوە هەنگاوی دەنا و پرسیی: یانیگر نین؟

ـ تۆ خۆت لەکوێ دەخەوی؟

ئێمە ئەمشەو ئەسپەکان دەبەین بۆ لەوەڕ.

ڤسلۆڤسکی چاوی لە سووچی حەوشەکە کرد و فایتوونە بێئەسپەکەی دی بەسەر پانتای ئاسۆوە لە چوارچێوەی گەورەی دەرگای کادێنەکەدا دەتگوت لە قەتحە گیراوە گوتی: لەو شەوە خۆشە! گوێ بگرن، دەنگی ژنان دێت گۆرانی دەڵێن! بەڕاستی دەنگیان خۆشە. خاوەنماڵ، ئەوانە کێن گۆرانی دەڵێن؟

ـ جیرانەکانمانن.

ـ وەرن با بچین بۆ پیاسەکردن! خۆ خەوەکەمان زڕاوە. وەرە با بڕۆین ئابلۆنسکی.

ئابلۆنسکی خۆی کێشایەوە و گوتی: خۆزگە پیاو بیتوانیبایە هەر ئاوا بە ڕاکشاوی بچێت بۆ پیاسەکردن! ئاوا تخێڵبوونیش ناخۆش نییە.

ڤسلۆڤسکی گورج هەستا و بەدەم کەوشلەپێ کردنەوە گوتی: باشە، من بە تەنیا دەچم. خوداحافیز هاوڕێیان. ئەگەر خۆشم ڕابوارد بانگتان دەکەم. ئێوە بە ڕاو میوانداریتان لە من کرد، منیش چاکەی ئێوەم لە بیرناچێت.

کاتێك ڤسلۆڤسکی ڕۆیشت و کابرای وەرزێڕیش بە دوایدا چووەدەرێ و دەرگای کادێنەکەی پێوەدا ئابلۆنسکی بە لەڤینی گوت: کوڕێکی باشە، وانییە؟

لەڤین گوتی: بەڵێ، زۆر کوڕی چاکە! ـ بەڵام زەینی هەر لە دەوری دەمەتەقێکەی پێشوویان دەسووڕایەوە. پێیوابوو هەتا ئەو جێیەی توانیویەتی هەست و بیروباوەڕی خۆی بۆ

روونکردۆتەوە و ئەوان هەردووکیان، ئەگەرچی ڕاست و بەهۆش بوون، یەکدەنگ گوتبوویان کە ئەو دڵی خۆی بە سەفسەتە خۆش دەکات، بەڵام خۆی لەوە دڵگران بوو.

ـ بڕوانە هاوڕێ، کارەکە لە دووحاڵ بەدەر نییە، یان دەبێ قەبووڵی بکەی کە ئەم سیستەمەی ئێستا عادڵانەیە و ئەگەر وابێ بەرەڤانی لە مافی خۆت دەکەی، یان وەك من ددانی پێدا بنێی کە خاوەنی سەربەشایەتییەکی ناعادڵانەین و چێژی لێوەردەگرین.

ـ نا، ئەگەر سەربەشایەتییەکان ناعادڵانە بن تۆ ناتوانی چێژ لەو نێعمەتانە وەرگری کە لە بەردەستتدایە. لانیکەم من ناتوانم. بۆ من لە هەموو شتێك گرینگتر ئەوەیە هەست بە تاوان نەکەم.

ستیپان ئارکادیچ کە دیاربوو هێندەی گوشار بۆ مێشکی خۆی هێناوە جاڕز بووە گوتی: لەڤین، هەر بەڕاستی تۆ حەز ناکەی بچین بۆ پیاسەکردن؟ خۆ خەومان لێناکەوێ، وەرە با بچین!

لەڤین وەڵامی نەدایەوە. ئەو قسانەی لە کاتی ئاخافتنەکەیاندا دەربڕیبوو، یان ئەوەیکە تەنیا بە شێوەیەکی نەرێنی لە ڕێگای ویژداندا هەنگاو هەڵدەگرێ، زەینی بە خۆیەوە خەریك کردبوو. بە خۆی گوت «بەڵام یانی بەڕاستی تەنیا بە شێوەی نەرێنی دەتوانین لە ڕێگای عەداڵەتدا هەنگاو هەڵگرین؟»

ستیپان ئارکادیچ ڕاستەوەبوو و گوتی: بۆنی ئەو گیاوگژەی ئەم نێو کادێنە بۆنێکی زۆر توندی هەیە، من بە هیچ جۆرێك ناتوانم بخەوم. ڤاسنکا لەوێ عەجەب بەزمێکی وەڕێ خستووە. گوێت لە دەنگی ئەو و قاقا و قریشکەی ژنانە؟ نایەی بچین؟ هەستە.

لەڤین گوتی: نا، من نایەم.

ستیپان ئارکادیچ کە بە تاریکی لە کڵاوەکەی دەگەڕا گوتی: ئەو کارەشت بۆ لەبەرچاو گرتنی بنەما و ڕێوشوێنە کۆمەڵایەتییەکانە؟

ـ نا، پێوەندیی بە بنەما و ڕێوشوێنەوە نییە. بەڵام بۆ بێم؟

کڵاوەکەی دۆزییەوە و گوتی: دەزانی چی، تۆ ژیان لە خۆت تێکدەدەی.

ـ بۆ؟

ـ پێتوایە نازانم پێوەندیت لەگەڵ ژنەکەت چۆنە؟ من گوێم لێبوو هاتن و نەهاتنت بۆ ڕاو و بەجێهێشتنی بە ماوەی دوو ڕۆژ چەندە گرینگە بەلاتەوە! ئەمانە هەمووی بۆ سەردەم و بارودۆخێك لە ژیاندا و بۆ دەورانی تازەزاوایی باش و بەجێن، بەڵام نەك هەتا ئاخری تەمەن. ـ لەگەڵ کردنەوەی دەرگاکە گوتیشی: پیاو دەبێ ئازاد بێت. بەغیرەت و خاوەنی خووخدەی پیاوانە بێت.

لەڤین لێیپرسی: یانیچی؟ یانی بچێ لەگەڵ ژنانی لادێیی رایبوێرێ؟

ـ ئەی بۆ نا؟ ئەگەر لەو کارە چێژ وەرگرێ با بیکات چییە؟ ***خۆ ئاسمان ناڕووخێ.*** خۆ ژنەکەم هیچ زیانێکی پێناگات و منیش کەیف دەکەم. تەنیا دەبێ رێزی بنەماڵە لەبەرچاو بگری. چوارچێوەی ماڵێ دەبێ بە پاکی بمێنێتەوە. بەڵام پیاو نابێ خۆی ببەستێتەوە.

لەڤین وەرسووڕا سەر لاتەنیشت و بە ساردوسڕی گوتی: نازانم، رەنگە قسەی تۆ بێت. بەڵام دەبێ سبەینێ زوو وەڕێ بکەوین. من هیچ کەس لە خەو هەڵناستێنم و شەوەکی دەڕۆم.

گوێیان لە دەنگی ڤسلۆڤسکی بوو کە گەڕایەوە و دەیگوت: ***هاوڕێیان زووکەن، وەرن دەی، نازانن چەندە جوان و بەنازە،*** خۆم سازم کردووە، ***بەڕاستی دڵڕفێنە،*** هەر راست دەڵێی گرتشێنە[٣٥]. سەری ئاشنایەتیمان داخستووە. بەڕاستی بێوێنەیەـ بە لەبزێك ئەو قسانەی دەردەبڕی کە دەتگوت کچە تەنیا لەبەر ئەو خۆی لە گوڵ داوە و نازونووز دەکات و زۆر لەو کەسە رازییە کە ئەو بووکەچینییەی بۆ دروست کردووە.

لەڤین خۆی کردە خەو و ئابلۆنسکی کەوشەکانی لەپێ کرد، جگەرەیەکی بەرگی داگیرساند و لە کادێنەکە چووەدەرێ و زۆر زوو بێدەنگ بوون و لەڤین مێشکی حەسایەوە.

لەڤین ماوەیەکی زۆر خەوی لێنەکەوت. کرمەکرمی لەوەڕانی ئەسپەکانی دەهاتە گوێ و پاشان دەنگی خاوەنماڵ و کوڕە گەورەکەی کە خۆیان ئامادەدەکرد بچن بۆ لەوەڕاندنی ئەسپەکان، پاشان لەوبەری دیکەی کادێنەکەوە گوێی لە دەنگی سەربازەکە بوو کە لەگەڵ خوشکەزاکەی، واتە کوڕە چکۆڵەی خاوەنماڵەکە جێوبانیان رادەخست تاکوو بخەون و دەنگی کوڕە چکۆڵەکەی دەبیست کە باسی سەگەکانی بۆ خاڵی دەکرد کە زۆر زەلام و ترسناك هاتبوونە بەرچاوی و پاشان دەستیکرد بە پرسیارکردن لە خاڵی کە سەگەکان چی راو دەکەن و سەربازەکە بە دەنگی خەواڵووەوە بۆی باسکرد کە سبەینێ راوچییەکان دەچن بۆ زەلکاوەکە و بە تفەنگ راوی باڵندە دەکەن، پاشان بۆ ئەوەی خۆی لە دەست کوڕە رزگار بکات گوتی: بخەوە ڤاسکا، بخەوە، دەنا خراپت بەسەر دێ. هەر زۆر زووش پرخووهۆڕیان بەرزبۆوە و ئیتر هیچ دەنگێك نەبوو جگە لە زیقەی زیقاوڵە و حیلە و پرمەی ئەسپەکان. لەڤین لە دڵی خۆیدا دووپاتی کردەوە «بەڵام بەڕاستی بە شێوەی نەرێنی؟ بەڵام چ بکەم؟ خەتای من چییە؟» پاشان کەوتە خەیاڵی راوی سبەینێ.

---

٣٥- گرتشێن، ئاماژەیە بە چیرۆکێکی فاوست کە کچێکی لادێیی جوان و ساکاری بەو ناوە هەڵفریواند.

«سبەینێ بەیانی زوو وەڕێ دەکەوم و هەوڵ دەدەم خوێنسارد و لەسەرەخۆ بم. پۆڕ و زیقاوڵە زۆرن. کاتێك بگەمەوە ماڵێ نامەی کیتی چاوەڕوانم دەبێ. بەڵێ، رەنگە ستیڤا راست بکات و من دەبێ پیاوانە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەم. زۆر نەرمی دەنوێنم. ئاکارم وەکوو ژنان وایە... باشە، چ بکەم؟ لێرە هەمو کارەکانم باری نەرێنیی بەخۆوە گرتووە.»

لەنێوان خەو و بەخەبەریدا گوێی لە دەنگی سەرخۆشانە و قاقاکێشانی ڤسلۆڤسکی و ستیپان ئارکادیچ دەبوو. تۆزێ چاوی هەڵێنا. مانگ هەڵاتبوو و ئەوان لەبەر دەرگانەی کادێنەکەدا و لەبەر تریفەی مانگەشەو راوەستابوون و قسەیان دەکرد. ستیپان ئارکادیچ باسی جوانی و ناسکیی کچەکەی دەکرد و ئەوی بە کاکڵە فندقی تازە و پاککراو دەشوبهاند. پێدەکەنی و پێکەنینەکەی وەك هەمیشە گیرۆبوو، وێدەچوو قسەی مووژیکەکە دووپات بکاتەوە کە پێیگوتبوو، دەیگوت: .واچاکە لە بیری ژنێکدابی بۆ خۆت!

لەڤین لەنێوان خەو و بەخەبەریدا گوتی: هاوڕێیان بەیانی زوو وەڕێ دەکەوین.

ئەوەی گوت و خەوی لێکەوت.

## دوازدە

کەڕەی بەیانی لەڤین وەخەبەر هات و هەوڵیدا هاوڕێکانی لە خەو هەستێنێ. ڤاسنکا دەمەوڕوو خەوتبوو، لاقێکی بە گۆرەوییەوە لە ئەدیاڵەکەی هاتبووە دەرێ و وەها لە حەوساڵان راست بووبۆوە کە پیاوی ئاقڵ نەبوایە نەیدەزانی ماوە. ئابلۆنسکی لەنێوان خەو و بەخەبەریدا گوتی: بەو بەیانییە زووە بۆ هەستین. تەنانەت لاسکاش کە لە پەنا ئالیکەکە خۆی مەڵاس دابوو و خەوتبوو نابەدڵانە هەستا، لاقەکانی خۆی یەك لەدوای یەك کێشایەوە و قورساییی خەوی لە خۆی تاراند. لەڤین جزمەی لە پێ کرد و تفەنگەکەی هەڵگرت، دەرگای کادێنەکەی بە ئەسپایی کردەوە کە جیڕەی دەهات و رۆیشتە دەرێ. هەردوو فایتوونەوان و عارەبە ئاژۆکە لە پەنا هێلینگەکانیان خەوتبوون و ئەسپەکان وەنەوزیان دەدا. تەنیا یەکیان بەخەبەر بوو و وێنجەی دەخوارد و بە پڕمەپڕم بڵاوی دەکردەوە. بوولێڵە بوو.

پیرێژنی خانەخوێ لە کۆلیتەکەیان هاتەدەرێ، زۆر خۆمانە و وەك ئەوەی لەگەڵ ئاشنایەکی قەدیمی قسە بکات، گوتی: بۆ ئاوا زوو هەستاوی باوەگیان؟

ـ دەچم بۆ راو پووریّ گیان. لەملایەوە ریّگا هەیە بۆ زەلکاوەکە؟

ـ هەر لەم پشتەوە، بەلای خەرمانەکەی ئیّمەدا، راست برِۆ باوەگیان. بە نیّو مەزرای کندیّلەدا توولە ریّیەك هەیە راست دەتباتە زەلکاوەکە.

پیرێژن کە لاقوقولە تاوەسووتەکەی هەلْکردبوو بە ئارامی لەگەلْ لەڤین رۆیشت و دەرگای حەوشەی بۆ کردەوە.

ـ لیّرەوە راست دەرِۆی بۆ لای زەلکاوەکە. کورِەکانیش دوێنیّشهو لیّرەوە چوون ئەسپەکان بلەوەریّنن.

لاسکا قوت و بەنەشە بە توولە ریّکەدا تیّیتەقاند و لەڤین بە هەنگاوی سووك و بە تالْووکە بەدوایدا دەرِۆیشت و بەردەوام چاوی لە ئاسمان دەکرد. دەیویست بەر لە خۆرهەلاّت بگاتە باتلاّخەکە. بەلاّم خۆر هەنگاوی خۆی شل نەدەکردەوە. کاتیّك لە کادیّنەکە هاتەدەریّ مانگ روون و تریفەریّژ بوو، بەلاّم ئیّستا وەك تۆپەلّە جیوەیەك سارد و کەمرِەنگ بوو، ئەستیّرەی رۆژیّ کە تاویّك لەمەوبەر سریوەی دەهات و چاوی لە زەوی دادەگرت، ئیّستا دەبوو لیّیبگەرِیّی و بەحالّەحالّ دەدۆزرایەوە. جارِە جۆکان، کە پیّشتر لە بوومەلیّلْی بەیانیدا وەکوو تاپۆیەك بە زەحمەت دەبیندران، ئیّستا بە روونی دیاربوون. شەونمی سەر پەلکی یاندز و بنچکی بەرز و بۆنخۆشی کندیّلە، کە بەبیّ پرِشنگی خۆر نەدەبیندران، داوەدەلینگ و پانتۆلّەکەی هەتا نزیك پشتیّنەی خووساندبوو. لە بیّدەنگیی کازیوەی بەیاندا چکۆلەترین دەنگ نەدەهات. میّشەنگوینیّك وەك گوللە ویزەی هات و بە پەنا گویّچکەیدا تیّپەرِی. بە وردی روانیی و میّشەنگوینی دووهەم و سیّهەمیشی دی. هەموویان لە پشت پەرژینی پلوورەزاریّك دەهاتنە دەریّ. کویّرە ریّگاکە راست دەگەیشتە باتلاّخەکە. تەم و هەلْمیّك لە زەلکاوەکە هەلّدەستا و جیّجیّ رووناك و جیّجیّش تاریك بوو، داربییەك و دارسۆتەکیّك لەنیّو زەلکاوەکەدا بوون و لە دوورەوە دەتگوت دورِگەن لەسەر رووبەریّك لە تەمومژ گەورە و بچووك دەبنەوە. منالْ و گەورە کە ئاگایان لە ئەسپەکانیان بوو بەر لە خۆرهەلاّت لە رۆخی زەلکاوەکە و قەراغ ریّگاکە راکشابوون و لە ژیّر قاپووتەکانیاندا خەویان لیّکەوتبوو. هەر لەو نزیکانە سیّ ئەسپی سندم لەپیّ دەلەوەرِان. یەکیّکیان سندمەکەی خۆی وەتەقەتەق خست. لاسکا لە تەنیشت خاوەنەکەیەوە دەرِۆیشت و بەردەوام تەماشای دەکرد و ئیجازەی دەخواست کە لە پیّشەوە غار بدات. لەڤین کە بە پەنا خەوتووەکاندا تیّپەرِی و دیتی وردە وردە خەریکە لاقی دەچەقیّ، چەخماخی تفەنگەکەی تاقی کردەوە و لاسکای خستە پیّشەوە. یەکیّك لە ئەسپەکان کە

بۆرەیەکی سێبڕ بوو چاك لەوەڕا بوو بە دیتنی لاسکا سڵەمییەوە و کلکی راوەشاند و پڕماندی، دوو ئەسپەکەی تریش قوشقی بوون و سندم لە پێ لەنێو زەلکاوەکەدا کەوتنە پاکوتان و جڵقوهۆڕی سمیان لەنێو قوڕ و زێلاقەکەدا دەنگی دایەوە و بە لەقەلەق لە زجاوەکە هاتنە دەرێ. لاسکا راوەستا و گوێی قووت کردەوە، بە چاوێکی رشقنجاڕانەوە لە ئەسپەکان و بە روانینێکی پرسیاراوی لە لەڤین راما. لەڤین دەستێکی بە سەری سەگەکەدا هێنا و فیتوویەکی لێدا یانی دەست پێدەکەین.

لاسکا بە نەشە و زۆر بە وریایی و وردبینییەوە لەنێو زەلکاوەکەدا کە لەبەر چاوی دەتگوت رادەژێ، کەوتە گەڕان و ملۆمۆکردن.

کە چووە نێو زەجاوەکەوە لەڕێوە لەنێو بۆنی خووپێگرتووی ریشەی دارەکان و گژوگیای چێنك و رەنگی قوڕە مەیلەوڕەشەکەی و بۆنی نائاسایی تەرسی ئەسپەکان و بۆنی باڵندەدا، راست ئەو بۆنە تیژەی کە دنەی دەدا و لە تەواوی ئەو شوێنەدا بڵاو بووبۆوە، ناسییەوە. ئەو بۆنە جێجێ لەنێو بنچك و سندەگیا و تریشکەی چینکەکەدا زۆر توند بوو، بەڵام بۆی مەعلووم نەدەبوو لەکام لاوە توندترە یان کەمترە. بۆ ناسینەوەی شوێنی بۆنەکە دەبوو بەرەوگەی بایەکەدا بڕوات. لاسکا ئاگای لە رۆیشتنی خۆی نەمابوو، بە هەڵبەزدابەزێکی گورج و توندوتۆڵ، وەك ئەوەی بۆ هەرلایەك بتوانێ و ئەگەر ناچاربێ راوەستێ و بە لایەکی تردا باداتەوە، بەلای راستیدا هەڵات و لە بەرەوگەی شنەبا لایدا و پاشان دیسان بەلای راستدا بایدایەوە و بەرەوڕووی شنەی بەیانی سەری پێوەنا. بە کەپۆی تیژ و ئاوەڵاوە هەواکەی هەڵدەمژی و زۆر زوو هەستی کرد ئەوەی هەڵیدەمژێ شوێنی بۆنەکە نییە، چونکە ئەوان لە هەموو شوێنێکی زەلکاوەکەدا هەن، هەر لە پێش خۆیەوە نەك دانەیەك و دووان بەڵکوو زۆری لێیە. لاسکا رۆیشتنەکەی خاو کردەوە. ئەوان لە هەموو شوێنێك بوون بەڵام بۆی دەرنەدەکەوت لەکوێ خۆیان مات داوە. بۆ ئەوەی شوێنی هەڵنیشتنەکەیان بدۆزێتەوە بە شێوەی جەغزی هەڵدەهات و ملۆمۆی دەکرد، کە لە ناکاو دەنگی خاوەنەکەی هۆشی لێتێکدا. لەڤین دەنگی هەڵبڕی: لاسکا، لەولایەوە ـ لایەکی تری نیشاندا. لاسکا راوەستا و چاوی لێکرد و دەتگوت بەو روانینە پێیدەڵێ: لێمگەڕێ با ئەو شێوەگەڕانەی خۆم درێژە پێبدەم. بەڵام فەرمانی خاوەنەکەی دووپات بۆوە و ئەمجارەیان تووڕەیی پێوە دیاربوو، دووسێ دەوەن و پنچکی نیشاندا کە ئاو دەوری تەنیبوون و وێدەچوو هیچ باڵندەیەك لەوێ خۆی حەشار نەدابێت. ناچار بەگوێی کرد و واینواند کە دەگەڕێ بۆ ئەوەی دڵی خاوەنەکەی خۆشبکات،

دەورێکی بە دەوری دەوەنەکاندا لێدا و هاتەوە جێگاکەی هەوەڵی خۆی و زۆر زوو دیسان بۆنەکەی هەست پێکردەوە. ئێستا کە خاوەنەکەی مزاحیمی کارەکەی نەبوو دەیزانی چ بکات و بێ ئەوەی بزانێ پێ لەکوێ دادەنێ و جاروبار لاقی لە پنجەدەڵاو و گیاسندەی ژێر ئاوەکە دەگیرا و سەرسمێکی دەدا و لەنێو ئاوەکەدا دەگلا، هەموو جارێك هەڵدەستایەوە سەر لاقە نەرم و بەهێزەکانی و دیسان درێژەی بە گەڕانەکەی دەدایەوە و بە شێوەی جەغزی دەسووڕا و ملۆمۆی دەکرد و دەبوو ئەو گرفتەی خۆی چارەسەر بکات. بۆنی ئەوان بەردەوام زیاتر و روونتر دەبوو بۆی و لەناکاو بە تەواوی بۆی دەرکەوت کە یەکێکیان، هەر لەوێ لە پشت دەوەنەکەی بەردەمیدا کە پێنج هەنگاوی لێوە دوور بوو، خۆی مات کردووە. لە جێی خۆی راوەستا و گوێی قوت کردەوە و دەتگوت وشك بووە. چونکە لاقی کورت بوون لەبەر چڕگەن و کاڕووش پێشی خۆی نەدەدی بەڵام بە بۆن دەیزانی کە باڵندەکە لەبەر دەمییەتی. راوەستا و بە تەواوی هەستی بە بوونی نێچیرەکە کرد و چێژی لەو کارەی خۆی وەردەگرت. کلکی هەڵێنابوو و قانگڵەی کردبوو و دەیلەراندەوە. دەمی داچەقاندبوو و گوێچکەی قوت کردبۆوە. کاتێك هەڵدەهات یەکێك لە گوێچکەکانی دافیچابوو، بە توندی و بەڵام بە پارێزەوە هەناسەی هەڵدەکێشا و هەر ئاواش بە پارێزەوە چاوی لە خاوەنەکەی دەکرد، بەڵام زیاتر چاوی لەلای نێچیرەکە بوو و ملی هەڵێنابوو. لەڤین بە سیمایەکی بۆ ئەو ئاشناوە، بەڵام بە چاوانی هەمیشە ترسناکەوە و بە ئاکارێکی بە بڕوای ئەو ناسروشتییەوە لەسەرەخۆ دەچووە پێشێ و لاقی لە کەندولەندی ژێر ئاوەکە دەگیرا. لەبەر چاوی لاسکا خاوەنەکەی زۆر بە وردی دەهاتە پێشێ، بەڵام لەڕاستیدا ئەو هەڵدەهات.

لەڤین کە ئاکاری لاسکای دی تێگەیشت کە شتێکی دیوەتەوە، چونکە هەموو حاڵەتێکی گەماڵەکەی خۆی دەناسی. دیتی دەمی تۆزێ داچەقاندووە و بە ماتەماتە و لەسەرەخۆ، وەك ئەوەی سەوڵ لێبدات، دەڕواتە پێشێ، بۆیە زانیی باڵندەیەکی دیوەتەوە و دەچێ بۆ لای ئەو، لە دڵەوە کەوتە دۆعاکردن کە ناوچاوەکەی بیهێنێ و بەتایبەت یەکەم تیری بەخەتا نەچێت، بە هەڵەداوان هاتە نزیك سەگەکەی. هاتە پێشێ و لەسەر سەری سەگەکەی و لە بەینی گوێچکە قوتەکانییەوە روانیی و شتێکی بەرچاو کرد کە سەگەکەی بە هێزی بۆنکردن دەیزانی. پۆڕێکی دی لەنێوان دووبنچکدا هەڵنیشتووە. پۆڕەکە ملی بۆ لایەك خوار کردبۆوە و زیت و ترساو دەیویست هەڵفڕێ. پاشان باڵێکی لێکدا و دیسان باڵی کۆکردەوە و کلکی جووڵاند و لە پشت بنجە دەڵاوێك خۆی شاردەوە.

لەڤین لاسکای بۆ پێشەوە دەنگدا و گوتی: بیگرە، بیگرە.

لاسکا دەتگوت لە دڵی خۆیدا دەڵێ «بچم بۆ کوێ؟ کە لێرەم واهەست دەکەم لە پەنایانم، بەڵام لێرە دوورکەومەوە ئیتر هیچم بۆ مەعلووم نابێ. نە دەزانم لەکوێن و نە دەشزانم چین و چەند دانەن.» بەڵام لەڤین بە چۆکی پاڵی بە پاشەڵییەوە نا و بە سرتەیەکی پڕ هەیەجان گوتی: بیگرە لاسکا، بیگرە.

دیسان لاسکا دەتگوت لە دڵی خۆیدا دەڵێ «چاکە، ئێستا کە ئەو ئاوا پێداگرە، خەتاکەی لەسەر من نییە!» گومبەتەی لە خۆیدا و بە پڕتاو بە نێو بنجە سێسوودا دەرپەڕی بۆ پێشەوە. ئیتر بە بۆن هەستی بە هیچ نەدەکرد و تەنیا دەیدی و دیبیست و هیچ تێنەدەگەیشت.

چەند هەنگاو لەولای ئەوەوە پۆڕێك بە دەنگێکی نەرم و باڵلێدانێك کە روونی و پاکییەکەی تایبەتی پۆڕە هەڵفڕی. تفەنگ تەقەی لێهەستا و جەستەی باڵندەکە بە سینگی سپییەوە بە قورسی لەسەر باتلاخەکە کەوتە خوارێ. دووهەمیش بێپڕاوەستان و بێ ئەوەی سەگەکە هێرشی بۆ بەرێت لە پشت سەری لەڤینەوە هەڵفڕی.

کە لەڤین ئاوڕی دایەوە و تەقەی لێکرد باڵندەکە دوورکەوتبۆوە و گوللەکەی پێی نەگەیشت. بەڵام باڵندەکە نزیکەی بیست هەنگاو فڕی، پاشان راست بەرەو سەرەوە باڵی گرت و وەکوو لەتکە گڵمتکێك کەوتە خوارێ.

لەڤین هەردوو باڵندە گەرم و قەڵەوەکەی نایە نێو توربێنی راوەکەیەوە و بەخۆی گوت: «ئەمجار ئیتر گرتوویەتی، لاسچکا وانییە؟»

کاتێك خەریکی پڕکردنەوەی تفەنگەکەی بوو و دیسان وەڕێ کەوتەوە، خۆر هەڵاتبوو، ئەگەرچی هێشتا لە پشت هەورەکان بوو و وەدیارنەکەوتبوو. مانگ ئیتر تریفەی نەمابوو و وەك پەڵە هەورێکی خڕ و چکۆڵە بە ئاسمانەوە سپیی دەکردەوە. ئەستێرە ئیتر بەدیارەوە نەمابوون. گژوگیای نێو زەلکاوەکە کە پێشتر بە ئاوەنگەوە زێوینیان دەنواند ئێستا رەنگیان زێڕین بوو و ئاوەکە رەنگێکی مسینی بەخۆوە گرتبوو. رەنگی کەهووی گیاوگژەکان بەو بەیانییە سەوزێکی مەیلەوزەردیان دەنواند. مەلانی باتلاخ لەسەر دەوەنە تەڕ و شەونماوییەکانی قەراغ جۆبارەکە کە سێبەرەکەیان درێژ بووبۆوە جریوەیان دەهات. باشوویەك تازە هەستابوو و لەسەر دارێکی کوڵەبنە نیشتبۆوە. سەری بۆ هەموولایەك دەسووڕاند و ناقایلانە چاوی لە زەلکاوەکە بوو. قشقەڕە بەسەر دەشتەکەدا دەفڕین و کوڕێکی پێخواس ئەسپەکانی لێدەخوڕی

بۆ لای پیرەپیاوێك كە بە كەپەنكەوە لە خەو هەستابوو و خۆی دەخوراند. دووكەڵی تەقەكردنەكە پەڵەیەكی شیرپەنگی خستبووە سەر رووبەری سەوزی گژوگیاكە.

یەكێك لە كورپژگەكان هەڵات بۆ لای لەڤین.

بە هەڵاتن وەدوای كەوتبوو و لە دوورەوە هەرای دەكرد: خاڵەگیان، دوێشەو ئێرە مراوییەكێویی لێبوو.

لەڤین، كە نێوچاوانەكەی هێنابووی و لەبەر چاوی ئەو منداڵە بە دوای یەكدا سێ پۆڕ و زیقاوڵەی كوشتبوو لە خۆشیانا پێی وەعەرز نەدەكەوت.

## سێزدە

ئەو باوەڕە خورافاتییەی راوچییان كە دەڵێن ئەگەر یەكەم تیریان بەختا نەچێت نێوچاوانەكەیان دەیهێنێ، بۆ لەڤین وەڕاست گەڕابوو.

سەعات دە بوو كە شەكەت و برسی و دڵشاد، دوای بڕینی نزیكەی سێ وێرست بە نۆزدە پۆڕ و زیقاوڵە و مراوییەك كە توربێنەكەی جێی نەبوو و بە نێوقەدیدا هەڵیواسیبوو، گەڕایەوە. هاوڕێكانی ماوەیەكی زۆر بوو لە خەو هەستابوون و لەبەر برسییەتی سەبریان نەكردبوو و نانو چاییان خواردبوو.

لەڤین گوتی: راوەستن، پەلە مەكەن، دەزانم نۆزدە دانە بوون ـ دیسان دەستیكردەوە بە بژاردنی باڵندەكان، كە ئیتر ئەو جوانی و شكۆیەی كاتی فڕینیان نەمابوو، وشك و قووپاو خوێن بە پەڕوپۆكانیانەوە وشك هەڵاتبوو و سەریان بە لایەكدا خوار بووبۆوە.

حیسابەكەی دروست بوو و كە دیتی ستیپان ئاركادیچ ئێرەیی پێدەبات كەیفی هاتێ. ئەوەشی پێخۆش بوو كاتێك گەڕایەوە راسپاردەكەی كیتی كە نامەیەكی بۆ هێنابوو چاوەڕوانی بوو.

نووسیبووی «من حاڵم باشە و شاد و بەكەیفم. ئەگەر نیگەرانی حاڵی منی خەمت نەبێ و خەیاڵت ئاسوودە بێ، چونكە ماریا ڤلاسیۆڤنا[٣٦] هاتووە و ئاگاداریم لێدەكات. (ئەو ماریا ڤلاسیۆڤنایە مامان بوو و لە ژیانی بنەماڵەی لەڤیندا كەسایەتییەكی تازە و گرینگ بوو.)

---

36- Vlacyevna

هاتووه تاکوو چاوی پێمبکەوێت و لەسەر ئەو باوەڕەیە کە حاڵی من زۆر باشە و ئێمە نەمانهێشتووە بڕوات هەتا تۆ دێیتەوە. هەمووومان باش و لەشساغین و تکات لێدەکەم دڵی خۆت نارەحەت مەکە و پەلەش مەکە بۆ گەڕانەوە، ئەگەر ڕاوکردنەکەت پێخۆشە و خۆشی ڕادەبوێری ڕۆژێکی تریش بمێنەوە.»

ئەو دوو شادییە، یانی بەدەستەوە هاتنی ڕاوی باش و گەیشتنی نامەی ژنەکەی هێندە زۆر بوو کە دوو کێشەی چکۆڵە کە دواتر ڕوویاندا، بە ئاسانی لە بیری چۆوە. یەکێك لەو دوو کێشەیە ئەوەبوو کە ئەسپەبۆر کە دیاربوو ڕۆژی پێشوو لە ڕادەبەدەر ماندووبووە، هیچ ناخوات و گوێچکەی داتەپاندووە. فایتوونەوانەکە دەیگوت: پساوە.

ـ دوێنێ زۆری ڕێگا بڕیوە، کۆنستانتین دیمیتریچ. خۆتان بڕوانن قوربان، سی وێرست بە زەبری قامچی ڕەتاوە.

کێشەکەیتریش هەر لە سەرەتاوە دڵی ناخۆش کرد بەڵام خۆی دواتر زۆری پێکەنین بە خۆی هات، ئەویش ئەوەبوو تەواوی ئەو نان و خواردنانەی کیتی بۆی پێچابوونەوە و هێندەش زۆر بوو کە پێیانوابوو بەشی حەوتوویەك دەکات، ئابلۆنسکی و ڤسلۆڤسکی قرتەیان لێبڕیبوو. لەڤین، کە شەکەت و ماندوو لە ڕاو گەڕایەوە، خولیای خواردنی پیراشکییە ناسك و خۆشەکان هێندە بە ڕوونی و ڕاستەقینە مێشکی داگرتبوو، کاتێك گەیشتەوە لای هاوڕێکانی، لاسکا چۆن بۆنی نێچیر دەکات ئەویش ئاوا بۆنی خواردنەکان لە لووت و هەناوی گەڕابوو دەمی ئاوی دەکرد. لەڕێوە دەستووری بە فیلیپدا کە خواردنی بۆ بێنێ. بەڵام بۆی دەرکەوت نەك پیراشکی نەماوە بەڵکوو جووجەی برژاویش قرتەی لێبڕاوە.

ستیپان ئارکادیچ بە پێکەنینەوە ڤاسنکا ڤسلۆڤسکیی نیشاندا و گوتی: ئشتیایەکی سەیری هەیە. من خۆم زۆر زگەڕۆم بەڵام ئەوە زگەڕۆیەکە هەر باسی مەکە!

ڤسلۆڤسکی کە تاریفی گۆشتی بریانی چێڵی دەکرد گوتی: نازانن چەندە خۆشبوو.

لەڤین بە نێوچاوانێکی گرژەوە چاوی لە خزمەتکارەکەی کرد و گوتی: دەی، چارە چییە؟ فیلیپ، ئێستا لانیکەم هێندێکم گۆشتی بریان بۆ بێنە!

فیلیپ وەڵامی دایەوە: گۆشتی چێڵەکەیان هەمووی خوارد و یەسقانەکانیشمدا بە سەگەکان!

لەڤین هێندەی پێناخۆش بوو کە بە ڕق هەستاوی گوتی: واچاك بوو بڕێکیش بۆ من بهێڵنەوە.ـ هێندەشی دڵ بەخۆی سووتا خەریکبوو دەستبکات بە گریان.

ڕووی لە فیلیپ کرد و بە دەنگێکی لەرزان گوتی: چاکە، یەکێك نێچیرەکان ئاوەڕووت بکە و نێوزگی پڕ بکە لە گەزنە. بەڵام جاریٚ هێندیٚ شیرم لەو خاوەن ماڵە بۆ وەربگرە ـ لەگەڵ گوتنی ئەو قسەیە هەوڵی دەدا چاو لە چاوی ڤسلۆڤسکی نەکات.

دوای ئەوەی بە شیر زگی خۆی تێر کرد لەوەی کە لەبەر برسییەتی رقهەستانی خۆی لەلای ئەو میوانە غەوارانە نواندبوو هەستی بە شەرمەزاری کرد. ئێوارە دیسان چوونەوە بۆ راو و ئەمجار ڤسلۆڤسکیش چەند باڵندەی راو کرد و شەویٚ گەڕانەوە بۆ ماڵیٚ.

گەڕانەوەکەشیان وەك رۆیشتنەکەیان بە خۆشی گوزەرا. ڤسلۆڤسکی هێندیٚ جار گۆرانیی دەگوت و هێندیٚ جاریش باسی ماجەراکانی خۆی لەگەڵ گوندنشینەکان بە تامولامەوە دەگێڕایەوە کە چۆن بۆ ڤۆدکا بانگهێشتنیان کردبوو و گوتبوویان «لای کەس دەنگیٚ نەکەی!» هێندیٚ جاریش بەسەرهاتی شەوی رابردووی لەگەڵ کچە وەرزێڕەکە دەگێڕایەوە، هەروەها ئەو وەرزێڕەی کە پرسیبووی ژنی هەیە یان رەبەنە و کە زانیبووی ژنی نییە گوتبووی «واچاکە بە چاوی خراپ لە ژنی خەڵکی نەڕوانی و لە بیری ئەوەدا بی خۆت ژن بێنی.» بەو قسەیەی کابرای لادێیی قاقا پێدەکەنی.

ـ لەسەریەك زۆرم ئەو سەفەرە کورتەمان پێخۆش بوو. ئەی ئێوە، لەڤین؟

لەڤین سادقانە گوتی: منیش زۆرم پێخۆش بوو! ـ نەك تەنیا لەبەرئەوەیکە لە ماڵیٚ رقی لە ڤاسنکا ڤسلۆڤسکی هەڵگرتبوو و ئێستا ئەو هەستەی لە دڵدا نەمابوو، بەڵکوو شادییەکەی زیاتر بەو هۆیەوە بوو کە زۆری حەز بە دۆستایەتیی ئەو کوڕە لاوە دەکرد.

## چاردە

ڕۆژی دوایی، لەڤین دوای ئەوەی سەردانی مڵکەکەی کرد، کاتژمێر دە لە دەرگای ئەو ژوورەیدا کە ڤاسنکا لێیخەوتبوو.

ڤسلۆڤسکی دەنگی بەرزکردەوە: فەرموو ـ پاشان کە بە جلوبەرگی ژێرەوە، لە هەمبەریدا راوەستا، بە پێکەنینەوە گوتی: ببوورن من تازە دەست و دەموچاوم شۆردووە.

لەڤین لەسەر لێواری پەنجێرەکە دانیشت و گوتی: تکات لێدەکەم نارەحەت مەبە. باش خەوتی؟

ـ وەك دێو. ئەمڕۆ چەندە رۆژێکی باشە بۆ راو.

ـ حەز لە چایی دەکەی یان قاوە؟

ـ هیچ کام. بەر لە فراوێن هیچ ناخۆم. بەڕاستی شەرمەزارم. خاتوونەکان حەتمەن هەستاون. واباشە پیاسەیەك بکەین. تکایە ئەسپەکانتم پیشان بدە.

بەنێو باخەکەدا کەوتنە پیاسەکردن و دوای ئەوەی چاویان بە گەورەکان کەوت و تەنانەت لەسەر پاراڵێل و بارفیکس کەمێك وەرزشیان کرد، گەڕانەوە بۆ ماڵێ و چوونە تەلاری میوانداری. ڤسلۆڤسکی لەگەڵ ئەوەدا کە دەچوو بۆ لای کیتی کە لەبەر سەماوەرەکە دانیشتبوو، گوتی: نازانی چەندە راوێکی باشمان کرد و چ سەیران و گەشتێکیش! سەدحەیف کە خاتوونەکان لەو خۆشیانە بێبەشن.

لەڤین بەخۆی گوت «دیسان دەستیپێکرد. بەڵام هیچ نییە، قەیناکا. هەرچۆنێك بێ دەبێ لەگەڵ خاتوونی بنەماڵە قسەیەك بکات.» لە بزە و حاڵەتی سەرکەوتووانەی ڤاسنکادا کاتێك لەگەڵ کیتی دەدوا هەستی بە شتێك کرد کە...

پرێنسسی گەورە کە لەگەڵ ماریا ڤلاسیۆڤنا و ستیپان ئارکادیچ لەوبەری مێزەکە دانیشتبوون لەڤینی بانگکرد بۆ لای خۆی و سەبارەت بە بردنی کیتی بۆ مۆسکۆ و دابینکردنی کاروباری منداڵبوونەکەی و خانوویەك بۆ نیشتەجێبوونیان، قسەی لەگەڵ کرد. بە بڕوای لەڤین هەرچەشنە تەدارەکێك بۆ زەماوەند زێدەڕەوی بوو، چونکە پێیوابوو هەرچەشنە تەدارەك و بەهەر رادەیەك بێ لە هەمبەر گەورەیی و شکۆی زەماوەنددا هیچ و پڕسووکایەتییە، جا تەدارەك و ئامادەکاری بۆ منداڵبوونی داهاتوو کە بە قامك رۆژەکانیان دەبژارد، دووهێندە شوورەیی و پڕسووکایەتیی دەنواند. بەردەوام هەوڵی دەدا گوێی لەوجۆرە قسە و باسانەی ژنان نەبێ سەبارەت بە پێچانەوە و مەلۆتکەکردنی کۆرپە. هەروەها رووی وەردەگێڕا بۆ ئەوەی چنینی بەند و دەسرازە و بڕینی پەڕۆوپاڵ و شانپێچ و بەرسنگەی کەتانی نەبینێ کە زۆر بەلایەوە نامۆ بوون و دواییان نەدەهات، دالیش گرنگایەتییەکی تایبەتی پێدەدان و بەردەوام خۆی و ژنەکانی تری پێوە سەرقاڵ کردبوو. لەلایەکەوە لەدایکبوونی منداڵەکەی، کە وادەیان پێدابوو کوڕ دەبێت (دڵنیابوو کۆرپەکەی کوڕ دەبێت)، بەڵام نەیدەتوانی باوەڕ بکات، چونکە لەبەر چاوی زۆر هەژەندبوو، هەروەها بە هۆی مەزنایەتییەکەیەوە لەبەرچاوی بەختەوەرییەکی مەحاڵ بوو، لەلایەکی تریشەوە خەیاڵی زانین سەبارەت بەو شتەی لەو بوارەدا رووی دەدا و لە ئاکامدا تەدارەکی ئامادەکاری بۆ ئەو میوانە چکۆڵە، وەك ئەوەی بۆ کردەوەیەکی مرۆڤەکان بێت، بەلایەوە قێزەون و پڕسووکایەتیی دەنواند.

بەڵام پرێنسس لەو هەستەی ئەو نەدەگەیشت و پارێزکردنی ئەوی لە بیرکردنەوە و قسەکردن لەوبارەوە، بە کەمتەرخەمی و خەمساردی دادەنا و هەر بەو هۆیە هەراسی

پێهەڵگرتبوو. ئەو بە ستیپان ئارکادیچی گوتبوو کە حەول بدات خانووبەرەیەکیان بۆ بدۆزێتەوە و ئێستا لەڤینی بانگکردبوو بۆ ئەو قسە و باسانە.

لەڤین گوتی: لەو بارەوە هیچی تێناگەم. ئەوی خۆت بە باشی دەزانی بیکە.

ـ دەبێ کاتی وەرێکەوتنەکەتان دیاری بکەی.

ـ راستت دەوێ سەرم لێیدەرناچێ. تەنیا دەزانم کە ملوێنان دایك منداڵیان دەبێت و نە پێویستیان بە چوونی مۆسکۆ هەیە و نە بە دوکتۆر... ئێستا چیبووە کە ئاوا....

ـ دەی کەوایە....

ـ نا، هەرچۆنێکە دەبێ بە دڵی کیتی بێت.

ـ من خۆ ناتوانم سەبارەت بە منداڵبوون لەگەڵ کیتی بدوێم. بۆ لەخۆڕا بیترسێنم؟ بەڵام هەر ئەم بەهارەی رابردوو ناتالی گولیتسینا چونکە مامانی باشی نەبوو، بەسەر منداڵەوە چوو.

لەڤین بە نێوچاوانێکی تاڵەوە گوتی: هەر کارێکی بیڵێن دەیکەم.

پرێنسس دەستیکرد بە قسەکردن لەگەڵیدا، بەڵام لەڤین گوێی بۆ رانەدەگرت. ئەگەرچی قسەکانی پرێنسس بەجارێ ئاڵەتیی دەکرد، بەڵام خەمۆکییەکەی بە هۆی قسەکانی ئەوەوە نەبوو، بەڵکوو بە هۆی ئەو دیمەنەوە بوو کە لەبەر سەماوەرەکە دەیدی.

جارجار چاوێکی لەولایە دەکرد و ڤاسنکای دەدی کە بزەیەکی شیرین و جوان نیشتۆتە سەرلێوی و بەسەر کیتیدا نووشتاوەتەوە و بە سرتە شتێکی پێدەڵێت. هەروەها کیتیشی دەدی کە سوورهەڵدەگەڕا و تووشی هەیەجان دەبوو. لەڤین لە دڵی خۆیدا گوتی: «نا، ئاوا نابێ.»

لە رواڵەت و بزەی ڤاسنکادا شتێکی ناپاك هەست پێدەکرا. لەڤین تەنانەت لە روانین و رواڵەتی کیتیشدا شتێکی ناپاکی دەدی. دیسان گەشبینییەکانی ئاوێتەی رەشبینی بوونەوە. دیسان وەك پێشوو هەستی کرد لە ناکاو و بەبێ تێپەڕاندنی قۆناخێکی ناڤینی لە بەرزاییی بەختەوەری و دڵحەساوەییی و گەورەییەوە کەوتۆتە نێو گێژەنی بێهیوایی و رەشبینی و سووکایەتییەوە. دیسان هەموو شتێك و هەموو کەس لەبەرچاوی کرێت و قێزەون بوون.

لەڤین دیسان چاوی لەوێ کردەوە و گوتی: دەیباشە، پرێنسس، هەرچۆنێك خۆت بەباشی دەزانی وابکە.

ستیپان ئارکادیچ بە گاڵتە گوتی: تاجی خەڕەبوون و سەرەڕۆیی چەند گرانە[٣٧] ـ کینایەکەشی تەنیا بۆ ئاخافتن لەگەڵ پرێنسس نەبوو بەڵکوو تێگەیشتبوو شڵەژانی لەڤین لە

---

٣٧- لە هۆنراوەیەکی بەناوبانگی پووشکین وەرگیراوە بە ناوی «باریس گادۆنۆڤ»

کوێوە سەرچاوە دەگرێ، بۆیە ڕاست ئاماژەی بەوە دەکرد. پاشان ڕووی لە ژنەکەی کرد و گوتی: دالی، تۆ ئەمڕۆ زۆر درەنگ هەستای!

هەموو لەبەر داریا ئەلکساندرۆڤنا هەستان. ڤاسنکا تەنیا چرکەیەك و زۆر بە بێهەمیەتی کە تایبەتی لاوانی ئەمڕۆیە و بۆ لەبەرچاو گرتنی ئەدەب و نەزاکەت لە هەمبەر ژناندا بەحاڵ سەریان دادەخەن، ئەویش ئاوا سەری بۆ دالی دانەواند، بە شتێك پێکەنی و دیسان درێژەی بە ئاخافتنەکەی دایەوە.

دالی گوتی: ماشا دیقی پێکردم. خەوی لێزڕابوو، وایلێهاتووە بەردەوام پەڵپو بیانوو دەگرێ.

ئاخافتنی ڤاسنکا و کیتی درێژەی بابەتەکەی چەند شەوی پێشوویان بوو سەبارەت بە ئانا و سەبارەت بەوە دەدوان کە بڵێی ئەوین گرینگتر لە پلەوپایەی کۆمەڵایەتی بێتە ئەژمار؟ کیتی زۆری حەز بەو ئاخافتنە نەدەکرد. چونکە نە ناوەڕۆکی باسەکەی بەدڵ بوو نە ئەو لەبز و راوێژەی ڤاسنکا پێیدەدوا، بەتایبەت بە هۆی شوێنێك کە بە باشی دەیزانی ئەو جۆرە ئاخافتنانە لەسەر هەستی مێردەکەی دادەنێ، بەڵام زۆر لەوە دڵپاك و ساویلکەتر بوو کە بتوانێ کۆتایی بە ئاخافتنەکە بێنێ و تەنانەت بتوانێ ئەو چێژە بشارێتەوە کە سەرنجی تایبەتی ئەو لاوە لە ناخ و ڕواڵەتیدا بەدیی هێنابوو.

دەیویست ئەو باسە ببڕێتەوە بەڵام نەیدەزانی بۆ ئەو کارە دەبێ چ بکات. دەیزانی بەو قەستە هەرکارێك بکات لە چاوی مێردەکەی ناشاردرێتەوە و ئەو بەباری خراپە لێکی دەداتەوە. بەڕاستیش کاتێك کیتی لە خوشکی پرسی ماشا چی کردووە، ڤاسنکا، دیاربوو کۆتایی هاتنی قسەکانی زۆر پێناخۆشە و بێموبالاتانە چاوێکی لە دالی کرد. ئەم پرسیارەی کیتی بە بڕوای لەڤین ساختە بوو، مەکر و فێڵە شاراوەکەشی زۆر قێزەون هاتە بەرچاوی.

دالی پرسیی: دەی، ئەمڕۆ دەچین بۆ کارگچنین؟

کیتی گوتی: بەڵێ، تکاتان لێدەکەم با بچین، منیش دێم ـ بەڵام کە ئەوەی گوت سوورهەڵگەڕا. دەیویست وەك ڕەسمی میوانداری لە ڤاسنکا بپرسێ کە ئەویش دێت یان نا، بەڵام لێینەپرسی. کە لەڤین بە هەنگاوی توند و خێرا بەلایدا تێپەڕی کیتی بە لەبزێکی خەتابارانە پرسیی: کۆسیتا، دەچی بۆکوێ؟ ـ ئەو لەبزە پرسیارەی کیتی بەجێبوونی دڵپیسییەکەی لەڤینی پشتڕاست کردەوە.

لەڤین بێ ئەوەی چاو لە چاوی بکات گوتی: کاتێك لە ماڵێ نەبووم مکانیك هاتووە و من هێشتا چاوم پێینەکەوتووە.

چووە خوارێ بەڵام هێشتا لە ژووری کارەکەی نەچووبووە دەرێ کە ترپەی ئاشنای هەنگاوی ژنەکەی بیست کە بە هەڵەداوان بە دوایدا دەهات.

لەڤین بە ساردی پێیگوت: چیتدەوێ؟ ئێمە گرفتارین.

کیتی رووی لە مکانیکی ئاڵمانی کرد و گوتی: ببوورە، من دەبێ تۆزێ لەگەڵ مێردەکەم بدوێم.

کابرای ئاڵمانی دەیویست بڕوات بەڵام لەڤین گوتی: نا، مەڕۆ، هەر لێرەبە.

ئاڵمانی گوتی: شەمەندەفەر سەعات سێ وەڕێ دەکەوێ، دەترسم فریای نەکەوم.

لەڤین وەڵامی نەدایەوە و لەگەڵ ژنەکەی لە ژوورەکە چوونە دەرێ.

بە زمانی فەڕەنسی پرسیی: **دەی، دەتەوێ چی بڵێی؟**

لەڤین چاوی لە چاوی نەدەکرد و نەیدەویست ژنەکەی بەو زگە پڕ و روخسارە بزرکاوەوە و بەو حاڵە بەزەییهێنەر و تێکشکاوەوە ببینێ.

کیتی گوتی: من.... من دەمویست بڵێم ئاوا ناتوانین بژین... ئەم ئازارە ئیتر بەڕاستی تاملێ ناکرێت.

لەڤین بە تووڕەیی گوتی: وریابە، کلفەتەکان لە ژووری خۆیانن گوێیان لە دەنگت دەبێ. ئێرە شوێنی چەلەحانێ نییە.

ـ کەوایە وەرە بۆ ئێرە.

لەبەر هەیوانەکە راوەستابوون و کیتی دەیویست بچێتە ژووری تەنیشتیان، بەڵام ژنی راهێنەرە ئینگلیزییەکە لەو ژوورە دەرسی بە تانیا دەگوت.

ـ چاکە، با بچین بۆ نێو باخەکە.

لەنێو باخەکە تووشی مووژیکێك بوون خەریکبوو توولەڕێی نێو باخەکەی پاك دەکردەوە. بەڵام بێ ئەوەی کیتی بیر لە چاوە فرمێسکتێزاوەکانی خۆی بکاتەوە و لەڤین گوێی لە رەنگوڕووە تووڕە و گرژەکەی خۆی بێ و بێ ئەوەی لە بیری ئەوەدابن کە هەڵسوکەوتیان لە کەسانێك دەچێ کە لە ترسی کێشە و بەڵایەك هەڵدێن" هێندە بە هەڵەداوان دەڕۆیشتن و هەستیان دەکرد ئەوەی لە دڵیاندایە دەبێ هەڵیڕێژن و متمانە بە یەکتر بدەن، هێندێك پێکەوە بن و بەو شێوەیە لە چنگ ئەو ئازارە دەربازبن، کە ژیانی لێتاڵ کردبوون و توانایی تاملکردنیان نەمابوو.

ئاخری گەیشتنە لای کەپرێکی چکۆڵە کە لەسەر پێچی توولەڕێی نێو دارەکان هەڵکەوتبوو، کیتی گوتی: ئاوا ژیان بەڕاستی مەحاڵە. من ئازار دەکێشم و تۆش حەسانەوەت نییە. بۆچی؟

لەڤین بەرەوڕووی راوەستابوو و دیسان وەك ئەو شەوە مشتە توندقووچاوەکانی لەبەر سینگیدا راگرتبوو، گوتی: تۆ تەنیا شتێك بە من بڵێ، قسەکانی ئەو هەتیوە شتێکی نەشیاو و ناپاك و پڕسووکایەتیی پێوە بوو یان نا؟

کیتی بە دەنگێکی لەرزۆك گوتی: پێوەیبوو، بەڵام کۆسیتا، بڕوام پێبکە خەتای من نییە. من لە ئەمڕۆ بەیانییەوە دەمویست بە لەبز و هەڵسوکەوتی خۆم نیشانی بدەم کە... بەڵام ئاخر ئەو جۆرە مرۆڤانە... هەر نازانم ئەوە ئێرە بۆ هاتووە؟ کاتێك ئەوە لێرە نەبوو هیچ گرفتێکمان نەبوو ـ ئەوەی گوت و گریان نەیدەهێشت قسەکانی دەربڕێ و هەموو ئەندامی بە هەنیسك دەلەرییەوە.

باخەوانەکە بە سەرسووڕمانەوە دەیدی کە هیچ کەس وەدوایان نەکەوتبوو و ئەو ژن و مێردە لەدەست شتێك رایان نەدەکرد، نێو کەپرەکەش شتێکیوای تێدا نەبوو کە ببێتە هۆی دڵخۆشییان، لەگەڵ ئەوەشدا پێیسەیر بوو دوای تاوێك بە رووخۆشی و رەنگ و رووی کراوەوە بە پەنایدا تێپەڕین و گەڕانەوە بۆ ماڵێ.

## پازدە

لەڤین دوای ئەوەی ژنەکەی برد بۆ نهۆمی سەرێ خۆی گەڕایەوە و چوو بۆ ژوورەکەی دالی. داریا ئەلکساندرۆڤناش ئەو رۆژە زۆر دڵتەنگ بوو. بە خەمباری و شێواوی لەنێو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو، بە تووڕەیی لەگەڵ کچەکەی دەدوا کە لە سووچێکی ژوورەکەدا راوەستابوو و دەگریا.

ـ هەتا شەوێ ئەوە جێگاتە و دەبێ ئاوا راوەستی، نانی نیوەڕۆش بە تەنیا دەخۆی و ئیتر چاوت بە بووکەڵە ناکەوێ، کراسی تازەشت بۆ نادوورم ـ ئەوانەی دەگوت و نەیدەزانی ئیتر چ تەمبێیانەیەکی تر بخاتەسەر ئەوانەی گوتبووی.

کە چاوی بە لەڤین کەوت گوتی: زۆر کچێکی خراپە. نازانم ئەو ئاکارە قێزەونە لە کێوە فێر بووە.

لەڤین کە هاتبوو سەبارەت بە کێشەکەی خۆی راوێژی لەگەڵدا بکات، کە دیتی لە کاتێکی نەشیاودا هاتووە پەژیوان بۆوە و بە خەمساردییەوە گوتی: ئەوە چیی کردووە ئاوا لێی تووڕەی؟

ـ هیچ، لەگەڵ گریشا چووبوون بۆ نێو تووڕکەکان و لەوێ.... نا، ناتوانم بڵێم لەوێ چیی کردووە. سەد رەحمەت لە پەرستارەکەی پێشوو، میسئیلیۆت[38]. ئەمەیان هیچ ئاگادارییەکیان لێناکات. هەر دەڵێی بووکۆکەی قورمیشییە. بیری لێبکەوە...

---

38- Elliot

دەستیکرد بە باسکردنی تاوانەکەی ماشا.

لەڤین دڵنیای کرد و گوتی: ئەوە نیشاندەری هیچ شتێك نییە. ئاکاری قێزەون یانیچی؟ تەنیا هاروهاجییەکی منداڵانەیە و بەس.

دالی گوتی: دەی، تۆ بۆ شێواوی؟ دیارە تووڕە و شڵەژاوی. کارێکت بە من بوو؟ لەوێ چ خەبەرە؟

لەڤین بەو لەبزی پرسیارەدا زانیی دەتوانێ ئەوەی لە دڵیدایە بۆی هەڵڕێژێ.

ـ من لەوێ نەبووم. لەگەڵ کیتی چووین بۆ نێو باخەکە. ئەمە جاری دووهەمە لەو کاتەوە.... ستیڤا هاتووە... پێکەوە دەمەقاڵێیان لێپەیدا دەبێ.

دالی بە چاوە وردبینەکانی، کە دیاربوو هەموو شتێك تێدەگا، لە لەڤینی روانی و لەڤین درێژەی بە قسەکانیدا:

ـ ئێستا تۆ راستم پێبڵێ، سوێندم بۆ بخۆ، باسی کیتی ناکەم، بەڵام لەبزی ئەو کوڕە و هەڵسوکەوتی پێتوانییە بۆ مێردێك ناخۆشە و لە دڵی گران دێ؟ نەك هەر ناخۆش، پێتوانییە ئاکار و ئاخافتنی پڕسووکایەتییە و تامڵ ناکرێ؟

ـ چۆنت پێبڵێم... ـ چاوێکی لە ماشا کرد، کە بزەیەکی کەمڕەنگی لەسەر لێوی دایکی دی دەیویست بێت بۆ لای. گوتی: هەر لەوێ، لەو سووچە راوەستەـ پاشان رووی کردە لەڤین و گوتی: ئەگەر لە دابونەریتی ئەمڕۆییەکان بپرسی ئەو کوڕە کارێکی کردووە کە هەموو لاوەکانی ئەمڕۆ دەیکەن. ***یانی دڵی ژنێکی جوان و جحێڵی رفاندووە،*** مێردێکی ئەمڕۆییش دەبێ بەو ئاکارەی ئەو هەست بە سەربەرزی بکات.

لەڤین گوتی: بەڵێ، بەڵێ، بەڵام تۆ سەرنجت پێدا؟

ـ نەك هەر من، ستیڤاش تێگەیشت. دوای چایی بە راشکاوی پێیگوتم: «***وادیارە ڤسلۆڤسکی دەیهەوێ دڵی کیتی نەرم بکات.***»

لەڤین گوتی: چاکە، زۆر چاکە، ئیتر خاترجەم بووم. وەدەری دەنێم.

دالی تۆقیوانە دەنگی هەڵبڕی، دەڵێیچی؟ جا بۆ شێت بووی؟ـ بە پێکەنینەوە گوتیشی: کۆسیتا، تۆ بۆ واتلێهاتووە؟ ئاگات لە خۆت بێـ رووی لە ماشا کرد و گوتی: باشە، ئێستا دەتوانی برۆی بۆ لای فانیـ رووی لە لەڤین کردەوە و درێژەی پێدا: نا، ئەگەر پێتخۆشە بە ستیڤا دەڵێم بڕوات و لەگەڵ خۆی بیبات. دەکرێ بڵێین بڕیار وایە میوانتان بۆ بێت. بەڵام ئەو کوڕە تازە هاتووە و ئاکار و خووخدەشی لەگەڵ دابونەریتی ئێمە سازگار نییە.

ـ نا، نا، من خۆم کارەکە جێبەجێدەکەم.

ـ دەتەوێ شەڕی لەگەڵ بکەی؟

لەڤین گوتی: قەت کاری واناکەم، دەچم بۆ گەڕان و رابواردن ـ چاوانیشی بەڕاستی بریقەی شادیی تێدا دەدرەوشایەوە. کچەی تاوانبار کە نەچووبوو بۆ لای فانی و بە دوودڵی لەلای دایکی راوەستابوو و لە ژێر چاوەوە و لەسەر هەست دەیڕوانی، تاکوو چاوی پێیبکەوێ، لەڤین تکای بۆ کرد و گوتی: لەبەر خاتری من بیبەخشە. ئیتر لەو کارانە ناکات.

دالی چاوێکی لە کچەکەی کرد، کچە دەستیکرد بە گریان و سەری کرد بە بەینی ئەژنۆی دایکیدا و دالی دەستە کز و مێهرەبانەکەی بەسەریدا هێنا.

لەڤین بەدوای ڤسلۆڤسکیدا رۆیشت و لە دڵی خۆیدا گوتی «ئاخر نازانم چ خاڵێکی هاوبەش لەنێوان ئێمەدا هەیە؟»

کە گەیشتنە بەرهەیوانەکە دەستووریدا ئەسپەکان لە فایتوونەکە بکەن تاکوو بچن بۆ وێستگەی هێلاسن.

پێشخزمەتەکەی گوتی: دوێنێ یەکێك لە فەنەرەکانی شکا.

ـ دەی کەوایە عارەبانەکە حازرکەن. بەڵام زووکەن، میوانەکە لە کوێیە؟

ـ چوو بۆ ژوورەکەی خۆی.

کە لەڤین چووە ژووری ڤاسنکا کەلوپەلەکانی لە جانتاکەی دەرهێنابوو، دەفتەری نۆتە نوێیەکانی هەڵبژاردبوو و خەریکبوو بەجێی جزمە بەلەکپێچی ئەسپسواری بە لاقی تاقی دەکردەوە.

یان روخساری لەڤین حاڵەتێکی تایبەتی پێوە دیاربوو یان ڤاسنکا وای هەست کردبوو کە ***ئەو نەختە حەز لێکردووییەی*** ئەو لەم ماڵەدا نابەجێ بووە، چونکە بە هاتنە ژوورەوەی لەڤین تۆزێ دڵگران بوو. (هەڵبەت هەتا ئەو جێیەی کە گەنجێکی کۆمەڵگای ئەمڕۆ دڵگرانی بزانێ چییە.)

ـ دەتهەوێ بەو بەلەکپێچانەوە ئەسپسواری بکەی؟

ڤاسنکا لاقە گۆشتنەکانی لەسەر کورسیەك دانا و بە دەم توندکردنی بەندی بەلەکپێچەکانییەوە بزەیەکی سایلۆحانە نیشتە سەرلێوی و گوتی: بەڵێ، بە بەلەکپێچەوە زۆر خاوێنترە.

ئەو بەڕاستی لاوێکی رۆحسووك بوو، لەڤین دڵی پێیسووتا و کە شەرم و رووزەردیی لە نیگایدا بەدی کرد، لە رووی میوانگرییەوە لە دڵی خۆیدا هەستی بە شەرمەزاری کرد.

لەتە دارێك کە ئەو ڕۆژە بەیانی کاتی وەرزش، ویستبوویان داری خواربووی پارالێل چاك بکەنەوە شکابوو، هەروا لەسەر مێزەکە کەوتبوو. لەڤین دەستیدا دارەکە و هەڵیگرت، چونکە نەیدەزانی چۆن ئەوەی لە دڵێدایە دەریبڕێ، دەستیکرد بە لێکردنەوە تەڵەزمە شکاوەکانی سەری دارەکە.

گوتی: دەمویست... ـ خەریکبوو پەژیوان بێتەوە و ئیتر وازی لێبێنێ بەڵام کە کیتی و بڕیارەکەی خۆی وەبیرهاتەوە گوتی: دەستوورم داوە ئەسپەکانت بۆ لە عارەبانەکە بکەن.

ڤاسنکا بە سەرسووڕمانەوە گوتی: چۆن، لە عارەبانەی بکەن؟ بۆ دەمانەوێ بچین بۆ کوێ؟

لەڤین هەروا خەریکی شکاندنی تەڵەزمی سەری دارەشکاوەکە بوو بە ناوچاوانێکی تاڵەوە گوتی: بۆ ئێوە. چونکە دەبێ بچیت بۆ وێستگەی هێڵاسن.

ـ چۆن؟ مەگین دەتەوێ بچین بۆ شوێنێك؟ کێشەیەك رووی داوە؟

لەڤین کە خێرا خێرا تەڵەزمەکانی دەشکاند گوتی: ئەو کێشەیەی رووی داوە ئەوەیە کە... میوانم دێ. نا، میوانیش نایەت و هیچ شتێکیش رووی نەداوە، من تکات لێدەکەم لێرە بڕۆن. تۆ دەتوانی ئەم بێئەدەبییەی من هەرچۆنێکت پێخۆشە لێکیبدەیتەوە.

ڤاسنکا سەری هەڵێنا و سینگی دەرپەڕاند.

ئاخری لە مەبەستی لەڤین گەیشتبوو و خاکەڕایانە گوتی: من داوات لێدەکەم بۆم روون بکەیتەوە.

لەڤین کە دەیویست لەرزینی لێو و شەویلکەی بشارێتەوە لەسەرەخۆ گوتی: من ناتوانم هیچ روونکردنەوەیەکم بۆ ئێوە هەبێت و واچاکە داوای ئەوەم لێنەکەیت.

چونکە تەڵەزمەکانی هەموو شکاندبوو و لە دارەکەی کردبوونەوە قامکی کرد بە بەینی سەری داقڵیشاوی دارەکەدا و کردی بە دوولەتەوە و لەتێکیان کە خەریکبوو بەربێتەوە گورج گرتییەوە.

ڕەنگە دیتنی باسك و ماسوولکەی لەڤین کە ئەو ڕۆژە کاتی وەرزش ڤاسنکا دەستی لێدابوون و هەروەها چاوە سوور و پڕگڕەکانی و دەنگی گڕ و شەویلکەی لەرزۆکی لە هەموو وتەیەك روون و ئاشکراتر بێ کە مەبەستی چییە. بۆیە شانی هەڵتەکاند و بە بزەیەکی پڕسووکایەتییەوە کڕنۆشی بۆ کرد.

ـ دەکرێ چاوم بە ئابلۆنسکی بکەوێت؟

شان هەڵتەکاندن و بزە پرسووکایەتییەکەی لەڤینی شلوێ نەکرد. بەخۆی گوت «جگە لەوە چیی تری لەدەست دێ؟»

ـ هەر ئێستا دەینێرمە خزمەتتان.

ستیپان ئارکادیچ کە زانیی خانەخوێکەی خەریکە میوانەکەی لە ماڵێ وەدەر دەنێ، لەنێو باخەکە لەڤینی پەیدا کرد کە چاوەڕوانی ڕۆیشتنی میوانەکەی بوو، گوتی: ئەو کارە شێتانەیە چییە؟ ***بەڕاستی ئەوە شتێکی قۆڕ و شوورەییە!*** قەت ئەو کارە لە تۆ ناوەشێتەوە. وادیارە شەیتان چۆتە کەڵێشەتەوە! ***تۆ خۆت نازانی کارەکەت چەندە ناشیرینە.*** پێتوایە ئەگەر لاوێك...

بەڵام دیاربوو ئەو زەبرە بەژانەی لە غیرەتی لەڤین درابوو، هێشتا ئازارەکەی تازەبوو، چونکە کاتێك ستیپان ئارکادیچ خەریکی شێر و ڕێوی هێنانەوە بوو، دیسان ڕەنگی هەڵبزڕکا و قسەکەی پێبڕی: تکات لێدەکەم پاکانەی بۆ مەکە. من جگە لەوە هیچ ڕێگایەکی ترم پێشك نەدەهات. من لە رووی هەردووکتان شەرمەزارم، بەڵام پێموانییە ئەو جوابکردنە زۆریش لە دڵی گران بێت، مانەوەشی لێرە بۆ خۆم و خێزانم زۆر ناخۆشە و حەز بە چارەی ناکەین.

ـ خۆ مەسەلەی دڵهێشانی ئەو نییە. کارەکەی تۆ سووکایەتی پێکردنە. جگە لەوەش زۆر ***شوورەییە.***

ـ هەڵسوکەوتی ئەویش سووکایەتییە بە من و ئازارم دەدات. خۆ من هیچ خەتایەکم نەکردووە، من نازانم بۆ دەبێ بە هۆی ئەوەوە خۆم تووشی ئازار بکەم و حەسانەوە لە خۆم هەڵگرم.

ـ بەڵام قەت ئەو چاوەڕوانییەم لە تۆ نەبوو. ***بەناموس بوون کارێکی خراپ نییە و پیاو دەبێ بەغیرەت بێ، بەڵام هەتا ئەوڕادەیەش بەڕاستی شوورەییە.***

لەڤین بەپەلە رووی لێوەرگێڕا و بە ڕێگاکەدا داگەڕا خوارێ و لەوێ دەستیکرد بە پیاسەکردن. زۆر زوو تەقوکوتی عارەبانە پەیدابوو و لە پشت دارەکانەوە دیتی ڤاسنکا بە کڵاوە سکاتلەندییەکەیەوە لەسەر ئالفی نێو عارەبانەکە دانیشتووە و (بۆ بەدبەختی عارەبانەکە کورسیشی نەبوو.) بە هەڵبەز دابەزی عارەبانەکە بە هەموو بارێکدا رادەژێ، عارەبانەکە هاتە سەر ڕێگاکە و دوورکەوتەوە.

کاتێك پێشخزمەتەکەی لە ماڵێ دەرپەڕی و چوو عارەبانەکەی راگرت، لەڤین لە ژێر لێوەوە گوتی: بڵێی چی بووبێ؟ ـ مکانیکە ئاڵمانییەکە بوو کە بە تەواوی لە بیرکرابوو. کابرای مکانیك لە هەمبەر ڤسلۆڤسکیدا کڕنۆشێکی کرد، شتێکی پێگوت و سواری عارەبانەکە بوو و پێکەوە دوورکەوتنەوە.

ستیپان ئارکادیچ و پرێنسس بێزاریی خۆیان لەو کارەی لەڤین دەربڕی. لەڤین خۆشی نەك هەستی دەکرد کارەکەی زۆر ناحەز و ***شوورەیی*** بووە، بەڵکوو خۆشی لە هەموو بارێکەوە بە خەتابار و شەرمەزار دەزانی. بەڵام کاتێك وەبیر ئازاری خۆی و ژنەکەی دەکەوتەوە بە خۆی دەگوت ئەگەر جارێکی تریش بارودۆخێکی ئاوا بێتە پێشێ، ئەو کارە هەر دەکات.

ئەو ڕۆژە هەرچۆنێك بوو تێپەڕی و ئێوارە داهات، جگە لە پرێنسس کە لەو کارەی لەڤین خۆش نەبووبوو، هەمووان وەك منداڵ، کە تەمبێ دەکرێ، دوای بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمێکی خەماوی، شاد و بەنەشە بوون و شەوێ دوور لە چاوی پرێنسس باسی دەرکردنی ڤسلۆڤسکییان دەکرد و دەتگوت باسی ڕووداوێکی زۆر کۆن دەکەن. دالی کە گێڕانەوەی نەقلێ و قسەی خۆشی لە باوکی بەمیرات پێگەیشتبوو، بەسەرهاتەکەی بۆ جاری سێهەم و چوارەم گێڕایەوە و هەموو جارێك شتێکی پێکەنینیی پێوە دەنا. ڤارنکا لەبەر پێکەنین لەوانەبوو لەخۆ بێتەوە، دەیگوت: خۆشی خۆشی تازە چەند تەنزیل و قردێلەم لە سەر و لیباسەکانم دابوو و دەمویست بێم بۆ ژووری میوانداری و سەرنجی میوانەکە ڕاکێشم کە عارەبانە شەقوشڕەکە بە تەقوکوت لەولاوە هات. نێو عارەبانەکەش کێی تێدابوو؟ ڤاسنکا بەو کڵاوە سکاتلەندییەوە بەلەکپێچی لە لاقولەتەری توند کردبوو، دەفتەری نۆتەکانی نابووە بن باخەڵی و لەسەر ئاڵفەکە وەرکەوتبوو.

- واباش بوو بتگوتبایە لانیکەم فایتوونەکەی بۆ ئامادەبکەن. ڕاست لەوکاتەدا کە عارەبانەکە لەقلەق دووردەکەوتەوە، کەسێك هەرای کرد ڕاوەستە، ڕاوەستە! گوتم ڕەنگە پەشیمان بووبێتنەوە. ڕوانیم بزانم چیدەکەن دیتم مکانیکە قەڵەوە ئاڵمانییەکەشیان لە پاڵ ئەودا دانیشاند و هەردووکیان پێکەوە ڕۆیشتن. ئەو تەنزیل و قردێلانەی منیش خۆم پێڕازاندبوونەوە بێکەڵك مانەوە.

# شازده

داریا ئەلکساندرۆڤنا کە دەیویست بچێت بۆ لای ئانا و چاوی پێیبکەوێت بڕیارەکەی خۆی بردەسەر و چوو. نەیدەتوانی خۆی رازی بکات کە ببێتە هۆی دڵئێشانی خوشکی یان رەنجانی مێردەکەی. هەقی بە کیتی و لەڤین دەدا کە هیچ پێوەندییەکیان لەگەڵ ڤرۆنسکی نەبێ، بەڵام لەلایەکی ترەوە بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی کە بچێت بۆ سەردانی ئانا و پێیبسەلمێنێ کە گوێی لەوەنییە کۆمەڵگا چۆنی چاو لێدەکات و ئەو هەروا جێگای لە دڵیدایە و سەبارەت بە ئەو یانی (ئانا) هەستی ناگۆڕێ.

بە مەبەستی ئەوەیکە بۆ ئەو سەفەرە دڵی لەڤین و کیتی لە خۆی نەڕەنجێنێ، کەسێکی نارد بۆ نێو دێ تاکوو ئەسپ و فایتوونی بۆ بەکرێ بگرێ، بەڵام لەڤین کە لەوە ئاگاداربوو دەستیکرد بە لۆمەکردنی:

ـ بۆ پێتوایە من بۆ ئەو سەفەرەی تۆ دڵگرانم؟ وایدانێین پێمناخۆشە بچی بۆ ئەو سەفەرە، ئەگەر بە ئەسپی کرێ بچی زیاترم پێناخۆش دەبێ. تۆ جارێکت پێنەگوتم کە بڕیارت داوە بچی بۆ سەفەر. ئەگەر ئەسپ لە گوندەکە بەکرێ بگری، بەر لە هەموو شتێك من دڵم لێتدێشێ و لەوەش گرینگتر ئەوەیە کە ئەوان قەبووڵی دەکەن بەڵام ناتگەیەننە جێ. ئەسپەکانی من ئامادەن و ئەگەر ناتهەوێ زویرم بکەی دەبێ بە فایتوون و ئەسپەکانی من بچی.

داریا ئەلکساندرۆڤنا ناچار قەبووڵی کرد و لەڤین لە رۆژی دیاریکراودا چوار ئەسپی لە فایتوون کرد بۆ ژنخوشکەکەی و چوار ئەسپی تریشی لە پێشەوە نارد بۆ نیوەی رێگا تاکوو لەوێ ئامادەبن بۆ گۆڕین. ئەو ئەسپانە هیچ کام رێکوپێك و لەسەر لۆق نەبوون بەڵام دەیانتوانی لە ماوەی رۆژێکدا داریا ئەلکساندرۆڤنا بگەیەنن. بەو شێوە بۆ هێنانی مامان و گەیاندنە وێستگەی پرێنسس کە ئەویش دەیویست بڕوات، بەجارێ دەستو باڵی لەڤین دەبەسترا بەڵام پێیوابوو لە رەسمی میوانداری بەدوورە ئەگەر بهێڵێ داریا ئەلکساندرۆڤنا ئەسپی لە

خەڵکی گوندەکە بەکرێ بگرێ. جگە لەوەش دەیزانی دانی بیست ڕۆبڵ کرێی ئەو ئەسپانە ڕەنگە لە توانای دالیدا نەبێت. لەڤین و کیتی کێشە ماڵییەکانی داریا ئەلکساندرۆڤنایان بە کێشەی خۆیان دەزانی.

داریا ئەلکساندرۆڤنا لەسەر داوای لەڤین بەر لە خۆرهەڵات وەڕێ کەوت. ڕێگاکە خۆش بوو و فایتوونەکە بە نەرمی دەڕۆیشت، ئەسپەکان چالاك بوون و لەڤین بەجێی خزمەتکار نووسیارەکەی خۆی بۆ خاترجەمیی زیاتر لەگەڵ دالی نارد و لە پەنای فایتوونەوانەکە داینیشاند. داریا ئەلکساندرۆڤنا خەوی لێکەوت و کاتێك وەخەبەر هات هێندەیان نەمابوو بگەنە کاروانسەرای نیوەی ڕێگا کە دەبوو لەوێ ئەسپەکان بگۆڕن.

دالی ڕاست لە ماڵی ئەو وەرزێڕە پیرە دەوڵەمەندەی کە لەڤین لە ڕێگای ملکەکەی سێڤیاژێسکی لایدابوو، چایی خواردبۆوە و لەگەڵ ژنان سەبارەت بە منداڵەکانیان و لەگەڵ پیرەپیاوی وەرزێڕیش سەبارەت بە کۆنت ڤرۆنسکی دوابوو، کە پیرەپیاو زۆری تاریف لێکرد، سەعات دە دیسان وەڕێ کەوتەوە. لە ماڵێ بە هۆی گرفتاری و کێشەی منداڵەکانییەوە قەت دەرفەتی ئەوەی نەبوو بیر بکاتەوە. بەڵام ئێستا لە ماوەی ئەو سەفەرە چوار سەعاتەیەدا هەموو ئەو فیکر و خەیاڵانەی لە مێشکیدا پەنگیان خواردبۆوە هورووژمیان بۆ زەینی هێنابوو. بە سەرلەبەری ژیانی خۆیدا هاتەوە و لە هەموو بارێکەوە هەڵیسەنگاند و لێکیدایەوە، ئەوەش کارێك بوو کە قەتی بۆ نەلوابوو. بۆ پێداچوونەوە هەلی بۆ نەڕەخسابوو. ئەو بیر و خەیاڵانە زۆر سەیر بوون بەلایەوە. سەرەتا لە بیری منداڵەکانیدا بوو، ئەگەرچی پرێنسس و زیاتر لەویش کیتی (زیاتر هیوای بە کیتی بوو) بەڵێنیان پێدابوو کە ئاگادارییان لێبکەن، لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەتوانی خەمی نەبێت و دڵنیابێ. خەمی ئەوەی بوو دیسان ماشا هاروهاجی بکات و ئەگەر ئەسپ لەقە لە گریشا بدەن چ بکات؟ خودا بکا لیلی شتی خراپ نەخوات و دیسان تووشی زگئێشە نەبێ! پاشان مەسەلەی پێوەندیدار بە داهاتووی نزیك جێگای مەسەلەکانی ئێستایان گرتەوە. کەوتە بیری ئەوەیکە بۆ ئەم زستانە ماڵێکی تازە لە مۆسکۆ بەکرێ بگرێ، قەنەفەی ژووری میوانداری کۆن بوون و پێویستە بگۆڕدرێن و دەبێ باڵتەی تیسکن بۆ کچە گەورەکەشی بکڕێ. پاشان کێشەکانی داهاتووی دوور، زەینی بە خۆیەوە خەریك کرد. دەبێ چ بکات کە منداڵەکانی ببنە کەسێك بۆ خۆیان. بۆ کچەکان زۆر دژوار نەبوو، بەڵام کوڕەکان!

«جارێ خۆم دەرس بە گریشا دەڵێم، بەڵام ئێستا سەرم زۆر قاڵ نییە و دەتوانم. چونکە دووگیان نیم. خۆ ناکرێ هیچ چاوەڕوانییەکم لە ستیڤا هەبێ. خۆم دەبێ بە یارمەتیی کەسانی

خێرخواز گەورەیان بکەم. بەڵام ئەگەر دیسان زگم پڕبێت، چ بکەم؟») هەروەها بیری لەوەش کردەوە کە دەڵێن ژن تووك لێ کراوە و ژانی منداڵبوون سزای تاوانەکانییەتی و ئەو قسەیەش چەندە نادروستە. «ژانی منداڵبوون شتێکی ئەوتۆ نییە. ئازاری دووگیانی دژوارە.» دوایین دووگیانیی خۆی هێنایەوە بەرچاو و مەرگی دوایین منداڵی و هەروەها قسەکانی ئەو ژنە لادێیەی وەبیرهاتەوە کە لە ماڵەکەی نێو ڕێگا چاوی پێیکەوتبوو. دالی لێیپرسیبوو منداڵی هەیە یان نا، ژنە جوان و جحێڵەکەش پێکەنیبوو و وەڵامی دابۆوە:

ـ کچێکم بوو بەڵام خودا ڕزگاری کردم. جێژنی فەتیرە بەخاکمان سپارد.

داریا ئەلکساندرۆڤنا لێیپرسی: خەمی بۆ دەخۆی؟

ـ خەمی چی بخۆم؟ خەزوورم بەبێ منداڵەکەی منیش زۆری نەوە هەیە. منداڵ تەنیا هۆی دەردەسەرییە. ناهێڵێ هیچ کارێك بکەی، بەجارێ دەستو باڵت دەبەستێ.

ئەگەرچی ژنە جحێڵەکە ڕووپاك و ڕۆحسووك بوو بەڵام ئەو وەڵامە بە بڕوای دالی زۆر ناحەز و دزێو بوو. کەچی ئێستا بێ ئیختیار قسەکانی ئەو ژنەی وەبیرهاتبۆوە. قسەکانی ئەو ژنە لەگەڵ ئەوەدا تاڵ و دزێو بوون، لە هەقیقەت بەری نەبوون.

داریا ئەلکساندرۆڤنا، گەڕایەوە بۆ ژیانی خۆی و پازدە ساڵ تەمەنی ژن و مێردایەتی و لە دڵی خۆیدا گوتی: «بیری لێدەکەیتەوە، هەمووی دووگیانی، هەمووی دڵتێکەڵهاتن و بەرچاو تاریکبوون و گوێنەدان بە هەموو شتێك و لە هەمووشی گرینگتر دەموچاوی ناحەز و لەشولاری ناتەرز. هەر ئەم کیتییەی خوشکم، ئەو کیتییە جحێڵ و شۆخوشەنگە چۆن ناحەز بووە! من ئیتر هەر بۆ باسکردن نابم، کاتێك زگم پڕ دەبێ بێزت نایە تەماشام بکەی. ژانگرتنیش ئازارێکی دژوارە، ئازارێکی ترسناك، هەموو ژانەکان لەلایەك و خولەکی کۆتایی لەلایەك. دوای ئەوەش کاتێك لێدەبییەوە منداڵەبەری و شیرپێدان و شەو و شەونخوونی و ژان و ئازاری تاقەتپڕووکێن.»

داریا ئەلکساندرۆڤنا کە ژانی گژنیژەی مەمکەکانی وەبیرهاتەوە وا هەموو جارێك کاتی منداڵبوون دەقەڵەشین و دەسۆڵانەوە، مۆچڕکی پێدا هات. «پاشان نەخۆشکەوتنی منداڵەکان، کە ترسێکی هەمیشەییە، دوای ئەویش عاملاندیان، ئەو خووخدە ناحەزانەی فێری دەبن، (ماشای وەبیرهاتەوە لەنێو دار تووەدڕکەکاندا.) هەروەها دەرسخوێندیان، فێرکاریی لاتین کە ئەو هەمووە گرانە و تێگەیشتنیشی دژوار! لە هەمووشی خراپتر مەرگی منداڵەکان.» مەرگی دوایین منداڵەکەی وەبیرهاتەوە کە کوڕێکی شیرەخۆرە بوو و بە نەخۆشیی دووشاخە مردبوو،

هەرجارێك دەهاتەوە بیری كزە لە دڵی دایكانەی هەڵدەستا، هەروەها بەخاكسپاردنەكەی وەبیرهاتەوە كە ئەو تابووتە چكۆڵە پەمەییە چۆن هەمووان بەسەر ساردی چاویان لێدەكرد و كاتێك دەرگای پەمەییی تابووتەكە، كە خاچێكی زێڕكفتی بریقەدار بوو، دەیانویست لەسەر تابووتەكەی دانێن، چاوی بە جگەرگۆشەكەی كەوت لەنێویدا راكشابوو، كە نێوچاوانە چكۆڵە و رەنگپەڕیوەكەی و تاڵەمووی ناسكی سەرلاجانگی و دەمە نوقڵییەكەی دی كە بە شێوەیەكی سەیر كرابۆوە و دەتگوت برسییەتی و دەیهەوێ دەم بۆ مەمكی بێنێ، هەستی بە جەرگسووتان و تەنیا مانەوەی خۆی كرد و هەر ئەوە بوو گیانی دەرنەچوو.

ئەوانە هەموویان لەبەر چی؟ ئاكامی هەموو ئەوانە چییە؟ ئەوەیە كە من ساتێكم حەسانەوە نییە، یان دووگیانم یان شیر بە منداڵ دەدەم و هەمیشە ئاڵەتی و جینگزیم و خۆم ئازار دەكێشم و دەبمە هۆی ئازاری كەسانی دیكەش، مێردەكەم لێم وەڕەزە و بەو شێوەیە ژیانم تێدەپەڕێ و منداڵەكانم بە نامرادی و ژیانتاڵی گەورە دەبن و خراپ بار دێن و خۆشی لە خۆیان نابینن. هەر ئەمساڵ ئەگەر لەڤین و كیتی نەبووایەن و بانگهێشتنیان نەكردایەین بۆ گوندەكەیان نەماندەزانی ئەم هاوینە چۆن رابوێرین. هەڵبەت كۆسیتا و كیتی هێندە دڵیان باشە ناهێڵن هەست بە نامۆیی بكەین بەڵام ئەوە تاسەر نییە و خۆشیان منداڵیان دەبێ و ئیتر ناتوانن یارمەتیمان بدەن. هەر ئێستاش بووینەتە سەرباریان. نازانم باوكم كە دەكرێ بڵێین هیچی بۆ خۆی نەهێشتۆتەوە، بڵێی یارمەتیمان بدات؟ بەڕاستی خۆم ناتوانم منداڵەكانم بە جێیەك بگەیێنم و پێویستم بە یارمەتیی كەسوكارەكانمە و دەبێ ئەو سەرشۆڕییە تامڵ بكەم. وایدانێین نێوچاوانەكەم دەیهێنێ و ئیتر منداڵەكانم تێداناچن و من هەرچۆنێكە گەورەیان دەكەم، ئەگەر زۆر زۆر هونەر بكەم رەنگە نەهێڵم ببنە كەسانێكی لاتو لووت. ئەوەش گەورەترین چاوەڕوانیمە و بۆ گەیشتن بەو ئاكامە دەبێ ئارەق بڕێژم و ئازار بكێشم و كۆسپ و لەمپەرەكان لەسەر رێگای خۆم لابەرم!... تەواوی ژیانم بۆ گەیشتن بە ئێرە فەوتاوە.» دیسان قسەی ژنە لادێییەكەی وەبیرهاتەوە و دیسان هەستی بە بێزاری كرد. بەڵام نكوولی لێ نەدەكرا كە ئەو قسەیە هێندێكی هەقیقەتی تاڵ لەخۆ گرتبوو.

داریا ئەلكساندرۆڤنا بە مەبەستی ئەوەی خۆ لە چنگ ئەو بیر و خەیاڵە ترسناكانە دەربازبكات لە نووسیارەكەی لەڤینی پرسی كە لە پێشەوە دانیشتبوو: میخائیل! زۆرمان ماوە بگەینێ؟

ـ پێموایە لەم گوندە تێپەڕین حەوت وێرستی ترمان دەمێنێ.

فایتوونەکە بە کۆڵانێکی لێژی گوندەکەدا داگەڕا و رویشت بۆ لای پردێکی چکۆڵە. تاقمێك ژنانی گوندنشین، باقەبێنی بادراویان بە شاندا دابوو و بەسەر پردەکەدا تێدەپەڕین و دەنگی زوڵاڵ و پڕنەشەی ئاخافتنیان دەبیسترا. ژنەکان بە کونچکاوییەوە تەماشای فایتوونەکەیان دەکرد. داریا ئەلکساندرۆڤنا ئەو دەموچاوە گەش و پاکانەی دەدی کە ئاوڕیان بۆ لای دابۆوە و پێیوابوو بەو شادی و رووخۆشییەیان بە ئەو پێدەکەنن. فایتوونەکە بە پەنای ژنەکاندا تێپەڕی و لەوبەری پردەکەوە دیسان بە رێگا لێژەکەدا چووە سەرێ و کەوتەوە سەر رەوتەکەی پێشووی خۆی. داریا ئەلکساندرۆڤنا بەدەم راژان و هەڵبەزدابەزی فایتوونە کۆنەکەوە دیسان خەیاڵ هەڵیگرتەوە. «هەموو دەژین و چێژ لە ژیان وەردەگرن، منیش دەڵێی لە بەندیخانەدام و لەو دنیایە دوورم، جگە لە خەم و خەفەتیش کە خەریکە دەمفەوتێنن، هیچی تر نابینم و ئێستاش بۆ ساتێك وەخۆ هاتوومەتەوە. هەموو دەژین، هەمووان، ئەم ژنانە، ناتالیای خوشکم، کیتی و ڤارنکا و ئانا، کە دەچم بۆ سەردانی. تەنیا منم کە لە ژیان بێبەشم.

«نازانم بۆ هەمووان خوێنی ئانایان لە تەشت کردووە. ئاخر بۆ؟ یانی من لەو چاکترم؟ من مێردێکم هەیە کە خۆشمدەوێ. بەڵام ئانا مێردەکەی خۆی خۆشنەدەویست. هیچ تەخسیرێکی نەبوو. ئەو دەیهەوێ بژی. خودا وای خولقاندووین کە پێویستیمان بە ژیان هەبێ. زۆر وێدەچێ ئەگەر منیش لەجێی ئەو بووایەم هەروام بکردبایە. هەتا ئەمڕۆکە نازانم لەو رۆژە تاڵانەدا کە هات بۆلام لە مۆسکۆ، چاکم کرد بە قسەم کرد یان نا، رەنگە واباشتر بوو منیش دەست لە مێردەکەم بەردەم و ژیانێکی تازە بۆ خۆم پێکبێنم. منیش دەتوانم حەزلێکردوویی بکەم و جۆرێك بم کە بەڕاستی خۆشیان بوێم و حەزم لێبکەن. یانی ئێستام باشترە؟ مێردەکەم لای من رێزی نییە. من تەنیا پێویستیم پێیهەیە و ناچارم تامڵی بکەم. یانی بەڕاستی ئەم بارودۆخە باشترە؟ ئەو کاتە هێشتا دەمتوانی کەسێکم خۆش بوێ. هێشتا شۆخوشەنگ بووم.» داریا ئەلکساندرۆڤنا کە گەیشتە ئێرە حەزی دەکرد خۆی لە ئاوێنەیەکدا ببینێ. ئاوێنەیەکی چکۆڵە لە جانتاکەیدا بوو حەزی دەکرد دەریهێنێ. بەڵام چاوی لە پشتی فایتوونەوان و نووسیارەکەی لەڤین کرد کە کەندولەندی رێگاکە رایدەژاندن و دەترسا یەکیان ئاوڕ بداتەوە و بیبینێ، بۆیە ئاوێنەکەی دەرنەهێنا.

بەڵام بێ ئەوەی چاو لە ئاوێنەکە بکات بەخۆی گوت کە هێشتا درەنگ نەبووە و بیری لە سرگی ئیڤانۆڤیچ کردەوە کە زۆر بەڕوویەکی خۆشەوە لەگەڵی دەدوێ و تۆرۆڤتسینی وەبیرهاتەوە کە هاوڕێی ستیڤا بوو و زۆریش پیاوێکی مێهرەبان بوو، ئەو کاتەی منداڵەکانی مێکوتەیان گرتبو پێکەوە

ئاگادارییان لێکردبوون و ئەو کاتە دڵی پێدابوو. هەروەها کوڕێکی زۆر گەنج وەك مێردەکەی کە بە گاڵتە دەیگوت، بەڵام ئەو بەڕاستی لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە لە هەموو خوشکەکانی جوانترە. بەم جۆرە داریا ئەلکساندرۆڤنا ماجەرای دڵدارییەکی ئاگراویی لە خەیاڵیدا هەڵگیرساندبوو. «ئانا زۆر کارێکی باشی کرد و من قەت لۆمەی ناکەم. خۆشی بە مراد گەیشتووە و پیاوێکیشی بەختەوەر کردووە، وەك من خۆی نەفەوتاندووە و حەتمەن وەك رابردوو رووخۆش و وریا و دڵتەڕە.» بزەیەکی رەزایەت و مەکرێکی ژنانە چینی خستە سەر لێو و روومەتی داریا ئەلکساندرۆڤنا، بەتایبەت بەو هۆیەی کاتێ بیری لە ماجەرا ئەویندارییەکانی ئانا دەکردەوە، راست وێنەی ئەو ماجەرایەی لەگەڵ پیاوێکی خەیاڵی و خاوەن کەسایەتی کە دڵی پێدابوو، بۆ خۆی داڕشتبوو، ئەویش وەك ئانا لەلای مێردەکەی ددانی بە هەموو شتێکدا دەنا و دەیهێنایە بەرچاوی خۆی مێردەکەی چۆن بە بیستنی ئەو ددانپێدانانە تووشی سەرسووڕمان و شڵەژان دەبێ، بۆیە بزە دەنیشتە سەرلێوی.

لەو خەیاڵەدا بوو کە فایتوونەکە لە جادەی سەرەکی لایدا و رێگای ڤازدۆڤیژنسکۆیەی گرتەبەر.

## حەڤدە

فایتوونەوان ئەسپەکانی راگرت و چاوێکی لەلای راست کرد کە چەند گوندنشین لە جاڕە جۆیەکەدا و لەژێر سێبەری عارەبانەیەك دانیشتبوون. نووسیار سەرەتا دەیویست دابەزێ بەڵام پاشگەز بۆوە و بە شێوەیەکی ئەربابانە دەنگی هەڵبڕی و یەکێك لە گوندنشینەکانی بانگکرد. سروەیەك کە کاتی رۆیشتن فێنکی دەکردنەوە کاتێك راوەستان ئەویش ئیتر نەشنییەوە. ئەسپەکان ئەو مێش و مۆزانەیان بە زەبری توندی کلکیان دەتاراند کە بە جەستەی خووساوی ئارەقەیانەوە دەنیشتن. تەقوکوتی ماڵەغان رەقاندنەوە لە پەنای عارەبانەکەوە دەهات، بێدەنگ بوو. یەکێك لە گوندنشینەکان هەستا و هات بۆ لای فایتوونەکە.

نووسیار بە تووڕەیی گوڕاندی بەسەر کابرای گوندنشیندا کە بە پێخاوسی و بە شێنەیی بەسەر کەندولەندی رێگاکەدا دەهات: چاوی لێکە، دەڵێی نەمەییوە، ناتوانێ بە رێدا بڕوا! زووکە دەی، بجووڵێ.

پیرەپیاو کە تاڵێك کندێلەی لە قژە لوول و ئاڵۆزەکەی سەرناوچاوانی بەستبوو، پشتە کۆمەکەشی ئارەقەی کردبوو و کراسەکەی تۆخی دەنواند، هەنگاوی توند کرد و گەیشتە لای فایتوونەکە و دەستە تاوانگازە رەشهەڵگەڕاوەکەی لەسەر گێلگیرەی فایتوونەکە دانا.

لەگەڵ دووپاتکردنەوەی پرسیاری نووسیار گوتی: ڤازدۆڤیژنسکۆیە؟ ماڵی ئەرباب کۆنت؟ لەو پێچە تێپەڕین بە دەستە چەپدا بایدەنەوە و جادەکە بگرنەبەر راست دەگەنە ماڵی کۆنت. ئیشتان بە خۆیەتی؟

داریا ئەلکساندرۆڤنا کە نەیدەزانی لەلای کابرای لادێیی بە چ ناوێك پرسیاری ئانا بکات، بە دەربڕینێکی ناڕوونەوە پرسیی: ئەریٚ باوەگیان، بلێی لە ماڵیٚ بن؟

پیرەپیاو ئەم پا و ئەو پای کرد و جێگای پێی بە هەر پێنج قامکەکەیەوە لەسەر خۆڵەمرەی رێگاکە مایەوە و وەڵامی دایەوە: دەبیٚ لە ماڵیٚ بنـ دووپاتی کردەوە: بەڵیٚ، دەبیٚ لە ماڵیٚ بن. دوێشەو دیسان میوانیان هەبوو. زۆریشیان میوان هەبوو ـ دیاربوو سوێرقسەیە. ئاوڕی لەو گەنجە دایەوە کە لە ژێر عارەبانەکەوە هەرای دەکرد و گوتی: چیتدەویٚ؟ بەڵیٚ! یەکدوو کاتژمێر لەمەوبەر بەر سواری لێرەوە تێپەڕین. چوون چاو لە مەکینەی دروێنە بکەن، ئێستا دەبیٚ گەڕابێتنەوە. حەزرەتی هێژا لەکوێوە تەشریفتان هێناوە؟

فایتوونەوان کە وەسەر دەکەوتەوە تاکوو لە جێگاکەی خۆی دانیشیٚ، گوتی: ئێمە لە رێگای دوورەوە هاتووین. کەوایە گوتت نزیکە؟

ـ گوتم هەر لێرەیە. لەو پێچە تێپەڕین ـ دەیبینن ـ دەستە زبرەکەی بە گێلگێری فایتوونەکەدا هێنا.

لادێییەکی تریش کە لاوێکی لاشساغ و زەنتۆڵ بوو هاتە پێشیٚ.

پرسیی: ئێوە مەزرایەکتان پێشك نایە بیدوورینەوە؟

ـ نازانم باوەگیان.

پیرەپیاو زۆری ئیشتیا لە قسە بوو بە نابەدڵی وازی لە میوانەکان هێنا و گوتی: بە دەستە چەپەدا بایدەنەوە ماڵی ئەرباب وەدیار دەکەوێت!

فایتوونەوان وەڕیٚ کەوت بەڵام خەریکبوو بەلای چەپدا بایدەنەوە کە گوندنشینەکان هەرایان کرد: راوەستن، هۆی براله، راوەستن!

فایتوونەوان رایگرت.

کابرای گوندنشین دەنگی هەڵبڕی: خۆیان ئەوا هاتن. ئەوەتانێن. چاولێکەن، لەولاوە هاتن! ـ کە ئەوەی دەگوت ئاماژەی بە چوار کەس کرد کە سوارەبوون و دوو کەسی تریش کە سواری شارابانێك[٣٩]

---

٣٩- وشەیەکی فەڕەنسییە بە مانای عارەبانەی کورسیدار. کەرەسەیەکی ڕاگوێستنی سەرئاوەڵایە وەك عارەبانە ئەسپ ڕایدەکێشیٚ بەڵام نەك بۆ هەڵگرتنی بار، بەڵکوو کورسیی هەیە بۆ دانیشتن و زیاتر بۆ ئەو کەسانە دەبیٚ کە سواری نازانن یان نایانهەویٚ سواری بکەن.

بووبوون و بە ڕێگاکەدا تێدەپەڕین، ڤرۆنسکی و ڤسلۆڤسکی و ئانا و کەسێکی تر سواری ئەسپ بووبوون و پرێنسس ڤارڤارا و سڤیاژسکی کە لەنێو شارابانەکەدا دانیشتبوون. ئەوان بۆ سواری و رابواردن چووبوون و هەروەها بۆ دیتنی ئەو ماشێنی دروێنانەی کە تازە هێنابوویان.

کاتێك فایتوونەکە راوەستا، سوارەکان نەرمنەرم هاتنە پێشێ. ئانا لە پێش هەموویانەوە بوو و ڤسلۆڤسکی شانبە شانی دەهات. ئانا سواری ئەسپێکی رەگەز ئینگلیزیی بەهێز بووبوو کە زۆر بەرز نەبوو و یالْ و کلکیشی قولْە بوون و بە کاوەخۆ دەهاتنە پێشێ. ئانا کلاوێکی سواریی رەشی لەسەر نابوو کە قژە رەشەکانی لە ژێرییەوە هاتبووە دەرێ و شان و ملە گۆشتن و نێوقەدە باریکەکەی و قیتوقۆزییە شاهانەکەی لەسەر ئەسپ داریا ئەلکساندرۆڤنای تووشی سەرسووڕمان کرد.

یەکەم جار کە چاوی پێیکەوت سوارییەکەی ئانای بە کارێکی نەشیاو هاتە بەرچاو. داریا ئەلکساندرۆڤنا پێیوابوو سواری بۆ ژنان کارێکی سووك و جلْفانەیە و بە بڕوای ئەو لەگەلْ کەسایەتیی ئانا سازگار نییە، بەلاّم کە لە نزیکەوە دیتی لەڕێوە بەچاوی پەسندەرانەوە لێیڕوانی. جلوبەرگ و هەلْسوکەوتی سەرەڕای رازاوەیی و دلْڕفێنی ئەوەندە ساکار و لەسەرەخۆ و قوڕساخ بوو کە پێیوابوو لەوە سروشتی تر هەر نابێ.

لە شانی ئاناوە چاوی بە ڤسلۆڤسکی کەوت کە سواری ئەسپێکی بەلْەك بووبوو کە یەکێك لە ئەسپەکانی سوارەنیزام بوو، ئەسپەکە دیاربوو ماندووە و جەستەی شەلاّلْی ئارەقە بوو. ئەویش قیتو قۆز لاقە قەلْەوەکانی راست بەردابۆوە و هەر ئەو کلاّوە سکاتلەندییەی لە سەردا بوو کە قردیلە و رووبانەکانی بەدەم باوە دەشنینەوە و دیاربوو زۆر بەخۆی دەنازێ و داریا ئەلکساندرۆڤنا کە ناسییەوە نەیتوانی بەرگری لەو بزە شادمانە بکات کە نیشتە سەرلێوی. بەدوای ئەواندا ڤرۆنسکی دەهات و سواری ئەسپێکی کوێتی رەسەن بوو کە دیاربوو زۆری رمبازێن پێکراوە و هەولْی دەدا بە کێشانی هەوسارەکەی رایگرێ و ئارامی بکاتەوە.

بەدوای ئەویشدا پیاوێکی کورتە بالاّ کە جلوبەرگی سواریی لەبەردا بوو بە سواری ئەسپێکی شێ و سڤیاژسکی و پرێنسس، کە لەنێو شارابانێکی تازەدا دانیشتبوون و ئەسپێکی رەش رایدەکێشا هاتنەپێشێ.

ئانا هەر لەگەلْ چاوی بەو خاتوونەی سووچی فایتوونەکە کەوت کە خۆی کۆکردبۆوە، ناسییەوە بزەیەکی شادی نیشتە سەرلێوی و گەشایەوە. دەنگی تۆزێ بەرزکردەوە و لەسەر زینەکە لەرییەوە و ئەسپەکەی تاودا بۆ لای فایتوونەکە. گەیشتە لای فایتوونەکە بەبێ

یارمەتیی هیچ کەس بازیدا خواریێ و داوێنی کراسەکەی بەلادا کرد و بە هەڵاتن چوو بۆ لای دالی.

ـ بیرم لێدەکردەوە بەڵام نەمدەوێرا دڵنیابم. ئاخ چەندە دڵخۆشم! نازانی چەندە خۆشحاڵم! ـ قسەی دەکرد و جارجار روومەتی بە روومەتی دالییەوە دەنووساند و ماچی دەکرد. هێندێ جاریش لە خۆی دووردەخستەوە و بە پێکەنینەوە تێیدەڕوانی.

ئاوڕی بۆ لای ڤرۆنسکی دایەوە کە بە دیتنی ئەوان دابەزیبوو و دەهات بۆ لایان، گوتی: چاولێکە ئەلکسی، کێ هاتووە!

ڤرۆنسکی کڵاوە گرۆڤەرە خۆڵەمێشینەکەی لەسەری داگرت و لە دالی نزیکبۆوە.

پێکەنی و ریزی ددانە سپی و قایمەکانی وەدەر خست و گوتی: نازانی چەندە بە هاتنت خۆشحاڵین! ـ ئەو رستەیەی جۆرێك دەربڕی کە کێشێکی تایبەتی پێدابوو.

ڤاسنکا ڤسلۆڤسکی لە ئەسپەکەی دانەبەزی و کڵاوەکەی لە سەری داگرت، سڵاوی لە میوانەکە کرد و کڵاوەکەی راتەکاند بەجۆرێك کە تەنزیل و رووبانەکانی بە حەواوە دەشەکانەوە.

کاتێك شارابانەکە نزیکبۆوە ئانا لە وەڵامی روانینە پرسیاراوییەکەی دالیدا گوتی: ئەوە پرێنسس ڤارڤارایە.

داریا ئەلکساندرۆڤنا گوتی: سەیرە!ـ بێ ئیختیار شوێنەواری ناشادی دەموچاوی داگرت.

پرێنسس ڤارڤارا پووری مێردەکەی بوو و دالی لە قەدیمەوە دەیناسی و بە ژنێکی بەرێزی نەدەزانی. دەیزانی ئەم پرێنسسە لە ماوەی تەمەنیدا سەرباری خزموکەسە دەوڵەمەندەکانی بووە، بەڵام ئێستا کە لە ماڵی ڤرۆنسکی رایدەبوێری و هیچ خزمایەتییەکیشی لەگەڵی نییە بۆ ئەو لەبەر مێردەکەی جۆرێك سەرشۆڕیی پێوە بوو. ئانا رەنگ پەڕینەکەی داریا ئەلکساندرۆڤنای دیت و ناڕەحەت بوو، داوێنی کراسەکەی بەردایەوە کە پەراوێزی داوێنەکەی لە لاقی گیرا.

داریا ئەلکساندرۆڤنا چوو بۆ لای شارابانەکە و بە ساردوسڕی سڵاو و چاکوخۆشی لەگەڵ ڤارڤارا کرد. سڤیاژێسکیش دەیناسی، حاڵی لەڤین و هاوسەرە جحێڵەکەی لێپرسی و دوای ئەوەی چاوێکی خێرای لە ئەسپە ناجۆر و گێلگیری پینەداری فایتوونەکە کرد داوای لە ئانا و دالی کرد سواری شارابانەکە بن.

گوتی: ئێوە بە سواری ئەم شارابانە وەرن. ئەسپەکەم زۆر خۆشبەزە و پرێنسسیش زۆر باشی داژوێ ـ ئاماژەی بە فایتوونەکەی لەڤین کرد و گوتی: منیش بە سواری ئەو باوبۆرانە دێم.

ئانا کە نزیکبووبۆوە گوتی: نا، ئێوە هەر لەجێی خۆتان بن، فایتوونەکە بۆ ئێمە ـ دەستی خستە ژێر پیلی دالی و لەگەڵ خۆی بردی.

دالی چاوی لەو شارابانە بڕیبوو و بە دیتنی ئەو کەرەسە جوانە کە قەتی نەدیبوو، هەروەها ئەسپە جوان و رازاوەکان و ناسینی ئەو کەسانەی دەوروبەری واقی وڕمابوو. بەڵام لە هەمووی زیاتر بە دیتنی ئەو گۆڕانەی کە بە سەر ئانای ناسیاو و خۆشەویستیدا هاتبوو سەری سووڕما. هەر ژنێکی تر کە وەك دالی وردبین نەبوایە و پێشتر ئانای نەناسیبایە، بەتایبەت لەو بیر و خەیالانەش رەها بوایە کە بە رێگاوە زەینی داگرتبوو، لە روخساری ئانادا شتێکی تایبەتی نەدەدی، بەڵام دالی ئێستا بە دیتنی جوانییەکی تێپەڕ کە تەنیا لە کاتی ناسکی ئاشقبووندا روخساری ژنان دەگەشێنێتەوە ئێستا لە روخساری ئانادا دەیدی و سەری سووڕمابوو. هەموو شتێك لە روخساری ئەودا سەرنجراکێش بوو، لە وەدیارکەوتنی خەتوخاڵی گۆنا و چاڵی چەنە و کەوانەی دڵگری لێوانییەوە بگرە هەتا دەگاتە بزە شیرینەکەی کە دەتگوت خەرمانەیە بە دەوری مانگی رووییەوە، هەروەها ترووسکەی چاوانی و جوانی و توندوتۆڵی و دەنگە گەرم و نەرمەکەی و تەنانەت تووڕەیی لاوێنەرانەی کە لە وەڵامەکەیدا بوو کە بە ڤسلۆڤسکیی دایەوە، کاتێك ئیجازەی وەرگرت کە سواری ئەسپەکەی بێت و وایڕابێنێ کە بە لاقی راستەش بکەوێتە غار، دەتگوت ئانا خۆشی لەوە ئاگادارە و حەزیشی پێدەکات.

کاتێك سواری فایتوونەکە بوون لە ناکاو هەردووکیان دڵتەنگی دایگرتن. دڵتەنگی ئانا بە هۆی نیگا مانادارەکەی دالییەوە بوو، دالیش بە هۆی ئەو توانجەی سڤیاژسکی کە بە فایتوونەکەی گوتبوو «باوبۆران»، لەبەر پیس و چەپرەکبوونی لەلای ئانا هەستی بە شەرمەزاری کردبوو و بەخۆدا شکابۆوە. فیلیپی فایتوونەوان و نووسیارەکەی لەڤینیش هەر ئەو هەستەیان هەبوو. نووسیار بۆ شاردنەوەی بەخۆدا شکاندنەوەکەی، بۆ دانیشاندن و پێوەدانی دەرکی فایتوونەکە چالاکانە هەڵسوکەوتی دەکرد بەڵام فایتوونەوانەکە دەموچاوی بە یەکدا دابوو، ویستی سەر بۆ ئەو هەڤیازییە رواڵەتییە دانەنوێنێ و هەمیەت بە ئانا نەدات. چاوێکی لە ئەسپە رەشەکە کرد کە شارابانەکەی رادەکێشا و زەردەیەکی تەشەراوی هێنایە سەرلێوی و لە دڵەوە خاترجەم بوو کە ئەو شارابانە تەنیا بۆ پرۆميناژ ﴿هەڵبەت مەبەستی Promenade بوو کە وشەیەکی فەرەنسییە بە مانای گەشت و گەڕان﴾ باشە و لە کاتی گەرمادا قەت ناتوانێ یەکجێ چل وێرست رێگا ببڕێ.

ئەو گوندنشینانەی لە پەنا عارەبانەکەیان دانیشتبوون ئێستا هەستابوونە سەرپێ و بە کونچکاوی و نەشەوە چاویان لە میوانەکان دەکرد و سەبارەت بە ئەوان بیروڕای خۆیان دەردەبڕی.

ئەو پیرەپیاوەی کە قژە لوولەکەی سەر ناوچاوانی بە باقەبێنێکی کندێلە بەستبوو گوتی: چەندە خۆشحاڵ بوو. وادیارە زۆر لەمێژە یەکتریان نەدیوە.

ـ بڕوانە، مامە گوراسیم[40] ئەو ئەسپە رەشە خودا دایناوە بۆ کولۆشکێشان. لەڕێوە جیکەی لێدەچنێ.

یەکێکی تریان ڤاسنکا ڤسلۆڤسکیی نیشاندان کە لەسەر زینێکی ژنانە رۆنیشتبوو و گوتی: چاوی لێکەن، ئەوە ژنە پانتۆڵی لە پێ کردووە؟

ـ نا، پیاوە. نەتدیوە چەند گورجو گۆڵ پەڕییە سەر پشتی ئەسپەکە؟

ـ کوڕەکان، ئەمڕۆ وادیارە ناتوانین سەرخەوێك بشکێنین.

پیرەپیاو چاوێکی لە خۆر کرد و گوتی: ئەمڕۆ ئیتر باسی خەو هەر مەکەن. رۆژ درەنگە. دەستبدەنە ماڵەغانەکان با بەری لێبگرینەوە.

## هەژدە

ئانا چاوی لە دەموچاوی کز و داغی ئازار پێداچزاوی دالی دەکرد کە تەپوتۆزی رێگا هێڵی خستبووە سەر چرچولۆچەکانی و خەریکبوو دەیگوت کز بووە، وەبیریشی هاتەوە کە خۆی جوانتر بووە و چاوی دالیش ئەوەی بە ئەو دەگوت، هەناسەیەکی هەڵکێشا و دەستیکرد بە باسکردنی خۆی.

گوتی: تۆ چاو لە من دەکەی و لە دڵی خۆتدا دەڵێی ژنێك لەو بارودۆخەی مندا بێژی بەختەوەر بێت؟ جا چ بکەم؟ ددانپێدانان بەو حاڵەدا، پڕ شوورەییە" بەڵام من.... من بەختەوەرم و ئەوەش بۆ لێبوردن نابێت. وەکوو جادوو لێکراوەکان دەچم. وەکوو کەسێك کە خەونێکی هاشەوپاشە دەبینێت، خەونێك کە لە ترسانا ئازای ئەندامی وەلەرزین کەوتبێت، لە پڕیش لە خەو راچەنیبێت و بۆی دەرکەوێ هەموو ئەو شتە ترسناکانەی دیتوویەتی خەون بووە. من خەبەرم بۆتەوە. ماوەیەك ژیانم بە ترس و ئازارەوە رابوارد. ئێستاش ماوەیەکە، بەتایبەت لەوەتا هاتووین بۆ ئێرە، هەست بە بەختەوەری دەکەمـ ئانا کە ئەو قسانەی کرد بە بزەیەکی شەرمنانە و روانینێکی پرسیاراوییەوە لە دالی راما.

---

40- Guerassim

دالی به پێکەنینەوە گوتی: زۆرم پێخۆشە! ـ بەڵام دەربڕینەکەی زۆرلەوە ساردوسڕتر بوو کە دەیویست. گوتیشی: زۆرم پێخۆشە دەبینم سەرودڵخۆشی! ئەی بۆ نامەت بۆ نەدەنووسیم؟

ـ بۆ؟... چونکە نەمدەوێرا... تۆ نازانی خەڵکی بە چ چاوێك لە من دەڕوانن؟

ـ نەتدەوێرا؟ ئەگەر دەتزانی من چەندە... من لەسەر ئەو باوەڕەم کە...

داریا ئەلکساندرۆڤنا دەیویست باسی فیکر و خەیاڵەکانی ئەمڕۆی خۆی بکات بەڵام دیارنەبوو بە چ هۆیەك بە شیاوی نەزانی.

ـ لەوە گەڕێین، پاشان قسەی لێدەکەین ـ بەو مەبەستەی باسەکە بگۆڕێ ئەو سەربانە سەوز و سوورانەی پشت دار ئەقاقی و یاسە بنەوشەکانی نیشاندا و لێیپرسی: ئەو ماڵانە چین؟ ئەو هەمووە! دەڵێی شارۆچکەیە!

بەڵام ئانا وەڵامی نەدایەوە.

ـ نا، دالیگیان پێمبڵێ تۆ چۆن دەڕوانیتە ئەم بارودۆخەی من؟ چۆن بیردەکەیەوە؟

داریا ئەلکساندرۆڤنا گوتی: من پێموایە...ـ بەڵام لەوکاتەدا ڤاسنکا ڤسلۆڤسکی کە توانیبووی ئەسپەکە بە لاقی راست بخاتە غار، بەو جلوبەرگی سوارییە قوڵانەوە بە قورسی لەسەر قایشی شبرەوی زینە ژنانەکە بە پڕتاو بە پەنایاندا تێپەڕی و دەنگی هەڵێنا: جێبەجێبوو، ئانا ئارکادیۆڤنا!

ئانا تەنانەت چاویشی لێنەکرد، بەڵام داریا ئەلکساندرۆڤنا دیسان هەستی کرد ئەو باسە دوورودرێژە دەستپێکردنی لەنێو ئەو فایتوونەدا شیاو نییە. هەر بۆیە قسەکەی بە کورتی بڕییەوە و گوتی: من هیچ جۆرێك بیرناکەمەوە. من تۆم هەمیشە خۆشویستووە و لەسەر ئەو باوەڕەشم ئەگەر کەسێکت خۆشویست دەبێ ئەو جۆرەی کە هەیە خۆشت بوێ نەك ئەو جۆرەی کە پێتوایە دەبێ وابێ.

ئانا چاوی لەسەر دەستەخوشکەکەی هەڵگرت و پێلووی تێکبەزاند و (ئەوەش عادەتێك بوو کە بۆ دالی نائاشنابوو) چوو دەفیکرەوە، دەیویست بە تەواوی لە مانای ئەو قسەیەی دالی بگات. کە زانیی لێکدانەوەکەی بەپێی مەیلی خۆیەتی دیسان چاوی لە دالی بڕی و گوتی:

ـ ئەگەر تۆ تاوانێکت بووبوایە، خودا هەر لەبەر ئەو هاتنەت بۆلام و ئەو قسەیەی کە کردت لێت خۆشدەبوو.

دالی دیتی فرمێسك لە چاوی ئانادا قەتیس ماوە، بێ ئەوەی قسەیەك بکات دەستی گوشی.

دالی دوای خولەکێك بێدەنگی پرسیارەکەی خۆی دووپاتکردەوە: دەی، ئێستا پێمبڵێ، ئەو ماڵانە چین؟

ئانا وەڵامی دایەوە: ئەوانە ماڵی کرێکارانی مڵکەکە و شوێنی راهێنانی ئەسپ و یەخترمەخانە و گەورن. لێرەوە پارکە. سەرەتا ئێرە هیچی لێنەبوو، زەوییەکی وشك و رووتەن بوو. بەڵام ئەلکسی هەمووی سەرلەنوێ نۆژەن کردەوە. ئەو زۆر هۆگری ئەم مڵکە بووە و زۆری حەز لە کاروباری کشتوکاڵە و من ئەو چاوەڕوانییەم لێینەبوو، مرۆڤێکی لێزان و خاوەن مرخە. دەست بداتە هەر کارێك بە جوانترین و باشترین شێوە بەڕێوەی دێنێ. لێرە نەك هەست بە رەنج و ئازار ناکات بەڵکوو زۆر تامەزرۆیانە دڵی بە کارەکەی داوە. ئەو جۆرەی بۆم دەرکەوتووە و دەیناسم زۆر زوو دەبێتە مالیکێکی داهاتووبین و سەرکەوتوو. هەڵبەت هێندێ چکووسە، بەڵام تەنیا لە کاری وەرزێڕیدا وایە. لە جێیەك کە حیسابی دەهەزار رۆبڵ لە گۆڕێدا بێ بەبای خەیاڵیدا نایە و حسابی بۆ ناکات ـ ئانا ئەو قسانەی بە بزەیەکی شادانە و لەبزێکی ئاوێتەی مەکری ئەو ژنانەوە دەربڕی کە ئاکار و تایبەتمەندیی شاراوەی پیاوی خۆشەویستی خۆی وەسف دەکات کە تەنیا خۆی دەیبینێ: ئەو بینا گەورەیەت دیوە؟ نەخۆشخانەی تازەیە. پێموایە زیاتر لە سەدهەزار رۆبڵ هەڵدەگرێ. **فیکر و زیکری** بۆتە ئەو نەخۆشخانەیە. دەزانی چیبوو کە دەستیدا ئەو کارە؟ گوندنشینەکان داوایان لێکرد کە لەوەڕگەیەکی هەرزانتریان بە ئیجارە بداتێ، بەڵام بە هیچ جۆرێ پێملی نەدەبوو، بەڵام من لۆمەم کرد و ئاوڵناوی رژد و جەبوونم دایە پاڵی. هەڵبەت نەك هەر بۆ ئەو بابەتە بەڵکوو بە شێوەی گشتی بۆ هەموو کارێك. ئەوەبوو کاروباری ئەو نەخۆشخانەیەی دەست پێکرد، تێدەگەی؟ دەیویست پێمبسەلمێنێ کە چکووس نییە. بیناکە شتێکی زۆر مەزن و بێوێنە نییە. بەڵام هەر ئەوە بووە هۆی ئەوەی زیاترم خۆشبوێ. جا ئێستا چاوت بە ماڵەکەمان دەکەوێ. هەر ماڵە کۆنەکەی باپیرێتی و هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهێناوە.

دالی بە واقوڕمانێکی نەخوازراوەوە چاوی لە بیناکە کرد کە بەرهەیوانەکەی بە کۆڵەکەی سەرکۆڵدار رازاندبۆوە و بەو پەردە رەنگاوڕەنگانە و پیرەدارەکانی دەوروپشتییەوە سام و شکۆیەکی تایبەتی پێوە دیاربوو، گوتی: ئەك، چەندە جوانە!

ـ بەڵێ، جوانە! لە نهۆمی دووهەمی ماڵەکەوە بڕوانی دیمەنێکی زۆر جوان و بێوێنەیە.

بە فایتوونەکەوە چوونە حەوشە کە تەرکەکەی بە گوڵ و ریچکەکانی بە خیزی درشت رازابۆوە و دوو باخەوان دەوری باخچەکانیان بە بەردی کونکون دەنەخشاند. فایتوونەکە لە ژێر تاقی دەرگانەی چوونەژوورەوە راوەستا.

ئانا چاوی لە ئەسپە سوارییەکان کرد کە مەیتەرەکان خەریکبوون دەیانبردە دەرێ، گوتی: ئەوان زووتر لە ئێمە گەیشتوونەوە. ئەم ئەسپەی من زۆر جوانە، وانییە؟ من ئەوەم زۆر لە

ئەسپەکانی دیکە خۆشتر دەوێ ـ بەو دوو پێشخزمەتە جلوبەرگ رازاوەیەی گوت کە بەروپیریان هاتبوون: ئەو ئەسپە بێنە بۆ ئێرە، قەندی بدەیە، کۆنت لە کوێیە؟ ـ کە چاوی بە ڤرۆنسکی و ڤسلۆڤسکی کەوت کە بۆ پێشوازییان هاتنە دەرێ، گوتی: ئا، لێرەن.

ڤرۆنسکی رووی لە ئانا کرد و گوتی: پرێنسس دەچنە کام وەتاغ؟ـ بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بێت جارێکی تر سلاووچاکوخۆشیی لەگەڵ داریا ئەلکساندرۆڤنا کرد و ئەمجارەیان دەستی ماچکرد و گوتی: من پێموایە ژووره گەورە بانجێڵەدارەکە باشترە.

ئانا گوتی: ئا، نانا، زۆر دوورە. ژووری پالوودار باشترە. لەوێ ئێمە زیاتر دەتوانین پێکەوە بین. چاکە، با بڕۆین! ـ ئەوەی گوت و ئەو کولۆ قەندەیدا بە ئەسپەکەی کە یەکێك لە پێشخزمەتەکان هێنای بۆی.

ڤسلۆڤسکی کە لەگەڵ ڤرۆنسکی لە ماڵێ هاتبووە دەرێ ئانا بە زمانی فەرەنسی پێیگوت: ***ئێوە ئەرکی خۆتان لە بیردەچێتەوە.***

ڤسلۆڤسکی قامکەکانی کرد بە گیرفانی هێلەگەکەیدا و بە پێکەنینەوە هەر بەو زمانە وەڵامی دایەوە: ***ئیختیارت هەیە، گیرفانەکانم پڕن.***

ئانا دەستی بە دەسرەیەك سڕی کە بە لمبۆزی ئەسپە قەندخۆرەکە تەڕ بووبوو و گوتی: ***بەڵێ، زۆر درەنگ دێی***ـ رووی لە دالیش کرد و لێیپرسی: هەتا کەنگێ دەتوانی لێرە بمێنیتەوە؟ تەنیا رۆژێك؟ شتیوا هەرنابێ.

دالی گوتی: بەڵێنم داوە، بەتایبەت بە منداڵەکانم... ـ ترێق بۆوە، چونکە دەبوو جانتا و کەلووپەلەکانی داگرێت و بە هۆی ئەوەش کە دەیزانی دەموچاوی زۆر تەپوتۆزاوییە.

ـ نا، خۆشەویستەکەم، دالیگیان شتیوا هەر نابێ... چاکە، جارێ با بزانین. ئێستا با بڕۆین، با بڕۆین ـ ئەوەی گوت و دالیی برد بۆ ژوورەکەی.

ئەم ژوورە، ئەو ژوورە خۆشە نەبوو کە ڤرۆنسکی گوتبووی، بەڵکوو ژوورێك بوو کە ئانا بەو هۆیە داوای لێبوردنی لێکرد. بەڵام هەر ئەو ژوورەی کە دالی دەبوو بە هۆی سووکایەتییەوە لە خانەخوێکەی خۆشبێت ئەوەندە خاوێن و رازاوە بوو کە دالی جگە لە تەلارە گەورەکانی ئەورووپا لە هیچ کوێی تر ژووری ئاوای نەدیبوو.

ئانا تاوێك هەر بەو کراسی سوارییەوە لەلای دالی دانیشت و گوتی: دەی، خۆشەویستەکەم، نازانی چەندە خۆشحاڵم! دەی هێندێکم باسی منداڵەکان بۆ بکە. کچە جوانەکەی خۆم تانیا چۆنە؟ دەبێ ئێستا گەورە بووبێ.

داریا ئەلکساندرۆڤنا وەڵامی دایەوە: بەڵێ، زۆر گەورە بووە ـ خۆشی سەری لەو وەڵامە ساردوسڕەی سەبارەت بە منداڵەکانی سووڕما. پاشان گوتی: لە ماڵی لەڤین زۆر خۆشی رادەبوێرین.

ـ ئەگەر بمزانیبایە تۆ بە چاوی سووک لێمناڕوانی... بریا هەمووتان بهاتبایەن بۆ ئێرە ـ پاشان گوتیشی ستیڤا لە هاوڕێیانی قەدیمیی ئەلکسییە ـ کە ئەوەشی گوت سوورهەڵگەڕا.

دالی تۆزێ شڵەژا و گوتی: بەڵێ، بەڵام ئەوێش ناخۆش نییە...

ـ بەڵێ، هەڵبەت، من لەبەر خۆشحاڵی نازانم دەڵێمچی. بڕوام پێبکە خۆشەویستەکەم زۆر خۆشحاڵم بە هاتنتان ـ ئەوەی گوت و دیسان ماچی کردەوە: بەڵام تۆ هەر پێتنەگوتم سەبارەت بە من چۆن بیردەکەیتەوە. من حەزدەکەم ئەوە بزانم. من زۆرم پێخۆشە کە تۆ من لێرە راست بەو جۆرەی کە هەم دەمبینی. لە هەمووی گرینگتر ئەوەیە کە من حەز ناکەم خەڵکی پێیانوابێ دەمهەوێ شتێك بسەلمێنم. من نامهەوێ هێچشتێك بسەلمێنم. تەنیا دەمهەوێ بژیم و جگە لە خۆم ئازارم بە هیچ کەسی تر نەگات. مافی ئەوەشم هەیە. وانییە؟ ئەگەرچی ئەمە باسێکی دوورودرێژە و ئێمە دەرفەتمان دەبێ بە وردی سەبارەت بە هەموو شتێك بدوێن. من دەچم جلەکانم دەگۆڕم و یەکێك لە خزمەتکارەکانت بۆ دەنێرم.

## نۆزدە

داریا ئەلکساندرۆڤنا کە تەنیا کەوت بە چاوی کابانێك لە ژوورەکەی روانی. تەواوی ئەوانەی کاتی نزیکبوونەوە لە ماڵەکە و بە شێوەی پێدا تێپەڕین دیتبووی و هەروەها ئەوەی لەو ژوورەدا دەیدی هەمووی نیشاندەری ئەوپەڕی خۆشگوزەرانی و جوانپەرستی بوون، جۆرێ رازاوەیی و زەرقوبەرقی نوێی تایبەتی ئەورووپای دەهێنایەوە بیری کە وەسفەکەیانی تەنیا لە رۆمانە ئینگلیزییەکاندا خوێندبۆوە و قەت لە رووسیا و لە ماڵی ئاغاواتی لادێ شتی ئەوتۆی نەدیبوو. هەموو کەلوپەلەکان نوێ بوون، لە دیوارپۆشە فەڕەنسییەکانەوە بگرە هەتا دەگاتە مافوورەکانی ژێرپێی کە تەرکی ژوورەکەی بە تەواوی داپۆشیبوو. چرپا فەنەردارەکەی دۆشەکیشی لەسەر بوو، لاجامەی ئەمسەرەوسەری چرپاکە زۆر جوان و گلیل بوون. بالیفەکانیشی بەرگەکەیان هەورێشمین

بوو. ئاودەستی مەڕمەڕی و مێزی ئاڕایشت و قەنەفە و مێز و کاتژمێری برنجی سەر سۆبا و پەردە و سەرپەردەکانی هەموویان گرانبایی و نوێ بوون.

خزمەتکارێکی تایبەتی تەرپۆش کە ئاڕایشتی بسك و جلوبەرگی زۆر زیاتر لە هی دالی لەگەڵ دابی رۆژ دەیخوێندەوە و لەگەڵ هەموو شتەکانی نێو ژوورەکە سازگار بوو، هاتەژوورێ و بۆ خزمەتکردن دەستەونەزەر راوەستا.

داریا ئەلکساندرۆڤنا زۆری خاوێنی و ئەدەب و ئامادەبەخزمەتیی ئەو کچەی بەدڵ بوو، بەڵام وەکوو سەربارێك هاتە بەرچاوی. زۆر بەخۆدا شکایەوە کە دیتی بەجێی چاکەتێکی ساغ بە هەڵە چاکەتێکی پینەکراوی لەگەڵ خۆی هێنابوو. ئەو پینە و چنینەوانەی کە لە ماڵی خۆیان بە هۆی جوانی و رێکوپێکییانەوە بە خۆی دەنازی، لێرە هۆی شەرمەزاریی بوون. کە لە ماڵێ بوو لێبڕوون بوو بۆ دووریتی شەش چاکەت بیست و چوار ئارشین پارچەی پێویستە و هەر ئارشینەی نرخەکەی شەستو پێنج کاپکە، هەر ئەوەش ئەگەر، پێداویستییەکانی تر لەبەرچاو گرین، خۆی لە پازدە رۆبڵ تێدەپەڕێ. ئەویش بەو پینەکردن و چنینەوە جوان و رێکوپێکەی خۆی پازدە رۆبڵی بۆ بنەماڵەکەیان دەگێڕایەوە. بەو هۆیەوە لەلای ئەو خزمەتکارە هەستی بە شەرمەزاری نەدەکرد بەڵام هێندێ دڵگران بوو.

کاتێك ئانووشکا هاتەژوورەکەی کە لەمێژ بوو دەیناسی داریا ئەلکساندرۆڤنا هەستی بە ئۆخژن کرد. ئانا کڵفەتە تەرپۆشەکەی بانگکردبوو و ئانووشکا لەلای داریا ئەلکساندرۆڤنا مایەوە.

دیاربوو ئانووشکا زۆر بە هاتنی دالی دڵشادە و بەردەوام قسەی دەکرد. دالی بۆیدەرکەوت کە ئانووشکا دەیهەوێ بیروڕای خۆی لەمەڕ بارودۆخی تایبەتی خاتوونەکەی و بەتایبەت سەبارەت بە رادەی فیداکاری و خۆشەویستیی کۆنت بۆ ئانا ئارکادیۆڤنا دەربڕێت، بەڵام دالی هەموو جارێك کە دەهات خۆ لەو دارەتە بدات بە شێوەیەك قسەکەی پێدەبڕی یان باسەکەی دەگۆڕی.

ـ من لەگەڵ ئانا ئارکادیۆڤنا گەورە بووم و ئەو بۆ من لە هەموو کەس خۆشەویستترە. ئێمە داوەریمان پێناکرێ، بەڵام وادیارە ئەرباب ئەوەندە ئەوینداری...

داریا ئەلکساندرۆڤنا قسەکەی پێبڕی: باشە، ئەگەر دەکرێ ئەوانەیان پێبدە با بیشۆن.

ـ بەچاوان، جلشۆرخانەکەی ئێمە دوو کەسی لێیە کە ئەرکی شۆردنیان لە ئەستۆیە. مەلافەکان بە ماشێنی جلشۆری دەشۆن. کۆنت خۆی بە هەموو کارەکان رادەگا. نازانی چ مێردێکی...

دالی زۆری پێخۆش بوو کە ئاخری ئانا هات و کۆتاییی بە زۆربڵەییی ئانوشکا هێنا.
ئانا جلوبەرگی گۆڕیبوو و کراسێکی زۆر سادە و ناسکی لەبەرکردبوو. دالی بە وردی چاوی لە کراسە سادەکەی کرد. دەیزانی ئەو کراسە سادەیە بە چ نرخێك کڕدراوە و سادەییەکەی یانی چی.

ئانا ئاماژەی بە ئانووشکا کرد و گوتی: ئاشنای قەدیمە، وانییە؟

ئەو شڵەژانەی تاوێك لەمەوبەری ئانا ئاسەواری نەمابوو. ئانا بە تەواوی هەستی بە ئازادی و ئاسوودەیی دەکرد. دالی دەیدی کە ئەو ئێستا بە تەواوی بەسەر ئەو شێواوییەی خۆیدا زاڵ بووە کە بە هۆی هاتنی ئەوەوە هەستی داگرتبوو، رواڵەتی جۆرێك بوو کە دەتگوت دەرگای ئەو ئۆدەیەی لێداخراوە کە شوێنی هەست و ئەندێشە نهێنییەکانی بوو.

دالی لێیپرسی: دەی، ئانا، کچەکەت چۆنە؟

ـ ئانی؟ (کچەی ناو نابوو ئانی.) چاکە. زۆر چاکتر بووە. حەزدەکەی بیبینی؟ وەرە با بچین نیشانت بدەمـ دەستیکرد بە تاریفکردنی: نازانی لەگەڵ دایەن و پەرستارەکان چۆن تووشی دەردەسەری بووم! سەرەتا ئەو دایەنەی شیری دەدایە ئیتالی بوو، ژنێکی باش بوو بەڵام زۆر حەپۆل و ساویلکە بوو. دەمانویست جوابی بکەین بەڵام کچە وەهای خوو پێگرتبوو کە هێشتاش هەر رامانگرتووە.

دالی لێیپرسی: ئەی ئاخری کارەکەتان بەکوێ گەیاند؟... ـ مەبەستیشی ئەوەبوو کە کچە ناوی چی دەبێت. بەڵام کە دیتی ئانا نێوچاوانی تێکناوە روونی کردەوە کە: مەبەستم ئەوەیە چۆنتان لە شیر بڕییەوە؟ ئێستاش هەر شیری دەداتێ.

بەڵام ئانا تێنەگەیشت.

ـ تۆ مەبەستت ئەوەنەبوو، مەبەستت ئەوەبوو کە بە ناوی کامیانە؟ وانییە؟ ئەو بابەتە ئەلکسی زۆر ئازار دەدات. هێشتا ناوێکی نییە. یانی کارنینایە ـ کە ئەوەی گوت پێلووەکانی تێکبەزاند، بەجۆرێك کە تەنیا مژۆڵە تێکپەڕیوەکانی دیاربوون. بەڵام لە ناکاو رەنگ و رووی کرایەوە و گوتی: هەڵبەت لەو بارەوە دوایی بە وردی دەدوێین. وەرە با بچین نیشانت بدەم. زۆر رووخوش و خرپنە. فێری گاگۆڵکە بووە.

ئەو زەرقو بەرق و رازاوەییەی لە تەواوی ماڵەکەدا بوو تووشی سەرسووڕمانی کرد بەڵام کە ژووری منداڵەکەی دی بەجارێ عەبەسرا. چەند فایتوونی منداڵانەی جوان کە رایانسپاردبوو و لە ئینگلستانەوە بۆیان هێنابوون، چەند جۆر کەرەسە و رەوڕەوە بۆ دارەدارەکردن، قەنەفەیەکی گەورە

کە وەکوو مێزی بیلیارد دروست کرابوو و دەورەکەی لاجامە بوو بۆ ئەوەی منداڵەکە گاگۆڵکێی لەسەر بکات، کورسیلەی لانکەیی و ڤانی تایبەتی مەلەکردن هەموویان تازە و بریقەدار بوون. ئەوانە هەمووی دەستکاری ئینگلستان بوون و زۆریش قایم وماڵیچاك و گرانبایی بوون. ئەو ژوورە زۆر گەورە بوو، میچەکەشی بەرزبوو و تاو تێیدەکرد.

کە چوونە ژووری، کچە بە تویی کراسێك لەسەر کورسیلەیەکی چکۆڵە و لە پشت مێزێك دانیشتبوو سووپی دەخوارد و هەموو سینگ و بەرۆکی خۆی لە سووپ نابوو. کلفەتی رووسی کە کاروباری ژووری منداڵەکەی لە ئەستۆ بوو خەریکبوو خۆراکی دەدا بە منداڵەکە و خۆشی لەگەڵی دەخوارد. نە دایەنەکەی لەوێ بوو نە پەرستارەکەی. ئەوان لە ژوورەکەی تەنیشت بوون و بە زمانی فەڕەنسی قسەیان دەکرد، واشیان سەروپێی ئەو زمانە دەشکاند کە خۆیان نەبێ کەس نەیدەزانی دەڵێنچی.

بە بیستنی دەنگی دالی ژنێکی باڵابەرز و تەڕپۆشی ئینگلیزی کە دەموچاوێکی ناحەز و رەنگوڕوویەکی ناپاکی هەبوو بە هەڵەداوان خۆیکرد بە ژووریدا، لەگەڵ بزواندنی قژە زەردەکەی خۆی دەستیکرد بە پاکانە و خۆپەڕاندنەوە، ئەگەرچی ئانا بە هیچشێویەك سەرکۆنەی نەکردبوو، لەگەڵ هەر وشەیەکی ئانا، ژنە چەند جار خێرا خێرا دەیگوت: Yes my lady.

کچە قژڕەش و کاڵوکرچ و چاو و برۆ رەش، سپیکەڵانە و تۆزێ دەموچاو شلێ بوو. لەگەڵ ئەوەی بە توندی چاوی لە دایکی و ئەو ژنە نەناسیاوە واتە دالی دەکرد، بە زەردە گرتن و خۆشیرین کردن سەرنجی داریا ئەلکساندرۆڤنای وەها راکێشا کە ئێرەیی بە جوانی و لەشساغییەکەی برد. دالی زۆری گاگوڵکە کردنەکەی پێجوان بوو. هیچ کام لە منداڵەکانی خۆی ئاوا گاگۆڵکێیان نەکردبوو. کاتێك لەسەر فەرشەکە دایاننا و کراسەکەیان بۆ رێکوپێك کرد بەڕاستی شیرین و لەبەردڵان بوو. بەو چاوە رەش و گەشانەی وەك گیانلەبەرێکی وردیلە چاوی بە گەورەکاندا دەگێڕا و دیاربوو زۆری پێخۆشە کە ئاوا بە چاوی پەسندەرانەوە سەیری دەکەن. پێدەکەنی و بە زۆر نێوقەدە خەپەتۆڵەکەی هەڵدێنا و دەستە چکۆڵە و خرپنەکانی دادەنا، هێزی دەدا سەریان و لاقی بە دوای خۆیدا رادەکێشا و دیسان دەستی دەگوێستەوە و لەسەر چۆك و لەپی دەستی دەڕۆیشت.

بەڵام داریا ئەلکساندرۆڤنا کەشی ژوورەکە و بەتایبەت پەرستارە ئینگلیزییەکەی نەکەوتە بەردڵ. بە بڕوای ئەو ژنێکی وریا و مرۆڤناسی وەك ئانا کە توانیبووی ژنێکی خوێنتاڵ و ناباری وەك ئەم ئینگلیزییە بگرێ بۆ پەرستاریی کچەکەی نیشاندەری ئەوەیە کە لە بنەماڵەیەکی ئاوا بێسەرەوبەرەدا

قەت وێناچێ کاروبارەکان بە باشی بەڕێوەبچن. جگە لەوەش داریا ئەلکساندرۆڤنا لەڕێوە بە قسەکانی ئانادا زانیی کە ئەو لەگەڵ دایەن و پەرستاری کچەکەی ناژی و دیداری ئەمڕۆی ڕووداوێکی نائاسایی دێتە ئەژمار. ئانا دەیویست لەیستۆکێك بدات بە کچەکەی بەڵام هەرچی گەڕا نەیدۆزییەوە.

لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو کاتێك دالی لێیپرسی منداڵەکە چەند ددانی هاتووە، ئانا نەیتوانی وەڵامی دروستی بداتەوە و خەبەری نەبوو کچەکەی جگە لەو چوار ددانەی پێشەوەی دوو ددانی دیکەشی هاتووە.

ئانا داوێنی درێژی کراسەکەی هەڵکرد بۆ ئەوەی لەو لەیستۆکانەی بەر دەرگاکە نەگیرێ و لەگەڵ هاتنە دەرێ لە ژوورەکە گوتی: من لەو ژوورەدا دەڵێی غەریبەم و تاملکردنی ئەو بارودۆخەم زۆر بەلاوە دژوارە. لەگەڵ نۆبەرەکەم وانەبووم.

دالی شەرمنانە گوتی: من بە پێچەوانەی ئەوەم بیردەکردەوە.

ئانا وەك ئەوەی لە شتێکی دوور ورد بێتەوە پێلووی تێکبەزاند و گوتی: ئەیەرۆ، وامەڵێ! دەزانی، من سریۆژام دەدی. ئەگەرچی، با ئەو باسە دانێین بۆ دوایی. تۆ نازانی، من وەك برسییەك وام کە لە ناکاو سفرەیەکی ڕەنگین لەبەر دەمی خۆی دەبینێ و نازانێ لە کامیان بخوات. ئێستا ئەو سفرە ڕەنگینەی من تۆی و زۆریشم قسە لە دڵدایە و کەسم نییە تاکوو پرێسکەی دڵمی لەلا بکەمەوە و نازانم چۆن دەست پێبکەم. ***بەڵام هەتا هەموو دەردەدڵەکانی خۆمت بۆ هەڵنەڕێژم دەستت لە کۆڵ ناکەمەوە.*** دەبێ ئەوەی لە دڵمدایە پێتیبڵێم. سەرەتا دەبێ تەواوی ئەو کەسانەت پێبناسێنم کە لێرەن. لە پێشدا ژنەکان. پرێنسس ڤارڤارا. تۆ ئەو دەناسی. دەزانم تۆ و ستیڤا چۆن چاوی لێدەکەن. ستیڤا دەڵێ ئەو لە ژیاندا هیچ ئامانجێکی نییە جگە لەوەی گەورەیی خۆی بە پوورە کاترینا پاولۆڤنا بسەلمێنێ. ئەوە وایە. بەڵام ئەوانە بەجێی خۆی زۆر ژنێکی باشە و من زۆر منەتباری ئەوم. ئەوسەردەمەی لە پترزبۆرگ بووم زۆرم پێویستی بە دەستەخوشکێك هەبوو. هەر ئەو کاتە بوو ئەو هات بۆلام. بەڵام بەڕاستی ژنێکی مێهرەبانە و ئەو بارەی کە بارودۆخە تایبەتەکەم ناویەتە سەرشانم زۆری بۆ سووك کردووم. دەزانم تۆ لەو دژواری و بارودۆخە تاڵەی ئێستای من ناگەی ـ گتێکی گرت و پاشان گوتی: هەڵبەت ئەم قسانە هی ئەو کاتەن وا لە پترزبۆرگ بووین. لێرە زۆر ئارام و بەختەوەرم. بەڵام، با ئەو قسانە هەڵگرین بۆ دوایی. با درێژە بە ناساندنی میوانەکان بدەم. دوای پرێنسس نۆرەی سڤیاژسکییە. ئەو نەجیمزادەیە و مرۆڤێکی زۆر بەڕێز و خاوەن کەسایەتییە... بەڵام پێویستی بە ئەلکسییە و شتێکی لێیدەوێ. دەزانی لەوەتا لێرەین و بووینەتە دانیشتووی گوند، ئەلکسی بەو ماڵ و سامانەی هەیەتی زۆری کار لەدەست دێ و لە زۆر جێگایان دەستی دەڕوا. پاشان تۆشکڤیچ. تۆ ئەوت دیتووە. ئەو لەگەڵ بێتسی بوو. بەڵام بێتسی

وازی لێهێنا و ئێستا هاتووە بۆ ئێرە. ئەو ئەلکسی گوتەنی لەو مرۆڤانەیە کە ئەگەر بەو شێوەی خۆیان دەنوێنن چاویان لێبکەین زۆر رۆحسووك و لە دڵەوە نزیکن. جگە لەوەش بە دەردی پرێنسس ڤارڤارا دەڵێ لاوێکی هێژا و لەلای خەڵك خۆشەویستە. دوای ئەویش ڤسلۆڤسکی... خۆ ئەو دەناسی ـ لێرەدا سێبەری نازو مەکرێك نیشتە سەرلێوی و درێژەی بە قسەکانیدا: کوڕێکی زۆر شیرینە. ئەوە چ کارێك بوو لەڤین لەگەڵی کرد؟ ڤسلۆڤسکی هەمووی بۆ ئەلکسی گێڕایەوە. بەڵام ئێمە باوەڕ ناکەین ـ پاشان هەر بەو زەردەخەنە بەمەکرانەیەوە گوتیشی: ***کوڕێکی زۆر مێهرەبان و ساویلکەیە.*** پیاوان پێویسیان بەو جۆرە رابواردنانە هەیە و ئەلکسی هەمیشە پێی خۆشە تاقمێك لە دەوروبەری بن. هەر بەو هۆیە ئەو میوانانە هەموویان بۆ من خۆشەویستن. ماڵەکەی ئێمە دەبێ هەمیشە پڕ لە شادی و سەفا بێت دەنا ئەلکسی هەوای شتی تازە لەسەری دەدات. جگە لەو کەسانە ئاریکارێکی ئەڵمانیش لێرەیە و مرۆڤێکی یەجگار باشە و زۆر بەسەر کارەکەی خۆیدا زاڵە. ئەلکسی قەدری باش دەزانێ. دوکتۆرێکیش لێرەیە، ناکرێ بڵێین تەواو نێهێلیستە بەڵام خواردن بە کارد و چەتاڵ دەخوات. (یانیها جیاوازە) دوکتۆرێکی باشیشە. دوای ئەویش وەستایەکی بیناساز... وەلحاسڵ دەکرێ بڵێین دەربارێکی چکۆڵەمان پێکهێناوە.

## بیست

ئانا لەگەڵ داریا ئەلکساندرۆڤنا چوونە بەرهەیوانێکی بەردینی گەورە کە پرێنسس ڤارڤارا لە سووچێك و لەبەر سێبەرەکە، کەلوپەلی گوڵدۆزیی لەبەر دەمی خۆی دانابوو و دانیشتبوو، خەریکی گوڵدۆزیکردنی رووبەرگی کورسییەك بوو بۆ ئەلکسی کیریلۆڤیچ، ئانا گوتی: فەرموو، پرێنسس، ئەمەش دالی کە ئەو هەمووە بە ئاواتەوە بووی بیبینی. ئەو دەڵێ هەتا کاتی فراوێن هیچ ناخوات، بەڵام ئێوە دەستوور بدەن بەڵکوو بۆ بەرکوڵ شتێك ئامادەبکەن، من دەچم ئەلکسی و ئەوان دەبینمەوە و دەیانهێنم بۆ ئێرە.

پرێنسس ڤارڤارا بە روویەکی خۆش و هێندێ خۆگرتنەوە پێشوازیی لە دالی کرد و لەڕێوە دەستیکرد بە روونکردنەوە کە ئەو تەنیا بەو هۆیە هاتووە بۆ لای ئانا، چونکە هەمیشە ئەوی لە خوشکی، واتە کاترینا پاولۆڤنا، هەر ئەو کەسەی کە ئانای گەورە کردبوو، خۆشتر ویستووە و ئێستا کە هەمووان روویان لێوەرگێڕاوە، بە ئەرکی خۆی دەزانێ کە لەو بارودۆخە تاڵ و دژوارەدا کە زۆر تاقەتپڕووکێنە یارمەتیی بدات.

ـ هەر تەڵاق وەرگری من دیسان دەگەڕێمەوە بۆ قوژبنی تەنیاییی خۆم و بە تەنیا ژیان رادەبوێرم. بەڵام ئێستا کە دەتوانم کەڵکێکم هەبێ، بە پێچەوانەی خەڵکی، ئەرکی خۆم با بەلامەوە گرانیش بێت، بەڕێوەی دەبەم. تۆش خۆشەویستەکەم، زۆر کارێکی باشت کرد هاتی. ئەوان وەك ژن و مێردێکی زۆر مێهرەبان و سەرو دڵخۆش پێکەوە رایدەبوێرن و داوەری باش یان خراپبوونی کارەکەیان پێوەندیی بە ئێمەوە نییە و خودا دەزانێ. مەگین بیریووزۆڤسکی[41] و ئاڤنییڤا[42]... هەروەها نیکاندرۆڤ[43] یان ڤاسیلییۆڤ[44] و مامۆنۆڤا[45] و لیزا نیپتۆنۆڤاش[46] ئەو کارەیان نەکرد؟ مەگین خەڵکی پاشملە باسی ئەوانیشیان نەدەکرد؟ بەڵام ئاخری هەموویان وەرگیرانەوە و گەڕانەوە شوێنە تایبەتەکانی خۆیان لە کۆمەڵگادا. جگە لەوەش ***چاو لە دەم و دەزگاکانیان بکە، چەندە جوان و پەسند و جێگای رێزن. راست دەڵێی لە لەندەنی. بەیانی هەموو بۆ breakfast کۆدەبنەوە و پاشان هەرکەسەی بە دوای کاری خۆیدا دەڕوات***. هەموویان هەتا کاتی فراوێن هەرکارێکیان پێخۆش بێ دەیکەن. کاتی فراوێن سەعات حەوتی دوانیوەڕۆیە. ستیڤا زۆر کارێکی باشی کرد تۆی نارد. نابێ پێوەندیی خۆی لەگەڵ ئەوانە بپسێنێ. دەزانی ڤرۆنسکی لە رێگای دایکی و براکەیەوە هەموو کارێکی پێدەکرێ. جگە لەوەش هەموو خەریکی خێر و چاکەکارین. باسی ئەو نەخۆشخانەی بۆ نەکردی کە خەریکە دروستی دەکات؟ ***شتێکی بێوێنەیە***. هەموو پێداویستییەکانی لە پاریسەوە دێ.

بە هاتنەوەی ئانا کە پیاوەکانی لە ژووری بیلیارد دۆزیبۆوە و لەگەڵ خۆی هێنابوونی بۆ بەرهەیوانەکە ناچاربوون قسەکەیان ببڕن. هێشتا زۆری مابوو بۆ خواردنی فراوێن و هەواکەشی زۆر خۆش بوو، بۆ رابواردنی ئەو ماوەیە پێشنیاری جۆراوجۆریان کرد کە هیچ کام لەگەڵ دابونەریتی باوی پاکرۆسکۆیە یەکی نەدەگرتەوە.

ڤسلۆڤسکی بە زەردەخەنەیەکی جوانەوە و بە زمانی فەرەنسی پێشنیاری کرد: ***لەسەر چیمەنەکە دەستێك یاریی تنیس بکەین***. ئانا ئارکادیۆڤنا من و تۆ دیسان دەبینە دەستەییەك.

---

41- Biriouzovsky
42- Aveniyva
43- Nikandrov
44- Vassiliev
45- Mamonova
46- Neptounova

ڤرۆنسکی گوتی: نا، هەواکەی بۆ تنیس نابێ زۆر گەرمە. واچاکە لەنێو باخەکەدا پیاسە بکەین، پاشان بە گەمیە بچین بۆ گەڕان و رۆخی چۆمەکە نیشان داریا ئەلکساندرۆڤنا بدەین.

سڤیاژسکی گوتی: من لەگەڵ هەموو کارێك لێکم.

ئانا گوتی: من پێموایە دالی پیاسەکردنی نێو باخەکە و پاشان گەمیەسوراییی لە هەموو شتێك پێخۆشترە.

بڕیارەکەیان هاتە سەرئەوەی ڤسلۆڤسکی و تۆشکڤیچ بچن بۆ دیوی جلان لە کەناری چۆمەکە و گەمیەکە ئامادەبکەن و چاوەڕوانی ئەوانی دیکەش بن.

ئەوانی دیکەش چوار کەس بوون و دوو دوو بە تولەڕێی نێو باخەکەدا کەوتنە رێ. ئانا لەگەڵ سڤیاژسکی و دالی لەگەڵ ڤرۆنسکی. دالی لەو شوێنە تازەیە کە زۆر نامۆ بووبۆی هەستی بە دڵگرانی کرد. لە زەینی خۆیدا و بە شێوەی بەڵگە هێنانەوە ئەو کارەی ئانای نەك پێ خراپ نەبوو بەڵکوو پەسندیشی دەکرد. لەسەر یەك ئەویش وەك زۆربەی ئەو ژنانەی کە ناتوانی رەخنە لە ئاکاریان بگری و لە یەکهاوی بوون و بێڕەنگیی ژیانی پاك و بێدڵۆ وەڕەز بوون و لە دوورەوە نەك ئەشقی رموودە بوو بە تاوان بە شتێکی خراپ نازانن بەڵکوو ئاواتیشی بۆ دەخوازن. بێجگە لەوەش ئانای لە دڵەوە خۆش دەویست. بەڵام لە کردەوەدا، کە ئەوی لەنێو ئەو مرۆڤە غەوارە و نامۆیانەدا دەدی کە بەو لەبز و هەڵسوکەوتە بەئەدەبانەیەی ئەمڕۆیان، کە شتێکی تازە بوو بەلایەوە، نەیدەتوانی ئاسوودە بێ. لە هەموویان ناخوشتر ئاکاری پرێنسس ڤارڤارا بوو کە تەنیا لەبەرئەوەی شوێن و کەرەستە و بژیوی ژیانیان بۆ دابینکردبوو، تاوانەکەیانی بە کارێکی رەوا دەزانی.

لەسەریەك دالی ئاکاری ئانای لە زەینی خۆیدا پەسند دەکرد. بەڵام دیتنی پیاوێك کە ئەو ئاکارە نەگونجاو و نائاساییە بە هۆی ئەوەوە رووی دابوو زۆری دڵگران دەکرد و حەزی بە چارەی نەدەکرد. جگە لەوەش ئەو قەتی ڤرۆنسکی نەکەوتبووە بەردڵ. بە پیاوێکی قۆڕەدەماخ و لووتبەرزی دەزانی و جگە لە ماڵ و سامانی زۆر هیچ شتێکی تری لەودا نەدەدی کە خۆی پێوە رانێ. بەڵام لێرە، لە ماڵەکەی خۆی، نەخوازراوانە شکۆمەندتر لە پێشووی دەنواند و زیاتر شوێنی لەسەر هەستی دانابوو، بۆیە نەیدەتوانی لەگەڵ ئەودا هەست بە ئازادی و ئاسوودەیی بکات. لەلای ئەو راست ئەو هەستەی بوو کە لەگەڵ ژنە خزمەتکارەکە هەیبوو کاتێك چاکەتە پینەکراوەکەی دی. لەلای ژنە خزمەتکارەکەش بە هۆی ئەو پینانەوە شەرمی نەکرد بەڵام ئاسوودەش نەبوو.

دالی هەستی بە بێئۆقرەیی دەکرد و لەوە دەگەڕا بابەتێك بدۆزێتەوە بۆ قسەکردن. هەرچەند دەیزانی بۆ پیاوێکی لەخۆبایی و بەدەماری وەك ڤرۆنسکی تاریفکردنی شکۆی ماڵ و جوانیی باخەکەی وێناچێ شتێکی خوش بێ، بەڵام نەیتوانی جگە لەوە بابەتێکی تر بدۆزێتەوە، بۆیە ناچاربوو بڵێ زۆری ماڵەکەی پێخۆشە.

ڤرۆنسکی گوتی: باڵەخانەیەکی زۆر جوانە بە شێوازی باشی قەدیم.

ـ من زۆرم حەوشەی بەربیلاکە کەوتۆتە بەردڵ.

ـ هاە ـ جا ئەوە سەر لە بەهارێ بتدیبایە دەتگوت چی ـ کە ئەوەی دەگوت لە خۆشیانا گەشابۆوە.

سەرەتا بە پارێزەوە و پاشان زۆر بە تامەزرۆییەوە سەرنجی دالیی بۆ لای وردەکاری و جوانییەکانی ماڵەکەی و رازاندنەوەی باخەکە راکێشا. دیاربوو چونکە بۆ نۆژەن کردنەوە و رازاندنەوەی ماڵ و باخەکە خۆی زۆری زەحمەت کێشاوە حەزی دەکرد لەلای میوانەکەی بەخۆی بنازێ و زۆری ئەو تاریفانەی داریا ئەلکساندرۆڤنا پێخۆش بوو.

ـ ئەگەر ماندوو نییت و حەزت لێیە با چاوێکیش لە نەخۆشخانەکە بکەین، ئەوەتا نزیکە لێرەوە ـ کە ئەوەی گوت چاوی لە روخساری دالی کرد تاکوو دڵنیابێ ئەو سەردانەی پێناخۆش نییە.

ڕووی لە ئانا کرد و پرسیی: ئانا، تۆش دێی؟

ئانا چاوێکی لە شۆڤیاژێسکی کرد و گوتی: حەزدەکەی بچین؟ ـ بە زمانی فەڕەنسی گوتی: ***بەڵام جوان نییە ئەو بێچارانە ڤسلۆڤسکی و تۆشکڤیچ لەنێو گەمیەکە چاوەڕوان راگرین. بێتاقەت دەبن.*** دەبێ بنێرین ئاگاداریان بکەنەوە ـ رووی لە دالی کرد و هەر بەو بزە زیرەکانەیەوە کە وەك پێشوو ئەو کاتەی باسی نەخۆشخانەکەی دەکرد پڕبوو لە راز گوتی: بەڵێ، ئەوە جۆرێك یادمانە کە لە پاش خۆی بەجێی دێڵێ.

سڤیاژسکی گوتی: بەڵێ، دروستکردنی ئەو نەخۆشخانەیە کارێکی بێوێنەیە ـ بەڵام بۆ ئەوەی قسەکەی رەنگی مەرایی بەخۆوە نەگرێ لەڕێوە رەخنەیەکی لە کارەکەی گرت و گوتی: بەڵام کۆنت، من پێمسەیرە چۆنە ئەو هەنگاوە گەورەیەت لە بواری لەشساخی و پاکژیدا هەڵێناوەتەوە، ئەی بۆ ئاوڕێك لە دروستکردنی قوتابخانە نادەیتەوە؟

ڤرۆنسکی بە زمانی فەڕەنسی وەڵامی دایەوە: ***هێندەیان قوتابخانە دروست کردووە، ئیتر بێتام بووە.*** هەڵبەت ئێوە لە مەبەستەکەی من تێدەگەن، هۆیەکەی ئەوە نییە. بەڵام لەم

بوارەدا هاتمە سەر ئەوەی کارێك بکەم ـ توولە ڕێیەك کە لە شەقامی باخەکە جیا دەبۆوە نیشانی داریا ئەلکساندرۆڤنایدا و گوتی: لێرەوە دەگەینە لای نەخۆشخانەکە.

ژنەکان بۆ ئەوەی خۆر لێیان نەدا چەترەکانیان هەڵدا و بە توولە ڕێکەدا کەوتنەڕێ. داریا ئەلکساندرۆڤنا دوای تێپەڕین لە چەند پێچوپلۆوچ کە لە دەروازەیەکی گەورەی نەردەیی چوونە دەرێ و لە هەمبەر خۆیاندا، زەوییەکی بەرینی دی کە بینایەکی گەورە و سووری لێدروست کرابوو و لە حاڵی تەواوبووندا بوو، پلانەکەشی بە شێوەیەکی پێچەڵاوپووچ داڕێژرابوو. بریقەی شیروانییەکانی کە هێشتا ڕەنگ نەکرابوون لەبەر خۆرەتاوەکە چاوی وەشەوارە دەخست. لەپاڵ ئەو بینایەدا کە لە حاڵی تەواوبووندا بوو خانوویەکی تریش وەبەرچاو دەکەوت کە دەورانی دەوری چێوبەستی لێدرابوو و کرێکاران بە جلوبەرگی خۆڵاوی و شمشە و شاغوڵ بەدەستەوە لەسەر چێوبەستەکان خەریکی دایواردانان بوون و بە سەتڵ دۆغابیان دەکرد بەسەر دیوارە کەرپووچییەکاندا.

سڤیاژسکی گوتی: کارەکانتان چاك دەڕۆنە پێشێ. جاری پێشوو کە لێرەبووم هێشتا دیوارەکانی تەواو نەبووبوو.

ئانا گوتی: هەتا پاییز کاری بیناسازییەکە تەواودەبێ. وردەکارییەکانی ناوەوەی لە تەواوبوونە.

ـ ئەم بینا تازەیان دەبێ بەچی؟

ڤرۆنسکی گوتی: ئەوەش شوێنی نیشتەجێبوونی پزیشك و دەواسازەکانە.

ـ کە چاوی بە بەنناکە کەوت بە پانتۆڵێکی قوڵەوە دەهات بۆ لای، داوای لێبوردنی لە دالی کرد و چوو بۆ لای.

دەورێکی بە دەوری قوولکەی ماڵاتەکەدا لێداو ڕاوەستا، بەنناکە هاتەپێشێ و دەستیانکرد بە قسەکردن.

ئانا چووە پێشێ و پرسیی چییە کێشەیەك هاتۆتە گۆڕێ؟ وەڵامیان دایەوە کە بەردەنووسی سێ سووچی سەردەرانەکە زۆر لە خوارێ دەبێ.

ئانا گوتی: من لە سەرەتاوە گوتم دەبێ بناغەکەی بەرزتر بکەنەوە.

بەنناکە گوتی: وایە ئانا ئارکادیۆڤنا، بریا ئەو کارەمان بکردبایە. بەڵام ئیتر کارێکە هاتۆتە پێشێ.

ئانا کە دیتی سڤیاژسکی سەری لەو زانیارییانەی لە بواری بیناسازیدا سووڕماوە گوتی: بەڵێ، من زۆرم حەز لە کاری بیناسازییە. واباشە دیواری بینا تازەکەش لەگەڵ نەخۆشخانەکە

هاوتەراز بن، بەڵام دواتر هاتینە سەرئەوەی ئەو خانووبەرەیەش سازبکەین، بەبێ پلان و نەخشە کارەکەمان دەست پێکرد.

ڤرۆنسکی کە قسەکانی لەگەڵ بەنناکە تەواوبوو گەڕایەوە بۆ لای ژنەکان و ڕێنوێنی کردن بۆ نێو نەخۆشخانەکە.

لە دەرەوە کرێکارەکان هێشتا خەریکی قڕنیزی لێواری سەربانەکان بوون، لە ناویشەوە نهۆمی خواروو بەدەست نەققاشەوە بوو. کاری نهۆمی دووهەم لە تەواوبوون بوو. بە پلیکانێکی بەرینی چۆدەنیدا وەسەر کەوتن و گەیشتنە سەر پێگۆڕکەکە و لەوێوە چوونە ژوورێکی گەورە. دیوارەکان سپیکاری کرابوون و بە شێوەی مەڕمەڕین نەققاشی کرابوون. پەنجێرە گەورەکان هەموویان تێگیرابوون. تەنیا پارکێتی تەرکی ژوورەکان کاری مابوو، ئەو دارتاشانەی کە خەریکی رەندەکردنی سووچ و لێوارەی تەختەکان بوون لەبەریان هەستان و ئەو قەیتانەی لەنێوچاوانیان بەستبوو دایانماڵی و سڵاویان لە ئەربابەکەیان کرد.

ڤرۆنسکی گوتی: ئێرە پرسگە و شوێنی وەرگرتنی نەخۆشەکان و ژووری چاوەڕوانییە، مێزێکی نووسین لێرە دادەندرێ و هەروەها مێزێکی چکۆڵە و دۆڵابێکیش، هەر ئەوەندە.

ئانا گوتی: لەملایەوە وەرن. لە پەنجێرەکە نزیك مەبنەوە ـ نووکی قامکی لە پەنجێرەکەدا تاکوو تازە بوونی رەنگەکەی تاقی بکاتەوە و گوتیشی: نا، ئەلکسی رەنگەکەی وشك بۆتەوە.

لە ژووری پرسگە و ژووری چاوەڕوانییەوە چوونە دالانەکە. ڤرۆنسکی دەرگای هەواگۆرە نوێیەکەی نیشاندا کە تازە دایانبەستبوو، پاشان ڤانە مەڕمەڕییەکانی حەمام و قەرەوێڵە بە فەنەری سەیر و سەمەرەوە، دوای ئەویش بردنی بۆ ژوورەکانی تایبەتی نەخۆش و هەمار و ژووری جلان، هەروەها ئەو سۆبایانەی کە بە شێوەی نوێ دروست کرابوون و پاشان ئەو داشقە و عارەبانە دەستییانەی نیشاندان کە بۆ گوێستنەوەی کەلوپەل و شتومەکی جۆراوجۆر کەڵکیان لێوەردەگیرا و تایەی نەرمیان لە ژێردا بوو و کاتی لێخوڕین تەقوکوتیان نەدەهات، هەروەها زۆر شتی دیکە. سڤیاژسکی وەك کەسێکی کە لەگەڵ هەموو ئەو پێشکەوتە نوێیانە ئاشنابێ، بە شانوباڵی هەموو ئەو داهێنانە نوێیانەیدا هەڵدەگوت و وایدەنواند کە قەدریان دەزانێ. دالی بە دیتنی ئەو شتانە کە قەتی نەدیتبوون ماق مابوو و دەیویست سەری لە هەموو شتێك دەرچێت و سەبارەت بە وردەکارییەکان پرسوجۆی دەکرد و ڤرۆنسکیش زۆری کەیف بەوە دەکرد.

سڤیاژسکی گوتی: بەڕاستی من پێموایە ئەمە تەنیا نەخۆشخانەیەکە لە رووسیا کە لە هەموو بارێکەوە بەرێوجێ سازکراوە.

دالی پرسیی: بەڵام لەو نەخۆشخانەیەدا بەشی زایەمان لەبەرچاو نەگیراوە. زێسانگە بۆ گوند زۆر پێویستە. من زۆر جار....

ڤرۆنسکی ئەگەرچی زۆر دەروەستی ئەدەب و راگرتنی حورمەتی بەرانبەرەکەی بوو، قسەکەی پێبڕی: ئێرە خۆ زێسانگە نییە، نەخۆشخانەیە و لەوێدا جگە لە نەخۆشە گیرۆکان هەموو نەخۆشێك ماریجە دەکرێ. ئێستا ئەوە ببینە ـ کورسیلەیەکی تایەداری بۆ لای دالی رادا کە تازە هێنابوویان و بۆ ئەو نەخۆشانە دەبوو کە لە حاڵی چاکبوونەوەدان، لە سەری دانیشت و دەستیکرد بە لێخوڕینی و گوتی: ئەوە بۆ ئەو نەخۆشانەیە کە ناتوانن بەڕێدا بڕۆن، یان هێشتا هێزو تینێکی وایان نەهاتۆتەوەبەر یان لاقیان بە هۆیەك توانایی تێدا نییە و پێویستیان بە هەوای تازەیە، بەو کورسییە تایەدارانە دەگەڕێن.

داریا ئەلکساندرۆڤنا هەموویانی پەسن دەکرد و زۆری بەدڵ بوون، بەڵام لە هەموویان زیاتر چێژی لەو حەز و خولیا سروشتی و ساویلکانەی ڤرۆنسکی وەردەگرت. هێندێ جار دڵی بە قسەکانی نەدەدا و تەنیا لەبز و راوێژەکەی دەبیست و لە خەیاڵی خۆیدا خۆی لەجێی ئانا دادەنا و لە دڵی خۆیدا دەیگوت «بەڵێ، مرۆڤێکی زۆر رۆحسووك و لەبەردڵانە.» و بەهۆی ئەو حەز و تاسەیەی لە ناخیدا بوو وەهای کەوتبووە بەردڵ کە هەقی بە ئانا دەدا کە ئاوا ئاشقی بووە و دڵی پێداوە.

## بیست و یەك

ئانا داوای کرد بچن بۆ دیتنی پەروەرشگا و شوێنی راهێنانی چارەوێ، چونکە سڤیاژسکی دەیویست چاوی بە ئەسپێکی تازە هاوردوو بکەوێت، بەڵام ڤرۆنسکی پێیگوت پرێنسس ماندووە و حەزی لە دیتنی ئەسپ نییە. ئێوە بچن من پرێنسس دەبەمەوە بۆ ماڵێ، رووی لە دالی کرد و گوتیشی: ئەگەر حەزی لێیە پێکەوە برێك دەدوێین.

داریا ئەلکساندرۆڤنا کە هێندێ ماقمابوو گوتی: من زۆر لە ئەسپ و شتیوا تێناگەم، بەڵام ئاخافتن لەگەڵ ئێوەم زۆر پێخۆشە.

بە روخساری ڤرۆنسکیدا تێگەیشتبوو کە چاوەڕوانییەکی لێیهەیە. بە هەڵەش نەچووبوو، هەر لەگەڵ پێیاننا ئەودیوی دەروازە نەردەییەکەوە و چوونە نێو باخەکە ڤرۆنسکی چاوێکی لەلای ئانا کرد و کە دڵنیابوو ئانا دوورە و نە دەنگیان دەبیستێ و نەدەیانبینێ، بە روانینێکی زەردەخەنە تێزاوەوە گوتی: نازانم تۆ زانیبووت دەمهەوێ قسەت لەگەڵ بکەم یان نا؟ ـ

کڵاوەکەی لە سەری داگرت و دەسرەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا و لەگەڵ وشککردنەوەی سەری گوتی: من دڵنیام کە تۆ دەستەخوشکی راستەقینەی ئانای.

داریا ئەلکساندرۆڤنا هیچ وەڵامێکی نەدایەوە و تەنیا بە حەپەساوی چاوی لێکرد. لەوکاتەوە کە لەگەڵی تەنیا کەوتبوو ترسێك نیشتبووە دڵی. چاوانی بە بزە دەدرەوشانەوە و هەڵسوکەوتی جیددیی ڤرۆنسکی ترسێکی خستبووە دڵییەوە.

بۆچوونی جۆراوجۆر سەبارەت بە ویستەکەی ڤرۆنسکی بە زەینیدا تێدەپەڕین. «حەتمەن داوام لێدەکات لەگەڵ منداڵەکانم بە میوانی بێم بۆ لایان. منیش نابێ ئەو داوایەی قەبووڵ بکەم. یان دەیهەوێ من لە مۆسکۆ کوڕێك بۆ ئانا پەیکبێنم... یان رەنگە بیهەوێ سەبارەت بە ئانا و ڤسلۆڤسکی شتێك بڵێ یان لەوانەیە سەبارەت بە کیتی و ئەوەی کە لە هەمبەر ئەودا خۆی بە خەتابار دەزانێ.» ئەو بەردەوام بۆچوونی ناخۆش و جۆراوجۆری سەبارەت بە مەبەستەکەی ڤرۆنسکی لە دڵی خۆیدا دەهێنا و دەبرد بەڵام ئەوەیکە ڤرۆنسکی دەیویست لەگەڵی بێنێتە گۆڕێ، بەڕاستی هەر بە زەینیشیدا نەهاتبوو.

گوتی: تۆ لەلای ئانا قسەت بڕ دەکات، ئەویش زۆری تۆ خۆشدەوێ، تکایە یارمەتیم بدە.

داریا ئەلکساندرۆڤنا بە سەرنجێکی شەرمنانەوە لە روخساری وشکی ڤرۆنسکیی روانی کە هێندێ جار لەبەر خۆرەکە و هێندێ جاریش دەکەوتە بەر سێبەری لکوپۆپی چڕی دارەکان و تاریك دادەگەڕا، چاوەڕێ بوو بزانێ ئیتر چی دەڵێ، بەڵام ڤرۆنسکی بە نووکی گۆچانەکەی کایەی بە خیزی بەردەمی دەکرد و شانبەشانی ئەو هەنگاوی دەنا و هیچی نەدەگوت.

ـ تۆ لە هاوڕێیانی قەدیمی ئانای و تەنیا خاتوونێکیشی کە هاتووی بۆ سەردانمان، هەڵبەت پرێنسس ڤارڤارا ناهێنمە ئەژمار. پێموانییە هۆی ئەو سەردانەتان ئەوەبێ کە پێوەندییەکەمان ئاسایی بێتەوە، بەڵکوو بەو هۆیەیە کە دەزانی ئێمە تووشی چ کێشە و ئاریشەیەك بووین و چونکە ئانات خۆشدەوێ ویستووتە یارمەتیی بدەی ـ ئەوەی گوت و چاوێکی لە دالی کرد و لێیپرسی: وانییە؟

داریا ئەلکساندرۆڤنا بەدەم دادانەوەی چەترەکەیەوە گوتی: وایە، وایە بەڵام...

ڤرۆنسکی قسەکەی پێبڕی و گوتی: نا،... ـ بێ ئیختیار راوەستا، بەجۆرێك کە داریا ئەلکساندرۆڤناش لە جێی خۆی راوەستا. پێیوانەبوو بەو کارە هاوقسەکەی خۆی تووشی بارودۆخێکی ناخۆش دەکات. درێژەی پێدا: نا، هیچ کەس وەك من تێناگا ئانا چەندە لە بارودۆخێکی دژواردایە. ئەوەش سروشتییە، هەڵبەت بە مەرجێك کە تۆ بە کەرەمی خۆت وەك مرۆڤێکی بەبەزەیی چاوم لێبکەی. من خۆم بوومەتە هۆی پێکهێنانی ئەو بارودۆخە دژوارە و هەر بەو هۆیەش هەست بە دژوارییەکەی دەکەم.

داریا ئەلکساندرۆڤنا بێ ئیختیار پەسنی ئەو راستوێژی و لەبزە قایمەی کرد و گوتی: تێناگەم، بەڵام خەمی ئەوەمە جەنابت راست بەو هۆیەی کە لەو کارەدا خۆت بە خەتابار و تاوانبار دەزانی، کارەکە لە خۆت گەورە بکەیەوە. دەزانم بارودۆخی ئەو لە کۆمەڵگای خانەدانەکاندا باش نییە و گوڵۆڵەی کەوتۆتە لێژی.

ڤرۆنسکی بە نێوچاوانێکی گرژەوە برۆی تێکنا و گوتی: لەنێو کەسانی ناوبەدەرەوە و خانەداندا دنیای لێ بۆتە دۆزەخ. نازانی لە ماوەی ئەو دوو حەوتووەدا لە پترزبۆرگ چ ئازارێکی کێشا... تکات لێدەکەم باوەڕم پێبکە.

ـ بەڵێ، بەڵام لێرە، نە ئانا هەست دەکات پێویستی بە کۆڕی ئاشنا و رۆشنا قەدیمییەکانی هەیە و نە ئێوەش....

ڤرۆنسکی بە سووکایەتییەوە گوتی: کۆڕی ئاشنا و رۆشنا؟ من دەبێ چ پێویستییەکەم پێیان هەبێ؟

ـ هەتا ئەو کاتە، کە لەوانەیە بۆ هەمیشە بێت، ئێوە بەختەوەر و ئاسوودەن. من وەك دیتوومە ئانا زۆر بەختەوەرە، خۆشیدەوێی. پێیگوتم ـ داریا ئەلکساندرۆڤنا کە ئەمەی دەگوت پێکەنی و ئێستا لەگەڵ گوتنی ئەو قسەیە راستیی بەختەوەریی ئانا تووشی دڕدۆنگیی کرد.

بەڵام ڤرۆنسکی وەك ئەوە وا بوو کە گومانی لەو مانەیە هەبێت.

گوتی: بەڵێ، دەزانم کە دوای ئەو هەموو رەنج و ئازارە سووکناییی هاتووە و ئێستا بەختەوەرە. ئەو ئێستا بەختەوەرە. بەڵام من؟... زۆر لەو کێشەیە دەترسم کە چاوەڕوانمانە و رۆژێك بەرۆکمان بگرێت... داوای لێبوردن دەکەم، حەزدەکەی پیاسە بکەین؟

ـ نا، بۆ من فەرق ناکات.

ـ باشە، کەوایە لێرە دادەنیشین.

داریا ئەلکساندرۆڤنا لەسەر کورسییەکی سووچی رێگاکە دانیشت و ڤرۆنسکی بە پێوە لەبەردەمی راوەستا.

ڤرۆنسکی دووپاتی کردەوە: من دەزانم ئانا بەختەوەرە ـ گومانی ئەوەی کە ئانا بەڕاستی بەختەوەرە یان نا زیاتر دڵی ئەلکساندرۆڤنای داگرت. ڤرۆنسکی درێژەی پێدا: بەڵام ئەو بارودۆخە بڵێی بەو شێوەیە درێژە بکێشێ؟ ئەو رێگایەش کە ئێمە گرتوومانەتە بەر رێگایەکی دروستە یان نا، ئەوە باسێکی ترە. ئێمە ئەو رێگایەمان گرتۆتەبەر و یان گاڵ دێنێ یان پەموو... ـ لێرەدا زمانی ئاخافتنەکەی گۆڕی و بە فەرەنسی گوتی: بەڵێنمان بە یەکتر داوە

هەتا ژیانمان مابێ ئەوینێکی پاك و پیرۆز بە یەکمانەوە گرێ دەدات و لە یەکتر جیا نابینەوە. منداڵێکمان هەیە و لەوانەیە منداڵی دیکەشمان ببێ. بەڵام ئەو یاسا و رێسا و بارودۆخەی تێیکەوتووین وایکردووە کە هەزاران کۆسپ و لەمپەریان لەسەر رێگاکەمان زەق کردۆتەوە و ئەو کە ئێستا دوای ئەو هەموو رەنج و ئازارە تۆزێ حەساوەتەوە، ئەوان نابینێ و ناشیهەوێ بیانبینێ. ئەوەش دیار و بەرچاوە. بەڵام من ناتوانم ئەو کۆسپانە لەبەرچاو نەگرم. کچەکەی من بەپێی یاسا کچێ من نییە، کچی کارنینە ـ جۆرێك خۆی بادا دەتگوت نکوولّی لە هەموو شتێك دەکات گوتی: من نامەوێ بچمە ژێر باری ئەو درۆ و دەلەسانەوە ـ بە روخسارێکی گرژ و سەرنجێکی مانادارەوە لە داریا ئەلکساندرۆڤنای روانی.

داریا ئەلکساندرۆڤنا هیچی نەگوت. هەروا چاوی لە ڤرۆنسکی دەکرد. ڤرۆنسکی درێژەی پێدا: سبەینێ کوڕێکمان دەبێ. کوڕی من دەبێ بەڵام یاسا بە کوڕی کارنینی دەزانێ، نە ناوی منی بەسەرەوە دەبێت و نە ماڵ و سامانەکەی منی بە میرات پێدەگات، ئێمە هەرچەندیش لە بنەماڵەدا بەختەوەر بین و هەرچەندیش منداڵمان بێت هیچ پێوەندییەك لەنێوان من و منداڵەکانمدا نابێت. ئەوان هەموو دەبنە منداڵی کارنین. قورسی و رەشیی ئەم بارودۆخەت دیوە؟ من هەوڵم داوە لەم بارەوە لەگەڵ ئانا بدوێم بەڵام ئەو تاقەتی ئەو باسەی نییە و خێرا رقی هەڵدەستێ. ئەو تێناگات و منیش ناتوانم هەموو شتێکی پێبڵێم. ئێستا با لەلایەکی ترەوە چاو لە کێشەکە بکەین. خۆشەویستیی ئەو هۆی بەختەوەریی منە. بەڵام دەبێ کارێکیشم هەبێ. ئەو کارەم پەیدا کردووە و شانازیی پێوەدەکەم و ئەوەم زۆر لە کاری هاوڕێ قەدیمییەکانم لە دەرباری ئەرتەشدا پێباشتر و پڕبایەخترە و قەت بەو کارەی ئەوانی ناگۆڕمەوە. من لێرە کار دەکەم و جێپێی خۆم کردۆتەوە و زۆریش رازیم. لە هۆکارەکانی بەختەوەریش هیچم کەم نییە. زۆریش حەز بەو کارە دەکەم و لەبەر ناچاریش نییە کە رووم لەو کارە کردووە، بە پێچەوانە...

داریا ئەلکساندرۆڤنا تێگەیشت کە ڤرۆنسکی گەیشتە ئەو قسانە دەستەپاچە بوو. ئەو نەیتوانی پاکانە بۆ لادانەکەی لەرێی ئاخافتنەکەیان بکات. بەڵام هەستی دەکرد لەگەڵ دەستپێکردنی باسی ئەو گرفتانەی کە زەینی بە خۆیەوە خەریك کردبوو و نەیدەتوانی لەگەڵ ئانا بیهێنێتەگۆڕێ، لەو بوارەدا هەرچییەکی بوو درکاندی. مەسەلەی کاروباری کشتوکاڵیش بەشێك لەو فیکرە تایبەتییانەی بوو.

ڤرۆنسکی وەخۆ هاتەوە و درێژەی بە قسەکانی دایەوە: بەڵێ، گوتم کە... مەسەلەی گرینگ ئەوەیە کاتێك کار دەکەین دەبێ دڵنیابین ئەو کارەی دەیکەین بە مردنمان تەواو نابێت و عەولادەکانم درێژە بە کار و کردەوەکانم دەدەن. بەڵام من لەو نێعمەتە بێبەشم. حاڵی پیاوێك بێنە بەرچاوی خۆت کە لە پێشدا دەزانێ منداڵی جگەرگۆشە و ژنە خۆشەویستەکەی پێوەندییان بە ئەوەوە نییە و پێوەندییان بە کەسێکەوە دەبێت کە لێیان بێزارە و حەز ناکات گوێی لە ناوەکەشیان بێت. ئەوەش ناخۆش و ترسناك نییە؟

بێدەنگ بوو و دیاربوو زۆر شڵەژاوە.

داریا ئەلکساندرۆڤنا گوتی: بۆچی، دەنا من زۆر باش لە بارودۆخی ئێوە دەگەم ـ پاشان لێی پرسی: بەڵام دەتوانێ چ بکات؟

ڤرۆنسکی هەوڵیدا کە بێتەوە سەرخۆ و گوتی: ئێستا گەیشتینە مەبەستەکەی من. ئانا دەتوانێ. کارەکە لە دەستی ئەودایە ئەگەر حەزی لێبێ. تەنانەت بۆ داواکردنی مافی باوکایەتی لە بارەگای ئیمپڕاتۆر تەڵاقی ژن پێویستە و ئەوەش پێوەندیی بە ئاناوە هەیە. مێردەکەی رازی بوو تەڵاقی بدات. لەوکاتەدا مێردەکەی تۆ پێملی کردبوو. من دەزانم تەنانەت ئەمڕۆش بۆ تەڵاقدانی هیچ دژایەتییەکی نییە و هەر ئەوەندەیە ئانا نامەیەکی بۆ بنووسێ. ئەو راشکاوانە گوتوویەتی ئەگەر ئانا داوای تەڵاق بکات ئەو رەتی ناکاتەوە ـ ڤرۆنسکی بە لەبزێکی تاڵ گوتیشی: هەڵبەت دەبێ بڵێین ئەمە یەکێك لەو دڵڕەقییانەیە کە وەك فریزوو ریشەی داکوتاوە و تەنیا لەو مرۆڤە بێبەزەییانە دەوەشێتەوە. ئەو دەزانێ زیندووبوونەوەی یادی ئەو و ئەم رووداوە تاڵە لە دڵی ئانادا چەندە پڕئازارە. لەگەڵ ئەوەشدا دەیهەوێ پێملی بکات کە داواکاریی نووسراوەی بداتێ. من تێدەگەم کە ئەو کارە بۆ ئانا سانا نییە بەڵام کێشەکە هێندە گرینگە کە دەبێ ***ئەو نەرمی و دڵناسکییانە وەلانێین. مەسەلەی گرینگ بوونی ئانا و بەختەوەری منداڵەکانییەتی.*** من باسی خۆم ناکەم، ئەگەرچی کارەکەی منیش زۆر دژوارە، یەکجار دژوارە ـ ئەو ئەم رستەیەی بە لەبزی هەڕەشەکردن لە کەسێك دەربڕی کە کارەکەیان لێئاڵۆز و دژوار کردووە: بەڵێ، پڕێنسس، من ئێوە بە هۆکاری نەجاتبوونی خۆمان دەزانم و بەبێ رووپامایی دەستەوداوێنی ئێوە دەبم. تکایە یارمەتیم بدە و پێملی بکە با تەڵاق لە مێردەکەی وەرگرێ.

داریا ئەلکساندرۆڤنا چوو لە فیکرەوە. پاشان گوتی: هەڵبەتـ دوایین دیداری خۆی و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی وەبیرهاتەوە و کەوتە بیری ئانا و بە لەبزێکی قایم گوتی: هەڵبەت، هەڵبەت!

ـ دەزانم لە قسەی ئێوە دەرناچێ، پێملی بکە با نامەکە بنووسێ. من نامەوێ و دەتوانم بڵێم ناتوانم لەوبارەوە لەگەڵی بدوێم.

داریا ئەلکساندرۆڤنا گوتی: زۆر باشە، قسەی لەگەڵ دەکەمـ لەناکاو بیّ ئەوەی بزانیّ بۆ، خوخدە سەیر و تازەکەی ئانای وەبیرهاتەوە کە پیڵووی تیّك دەبەزاند" بەڵام بۆ ئانا خۆی مشووری ئەوە ناخوات؟ ـ وەبیری هاتەوە کە راست ئەو کاتەی کار دەگاتە مەسەلە سۆزدارەکان و هۆگرییە تایبەتییەکانی ژیان، ئاوا پیّلووەکانی تیّکدەبەزیّنیّ. لە دڵی خۆیدا گوتی «هەر دەڵیّی کاتیّك چاو لە ژیانی خۆی دەکات چاوەکانی ئاوا دەقونجیّنیّ بۆ ئەوەی هیچ نەبینیّ.» لە وەڵامی سپاسی ڤرۆنسکیدا گوتی: حەتمەن قسەی لەگەڵدا دەکەم. لەبەر خاتری خۆم و لەبەرخاتری ئەویش.

هەستان و بەرەو ماڵیّ وەڕیّ کەوتن.

# بیست و دوو

دالی کە گەڕایەوە ئانا چاوی لە چاوی بڕی، دەتگوت دەیهەویّ بزانیّ لەگەڵ ڤرۆنسکی چییان گوتووە، بەڵام زمانی نەگەڕا.

گوتی: وادیارە کاتی نانی نیوەڕۆیە. ئیّمە هەر فریا نەکەوتین یەکتر ببینین. هیوام بە شەوێیە. واچاکە جلەکانمان بگۆڕین. تۆش هەروا. لەلای قوڕەکارییەکە هەموو جلەکانمان پیس بوون.

دالی چوو بۆ ژوورەکەی خۆی. کەوتە پیّکەنین. جلی پیّنەبوو بیگۆڕیّ. باشترین جلی ئەوەبوو کە لەبەریدا بوو. بەڵام بە مەبەستی ئەوە بۆ کاتی فراویّن گۆڕانیّك لە سەر و وەزعی خۆیدا پیّکبیّنیّ داوای لە پیّشخزمەتەکەی خۆی کرد تۆزیّ جلەکانی بتەکیّنیّ و سەرقۆڵ و رووبانەکانی بگۆڕیّت و بە تۆڕیّك سەرو پرچی رازاندەوە.

کە ئانا بۆ سیّهەم جار جلەکانی گۆڕی، بەڵام بەوپەڕی ساکارییەوە هات بۆ لای. دالی بە پیّکەنینەوە پیّیگوت: چاولیّکە، جگە لەوە هیچ کاریّکی ترم لەدەست نەهات.

ئانا گوتی: راست دەکەی، ئیّمە لیّرە لە رادەبەدەر خۆمان دەربەستی شکۆ و خۆڕانان کردووە. ـ وەك ئەوەوابوو کە بیهەویّ بەو قسەیە داوای لیّبوردنی لیّبکات کە ئاوا خۆی رازاندۆتەوە: ئەلکسی بە هاتنی تۆ زۆر خۆشحاڵە. زۆر بە دەگمەن بە بۆنەی شتیّکەوە ئاوا خۆشحاڵ دەبیّت. بەجاریّ ئاشقت بووە. ماندوو نیت؟

بەر لە فراوێن دەرفەت نەبوو باسی شتێك بكەن. كە هاتنە ژووری میوانداری پرێنسس ڤارڤارا لەوێ بوو، پیاوەكان هەموو ریدنگۆتی رەشیان لەبەردا بوو. بەنناكە فراكی لەبەركردبوو. ڤرۆنسكی، گزیر و دوكتۆرەكەی بە میوانەكان ناساند، لەلای قورەكارییەكە بەنناكەی پێناساندبوو.

سەرپێشخزمەتێكی زلحۆرت كە ریشی تیفتیفە دابوو و دەموچاوە خڕ و قەڵەوەكەی بریقەی دەهات، ملیوانەی كراسەكەی شەقورەق وێستابوو و بۆینباخێكی سپیی لە ملدا بوو خەبەری هێنا كە نان و چێشت ئامادەیە و ژنەكان هەستان. ڤرۆنسكی داوای لە سڤیاژسكی كرد كە لەگەڵ ئانا ئاركادیۆڤنا بڕوات و خۆی چوو بۆ لای داریا ئەلكساندرۆڤنا. ڤسلۆڤسكی وەپێش تۆشكڤیچ كەوت و خێرا قۆڵی خستە قۆڵی پرێنسس ڤارڤارا، توشكۆڤیچ و دوكتۆر و بەنناكەش بەبێ خاتوون رۆیشتن بۆ سەرمێزەكە.

فراوێن و ژووری نانخواردن و قاپووقاچاخ و خزمەتكاران و خۆراك و شەراب نەك لەگەڵ شكۆ و بریقوباق و نوێبوونی گشتیی ماڵەكە سازگار بوو بەڵكوو لەوانیش تازەتر و بەشكۆتری دەنواند. داریا ئەلكساندرۆڤنا كە ئەم زەرقوبەرق و شكۆیەی زۆر بەلاوە تازە بوو دەیڕوانی و وەك كەیبانوویەك كە خۆشی ماڵێك بەڕێوەدێنێ، ئەوەی دەیدی فەرقی عەرز و ئاسمانی لەگەڵ ماڵوحاڵەكەی ئەو هەبوو و قەت پێیوانەبوو ئەوەی دیبینێ رۆژێك روو لە ماڵ و ژیانی ئەویش بكات، لەگەڵ ئەوەشدا بە وردی دەیڕوانی و لەوە سەری سووڕمابوو كە كارگێڕ و سەرپەرستی ئەم دامودەزگایە دەبێ كێ بێ و چۆنی بەڕێوەدێنن؟ ڤاسنكا ڤسلۆڤسكی و مێردەكەی خۆی و تەنانەت سڤیاژسكی و زۆربەی ئەو پیاوانەی كە ئەو دەیناسین قەت بە وردی سەرنجی ئەم شتانە نادەن و هەرشتێك كە خانەخوێیەكی ساماندار حەزدەكات بە میوانەكانی بسەلمێنێ، بێ سێ و دوو قەبووڵی دەكەن و هێندە كەمتەرخەمن قەت بیر لەوە ناكەنەوە كە ئەوەی لە ماڵێكی ئاوا خۆش و پڕشكۆدا و بەوپەڕی جوانی و رێكوپێكییەوە دەیبینن بۆ خانەخوێ ئەرك و زەحمەتێكی هەڵگرتووە و لە خۆڕا سەری هەڵنەداوە. بەڵام داریا ئەلكساندرۆڤنا چاك تێدەگەیشت كە هیچ كارێك، تەنانەت هەلیماوێكی سادە بۆ فراوێنی منداڵان لەخۆوە ساز ناكرێ، كەوایە هەڵسووڕاندنی دامودەزگایەكی بەم گەورەیی و پێچەڵاوپووچی و جوانییە ئاوا بە رێكوپێكی دەبێ كەسێكی زۆر چالاك و لێزانی لە پشتەوە بێت. بە دیتنی چاوی تیژی ئەلكسی كیریلۆڤیچ كە بەسەر مێزەكەدا گێڕای و ئاماژەی بەسەر پێشخزمەتەكە كرد و لە ئەو (یانی دالی)ی پرسی كە حەزی لە سووپی گەرمە یان سارد، تێگەیشت كە گێڕان و نەزمونیزامی ئەم كاروبارە بە دەست ئەوە و رۆڵی ئانا لەو بوارەدا لە رۆڵی

ڤسلۆڤسکی گرینگتر نییە. ئەو و سڤیاژسکی و پرێنسس ڤارڤارا لەو روانگەیەوە هەموویان وەك یەك میوان بوون و دڵخۆشانە چێژیان لەو میوانداربیە وەردەگرت.

ئانا تەنیا بەڕێوەبردنی رەوتی ئاخافتنەکانی لە ئەستۆ بوو، ئەم ئاخافتنەش لەسەر مێزێکی چکۆڵە و لە هەنتەشی گزیر و بەنناکەدا، کە لەگەڵ میوانەکانی تر هاوشان نەبوون و هەوڵیان دەدا لە ژێر باری ئەو باقوبریقە نامۆیەدا ئازار نەکێشن و هەست بە غەریبی نەکەن، نەشیان دەتوانی ماوەیەکی درێژخایەن لەو دەمەتەقێ و ئاخافتنەدا بەشداری بکەن، زۆر دژوار بوو. داریا ئەلکساندرۆڤنا دیتی ئانا ئەم ئاخافتنە دژوارەی بە وردبینی و هەڵسەنگاندنی سروشتیی خۆی و تەنانەت بە تامەزروییەوە بەڕێوەدەبرد.

باس هاتە سەر ئەوەی کە تۆشکڤیچ و ڤسلۆڤسکی چۆن بە تەنیا سواری گەمیەکە بوون و تۆشکڤیچ دەستیکرد بە باسکردنی دوایین کێبەرکێی گەمیەوانی پترزبۆرگ و ئانا لەسەر هەست بوو و کەڵکی لە یەکەم گتگرتن وەرگرت و بۆ ئەوەی نەهێڵێ بەنناکەیان بێدەنگبێ گوتی:

ـ نیکۆلای ئیڤانڤیچ (یانی سڤیاژسکی) پێیسەیر بوو کە دیتی کاری بیناکە لە چاو دوایین جار کە لێرەبوو ئاوا بەخێرایی چۆتە پێشێ.

بەننا بە زەردەیەکەوە گوتی: کارکردن لەگەڵ حەزرەتی کۆنت زۆر خۆشە. (ئەو پیاوێکی بەڕێز و لەسەرەخۆیە و زۆر باش لە کارزانی و شارەزاییی خۆی تێدەگات.) کاتێك خاوەنکارەکەت نووسینگەی پارێزگایە، کارەکە جۆرێکی دیکەیە. بۆ کارکردن دەبێ ماوەیەکی زۆر نامە بنووسی و باوەشێك پەڕەکاغەز رەش بکەیەوە، بەڵام حەزرەتی کۆنت بە دوو وشە قەراروبڕیەی لەگەڵ دەکەی و کارەکە تەواودەبێت.

سڤیاژسکی بە پێکەنینەوە گوتی: رەوشتێکی ئەمریکاییە.

ـ بەڵێ قوربان، لەوێ باڵاخانەکان لە رووی ئەقڵەوە هەڵدەچنن...

باس هاتەسەر فێڵ و دەهۆی دەسەڵاتداران لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەڵام ئانا لەرێوە مەسەلەیەکی تری هێنایەگۆڕێ بۆ ئەوەی گزیرەکەش زۆر بێدەنگ نەبێ و رووی لە داریا ئەلکساندرۆڤنا کرد و پرسیی: تۆ قەتت لاوێردە دیتووە؟ ئێمە چووین بۆ دیتنی ئەو مەکینەیە و لە دیتنی ئەو دەگەڕاینەوە کە چاومان پێتکەوت. منیش بۆ جاری یەکەم بوو چاوم بە مەکینەیەکی ئاوا دەکەوت.

دالی پرسیی: چۆن کاردەکات؟

ـ راست وەك مەقەست! تەختەیەکە و ژمارەیەکی زۆر تیخەڵەی چکۆڵە. ئاوا.

ئانا بە دەستە جوان و سپی و ناسك و قامكی پڕئەنگوستیلەوە كارد و چەتاڵێكی هەڵگرت و دەستیكرد بە نیشاندانی شێوەی كاركردنی لاوێردەكە. دیاربوو خۆشی دەیزانی هیچی لێتێناگەن بەڵام دەیزانی قسەكردنەكەی شیرینە و دەستە سپی و ناسكەكانی جوانن، بۆیە درێژەی بە باسكردنەكەیدا.

ڤسلۆڤسكی كە چاوی لێنەدەترووكاند بە گاڵتە گوتی: بەجێی مقەست بفەرموو قەڵەمتراشی كەشخە.

ئانا وەڵامی ئەو قسەیەی بە زەردەخەنەیەكی كەمڕەنگ دایەوە و هیچی نەگوت، رووی لە گزیری ئاڵمانی كرد و لێیپرسی: وانییە، كارڵ فیۆدۆریچ؟ وەك مقەست ناچێت؟

گزیر بە زمانی ئاڵمانی وەڵامی دایەوە: ***وایە، كارەكەی زۆر ئاسانە*** ـ خۆشی دەستیكرد بە باسكردنی پێكهاتەی مەكینەكە.

سڤیاژسكی گوتی: حەیف باقە نابەستێ. ئەگەر ئەوەشی بكردبایە زۆر شتی چاك بوو. من لە پێشانگای ڤیەنا مەكینەیەكم دی باقەكانیشی بە شریت دەبەست.

گزیر كە بەو قسەیە بێدەنگیی شكاندبوو رووی لە ڤرۆنسكی كرد و هەروا بە زمانی ئاڵمانی گوتی: ***دیارنییە. دەبێ نرخی تاسمەكەشی لەبەرچاو بگری. حیسابەكەی ئاسانە حەزرەتی هێژا!*** ـ دەیویست ئەو قەڵەم و دەفتەرچەیە لە گیرفانی دەرهێنێ كە هەموو شتێكی تێدا حیساب دەكرد بەڵام وەبیری هاتەوە كە لەسەر مێزی نانخواردنە و تێگەیشت كە ڤرۆنسكی چۆن ساردوسڕانە چاوی لێكرد، بۆیە وازی لە روونكردنەوەی زیاتر هێنا و بە ئاڵمانییەكی تۆزێ تێكەڵ بە رووسی گوتی: ***زۆر دژوارە، بابی زەحمەتەكەی نابێ.***

ڤاسنكا ڤسلۆڤسكی بۆ گاڵتەكردن و لاساییكردنەوەی كابرای ئاڵمانی بە رستەیەكی ئاوێتەی دووزمان گوتی: ***پیاو ماسی بگرێ قوونی تەڕ دەبێ*** ـ بە پێكەنینەوە رووی لە ئانا كرد و بە زمانی فەڕەنسی گوتی: ***ئاڵمانی زمانێكی شیرینە!***

ئانا بە لەبزێكی جیددی و ئاوێتەی گاڵتە بە زمانی فەڕەنسی گوتی: ***واز بێنە!***

ڕووی لە دوكتۆریش كرد كە پیاوێكی لاواز و زەردەڵە بوو، گوتی: ڤاسیلی سیمیڤۆنیچ، ئێمە پێمانوابوو لە سەحرا چاومان بە ئێوە دەكەوێ. لەوێ نەبوون؟

دوكتۆر بە گاڵتەكردنێكی خەمبارانەوە وەڵامی دایەوە: لەوێ بووم بەڵام بووم بە هەڵم.

ـ كەوایە وەرزشێكی باشتان كردووە.

ـ زۆر خۆش بوو.

ـ حاڵی پیرێژن چۆنە؟ هیوادارم سوورەیاوی نەگرتبێ.
ـ نا، سوورەیاو نییە، بەڵام گرانەتایەك لە سوورەیاو کەمتر نییە.
ـ داماوە! ـ بەم شێوەیە چونکە دەبوو دەرهەق بە کاردارەکانی ئەدەب بەجێ بێنێ دەستیکردەوە بە خزمەت کردنی میوانەکانی.

سڤیاژسکی بە گاڵتەوە گوتی: بەڵام ئانا ئارکادیۆڤنا، ئەگەر کەسێك بیهەوێ بەو روونکردنەوەی ئێوە مەکینەی دروێنە ساز بکات کارەکەی ئاسان نابێت.

ئانا بە پێکەنینەوە گوتی: نا، بۆچی؟ـ بزەکەشی دەیگوت کە شێوەی روونکردنەوەکەی شیرینی و دڵڕفینییەکی پێوە دیاربووە کە سڤیاژسکی بە جوانی دیتبووی. ئەم دڵڕفێنییە گەنجانەیە کە بە بڕوای دالی لە هەڵسوکەوتی ئانادا شتێکی تازە بوو، بووە هۆی سەرسووڕمانی ناخۆشی ئەو.

تۆشکڤیچ گوتی: بەڵام زانیارییەکانی ئانا ئارکادیۆڤنا لە بواری بیناسازیدا بەڕاستی جێگای سەرسووڕمانە.

ڤسلۆڤسکی گوتی: هەروایە. من دوێنێ گوێم لێبوو کە ئانا ئارکادیۆڤنا باسی بەردەنووس و قڕنیزی دەکرد.

ئانا گوتی: هیچ سەیر نییە. پیاو هێندە لەو شتانە دەبینێ و دەبیستێ. من لێم روونە کە ئێوە تەنانەت نازانن بینایەك چ کەرەسە و پێداویستییەکی دەوێ.

داریا ئەلکساندرۆڤنا دەیدی کە ئانا حەزی لەو لەبزە سووك و گاڵتەوئامێزەی نێوان خۆی و ڤسلۆڤسکی نییە بەڵام بێ ئیختیار خۆی تێوەدەدات.

بەڵام هەڵسوکەوتی ڤرۆنسکی لەوکاتەدا هیچ وەك ئاکاری لەڤین نەدەچوو. دیاربوو هیچ گرینگایەتییەك بە هەڵەوەڕییەکانی ڤسلۆڤسکی نەدەدا و بە پێچەوانە هانیدەدا کە درێژە بەو گاڵتە و گەپانە بدات.

ـ پێمبڵێ بزانم ڤسلۆڤسکی، ئەو بەردانە بە چی پێکەوە دەنووسێن؟
ـ دەی دیارە، بە چیمەنتۆ.
ـ بژیی، ئێستا پێمبڵێ بزانم چیمەنتۆ چییە؟

ڤسلۆڤسکی لە وەڵامدا گوتی: چیمەنتۆ، شتێکە وەك هەویر وایە،... نا، بێتۆنە، ـ هەمووانی وەپێکەنین خست.

دەمەتەقێ لەنێوان ئامادەبووانی سەرمێزەکەدا بەردەوام بوو، جگە لە گزیری ئەڵمانی و بەنناکە کە بێدەنگ دانیشتبوون. هێندێ جار زۆر نەرم و لەسەرەخۆ دەدوان، هێندێ جاریش لە کەسێکیان هەڵدەپێچا و تووشی خاڵێکی هەستیار دەبوون. جارێك قسەیەکیان کرد کە لە دڵی داریا ئەلکساندرۆڤنا گران هات و واهەڵچوو کە رەنگی بە جارێ هەڵبزرکا و پاشان هەوڵی دەدا وەبیر خۆی بێنێتەوە کە نەوەك لەو کاتەدا کاردانەوەیەکی نابەجێی لە خۆی نیشان دابێت و قسەیەکی ناخۆشی لە دەم دەرپەڕیبێ. سڤیاژسکی قسەی هێنایە سەر لەڤین و گوتی: زۆری پێ سەیرە کە لەڤین دەڵێ مەکینەی کشتوکاڵ بۆ رووسیا سەرتاپای زیانە.

ڤرۆنسکی بە پێکەنینەوە گوتی: من هێشتا ئەو شانازییەم بە نسیب نەبووە کە لەگەڵ ئەو ئاغا لەڤینە ئاشنابم. بەڵام وێناچێ قەت چاوی بەو مەکینانە نەکەوتبێ کە بە شتێکی خراپیان دەزانێ. یان ئەگەر دیتبێتی و تاقیی کردبێتەوە مەعلووم نییە چ جۆرە مەکینەیەك بووە، رەنگە لەو مەکینانەی دەستکاری رووسیا بووبێ نەك مەکینەی دەستکاری هەندەران. نازانم چۆن دەکرێ کەسێك بیروباوەڕێکی ئەوتۆی هەبێت؟

ڤسلۆڤسکی رووی لە ئانا کرد و بە پێکەنینەوە گوتی: ئەو جورە بیروباوەڕانە زیاتر لەنێو تورکەکاندا دەبێ لێیبگەڕێی.

داریا ئەلکساندرۆڤنا سوورهەڵگەڕا و گوتی: من ناتوانم بەرەڤانی لە بیروڕای ئەو بکەم، بەڵام دەتوانم بڵێیم مرۆڤێکی زۆر تێگەیشتوو و خوێندەوارە و ئەگەر خۆی لێرەبوایە حەتمەن وەڵامی دەدانەوە. بەڵام من ناتوانم.

سڤیاژسکی رۆحسووکانە گوتی: من زۆرم خۆشدەوێ و هاوڕێی قەدیمیمە. ***بەڵام داوای لێبوردن دەکەم، بەندەکانی خودا بە تەواوی بێعەیب نین.*** بۆ وێنە لەسەر ئەوە سوورە کە زێمستڤا و تەوای دادگاکانی بێکەڵکن و بەهیچ جۆرێك نابێتە ئەندامیان.

ڤرۆنسکی لەگەڵ ئەوەی گۆزەڵە سەهۆڵاوەکەی هەڵگرت و پەرداخێکی قەدباریکی پڕکرد لە ئاو گوتی: ئەوە بێموبالاتیی ئێمەی رووسییە، ئەو ئەرکانەی کە مافی خۆمان دەینێتە سەرشانمان هەستی پێناکەین.

داریا ئەلکساندرۆڤنا رقی لەو لەبزە خۆبەزل زانانەیەی ڤرۆنسکی هەستا و گوتی: من هیچ کەسم پێشك نایە لەو زیاتر لە خەمی ئەرکەکانی خۆیدا بێت.

ڤرۆنسکی کە دیاربوو بە هۆیەك دڵی لەو ئاخافتنە زویربووە گوتی: بە پێچەوانە، من کە ئێستا لە هەمبەرتاندا دانیشتووم، بە بۆنەی نیکۆلای ئیڤانفیچەوە (ئاماژەی بە سڤیاژسکی

کرد) ئەو شانازییەم پێبڕاوە کە ببمە ئەندامی دادگای زێمستڤا و شانازیی پێوەدەکەم و ڕێزم بۆیان هەیە کە هەڵیانبژاردووم. من لەسەر ئەو باوەڕەم کە ئەرکی چوون بۆ ناوەندی پارێزگا و پێڕاگەیشتنی کێشە و سکالای گوندنشینێك سەبارەت بە ئەسپەکەی بەو ڕادەیە گرینگە کە هەرکارێکی دیکەم لەدەست بێت بۆی وەلابنێم و بتوانم کارێك بکەم کە ڕۆژێك وەکوو کەسێکی شیاو بمکەنە ئەندامی زێمستڤا و شانازیشی پێوە دەکەم. من تەنیا لەو ڕێگایەوە دەتوانم ئەو سەربەشانەیەی کە وەك مالیکێك پێمدەدرێ قەرەبووی بکەمەوە. بەداخەوە خەڵك لەو گرینگایەتییە ناگەن کە دەبێ مالیکە گەورەکانی ئەم وڵاتە بیانبێت.

داریا ئەلکساندرۆڤنا کە دیتی ڤرۆنسکی لەسەر مێزی میواندارییەکەی خۆی تا ئەوڕادەیە لە خۆی دەفشێ و بە شانوباڵی خۆیدا هەڵدەڵێ و بیروڕای خۆی بەڕاست دەزانێ و پەسندی دەکات سەری سووڕما. وەبیری هاتەوە کە لەڤینیش لەو بوارەدا بیروڕای ڕاست وەکوو بیروڕای ڤرۆنسکی وا بوو. لەسەر مێزی خۆی ئاوا لێبڕاوانە داوەریی دەکرد. بەڵام ئەو لەڤینی خۆشدەویست و هەر بەو هۆیەش پێیوابوو ئەو بەرهەقە.

سڤیاژسکی گوتی: بەمشێوەیە جەنابی کۆنت، ئێمە دەتوانین لە کۆڕەکانی داهاتوودا لەلایەن ئێوەوە خاترجەم بین. بەڵام دەبێ زووتر وەڕێ بکەون، بۆ ئەوەی ڕۆژی هەشتەم لەوێ ئامادەبن. خۆزگە ئەو شانازییەتان بە من بدایە و لە ماڵەکەی من نیشتەجێ بووایەن.

ئانا گوتی: بەڵام من تا ڕادەیەك لەگەڵ ***مێردەکەی خوشکت*** هاوڕام ـ بە بزەیەکەوە گوتیشی: بەڵام ئەوەندە توندڕۆ نیم. منیش لەسەر ئەو باوەڕەم کە لەم دواییانەدا ئەم چەشنە بەڵێن و بڕیارە کۆمەڵایەتییانە لە ڕادەبەدەر پەرەیان سەندووە. لە ڕابردوودا هێندەمان فەرمانبەر هەبوو کە بۆ هەرکارێك فەرمانبەرێکمان بوو. ئێستاش بۆ هەموو کارێك چاوەڕوانن کەسێك بە ویستی خۆی کارە کۆمەڵایەتییەکان لە ئەستۆ بگرێت. ئەلکسی شەش مانگ نابێ لێرەیە و لە پێنج شەش دامەزراوەی کۆمەڵایەتی و ڕێکخراوەی چاکەکاری و دادگا و فلانشۆڕا و لێژنەی داوەری یا کۆمەڵەی ئەسپسواریدا بۆتە ئەندام. ***ئەگەر ئاوا بڕواتە پێشێ*** بەم زووانە ئیتر هیچ کاتێکی بۆ نامێنێتەوە کە بە کارەکانی خۆی ڕابگات. ژمارەی ئەو جۆرە دامەزراوانەش هێندە زۆرە کە دەترسم کارەکانیان لە تەشریفاتی ڕواڵەتی تێنەپەڕێ پاشان ڕووی لە سڤیاژسکی کرد و لێیپرسی: نیکۆلای ئیڤانڤیچ ئێوە لە چەند دانە لەو ڕێکخراوانەدا ئەندامەتیتان هەیە؟ پێموایە کە زیاتر لە بیست دانەدا، وانییە؟

ئانا ئەو قسانەی بە گاڵتە بوو، بەڵام بە لەبزیدا هەستت دەکرد کە لەو بارودۆخە وەزاڵە هاتووە. داریا ئەلکساندرۆڤنا کە بە وردی ئانا و ڤرۆنسکیی خستبووە ژێر چاوەدێری زۆر زوو لەو مانایە گەیشت. هەروەها بۆی دەرکەوت کە لە کاتی ئەو وتووێژەدا شوێنەواری گرژی و کەللەڕەقی بە روخساری ڤرۆنسکییەوە دیارە. بێجگە لەوە دیتی پرێنسس ڤارڤارا بە مەبەستی گۆڕینی باسەکە، بە تالّووکە دەستیکرد بە باسکردنی ناسیاوە پترزبۆرگییەکانی و هەروەها ئەو قسانەی ڤرۆنسکیی وەبیرهاتەوە کە چاوەڕوانی نەدەکرد، ئەو کاتەی لەنێو باخەکە بوون سەبارەت بە چالاکییەکانی خۆی لە گوند بۆی باسکردبوو، بەو ئاکامەش گەیشت کە ئەم باسەی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان پێوەندیی بە دەمەقالّیی نهێنیی نێوان ئانا و ڤرۆنسکییەوە هەیە.

فراوێن و شەراب و شێوەی میوانداریی پێشخزمەتەکان لەسەر مێزی نانخواردن زۆر باش بوو، بەڵام هەر لەوانەبوو کە داریا ئەلکساندرۆڤنا لە میواندارییە فەرمی و کۆڕە گەورەکانی سەمادا و لە رابردوودا دیتبووی، ئێستاش ئیتر حەزی لەو جۆرە کۆبوونەوە ساردوسڕ و وشکانە نەبوو کە دوور بوونی دڵەکان لە یەکتری و هەڵسوکەوتی فەرمی ئەو کەسانەی هەست پێدەکرد، هەر بەو هۆیەش لە رۆژێکی ئاسایی و لە کۆڕێکی چکۆڵەدا شوێنێکی ناخۆشی لەسەر دڵی دانابوو. دوای نانخواردن چوونە بەر بێلاکە دانیشتن و پاشان چوون بۆ یاریی تێنیسی سەر چیمەن. یاریکەران بوون بە دوو بەشەوە و لەمبەر و ئەوبەری تۆڕێك کە بە دوو ئەستووندەکی ئاڵتوونی رەنگەوە بەسترابوو و لەسەر چیمەنێکی رێك و تەکووز لە جێی خۆیان دامەزران. داریا ئەلکساندرۆڤنا هەوڵیدا لە یارییەکەدا بەشداری بکات بەڵام هەتا ماوەیەکی زۆر سەری لە رەوشت و تەکنیکی یارییەکە دەرنەدەچوو. پاشان کە لەگەڵ رەوشت و چۆنێتیی یارییەکە ئاشنابوو هێندە ماندووبووبوو کە لە پەنای پرێنسس ڤارڤارا دانیشت و دەستیکرد بە تەماشاکردنی یاریکەران. تۆشکڤیچیش کە هاویاریی ئەو بوو، ماندووبوو بەڵام یاریکەرانی تر هەتا ماوەیەکی زۆر درێژەیان پێدا. سڤیاژسکی و ڤرۆنسکی هەردووکیان زۆر چاکیان یاری دەکرد و دیاربوو چاکی لێدەزانن. ئەوان بە وردی چاویان لە تۆپەکە دەبڕی، بە شێنەیی و بەبێ دوودڵّی و زۆر گورج و توندوتۆڵ دەچوون بۆ لای تۆپەکە و سەبریان دەکرد هەتا هەڵدەبەزییەوە و بە زەبرێکی توند و میزانی راکێت و بە متمانەوە لێیان دەدا بۆ ئەوبەری تۆڕەکە. ڤسلۆڤسکی ناشارەزایانەتر لەوانی دیکە یاریی دەکرد و زۆری خۆی ماندوو دەکرد بەڵام بەنەشە و هەڵسوکەوتی خۆی هەمووانی شاد و دڵخۆش دەکرد. قاقای پێکەنین و هەرا و هاواریان نەدەبڕایەوە. ئەویش وەك پیاوەکانی تر دوای ئیجازە وەرگرتن لە ژنەکان رێدنگووتەکەی خۆی داکەند و قەڵافەتی جوان و

بەخۆوەی بەو کراسە سپییەوە و روخساری سوور و سپی و ئارەقەکردووی و هەڵسوکەوتی خێرای جۆرێك بوو کەسەرنجی هەمووانی رادەکێشا.

ئەو شەوە، کاتێك داریا ئەلکساندرۆڤنا رۆیشت بۆ ژووری خەوەکەی و هەرکە چاوی لەسەریەك دانا ڤاسنکا ڤسلۆڤسکی هێنایە بەرچاوی خۆی کە لەسەر چیمەنی یاریگاکە بەملاو بەولادا هەڵبەزودابەزی دەکرد.

داریا ئەلکساندرۆڤنا لە کاتی یارییەکەدا دڵی خۆش نەبوو. حەزی بەو پێوەندییە سووکەی نێوان ئانا و ڤسلۆڤسکی نەدەکرد و هەروەها ئەو حاڵەتە گشتی و نائاساییەی گەورانی زۆر پێناخۆش بوو کە بەبێ حوزووری منداڵان، دەستیان کردبوو بە یاریی منداڵانە. بەڵام لەبەرئەوەی بە ئاکاری خۆی یارییەکەیان لێتێك نەدات و هەروەها بەشێوەیەك کاتی خۆی تێپەڕێنێ، دوای هێندێ پشوودان گەڕایەوە بۆ لای یارییەکە و واینواند کە شاد و دڵخۆشە و چێژ لەو یارییە وەردەگرێ. ئەو رۆژە بەردەوام هەستی کردبوو کە لە شانۆیەکدا بەشداری دەکات و تەواوی ئەکتەرەکانی تر لەو باشتر دەور دەگێڕن و ئەو بە یاریی ناشارەزایانەی خۆی کارەکە لەوانی دیکەش تێکدەدات.

ئەو بەو قەستە هاتبوو کە ئەگەر خۆشی بۆ بگوزەرێ دوو رۆژ بمێنێتەوە. بەڵام هەر ئەو رۆژە، لە کاتی یارییەکەدا بڕیاریدا بۆ سبەینێ بگەڕێتەوە. ئەو دەردەسەرە پڕئازارە دایکانەیەی کە لە ماوەی رێگادا تا ئەوڕادەیە لێیان بێزار بوو، دوای تێپەڕینی رۆژێك دوور لە منداڵەکانی بەجۆرێکی تر زەین و بیری داگرتبوو و بەرەولای خۆی رایدەکێشا.

داریا ئەلکساندرۆڤنا دوای چایی و گەڕان بە گەمیەی شەوانە، بە تەنیا گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی و کراسەکەی داکەند و لەسەر چرپاکە دانیشت تاکوو قژە تەنکەکەی خۆی بۆ شەوێ بە شێوەیەکی تر دەرهێنێ، ئێستاش هەستی بەو ئوخژن و حەسانەوە دەکرد.

تەنانەت حەزی نەدەکرد ئانا بێت بۆ لای و بە خەیاڵیش حەزی پێنەدەکرد. پێی خۆشبوو لەگەڵ فیکر و خەیاڵەکانی خۆی تەنیا بمێنێتەوە.

## بیست و سێ

دالی دەیویست بچێتە سەر پێخەفەکەی کە ئانا بە جلوبەرگی خەوەوە هات بۆ ژوورەکەی.

ئانا ئەو ڕۆژە چەند جار ویستبووی سەبارەت بە مەسەلە و کێشە نهێنییەکانی خۆی لەگەڵی بدوێ و پرێسکەی دڵی لەلا بکاتەوە و هەموو جارێك دوای چەند وشە قسەکەی بڕیبوو و گوتبووی: دواتر باسی دەکەین، هەرکاتێك تەنیا کەوتین. من زۆرم قسە لە دڵدایە دەبێ پێتی بڵێم.

بەڵام ئێستا کە تەنیا کەوتبوون ئانا نەیدەزانی باسی چی بکات. لەبەر پەنجێرەکە دانیشتبوو و چاوی لە دالی بڕیبوو، کۆمای دەردەدڵە نهێنییەکانی لە زەینی خۆیدا وەرد دەدایەوە و نەیدەزانی لەکوێوە دەست پێبکات. پێیوابوو ئەوەی دەبوو بیلێ هەموی گوتووە.

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و تاوانبارانە چاوێکی لێکرد و گوتی: دەی، باسی کیتیم بۆ بکە. دالی ڕاستم پێبلێ، لە من دڵمەند نییە؟

داریا ئەلکساندرۆڤنا بە بزەیەکەوە گوتی: دڵمەند؟ نا.

ـ بەڵام لە من بێزارە و بە ژنێکی سووك و چرووکم دەزانێ، وانییە؟

ـ نا، قەت وانییە! بەڵام چیی لێدەکەی، خۆ دەزانی ئەو شتانە لە بیرناچنەوە.

ئانا ڕووی وەرگێڕا و لە پەنجێرە ئاوەڵاکەوە چاوی لە دەرێ کرد و گوتی: بەڵێ، وایە، بەڵام خەتای من نەبوو. نازانم تەخسیری کێ بوو. هەر بەڕاستی خەتا و تەخسیر یانی چی؟ مەگین جگە لەوەی ڕابرد شتێکی تر دەگونجا؟ تۆ خۆت بڵێ، دەگونجا؟ تۆ چۆن بیردەکەیەوە؟ یانی دەکرێ تۆ نەبووبایەی بە ژنی ستیڤا؟

ـ ڕاستت دەوێ نازانم. بەڵام تۆ شتێکم پێبڵێ...

ـ زۆر چاکە، پەلە مەکە، هێشتا باسی کیتی کۆتاییی نەهاتووە. پێم بڵێ بزانم، ئەو بەختەوەرە؟ بیستوومە لەڤین زۆر پیاوی چاکە.

ـ ئاوەڵناوی «زۆر پیاوی چاکە» بۆ ئەو کەمە. من مرۆڤی لەو باشترم پێشك نایە.

ـ پەککوو چەندەم پێخۆشە! زۆرم پێخۆشەـ قسەکەی دالیی دووپاتکردەوە: زۆر پیاوی چاکە بۆ ئەو کەمە!

دالی زەردەیەکی گرت و گوتی: بەڵام باسی خۆتم بۆ بکە. من زۆرم قسە لە دڵدایە پێتیبڵێم. من لەگەڵ... ـ دالی نەیدەزانی چۆن ناوی بێنێ. زمانی نەدەگەڕا کە بڵێ کۆنت ئەلکسی کیریلۆڤیچ.

ئانا گوتی: لەگەڵ ئەلکسی قسەت کرد، دەزانم. چیتان گوت؟ بەڵام من دەمویست راشکاوانە لێتبپرسم کە سەبارەت بە من و ژیانم چۆن بیردەکەیتەوە؟

ـ چۆن دەتهەوێ بەجارێك هەموو شتێکت پێبڵێم؟ راستت دەوێ نازانم بڵێمچی.

ـ نا، هەرچییەك بێ دەبێ بیڵێی... خۆ تۆ ژیانی منت دیوە. بەڵام لە بیرت نەچێ ئێستا هاوینە کە تۆ هاتووی و ئیمە بە تەنیا نیین... ئەوە بزانە ئێمە سەرەتای بەهار هاتین بۆ ئێرە و زۆر تەنیا بووین و دوای ئەوەش هەروا تەنیا دەبین و من لەوە باشتر هیچم ناوێ. بەڵام بیری لێبکەوە کاتێك من بە تەنیا بم ژیان چۆنی لێدی. بیهێنە بەرچاوت کە ئەو بڕوات و من لێرە بە تاقیتەنیا بمێنمەوە. رۆژێکی ئاواش هەر دێ... هەموو شتێك نیشاندەری ئەوەیە کە ئەم حاڵە زۆر جار دووپات دەبێتەوە و ئەو نیوەی کاتی خۆی لە دەرەوە رادەبوێرێ ـ کە ئەوەی گوت هەستا و هات لە تەنیشتی دالی دانیشت.

ـ وایە... ـ دالی کە دەیویست وەڵامی بداتەوە قسەکەی پێبڕی و گوتی: هەڵبەت من بە زۆر ئەوم لەلای خۆم رانەگرتووە. ئەگەر بشمهەوێ ناتوانم رایگرم. رۆژێك کێبەرکێی ئەسپسوارییە و ئەسپەکانی لە کێبەرکێدا بەشداری دەکەن و ئەو دەبێ بچێت، منیش زۆر خۆشحاڵم کە دەڕوات و خۆشی رادەبوێرێ. بەڵام بیر لە من بکەوە. بارودۆخی من بهێنە بەرچاوی خۆت... دەی، چی دەکرێ؟ با هەر باسی نەکەین ـ زەردەیەکی گرت و گوتی: دەی، پێمبڵێ بزانم، ئەو سەبارەت بە چی قسەی لەگەڵ کردی؟

ـ سەبارەت بە مەبەستێك کە من خۆشم دەمویست لێتبپرسم و باسی بکەین، هەر بەو هۆیەش هاودەنگ بوون لەگەڵ ئەو بۆ من سانا نییە. باسەکە لەسەر ئەوەبوو کە یانی ناگونجێ... ناتوانێ... ـ داریا ئەلکساندرۆڤنا دوودڵ ما بیڵێ یان نەیڵێ، پاشان گوتی: ناکرێ کارەکە لایەکی بە لایەکدا بخەن و بارودۆخی تۆش باشتر بێت؟... دەزانی من لەو بارەوە بیروڕام چییە... بەڵام سەرەڕای هەموو ئەوانە ئەگەر دەگونجێ ژیانی هاوبەش پێکبێنن...

ئانا گوتی: مەبەستت ئەوەیە تەڵاق وەرگرم؟ تۆ دەزانی تەنیا ژنێك كە لە پترزبۆرگ هات بۆ سەردانم بێتسی تۆرسكایا بوو؟ خۆ تۆ دەیناسی. ***لە راستیدا تەواوی پترزبۆرگ بگەڕێی ژنێكی لەوە بەستۆكەتر بێڕەوشت و لاڕێترت بۆ پەیدا نابێ.*** لەگەڵ ئەم تۆشكڤیچە پێوەندیی هەبوو و بە شوورەییترین و دزێوترین شێوە خەیانەتی بە مێردەكەی دەكرد. بە منی گوت هەتا بارودۆخەكەم روون نەبێتەوە ئامادە نییە تەنانەت ناویشم بێنێ. پێتوانەبێ من ئەو بە هاوشانی تۆ دەزانم... من تۆ بە خۆشەویستی خۆم دەزانم و باشیشت دەناسم، بەڵام نەخوازراوانە ئەوم وەبیرهاتەوە. ـ دووپاتیشی كردەوە: دەی ئێستا پێمبڵێ، ئەلكسی چیی بە تۆ گوت؟

ـ گوتی: لەبەر خاتری تۆش و خۆشی ئازار دەكێشێ. رەنگە بڵێی بە هۆی خۆپەرستییەوەیە، بەڵام خۆپەرستییەكی رەوا و بەنرخە و جێگای رێزە. ئەو دەیهەوێ بەر لە هەموو شتێك كچەكەی ببێتە شەرعی و هەروەها مێردی تۆ بێت و بە شێوەی یاسایی لەگەڵتدا بێت.

ئانا خەمبارانە قسەكەی پێبڕی و گوتی: كام ژن، كام كلفەت دەگونجێ لەم بارودۆخەی مندا بێ و لە من زیاتر سەر لە پێناوی پیاوێك بێت؟

ـ گرینگترین شت كە ئەو دەیهەوێ ئەوەیە كە تۆ ئازار نەكێشی.

ـ ئەوە بە هیچ شێوەیەك ناگونجێ. دەی چیی تریش؟

ـ دوای ئەویش شتێكە كە زۆر شەرعییە، یانی منداڵەكانی ئێوە ناوی ئەویان بەسەرەوە بێت.

ئانا پێلووی تێكبەزاند و رووی لە دالی وەرگێڕا و لێیپرسی: كام منداڵان؟

ـ ئانی و ئەو منداڵانەی كە دواتر دەتانبێ.

ـ لەو بابەتەوە خەیاڵی ئاسوودە بێ، من منداڵی دیكەم نابێت.

ـ چۆن دەتوانی بڵێی كە ئیتر منداڵت نابێت؟

ـ نا، ئیتر منداڵم نابێت، چونكە نامەوێ ببێت.

ئانا بەو هەموو هەیەجانەوە كە تووشی هاتبوو بە دیتنی حاڵەتی روخساری دالی كە كونچكاوییەكی ساویلكانەی تێكەڵ بە ترس و سەرسووڕمانی پێوە دیاربوو، گرژییەوە.

ـ دوای نەخۆشییەكەم دوكتۆر پێیگوتم كە ..........................................

دالی كە چاوانی بە هۆی سەرسووڕمانەوە زەقبووبوونەوە گوتی: شتیوا هەر نابێـ ئەو دۆزینەوەیە بۆ ئەو لەو دۆزینەوانە بوو كە كاردانەوە و ئاكامەكەیان هێندە گەورەیە كە سەرەتا مرۆڤ هەست دەكات كە فكری تەواوی رووبەری ئەوی نەگرتۆتە بەر و دەبێ زۆر زۆری بیر لێبكاتەوە.

ئەم هەواڵە کتوپڕە دەرگای ئەو راز و نهێنییانەی بۆ خستە سەر گازی پشت کە چەند وەخت بوو لێی داخرابوو، ئەویش ئەو بنەماڵانە بوون کە منداڵێك یان دووانیان هەیە و بیر و هەستێکی دژوازی لە مێشکیدا زەق کردەوە کە نەیتوانی هیچ بڵێت و تەنیا بە واقوڕمانەوە چاوی تێبڕی. ئەمە هەر ئەو شتە بوو کە ئەو رۆژە لە ماوەی رێگادا بیری لێدەکردەوە و وەك خولیایەك مێشکی داگرتبوو، بەڵام ئێستا کە بۆی دەرکەوت ئەو شتە مەحاڵ نییە ترس دایگرت. هەستی دەکرد کە ئەمە چارەسەرێکی سادەیەی بۆ کێشەیەکی زۆر گەورە و دژوار.

دوای ماوەیەك بێدەنگی بە زمانی فەرەنسی گوتی: ***ئەم کارە لەگەڵ ئەخلاق هیچ سازگارییەکی نییە.***

ـ بۆچی؟ بیری لێبکەوە، من ناچارم یەکێك لەو دوو رێگایە هەڵبژێرم. یان زگم پڕ بێ، یان نەخۆش، یان تەنیا دۆست و هاوڕێی مێردەکەم بم، چونکە ئەلکسی لەگەڵ مێرد هیچ جیاوازییەکی نییە ـ ئەو بە ئانقەست ئەم قسەیەی بە لەبزێکی خەمساردانە و کەمتەرخەمانە دەربڕی.

داریا ئەلکساندرۆڤنا گوتی: بەڵێ، بەڵێ، هەڵبەت ـ ئەو قسانەی ئانا هەر ئەو بەڵگەهێنانەوانە بوو کە ئەو خۆی سەبارەت بە خۆی دەیهێنایەوە، بەڵام ئەمجارەش زیاتر لە پێشوو قانعی نەکرد.

ئانا، وەك ئەوەی فیکرەکەی ئەوی خوێندبێتەوە گوتی: بۆ تۆ، یان بۆ کەسانی تر لەوانەیە هێشتا لەو بارەوە دڕدۆنگی رەوابێت، بەڵام بۆ من... تۆ دەبێ لەوە تێبگەی کە من ژنی ئەو نیم. پێوەندیی من و ئەو پێکەوە هەتا کاتێك بەردەوامە کە خۆشیبوێم. ئێستا من دەتوانم لە چ رێگایەکەوە ئەشقی ئەو بپارێزم؟ لەگەڵ ئەم؟ ـ دەستە سپی و ناسکەکانی خۆی بە مەبەستی نواندنی دووگیانی لەبەر سکیدا گرت.

خەیاڵ و بیرەوەریی زۆر، وەك ئەوەی تووشی هەیەجان و شڵەژانێکی زۆر بووبێ، بەو شێوەیە نائاسایی و زۆر بە گوشار هۆمەنیان بۆ بیرگەی داریا ئەلکساندرۆڤنا هێنا. بەخۆی گوت «من نەمتوانی ستیڤا شەیدای خۆم بکەم و خۆشەویستییەکەی بپارێزم. ئەو منی وەلانا و لەگەڵ کەسێکی تر دەستی تێکەڵکرد، بەڵام هەر ئەو ژنەش کە لەبەر ئەو خەیانەتی بە من کرد نەیتوانی بە جوانی و شۆخوشەنگیی خۆی خۆشەویستی و ئەشقی ئەو مسۆگەر بکات. ستیڤا ئەویشی بەجێ هێشت و لەگەڵ ژنێکی تر تێکەوت. یانی بەڕاستی ئانا دەتوانێ کۆنت ڤرۆنسکی بەو شێوەیە بۆخۆی راگرێ و کەویی بکات؟ ئەگەر کۆنت بە دوای ئەو شتانەوە بێت ژنانی تەڕپۆش و

شۆخوشەنگ و بەدەوی جوانتر لە ئەو دەدۆزێتەوە. هەرچەندیش قۆڵ و باسکی سپی و ناسك و جوان بن و بەژنوباڵای لەبار و دڵڕفێن بێت و روخسارە سوور و سپییەکەی لە ژێر چینی بسکە رەشەکەیدا پیاو شەیدا بکات، دۆزینەوەی ژنانی جوانتر و دڵڕفێنتر لەو دژوار نییە، هەروەك بۆ میردە سووك و چرووك و نەگبەتەکەم لەگەڵ ئەوەدا خوێنشیرینیشە، دژوار نەبوو.»

دالی وەڵامی نەدایەوە و تەنیا هەناسەیەکی هەڵکێشا. ئەم هەناسەیە کە نیشاندەری ئەوەبوو لەگەڵیدا هاوڕا نییە و ئانا لەڕێوە تێگەیشت و درێژەی بە قسەکانیدا. بەڵگەی زۆر قایمتری لەلا بوو کە نەدەکرا هیچ وەڵامێکییان بۆ بدۆزێتەوە.

ـ تۆ دەڵێی ئەمە کارێکی باش نییە. بەڵام دەبێ بیری لێبکرێتەوە تۆ بارودۆخی منت لە بیردەچێ. چۆن دەتوانم دیسان منداڵم ببێ؟ ئازاری نەخۆشی هیچ، لێی ناترسم، بەڵام بیری لێبکەوە پێناسی منداڵەکانی من دەبێ بەچێ؟ منداڵانێکی قوڕبەسەر کە دەبێ باری ناوی پیاوێکی بێگانە لەسەر شانی خۆیان تامڵ بکەن. بەو لەدایکبوونەی خۆیان ناچاربن لە دایکیان و باوکیان و خۆیان شەرمەزار بن.

ـ کەوایە هەر بەو هۆیە وەرگرتنی تەڵاق پێویستە.

بەڵام ئانا گوێی بۆ رانەدەگرت. دەیویست هەموو ئەو بەڵگانەی کە لەو چەند وەختەدا لە دڵی خۆیدا لێکی دابۆوە و هیوای پێیان هەبوو بە وردی بۆی بگێڕێتەوە و ئەوەی لە دڵیدایە هەڵیڕێژێ.

ـ ئەگەر ئاوەزێك کە پێمدراوە بۆ بەرگری کردن لە دووگیانبوون و هێنانە سەر دنیای منداڵانی چارەڕەش وەگەڕی نەخەم، کەوایە ئەو ئاوەزە بەکەڵکی چی دێت؟

چاوی لە دالی کرد بەڵام لەسەر وەڵام رانەوەستا و درێژەی پێدا: من هەمیشە خۆم لە هەمبەر ئەو منداڵە چارەڕەش و بەستەزمانانەدا بە خەتابار دەزانم. ئەو منداڵانە ئەگەر نەیەنە سەردنیا چارەڕەش نابن و ئەگەر بێن و چارەڕەش بن تاوانی چارەڕەشییەکەیان تەنیا لە ئەستۆی من دەبێت.

ئەوانە هەمووی ئەو بەڵگانەبوون کە داریا ئەلکساندرۆڤنا بۆخۆی دەهێنایەوە، بەڵام ئێستا دەیبیست و قەبووڵی نەدەکردن. بەخۆی دەگوت «چۆن دەگونجێ کەسێك تاوانی بوونەوەرێکی لە ئەستۆ بێت کە هێشتا لەدایك نەبووە؟» لە ناکاویش ئەو بیرە بە مێشکیدا هات «یانی دەکرێ بارودۆخێك بێتەپێشێ کە نەبوونی گریشای جگەرگۆشەی باشتر بێت لە بوونی؟» ئەو

بیرەشی هێندەی بەلاوە چەوت و سەیر بوو کە سەری راوەشاند تاکوو ئەو کێشە و ئالۆزییەی کە شێتانە مێشك و بیری داگرتبوو لەسەری خۆی بڕەوێنێ.

گوتی: نا، نازانم، بەڵام ئەوەندە دەزانم دروست نییە ـ شوێنەواری بێزاری لە روخساریدا خۆی نواند.

ـ بەڵێ، بەڵام ئەوەت لە بیرنەچێ کە تۆ کێی و من کێم ـ لەگەڵ ئەوەی ئەو هەموو بەڵگەیەی پێبوو و هەمووشیان هیچ و بێبنەما بوون، وەك ئەوەی خۆی ئاگاداربێت کە کارەکەی دروست نییە درێژەی پێدا: بێجگە لەوەش، ئەم خاڵە گرینگەت لە بیرنەچێت کە بارودۆخی من ئێستا لەگەڵ بارودۆخی تۆ زۆر جیاوازە. کێشەی تۆ ئەوەیە کە ئیتر منداڵت نەبێ. بەڵام بۆ من مەسەلە ئەوەیە کە حەزدەکەم منداڵم ببێ یان نا؟ ئەو دوو دانەش زۆر جیاوازن. تۆ دەبێ تێبگەی کە من لەم هەلومەرجەی ئێستادا ناتوانم ویستێکی ئەوتۆم هەبێ.

داریا ئەلکساندرۆڤنا ئیتر وەڵامی نەدایەوە. لەناکاو وای هەست کرد کە زۆر لە ئانا دوورکەوتۆتەوە و کێشەگەلێکیان لەنێواندایە کە بە هیچ شێوەیەك بیروڕایان یەك ناگرێتەوە و هەر بەو هۆیەش وا باشترە لەوە زیاتر لە سەری نەڕۆن.

## بیست و چوار

دالی گوتی: کەوایە واچاکە ئەگەر بۆم بلوێ تۆزێك بەو بارودۆخەی خۆم رابگەم.

ئانا گوتی: بەڵێ، ئەگەر بلوێ ـ لە ناکاو دەنگی گۆڕاو بە شێنەیی و خەمبارانە گوتی: دالی، حەزناکەم لەوبارەوە بدوێین.

داریا ئەلکساندرۆڤنا کە شوێنەواری خەمێکی قورسی بە روخساری ئاناوە دی گوتی: باشە، باسی ناکەین. من ئەو خەمە قورسەی تۆ دەبینم کە چۆن لە سەر دڵت بۆتە بار.

ـ من؟ قەت وانییە! من زۆر دڵخۆشم و لە ژیانی خۆم رازیم. مەگین نەتدیوە چ ئاورێکم کردۆتەوە؟ ڤسلۆڤسکی...

داریا ئەلکساندرۆڤنا کە دەیویست باسەکە بگۆڕێ گوتی: با، راستت دەوێ من ئەو لەبز و هەڵسوکەوتەی ڤسلۆڤسکیم بە دڵ نییە.

ـ ئەیەڕۆ، نا نا! ئەوە بۆ ئەوەیە تۆزێ ئەلکسی ختووکە بدەم، تەنیا ئەوە. ڤاسنکا منداڵە و بە تەواوی لە ژێردەستی خۆمدایە. تێدەگەی؟ من هەرچۆنێکم پێخۆشبێ هەڵیدەسووڕێنم. دالی، ئەو بۆ من وەك گریشای تۆ وایە... ـ لەناکاویش باسەکەی گۆڕی. گوتی: تۆ دەڵێی من لەڕادەبەدەر خەمبارم. تۆ ناتوانی تێبگەی. من زۆر لە بارودۆخێکی تاڵدام. هەوڵ دەدەم ئەو بارودۆخە رەشەی خۆم بنوێنم.

ـ بەڵام بە بڕوای من دەبێ بیری لێبکەیتەوە و هەر کارێك کە پێویستە بیکەی.

ـ ئاخر، دەبێ چ بکەم؟ هیچ! تۆ دەڵێی لەگەڵ ئەلکسی ژیانی هاوبەش پێکبێنم!ـ لەپڕ سوورهەڵگەڕا. هەستا سەرپێ و سینگی دەرپەڕاند، هەناسەیەکی هەڵکێشا و بە نەرمی لەنێو ژوورەکەدا دەستیکرد بە پیاسەکردن و جارجار رادەوەستا: بیر لە مەسەلەکە ناکەمەوە... رۆژێك، تەنانەت سەعاتێکیش نییە کە من بیر لەو کێشەیە نەکەمەوە و لە دەستی ئەو بیرکردنەوەیە خۆم سەرکۆنە نەکەم. چونکە ئەو فیکر و خەیاڵانە لەوانەیە پیاو شێت بکەن ـ دووپاتی کردەوە: بەڵێ، پیاو شێت دەکەن. کاتێك ئەو بیرانە لە مێشکمدا گاڵە دەکەن و دەهارووژێن بەبێ مۆرفین خەوم لێناکەوێ. بەڵام بەهەرحاڵ، وەرە با بە خۆێنساردی قسە بکەین. پێمدەڵێن تەڵاق وەرگرم. دەزانم تەڵاقم نادات. ئەو ئێستا بە تەواوی لە ژێر کاریگەریی کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنادایە.

ـ دالی لەسەر کورسییەکە خۆی قیت کردەوە و بە روخسارێکەوە کە رەنجی دڵسۆزیی پێوە دیاربوو چاوی لێکرد و سەری لەگەڵ هاتوچۆکردنی ئانا دەگێڕا.

لەسەرەخۆ گوتی: دەبێ هەوڵێکی بۆ بدەی.

ئانا گوتی: باشە، هەوڵی بۆ دەدەین. باشە چ بکەین؟ ـ دیاربوو باسی بیر و خەیاڵێك دەکات کە هەزار جاری لە مێشکی خۆیدا تاوتوێ کردووە و زۆر بە رەوانی دریدەبڕین: یانی من کە رقی دنیام لێیەتی، ئەگەرچی ددانی پێدادەنێم کە تاوانم دەرهەقی کردووە و ئەویش دەرهەق بە من گەورەیی نواندووە، خۆمی لەلا چکۆڵە بکەمەوە و نامە و داواکاریی بۆ بنێرم... ئێستا وایدانێین کە من هەوڵی خۆمدا و ئەو سووکایەتییەم قەبووڵ کرد. ئەویش یان وەڵامێکی دڵشکێنانەم پێدەداتەوە، یان رازی دەبێت. گریمان رازی بوو ـ ئانا لەو کاتەدا لەوسەری ژوورەکە و لە دالی دوور بوو. لەوێ راوەستا و خۆی بە پەردەی پەنجێرەکەوە خەریك کرد و درێژەی پێدا: وایدانێین رازی بوو، بەڵام ئەی... کوڕەکەم؟... خۆ کوڕەکەم نادەن بە من. ئەو لە ژێردەستی باوکیدا گەورە دەبێ و بە چاوێکی سووك تەماشای من دەکات و بیرم لێدەکاتەوە، چونکە حاشام لە باوکی کردووە. تۆ دەبێ تێبگەی کە من ئەوم ئەگەر لە ئەلکسی زیاتر خۆشنەوێ لانیکەم بەقەد ئەوم خۆشدەوێ و هەمیشە هەردووکیانم لە خۆم خۆشتر ویستووە.

هاتەوە بۆ نێوەڕاستی ژوورەکە و لە هەمبەر دالیدا راوەستا و دەستی لەسەر سینگی دانا. بەژنوبالای بەو ربدۆشامبرە سپییەوە زۆر بەرز و قەویوقۆڵی دەنواند. سەری داختبوو و لە بنەوە چاوی لە لەشولاری لاواز و رەقەڵەی دالی دەکرد کە بەو جلوبەرگە پینەکراو و شەوکڵاوە کۆنەوە لەبەر هەیەجان دەلەرزی و بێ ئیختیار بەزەییی پێیدا دەهات.

ـ من لە دنیادا تەنیا ئەو دوو کەسەم خۆش دەوێ و ئەشقی ئەوانیش پێکەوە سازگار نییە. ناتوانم هەردووکیانم پێکەوە خۆشبوێ و تەنیا ئاواتیشم ئەوەیە کە بتوانم هەردووکیانم خۆشبوێ. ئەگەر لەوە بێبەش بم شتەکانی تر هیچیان بۆ من گرینگ نین، هەرچییەك دەبێ با ببێ. ئاخری لایەکی بە لایەکدا دەکەوێ و هەر بەو هۆیەش ناتوانم و ناشمهەوێ باسی بکەم. تۆش سەرکۆنەم مەکە، لێم مەبە بە قازییەکی سەختگیر. تۆ هێندە پاکی ناتوانی بە جوانی لەو ئازارەی من بگەیـ لێیچووە پێشێ و لە پەنایدا دانیشت. تاوانبارانە چاوی لە روخساری بڕی و دەستی گرت.

ـ تۆ چۆن بیردەکەیتەوە؟ تۆ سەبارەت بە من چۆن بیردەکەیتەوە؟ بە چاوی سووکایەتی لێممەڕوانە. من شیاوی سووکایەتی نیم، تەنیا چارەڕەشم. ئەگەر هیچ کەس چارەڕەش نەبێ، من هەم ـ ئەوەی گوت و رووی کرد بەولاوە و دەستیکرد بە گریان.

دالی کە تەنیا کەوت لە خودا پاڕایەوە و دوای دۆعاکردن لەسەر پێخەفەکەی راکشا و سیچەنی گرت. هەتا ئەو کاتەی کە گوێی بۆ قسەکانی ئانا شل کردبوو لە ناخەوە دڵی پێی دەسووتا بەڵام ئێستا نەیدەتوانی خۆی وادار بکات کە بیری لێبکاتەوە. یادی ماڵەکەی و بەتایبەت منداڵەکانی بە شکۆیەکی تازە و ترووسکەیەکی بێوێنەوە لە خەیاڵیدا درەوشایەوە. ئەم دنیا چکۆڵە ئێستا هێندە بەلایەوە شیرین و خۆشەویست بووبوو کە بە هیچ نرخێك ئامادە نەبوو رۆژێکی تری لێدوور بێت و بڕیاریدا بەیانی زوو بگەڕێتەوە بۆ لای بنەماڵەکەی.

لەوکاتەدا ئانا گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی. پەرداخێکی هەڵگرت و چەند تکە دەرمانی تێکرد کە بەشێکی زۆری مۆرفین بوو، نای بە سەرییەوە و ماوەیەك بێدەنگ دانیشت و پاشان ئارام و بەنەشە رۆیشت بۆ ژووری خەوەکەی.

کاتێك چووە ژووری خەوەکەیان ڤرۆنسکی بە وردی چاوی لە چاوی بڕی. لە شوێنەواری ئاخافتنێك دەگەڕا کە دەیزانی دوای مانەوەیەکی ئاوا درێژخایەن لە ژوورەکەی دالی دەبێ پێوەی دیاربێت. بەڵام لە دەموچاویدا، کە نیشاندەری شتێك بوو و دەتگوت سوورهەڵگەڕاوە و وەخۆهاتۆتەوە و دیسان بزر بۆتەوە، جگە لە جوانی هیچی تری تێدا بەدی نەکرد، ئەگەرچی شتێکی تازە نەبوو بەڵام هەروا دڵڕفێن بوو و هەروەها ئاناش کە لە جوانیی خۆی ئاگاداربوو و

حەزی لێبوو جوانییەکەی زیاتر شوێن لەسەر ڤرۆنسکی دانێ و ئەو کاریگەرییە مسۆگەر بکات. ڤرۆنسکی نەیدەویست بپرسێ لەگەڵ دالی باسی چییان کردووە، بەڵام هیوادار بوو ئانا خۆی شتێك بڵێ.

بەڵام ئانا تەنیا گوتی: زۆرم پێخۆشە کە تۆ دالیت کەوتۆتە بەردڵ، ژنی چاکە نا؟

ـ بەڵام من لەمێژە دەیناسم. ئەو ژنێکی زۆر مێهرەبانە. بەڵام لەڕادەبەدەر بیرکورتە. لەگەڵ ئەوەشدا من بە هاتنی زۆر خۆشحاڵ بووم.

دەستی ئانای گرت و بە چاوێکی پڕ پرسیارەوە لە چاوی راما.

بەیانیی رۆژی دوایی داریا ئەلکساندرۆڤنا، سەرەڕای حەول و پێداگریی زۆری خانەخوێکان، خۆی بۆ گەڕانەوە ئامادەکرد. فایتوونەوان بەو کۆتە نیوداشتە و کڵاوە کۆنەیەوە کە دەتگوت کڵاوی عارەبەوانەکانە بە روخسارێکی گرژ و ئاکارێکی توندوتۆڵەوە ئەسپە ناهاوڕەنگەکانی لە فایتوونە چەپرەکەکە کرد کە چەرمی گێلگیرەکانی دڕاو و پینەکراو بوون و هێنای بۆبەر دەرگا خیزڕێژکراوەکە.

ماڵئاوایی کردن لە پرێنسس ڤارڤارا و پیاوەکان بۆ داریا ئەلکساندرۆڤنا تەکلیفێکی ناخۆش بوو کە بە تووشییەوە بوو. دوای رۆژێك مانەوە ئەویش و میوانەکانیش بە روونی هەستیان کردبوو کە پێکەوە دانوویان ناکوڵێ و باشتر وایە رەوشتی تا دووری پووری لەبەرچاو بگرن. تەنیا ئانا خەمناك بوو. دەیزانی دوای رۆیشتنی دالی ئیتر هیچ کەس وەك ئەو هەستی نابزوێنێ. هەڵەسوون هێنانەوەی ئەو هەستانە بۆ ئانا زۆر تاڵ و بەژان بوو بەڵام دەیزانی کە بەرزترین و پاکترین بەشی رۆحی ئەو بەشە بوو کە ئەو هەستانە شوێنیان لەسەر دانابوو، ئەو بەشە زۆر زوو لەنێو ناپاکییەکانی ژیانیدا ئەوق دەبوو.

داریا ئەلکساندرۆڤنا کە گەیشتە دەشتەکە هەستی بە ئۆخژنێك کرد لە دڵی خۆیدا و دەیویست لە هاوڕێکەی بپرسێ کە لە ماڵی ڤرۆنسکی چۆنیان بۆ گوزەراوە، کە لەناکاو فیلیپی فایتوونەوان دەستیکرد بە قسەکردن و گوتی:

ـ خودا دەزانێ چەندە دەوڵەمەند بوون، بەڵام تەنیا سێ ئایەرەیان وێنجە پێداین و ئەسپەکان هێشتا رۆژ نەبووبۆوە ئاخوڕەکانیان لێسدابوو. سێ ئایەرە، تەنیا بەرکوڵی ئەسپەکانی ئێمەیە. لەم کاتەی ساڵدا وێنجە لە کاروانسراکانی سەرەڕێ چل و پێنج کاپك زیاتر نییە، ئێمە ئەسپی میوانەکانمان هەتا بخۆن بۆیان تێدەکەین.

نووسیار وتەکانی فایتوونەوانی پشتڕاست کردەوە: ئەو سایەوشکانە کوا ئەربابن.

دالی پرسیی: ئەسپەکانیان چۆن بوون؟

ـ ئەسپەکانیان قسەیان لەسەر نەبوو. نان و چێشتەکانیان زۆر خۆش بوو، بەڵام داریا ئەلکساندرۆڤنا، زۆر بێتاقەت بووم ـ دەموچاوی جوان و مێهرەبانی خۆی بۆ لای ئەو وەرسووڕاند و گوتی: نازانم، داریا ئەلکساندرۆڤنا، ئێوە خۆشتان رابوارد؟

ـ نا، منیش تاقەتم بەسەر چووبوو. ئێستا بڵێن بزانم، ئەمشەو دەگەینەوە؟

ـ دەبێ بگەینەوە.

داریا ئەلکساندرۆڤنا کە گەیشتەوە ماڵێ و دیتی هەموویان ساغ و بەتایبەت مێهرەبان و دڵخۆشن، زۆر بە گەشە و نەشەوە باسی سەفەرەکەی خۆی بۆ گێڕانەوە و هەروەها باسی میوانداریی گەرموگوڕ و خانەخوێی و ماڵی بەشکۆ و پڕ بریقوباق و زەوق و سەلیقەیان و گەشت و گەڕان و رابواردنەکانیانی کرد، ئیجازەشی بە هیچ کەس نەدا بە باری لۆمە و زەمکردندا زمانی بگەڕێ.

ئێستا بە راستوێژییەکی زۆرەوە گوتی: دەبێ ئانا و ڤرۆنسکی بناسی و پاشان داوەرییان لەسەر بکەی. من ئێستا باشتریان دەناسم و تێدەگەم کە زۆر مێهرەبان و دڵسۆزن ـ هەستی تەموومژاوی و ناڕەزایەتیی خۆمم لە ماڵی ئەوان بە یەکجاری لە بیرکردبوو.

## بیست و پێنج

ڤرۆنسکی و ئانا هەر لەو بارودۆخەی پێشوودا و بێ ئەوەی هیچ هەنگاوێك هەڵگرن بۆ تەڵاق، هاوین و بەشێك لە پاییزیان لە گوند رابوارد. هاتنە سەرئەوەی کە بۆ هیچ کوێ نەچن بەڵام هەرچی زیاتر بە تەنیا دەبوون و بەتایبەت لە پاییزدا کە میوانیان نەبوو، زیاتر هەستیان دەکرد کە تاقەتی تاملێ کردنی ئەو ژیانەیان نییە و دەبێ گۆڕانێکی بەسەردا بهێنن.

ژیانیان جۆرێك بوو کە وێدەچوو لەوە باشتر نەبێت. لە هیچ شتێکدا کەموکوڕییان نەبوو: لەشساغ بوون و خاوەنی منداڵێك و هیچ کام بێکار نەبوون. ئانا کاتێك میوانی نەبوو هەروا بەخۆی رادەگەیشت و زۆری کتێب دەخوێندەوە، جا چیرۆك بووایە یان کتێبگەلی بنەوەشیی پەسندی رۆژ هەمووی دەخوێندەوە. لە گۆڤار و رۆژنامەکاندا کە لە هەندەرانەوە بە دەستی دەگەیشتن کتێبی جۆراوجۆر دەناسێندران و تاریفیان لێدەکرا، ئانا بۆ هەموویان راسپاردەی دەنارد و بە وردبینییەك کە تەنیا لە کاتی دەفەرتهێنان و پشووداندا، بۆی دەگونجا

دەیخوێندنەوە. جگە لەوەش لە بواری ئەو کارانەدا کە ڤرۆنسکی پێوەیان سەرقاڵ بوو و متاڵای دەکرد و بە یارمەتیی کتێبەکان و گۆڤارە پسپۆڕییە تایبەتەکان لەو کارانە ورد دەبۆوە، بەجۆرێك کە زۆر جار ڤرۆنسکی لە بواری کشتوکاڵ و بیناسازی یان تەنانەت پەروەردە و راهێنانی ئەسپ یان وەرزشدا راستەوخۆ پرسیاری لێدەکرد، زۆر جاریش بە هۆی زانیاریی زۆر و وردبینی و داڵغەیەوە تووشی سەرسووڕمان دەبوو. سەرەتا دوودڵ بوو کە وەڵامە راستەکانی ئانای دەبیست و داوای بەڵگەی لێدەکرد. ئاناش ئەو وەڵامانەی کە دابوویەوە لە کتێبەکاندا دەیدۆزییەوە و پیشانی دەدا.

بینای نەخۆشخانەکەش ماوەیەك کاتی ئەوی گرت. ئانا تەنیا یارمەتیی نەدەدا بەڵکوو پێشنیاری زۆربەی کارەکانی دەکرد یان گەڵاڵەکەی دادەڕشتن. بەڵام گرینگترین بابەتی نیگەرانیی ئانا خۆی بوو، چونکە ڤرۆنسکی زۆری خۆشدەویست و ئەویش بەو هۆیە دەیویست تەواوی ئەو شتانەی کە ڤرۆنسکی لەبەر خاتری ئەو چاوپۆشیی لێکردووە بە هەوڵی خۆی و بوونی خۆی قەرەبووی بکاتەوە. ڤرۆنسکی ئەو حەزەی ئانا کە داگیرکردنی دڵی ئەو بوو و خزمەتپێکردنی کە تاقە ئامانجی ژیانی بوو، پێیدەزانی و رێزی بۆ دادەنا، بەڵام سەرەڕای ئەوەش قایمبوونی ئەو زنجیری خۆشەویستییانەی کە ئانا هەوڵیدەدا لە دەست و لاقی بخات و بیکاتە دیلی خۆی، بە تەواوی هەستی پێدەکرد. تا دەهات زیاتر بۆیدەردەکەوت کە ئەو زنجیرە لە دەست و لاقی توند بووە و بێ ئەوەی هەوڵ بدات بۆ پساندنی و قایمییەکەی تاقی بکاتەوە، زیاتر حەزی دەکرد بزانێ ئازادییەکەی لێداگیر دەکەن یان نا. ئەگەر ئەو تامەزرۆیی ئازادییە نەبوایە کە بەردەوام پەرەی دەسەند و ئەگەر هەرجارێکیش کە بۆ بەشداریکردن لە کێبەرکێی ئەسپسواری یان بەشداریکردن لە کۆڕێکدا دەیویست بچێت بۆ شار، ناچار نەبوایە لەگەڵیدا تووشی کێشە و دەمقرە بێت، دەیتوانی بەخۆی بڵێ بەختەوەرترین پیاوی دنیا. رۆڵێك کە بۆ خۆی هەڵبژاردبوو، یانی رۆڵی مالیکێکی ساماندار و یەکێك لەو کەسانەی کە دەبوو ببێتە هێمی سەرەکیی نەجیبزادانی رووسیا، نەك زۆری بەدڵ بوو بەڵکوو ئێستا شەش مانگ بوو لە گوند دەژیا و چێژێکی زۆری لەو ژیانە وەردەگرت. جگە لەوەش کارەکەی کە بەردەوام زیاتری هۆگری خۆی دەکرد بە جوانی وەگەڕ کەوتبوو. سەرەڕای پارەیەکی زۆر کە لە نەخۆشخانەکەی خەرج کردبوو و یان بۆ کڕینی مەکینەی نوێی کشتوکاڵ کە لە سوسیراوە دەهاتن، یان کڕینی مانگای رەسەن و وەگەڕخستنی دەسمایە، دڵنیابوو کە پارەکەی خۆی بە فیڕۆ نەداوە بەڵکوو بە پێچەوانە سامانەکەی زیادی کردووە. کە باسی داهات دەهاتەگۆڕێ، جا لە فرۆشی لێڕەوار، گەنم، خوری یان ئیجارەی زەوی بوایە، هێندە رەق بوو دەتگوت بەردی سماتەیە و

لە هەمبەر حەولی بەرانبەرەکەیدا بۆ هێنانەخوارەوەی نرخەکەیان وەك کێو خۆڕاگریی دەکرد و کاپکێك نەدەهاتە خوارێ. ڕەوشتی کاروباری بەربڵاوی کشتوکاڵ، چ لێرە و چ لە ملکەکانی تری ئەوەبوو کە قەت تووشی هەڵە نەبێ و سادەترین و پڕمتمانەترین ڕێگا هەڵبژێرێ و زۆر دەستپێوگر و بە ماڵداری بوو و هێندە بە وردی دەیڕوانییە کاروبارەکانی کەسپ و ملکدارییەکەی مووی لە ماست دەردەکێشا. سەرەڕای ئەو هەموو زیرەکی و فێڵەبازییەی گزیری ئاڵمانی کە هەوڵی دەدا بۆ کڕینی شتێك هانی بدات و نرخەکانی جۆرێك دەخەملاند کە سەرەتا زۆر گرانی دەنواند، بەڵام پاشان بە هەڵسەنگاندنی سەروبەری کارەکە دەیتوانی زۆر هەرزانتر بیکڕێت و مامەڵەکە پڕقازانج بنوێنێ، ڤرۆنسکی فریوی نەدەخوارد و تەسلیم نەدەبوو. گوێی بۆ قسەکانی گزیر رادەگرت و پرسوڕای پێدەکرد، بەڵام تەنیا کاتێك ڕازی دەبوو کە ئەوەی راسپاردنی بۆ دەکات یا دامەرزاوەیەك کە پێویستە بناغەکەی دارێژێ، لە رووسیا نوێترین شت بێت و هێشتا نەناسرابێت، بەجۆرێك کە بتوانێ ببێتە هۆی سەرسامی. جگە لەوەش تەنیا کاتێك بڕیاری دەدا سەرمایەگوزاری بکات کە پارەیەکی خەوتووی زۆری لە دەستدا بێ، کە بڕیارەکەشی دەدا چکۆڵەترین پارەی کارەکەی لەبەر چاو دەگرت و هەڵیدەسەنگاند، لەسەر ئەوەش پێداگر بوو کە لە هەمبەر ئەو پارەیەدا کەوا دەیدا باشترین کاڵا و کەلوپەل بەدەست بێنێ. بەوچەشنە کارکردنەدا دیاربوو کە سامانی خۆی بەفیڕۆ نادات، بەڵکوو بە پێچەوانە قازانجێکی باشیشی دەکرد.

لە مانگی ئۆکتۆبەردا بڕیاربوو هەڵبژاردنی شۆڕای رەهێشتە لە پارێزگای کاشین بەڕێوەبچێ، کە ملکەکانی ڤرۆنسکی و سڤیاژسکی و کازنیشۆڤ و ئابلۆنسکی و بەشێکی کەم لە ملکەکەی لەڤین لەوێ هەڵکەوتبوو.

ئەم هەڵبژاردنە بەهۆی بارودۆخی تایبەت و ئەو کەسایەتییانەی کە لەو هەڵبژاردنەدا بەشدارییان کردبوو سەرنجی کۆمەڵگایان بۆ لای خۆیان راکێشابوو. لە هەموو لایەك باسی ئەو هەڵبژاردنە بوو و بە وردی و بەڕێوەجێ خەریکی ئامادەکاری بوون. ئەو کەسایەتییانەی کە دانیشتووی مۆسکۆ و پترزبۆرگ و تەنانەت دانیشتووی هەندەرانیش بوون و قەت لە هیچ هەڵبژاردنێکدا بەشدارییان نەدەکرد، بۆ ئەم هەڵبژاردنە هاتبوون و کۆ بووبوونەوە.

ڤرۆنسکی زۆر لەمەوبەرەوە بەڵێنی بە سڤیاژسکی دابوو کە لەو هەڵبژاردنەدا بەشداری دەکات.

سڤیاژسکی کە لە وازدۆڤیژنسکۆیە زۆر جار بووبووە میوانی ڤرۆنسکی، بەر لە هەڵبژاردن چوو بە دوای ئەودا تاکوو پێکەوە بچن بۆ شوێنی دەنگدان.

ڕۆژێك بەر لە وەڕێکەوتنەکەیان هێندەی نەمابوو بە هۆی ئەو سەفەرەوە دەمەقاڵێ لەنێوان ڤرۆنسکی و ئانادا ساز بێت. پاییز بوو، پاییزانەش ژیان لە گوند زۆر ناخۆش و دژوارە. بەو هۆیە ڤرۆنسکی کە خۆی بۆ کێشە ئامادەدەکرد، بە لەبزێکی وشك و سارد، بەجۆرێك کە پێشتر پێوەی نەبینرابوو قەستی خۆی بۆ ئەو رۆیشتنە بە ئانا راگەیاند. بەڵام بەپێچەوانەی چاوەڕوانییەکەی، ئانا بەوپەڕی نەرمی و ئارامییەوە پێشوازیی لە هەواڵەکە کرد و تەنیا لێیپرسی کەنگێ دەگەڕێتەوە. ڤرۆنسکی کە تێنەدەگەیشت چۆنە ئاوا ئارام و لەسەرەخۆیە، بە وردی چاوی لە چاوی بڕی. ئانا بەو روانینەی زەردەیەك نیشتە سەرلێوی. ڤرۆنسکی دەیزانی ئانا چۆن توانایی ئەوەی هەیە خۆی لەنێو خۆیدا داڵدە بدات و دەیزانی کە ئەم حاڵە تایبەتی کاتێکە کە ئانا بڕیارێکی داوە و رازی کارەکەی لە ئەو شاردۆتەوە. لەوە دەترسا بەڵام هێندە لە کێشە و دەمقرە بێزار بوو کە واینواند باوەڕی پێکردووە و هەتا رادەیەکیش دەیویست باوەڕ بکات، یانی بەڕاستی باوەڕی بە ئاقڵبوونی ئەو کردبوو.

گوتی: هیوادارم زۆر دڵی خۆت ناڕەحەت نەکەی.

ئانا گوتی: منیش هیوادارم. دوێنێ سندووقێکم کتێب لە گووتییەرەوە[٤٧] بۆ هاتووە. نا، بێتاقەت نابم.

ڤرۆنسکی بەخۆی گوت «ئەو بەئانقەست ئاوا قسە دەکات. چاکتر. دیسان بەزمەکە دەستی پێدەکرد.»

بەمشێوەیە، بێ ئەوەی لەوە زیاتر لەگەڵ ئانا بدوێ بەرەو شوێنی دەنگدان وەڕێکەوت. یەکەم جار بوو کە هەتا کۆتایی قسەی دڵیان دەرنەبڕی و دڵیان لە یەکتر پاك نەکردەوە و لێکهەڵبڕان. ڤرۆنسکی لەلایەکەوە ئەوەی پێناخۆش بوو و لە لایەکی تریشەوە بیری دەکردەوە کە ئاوا باشترە. بەخۆی گوت «سەرەتا، شتێکی وەك ئێستا و شاراوە دەبێ، بەڵام دواتر دەبێتە خووخدە. بەهەرحاڵ من ئامادەم هەموو شتێکی بدەمێ جگە لە ئازادی و سەربەستیی پیاوانەی خۆم.»

٤٧- Gautier ناوی کتێبفرۆشییەکی گەورەی فەڕەنسی بوو لە مۆسکۆ لە ساڵی ١٧٩٩ دامەزرابوو.

# بیست و شەش

مانگی سپتامبر بوو کە لەڤین بە بۆنەی زایەمانی کیتییەوە چوو بۆ مۆسکۆ. مانگێك بوو لە مۆسکۆ کاتی خۆیان بەفیڕۆ تێپەڕ دەکرد، سرگی ئیڤانڤیچ کە ملکێکی لە پارێزگای کاشین هەبوو و زۆر هۆگری هەڵبژاردنەکەی داهاتوو بوو بڕیاریدا بچێت بۆ ئەوێ و لەو هەڵبژاردنەدا بەشداری بکات، داوای لە لەڤینیش کرد کە خاوەنی دەنگێك بوو تاکوو بۆ بەشی سێلەزنیڤ[48] لەگەڵیدا بچێت. جگە لەوە لەڤین خۆشی لە پارێزگای کاشین کارێکی هەبوو ئەویش سەردانی ملکی خوشکەکەی بوو کە خۆی دانیشتووی دەرەوەی وڵات بوو، هەروەها دەبوو پارەی ئەو زەوییە لە گوندنشینەکان وەرگرێت کە پێی فرۆشتبوون.

لەڤین بۆ قەبووڵکردنی ئەو داواکارییەی براکەی دوودڵ بوو، بەڵام کیتی کە دەیدی ئەو لە مۆسکۆ هەست بە دڵتەنگی دەکات داوای لێکرد بچێت و بەبێ ئاگادارکردنەوەی ئەو رایسپارد رێدنگووتێکی تایبەتی کۆڕی رەهیشتەکانی بۆ بێنن کە بایی هەشتا رۆبڵ بوو. هەر ئەو هەشتا رۆبڵەش کە بۆ کڕینی بەرگی فەرمی خەرج کرابوو گرینگترین هۆکار بوو کە ئاخری هێنایە سەر ئەوەی بچێت. لەگەڵ سرگی ئیڤانڤیچ چوو بۆ پارێزگای کاشین.

لەڤین شەش رۆژ بوو لە کاشین بوو و هەموو رۆژێك لە کۆڕەکانی زێمستڤادا بەشداریی دەکرد و بەدوای کاروباری ملکی خوشکەکەیدا هەڵدەسووڕا و ماندووبوونەکەی بێئاکام بوو. ئەندامانی زێمستڤا هەموو سەرقاڵی هەڵبژاردن بوون و تەنانەت کارێکی زۆر سادە کە پێڕاگەیشتن بە ملکی خوشکەکەی بوو نەیتوانی بەڕێوەیبەرێت. کارەکەی تریشی کە وەرگرتنی پارەی زەوییەکانی بوو و لەگەڵ کۆسپێك بەرەوڕوو بووبوو. ئاخری دوای زەحمەتێکی زۆر و لابردنی کۆسپی سەرەڕێ، توانیی پارەکە وەرگرێت، بەڵام نووسیارەکە کە پیاوێکی زۆر مێهرەبان و دڵسۆز بوو نەیدەتوانی حەواڵەی پێدانی پارەکەی بداتێ، چونکە بۆ ئەو کارە واژۆی

---

48- Selezniev

سەرۆکی شۆڕا یان سەرۆك خانانی دەویست و سەرۆکی خانان کۆڕێکی تایبەتی هەبوو و کەفیلێکی بۆ کاروبارەکانی دەستنیشان نەکردبوو. ئەو هەڵسووڕان و ئاخافتنانە لەگەڵ فەرمانبەران کە زۆر رووخۆش و چاکەخواز بوون و دەیانزانی گرفتی کارەکەی لەکوێدایە و دەیانزانی هەقیەتی بەڵام نەیاندەتوانی گرفتەکەی بۆ چارەسەر بکەن، هەموو ئەو کێشە و گرفتانە کە هیچ ئاکامێکی نەبوو بارێکی قورس و تاقەتپڕووکێنی لەسەر دڵی لەڤین دانابوو کە وەك هەستی پڕ لە ژانی خەوتوویەك دەچوو کە دەبوو بجووڵێ بەڵام ماسوولکەکانی لە ئیختیاری خۆیدا نەبوون. ئەو زیاتر کاتی ئاخافتن لەگەڵ وکیلە دڵپاکەکەی خۆی تووشی ئەو حاڵەتە دەبوو. ئەو پارێزەرە رواڵەتەن هەرکارێکی لە دەستی بهاتبایە دەیکرد تاکوو گرفتەکەی بۆ چارەسەر بکات. زۆر جار دەهاتە پێشێ کە پێیبڵێن: ئێوە واچاکە ئەو کارە بکەن. بچن بۆ فلانجێ و ئاوابکەن و ئاوابڵێن ـ هەروەها پیلانێکی بۆ کارەکانی لەڤین دارشتبوو و بە بڕوای ئەو دەبوو بەڕێوەیبەرێت تاکوو ئەو گرفتەی کە بووبووە کۆسپی سەر رێگای لە ناویبەرێت یان وازی لێبێنێ. بەڵام لەڕێوە گوتیشی: ئەگەرچی ناهێڵن. لەگەڵ ئەوەشدا تاقیکردنەوەکەی زەرەدی نییە ـ لەڤینیش تاقیی دەکردەوە و ئەو شوێنانەی پێیانگوتبوو دەچوو و چۆنیان پێگوتبوو وای دەکرد و وای دەگوت. هەمووان چاکەی ئەویان دەویست و لەگەڵی مێهرەبان و رووخۆش بوون، بەڵام ئەو کۆسپەی کە خۆی لێ لادابوو هەمیشە لە کۆتاییی رێگادا لە بەردەمیدا شین دەبوو و رێگای لێدەگرت. لە هەمووی پڕئازارتر ئەوە بوو کە بە هیچ جۆرێك نەیدەتوانی تێبگات کە خەنیمەکەی کێیە و بە ئاکام نەگەیشتنی کارەکەی دەبێ بە قازانجی کێ بێت. ئەوە شتێك بوو کە هیچ کەس نەیدەزانی و تەنانەت پارێزەرەکەشی سەری لێی دەرنەدەچوو. ئەگەر گرفتی کارەکەی سادە بووایەت و هەر بەوڕادەیەش بۆ تێگەیشتن بووبووایە کە کڕینی بلیتی قەتار جگە لە چاوەڕوانی لە ریزی کڕیاراندا ناگونجێ، گوێی لێنەبوو. بەڵام هیچ کەس نەیدەتوانی هۆی ئەو کۆسپانەی سەرڕێگای بۆ روون بکاتەوە.

بەڵام لەڤین لەوکاتەوە زەماوەندی کردبوو زۆر گۆڕابوو. زۆر بەتاقەت و لەسەرەخۆ بووبوو و ئەگەر تێنەگەیشتبایە کە بۆچی کارەکەی وایلێهاتووە، بەخۆی دەگوت چونکە لە هەموو شتەکان ناگات و ناتوانێ داوەری بکات، حەتمەن دەبێ ئاوا بێت و هەوڵی دەدا حاسێ نەبێت.

ئێستا کە لە شوێنی دەنگدان بوو و لە هەڵبژاردنیشدا بەشداریی کردبوو هەوڵی دەدا گلەوگازندە نەکات و لەگەڵ کەسیش تووشی دەمەقاڵێ نەبێت، هەتا ئەو جێیەی کە بۆشی دەلوێ لەو کارانەدا کە کەسانێکی پاك و بەشەرەف و جێگای رێزی خۆی ئاوا بە شێوەیەکی

جیددی و تامەزرۆیانە پێوەی خەریکن لێی ورد بێتەوە و لە وردەکارییەکانی بگات. لەوکاتەوە زەماوەندی کردبوو زۆر لایەنی تازە و جیددیی ژیانی بۆ روون بووبۆوە. کە لە رابردوودا چونکە سەرساردانە لەگەڵی بەرەوڕوو بووبوو لەبەرچاوی بێبایەخی دەنواند. هەر بەو هۆیەش کاری هەڵبژاردنیشی بە جیددی دەزانی و لەوێدا بەدوای مانایەکی قووڵدا دەگەڕا.

سرگی ئیڤانڤیچ مانا و گرینگایەتیی گۆڕانێك کە بڕیاربوو لەو هەڵبژاردنەدا روو بدات بۆ لەڤینی روونکردەوە. سنێتکۆڤ[49] سەرۆك خانانی پارێزگای کاشین، بەرپرسایەتیی زۆربەی کاروبارە گرینگ و گشتییەکان، لەوانە کاروباری تایبەت بە سەرپەرستاری و چاوەدێری ئەو (یانی ئەو کارانەی کە لەڤین لە ئێستادا لەدەست خاوەخاوبوونی گازندەی هەبوو) و خەرجکردنی بڕێکی زۆر لە پارەکە کە رەهیشتەکانی پارێزگا دەیاندا و بەڕێوەبردنی کاوباری قوتابخانە دواناوەندییەکانی کچان و کوڕان و فێرگە سەربازییەکان و هەروەها بەپێی بڕیاری نوێ، دانانی فێرکاریی سەرەتایی و لە ئاکامیشدا کاروبارەکانی زێمستڤا، هەموویانی بەپێی یاسا لە ئەستۆ بوو. ئەم ئاغای سنێتکۆڤە لە رەهیشتە قەدیمییەکان و بەپێی پێوەرەکانی خۆی مرۆڤێکی بەشەڕەف و رۆحسووك بوو کە سامانێکی زۆری نابووە سەریەك بەڵام بە هیچ جۆرێك لە پێویستییەکانی سەردەم نەدەگەیشت. لە هەموو کارەکانیدا لایەنگری خانەدانەکان بوو و راشکاوانە دژایەتیی لەگەڵ پەرەگرتنی فێرکارییە گشتییەکان دەکرد و بەپێی دەستوور کە زێمستڤا دەبوو گرنگایەتییەکی زۆری هەبێ چۆنێتیی چینایەتیی پێبەخشیبوو. پێویست بوو کەسێکی پشوودرێژ و ئەمرۆیی و جیددی لە جێی ئەو داندرێ و کارەکان جۆرێك بەڕێوەبەرێت کە هەموو ئەو مووچە و دەرماڵەی دراوە بە رەهیشتەکان، ئەویش نەك لە مەقامی نەجیمزادەدا بەڵکوو وەك ئەندامێکی زێمستڤا و هەروەها هەڤیازییەك کە لەوانەیە بۆ مسۆگەرکردنی حکوومەتێکی ئازاد و بەری لە دزەکردنی رەهیشتەکانی پارێزگا بەکەڵك بێ، بیهێنێتە دەرێ. پارێزگای کاشین زۆر پڕ داهات و لە هەموو بارێکەوە لە پارێزگاکانی تر لە پێشتر بوو و ئێستاش بە بۆنەی هەڵبژاردنەوە وزەگەلی زۆر مەزنی تێدا کۆ بووبۆوە کە ئەگەر کارەکان بە شێوەیەکی شیاو بەڕێوەبچووبایەن لەوانەبوو ببێتە سەرمەشقێك بۆ پارێزگاکانی دیکە و تەنانەت هەموو رووسیاش، هەر بەو هۆیەش کاری هەڵبژاردن گرنگایەتییەکی یەکجار زۆری هەبوو. بۆ جێنشینی سنێتکۆڤ وەك پۆستی سەرۆك خانان سڤیاژسکی یان لەو باشتر

---

49- Snetkov

نەڤیدۆڤسکی[50] لەلایەن دەنگدەرانەوە پاڵێورابوون و ئەم نەڤیدۆڤسکییە مامۆستای پێشووی زانستگا و پیاوێکی زۆر بەهۆش و خاوەن ژیار و هاوڕێی زۆر نزیکی سرگی ئیڤانڤیچ بوو.

پارێزگار کاتی کردنەوەی شۆڕا لە وتەکانیدا داوای لە رەهیشتەکانی پارێزگای کرد کە لەکاتی هەڵبژاردنی کەسەکاندا بۆ پۆستی پێوەندیدار، شیاویی پاڵێوراوەکان و بەرژەوەندیی وڵات لەبەرچاو بگرن نەك دۆستایەتی و رکەبەرایەتی و گوتی هیواداره رەهیشتە بەشەرەفەکانی پارێزگای کاشین وەك هەڵبژاردنەکانی رابردوو ئەرکی پیرۆزی خۆیان ئەو جۆرەی کە پێویستە بەجێبێنن و شیاویی خۆیان بنوێنن و متمانەی بەرزی ئیمپراتوور وەدەست بێنن.

پارێزگار دوای کۆتاییهاتنی وتەکانی لە تەلارەکە چووەدەرێ و ئەشراف و رەهیشتەکان بە شادی و پلەزیقان و تەنانەت هێندێکیان بە تامەزرۆییەوە بە دوایدا چوونەدەرێ و کاتێك کە پاڵتۆ کەڵپۆسەکەی لەبەر دەکرد و دۆستانە لەگەڵ سەرۆك خانان دەدوا لە دەوری کۆزیلکەیان بەست. لەڤینیش کە دەیویست گوێی لە هەموو قسەکان بێت و هیچ نەبێت کە نەیبیستبێت، لەنێو ئاپۆرەکەدا بوو و گوێی لێبوو کە پارێزگار بە سەرەکخانانی گوت «تکایە لەلایەن خێزانمەوە بە ماریا ئیڤانۆڤنا بفەرموون کە زۆر بەداخەوەیە چونکە دەبێ سەردانی پەروەرشگە بکات و ناتوانێ بچێت بۆ دیدەنیی.» نەجیمزادان هەموو بە قسەکردن و قاقاکێشان باڵتەی خۆیان دۆزییەوە و رۆیشتن بۆ کەنیسە.

لە کەنیسە لەڤین کاتی بەجێهێنانی رێورەسمی سوێندخواردن وەك خەڵکەکەی تر دەستی گرتبۆوە و هەرچی ئوسقۆفی مەزن دەیگوت دووپاتی دەکردەوە و داواکارییەکانی پارێزگاری بە توندترین سوێند مسۆگەر کرد. رێورەسمی دۆعا لە کەنیسە هەمیشە شوێنی لەسەر لەڤین دادەنا و کاتێك کە سوێندی «خاچەکە ماچ دەکەم»ی دەربڕی و ئاوڕیدایەوە چاوی بە ئاپۆرەی پیران و لاوان کەوت کە هەموویان ئەو وتەیە دووپات دەکەنەوە، دڵی بەپڕتاو لێیدەدا و هەیەجان ناخی داگرتبوو.

رۆژی دوایی و رۆژی سێهەم کە باسەکەیان لەسەر پارەی نەجیمزادان و قوتابخانە دواناوەندییەکانی کچان بوو و بە بڕوای سرگی ئیڤانڤیچ هیچ کەڵکێکی نەبوو و لەڤین بۆ کاروبارەکانی خۆی دەبوو سەر بە هەموو شوێنێکدا بکات، لە کۆڕەکەدا بەشداریی نەکرد. رۆژی چوارەم راگەیشتن بە حیسابەکانی پارێزگا دەهاتە بەرباس و بۆ یەکەم جار لەنێوان دارودەستەی

---

50- Nevedvsky

قەدیم و تاقمی نەیاران کێشە سازبوو. لێژنەیەك کە پێڕاگەیشتنی حیسابەکانی پێسپێردرابوو بە کۆڕی گشتییان ڕاگەیاند کە حیسابەکان هەموو ڕێکوپێکە و هیچ کێشە و هەڵەیەکی تێدا نییە. سەرەك خانان هەستا و بەدەم فرمێسك هەڵوەراندنەوە سپاسی لە متمانەی کۆڕەکە کرد. ڕەهیشتە و نەجیمزادان هەموو درووودیان بۆ نارد و دەستیان گوشی. بەڵام لەوکاتەدا یەکێك لە ڕەهێشتەکان لە گورووپی سرگی ئیڤانڤیچ گوتی کە بیستوویەتی لێژنە بە حیسابەکاندا نەچۆتەوە چونکە پێیانوابووە بەو کارە دڵی سەرەك خانان گەرد دەگرێ. یەکێك لە ئەندامانی لیژنە لە رووی هەڵەشەیی و بەبێ تێبینی وتەکەی ئەوی پشتڕاست کردەوە. یەکێك لە ئامادەبووان کە لاوێکی خڕیلانە بوو و زمانی دەتگوت ئاورە بە لەبزێکی ژەهراوی گوتی: هەڵبەت ئەگەر لیژنە بە حیسابەکانی سەرەك خاناندا بچووبایەتەوە دەبووە هۆی دڵخۆشیی ئەو و ئەندامانی لێژنە بەوکارە بێجێیەی خۆیان ئەویان لەو دڵخۆشییە بێبەش کردووە. دوای ئەوە لیژنە ڕاپۆرتەکەی خۆی وەرگرتەوە و سرگی ئیڤانڤیچ بە شێوەیەکی ژیرانە و بە بەڵگەهێنانەوە دەستی پێکرد کە لیژنە دەبێ ڕاشکاوانە ڕایگەیێنێ کە بە حیسابەکان ڕاگەیشتووە، پاشان سڤیاژسکی و دوای ئەویش لاوە زمانئاگرینەکە قسەیان کرد. باسەکە زۆری خایاند و بێئاکام مایەوە. لەڤین پێیسەیر بوو کە باسەکە لەوبارەوە ئاوا درێژەی پەیدا کرد و بەتایبەت بەو هۆیەی کە لە براکەی پرسی یانی بە بڕوای ئەو دەبێ گوژمەیەك لەو پارەیە بە داروبەرددا درابێ یان باشقڵ درابێ، سرگی ئیڤانڤیچ وەڵامی دایەوە:

ـ نانا، ئەو پیاوێکی ڕاست و بەشەڕەفە. بەڵام دەبێ کۆتایی بەو شێوە کۆن و خۆمانە و ریشسپییانەیەی بەڕێوەبردنی شۆڕای ڕەهیشتەکان بێنن.

ڕۆژی پێنجەم هەڵبژاردنی شۆڕای ناوچەییی ڕەهیشتەکان بەڕێوەچوو و کارەکە لە هێندێك مەڵبەند زۆری شەڕوشۆڕ و قرموقاڵ لێکەوتەوە. سڤیاژسکی لە ناوچەی سلزنیسك هەر لە دەوری یەکەمدا بە زۆرترین دەنگ هەڵبژێردرا و بەوبۆنەوە لەماڵەکەی خۆی میوانییەکی وەڕێخست.

# بیست و حەوت

ڕۆژی شەشەم هەڵبژاردنی پارێزگا بەڕێوەچوو. تەلارە گەورە و بچووکەکانی پارێزگا لە خەڵکی خانەدان جمەیان دەهات و هەموو یۆنیفۆرمی جۆراوجۆریان لەبەردا بوو. زۆربەیان هەر ئەو ڕۆژە گەیشتبوونێ. ئەو دۆست و ئاشنایانەی لەمێژبوو یەکتریان نەدیتبوو، لە هەموو لایەکەوە هاتبوون، یەکێك لە کریمەوە، ئەوی تر لە پترزبۆرگ یان لە ولاتانی هەندەرانەوە هاتبوون و لە تەلارەکاندا کۆ بووبوونەوە و یەکتریان دەدیتەوە.

ڕەهیشتە و خانەدان لە تەلارە جۆراوجۆرەکان و هەموو شوێنێك بە گورووپی گەورە و چکۆڵە دابەش بووبوون و بەو ڕوانینە گوماناوی و دەخەزدارانەیەی هێندێکیاندا و بە بێدەنگبوونیاندا کاتی نزیکبوونەوەی غەریبەیەك و لەوەی کە هێندێکیان لەگەڵ یەکتر خەریکی سرتوخورت بوون و تەنانەت دەچوونە سووچێکی دووری دالانەکە، لەڕێوە بۆتدەردەکەوت کە هەرکام لەو گورووپانە خەریکی شاردنەوەی نهێنییەکن. ئامادەبووان بە ڕواڵەت دیاربوو کە بە دوو دەستەی زۆر جیاواز دابەش بوون: یەکیان لاوان و ئەوی تریان بەساڵاچووان. بەساڵاچووان زیاتر یۆنیفۆرمی قەدیمیی خانەدانەکانیان لەبەردا بوو کە قۆپچەکانیان هەتا سەرێ هەڵپێکرابوون و شمشێریان بە نێوقەدی خۆیاندا هەڵواسیبوو و کلاوی تایبەتیان لەسەر نابوو. هەموویان نیزامی بوون و بەپێی ئەو پۆستەی کە تێیدا خزمەتیان دەکرد یان کردبوویان، یۆنیفۆرمی هێزی زەریایی یان سوارەنیزام یان لەشکری پیادەیان لەبەرکردبوو. یۆنیفۆرمی ڕەهیشتە بەساڵاچووەکان بە دابی قەدیم دوورابوون، بە شانە هەڵمساوەکانیاندا دیاربوو کە چکۆڵە بوونەتەوە و بە بەریان تەنگن و کەمەرەکەیان هەڵکشابوون. دەتگوت خاوەنەکانیان دوای دوورینی یۆنیفۆرمەکە لەپڕ گەورە بوون. بەڵام دەستەکەی دیکە کە لاوان بوون یۆنیفۆرمی خانەدانەکانی ئەمڕۆیان لەبەردا بوو بە یەخەی ئاوەڵا و کەمەری داچۆڕاو و شانی پان و هێلەگی سپییەوە، یان یۆنیفۆرمەکەیان ملیوانەکەی ڕەش بوو و گەڵا زەیتوونی لەسەر زەڕیچن کرابوو کە نیشانی وەزارەتی داد بوو. ئەو کەسانەی

کە یۆنیفۆرمی دەربارییان لەبەردا بوو جێجیّ کوڕەکانیان دەڕازاندەوە و هەموو سەر بە دەستەی لاوەکان بوون. بەڵام ئەم جیاوازییەی لاوان و بەساڵاچووان لەگەڵ تاقمبازیی سیاسیی ئەوان یەکی نەدەگرتەوە. هێندێك لە لاوەکان وەك لەڤین بۆی دەرکەوت، سەر بە دەستەی بەساڵاچووان بوون و بەپێچەوانەش هێندێك لە رەهیشتە پیرەکان لەگەڵ سوڤیاژێسکی خەریکی چپە و سرتە بوون و دیاربوو لە لایەنگرانی پەڕوپاقورسی دەستەی لاوانن.

لەڤین لە یەکێك لە تەلارە چکۆڵەکان، کە تایبەتی جگەرەکێشان و خواردن و خواردنەوە بوو، لە پاڵ دەستەکەی خۆی راوەستابوو و گوێی بۆ قسە و باسەکانیان راگرتبوو، تەواوی وزەی زەینیی خۆی خستبووەکار بۆ ئەوەی شتێك لەو باسوخواسانەیان هەڵکرێنیّ بەڵام هەوڵەکەی بێئاکام بوو. سرگی ئیڤانڤیچ کانوونێك بوو کە هەمووان لە دەوری کۆدەبوونەوە. ئەو ئێستا گوێی بۆ سوڤیاژێسکی و خلیۆستۆڤ بە باشی گرتبوو کە سەرەك خانانی ناوچەیەکی تر و لە گرووپی خۆیان بوو. خلیۆستۆڤ بە باشی نەدەزانی کە لەگەڵ هەڵبژاردەکانی ناوچەی خۆیان داوا لە سنیێتکۆڤ بکات دیسان خۆی بپاڵێوێتەوە و سوڤیاژێسکی هەوڵی دەدا قانعی بکات کە ئەم کارە پێویستە و سرگی ئیڤانڤیچیش لەگەڵی هاوڕا بوو. لەڤین نەیدەزانی بە چ هۆیەك دەبیّ داوا لە رێبەری گوروویە نەیارەکەیان بکەن کە لە هەڵبژاردندا بە داخوازیی خۆی بچێتە پێشیّ، لە لایەکی تریشەوە دەیدی هەموویان حەز بە شکستخواردنی دەکەن.

ستیپان ئارکادیچ کە یۆنیفۆرمی ئاجوودانیی لەبەردا بوو و لە خواردنەوە دەگەڕایەوە و بە دەسرەیەکی ناسکی بۆنخۆش لێوی خۆی دەسڕی لێیان هاتەپێشیّ و لەگەڵ ئەوەی دەستی بە ریشی خۆیدا دەهێنا و رێکوپێکی دەکرد گوتی: دەی سرگی ئیڤانڤیچ، دەبیّ بابەتەکەی خۆمان دیاری بکەین ـ کە گوێشی بۆ ئاخافتنەکەی ئەوان راگرت بیروڕای سوڤیاژێسکیی پەسند کرد.

ـ ناوچەیەك تەواوە و سوڤیاژێسکی دیارە سەر بە گورووپی نەیارە ـ هەموویان جگە لە لەڤین لە قسەکەی تێگەیشتن و بەڕاستیان زانی.

ئابلۆنسکی رووی لە لەڤین کرد و لەگەڵ گرتنی قۆڵی گوتی: دەی، کۆستیا، تۆش کەوتوویە نەشە؟ ـ لەڤین قسەیەکی وای پێنەبوو کە بیخاتە نەشە، بەڵام سەری لە کارەکانیان دەرنەدەچوو و لەگەڵ ئابلۆنسکی چەند هەنگاوێك لە کوڕەکە دوورکەوتنەوە و ددانیپێدانا کە زۆری پیّ سەیرە دەیانهەویّ سەرۆکی پێشووی شۆڕای پارێزگا هان بدەن دیسان لە هەڵبژاردندا بەشداری بکاتەوە و خۆی بپاڵێویّ.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: پەککوو لە دەست ئەو دڵە پاك و سادەیەی تۆ! ـ چۆنێتیی کارەکەشی بە بەیانێکی کورت و روون بۆ باسکرد. ئەگەر وەك هەڵبژاردنەکانی رابردوو هەموو ناوچەکانی پارێزگا داوا لە سەرۆك خانان بکەن دیسان خۆی بپاڵێوێ ئەو بە زۆربەی دەنگ هەڵدەبژێردرێتەوە. ئێمە نامانهەوێ ئەوە سەربگرێ. دیارە هەشت ناوچە پشتیوانیی لێدەکەن. ئەگەر دوو ناوچە پشتیوانیی لێنەکەن لەوانەیە سنیتکۆڤ زویربێت و بکشێتەوە. ئەگەر واشی لێبێت گورووپی نەیار کەسێکی تر لە ئەندامانی خۆی وەکوو پاڵێوراو هەڵدەبژێرێت و ئەو کاتە هەموو حیسابەکانی ئێمە تێکدەچن. بەڵام ئەگەر تەنیا ناوچەیەك، یانی سوڤیاژێسکی، پشتیوانیی لێنەکات سنێتکۆڤ خۆی دەپاڵێوێ و تەنانەت هێندێك لە نەیاران دەنگی پێدەدەن، بەجۆرێك کە کاتێك بۆ هەڵبژاردنی پاڵێوراوی گورووپەکەی ئێمە دەنگدان بەڕێوەبچێت تاقمێك لە گورووپی نەیار بەهۆی نەزاکەتەوە دەنگی پێدەدەن.

لەڤین تاڕادەیەك لەو پلانە گەیشت بەڵام نەك بە تەواوی و دەیویست چەند پرسیاری تری لێبکات کە لەناکاو هەموو دەستیانکرد بە قسەکردن و بە قرموقاڵ و ژاوەژاو بەرەو تەلاری گەورە وەڕێکەوتن.

ـ چۆن؟ چی؟ کێ؟ نامەی بریکاری؟ بەکێ؟ چۆن؟ رەتیان کردەوە؟ نامەی بریکاری قەبووڵ نییە! فلێرۆڤ قەبووڵ ناکەن؟ دەی وایدانێین دەوسیەشی هەبێ. ئەگەر ئاوابێ هیچ کەس نابێ قەبووڵ بکەن. ئەوە خوێڕییەتییە. وڵات یاسای هەیە ـ لەڤین لەملاولاوە گوێی لەو قسانە دەبوو و لەگەڵ خەڵکەکە کە بە هەڵەداوان دەڕۆیشتن بۆ ئەوەی هەموو شتێك ببیستن و ببینن، بێ ئەوەی خۆی بزانێ بۆ کوێ، خۆیکرد بە نێو ئاپۆرە و پاڵەپەستۆی پیاوماقووڵاندا و گەیشتە تەلاری گەورە، چووە نزیك ئەو مێزەی کە سەرۆکی شۆڕای رەهیشتەکانی پارێزگا و سوڤیاژێسکی و چەند کەسایەتیی بەرجەستەی تر لە دەوری دانیشتبوون و بە گەرمی خەریکی دەمەتەقێ بوون.

# بیست و هەشت

لەڤین لێیان دوور بوو. سیخەسیخی سینگی یەکێك لە خانەدانەکان کە لەپاڵ ئەودا ڕاوەستابوو و سیڕەسیڕی کەوشی پیاوێکی زەبەلاحی تر لەولایەی ترەوە نەیدەهێشت گوێی لە قسەکانیان بێت و بە روونی حاڵیببێت. ئەو دەنگی نەرمی سەرۆك شۆڕای ڕەهیشتەکان و دەنگی جیکن و ناخۆشی لاوە قسەڕەقەکە و دوای ئەویش دەنگی سوڤیاژێسکیی لە دوورەوە دەبیست. تا ئەو جێیەی ئەو تێدەگەیشت باسەکە لەسەر لێکدانەوەی مادەیەکی یاسا و مانای دەستەواژەی «بۆ بە دوادا چوون» دەم بە دەم دەگەڕا.

کوڕەکە لێك بڵاوبوو تاکوو ڕێگا بۆ سرگی ئیڤانڤیچ بکەنەوە کە دەیویست بچێت بۆ لای مێزەکە. سرگی ئیڤانڤیچ ڕاوەستا هەتا قسەی لاوە قسەتاڵەکە تەواوبوو، پاشان گوتی کە بە بڕوای ئەو باشترین کار ئەوەیە یارمەتیی لە یاسا وەرگرن و داوای لە نووسیارەکە کرد کە مادە یاسای ئەو بابەتە بدۆزێتەوە. لەو مادەیەدا یاسا بە ڕاشکاوی گوتبووی ئەگەر جیاوازیی بیروڕا لەگۆڕێدا بێت دەبێ هەڵبژاردن بە دەنگدان بێت.

سرگی ئیڤانڤیچ دەقی مادەکەی خوێندەوە و خەریکبوو ماناکەی روون دەکردەوە کە مالیکێکی کەڵەگەتی تەژەی پشتکووڕ کە سمێڵی خۆی ڕەنگ کردبوو و ملیوانەی یۆنیفۆرمە تەنگەکەی پشتملی ڕێکدەگوشی، قسەکەی پێبڕی. خۆی گەیاندە لای مێزەکە و بە ئەنگوستیلەکەی خۆی بە توندی کێشای بە مێزەکەدا و گوڕاندی:

ـ دەنگ بدرێ، دەنگ. ئەم هەموو لەسەرڕۆیشتنەی ناوێ، دەنگ بدرێ.

لەوکاتەدا چەند کەس پێکەوە هەڵیاندایە و کابرای کەڵەگەت، کە بە ئەنگوستیلەکەی کێشابووی بە مێزەکەدا، زیاتر رقی هەستا و جارلەگەڵ جار دەنگی هەڵدێنا بەڵام بۆت دەرنەدەکەوت چیدەڵێ.

ئەویش پێشنیارەکەی سرگی ئیڤانڤیچی هەبوو بەڵام دیاربوو لە ئەو و گورووپی لایەنگرانی بێزارە و بێزارییەکەشی تەواوی گورووپەکەی ئەوی تەنیوەتەوە و ناڕەزایەتیی گورووپی نەیار کە

ئەوانیش تووڕە بووبوون بەڵام بەهۆی لەبەرچاوگرتنی نەزاکەتەوە ددانیان بەخۆیاندا گرتبوو. هەموو دەنگیان هەڵێنا و بۆ ماوەی خولەکێك بوو بە کەسلەکەس و سەرۆکی شۆڕای رەهیشتەکان ناچار داوای لە ئامادەبووان کرد هێمنایەتی بپارێزن.

گوڕەو هەرا و هاواری شێتانە و پڕ لە تووڕەیی لە هەموولایەکەوە بەرزبۆوە و دەیانگوت «دەنگدان، دەبێ دەنگ بدرێ، ئەگەر کەسێك لە رەهیشتەکان بێت تێدەگا... ئێمە ئامادەین لەو رێگایەدا گیانی خومان بەخت بکەین... ئیمپراتووڕ متمانەی بە ئێمە کردووە... سەرۆکی شۆڕای خانەدان نابێ بکەوێتە بەرپرسیار... خۆ ئەو دەفتەرداری ئێوە نییە... ئیجازە بدەن دەنگ بدرێ...» دەموچاوەکان لە لەبز و راوێژیان تووڕەتر بوو. گڕی رق و تووڕەیی لە چاویاندا بڵێسەی دەکێشا. قینێکی ئەستوور لە روانینیاندا شەپۆلی دەدا. لەڤین نەیدەزانی کێشەکە لەسەر چییە و بەهۆی ئەو کێشە و ئاژاوەیەوە کە لەسەر دەنگدان و پێدانی مافی دەنگدان بە فلێرۆڤ بوو سەری سووڕمابوو و هیچی بۆنەدەچۆوە سەریەك. سرگی ئیڤانڤیچ پاشان بە روونی بۆی باسکرد کە" بەرژەوەندیی کۆمەڵگا وایدەخواست کە سەرۆکی شۆڕای خانەدانانی پارێزگا لەسەر کار لاببرێ. ئەوان بۆ لابردنی ئەو پێویستیان بە زۆرینەی دەنگەکان هەبوو. بۆ وەدەستهێنانی زۆرینەی دەنگەکانیش پێویست بوو کە فلێرۆڤ ماڤی دەنگپێدانی هەبێ و بۆ سەلماندنی مافی دەنگپێدانی ئەویش ناچاربوون ئەو مادە یاسایەی گۆرین شرۆڤە بکەن.

سرگی ئیڤانڤیچ ئاوا گەیشتە ئاکامی روونکردنەوەکەی: تەنانەت یەك دەنگیش لەوانەیە ئاکامی هەڵبژاردنەکە بگۆڕێ. بۆیە ئەگەر بمانهەوێ لە رێگای بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگادا هەنگاو هەڵگرین دەبێ زۆر بە شێوەیەکی جیددی تێوەبچین و لە رووی مەنتیقەوە کار بکەین.

بەڵام لەڤین ئەو بابەتەی لەبیرچووبۆوە و زۆری بەلاوە دژوار بوو کە ئەم مرۆڤە بەشەرەفانەی کە رێزیان بۆ دادەنێ ئاوا بە شڵەژاوییەکی دزێو و دەغەزدار و رق لەزگ بیانبینێ. چاوەڕێ نەما ئەو باسە تەواوبێت و لە چنگی ئەو هەستە ناخۆشە نەجاتی بێ، خۆی کرد بە تەلارە چکۆڵەکەدا کە جگە لەو پێشخزمەتانەی کە لە دەوری مێزەکە سەرقاڵ بوون هیچ کەسی تری لێنەبوو. کە دیتی پێشخزمەتەکان خەریکی خاوێنکردنەوەی قاپووقاچاخ و چنینی کەوچك و دەورییەکانن و چاوی بە دەموچاوی هێمن و بێخەمیان کەوت هەستێکی پڕ لە ئۆقرە و چاوەڕواننەکراو دڵی داگرت. دەتگوت لە هەوای کپ و بۆگەنیوی ژوورێکی دەرگا داخراوەوە هاتۆتە نێو هەوای پاك و ئازادەوە. دەستیکرد بە پیاسەکردن و بە چێژەوە چاوی لە پێشخرمەتەکان دەکرد. یەکیان کە ریشێکی سپیی لەسەر لاجانگی هێشتبۆوە و بە بێزاری

چاوی لەو پێشخزمەتە لاوانە دەکرد کە گاڵتەیان پێدەکرد، خەریکبوو فێری قەدکردنی دەسرەی سەرسفرەی دەکردن و لەڤین زۆری کەیف بەوەهات. خەریکبوو سەری قسە لەگەڵ کابرا پیرە بکاتەوە کە نووسیاری دایرەی سەرپەرستیاریی شۆڕای خانان، کە پیرەپیاوێك بوو، شانازیشی ئەوەبوو کە هەموو خانەدانەکانی پارێزگا بە ناوی چکۆڵە و ناوی باوکیانەوە دەناسیێ، ئەوی بۆ لای خۆی بانگکرد.

گوتی: ببوورە کۆنستانتین دیمیتریچ، براکەت لێتدەگەڕێ، دەبێ دەنگبدەی.

لەڤین رۆیشت بۆ نێو تەلارەکە و توپیلکەیەکی چکۆڵەیان دایەدەستی و لەگەڵ سرگی ئیڤانڤیچی برای چوون بۆ لای مێزێك کە سوڤیاژێسکی قۆڕساخ و مەند لە پشتی راوەستابوو و بزەیەکی تەشەراوی بە روخسارییەوە دیاربوو و نووکی ریشی لە قولمیچەیدا کۆکردبۆوە و هەڵێگێڕابۆوە بۆ بەرلووتی و بۆنی پێوە دەکرد. سرگی ئیڤانڤیچ دەستی بردە پێشێ و تۆپیلکەکەی خۆی لە شوێنێك دانا. پاشان جێگاکەی خۆیدا بە لەڤین بەڵام لەوێ دوورنەکەوتەوە. لەڤین هاتە پێشێ بەڵام تەواو لە بیری چووبۆوە کە مەسەلەکە چییە و شەرمەزارانە رووی لە سرگی ئیڤانڤیچ کرد و پرسیی: لە کاملا داینێم؟ ـ ئەو پرسیارەشی زۆر بە هێواشی و لە کاتێکدا کرد کە دەوروبەرییەکان قسەیان دەکرد، دەیویست هیچ کەس گوێی لە دەنگی نەبێ. بەڵام لەوکاتەدا هەموو بێدەنگ بوون و پرسیارە نابەجێیەکەیان بیست. سرگی ئیڤانڤیچ نێوچاوانی گرژ کرد و بە لەبزێکی جیددی گوتی: ئەوە پێوەندیی بە رای خۆتەوە هەیە.

هێندێك لە ئامادەبووان بەو پرسیار و وەڵامە، گرژینەوە. لەڤین سوورهەڵگەڕا و بەپەلە دەستیکرد بە ژێر ئەو ماهووتەدا کە دابوویان بە سەر سندووقەکەدا و چونکە تۆپیلکەکەی بە دەستی راستییەوە گرتبوو راست خستییە نێو پارێزەکی لای راستەوە. هەرکە تۆپیلکەکەی دانا وەبیری هاتەوە کە دەبوو بیخاتە پارێزەکی لای چەپەوە بەڵام تازە کار لەکار ترازابوو، بۆیە زۆر بەخۆدا شکاوە و بەپەلە رۆیشت بۆ ئەوسەری تەلارەکە. دەنگی نووسیار کە نەیدەتوانی پیتی «ڕ» بە جوانی بێژ بکات هەستا و ئاکامی دەنگدانەکەی راگەیاند: سەت و بیست و شەش دەنگی ئەرێنی و نەوەد و هەشت دەنگی نەرێنی ـ پاشان دەنگی قاقا و پێکەنین بەرزبۆوە چونکە قۆپچەیەك و دوو گوێزیشیان لەگەڵ تۆپیلکەکان خستبووە نێو سندووقەکەوە. بەمشێوەیە لێوەشاوەیی فلێرۆڤ پەسند کرا کە دەنگی پێبدرێت و گوروویی نوێخوازان سەرکەوتن.

بەڵام تاقمی کۆنەپارێز خۆیان بە دۆڕاو نەدەزانی. لەڤین گوێی لێبوو کە داوایان لە سنێتکۆڤ دەکرد دیسان خۆی بپالێوێ و دیتی کە تاقمێك لە خانەدانەکان لە دەوری سەرۆکی خانان کۆ بوونەتەوە و ئەویش قسەیان بۆ دەکات. لەڤین لێیان نزیکبۆوە. سنێتکۆڤ لە وەڵامیاندا دەیگوت کە رێزی هەیە بۆ متمانە و خۆشەویستییان بەڵام شایانی ئەوە نییە چونکە تەنیا هونەری ئەو هۆگری و وەفادارییە بە خانانی پارێزگا کە دوازدە ساڵ بە گیان و بەدڵ خزمەتی پێکردوون. چەند جار دووپاتی کردەوە کە: هەتا ئەو جێیەی لە دەستم هات بەڕاستی و بە بیر و باوەڕەوە خزمەتم کرد و رێزم بۆ هۆگری و متمانەتان هەیە و سپاس.... ـ لەناکاویش ئۆناقێك گەرووی گوشی و بەدەم گریانەوە لە تەلارەکە چووەدەرێ. جا ئەو گریان و فرمێسك هەڵوەراندنە بە هۆی زوڵمێکەوە بوو کە لێیکرابوو یان بە هۆی ئەو هۆگرییەی خانانەوە یان بارودۆخی نالەباری ئێستایەوە بوو کە خۆی لە تەنگژەی رق و توڕەییی خەنیمانیدا هەست پێدەکرد، هەرچییەك بوو شوێنی لە سەر دەوروبەرییەکانیشی دانا و زۆربەی رەهیشتە و خانەدانەکان دڵیان پڕ بوو، تەنانەت لەڤینیش دڵی پێیسووتا.

سەرۆکی شۆڕای خانان لەبەر دەرگاکەدا لووتی بە لووتی لەڤیندا تەقی. سەرەتا وەك ئەوەی لەگەڵ غەوارەیەك قسە بکات، گوتی: ببوورە، داوای لێبوردن دەکەم، تکاتان لێدەکەم بفەرموون... ـ بەڵام کە لەڤینی ناسییەوە شەرمنانە گرژییەوە. لەڤین پێیوابوو دەیهەوێ شتێك بڵێ بەڵام دیتی کە بە هۆی شڵەژانەوە قسەی بۆنایە. حاڵەتی دەموچاوی و یۆنیفۆرمەکەی و نیشانە و خاچەکانی و پانتۆڵە سپییەکەی کە بە ئاکارە توندەکەی رادەتەکان نێچیرێکی بازرە و داماوی وەبیری لەڤین هێنایەوە کە هیچ دەرەتانێکی نەماوە. ئەم حاڵەتەی دەموچاوی سەرۆکی شۆڕای خانان بە توندی لەڤینی شڵەژاند و شوێنی لەسەر دانا، چونکە راست رۆژێك پێشتر بۆ کارێکی خۆی چووبوو بۆ ماڵەکەی و ئەوی بەوپەڕی قوڕساخی و شکۆی باوکێکی دڵۆڤانەوە لەنێو خاوخێزانەکەیدا دیتبوو. ماڵێکی گەورە بوو، بە قەنەفەی جوان و قەدیمی رازابۆوە، کە میراتی باوباپیرانی بوو و پێشخزمەتەکانی نە تەرپۆش بوون و نە زۆر پاکوخاوێن، بەڵام بەساڵاچوو و بەڕێز بوون، کە دیاربوو یادگاری سەردەمی کوێلەدارین کە دەستیان لە خزمەتی ئەربابی قەدیمی خۆیان هەڵنەگرتووە و چاوی بە ژنەکەشی کەوتبوو کە خاتوونێکی قەڵەوە و رووخۆش و ساویلکە بوو، شەوکڵاوێکی رازاوە بە تۆڕ و دامتەلی لە سەر نابوو، شاڵێکی تورکیی بە شانیدا دابوو و نەوە جوانکیلەکەی خۆی دەلاواندەوە کە (کچەزای بوو). کوڕەکەشی لە قوتابخانە هاتەوە کە مێرمنداڵێك بوو پۆلی شەشەمی دەخوێند، سڵاوی لە باوکی کرد و

دەستە گەورە و پانەکەی ماچکرد، ئەوانە هەمووی لەگەڵ ئاکاری دلۆڤانانە و وتەی نەرم و پڕخۆشەویستی و گەرمی باوکانەی خانەخوێ ڕێزێکی نەخوازراوانەی لە دڵی لەڤیندا گووراندبوو و هاودڵییەکی لە ناخیدا بەدی هێنابوو. دیتنی ئەو پیرەپیاوە ئێستا لەڤینی شڵەژاندبوو و زۆری دڵ پێیدەسووتا و دەیویست شتێکی پێبڵێ و دڵی وەدەست بێنێ.

گوتی: گوێی مەدەیە، ئێوە هەروا سەرۆکی شۆڕای خانانی ئێمە دەبن.

پیرەپیاو ترساوانە چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد و گوتی: پێمواننییە. من پیرم و شەکەت بووم. کەسانێکی شیاوتر و لە من بەتواناتر هەن. دەبێ جێگا بۆ ئەوان چۆڵ بکەین.

ئەوەی گوت و خۆی کرد بە دەرگایەکی تەنیشت خۆیدا.

پڕشکۆترین سات بەسەردا هات. دەبوو دەنگدان بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکی شۆڕا دەستپێبکات. بەڕێوەبەرانی هەردوو گورووپەکە بەهیوای سەرکەوتنی خۆیان بوون و بە قامك حیسابی ئەو تۆپیلکە ڕەش و سپییانەیان رادەگرت کە وێدەچوو وەدەستی بهێنن.

ئاکامی ئاخافتن سەبارەت بە مافی دەنگپێدانی فلێرۆڤ تەنیا ئەو دەنگەی بە نسیبی گورووپی نوێخواز نەکرد بەڵکوو دەرفەتی پێدان کە پیلانی گورووپی کۆنەپارێزان پووچەڵ بکەنەوە کە چەندکەس لە خانەدانەکانیان لە دەنگدان بێبەش کردبوو. یاریدەدەرانی سنێتکۆڤ دوو کەس لە دەنگدەرەکانیان وەسەر هەوای شەڕابخواردنەوە خستبوو و چونکە ئەو دوو کەسە نەیانتوانیبوو لە هەمبەر وەسوەسەی مەینۆشیندا خۆڕاگری بکەن، مەست و کەلەلا کەوتبوون و یۆنیفۆرمی کەسێکی تریشیان دزیبوو.

گورووپی نوێخوازان کە لەو ماجەرایە ئاگاداربوون لەو ماوەیەدا کە ئاخافتن سەبارەت بە فلێرۆڤ بەردەوام بوو چەند کەس لە خۆییەکانیان بە فایتوون نارد تاکوو بۆ ئەو نەجیمزادە بێبالّتەیە، بالّتەی تازە بهێنن و یەکێك لە سەرخۆشەکانیشیان تۆزێ هێنایەوە سەرخۆ و هێنایان بۆ تەلاری هەڵبژاردن.

مالیکێك کە چووبوو بە دوایاندا تاکوو بیانهێنێ لە سوڤیاژێسکی چووە پێشێ و گوتی: یەکیانم هێنا. ئاوی ساردم بە سەریدا کرد و وەهۆشم هێنایەوە. دەتوانێ دەنگ بدات.

سوڤیاژێسکی سەرێکی لەقاند و گوتی: زۆر سەرخۆش نییە؟ دەتوانێ بە پێوە راوەستێ؟

ـ نا، وشیار بۆتەوە. بە مەرجێك کە ئیتر دەرخواردی نەدەن. بووفەدارەکەم راسپاردووە کە بە هیچ شێوەیەك و تەنانەت دلۆپێك ڤۆدکاشی پێنەدەن.

# بیست و نۆ

ڕەهیشتە و نەجیمزادان لە تەلارێکی باریك کە بەندوبەساتی خواردن و خواردنەوەی لێدابینکرابوو، کۆ بووبوونەوە. هەیەجان جارلەگەڵ جار دایدەگرتن و شوێنەواری شڵەژان لە روخساریاندا خۆی دەنواند. لە هەمووی توندتر دڵەخورپەری بەڕێوەبەرانی دوو لایەنەکە بوو کە ئاگایان لە هەموو وردەکارییەکان هەبوو و دەیانزانی دەنگە ئەرێنی و نەرێنییەکان چەندەیە. ئەوان فەرماندەرانی خەبات و تێکهەڵچوونێك بوون کە زۆر زوو دەستی پێدەکرد. خانەدانەکانی تریش، وەك سەربازانی ئاسایی، ئەگەرچی خۆیان بۆ بەربەرەکانێ ئامادەدەکرد بەڵام زیاتر خەریکی کەیف و رابواردن بوون. تاقمێك راوەستابوون و هێندێکیش لە پشت مێزەکان دانیشتبوون و پاروویان بادەدا، تاقمێکی تریش لەنێو تەلارە باریکەکەدا پیاسەیان دەکرد و جگەرەیان دەکێشا و لەگەڵ دۆستانی پێشوویان کە لەمێژ بوو چاویان بە یەکتر نەکەوتبوو خەریکی ئاخاوتن بوون.

لەڤین ئیشتیای بۆ هیچ نەدەچوو و جگەرەشی نەدەکێشا. نەیدەویست لە گورووپەکەی خۆی واتە سرگی ئیڤانڤیچ و ستیپان ئارکادیچ و ئەوانی تر نزیك ببێتەوە. چونکە ڤرۆنسکی بە یۆنیفۆرمێکی کەلبەدوونکراوی تایبەتەوە کە دەرەجەی ئاجوودانیی دەرباری پێوەبوو لەنێو کۆڕەکەیاندا بوو و زۆر بە گوڕوتینەوە قسەی دەکرد. لە دوێنێوە کە لە کاتی دەنگداندا چاوی پێیکەوتبوو چونکە نەیدەویست لەگەڵی بەرەوڕوو بێت هەوڵی دەدا خۆی لێنزیك نەکاتەوە و دووریی لێدەکرد. لەبەر پەنجێرەکە دانیشت و دەستیکرد بە تەماشاکردنی گورووپە جۆراوجۆرەکان و گوێی بۆ باسوخواسەکانی دەوروپشتی خۆی راگرتبوو. زۆر دڵتەنگ بوو، بەتایبەت بەو هۆیەی کە دەیدی هەمووان بەکەیف و دەماخەوە دێن و دەچن و هەرکەسەی لە بیری شتێکدایە و دڵی لەلایەکە، تەنیا ئەو و هاونشینە پیر و کەنەفتەکەی کە ددانی لە دەمدا نەمابوو و یۆنیفۆرمێکی هێزی زەریاییی لەبەردا بوو و قسەکردنەکەی بەو دەموفلچە بێددانەوە هەر فلتەی دەهات و هیچی لێحاڵی نەدەبوو، بێ ئەوەی هۆگری شتێك بن بێکار لە پەنایەك دانیشتبوون.

مالیکێکی کورتەباڵای پشتچەماوە کە قژە چەورکراوەکەی کەوتبووە سەر ملیوانەی کەلبەدوونکراوی یۆنیفۆرمەکەی و پاژنەی پۆستاڵەکانی کە نویێ بوون و وێدەچوو بە بۆنەی هەڵبژاردنەوە لە پێی کردبێتن، لە عەرزی دەدان و زۆر بە تینوتاو دەدوا و دەیگوت: کڵاوچییەکی سەیرە. من پێمگوت کە ئاوا نابێت. چۆن شتی وا دەبیێ؟ بە سێ ساڵیش ناتوانێ ئەو رادەیە دابین بکات ـ مالیك کە ئەوەی گوت بێ ئیختیار چاوێکی لەلای لەڤین کرد و خێرا و بە توندی رووی وەرگێڕا.

مالیکە وردیلەکە بە دەنگێکی جیکن گوتی: بەڵێ، ئەو کارە بۆنی ناپاکییەکەی بەرزبۆتەوە.

دوای ئەوانە تاقمێکی زۆر لە مالیکان کە لە دەوری ژینراڵێکی قەڵەوە کۆزیلکەیان بەستبوو هاتن بۆ لای لەڤین. دیاربوو لە شوێنێك دەگەڕێن کە بتوانن پێکەوە قسە بکەن و غەوارەیەك گوێی لە قسەکانیان نەبێت.

ـ چۆن دەوێرێ بڵێ من دەستوورم داوە پانتۆڵەکەی لێبدزن. حەتمەن پانتۆڵەکەی فرۆشتووە و شەڕابی پێکڕیوە. ناوی خۆشی ناوە پرێنس. قوڕمدا بە چاوی خۆی و پلەوپایەکەیدا. ئەو چەڵەی گڵاوە دەوێرێ قسەش بکات.

کەسێك لە گورووپەکەی تردا گوتی: بەڵام ئیجازە بدەن. ئەوانە پشت بە مادەی یاسا دەبەستن. سەرناوی نەجیبی و حەیای ژنان دەبێ بە شێوەیەکی فەرمی مسۆگەر بووبێ.

ـ من چکارم بەسەر یاساوە داوە؟ من سادقانە قسە دەکەم. کەڵکی نەجیبی و حەیا ئەوەیە کە مرۆڤ قسەکەی بایەخی هەیە و بڕ دەکات و دەکرێ متمانەی پێبکەی.

ـ حەزرەتی مەزن، فەرموون، کونیاك نۆش بکەن.

گوروپێکی تر دەڕۆیشتن بە دوای رەهیشتەیەکدا کە بە دەنگی بەرز شتێکی دەردەبڕی. ئەو پیاوەش یەکێك لەو کەسانە بوو کە بە فێڵ مەستیان کردبوو.

مالیکێك کە سمێڵێکی سپیی هێشتبۆوە و یۆنیفۆرمەکەی هی سەرهەنگە قەدیمییەکان بوو، بە دەنگێکی خۆش دەیگوت: من هەمیشە داوام لە ماریا سێمیۆنۆڤنا کردووە کە ملکەکەی بە ئیجارە بدات چونکە خۆی ناتوانێ هیچ داهاتێکی لێوەدەست بهێنێ ـ ئەمە هەر ئەو مالیکە بوو کە لەڤین لە ماڵی سوڤیاژێسکی دیتبووی. لەڕێوە ناسییەوە. مالیکەکەش بە وردی چاوی لە لەڤین کرد و ناسییەوە و پێکەوە سڵاو و چاکوخۆشییان کرد.

ـ زۆر خۆشحاڵم بە دیتنت. چۆن دەتوانم لەبیرم بچێتەوە؟ زۆر چاکم لە بیرە. ساڵی رابردوو بوو، لە ماڵی نیکۆلای ئیڤانئیچ، سەرۆکی شۆڕای خانانی ناوچەکەمان.

لەڤین پرسیی: دەی، بارودۆخی مڵکەکەتان لەچیدایە؟

کابرای مالیك لەلای لەڤین راوەستا و بە بزەیەکی بەیدەستانە و بە لەبزێکی ئاسوودەوە کە نیشاندەری ئەوەبوو چارەیەك نییە و کارەکە هەروا دەبێ، وەڵامی دایەوە: هەروا وەك پێشوو. زەرەد لەدوای زەرەد ـ پاشان لێیپرسی: ئێوە چۆن رێتان کەوتە ئەم پارێزگایەی ئێمە: هاتووی لەم **کۆدەتایەی** ئێمەدا بەشداری بکەیت؟ ـ ئەم وشە فەرەنسییەی زۆر خراپ بێژ دەکرد و جەختی لەسەر دەکرد: هەموو رووسیا لێرە کۆ بوونەتەوە، تەنانەت ئاجوودانەکانیش، تەنیا وەزیرەکان نەهاتوون ـ کە ئەوەی گوت ئاماژەی بە ستیپان ئارکادیچ کرد کە بە پانتۆڵی سپی و یۆنیفۆرمی ئاجوودانییەوە لەگەڵ ژنیراڵێك پیاسەی دەکرد.

لەڤین گوتی: دەبێ ددانی پێدابنێم کە لە مانای ئەم هەڵبژاردنەی رەهیشتەکان ناگەم.

مالیك چاوێکی لێکرد.

ـ تێگەیشتنی ناوێ. چونکە هیچ مانایەك لە گۆڕێدا نییە کە تێیبگەی. دەزگایەکی بەخەسار چووە. بەڵام کەوتۆتە گەڕ و هێشتا جووڵەیەك دەکات. چاو لەوانە بکە بەو یۆنیفۆرمە پڕزریقە و بریقانەیانەوە. من لە ئێوە دەپرسم ئێرە مەکۆی قازییەکانی ناوچە و ئەندامانی هەمیشەییە یان مەکۆی خانان و پرێنسەکان؟

لەڤین پرسیی: تۆ خۆت بۆچی هاتووی؟

ـ یەکەم بەپێی خووخدە. دووهەم بۆ ئەوەی پێوەندی دامەزرێنم. ئەمەش جۆرێك ئەرکی ئەخلاقییە. جگە لەوەش، ئەگەر راستت دەوێ، کارێکی تایبەت بە خۆمم هەیە. زاواکەم دەیهەوێ ببێتە ئاندامی شۆڕا. ئەوان دەستەنگن و من دەمهەوێ ئەو پلەوپایەی بۆ مسۆگەر بکەم ـ ئاماژەی بەو لاوە دەمتیژە کرد کە لەسەر مێزی پارێزگار قسەی کردبوو و پرسیی: بەڵام ئەوانە بۆچی دێن؟

ـ ئەوانە بەرەی نوێی رەهیشتەکانن.

ـ لەسەر نوێ بوونەکەیان قسەم نییە. بەڵام نەجیبییەکەیان چیت عەرز بکەم. نەجیب ئێمەین. بەڵام نەجیبی لادێیی. ئەوانە لە پلەوپایەی نەجیبدا خەریکن خۆیان دەکوژن.

ـ بەڵام ئێوە لەسەر ئەو باوەڕەن کە نەجیبزادە و رەهیشتە سیستەمێکی بەخەسارچووە.

ـ هەڵبەت، ئیتر کۆن بووە و تەمەنی خۆی رابواردووە. بەڵام دەبێ رێزی بۆ دانێین. بۆ وێنە ئەم سنێتکۆڤە... ئێمە باش یان خراپ هەزار ساڵ گەشەمان کردووە. دەزانی، ئەگەر ئێوە بتانهەوێ بەر ماڵەکەتان بکەنە باخچە، گەڵاڵەی بۆ دادەرێژن. جا ئەگەر دارێکی سەد ساڵە لەو نێوەدابێ، با دارەکە

خواروخێچ و گرێگرێش بێت بەڵام بۆ باخچەی گوڵ ئەو دارە نابڕنەوە. گەڵاڵەی باخچەکەتان وا دادەڕێژن کە پیرەدارەکە بیڕازێنێتەوە. ئەگەر ئەمڕۆ نەمامێك بچەقێنی خۆ بە ساڵێك و دوو ساڵ نابێتە پیرەدار ـ ئەم قسەیەی بە پارێزەوە دەربڕی و هەر خێرا قسەکەی گۆڕی و پرسیی: دەی دۆخی کاروباری ئێوە چۆنە؟

ـ بۆ تاریف نابیٚ. پێنج لە سەد زیاترم داهات نابێت.

ـ بەڵێ، بەڵام ئێوە کار و ئەرکی خۆتان ناهێننە ئەژمار. ئاخر کارەکەی خوشتان بایخی هەیە. من باسی خۆمتان بۆ دەکەم. بەر لەوەی خۆم لەسەر مڵکەکە بم لە دەوڵەتدا خزمەتم دەکرد و ساڵی سێ هەزار ڕۆبڵم مووچە وەردەگرت. ئێستا ئەرکیشم زیاتر بووە و وەك تۆ ساڵی پێنج لە سەد زیاترم بۆ نامێنێتەوە. ئەویش ئەگەر خودا پشتیوان بێت ڕووداوێکی خراپ نەقەومێ. ئەو زەحمەتەی خۆم لەسەر مڵکەکە دەیکێشم لە هیچ کوێ نایەتە ئەژمار.

ـ دەی ئەگەر زەرەدی هەیە بۆ دەستی لێهەڵناگری؟

ـ کارە، ئیتر چ بکەم؟ خووم پێگرتووە. جگە لەوەش پیاو لێبڕوونە دەبێ ئەو کارە بکات. ـ مالیك کە دەمی گەرم داهاتبوو، هەنیشکی لەسەر لێواری پەنجێرەکە دانا و درێژەی پێدا: بێجگە لەوەش بۆ لە ئێوەی بشارمەوە کوڕەکەم دانووی لەگەڵ کشتوکاڵ ناکوڵێ، دیارە کەوتۆتە سەر هەوای زانست. بۆیە کەس نییە دوای مردنم درێژە بە کارەکەم بدات. ئەوەش بەجێی خۆی، مرۆڤ بۆیە کار دەکات تاکوو سەرقاڵ بێت. بۆ وێنە ئەمساڵ باخێکی میوەم چەقاندووە.

لەڤین گوتی: بەڵێ، بەڵێ، ئەو فەرمایشتەتان ڕاستە. من هەمیشە واهەست دەکەم کە لە کاری کشتوکاڵدا بەڕادەی زەحمەتەکەم داهاتم بۆ نامێنێتەوە... بەڵام مرۆڤ لە هەمبەر زەویوزارەکەیدا هەست بە بەرپرسایەتی دەکات.

مالیك درێژەی بە قسەکانی دایەوە: جا با شتێکت پێبڵێم. جیرانەکەی من بازرگانە. ڕۆژێك هاتبوو بۆ سەردانم. مڵکەکەی خۆمم نیشاندا. لەنێو باخەکەدا پیاسەمان دەکرد گوتی: «دەزانی ستیپیان ڤاسیلیچ، کاری زەویوزاری ئێوە زۆر باشە بەڵام مشووری باخەکەتان ناخون.» ئەگەرچی باخەکەی من هیچ عەیبێکی نییە و من زۆر جوانی پێڕادەگەم. گوتی «ئەگەر من لەجێی ئێوە بووایەم ئەو دارە زیزفۆنانەم دەبڕی. بەڵام ئیتر کاتی بەسەر چووە. دەبێ کاتێك شیلەکەیان هەڵدەچێ بیبڕیتەوە. ئێوە هەزار بنە داری زیزفۆنتان هەیە کە هەرکامیان ڕێك دوو دانە ڕاژەی تێدا دەبێ. ئەمساڵ ڕاژە و ئاڵوودار بۆ میچی خانووبەرە بازاڕەکەی گەرمە و لە حەوا دەیقۆزنەوە.»

لەڤین کە دیاربوو زۆر لەگەڵ ئەو حیساباتە تێکەوتووە بە بزەیەکەوە درێژەی بە بەڵگەهێنانەوەکانی مالیکدا: بە پارەکەشی ئاژەڵ و زەویوزاری بەلاش دەکڕێت یان بە سووتوسەلەم

دەیدا بە گوندنشینەکان. خەڵکی ئاوا دەوڵەمەند دەبن. من و ئێوەش ئەگەر بتوانین مڵکەکەمان وەك خۆی بپارێزین و بۆ عەولادەکانمانی بەجێ بێڵین دەبێ شوکری خودا بکەین.

مالیك گوتی: بیستوومە ژنت هێناوە، وایە؟

لەڤین بە هەستێکی گەرم و سەربەرزانەوە وەلامیدایەوە: بەڵێ... بەڵێ، بارودۆخی ئێمە زۆر سەیرە. ئێمە بەبێ لەبەرچاو گرتنی داهاتوو دەژین. هەر دەڵێی راسپاردەین و وەك گاورەکان ئاگرێکی پیرۆزمان داییساندووە و ناهێڵین بکووژێتەوە.

مالیك لە ژێر سمێڵە سپییەکەیدا زەردەیەکی گرت و گوتی: هێندێك لە ئێمە وەك ئەم دۆستانەمان نیکۆلای ئیڤانڤیچ یان لەم دواییانەدا ئەم کۆنت ڤرۆنسکییە، کە هاتووە بۆتە دانیشتووی گوند و دەیانهەوێ کشتوکاڵی سەنعەتی وەڕێ بخەن. بەلام ئەو کارەیان تا ئێستا جگە لە بەفیڕۆدانی سامانەکەیان هیچ ئاکامێکی تری نەبووە.

لەڤین گەڕایەوە سەر باسەکەی پێشوو و لێیپرسی: بەلام بۆ ئێمەش ئەو پێشنیارەی بازرگانەکە نەگرینەگوێ و ئەو دارە زیزفۆنانە ببڕین و دەستبکەین بە دروستکردنی کاریتە و ئالۆدار بۆ میچ و بانی خانووبەرە؟

ـ خۆتان گوتتان. بۆ ئەوەی پارێزگاری لە ئاگرە پیرۆزەکە بکەین. جکە لەوەش ئەمە کاری رەهیشتەکانی لادێ نییە. ئێمەش وەك نەجیمزادەیەك، کارمان ئەوەنییە لێرەبین. هەڵبژاردن و ئەمجۆرە گەمانە کاری مرۆڤە نەجیبەکانە، کاری سەرەکیی ئێمە لە سەحرایە و لە سووچی تەنیاییی خۆمان. ئێمەش خاوەنی خۆماکێکی پیشەییین و دەزانین چ کارێك شیاوە و چ کارێك نابێ بکرێ. مووژیکەکانیش هەروان. هێندێ جار دەبینین مووژیکێکی باش ئەوەندە زەوی بە ئیجارە دەگرێ کە بتوانێ بە جوانی داهاتی لێوەدەست بێنێ. زەوییەکەی هەرچەندیش خراپ بێ دەیکێڵێ. ئەویش ناڕوانێتە داهاتوو. بۆیە تووشی زیان دەبێت و دەست لە کارەکەی هەڵدەگرێ.

لەڤین گوتی: راست وەك ئێمە ـ کە چاویشی بە سێڤیاژێسکی کەوت دێت بۆ لایان گوتی: زۆر خۆشحاڵم چاوم پێتان کەوت.

مالیك بە سێڤیاژێسکیی گوت: ئێمە دوای دیدارەکەمان لە ماڵی ئێوە یەکەم جارە یەکتر دەبینینەوە. تۆزێ دەمەتەقێمان کرد.

سێڤیاژێسکی بە بزەیەکەوە گوتی: دەی، رەخنەتان لە سیستەمی کشتوکاڵی نوێ گرت؟

ـ ئەوەشمان لە بیرنەکرد.

ـ کولۆکۆی دڵمان هەڵڕشت.

## سی

سێڤیاژێسکی قۆڵی لەڤینی گرت و لەگەڵی رۆیشت بۆ لای خۆییەکان. ئێستا ئیتر نەیدەتوانی خۆی لە ڤرۆنسکی لابدات و لەگەڵی بەروەڕوو نەبێت. ئەو لەلای ستیپان ئارکادیچ و سرگی ئیڤانڤیچ راوەستابوو و راست چاوی لە لەڤین بڕیبوو کە دەهاتە پێشیێ.

دەستی لەڤینی گوشی و گوتی: خۆشحاڵم بە دیتنتان. وادیارە پێشتریش شانازیی چاوپێکەوتنی ئێوەم هەبووە... لە ماڵی پرێنسس ئیشچر باتسکی.

لەڤین شینهەڵگەڕا و گوتی: بەڵێ چاکم لە بیرە ـ هەر خێراش رووی وەرگێڕا و لەگەڵ براکەی دەستیکرد بە قسەکردن.

ڤرۆنسکی زەردەیەکی کەمڕەنگ نیشتە سەرلێوی و درێژەی بە قسەکانی لەگەڵ سێڤیاژێسکیدا. دیاربوو حەزناکات سەریقسە لەگەڵ لەڤین بکاتەوە. بەڵام لەڤین کاتی قسەکردن لەگەڵ براکەی لە پەستا لایدەکردەوە و چاوی لە ئەو دەکرد، لە بیری ئەوەدابوو کە چۆن سەری قسەی لەگەڵدا بکاتەوە، تاکوو هەڵسوکەوتە وشك و بێئەدەبانەکەی خۆی قەرەبوو بکاتەوە.

ڕووی لە سێڤیاژێسکی و ڤرۆنسکی کرد و پرسیی: ئێستا ئیتر کێشەکە چییە؟

سێڤیاژێسکی وەڵامیدایەوە: کێشەکە سنتکۆڤە، دەبێ یان رەتی بکاتەوە یان قەبووڵی بکات.

ـ دەی قەبووڵی دەکات یان نا؟

ڤرۆنسکی گوتی: کێشەکە لێرەدایە کە نە قەبووڵی دەکات و نە رەتی دەکاتەوە.

لەڤین چاوێکی لە ڤرۆنسکی کرد و پرسیی: ئێستا ئەگەر قەبووڵی نەکات کێ بەجێی ئەو ئەرکەکە وەئەستۆ دەگرێت؟

سێڤیاژێسکی گوتی: هەرکەس بخوازێت.

لەڤین پرسیی: ئێوە ئامادەن؟

سێڤیاژێسکی نارەحەت بوو و شڵەژاوانە چاوی لە لاوە دەمتیژەکە کرد کە لە تەنیشت سرگی ئیڤانڤیچ راوەستابوو و گوتی: نا، من مەعاف بکەن.

لەڤین کە هەستی دەکرد کەوتۆتە سەرگۆڕەپانێکی گوماناوی گوتی: کەوایە کێی تر؟ نڤیدۆڤسکی؟

بەڵام ئەو قسەیە جوان نەبوو. نڤیدۆڤسکی و سێڤیاژێسکی هەردووکیان خۆیان پاڵاوتبوو.

لاوە دەمتیژەکە وەڵامیدایەوە: من بە هیچ شێوەیەك ئامادە نیم.

نڤیدۆڤسکی ئەو لاوە دەموقسە رەقە بوو. سێڤیاژێسکی ئەوی بە لەڤین ناساند.

ستیپان ئارکادیچ چاوێکی لە ڤرۆنسکی قرتاند و گوتی: وادیارە ئەم هەڵبژاردنە دڵی تۆشی خستۆتە قرتوفرت. ئەوەش وەك کێبەرکێی ئەسپسواری وایە. پیاو دەتوانێ گرێوی لەسەر بکات.

ڤرۆنسکی گوتی: بەڵێ، پیاو تووشی هەیەجان دەکات. پیاو کاتێك دەست دەکات بە کارێك دەیهەوێ تەواوی بکات. جۆرێك بەربەرەکانێیە ـ ئەوەی گوت و نێوچاوانی تێکنا و لێوی خۆی کرۆشت.

ـ سێڤیاژێسکی کوڕی خەباتە. هەموو شتێکی روونا کە.

ڤرۆنسکی بە بیرێکی شڵەژاوەوە گوتی: بەڵێ، راست وایە!

بێدەنگ بوون و ڤرۆنسکی لەو بێدەنگییەدا، چونکە دەبوو سەرنجی لەسەر شتێك بگیرسێتەوە چاوی لە لەڤین دەکرد، لە قاچی و جلەکانی و پاشان لە روخساری دەڕوانی و کە گەیشتە جووتێ چاوی خەمناك کە بڕدرابوونە روخساری خۆی، بۆ ئەوەی شتێکی گوتبێ گوتی: ئێوە خۆ هەمیشە دانیشتوی گوندن، ئیتر بۆ نەبوونەتە قازیی ناوچە لە شۆڕای زێمستڤادا؟ یۆنیفۆرمی قازیی ناوچەشتان لەبەردا نییە.

لەڤین کە لە سەرەتاوە چاوەڕوانی دەرفەتێك بوو کە قسە لەگەڵ ڤرۆنسکی بکات و لەو رێگایەوە هەڵسوکەوتە ساردەکەی خۆی قەرەبوو بکاتەوە و دڵنەوایی بکات بە خەمبارییەوە گوتی: چونکە بە پلەوپایەیەکی بێ مانای دەزانم.

ڤرۆنسکی بە سەرسووڕمانەوە بەڵام لەسەرەخۆ گوتی: من لەگەڵ ئەو بیروڕایەت هاودەنگ نیم، بە پێچەوانە...

لەڤین پەڕییە نێو قسەکانی: ئەوانە هەمووی گەمەن. ئێمە هیچ پێویستییەکمان بە قازیی ناوچە نییە. من خۆم هەشت ساڵە هیچ سکاڵایەکم نەبووە تاکوو سەردانی دادگا بکەم، جارێکیش کە بوومە زۆر بە بارێکی خراپدا شکاوەتەوە. دادگای ناوچە چلوێرست لە ماڵەکەی ئێمە دوورە. من دەبێ بۆ سکاڵایەك لەسەر دوو رۆبڵ پارێزەرێك بنێرم بۆ ئەوێ کە پازدە رۆبڵی تێدەچێت.

ماجەرای وەرزێرێکی گێڕایەوە کە ئاردی لە ئاشێك دزیبوو و ئاشەوانەکە پێیگوتبوو ئاردی دزیوە و وەرزێڕەکە چووبوو لە دادگا شکایەتی لێکردبوو کە تۆمەتیان داوەتە پالی. ئەم باسە نابەجێ و بێ مانا بوو، لەڤین خۆشی کاتی گێڕانەوەی ماجەراکە لەوە ئاگاداربوو.

ستیپان ئارکادیچ بە بزەیەکی نەرم و شیرینەوە کە تایبەتی خۆی بوو گوتی: زۆر سەرنج راکێشە! باشە وەرە با بڕۆین. وادیارە دەنگدان دەستیپێکردووە.

بەڵام لەڤین نەچوو لەگەڵیدا و ئەو دوورکەوتەوە.

سرگی ئیڤانڤیچ کە وتە نابەجێکانی تاوێك لەمەوبەری براکەی بیستبوو، پێیگوت: تێناگەم چۆن دەلوێ مرۆڤ تا ئەوڕادەیە لە وردبینی سیاسی بێ بەش بێت؟ ئەوە هونەرێکە کە ئێمەی رووسی نیمانە. سەرۆك خانانی پارێزگا خەنیمی ئێمەیە و تۆ وەکوو دۆستێکی گیانی و ***بە لەبزێکی خۆمانە*** لەگەڵی دەدوێی و داوای لێدەکەی خۆی بپالێوی. بەڵام لەگەڵ کۆنت ڤرۆنسکی... کە من حەز بە دوستایەتیشی ناکەم و بۆ نیوەڕۆش بانگهێشتنی کردووم، بەڵام ناچم. هەرچییەکیش بێت لە گورووپی ئێمەیە، تۆ زویری دەکەیت و دەیکەیتە نەیاری خۆت. دوای ئەویش لە نڤیدۆڤسکی دەپرسی کە خۆی دەپالێوێ یان نا. چ مرۆڤێکی ژیر کاری ئاوا دەکات؟

لەڤین گوتی: هەهوو، تۆش قسەی قۆڕ دەکەی، من سەرم لەوانە دەرناچێ.

ـ بەڵێ، دەڵێی قسەی قۆڕە بەڵام کاتێك بە چەکمەوە تێدەکەوێ کارەکە خراپ دەکەیت و هەموو شتێك دەشێوێنی.

لەڤین بێدەنگ بوو و پێکەوە چوون بۆ تەلاری گەورە.

سەرۆك خانانی پارێزگا ئەگەرچی هەستی دەکرد پیلانێك بە دژی ئەو رێکخراوە و لەگەڵ ئەوەشدا کەس داوای لێنەکردبوو بڕیاریدا خۆی بپالێوێ. ئامادەبووان لەنێو تەلارەکەدا هەموو بێدەنگ بوون. نووسیار بە دەنگێکی بەرز رایگەیاند کە میخائیل ستیپانڤیچ ملازمی گارد بۆ پلەی سەرۆکخانانی پارێزگا خۆی دەپالێوێ.

سەرۆکی شۆڕاکانی ناوچە بەو دەورییانەوە کە تۆپیلکەی چکۆڵەی تێدابوو لەسەر مێزەکەی خۆیانەوە رۆیشتن بۆ لای مێزی سەرۆك خانانی پارێزگا و دەنگدان دەستیپێکرد.

ستیپان ئارکادیچ کاتێك لەڤین لەگەڵ براکەی بەدوای سەرۆکی شۆڕای ناوچەدا رۆیشت بۆیلای مێزی دەنگدان، چرپاندی بە گوێیدا کە تۆپیلکەکەی بخاتە لای راستی سندووقەکە. بەڵام لەڤین، ئەو روونکردنەوانەی سەبارەت بە هەڵبژاردن پێیان دابوو هەمووی لەبیرچووبۆوە و دەترسا ستیپان ئارکادیچ کە پێیگوتبوو «لای راست» بە هەڵە چووبێت. ئاخر سنتکۆڤ لە گورووپی نەیار بوو. لەگەڵ نزیکبوونەوە لە

سندووقەکە تۆپیلکەکەی بە دەستی ڕاستەوە گرتبوو بەڵام چونکە پێیوابوو ستیپان ئارکادیچ بەهەڵە چووە کە گەیشتە بەرسندووقەکە تۆپیلکەکەی دایەدەستی چەپەی و دیاربوو کە لەلای چەپی سندووقەکەی دانا.

یەکێك لە چاوەدێران کە لە نزیك سندووقەکە ڕاوەستابوو بە دیتنی جووڵانی هەنیشکیان تێدەگەیشت کە هەرکەسەی تۆپیلکەی خۆی لە کاملا دادەنێ، بە دیتنی دەنگدانەکەی لەڤین نێوچاوانی تێکنا. هیچی پێ نەبوو کە چاوە تیژەکانی خۆی پێتاقی بکاتەوە.

هەموو بێدەنگ بوون و دەنگی بژاردنی دەنگەکان دەبیسترا. پاشان دەنگی کەسێك هات کە ژومارەی دەنگە ئەرێنی و نەرێنییەکانی بە دەنگێکی بەرز ڕاگەیاند. سەرۆك خانان بە زۆرینەی دەنگ هەڵبژێردرابوو. سنێتکۆڤ هاتەژووری و ڕەهیشتەکان دەوریاندا و پیرۆزباییان پێگوت.

لەڤین لە سرگی ئیڤانڤیچی پرسی: دەی، تەواوبوو؟

سێڤیاژێسکی بە پێکەنینەوە لەجیاتی سرگی ئیڤانڤیچ وەڵامیدایەوە: جارێ سەرەتای کارە. دەنگی پالێوراوی خەنیم لەوانەیە زیاتر بێت.

لەڤین ئەوەشی لەبیرچووبۆوە. تازە وەبیری هاتبۆوە کە خاڵێکی ورد لەگۆڕێدا بوو. بەڵام نەیدەویست وەبیری بێتەوە ئەو خاڵە چیبووە. خەمۆك و دڵتەنگ بوو، دەیویست لەو ئاپۆرەیە دوورکەوێتەوە.

کە دیتی هیچ کەس سەرنجی پێنادا و وێدەچێ بوونی لەوێ هیچ کەڵکێکی نەبێ، بە هێواشی ڕۆیشت بۆ تەلاری چکۆڵە کە تایبەتی خواردن و خواردنەوە بوو، بە دیتنی پێشخزمەتەکان هەستی بە حەسانەوە و دڵنیایی دەکرد. پێشخزمەتێکی پیر خۆراکێکی هێنا بەردەمی و لەڤین شتێکی هەڵگرت، لەتە کۆتلێتێك و هێندێ فاسوولیای خوارد و لەگەڵ پێشخزمەتەکە ماوەیەك سەبارەت بە ئەربابەکەی پێشووی دوا و چونکە حەزی نەدەکرد بگەڕێتەوە بۆ تەلارە گەورەکە و دەیزانی بارودۆخەکەی لەگەڵ ڕۆحی سازگار نییە ڕۆیشت بۆ دالانی نهۆمی سەروو.

دالانەکە پڕبوو لە ژنانی ڕازاوە و شۆخوشەنگ، هەموویان بەسەر مەجەرەکاندا داهاتبوونەوە و هەوڵیان دەدا یەك وشەش لەو قسانەی نهۆمی خوارێیان لەدەست دەرنەچێت. چەند خابیرەی تەڕپۆش و مامۆستایەکی قوتابخانەی ناوەندی، کە چاویلکەی لە چاودا بوو، لەگەڵ چەند ملازم لەلای ژنەکان ڕاوەستابوون یان دانیشتبوون. هەموو باسی هەڵبژاردنیان دەکرد و دەیانگوت سەرۆك خانان زۆر شەکەت بووە و وزە و توانای نەماوە، هەروەها وتەکانی نهۆمی خواروو زۆر سەرنجڕاکێشن و لەڤین گوێی لێبوو کە لە یەکێك لە گورووپەکاندا تاریفی براکەیان دەکرد. خاتوونێك بە پارێزەرێکی گوت:

ـ چەندەم پێخۆشە گوێم لە وتەکانی کازنیشۆڤ بوو. بایی برسێتییەکە دەبوو. بێوێنە بوو. چەند بە روونی دەدوێ و دەنگێکی زولاڵی هەیە. لە دادگای ئێوە هیچ کەس ئاوا نادوێ. تەنیا «مایدێل[51]»تان هەیە، بەڵام بۆ دەم و راوێژیان ئەو لەکوێ و کازنیشۆڤ لەکوێ.

لەڤین کە لەپاڵ لاجامەکان جێگایەکی بەتاڵی دۆزییەوە دانەوی و دەستیکرد بە روانین و گوێگرتن.

ڕەهیشتەکان هەموو لە پشت پاراوانەکانی تایبەت بە خویان دانیشتبوون.

پیاوێکی یۆنیفۆڕم لەبەر لەنێو تەلارەکەدا راوەستابوو و بە دەنگە باریکەکەی خۆی هاواری دەکرد و رایدەگەیاند: دەنگدان بۆ هەڵبژاردنی ملازمی ناوەند یۆگنی ئیڤانڤیچ ئاپۆختین بۆ پلەی سەرۆك شۆڕای رەهیشتەکان دەستپێدەکات.

بێدەنگییەکی چڕ باڵی بەسەر تەلارەکەدا کێشا و دەنگی گڕی پیاوێکی بەساڵاچوو رایگەیاند:

ـ پاشگەز بۆتەوە.

دەنگی راگەیێنەرەکە دیسان بەرزبۆوە. دەنگدان بۆ هەڵبژاردنی راوێژکاری دەربار پیووتێر پیترۆڤیچبال.

دەنگی زیقنی گەنجێك بەرزبۆوە: پاشگەز بۆتەوە.

دیسان ئەو قسانەیان دووپاتکردەوە و دیسان پاشگەزبوونەوەی خۆپاڵێو راگەیەندرا. ئەو کێشەیە نزیکەی کاتژمێرێکی خایاند. لەڤین هەنیشکی دابووە سەرلاجامەکان و دەیڕوانی و گوێی راگرتبوو. سەرەتا تووشی سەرسامی بووبوو و هەوڵیدەدا لە رووداوەکان تێبگات، بەڵام کە هیوابڕاو بوو هەستی بە دڵتەنگی کرد. پاشان کە هەیەجان و رقی هەموو روخسارەکانی دی خەمێك دڵی داگرت. بڕیاریدا لەوێ دووركەوێتەوە و بەو قەستە رۆیشتە خوارێ. کاتێك بە دالانی پشت بانجێڵەکەدا تێدەپەڕی تووشی قوتابییەکی دواناوەندی بوو کە بە روخساری خەمناك و چاوی سوورەوە دەهات و دەچوو، لەسەر پلیکانەکانیش ژن و مێردێکی دی: ژنەکە کەوشی پاژنەبەرزی لە پێدا بوو و بەپەلە دەهاتە سەرێ، هەروەها جێگری دادستانی دی کە پیاوێکی کز و رەقەڵە بوو.

---

51- Maydel

لەڤین لە پاڵ دیوارەکە راوەستا بۆ ئەوەی رێگا بۆ ژنەکە چۆڵ بکات، گوێی لێبوو کە جێگری دادستان دەیگوت: من پێمگوتی پەلە مەکە درەنگ ناگەینێ.

لەڤین گەیشتە سەرپلیکانی چوونەدەرەوە و خەریکبوو ئەو ژومارەی لە گیرفانی دەردەهێنا کە لە بری باڵتەکەی پێیاندابوو، کە نووسیار بە هەڵەداوان خۆی گەیاندێ و گوتی: کۆنستانتین دیمیتریچ، تکایە فەرموون دەنگبدەن. دەنگدان بۆ هەڵبژاردنی نڤیدۆڤسکی بوو کە ئاوا لێبڕاوانە چاوپۆشیی لە خوپالاوتن کردبوو.

لەڤین لە دەرگای تەلاری گەورە نزیکبۆوە. دەرگاکە داخرابوو. نووسیار لە دەرگاکەیدا و کردیانەوە، دوو مالیك بە روخساری سوورهەڵگەڕاوەوە بە پرتاو بە پەنا لەڤیندا تێپەڕین.

یەکێکیان دەیگوت: ئیتر تاقەت ناهێنم.

بە دوای مالیکەکاندا سەرۆکی شۆڕای رەهیشتەکانی پارێزگا پەیدابوو. روخساری بەهۆی ترس و درژانگەوە سەرسووڕهێنەر بوو.

سەردەرگاوان دەنگی هەڵێنا: مەگین بە تۆم نەگوتبوو مەهێڵە کەس بڕواتە دەرێ.

ـ حەزرەتی مەزن، من دەرگاکەم کردەوە بێتە ژووریٚ.

سەرۆکی شۆڕا هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی: خودایە چ بکەم! ـ سەری داخست و بە پانتۆڵی سپیی داکەوتووەوە شەکەت و بێتاقەت رۆیشت بۆ لای مێزە گەورەکەی نێوەڕاستی تەلار.

نڤیدۆڤسکی بەپێی گەڵاڵەیەك کە دارێژرابوو زۆرینەی دەنگی وەدەست هێنا و بۆ سەرۆکی شۆڕای رەهیشتەکان هەڵبژێردرا. زۆر کەس بەکەیف بوون و زۆر کەسیش سەرخۆش و بە کاوی دڵ گەیشتوو، زۆر کەسیش ناڕازی و ناکام مابوونەوە. سەرۆك خانان لە پێشدا دڵگران بوو و نەیدەتوانی ناڕەحەتییەکەی خۆی بشارێتەوە. کاتێك نڤیدۆڤسکی لە تەلارەکە چووەدەرێ خەڵکەکە تێیهاڵان و ئەویش زۆر بە دڵخۆشی بە دوایدا رۆیشت، هەروەك رۆژی یەکەمی هەڵبژاردن بە دوای سەرۆکی پێشیندا رۆیشتبوو و هەروەها وەکوو ئەو کاتەی کە سنیێتکۆڤ لە دەورەی یەکەمدا زۆرینەی دەنگی وەدەست هێنا و وەدوای کەوت.

## سی و یەك

سەرۆکخانانی نویٚ و زۆربەی ئەندامانی گورووپی سەرکەوتوو ئەوشەوە لەو میوانداریيەدا بەشدارییان کرد کە ڤرۆنسکی وەڕێی خستبوو.

ڤرۆنسکی، بەوهۆیە لەو هەڵبژاردنەدا بەشداریی کردبوو کە لە چنگی کەسەر و دڵتەنگیی لادیٚ دەربازبێت و هەروەها بەو قەستەش کە پێداگری لە مافی ئازادیی خۆی بکات و ئەوەندە نەکەوێتە ژێر باری قەیدوبەندی ئاناوە. هەروەها بە مەبەستی ئەوەی کە قەرەبووی ئەو چاکە و پیاوەتییانەی سێڤیاژێسکی بکاتەوە کە کاتی هەڵبژاردنی زێمستڤا بۆ هەڵبژاردنی شوڕای رەهیشتەکان پشتیوانیی لێکردبوو. لە هەمووشی گرینگتر بۆ ئەوەی هەموو ئەرکی خۆی کە وەك مەقامێکی نەجیب و خاوەن مڵك لە ئەستۆی بوو و خۆی شانی دابووەبەری موو بە موو ئەنجامی بدات. بەڵام قەت چاوەڕوانیی نەدەکرد ئەم هەڵبژاردنە تا ئەوڕادەیە سەرقاڵی بکات و ئاوا هانیبدات، بەجۆرێك کە خۆی بتوانیٚ ئاوا بە باشی بەڕێوەی بێنیٚ. ئەو لە جەرگەی رەهیشتە گوندنشینەکاندا تازەکار بوو، بەڵام سوور سوور دیاربوو سەرکەوتوو دەبیٚ و دەیزانی و لێی روونبوو کە لەنێو رەهیشتە و خانەدانەکاندا پێگە و دەسەڵاتێکی بەرچاوی وەدەست هێناوە. ئەو بۆ ئەم دەسەڵات و دەستڕۆیشتنەی، خۆی بە منەتباری سامان و ناوبانگ وماڵە گەورەکەی خۆی دەزانی، کە ئەو ماڵەش لەنێوشار بوو و دۆستی لەمێژینەی خۆی شیرکۆڤ پێیدابوو. ئەو شیرکۆڤە چالاکی بواری ئابووری بوو و بانکێکی پڕ برەوی لە کاشین دامەزراندبوو، هەروەها بەرمنەتی ئەو ئاشپەزە بێوێنەیە بوو کە لە گوندەوە هێنابووی. جگە لەوەش نزیکایەتیی لە پارێزگار کە هاوڕێی گیانیگیانیی بوو و ڤرۆنسکی پشتیوانیی لێدەکرد لەو کار و دەسەڵاتەدا بێکاریگەری نەبوو. بەڵام گرینگترین هۆکاری جێکردنەوەی ڤرۆنسکی لە دڵی رەهیشتەکاندا ئاکاری سادە و پێوەندی بەبیٚ جیاوازی بوو لەگەڵ هەمووان، کە زۆر زوو زۆربەی خانەدانەکان، سەبارەت بە ئەو بیروڕایان گۆڕدرا کە بە هەڵە پێیانوابوو قۆڕەدەماخ و

لەخۆباییە. ئەو خۆی لەسەر ئەو باوەڕە بوو جگە لەو لاوە نیمچە شێتەی کە مێردی کیتی ئیشچر باتسکییە و بەبێ پێشەکی و بە رقێکی پێکەنینییەوە ئەو هەموو قسە هەڵێتوپەڵێتەی کردبوو، هەموو رەهیشتە و خانەدانەکان دەیانناسی و هۆگری بوون. ئەو بە روونی دەیدی و خەڵکیش دانیان پێدا دەنا کە نڤیدۆڤسکی دەبێ ئەو سەرکەوتنەی خۆی تاڕادەیەکی زۆر بە قەرزداری دەستڕۆیشتوویی ئەو بزانێ. ئێستاش ئەو میوانداریی‌یەی بە بۆنەی شادیانەی هەڵبژاردنیی نڤیدۆڤسکییەوە رێکخستبوو. ئەوەندەش دڵخۆش بوو کە دەتگوت جێژنی سەرکەوتنی خۆی گرتووە. رێورەسمی هەڵبژاردنەکە بە رادەیەك سەرنجی راکێشابوو کە لە دڵی خۆیدا دەیگوت ئەگەر هەتا سێ ساڵی داهاتوو زەماوەند نەکات خۆی بۆ سەرۆکی شۆرا دەپاڵێوێ، هەروەك چۆن هەموو جارێ کە ئەسپسوارێك لە کێبەرکێی ئەسپسواریدا خەڵاتی دەبردەوە تاسەی ئەسپسواری و خەڵات وەرگرتن دڵی دادەگرت.

ئێستاش جێژنی سەرکەوتنی سوارکاری وەڕێ خرابوو. ڤرۆنسکی لە سەرووی کۆڕەکە دانیشتبوو و پارێزگاری لاو لەلای دەستە راستی جێی خۆش کردبوو کە ئەمیرێك بوو لە ئاجوودانەکانی ئیمپڕاتۆر و هەمووان بە خاوەن دەسەڵاتی پارێزگایان دەزانی. ئەوبوو کە رێورەسمی هەڵبژاردنی بە شکۆیەکی زۆرەوە دەستپێدەکرد و بە مژولیایشە پڕشکۆکانی رێورەسمەکەی گەرم دادەهێنا، ڤرۆنسکی دەیدی کە لە دڵی زۆر کەسدا رێزی هەیە و خۆشیاندەوێ، بەڵام ئەم پارێزگارە لەبەرچاوی ڤرۆنسکی هەر ماسلۆڤکاتکا[52] بوو. ئەوەش ئاوەڵناوێك بوو کە لە خوێندنگەی سەربازی بە سەریاندا بڕیبوو، بۆیە کە چاوی بە ڤرۆنسکی دەکەوت ترێق دەبۆوە و ئەویش هەوڵی دەدا خەیاڵی ئاسوودە بکات. لەلای چەپیشی نڤیدۆڤسکی دانیشتبوو کە روخسارە جحێڵەکەی حاڵەتێکی توند و سەرنجەکانیشی تیژ و ژەهراوی بوون. ڤرۆنسکی لەگەڵ ئەو بە شێوەیەکی سادە و بەڕێزانە هەڵسوکەوتی دەکرد.

سێڤیاژێسکی بە دڵێکی فراوانەوە نامرادیی خۆی قەبووڵ کردبوو و ئێستا جامی مەی بە دەستەوە بە نڤیدۆڤسکیی دەگوت کە هەڵنەبژێردرانی خۆی تەنانەت بە ناکامیش نازانێ. دەیگوت کە خانەدانەکان بۆ رێگایەکی تازە کە دەبێ بیگرنەبەر قەت نوێنەرێکی لە ئەو

---

52- Maslovkatka

شیاوتریان پەیدا نەدەکرد و بەمهۆیەش ئەوەی راست و شەریف بوو، وەك ئەو دەڵێ، یاریکاری سەرکەوتنی ئەو رۆژە و هوکاری رێزلێنانی ئەویش بوو.

ستیپان ئارکادیچ لە بارێکەوە بەوە دڵخۆش بوو کە چەند کاتژمێر بە خوشی رایدەبوێرێ و هەمووانی دەدی شادن و رازین بەو سەرکەوتنە. مێزەکان رازاوە و خواردنەکان بەتام بوون، لەگەڵ ئەوەشدا باسی رووداوە سەرنجڕاکێشەکانی کاتی هەڵبژاردنیان دەکرد و سێڤیاژێسکی بە لەبزێکی قەشمەرجاڕانەوە لاساییی مژولیایشە گرینۆکانەکەی سەرۆکی ناکامبووی شۆڕای خانانی دەکردەوە و رووی لە نڤیدۆڤسکی کرد و گوتیشی حەزرەتی مەزن پێویستە بۆ پێڕاگەیشتنی حیساب و کیتابەکانی شۆڕا رەوشتێکی وردتر و کاریگەرتر لە گریان هەڵبژێرن. یەکێکی تر لە رەهیشتە قەشمەرەکان گێڕایەوە کە سەرۆکی شۆڕای خانانی پێشوو فەرمانی داوە کە چەند پێشخزمەتی بە پانتولی قولە و گۆرەویی مل درێژەوە بۆ بنێرن تاکوو لەو کۆڕی سەمایەدا کە دەیهەوێ بیگرێ سەما بکەن و دەیگوت ئێستا دەبێ بیاننێرێتەوە مەگین سەرۆکی نوێی شۆڕا بیهەوێ کۆڕێکی سەما بەو پێشخزمەتانە ساز بدات.

لە کاتی فراوێندا بەردەوام سەرۆك خانانیان بە سەرناوی «سەرۆکی شۆڕای خۆمان» و «حەزرەتی مەزن» بانگ دەکرد.

ئەم سەرناوانە بە شادی و نەشەیەکەوە دەگوتران کە دەتگوت تازەبووکێك بە ناوی مێردەکەیەوە بانگ دەکەن و پێیدەڵێن «خاتوون». نڤیدۆڤسکی وایدەنواند کە گوێ بەو سەرناوانە نادات و تەنانەت بە شتێکی سووکیشی دەزانێ. بەڵام دیاربوو بە بیستنی کەیف دەکات و هەوڵ دەدات خۆی کۆنترۆڵ بکات و بە هۆی شادییەوە کردەوەیەکی نەشیاو لە خوی نیشان نەدات کە لەگەڵ ئەو جەوە لیبراڵە تازە یەك نەگرێتەوە.

لە کاتی نانخواردندا بەردەوام تێلگەڕام بۆ ئەو کەسانە بەڕێ دەکرا کە هۆگری چۆنێتیی مەراسیمی هەڵبژاردنەکە بوون. ستیپان ئارکادیچ کە زۆر سەرخوش بوو تیلگەڕامێکی بەم ناوەرۆکەوە بۆ داریا ئەلکساندرۆڤنا نارد:«نڤیدۆڤسکی بە زۆرینەی دەنگ و جیاوازیی دوازدە دەنگەوە هەڵبژێردرا. پیرۆزە! هەواڵەکە بە هەمووان راگەیێنە.» ئەو تیلگەڕامەکەی بە دەنگی بەرز نژوە کرد و گوتی کە واچاکە هەمووان دڵخۆش بکەم. بەڵام داریا ئەلکساندرۆڤنا کاتێك تێلگەڕامەکەی خوێندەوە هەناسەیەکی قوولی هەڵکێشا و داخی ئەو یەك رۆبڵەی لێهات کە بۆناردنی ئەو تێلگەڕامە خەرجکراوە. زانیشی مێردەکەی ئەو کارەی لە کۆتاییی نانخواردندا

کردووە. ئەو لەگەڵ ئەم کەمایەسییەی مێردەکەی ئاشنابوو و دەیزانی کە دوای خواردنی خۆش و بەتام ئیشتیای ناردنی ***تێلگەرام دڵی دادەگرێ***.

ئەم میواندارییە بە خواردنی خۆش و بەتام و شەڕابی سازگار کە نەك لە خوگخانەکانی رووسی بەڵکوو لە بتریدا راستەوخۆ لە هەندەرانەوە هاتبوو، زۆر سادە و جوامێرانە بوو و بە شادی و نەشەیەکی زۆرەوە بەڕێوەچوو. بانگهێشتنکراوەکان کە بیست کەس دەبوون سێڤیاژێسکی لەنێو هاوبیرانی لیبراڵ و خاوەن پلەوپایە نوێخوازەکان و هەروەها کەسانی قسەخۆش و بەرێزدا گوڵبژێری کردبوون. پەرداخەکان لێکدەدران، بەشێوەی جیددی و گاڵتە، بە سڵامەتیی سەرۆکی نوێی شۆڕای خانان و پارێزگار و بەرپرسی بانگ و «خانەخوێی دلۆڤان». هەڵیاندەدا.

ڤرۆنسکی دڵخۆش و رازی بوو. ئەو قەت چاوەڕوانی شادی و خۆشییەکی ئاوا دڵگر نەبوو، لەم شوێنە دوورەدەستە و دوور لە پێتەخت.

لە کۆتاییی نانخواردندا شادیی میوانەکان زیاتر بوو. پارێزگار داوای لە ڤرۆنسکی کرد کە بچێت بۆ ئەو کۆنسێرتەی کە هاوسەرەکەی بۆ یارمەتیدانی «برایانی ئیسلاو» رێکی خستبوو، چونکە هاوسەرەکەی زۆر تامەزرۆی ئاشنایەتی بوو لەگەڵیدا.

گوتی: کۆڕێکی سەماشی لێدەبێت و تۆ ئەو هەلەت بۆ هەڵدەکەوێ کە چاوت بە ئافرەتە شۆخوشەنگەکانی ئێمە بکەوێ.

ڤرۆنسکی بە زمانی ئینگلیزی وەڵامیدایەوە: «***من لەو خەتەدا نیم***». حەزی لە بەکارهێنانی ئەو زاراوەی بوو. بەڵام دواتر پێکەنی و بەڵێنیدا بچێت.

کاتێك نانخواردن تەواوبوو و هەموو جگەرەیان داییساندبوو پێشخرمەتەکەی ڤرۆنسکی بە نامەیەکەوە کە لەسەر کەشەفێکی دانابوو هات بۆ لای ئەربابەکەی و گوتی: نامەیەکە لە ڤازدۆڤیژنسکۆیەوە پەیکی تایبەت هێناویەتی.

ڤرۆنسکی لەگەڵ ئەوەی بە نێوچاوانێکی گرژەوە نامەکەی دەخوێندەوە یەکێك لە میوانەکان ئاماژەی بە پێشخزمەتەکە کرد و بە فەڕەنسی گوتی: ***زۆر سەیرە لەگەڵ سۆنتیتسکی لێکیان ناکەیەوە هێندە شێوەی یەکتر دەدەن.***

نامەکە هی ئانا بوو. ڤرۆنسکی بەر لەوەی بیخوێنێتەوە دەیزانی ناوەرۆکی نامەکە چییە. ئانا بەهیوا بوو هەڵبژاردنەکە لە ماوەی پێنج رۆژدا تەواوبێت و ڤرۆنسکی بەڵێنی پێدابوو کە رۆژی هەینی دەگەڕێتەوە. ئەوە رۆژی شەممە بوو و ڤرۆنسکی دەیزانی کە ئانا لە نامەکەیدا

لۆمەی کردووە کە بۆچی هێشتا نەهاتۆتەوە، چونکە ئەو نامەیەی کە شەوی رابردوو بۆ ئانای نووسیبوو هێشتا بەدەستی نەگەیشتبوو.

ئەوەی لە نامەکەدا نووسیبووی هەر ئەوەبوو کە ڤرۆنسکی چاوەڕوانیی دەکرد، بەڵام شێوەی دەربڕینی وشەکانی نامۆی دەنواند و ناخۆش بوو بەلایەوە: «ئانی زۆر نەخۆشە. پزیشك دەڵێ لەوانەیە تووشی هەوکردنی سییە بووبێ. بە تەنیا نازانم چ بکەم و سەرم لێشێواوە. پرێنسس ڤارڤاراش یارمەتییم نادا هیچ، بۆتە ئەرکیش بە سەرمەوە. دوێنێ و پێرێ چاوەڕوانت بووم، ئێستاش ئەو نامەیە دەنووسم بزانم لەکوێی و چی دەکەی. دەمویست خۆم بێم بەڵام پاشگەز بوومەوە چونکە دەزانم تۆ حەزناکەی. لانیکەم وەڵامێکم بدەوە با دڵنیابم.»

منداڵەکە نەخۆشە و دەڵێ دەمویست خۆم بێم. کچەکەمان نەخۆشە و ئەویش بەو لەبزە تۆسنانەیە قسە دەکات.

ئەم هەڵبژاردنە پڕشکۆ و نەشە و میواندارییە دوور لە تاوانەکان و ئەو ئەشقە کەسەربارەی کە ناچاری کردووە بگەڕێتەوە و دیسان شان بداتەوەبەر باری ئەو خەم و کەسەرانە، ئەوەندە پێکەوە دژواز بوون کە تووشی سەرسامی و واقوڕمانی کرد. بەڵام دەبوو بگەڕێتەوە و بە یەکەم شەمەندەفەری ئەو شەوە وەڕێ کەوت.

## سی و دوو

ئانا بەرلەوەی ڤرۆنسکی بۆ بەشداریکردن لە هەڵبژاردن وەڕێ بکەوێ، بیری کردەوە ئەم بۆڵە و دەمەقاڵێیانەی کە بەرلە هەموو سەفەرێکی ڤرۆنسکی دێتەگۆڕێ، نەك ئەوەی نێوانەکەیان گەرم و قایم ناکات بەڵکوو دەبێتە هۆی کەلێن تێکەوتن و ساردبوونەوەی پێوندییەکەشیان. بەمهۆیە بڕیاریدا هەتا دەتوانێ هەوڵ بدات و ئارام و بەتاقەت دوورییەکەی تاملّ بکات. بەڵام روانینی سارد و وشکی ڤرۆنسکی ئەو کاتەی هات بۆ لای تاکوو هەواڵی سەفەرەکەی پێڕابگەیێنێ زویر و خەمباری کرد و هێشتا ڤرۆنسکی وەڕێ نەکەوتبوو ئەم ئارام و ئۆقرەی لێهەڵگیرا.

کاتێك تەنیا کەوت و لەو بارەوە بیری کردەوە کە ڤرۆنسکی حەزدەکات لە داوی ئەو دەربازبێت و دەیهەوێ ئازاد بژی، بەو ئاکامە هەمیشەییە گەیشت، ئەویش هەستکردن بە

چرووکی و سووکایەتیی خۆی بوو. «ئەو هەقیەتی کە بۆ هەرشوێنێك پێی خۆشە بچێت. نەك هەر مافی ئەوەی هەیە بڕوا بەڵکوو مافی ئەوەی هەیە دەست لە منیش هەڵگرێ. ئەو مافی هەموو کارێکی هەیە و من هیچ هەقێکم بە سەرییەوە نییە. بەڵام چونکە لەوە ئاگادارە خۆ نابێ کەڵکی لێوەرگرێ. دەی باشە، ئەو چیی کردووە؟... بە چاوی سارد و سووك تەماشای کردووم. هەڵبەت ئەو ساردوسڕییە شتێکی گرینگ و هەستپێکراو نییە. بەڵام پێشتر بەو چاوە سەیری نەدەکردم. ئەو ڕوانینە نیشاندەری زۆر شتە. ئەو ڕوانینە نیشاندەری ئەوەیە کە وردە وردە خەریکە لێموەڕەز دەبێ.»

هەرچەند خاترجەم بوو کە ڤرۆنسکی خەریکە مەیلەکەی سارد دەبێتەوە، بەڵام نەیدەتوانی هیچ حەولێك بدات و بە هیچ شێوەیەك نەیدەتوانی ئاڵوگۆڕی بەسەر پێوەندییەکەیاندا بێنێ. وەك ڕابردوو جگە لە ئەشق و دڵڕفێنی کەرەسەیەکی تری پێشك نەدەهات بۆ ڕاگرتنی دڵی. ڕاست وەك ڕابردووش بە ڕۆژدا خۆی بە کارەوە سەرقاڵ دەکرد و شەوانەش بە یارمەتیی مۆرفین خۆی لە خەیاڵی ترسناك و کوتاییهاتنی ئەشق و خۆشەویستی ڤرۆنسکی دەربازدەکرد. هەڵبەت ڕێگایەکی تریش هەبوو، ئەویش تەڵاق وەرگرتن لە مێردەکەی و شووکردنەوە بە ڤرۆنسکی بوو. هەڵبەت بۆ پابەندکردنی ئەو نا ـ ئانا بۆ پابەندکردنی ڤرۆنسکی لە ئەشقی ئەو زیاتر هیچی نەدەویست ـ بەڵکوو تەنیا بۆ نزیکبوون لە ئەو و وازلێنەهێنانی بوو. ئانا ناچاربوو پێمل بێت و بڕیاریدا هەرکاتێك ڤرۆنسکی یان ستیڤا لەوبارەوە قسە بکەن لەڕێوە قەبووڵی بکات.

ئانا ئەو پێنج ڕۆژە تەنیایی خۆی بەو فیکر و خەیاڵانە پڕکردبۆوە و دژواری و خەمی دووریی ڤرۆنسکیی پێسووك کردبوو.

ئەو، ئەو چەند ڕۆژەی بە گەڕان و قسەکردن لەگەڵ پرێنسس ڤارڤارا و سەردانی نەخۆشخانە و لە هەمووشی گرینگتر بە خوێندنەوەی ئەو کتێبانە پڕ دەکردەوە کە یەك لەدوای یەك دەیخوێندنەوە. بەڵام ڕۆژی شەشەم، کاتێك فایتوونئاژۆ بە تەنیا لە وێستگەی هێلاسن گەڕایەوە ئانا هەستیکرد کە ئیتر تواناییی ئەوەی نییە کە یادی ڤرۆنسکی بە سەرگەرمی و ڕابواردن لە بیر خۆی بەرێتەوە. هەر لەو کاتەدا کچەکەی نەخۆش کەوت. ئانا دەستیکرد بە پەرستاری کردن لە کچەکەی بەڵام ئەو کارەش نەیتوانی لە گێژەنی بیر و خەیاڵ دەربازی بکات. بەتایبەت کە نەخۆشیی کچەکەی مەترسیداریش بوو. هەرچەندیش هەوڵیدەدا نەیدەتوانی خۆشەویستیی ئەو کچە لە دڵی خۆیدا جێبکاتەوە و خۆڕانانیش کارێك بوو کە لە دەستی نەدەهات و نەیدەتوانی بە

درۆ وانیشان بدات کە خۆشی دەوێ. ئێوارەی ئەو ڕۆژە، کە تەنیا کەوت، ترسێکیوا سەبارەت بە ڤرۆنسکی گیانی داگرت کە هێندەی نەمابوو هەستێت و بەرەو شار وەڕێ بکەوێ، بەڵام کە بە وردی بیری کردەوە لەو کارە پاشگەز بۆوە و نامەیەکی نارەزایەتیی بۆ ڤرۆنسکی نووسی کە پێشتر باسی گەیشتنەکەی کراو بێ ئەوەی دوای نووسینەکەی بیخوێنێتەوە بەپەلە بە پەیکی تایبەتدا ناردی. بەیانیی ڕۆژی دوایی نامەکەی ڤرۆنسکی بە دەستی گەیشت و لەوەی کە ئەو نامەیەی نووسیبوو پەشیمان بۆوە. بە ترسەوە چاوەڕوانی دووپاتبوونەوەی ئەو ڕوانینە وشکە بوو کە کاتی وەڕێکەوتن لە چاوی ڤرۆنسکیدا دیتبووی، بەتایبەت بەو هۆیەی کە ڤرۆنسکی دەیزانی نەخۆشیی کچەکەی مەترسیدار نەبووە. سەرەڕای ئەوانەش خۆشحاڵ بوو کە نامەی بۆ نووسیوە. ئێستا ئانا بە ڕوونی دەیدی کە بارێکە لەسەر شانی ڤرۆنسکی و ڤرۆنسکی ناچارە چاوپۆشی لە ئازادیی خۆی بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای. لەگەڵ ئەوانەشدا خۆشحاڵ بوو کە ڤرۆنسکی دەگەڕێتەوە. لێگەڕێ با بوونی (بوونی ئانا) بارێك بێت لەسەر شانی بەڵام لێیدوورنەبێت و بتوانێ ببینێت و ئاگای لە هەموو هەڵسوکەوتەکانی بێت.

ئانا لە دیوی میوانداری و لەژێر چرایەکدا دانیشتبوو و کتێبێکی تازەی «تاین[٥٣]»ی دەخوێندەوە و گوێی بۆ لوورە و هاژەی با ڕاگرتبوو کە لە دەرەوە دەهات و سات بەسات چاوەڕوانی گەیشتنی فایتوونەکە بوو. چەند جار پێیوابوو تەقوکوتی تایەی فایتوونی دێتە گوێ بەڵام گوێچکەی زرینگابۆوە ئاخری نەك دەنگی تایەی فایتوون بەڵکوو دەنگی هاواری فایتوونئاژۆ و دەنگێکی کپ لەبەر هەیوانی ماڵەکەیانەوە هەستا و تەنانەت پرێنسس ڤارڤاراش کە خەریکی فاڵی پاپەز بوو ئەو دەنگەی هاتە گوێ و ئانا سوورهەڵگەڕا و هەستا سەرپێ. بەڵام بەجێی ئەوەی وەك دوو جاری پێشوو بڕواتە دەرێ، لە جێی خۆی ڕاوەستا. لە ناکاو ڕقی لەو خۆهەڵخەڵەتاندنەی خۆی هەستا و شەرمەزار بۆوە، بەڵام زیاتر لە شەرمەزارییەکە ترسی بەرەوڕووبوون لەگەڵ ڤرۆنسکی گیانی داگرتبوو. هەستی ڕەنجان و دڵمەندبوون لەگۆڕێدا نەمابوو و ئەو تەنیا لە ناڕازی بوونی ڤرۆنسکی دەترسا. وەبیری هاتەوە

---

٥٣- کتێبێکە لە بواری زانستدا بەرهەمی هیپۆلیت تاین حێخچڵ ڕەخنەگر و فەیلەسووفی فەرەنسی (١٨٩٢ ـ ١٨٢٨) هەر وەك لە بەشی حەوتی فەسڵی سیو یەکەمدا دەیبینین ئانا و ژنێك کە لەنێو فارگۆنێکدا لە پاڵییەك دانیشتوون ڕستەیەك لەو کتێبە، یەکیان بە فەرەنسی و ئەوی تریان بە ڕووسی دەردەبڕن. ڕستەکەش ئەمەیە: بۆیە ئاوەز بە ئێمە دراوە کە بتوانین خۆمان لە دەست ئەو ئازارانە دەربازبکەین کە تەنگیان پێهەڵچنیوین.

که دوو ڕۆژە حاڵی کچەکەی بەرەو چاکبوونەوە چووە. تەنانەت ڕقی لەوەش هەستابوو کە ڕاست لەوکاتەدا وا نامەکەی ناردبوو کچەکەی چاك بووبۆوە. پاشان وەبیری هاتەوە کە کچەکەی ساغ و سەلیم لەلای خۆیەتی و بە چاو و دەستی و قریشکە و گڕوگاڵ گوێچکەی دەلاوێنێتەوە. بۆیە هەموو خەمەکانی لەبیرچۆوە و شاد و بەکەیف هەڵات بەرەوپیری.

ڤرۆنسکی شەرمنانە هەر لە خوار پلیکانەکانەوە پرسیی: دەی، ئانی حاڵی چۆنە؟

لەسەر کورسییەك دانیشت تاکوو پێشخزمەت چەکمە گەرمەکانی لە پێ داکەنێ.

ـ ساغ و سلامەتە، چاك بۆتەوە.

ڤرۆنسکی تەکانێکی لە خۆیدا و پرسیی: ئەی خۆت، خۆت چۆنی؟

ئانا هەروا کە چاوی لە ڤرۆنسکی بڕیبوو بە هەردوو دەستی، دەستی ئەوی گرت و لەسەر کەلەکەی خۆی دانا.

ڤرۆنسکی چاوی لە سەرتاپای کرد و لە ئاڕایشتی کەزیە و جلەکانی ڕوانی کە دەیزانی لەبەر خاتری ئەو ئاوا خۆی ڕازاندۆتەوە و بە ساردی گوتی: باشە، دڵم حەساوە!

ئەوانە هەمووی خۆش بوون بەلایەوە بەڵام ئەم بارودۆخە هێندە دووپات بووبۆوە کە ئیتر دڵی پێینەدەکرایەوە و ئەو حاڵەتە ساردوسڕەی کە دەتگوت بەرد و دارە و ئانا زیاتر لەوە زەندەقی چووبوو لە ڕوخساری ڤرۆنسکیدا خۆی نواند.

ـ چاکە، زۆر خۆشحاڵم دەبینم تەندروستی ـ ڕیشی بە دەسرەیەك وشك کردەوە و دەستی ماچکرد.

ئانا بە خۆی گوت «قەیناکا. هەر ئەوەندەی لێرەبێ خەمم نییە. کاتێك لێرە بێت ناتوانێ، ناوێرێ خۆشینەوێم.»

شەوێ لەگەڵ پرێنسس ڤارڤارا بە خۆشی و شادی ڕایانبوارد و پرێنسس لەلای ڤرۆنسکی شکایەتی لە ئانا کرد کە کاتێك لە ماڵێ نەبووە پەنای بۆ مۆرفین بردووە.

ـ چ بکەم؟ خەوم لێنەدەکەوت... بیر و خەیاڵ ئازارم دەدات. کاتێك ئەو لەلامە پێویستم بە مۆرفین نییە و هەروانازانم هەشە.

ڤرۆنسکی باسی هەڵبژاردنەکەی کرد و ئانا بە پرسیارە شیاوەکانی خۆی وەقسەی دەهێنا و وایلێکرد باسی سەرکەوتنەکانی خۆی بکات کە زیاتر لە هەموو شتێك دەبووە هۆی دڵخۆشیی. پاشان باسی ماڵەکە و ئەوەی لەوێ سەرنجی ڕاکێشاوە هەمووی بۆ باسکرد و هێندێ زانیاریی پێدا کە بووە هۆی شادی و گەشانەوەی.

شەودرەنگان کە تەنیا کەوتن، ئانا دیتی دیسان دڵی ڤرۆنسکیی بە تەواوی خستۆتە داوی خۆی و ویستی تۆز و غەوری ئەو روانینە قورسەی کە بە هۆی نامەکەوە دڵی داگرتبوو، بیسڕێتەوە و گوتی: راستم پێبڵێ کاتێك نامەکەم بە دەستت گەیشت رقت هەستا و بڕوات بە قسەکانم کرد؟

لەگەڵ گوتنی ئەو قسەیە بۆی دەرکەوت، ئەگەرچی لەو ساتەدا دڵی ڤرۆنسکی لێوڕێژ بوو لە خوشەویستیی ئەو بەڵام ماجەرای نامەکەی هەر لە بیرە و لێیخۆش نەبووە.

ڤرۆنسکی گوتی: بەڵێ، لە نامەکەت تێنەگەیشتم. لەلایەکەوە نووسیبووت ئانی نەخۆشە و لەلایەکی تریشەوە خۆت دەتویست بێی.

ـ هەمووی راست بوو.

ـ گومانم نییە.

ـ بۆ گومانت نییە. خۆ دەزانم لە من رازی نییت.

ـ ئانا، شتیوا نابێ! هەڵبەت راستیشە، هێندێك لێت دڵمەند بووم، چونکە دەڵێی ناتەوێ قەبووڵی بکەی کە هێندێ جار لە کۆمەڵگادا مرۆڤ ئەرکێکی لەسەر شانە کە....

ـ ئەرکی چوون بۆ کونسێرت...

ڤرۆنسکی گوتی: چاکە، با زۆری لەسەر نەڕۆین.

ـ بۆ قسەنەکەین؟

ـ من تەنیا دەمەوێ بڵێم کە هێندێ جار کار و ئەرکی وا دێتە پێشێ کە مرۆڤ ناتوانێ وازی لێبێنێ. بۆ وێنە هەر ئێستا، بەمزووانە ناچارم بۆ ئەنجامدانی کارێکیماڵی بچم بۆ مۆسکۆ... ئاخ، ئانا، تۆ بۆ ئاوا زوو تێکدەچی؟ ئاخر نازانی من بەبێ تۆ ناتوانم بژیم؟

ئانا کە لەناکاو دەنگی گۆڕابوو گوتی: ئاخ، ئاوا! دەزانیچی، ئەم ژیانە بارێکی قورسە لەسەر دڵت. هێشتا نەهاتوویەوە دەتهەوێ بڕۆی. وەك ئەو کەسانەی کە....

ـ ئانا تۆ زۆر دڵڕەقی. من ئامادەم تەواوی ژیانم فیدای تۆ بکەم...

بەڵام ئانا ئیتر گوێی بۆ رانەدەگرت.

ـ ئەگەر تۆ بچی بۆ مۆسکۆ منیش دێم. من لێرە نامێنمەوە. یان دەبێ لێکجیا بینەوە یان پێکەوە بژیین.

ـ تۆ دەزانی من لەوە زیاتر هیچ ئاواتێکم نییە. بەڵام بۆ ئەو کارە...

ـ دەبێ تەڵاق وەرگرم؟ باشە، بۆی دەنووسم. دەزانم ئیتر ئەو جۆرە ژیانە ناگونجێ... بەڵام لەگەڵ تۆ دێم بۆ مۆسکۆ.

ڤرۆنسکی بە پێکەنینەوە گوتی: جۆرێك دەدوێی کە قسەکانت بۆنی هەڕەشەی لێدێ. من هیچ ئاواتێکم نییە جگە لەوەی هەمیشە لەگەڵ تۆ بم.

بەڵام لەگەڵ گوتنی ئەو قسە پڕ لە خۆشەویستییانە نەك وشکی و ساردی بەڵکوو رق و تووڕەیی پیاوێکی داماو و ئاڵەتی لە چاوانیدا ترووسکەی دەهات.

ئانا ئەو ترووسکەیەی دی و بە جوانی لە ماناکەی گەیشت.

ئەو روانینە دەیگوت «ئەگەر ئاوابێ، کارەساتە!» هەستێکی زووتێپەڕ بوو بەڵام ئانا قەت فەرامۆشی نەکرد.

ئانا نامەیەکی بۆ مێردەکەی نووسی و داوای لێکرد تەڵاقی بدات. لە کۆتاییی مانگی نوامبردا لەگەڵ پرێنسس ڤارڤارا، کە دەیویست بەرەو پترزبۆرگ وەڕێ بکەوێت ماڵئاواییان کرد و لەگەڵ ڤرۆنسکی چوو بۆ مۆسکۆ و لە چاوەڕوانیی وەڵامی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ و تەڵاقنامەدا، وەکوو هاوسەرێك لە ماڵی ڤرۆنسکی نیشتەجێبوو.

# یەك

لەڤین و ژنەکەی زیاتر لە دوو مانگ بوو لە مۆسکۆ دەژیان. بەپێی ئەو ڕێکەوتەی کە کەسانی شارەزا لە بواری دووگیانی و زایەماندا بۆ بوونی منداڵەکەی دەستنیشانیان کردبوو، ماوەیەکی زۆری لادابوو و کیتی هێشتا منداڵەکەی نەبووبوو، هیچ دیاردەیەکیش نەبوو بۆ ئەوەی بۆیان روون بێتەوە کە لێبوونەوەکە لە چاو دوو مانگ لەمەوبەر نزیکتر بووبێتەوە. دوکتۆر و مامان و دالی و پرێنسس و بەتایبەت لەڤین کە نەیدەتوانی بەبێ ترس و دڵەخورپە بێت و بەردەوام بیر لەو کێشەیە نەکاتەوە، هەموو ئۆقرەیان لێهەڵگیرابوو و دڵنیگەران بوون، لەو ناوەدا تەنیا کیتی بوو کە زۆر ئارام و بێخەم هەڵسوکەوتی دەکرد و دەتگوت مێشێکیشی میوان نییە.

ئێستا بە روونی لەوە ئاگاداربوو کە ئەشقێکی تازە سەبارەت بە کۆرپەی داهاتوو (کە هەر ئێستا بە پاژێکی جەستەی خۆی دەزانی.) لە دڵیدا گووراوە و بە چێژێکی زۆرەوە خۆی ئاوێتەی ئەو هەستە کردبوو. ئەم کۆرپەیە ئیتر بەشێك لە جەستەی ئەو نەبوو کە جیابوونەوە لێی بە بیریشدا نەیەت، بەڵکوو هێندێ جار جودا لە خۆی دەژیا. ئەم حاڵە زۆر جار بۆ کیتی زۆر تاڵ و بەژان بوو بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئەو ئەوینە، سەیر و نوێیە رۆحی ئاوێتەی شادی دەکرد و دەیویست بدات لە قاقای پێکەنین.

هەموو ئەو کەسانەی خۆشی دەویستن لێی نزیکبوون و بە دڵ خۆشیان دەویست و ئاگادارییان لێدەکرد و ئەوەی دەیدی تەنیا حەز و جوانی بوو، بەجۆرێك ئەگەر نەیزانیبایە و هەستی نەکردبایە کە ئەم دەورانە زۆر زوو کۆتاییی پێدێ ژیانێکی باشتر و شیرینتر لەوەی بۆ خۆی بەئاوات نەدەخواست. تەنیا شتێك کە ڕێژەیەك خۆشییەکەی لێشلوێ دەکرد ئەوەبوو کە مێردەکەی لە ژیانی شیرین و خووپێگرتووی گوند بێبەش بوو.

کیتی لە گوند شەیدای هێمنایەتی و سەروڕووخۆشی و میوانگریی مێردەکەی بوو. بەڵام لەڤین لە شار زۆر بە پارێزەوە هەڵسوکەوتی دەکرد، دەتگوت لەوە دەترسێ شتێك، یان لە خۆی گرینگتر، کیتی ئازار بدات. لەڤین هەستی دەکرد لە شوێنی راستەقینەی خۆی دڵحەساوەیە و

دەیزانی بەرد لە جێی خۆی قورسە، لە هیچ کارێکدا بە هەڵپە و تاڵووکە نەبوو و بێکاریش دانەدەنیشت، بەڵام لێرە لە شار، هەمیشە بەپەلە بوو، دەتگوت لەوە دەترسێ هەلێك لەدەست بدات و کارێك بە نیوەچڵی بهێڵێتەوە، ئەگەرچی هیچ کارێکیش نەبوو و کیتی بە دیتنی ئەم بارودۆخە دڵی پێیدەسووتا. دەیزانی کە لەڤین بە هیچ جۆرێك وانییە ئەم و ئەو بەزەیییان پێیدا بێ، بەپێچەوانە، هەرکاتێك لە کۆڕێکدا بە چاوێك تەماشای دەکرد، کە مرۆڤ چاو لە خۆشەویستی خۆی دەکات و هەوڵدەدات وەك بێگانەیەك بیهێنێتە بەرچاوی خۆی تاکوو بتوانێ ئەو هەستەی کە لە ناخی دی تراندا وەئاگای دێنێ لەودا بیدۆزێتەوە، بە ترسێکەوە کە سەرچاوەی چەشنێك ئێرەیی بوو دەیدی مێردەکەی نەك شایانی دڵسۆزی نییە، بەڵکوو بە قەڵافەتێکی لەبار و ڕەسەن و خاوەن دابونەریتێکی قەدیمییانە و شەرمنانەوە کاتی بەرەوڕوو بوون لەگەڵ ژنان، بەو ئەندامە بەهێزەوە روخساری لەبەر چاوی ئەو جوان و بەرچاوە و زۆر سەرنجڕاکێشیشە. بەڵام ئەو لەڤینی نەك لە دەرەوە بەڵکوو لە ناخەوە دەدی. دەیدی ئەوە جەستەی ڕاستەقینەی خۆی نییە. لێکدانەوەیەکی تریشی بۆ روونکردنەوەی ئەم حاڵەی ئەو پێشك نەدەهات. هێندێ جار لە دڵی خۆیدا بە هۆی ئەوەی ناتوانێ لە شار بژی لۆمەی دەکرد، بەڵام هێندیجار دەیدی دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیان بەو جۆرەی رازیی بکات بەڕاستی دژوارە بۆی.

بەڕاستی لەڤین چیی لەدەست دەهات؟ خۆ قومار لەو نەدەوەشایەوە. بۆ باشگا نەدەچوو. کیتی ئێستا دەیزانی تێکەوتن لەگەڵ پیاوانی سەروڕووخۆش و جەفەنگبازی وەك ئابلۆنسکی چ مانایەکی هەیە. هاوڕێبوون لەگەڵ ئەوان یانی مەی فڕکردن و پاشان ڕۆیشتن بۆ چەشنە جێگایەك. ئەو نەیدەتوانی بیر لەو شوێنانە بکاتەوە کە پیاوان لە بارودۆخی ئەوتۆدا رووی تێدەکەن و ترسی لێنەنیشێ. جگە لەوانەش لەڤین دەیتوانی لە میوانداریییەکاندا بەشداری بکات. بەڵام کیتی دەیزانی پیاوان لە کۆڕەکاندا دەبێ لەگەڵ ژنانی جوان و جحێڵ هاودەم بن و چێژی لێوەرگرن، بەڵام ئەو چێژەی بۆ مێردەکەی خۆی حەز پێنەدەکرد. دەیتوانی لە ماڵێ لەلای خۆی و دایکی و خوشکی بمێنێتەوە. بەڵام ئەگەرچی خۆی چێژی لەو دەمەتەقێ و رابواردنانەی نێوان خوشکەکانی، یان پرێنسس گوتەنی «ئالین چیی گوت و نادین چیی کرد» وەردەگرت و دەیزانی کە بۆ مێردەکەی جگە لە دڵتەنگی ئاکامێکی تری نییە. دەی باشە، لەڤین ئیتر دەیتوانی چ بکات؟ درێژە بە نووسینی کتێبەکەی بدات؟ هەوڵی دابوو ئەو کارە بکات و چووبوو بۆ کتێبخانە و چەند یادداشتی بۆ کتێبەکەی هەڵگرت و هێندێ زانیاریی

وەدەست هێنابوو بەڵام هەروەك پێیگوتبوو، وای بە بیردا دەهات کە هەرچەند کەمتری کار دەکرد کەمتر کاتی کارکردنی بۆدەمایەوە. بێجگە لەوەش سکاڵای بوو لەوەی کە لێرە لەڕادەبەدەر سەبارەت بە کتێبەکەی چەنەدرێژی کردووە و بیر و زەینی شێواوە و ئیتر هۆگریی پێینەماوە.

تەنیا کەڵکی ژیان لەم شارە ئەوەبوو کە لێرە تووشی کێشە و دەمقڕە نەبووبوون. بێژی ئەمە بەو هۆیەوە بێت کە لە شار بارودۆخێکی تر حاکم بوو یان بۆ ئەوە بوو هەردووکیان لێرە لەو بارەوە زیاتر خۆیان دەپاراست و هەوڵیان دەدا قسەیان لێکهەڵنەبەزێتەوە و ژیرانەتر هەڵسوکەوتیان دەکرد؟ هۆیەکەی هەرچییەك بوو، روون بوو کە دەمەقاڵێ بە هۆی ئێرەیی و خانەگومانییەوە، کە کاتی هاتن بۆ مۆسکۆ لێیدەترسا، بە هیچ شێوەیەك لەنێوانیاندا رووی نەدابوو.

لەو بارەوە تەنانەت رووداوێك روویدا کە بۆ هەردووکیان گرینگ بوو، ئەویش چاوبەیەك کەوتنی کیتی و ڤرۆنسکی بوو.

پرێنسس ماریا بارسیۆڤنا، دایەنی بەساڵاچووی کیتی کە زۆری خۆشدەویست، حەزی دەکرد هەرچۆنێکە چاوی پێیبکەوێ. کیتی بەو دووگیانی و بارودۆخە تایبەتەیەوە نەیدەتوانی بۆ هیچ کوێ بچێت، بەڵام هەرچۆنێك بوو لەگەڵ باوکی چوو بۆ سەردانی ئەو پیرێژنە بەڕێزە و لەوێ چاوی بە ڤرۆنسکی کەوت.

تەنیا رەخنەیەك کە کیتی دەیتوانی لەمەڕ ئەو رووداوەوە لە خۆی بگرێ ئەمەبوو کە هەرکە چاوی بە روخساری ئاشنای ڤرۆنسکی کەوت و بە جلوبەرگی سفیلەوە دیتی، کەوتە هەناسەبڕکێ و دڵەکوتێ و هەستی کرد کە روخساری بە توندی سوورهەڵگەڕاوە. بەڵام ئەم حاڵە زۆری نەخایاند. هێشتا باوکی کە بە ئانقەست بە دەنگی بەرز سڵاو و چاکوچۆنیی لەگەڵ ڤرۆنسکی کرد، نەکەوتبووە قسە کە کیتی لە هەموو بارێکەوە ئامادەبوو تاکوو بە پێی پێویست هێندە ئاسایی لەگەڵ ڤرۆنسکی بدوێ وەك ئەوەی لەگەڵ ماریابارسیۆڤنا. گرینگتر لەوەش شێوەی قسەکردنی لەگەڵیدا جۆرێك بوو، کە مێردەکەی (کیتی هەنتەشی نادیاری ئەوی لەو دیدارەدا لە پەنا خۆی هەست پێدەکرد) بە شیاوی بزانێ.

کیتی تۆزێکی قسە لەگەڵ کرد و تەنانەت زۆر ئاسایی بە قسە و جەفەنگەکانی سەبارەت بە هەڵبژاردن گرژییەوە، کە ئەو بە گاڵتە «هەڵبژاردنی پەرلەمانەکەمان»ی پێدەگوت. ئەم زەردەیە پێویست بوو تاکوو وابنوێنێ کە لە گاڵتەکەی گەیشتووە، بەڵام خێرا رووی لێوەرگێڕا و لەگەڵ پرێنسس کەوتە قسە و ئیتر تەنانەت بۆ جارێکیش چاوی لێنەکرد هەتا ئەو کاتەی

ڤرۆنسکی هەستا و خوداحافیزی لێکرد. ئەو کاتە چاوێکی لێکرد چونکە چاولێنەکردنی پیاوێك کە کڕنۆشت بۆ دەبات نیشاندەری بێئەدەبییە.

کیتی لە دڵەوە ڕێزی بۆ باوکی هەبوو کە سەبارەت بەو دیدارە لەگەڵ ڤرۆنسکی قسەی نەکرد، بەڵام لە کاتی پیاسەی ڕۆژانەدا هەستی بە مێهرەبانیی باوکی کرد دەرهەق بە خۆی و تێگەیشت کە باوکی لە هەڵسوکەوتی ئەو لەگەڵ ڤرۆنسکی ڕازی بووە. خۆشی لەو ئاکارەی خۆی ڕازی بوو. بە هیچ جۆرێك ئەو چاوەڕوانییەی لە خۆی نەبوو کە بتوانێ تەواوی بیرەوەرییەکانی و هەستی ڕابردووی سەبارەت بە ڤرۆنسکی لە قووڵاییی دڵیدا بنێژێ. نەك ئەوەیکە وابنوێنێ بەڵکوو بەڕاستی دەیویست لە هەنتەشی ئەودا خوێنسارد بێ و هیچ هەمیەتێکی پێنەدات.

کاتێك بە مێردەکەی گوت کە لە ماڵی پرێنسس ماریابارسیۆڤنا چاوی بە ڤرۆنسکی کەوتووە لەڤین لە ئەو زیاتر سوورهەڵگەڕا. گێڕانەوەی ئەو دیدارە بۆ کیتی زۆر دژوار بوو بەڵام بە وردی باسکردنی زۆر لەوە تاڵ و ناخۆشتر بوو، چونکە لەڤین لەم بارەوە هیچ پرسیارێکی لێنەدەکرد و تەنیا بە نیوچاوانێکی گرژەوە چاوی تێبڕیبوو.

کیتی گوتی: حەیفێ تۆ لەوێ نەبووی، هەڵبەت مەبەستم ئەوە نییە تۆ لە ژوورەکەدا ئامادە نەبووی... ئەگەر لەوێ بوایەی هەڵسوکەوتی من ئاوا سروشتی و خوێنساردانە نەدەبوو. من ئێستا کە لەگەڵ تۆ دەدوێم زۆر زیاتر، زۆر زۆر زیاتر لەو کاتە سوورهەڵگەڕاوم...ـ کە ئەو قسەی دەکرد بەڕادەیەك سوورهەڵگەڕابوو کە خەریکبوو دەستبکات بە گریان: بەڵام حەزم دەکرد لەوێ بوایەی و لە پشت دەرگاکە و لە کەلێنێکەوە هەمووشتێکت بدیبایە.

چاوە ڕاستوێژەکانی کیتی پێیدەگوت کە لە هەڵسوکەوتی خۆی ڕازییە و لەڤین سەرەڕای سوورهەڵگەڕانی ئەو خێرا دڵی حەساوە و دەستیکرد بە پرسیارکردن سەبارەت بە ڤرۆنسکی و ئەوەش ئەو شتە بوو کە کیتی حەزی پێدەکرد. کاتێك هەموو شتێکی بۆ گێڕایەوە و هیچ وردەکارییەکی بەجێ نەهێشت و تەنانەت گوتی سوورهەڵگەڕانی ڕوخساری تەنیا ئەو ساتەی سەرەتا بووە و ئەم بەرەوڕوو بوونەی کتومت وەکوو بەرەوڕوو بوون لەگەڵ نەناسیاوێك ئاسان بووە، لەڤین بە تەواوی هاتەوە سەرخۆ و گوتی زۆری ئەو کارەی کیتی بەدڵە و ئێستا ئیتر وەك ئەو ڕۆژەی هەڵبژاردن کەمتەرخەمانە لەگەڵ ڤرۆنسکی هەڵسوکەوت ناکات، لە یەکەم دەرفەتیشدا کە بۆی هەڵکەوێ هەوڵ دەدات هەتا دەتوانێ دۆستانە لەگەڵی بەرەوڕوو بێت.

گوتی: چەندە ناخۆشە مرۆڤ کەسێك بە دوژمنی خۆی بزانێ و بەرەوڕووبوون لەگەڵیدا بەلایەوە دژوار بێ. من بەش بەحاڵی خۆم زۆر خۆشحاڵم.

# دوو

کاتێك لەڤین سەعات یازدە، بەر لە چوونەدەرێ لە ماڵێ چوو بۆ لای ژنەکەی، کیتی پێیگوت: تکایە بچۆ سەرێك لە ماڵی بۆل[54] هەڵێنە. دەزانم فراوێن لە باشگا دەخۆن. باوەگیان ناوەکەتی تۆمار کردووە. بەڵام هەتا کاتی فراوێن چی دەکەی؟

لەڤین وەڵامیدایەوە: هیچ، تەنیا دەچم بۆ سەردانی کاتاڤاسۆڤ.

ـ ئاوا زوو؟

لەڤین گوتی: ئەو بەڵێنیداوە لەگەڵ مترۆڤ[55] بە یەکمان بناسێنێ. زۆرم حەزدەکرد سەبارەت بە کێتبەکەم لەگەڵی بدوێم. ئەم مترۆڤە هەر ئەو بیرمەندە بەناوبانگەکەی پترزبۆرگە.

کیتی گوتی: بەڵێ، هەر ئەوکەسەیە کەتاریفی وتارەکەیت دەکرد؟ دەی باشە، دواتر چیدەکەی؟

ـ سەرێکیش لە یانەی داد هەڵدێنم، بزانم ئەو کارەی خوشکم بە کوێ دەگا.

ـ ناچی بۆ کۆنسێرت؟

ـ بە تەنیا بچم بۆ کۆنسێرت چ بکەم؟

ـ نا، حەتمەن بچۆ. ئەو ئاوازە تازانە لێدەدەن کە ئەو کاتانە زۆرت حەز پێدەکرد. ئەگەر من بە جێی تۆ بوایەم حەتمەن دەچووم.

لەڤین چاوێکی لە کاتژمێرەکەی کرد و گوتی: هەرچۆنێك بێ بەر لە فراوێن سەرێك لە ماڵێ هەڵدێنم.

ـ ڕێدنگووتەکەت لەبەر بکە با یەکجاری سەرێکیش لە کۆنتسبۆل هەڵێنی.

ـ یانی حەتمەن پێویستە بچم؟

ـ حەتمەن! مێردەکەی هاتووە بۆ سەردانی ئێمە. چ زەحمەتێکی هەیە بۆ تۆ؟ بەسەر پێیەکەوە دەچی، دادەنیشی . پێنج خولەك باسی بارودۆخی هەوا و ئەم جۆرە شتانە دەکەی و هەڵدەستی دێیتەوە!

---

54- Bohl

55- Metrov

ـ باوەڕ ناکەی، ئەو جۆرە سەردان و هاتوچۆیانەم وەها لەبەرچاو کەوتووە کە پێمعەیبە. ئاخر ئەوەش بوو بەکار؟ دەڵێن کەسێك لەخۆوە هات، دانیشت، مزاحیمی کارەکەمان بوو و خۆشی ئازاردا و هەستا و ڕۆیشت.

کیتی دەستیکرد بە پێکەنین.

گوتی: بەڵام کاتێك ژنت نەهێنابوو دەچووی بۆ سەردانی ئەم و ئەو.

ـ دەچووم و هەمیشە هەستم بە شەرمەزاری کردووە. بەڵام ئێستا هێندە لەمێژە نەچووم بۆ دیدەنیی ئەم و ئەو خودا دەزانێ حەزدەکەم دوو ڕۆژ دەم لە نان و ئاو نەدەم بەڵام بۆ ئەو دیدەنییانە نەچم. هەر بەڕاستی شەرم دەکەم. بەڕاستمە زۆرم پێعەیبە. وا هەستدەکەم پێیان ناخۆشە و دەڵێن «هیچ کارێکی نییە بۆ هاتووە؟»

کیتی بە پێکەنینەوە چاوی لە چاوی بڕی و گوتی: نا، دڵنیابە پێیان ناخۆش نییە. ئەگەر پێیان ناخۆش بوو لەسەر منـ دەستی گرت و گوتی: باشە خوداحافیز! تکات لێدەکەم بچۆ بۆ سەردانیان!

لەڤین دەستی ژنەکەی ماچکرد و خەریکبوو بڕوات کیتی دیسان رایگرت و گوتی: کۆسیتا، دەزانی تەنیا پەنجا ڕۆبڵم پارە پێماوە؟

شوێنەواری نارەزایەتی کە کیتی پێی ئاشنابوو لە روخساری لەڤیندا وەدیار کەوت. گوتی: باشە، خەمت نەبێ. خێرا دەچم بۆ بانك. چەندەت پێویستە؟

کیتی دەستی مێردەکەی گرت و گوتی: نا، پەلە مەکە. دەبێ لەوبارەوە قسە بکەین. من زۆر لەم بارودۆخە بێزارم. ئەگەرچی هەڵەخەرجی ناکەم بەڵام ئەو پارەیە دەڵێی ئاوری پێوەدەنێی. ژیانی ئێمە شتێکی تێدایە کە دروست نییە.

لەڤین بە کۆخەیەك گەرووی ساف کرد و لە بن چاوەوە لە کیتی روانی و گوتی: قەت شتیوا نییە!

کیتی لەگەڵ ئەو گەروو سافکردنەی ئاشنابوو. ئەم کۆخەیە بە مانای نارەزایەتیی بوو. هەڵبەت نەك نارەزایەتی لە ئەو بەڵکوو لە خۆی. ئەو بەڕاستی ناڕازی بوو، بەڵام نەك بە هۆی ئەوەی خەرجەکەیان زۆر بوو. دڵگرانییەکەی بۆ ئەوەبوو شتێکیان وەبیردەهێنایەوە کە ئەو، ئەگەرچی دەیزانی باش نییە، حەزی دەکرد لە بیری بەرێتەوە.

ـ بە سۆکۆلۆڤم[56] گوتووە گەنم بفرۆشێ و ئیجارەی ئاشەکەش لە پێشدا وەرگرێ. وەلحاسڵ خەمت نەبێ پەکمان ناکەوێت.

---

56- Sokolov

ـ نا، بەڵام من دەترسم کە لەسەریەك خەرجمان زۆر...

لەڤین دووپاتی کردەوە: خەمت نەبێ، نانا.... زۆر چاکە، خوداحافیز خۆشەویستەکەم.

ـ نا، بەڕاستیمە، من هێندێ جار لەوەی کە بە قسەی دایەگیانم کردووە پەشیمانم. لە گوند بوایەین زۆر باشتر بوو. هاتووین بۆ ئێرە و بووینە هۆی ئازار و ئەزیەتی هەمووان و ئەم هەموو پارەیەش لە ئاو دەکەین.

ـ نا، وانییە، لەو کاتەوە لەگەڵ تۆم هیچ کات نەبووە بڵێم بریا ژیانم وەك ئێستا نەبوایە، یان پەشیمان بم....

کیتی راست چاوی لە چاوی بڕی و پرسیی: بەڕاستیتە؟

لەڤین بەبێ بیرکردنەوە و تەنیا بە مەبەستی دڵخۆشیدانەوەی کیتی ئەو قسەیەی کردبوو، بەڵام کاتێك چاوی لە روخساری کرد و دیتی کە ئەم چاوە راستوێژ و مێهرەبانانە لەسەر چاوی گیرساونەتەوە، ئەوەی گوتبووی بە دڵ و گیان دووپاتی کردەوە. بە خۆی گوت: من بەڕاستی ئەوم لەبیرچۆتەوە.» وەبیریشی هاتەوە کە بەمزووانە چ رووداوێك چاوەڕوانیانە.

هەردوو دەستی کیتیی گرت و لەسەرەخۆ گوتی: زۆری ماوە؟ هەست بەچی دەکەی؟

ـ هێندەم بێهۆ بیرکردۆتەوە کە ئێستا ئیتر هیچ هەستێکم نییە و هیچ نازانم.

ـ ئەی ناترسی؟

کیتی زەردەیەکی گرت و گوتی: تەنانەت بەقەد نووکە دەرزییەکیش.

ـ باشە، ئەگەر هەواڵێك بوو، من لەلای کاتاڤاسۆڤ دەبم.

ـ نا، هیچ هەواڵێك نابێ و بیریشی لێمەکەوە. من لەگەڵ باوەگیان بۆ پیاسەکردن دەچم بۆ بلۆار. سەرێکیش لە دالی هەڵدێنین. بەر لە فراوێن چاوەڕوانت دەبم. ئەرێ زانیوتە بارودۆخی دالی خەریکە بە بنبەست دەگا؟ تا ملان کەوتۆتە ژێر قەرز و هیچ شتێکیان بەدەستەوە نەماوە. دوێنێ لەگەڵ دایەگیان و ئارسنی (ئەو مێردەکەی خوشکی، پرێنس لۆوڤی بەو ناوە بانگ دەکرد) قسەمان دەکرد و قەرارمان دانا کە تۆ و ئارسنی بەگژ ستیڤادا بکەین. ئەو بارودۆخە ئیتر ناگونجێ. لەگەڵ باوەگیان لەوبارەوە ناکرێ قسە بکەین. بەڵام ئەگەر تۆ و ئارسنی...

لەڤین گوتی: باشە، بەڵام ئێمە چیمان لەدەست دێ؟

ـ چۆن چیتان لەدەست دێ؟ تۆ بچۆ بۆ لای ئارسنی و قسەی لەگەڵدا بکە. ئەو پێتدەڵێ کە ئێمە چ قەرارێکمان داناوە.

ـ باشە، هەرچی ئارسنی بیڵێ، من قەبووڵمە و چۆن بڵێ وادەکەین. کەوایە من دەچم بۆ لای ئەو. راستی ئەگەر بچم بۆ کۆنسێرت لەگەڵ ناتالی دەچم. باشە، ئیتر خوداحافیز!

لەسەر پلیکانەکان، کۆزمای پیر، کە لە کاتی رەبەنیی ئەوەوە پێشخزمەت بوو و ئێستا بەرپرسی کاروباری ماڵێ بوو لە شاری، لەڤینی راگرت و گوتی:

ـ کراساڤچیک[57] ـ ئەمە ناوی ئەسپێك بوو کە لەلای چەپی هێلینگەکە دەکرا و لە گوندەوە هێنابوویانـ ئەگەرچی ناڵەکەیان تازە لێگۆڕیوە، هەروا دەشەلێ. چی دەستوور دەفەرموون؟

لەڤین لەسەرەتای نیشتەجێبوونییەوە لە مۆسکۆ حەزی دەکرد ئەو ئەسپانە لە فایتوون و هێلینگەکان بکەن کە لە گوندەوە هێناویانە... دەیویست مەسەلەی هاتوچۆ باشتر و هەرزانتر بکەوێ، بەڵام بۆی دەرکەوت کەڵکوەرگرتن لە ئەسپەکانی خۆی لە ئەسپی کرێ گرانتر دەکەوێ و لە ئاکامدا ئەسپیان بەکرێ دەگرت.

ـ بنێرە بەدوای پزیشکی ئاژەڵدا بێت و پشکنینی بۆ بکات. رەنگە لاقی زەبری وێکەوتبێ.

کۆزما گوتی: بەسەرچاو! ئەی بۆ کاترینا ئەلکساندرۆڤنا (یانی کیتی) چ بکەین؟

لەڤین ئیتر وەك سەرەتای هاتنی بۆ مۆسکۆ پێی سەیر نەبوو کە بۆ رۆیشتن لە شەقامی ڤاژدۆڤیژنکاوە بۆ شەقامی سیڤتسك ڤراژك[58] دوو ئەسپی بەهێز لە فایتوونێکی قورس بکەن. تاکوو چوارسەد مەتر ئەو فایتوونە بە شەقامی پڕ لە بەفر و قوڕ و زێلاقەدا راکێشێ و چوار سەعات لەوێ چاوەڕێ راوەستی و پێنج رۆبڵ وەرگرێ. ئێستا ئەو کارەی زۆر بە شتێکی ئاسایی دەزانی.

گوتی: بڵێ دوو ئەسپ بەکرێ بگرن و لە فایتوونەکەی خۆمانی بکەن.

ـ بەسەرچاو قوربان.

ئەو گرفتەی گوند کە پێویستی بە کار و پێڕاگەیشتنی زۆر بوو، بە هۆی بەرەکەتی هەلوومەرجی شارەوە ئاوا بە ئاسانی چارەسەر کرابوو، لە ماڵێ هاتەدەرێ و لە سەربانیژەی تەنیشت پلیکانەکانەوە بانگی فایتوونێکی کرد و لێیسوار بوو و رۆیشت بۆ شەقامی

57- Krasavchik

58- Sivtsek Vrazhek

تینسکایا. بەدەم ڕێگاوە ئیتر بیر و زەینی خەرکاوی کێشەماڵییەکان نەبوو، بەڵکوو لە بیری ئەوەدا بوو کە چۆن لەگەڵ بیرمەندی پترزبۆرگی کە لە مەبەستە کۆمەڵناسییەکاندا خاوەنڕا بوو ئاشنا دەبێت و سەبارەت بە کتێبەکەی دەڵێچی.

تەنیا لە سەرەتای نیشتەجیبوونی لە مۆسکۆ بوو ئەو مەزێخە نابەجێ و بێداهاتە بەڵام پێویستانەی کە بە بڕوای دانیشتووانی گوند سەیری دەنواند و لە هەموو لایەکەوە ورووژمیان بۆ دەهێنا تووشی سەرسووڕمانی دەکرد. بەڵام ئێستا ئیتر خووی بەو مەزێخانە گرتبوو. لەو ڕوانگەیەوە ڕاست ئەو حاڵەی هەبوو کە لە پەندا دەڵێن مەیخۆرەوە هەیانە: پەرداخی یەکەم زەبری پەیاغ، پەرداخی دووهەم فڕینی هەڵۆ، لە سێ بەولاوە ڕەوەیەك سێروو. کاتێك لەڤین یەکەم گەڵای سەد ڕۆبڵی ورد کردەوە تاکوو جلوبەرگی تایبەت و کەلبەدوونکراو بۆ دەرگاوان و پێشخزمەتەکەی بکڕێ، لەلای خۆی حیسابی کرد کە نرخی ئەو جلوبەرگانە کە بەکاری هیچ نەدەهاتن ـ بەڵام بە ڕوانین لە سەرسووڕمانی پرێنسسی گەورە و کیتی بۆ ئەو کینایەی ئەو لەمەڕ بێکەڵکبوونی ئەوانەوە، بۆ چاوپۆشی نەدەبوون ـ هاوپەرای هەق و مزی دوو کرێکار بوو لە شەش مانگەی بەهار و هاویندا، یانی نزیك بە هەقو مزی سێسەد ڕۆژ کار، لە جێژنی پاکەوە هەتا ڕۆژی کەرنەڤاڵ، سێسەد ڕۆژ کاری تاقەتپڕووکێن هەر لە بەیانییەوە هەتا کۆتایی شەو. ئەم یەکەم گەڵا سەد ڕۆبڵییە وەکوو زەبری یەکەم پەیاغ وابوو. گەلایەکی دیکەی سەد ڕۆبڵیی ورد کردەوە بۆ کڕین و دابینکردنی خواردن و میواندارییەك کە خزمە نزیکەکان بانگهێشتن کرابوون، ئەویش بیست و هەشت ڕۆبڵی تێچوو و بە پێدانی ئەو گوژمەیە وەبیری هاتەوە کە بیست و هەشت ڕۆبڵ نرخی بەرهەمی دە چتۆرت (پێنج دسیاتین) گەنمە کە بە ڕەنج و زەحمەتێکی زۆر دەدووردرێتەوە و باقە دەبەستن و گێرەوکێشە و شەنوکەوی دەکەن و لە جەواڵ و تالینگەی دەکەن. (کە ئەم کارەی دوایی لە هەمووی ئاسانترە). بەڵام ماوەیەك بوو ئەسکەناس ورد دەکرانەوە و ئیتر نەدەبووە هۆی ئەو حیساب و کیتاب و بیرکردنەوانە و پارە وەك ڕەوەیەك سێروو هەڵدەفڕین و بە دەم بادا دەدران. یانی زەحمەتێك کە بۆ وەدەستهێنانی پارە دەکێشرا لەگەڵ ئەو چێژەی کە بۆ خەرجکردنی ئەو پارەیە هەیانبوو، یەکی دەگرتەوە؟ ئەوە بیر و خەیاڵێك بوو کە ماوەیەکی زۆر بوو لە زەینیدا سەریهەڵنەدەدا. ئەو حیسابڕاگرتن و داهاتووبینییەی تایبەتی وەرزێڕانیش، یانی ئەو نرخەی کە بۆ گەنمی لەبەر چاو دەگرن و لەوە کەمتر نایفرۆشن، لە بیری چووبۆوە. ئەو جۆیەی کە ماوەیەکی زۆر بوو بلەوەزانە هەوڵی دەدا لە نرخی دیاریکراو کەمتری نەفرۆشێ بە پەنجا کاپك هەرزانتر لە نرخی مانگێك لەمەوبەر فرۆشتی. تەنانەت ئەو فیکرەی کە بەو هەڵەخەرجی و تەخشانوپەخشانە ساڵێکی پێناچێ

دەکەوێتە ژێر باری قەرزوقۆڵەوە، بەلایەوە هیچ مانایەکی نەبوو. تەنیا پێویستی بە شتێك بوو، ئەویش ئەوەبوو کە پاشەکەوتی پارەی پێویست لە هەرکوێ بێ و بە هەرشێوەیەك بێ دەبێ لە بانکدا هەبێت تاکوو بۆ کڕینی گۆشتی ڕەشەوڵاخ سبەینێ تووشی کێشە نەبن. ئەم ڕەوشتە تا ئێستا لەبەرچاو گیرابوو چونکە پاشەکەوتی پارەی لە بانك هەمیشە بەلانی زۆرەوە هەبوو. بەڵام ئێستا پاشەکەوتی پارەی بانکیش گەسکی لێدرابوو و نەیدەزانی پارە لەکوێ پەیدابکات. هەر بۆیە کاتێك کیتی باسی پارەی کرد لەڤین شڵەژا و ڕەنگی تێکچوو. بەڵام ئەو کاتی ئەوەی نەبوو بیر لە پارە بکاتەوە. لەنێو فایتوونەکەدا دانیشتبوو و بیری لەلای کاتاڤاسۆڤ و چاوپێکەوتنی تاوێکی تری لەگەڵ مترۆڤ بوو.

## سێ

لەڤین لەم سەفەرەدا دیسان لەگەڵ دۆستی پێشووی زانکۆی، پرۆفیسۆر کاتاڤاسۆڤ، کە لە ڕۆژی زەماوەندەکەیەوە ئیتر چاوی پێینەکەوتبوو دیداری تازە کردەوە. ئەو کاتاڤاسۆڤی بە هۆی ڕووناکبیری و ڕوانگەی گەشبینانەی بۆ ژیان خۆش دەویست. پێیوابوو ئەم گەشبینییەی کاتاڤاسۆڤ بە هۆی بێنیازیی سروشتی ئەوەوەیە و کاتاڤاسۆڤیش شڵەژاویی ئەندێشەی لەڤینی بە هۆی کەمبوونی مرێسیی زەینی ئەوەوە دەزانی. بەڵام لەڤین زۆری حەز بەم گەشبینییەی کاتاڤاسۆڤ دەکرد و کاتاڤاسۆڤیش ناتەکووزیی بیر و زەینی لەڤینی بەدڵ بوو، بۆیە هەردووکیان خوازیاری چاوپێکەوتن و باسوخواس لەگەڵ یەکتر بوون.

لەڤین چەند بەشێکی لە کتێبەکەی خۆی بۆ کاتاڤاسۆڤ خوێندبۆوە و کاتاڤاسۆڤ پەسندی کردبوو. کاتاڤاسۆڤ ڕۆژی پێشوو لەڤینی لە کۆڕێکی مژولیاش دیتبوو و گوتبووی مترۆڤی بەناوبانگ، کە ئەو (یانی لەڤین) وتارەکەی زۆر کەوتۆتە بەردڵ، لە مۆسکۆیە و ئەوەی ئەو (یانی کاتاڤاسۆڤ) سەبارەت بەو کتێبە بۆی باسکردووە بە شتێکی باش و جێی سەرنجی زانیوە. گوتبووی مترۆڤ ڕۆژی دوایی سەعات یازدە لە ماڵی ئەو (یانی ماڵی کاتاڤاسۆڤ) دەبێ و زۆری پێخۆش دەبێ لەگەڵی ئاشنابێت.

کاتاڤاسۆڤ لە هۆڵە چکۆڵەکەی خۆی پێشوازیی لە لەڤین کرد و گوتی: بەڕاستی وادیارە دێیە سەرڕێ، باوەگیان! زۆریش لەوبارەوە خوشحاڵم. دەنگی زەنگەکەم بیست گوتم وێناچێ ئەو

ئاوا بەڵێنەکەی بەرێتە سەرێ و لە کاتی خۆیدا ئامادەبێت... چاکە، بیروڕات سەبارەت بەو مۆنتەنێگرۆ[59]یانە چییە؟ هەر دەڵێی شەڕ لە خوێن و دەمارياندايە.

- بۆ چیبووە؟

کاتاڤاسۆڤ دوایین هەواڵەکانی بە وردی بۆ گێڕایەوە و لەگەڵیدا چوون بۆ نووسینگەکەی و بە پیاوێکی کورتەبالاً و قەڵەو و سەروڕووخۆشی ناساند. ئەم پیاوە مترۆڤ بوو. هێندێك سەبارەت بە سیاسەت و روانگەی لێژنەکانی بالاًی پترزبۆرگ لەمەڕ رووداوەکانی ئەم دواییيانەوە دوان. مترۆڤ قسەیەکی دەکرد کە ئیمپڕاتۆر و یەکێك لە وەزیرەکانیش لەو بارەوە هەر ئەوەیان گوتبوو و لەڤین لە ژێدەرێکی جێی متمانەی بیستبوو. بەلاًم کاتاڤاسۆڤیش لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی بیستبوو کە ئەو وتانەی ئیمپراتۆر بە گشتی لەگەڵ ئەوەی کاتاڤاسۆڤ بیستبووی جیاواز بوو. لەڤین هەوڵیدا دۆخێك لە زەینی خۆیدا سازبکات کە هەردوو رێوایەتەکە راست بنوێنێ و ئاخافتن لەوبارەوە کۆتاییی پێهات.

کاتاڤاسۆڤ گوتی: ئەم هاوڕێیەی من (یانی لەڤین) سیپارەیەکی نووسیوە سەبارەت بە هەلوومەرجی سروشتیی کرێکار و پێوەندی لەگەڵ خاکدا، کە دەکرێ بڵێین کتێبێك دەبێ. من لەو بوارەدا هیچ زانیارییەکم نییە، بەلاًم وەك پسپۆڕێکی زانستی سروشتی ئەو بەشەی کەوتە بەردڵم کە مرۆڤ وەك شتێکی بەدەر لە پانتای یاسای سروشتی نازانێ بەڵکوو بە پێچەوانە سەرنج دەداتە پێوەندیی مرۆڤ و ژینگەی خۆی و هەر لەو پێوەندییەدا بە دوای یاسای گۆڕانکاریدا دەگەڕێ.

مترۆڤ گوتی: زۆر شتی چاکە.

لەڤین سوورهەڵگەڕا و گوتی: راستییەکەی ئەوەیە کە من کارێکم لە بواری کشتوکاڵدا دەستپێکردووە، بەلاًم کاتێك لە گرینگترین کاری کشتوکاڵ یانی وزەی کارم کۆڵییەوە نەخوازراوانە بەو ئاکامە گەیشتم کە هیچ چاوەڕوانییەکم لێینەبوو.

ئەنجا بە پارێزەوە، وەك ئەوەی بیهەوێ بوارێك تاقی بکاتەوە، دەستیکرد بە شرۆڤەکردنی بیروڕای خۆی. دەیزانی مترۆڤ وتارێکی سەبارەت بە رەتکردنەوەی بیروڕای گشتی پەسندی ئابووری نووسیوە، بەلاًم نەیدەزانی هەتا چ رادەیەك دەتوانێ هیوای بە رازیبوونی ئەو سەبارەت بە بیرۆکە تازەکانی خۆی بێت و لە روخساری ئارام و وریا و بیرمەندانەی ئەویشدا نەیدەتوانی شتێك هەڵکرێنێ.

---

59- Montenegro

مترۆڤ گوتی: چ تایبەتمەندییەکت لە کرێکاری رووسیدا دیوەتەوە؟ یانی لە تایبەتمەندییەکانی بە ناو بوونەوەرناسیی ئەودا شتێکی تایبەت دەبینی یان لە بارودۆخی کۆمەڵایەتییدا؟

لەڤین دەیدی کە هەر ئەم پرسیارەی ئەندێشەیەکی تێدایە کە ئەو لەگەڵی هاوڕا نییە. سەرەڕای ئەوانەش دەستیکرد بە شرۆڤەکردنی ئەندێشەی خۆی، بەو مانایەی کە کرێکاری رووس پێوەندییەکی لەگەڵ زەوی هەیە کە لە چاو کرێکاری گەلانی تر جیاوازە و بە مەبەستی سەلماندنی ئەو بیروڕایەی خۆی بە تاڵووکە گوتیشی کە پێیوایە ئەم پێوەندییەی گەلی رووس لەگەڵ خاك بە هۆی ئاگادارییەتی لە ریسالەتی ئاوەدانکاری و پاراستنی هەرێمی مەزن و نائاوەدانی رۆژهەڵات.

مترۆڤ قسەکەی پێبڕی و گوتی: ناسینی ریسالەتی نەتەوەیەك کارێکی ورد و گرانە و پیاو لەوێدا بە ئاسانی تووشی هەڵە دەبێ. دۆخی کرێکار قەت لە چوارچێوەی پێوەندیی ئەو و زەوی و سامان دەرباز نابێ.

مترۆڤ ئیتر نەیهێشت لەڤین بیروڕای خۆی هەتا کۆتایی دەربڕێ و دەستیکرد بە راڤەکردنی هەڤیازییەکانی ئەندێشەی خۆی.

بەڵام لەڤین لە هەڤیازییەکانی ئەندێشەی ئەو تێنەگەیشت، چونکە زەحمەتی تێگەیشتنەکەی بەخۆی نەدەدا: دەیدی کە مترۆڤیش وەك دیتران، سەرەڕای وتارێك کە نووسیویەتی و لەودا بیروڕای خاوەنڕایانی ئابووریی رەتکردۆتەوە، بارودۆخی کرێکاری رووس تەنیا لە روانگەی پێوەندیی ئەو لەگەڵ سامان و هەقدەست و داهاتی مالیکانەوە تاوتوێ دەکات، ئەگەرچی ناتوانێ نکووڵی لەوە بکات کە لە رۆژهەڵات، یانی گەورەترین بەشی خاکی رووسیا، داهاتی مالیکانەبوونی نییە و هەقدەستی کرێکاریش بۆ نەوەد لە سەد لە هەشتا ملوێن حەشیمەتی رووسیا تەنیا ئەوەندەیە کە زگی خۆیانی پێتێر بکەن و سامانیش جگە لە ئامێر و کەرەسەی کار، ئەویش بە شێوەیەکی زۆر سەرەتایی، هێشتا بوونی نییە. لەگەڵ ئەوانەشدا، وزەی کاری تەنیا بەو شێوەیە لەبەرچاو دەگرت، ئەگەرچی لە زۆربەی لایەنەکانەوە لەگەڵ ئابووریناسان هاوڕا نەبوو و سەبارەت بە هەقدەست بیرۆکەیەکی دارشتبوو کە بۆ لەڤینی شرۆڤە دەکرد.

لەڤین بە بێمەیلییەوە گوێی بۆ قسەکانی راگرتبوو و سەرەتا رەخنەی لێدەگرت. دیویست بپەڕێتە نێو قسەکانی و بیروڕای خۆی دەربڕێ کە بە بڕوای خۆی، ئەگەر پەسند بکرایە هیچ شرۆڤە و

بەڵگەهێنانەوەیەکی دیکەی پێویست نەبوو. پاشان دەستی لە دژایەتی کردنی لەگەڵیدا هەڵگرت چونکە بۆیدەرکەوت روانگەیان لەسەر مەسەلەکە هێندە ناسازگارە کە قەت لە قسەی یەکتر تێناگەن و ناچار بە گوێگرتن بەسندەی کرد. ئەگەرچی وتەکانی مترۆڤ ئیتر سەرنجی رانەدەکێشا بەڵام حەزی دەکرد گوێی بۆڕاگرێ. لەو رێگایەوە چێژی لە خۆپەسندییەکەی وەردەگرت کە دەیدی بیرمەندێکی بەناوبانگ ئاوا بە دڵگەرمی و سەرنج و متمانەوە گرنگیی بە مەبەستی باسەکەی داوە و بە جۆرێك کە هێندێ جار تەنیا ئاماژەیەك بە هەموو لایەنێکی مەسەلەکە بەس بوو، ئەندێشەکانی خۆی بۆ شرۆڤە دەکات. ئەو ئەم باسوخواسەی بە پڕبایەخبوونی خۆی دادەنا و نەیدەزانی مترۆڤ چونکە لەگەڵ هەموو نزیکانی خۆی لەسەر ئەو بابەتە باس و لێکدانەوەی بووە، ئێستا ئەوە لەگەڵ هەموو تازەناسیاوێك دێنێتەگۆڕێ و لەسەریەك سەبارەت بە بابەتێك کە زەینی بەخۆیەوە خەریك کردووە و بۆخۆشی هێشتا بۆی روون نەبۆتەوە هۆگرانە لەگەڵ هەموو کەس دەدوێ.

دوای ئەوەی مترۆڤ بیر و فکری خۆی شرۆڤە کرد کاتاڤاسۆڤ چاوێکی لە کاتژمێرەکەی کرد و گوتی: چاکە، ئیتر خەریکە درەنگ دەبێ.

لە وەڵامی پرسیارەکەی لەڤینیشدا گوتی: ئەمڕۆ لە کۆڕی زانستپەروەراندا دانیشتنێکمان هەیە بە بۆنەی پەنجاهەمین ساڵهاتی سڤینتیچ، من و پیۆتێر ئێڤانۆڤیچ (مەبەستی مترۆڤ بوو) دەچین بۆ ئەوێ. بەڵێنمداوە سەبارەت بە کارەکانی ئەو (یانی سڤینتیچ) لە بواری بوونەوەرناسیدا مژولیایش بکەم. تۆش لەگەڵمان وەرە. زۆر خۆش دەبێ.

مترۆڤ گوتی: بەڵێ، بەڕاستی کاتی ئەوە هاتووە وەڕێ بکەوین. تۆش لەگەڵمان وەرە و لەوێوە ئەگەر حەزت لێبوو دەچین بۆ ماڵی ئێمە. زۆر حەزدەکەم سەبارەت بە کتێبەکەت روونکردنەوەی زیاترم گوێ لێبێ.

ـ نا، شایانی نییە، هێشتا تەواو نەبووە، بەڵام زۆرم پێخۆشە و دێم بۆ کۆڕەکەتان.

کاتاڤاسۆڤ لە دیوەکەی تر لەگەڵ فراك لەبەرکردن گوتی: گوێت لێبوو باوەگیان؟ من بیروڕای خۆمم بە جیا دەربڕی.

ئاخافتن لەسەر مەسەلەی زانکۆ دەستیپێکرد.

مەسەلەی زانکۆ زستانی ئەو ساڵە لە مۆسکۆ رووداوێکی گرینگ دەهاتە ئەژمار. سێ کەس لە مامۆستا قەدیمییەکان لە شۆڕای زانکۆدا بیروڕای مامۆستایانی لاویان قەبووڵ نەکردبوو و مامۆستایانی لاو لە یادداشتێکی تایبەتدا دابوویان بە شۆڕای زانکۆ. ئەو بیروڕایە

به بڕوای تاقمێك زۆر نەشیاو و نابەجێ بوو و بە بڕوای هێندێ کەسیش گونجاو و ئاسایی بوو و مامۆستایان لەسەر ئەوە بووبوونە دوو گورووپی جیاواز.

یەکێك لەو دوو گورووپە کە کاتاڤاسۆڤیش لەوان بوو تۆمەتی ساختەچییەتی و بوختان و دەهۆیان دەدا پاڵ گورووپەکەی تر و ئەوانیش لەلایەن ئەو گورووپەی دیکەوە بە سەرەڕۆ و هەرزە تاوانبار دەکران. لەڤین لەوبارەوە هێندێ شتی بیستبوو و دەمەتەقێی لەسەر کردبوو و سەبارەت بە ئەوان بیروڕای خۆی هەبوو و لە ماوەی ڕێگادا هەتا گەیشتنە بینای کۆنی زانکۆ بەشداریی لە باسوخواسەکانیاندا کرد.

کۆڕەکە دەستیپێکردبوو... کاتاڤاسۆڤ و مترۆڤ لەسەر مێزێکی بە ماهووت داپۆشراو دانیشتن کە شەش کەسی دیکەش لە پشتی دانیشتبوون و یەکێك لەوان سەری بە سەر نووسراوەیەکدا گرتبوو و دەیخوێندەوە. لەڤینیش لەسەر یەکێك لە کورسییە خاڵییەکانی دەوری مێزەکە دانیشت و بە سرتە لە خوێندکارێکی تەنیشت خۆی پرسی ئەوەی دەیخوێنیتەوە چییە؟ خوێندکارەکە بە وەڕەزییەوە چاوێکی لە لەڤین کرد و گوتی: سەربردەی سیڤینتیچ.

لەڤین، ئەگەرچی هیچ هۆگرییەکی بەو سەربردەیە نەبوو بە نابەدڵییەوە گوێی ڕاگرت و هێندێ شتی نوێ و سەرنجڕاکێشی سەبارەت بە ژیانی ئەو بیرمەندە بەناوبانگە زانی.

کاتێك کە خوێندنەوەی سەربردە کۆتایی هات بەرپرسی لیژنە سپاسی لە خوێنەرەکە کرد و شێعرێکی خوێندەوە کە «مێنت»ی شاعیر بە بۆنەی ئەو کۆڕەوە ناردبووی و بە چەند وشە سپاسی لەو شاعیرەش کرد. پاشان کاتاڤاسۆڤ بە دەنگێکی بەرز و ناخۆش وتارەکەی خۆی سەبارەت بە کار و بەرهەمەکانی ئەو بیرمەندە خوێندەوە.

کاتێك کاتاڤاسۆڤ تەواوبوو لەڤین چاوێکی لە کاتژمێرەکەی کرد و دیتی ئیتر شتێکیوای نەماوە بۆ سەعات دوو، چونکە ئەگەر بیهەوێ بچێت بۆ کۆنسێرت فریا ناکەوێت نووسراوەکەی خۆی بۆ مترۆڤ بخوێنێتەوە و ئیتر حەزیشی نەدەکرد ئەو کارە بکات. لەگەڵ گوێگرتن لە وتارەکان بیری لەو قسانە کردەوە کە لەلای ئەو کردبووی. ئێستا بۆی ڕوون بووبۆوە کە ئەگەرچی ئەندێشەکانی مترۆڤ دوورنەبوو پتەو و بەجێ بن بەڵام بیر و بۆچوونەکانی خۆشی بێبنەما نەبوون. ئەم فیکرانە دەکرا دایانبڕێژێت و ڕوونیان بکاتەوە و بە جێیەکیان بگەیێنێ، بەڵام هەرکام لەوان (یانی مترۆڤ و لەڤین) دەبوو هەرکام لەو ڕێگایەدا تێبکۆشن کە هەڵیانبژاردووە و بڕۆنە پێشێ و بە زۆراندانی ئەندێشەکانیان هیچ ئاکامێکی نەبوو. بڕیاریدا داواکەی مترۆڤ ڕەت بکاتەوە و لەگەڵ کۆتایی هاتنی کۆڕەکە چوو بۆ لای. مترۆڤ ئەوی بە

بەرپرسی کۆڕەکە ناساند، کە لەگەڵ ئەو سەبارەت بە رووداوە نوێیەکانی دنیای سیاسەت قسەی دەکرد، لەوبارەوە مترۆڤ هەر ئەو شتانەی بە بەرپرسی کۆڕەکە دەگوت کە ئەو رۆژە بەیانی بە ئەو (یانی لەڤین)ی گوتبوو و لەڤینیش هەر ئەو قسانەی کرد کە بە مترۆڤی گوتبوو، بەڵام بڕوای تازەی خۆی کە هەر لەو کاتانەدا بە زەینی گەیشتبوو بە وتەکانی زیادکرد. پاشان باسەکە دیسان سەبارەت بە مەسەلەی زانکۆ دەستیپێکردەوە. لەڤین چونکە ئەو قسانەی جارێکی تر بیستبوو بەپەلە بە مترۆڤی گوت بەداخەوەیە کە ناتوانێ بانگهێشتنەکەی قەبووڵ بکات و خوداحافیزیی کرد و چوو بۆ ماڵی لۆوڤ.

## چوار

لۆوڤ، مێردەکەی ناتالی، خوشکی کیتی، هەموو ماوەی تەمەنی لە پێتەختەکان و وڵاتانی هەندەران رایبواردبوو و لەو شوێنانە خوێندبووی و لە مەقامی دیپلۆماتدا خزمەتی کردبوو.

ساڵی رابردوو وازی لە خزمەتی دیپلۆماتی هێنابوو، هەڵبەت نەك لەبەرئەوەی ناکۆکی لەگەڵ کەسێك هەبێت (ئەو قەت لەگەڵ هیچ کەس ناکۆکی و دژایەتی نەدەکرد) ناردبوویان بۆ دەربار و لە مۆسکۆ دەژیا بۆ ئەوەی بتوانێ بە باشترین شێوە دوو کوڕەکەی پەروەردە بکات.

لەڤین و لۆوڤ، سەرەڕای جیاوازیی تەمەن (لەڤین لە لۆوڤ جحێڵتر بوو) و نایەکسانییەکی بەرچاو کە بە خووخدە و بیروباوەڕیانەوە دیاربوو، لە ماوەی ئەم زستانەدا زۆر لە یەکتر نزیکبووبوونەوە و هۆگری یەکتر بووبوون.

لۆوڤ لە ماڵێ بوو و لەڤین بێخەبەر خۆیکرد بە ژوورەکەیدا.

لۆوڤ عەبایەکی درێژی پشتێنداری لەبەردا و چەکمەی لاسیقی لە پێدا و لەسەر کورسییەکی راحەتی دانیشتبوو، چاویلکەی پێنسیی کەهووی لە چاودا خەریکی خوێندنەوەی کتێبێك بوو کە لەسەر سێپەکێکی نۆتی دانابوو و جگەرەیەکی بەرگی تانیوەسووتاوی بە دەستە جوانەکەیەوە دوور لە کتێبەکە راگرتبوو.

دەموچاوی جوان و کز و هێشتا چرچولۆچ تێنەکەوتووی کە قژ و ریشە ماشوبرنجییەکەی بریقەی دەهات و پاك و نەجیبی دەنواند، بە دیتنی لەڤین روخسارە جوانەکەی گەشایەوە و بە شیلەی بزەیەك درەوشایەوە.

ـ کارێکی باشت کرد هاتی. خوداوڕاستان دەمویست بنێرم بە دواتاندا. دەی، کیتی حاڵی چۆنە؟ فەرموو لێرە دانیشە، ئێرە خۆشترە ـ هەستا و کورسییەکی لانکەیی بۆ هێنا پێشێ و بە زاراوەیەك کە هێندێك لە فەڕەنسی دەچوو لێیپرسی: ئاگاداریی ئەم دواییەت لە ***ژورناڵ دووسن پترزبۆرگدا*** [٦٠] خوێندەوە؟ بە بڕوای من بێوێنەیە.

لەڤین ئەوەی کە سەبارەت بە دەنگۆکانی پترزبۆرگ لە کاتاڤاسۆڤی بیستبوو بۆ لۆوڤی گێڕایەوە و دوای ئەوەی هێندێکی باسی سیاسەت کرد چووە سەرباسی ئاشنایەتی لەگەڵ مترۆڤ و چوون بۆ کۆڕی ڕێزگرتن لە سڤینتیچ کە بە بڕوای لۆوڤ زۆر سەرنجڕاکێش بوو.

گوتی: ئێرەیی بە ئێوە دەبەم. خۆزگەم بە خۆتان کە ڕێتان دەکەوێتە کۆڕ و کۆبوونەوەی بیرمەندان ـ کە دەمی گەرم داهات بەپێی خووخدە زمانەکەی گۆڕی و بە زمانی فەڕەنسی درێژەی بە قسەکانیدا کە زۆری بەلاوە ئاسان بوو. گوتی: ڕاستت دەوێ من دەرفەتم نییە. کاری فەرمانگە و چاوەدێریی دەرسی منداڵەکانم دەرفەتی ئەو کارانەی بۆ نەهێشتوومەتەوە. جگە لەوەش پێمعەیب نییە ددانی پێدابێنم کە لە بواری زانستدا هیچم پێنییە.

ئەو خاکەڕاییەی ئەو بۆنی خۆڕانانی لێنەدەهات و حەزی خۆبەکەم زانین و خاکەڕاییی درۆکامینی پێوەنەبوو، بەڵکوو بەڕاستی سادقانە بوو، هێندەی شوێن لەسەر دڵی لەڤین دانابوو و هەڵسوکەوتی بەدڵ بوو زەردەیەکی گرت و گوتی: من بڕوا بەو قسەیەی ئێوە ناکام؟

ـ چۆن باوەڕ ناکەی! من بەڕاستی هەست دەکەم خاوەن زانیاری نیم. تەنانەت بۆ چاوەدێریی وانەی منداڵەکانیشم دەبێ بە زۆربەی فێربوونەکانمدا بچمەوە و تەنانەت هێندێکیان بە شێوەیەکی سادە لە سەرەتاوە فێر ببمەوە. چونکە، دەزانی، مامۆستا بەسندە ناکات، دەبێ کارەکەی بخرێتە ژێر چاوەدێری، هەروەك چۆن ئێوە لە کاری کشتوکاڵدا تەنیا بە کرێکار بەسندە ناکەن بەڵکوو چاوەدێریشی بۆ دادەنێن ـ کتێبی ڕێزمانی بووسلایۆڤی نیشاندا کە لەسەر سێپەك دانابوو و گوتی: بڕوانە ئەوە دەخوێنمەوە. میشا دەبێ ئەوە فێر بێت، هەڵبەت زۆر دژوارە. بۆوێنە بڕوانە، دەکرێ لێرەدا بۆم ڕوون بکەیتەوە؟ دەڵێ...

لەڤین هەوڵیدا بۆی ڕوون بکاتەوە کە ئەو شتانە بۆ تێگەیشتن نابن و دەبێ فێریان بیت، بەلام لۆوڤ لەگەڵی هاوڕا نەبوو.

لۆوڤ گوتی: بەڵێ پێبکەنە!

60- Journal de St. Petersbourg

ـ بەپێچەوانە، ناتوانی تێبگەی کە کاتێك چاوت لێدەکەم ئەوەیکە لە داهاتوودا دەبێ بیزانم فێری دەبم، ئەویش عاملاندنی منداڵەکانمە.

لۆوڤ گوتی: جا ئەوە قسەیە! هیچ شتێك نییە کە ئێوە پێویست بێ لە من فێر بن.

لەڤین گوتی: من تەنیا دەزانم هیچ منداڵێکم وەك ئەو منداڵانەی ئێوە باش نەدیوە و ئەگەر بتوانم منداڵەکانم وەك ئەوان بعاملێنم خەمی هیچم نییە.

دیاربوو لۆوڤ دەیویست بەر بە شەپۆلانی شادیی خۆی بگرێ بەڵام ترووسکەی نەشە لە بزەکەیدا وەدیار کەوت.

ـ من تەنیا ئارەزوومە کە لە منداڵەکانی من باشتر بن ـ پاشان گوتیشی: دەزانی عاملاندنی منداڵی وەك ئەوانەی من کە بەم ژیانەی دووره ولاتی بێسەرپەرشت مابێتنەوە چەندە دژوارە!

ـ ئەوانە قەرەبوو دەکرێنەوە. منداڵەکانی تۆ زۆر خاوەن مرخن. گرینگ پەروەردەی ئاکارە و ئەمەش شتێکە کە من بە چاولێکردنیان فێری دەبم.

ـ دەڵێی پەروەردەی ئاکار. ناتوانی بیهێنیتە بەرچاوت کە ئەم کارە چەندە دژوارە.

هێشتا یەکێك لە کەموکوڕییەکانیت لانەبردووە چەند دانەی دیکە سەرهەڵدەدەن واتە تا کونێك دەگری دوانی دیکەی تێدەبێ. دەبێ هەمیشە لە شەڕ و خەباتدا بی و تاوێکت حەسانەوە نییە. ئەگەر بنەما ئایینییەکان مسۆگەر نەبن... دەزانی، دەگەڕێنەوە سەرباسەکەی پێشوومان، هیچ باوکێك تەنیا بە وزە و ئاوەزی خۆی ناتوانێ منداڵەکانی پەروەردە بکات و حەتمەن دەبێ یارمەتیی بیروباوەڕی ئایینیی لەپشت بێ.

ئەم ئاخافتنە کە لەڤین هەمیشە هۆگری بوو بە هاتنەژوورەوەی ناتالی ئەلکساندرۆڤنای شۆخوشەنگ، کە خۆی لە گوڵدابوو و ئامادەی چوونەدەرێ بوو، ناتەواو مایەوە.

ـ ئەیەڕۆ، ئێوە لێرەن؟ نەمزانیبووـ دیاربوو بەداخەوە نییە و زۆریش خۆشحاڵە لەوەی قسەکانی پێبڕیون، چونکە لەمێژە لەگەڵ ئەو دەمەتەقێ و مشتومڕانە ئاشنایە: دەی، پێمبڵێ کیتی چۆنە؟ من ئەمڕۆ بۆ فراوێن دێم بۆ ماڵی ئێوە ـ رووی لە مێردەکەشی کرد و گوتی: تۆ فایتوونەکە دەبەی یان...

باسوخواس لەنێوان لۆوڤ و ناتالیدا دەستیپێکرد کە ئەو رۆژەی خۆیان چۆن تێپەڕ دەکەن. بەوەدا کە لۆوڤ دەبوو بچێت بۆ سەردانی کەسێك و ئیشی دایرەی پێیبوو، ژنەش دەبوو بچێت بۆ کۆنسێرت و پاشان لە کۆڕی گشتیی لێژنەی باشووری رۆژهەڵاتدا بەشداری بکات، ناچاربوو

بەرنامەکانیان لە هەموو سەرێکەوە لێکبدەنەوە و قەراروبڕیەی کارەکان دابنێن. لەڤین کە وەك ئەندامی بنەماڵە چاوی لێدەکرا بە ناچاری خۆی لە باسەکەیان هەڵقوتاند و بڕیاریان دانا لەڤین لەگەڵ ناتالی بچێت بۆ کۆنسێرت و لە کۆڕەکەشدا بەشداری بکات و لەوێوە فایتوونەکە بنێرن بۆ فەرمانگەکەی ئارسنی و پاشان کاتێك ئیشەکەی تەوابوو بە فایتوونەکە بچێت بەدوای ناتالیدا و بیبات بۆ لای کیتی، یان ئەگەر کارەکە لە دایرە زۆری خایاند فایتوونەکە بنێرێ تاکوو ژنەکەی لەگەڵ لەڤین ببات بۆ ماڵێ.

لۆوڤ رووی لە ژنەکەی کرد و گوتی: دیتووتە مێردەکەی خوشکت چۆن بەخۆمدا دەشکێنێتەوە و دەڵێ منداڵەکانم زۆر باش و ژیرن، ئەگەرچی من باش دەزانم چەندەیان کەموکووڕی هەیە.

ژنەکەی گوتی: من هەمیشە دەڵێم ئەم ئارسنییە زۆر پێیزیادی دادەکێشێ، ئەگەر مرۆڤ بڕوات بەدوای کەماڵدا هیچکات رازی نابێت. ئەو قسەی باوەگیان راستە. کاتێك ئێمە چکۆڵە بووین لە لایەنێکەوە زێدەڕەوییان دەکرد، ئێمەیان لە نیوەنهۆمی خوارەوە دادەنا و نهۆمی دووهەمیش کە باشترین ماڵ بوو هی خۆیان بوو، ئێستا بەپێچەوانەیە، زێدەڕەوی بەو بارەی تردایە. باوك و دایك لە ژووری ژێر شیروانیدا دەژین و باشترین ژوورەکانیان دادەنێن بۆ منداڵەکانیان. باوك و دایك ئێستا هیچ مافێکیان نییە، هەموو شتێك بۆ منداڵەکانیانە.

لۆوڤ بە بزەیەکی جوانەوە دەستی لەسەر دەستی ژنەکەی دانا و گوتی: باشە، ئەگەر ئاوا باشترە با وابێ. هەرکەس تۆ نەناسێ پێیوایە دایکی منداڵەکانت نییت بەڵکوو ژنی باوکیانی!

ناتالی کارتی پاکەتهەڵچڕی لەسەر مێزەکە لە جێی خۆی دانا و بە نەرمی گوتی: نا، لە هیچ کارێکدا نابێ زێدەڕەوی بکرێ.

لۆوڤ کە دیتی کوڕە جوانەکانی هاتنە ژووریێ و سڵاویان لە لەڤین کرد و هاتبوون بۆ لای باوکیان و حەتمەن دەیانویست پرسیارێکی لێبکەن پێیگوتن: وەرن بزانم، کوڕە سەرتۆپەکانم!

لەڤین حەزی دەکرد لەگەڵ منداڵەکان بدوێ و ئەوەی بە باوکیشیانی دەڵێن گوێی لێبێ، بەڵام ناتالی دەستیکرد بە قسەکردن لەگەڵێدا و هەر لەو کاتەشدا کاخۆتین، یەکێك لە هاوکارەکانی لۆوڤ، بە یۆنیفۆڕنی دەربارەوە خۆیکرد بە ژوورێدا تاکوو لەگەڵ ئارسنی بچن بۆ سەردانی کەسێك، بەڵام بەرلە رۆیشتن باسێکی بێکۆتایی سەبارەت بە هێرزیگۆڤین و پرێنسس کۆرزینسکایا[61] و دۆما و مەرگی ناوادەی کۆنتس ئاپراکیسنا دەستیپێکرد.

---

61- Korzinskaya

لەڤین راسپاردەیەك كە پێیان گوتبوو لە بیری چووبۆوە و كە گەیشتە سەرسەرا كتوپڕ وەبیری هاتەوە.

کاتێك لۆوڤ بۆ بەڕێکردنی ئەو و ژنەکەی هاتبوو بۆ سەرپلیکانەکان، لەوێ راوەستا و لەڤین پێیگوت: ئەرێ لە بیرم نەبوو کیتی داوای لێکردم سەبارەت بە ئابلۆنسکی قسەتان لەگەڵ بکەم.

لۆوڤ سوورهەڵگەڕا و بە بزەیەکەوە گوتی: بەڵێ، دایەگیان دەیهەوێ ئێمە، دوو ئاوەڵزاوا، بکەوینە گیانی ئەو، بەڵام ئاخر من بۆ؟

ناتالی کە کەڕکەیەکی سپیی شێوە کەڵپۆسی لەبەردا بوو و چاوەڕوانی کۆتایی هاتنی قسەکانیان بوو، بە پێکەنینەوە گوتی: دەی کەوایە لێیگەڕێن من دەچم بۆ گیانی. ئێستا ئیتر با بڕۆین.

## پێنج

لە کۆنسێرتی بەیانەدا دوو ئاوازی زۆر خۆش لێدرا.

یەکێك لەوان فانتێزیای «شالیر لە بیابان» بوو، ئەوی تریش کوارتێتی کە بە یاد و ناوی باخ هۆنرابۆوە. هەردوو ئاوازەکە تازە بوون و رۆحێکی تازەی تێدا هەست پێدەکرا و لەڤین حەزی دەکرد خۆی داوەرییان لەسەر بکات. لەگەڵ ژنخوشکەکەی چوو لەسەر کورسییەك داینیشاند و خۆی لە پەنا کۆڵەکەیەك راوەستا، دەیویست زۆر بە وردی و خەیاڵی ئاسوودەوە گوێ بۆ ئاوازەکان رابگرێت. هەوڵی دەدا خەیاڵی ئاڵۆز نەبێت و دیتنی بۆینباخی سپیی رێبەری ئۆرکێسترا و جووڵە و ئاماژەکانی کە هەمیشە دەبێتە هۆی ئاڵۆزانی هۆش و هەستی بینەران و ئاوازەکە ناخۆش و پەڕگەنە دەکات، شوێنی لەسەر دانەنێ، بە دیتنی ئەو خاتوونانەش کە هاتبوون بۆ کۆنسێرتەکە و کڵاوی وایان لەسەر نابوو کە قردیلە و رووبانەکانی گوێچکەیانی گرتبوو و هەروەها بە روانین لەو کەسانەش کە سەربەهەوا بوون و سەرنجی هیچیان نەدەدا، یان سەرنجی هەموو شتێکیان دەدا جگە لەو ئاوازەی دەیانبیست، تووشی ئاڵۆزی و بیربڵاوی نەبێت و حەز و چێژەکەی لێزایە نەبێ. هەوڵی دەدا خۆ لە قەرەی خاوەنڕایان و مۆسیقاناسان و زۆربڵێ و چەقەسرۆیان نەدا و بە پێوە چاوی لە بەرپێی خۆی بڕیبوو و گوێی گرتبوو.

بەڵام هەرچی زیاتر گوێی بۆ فانتێزیای شالیر شل دەکرد دەیدی کەمتر دەتوانێ داوەریی لەسەر بکات و بیروڕایەکی ڕۆشنی هەبێت. دەتگوت بەردەوام دەربڕینی هەیەجانێك بە زمانی ئاواز دەستپێدەکات و شکڵ دەگرێت و لەڕێوە لەبەریەك هەڵدەوەشێت و وەك پاژگەلێك لە هەستی تازە و نابەجێ پرژو بڵاو دەبن، برێ جاریش هیچ هەستێکی تێدا نەبوو و تەنیا هەوەسبازی و ئیشتیا و هونەرنوێنی بێجێی ئاوازدانەرەکەی بوو کە جگە لە هێندێ دەنگی پێچەڵاوپووچ و تێکەڵپێکەڵ هیچی تر نەبوو. بەڵام هەر ئەو پاژی هەستانە کە بە زمانی مۆسیقا بەیان دەکران و هێندێ جار جوانیش بوون بەڵام دڵبزوێن نەبوون، چونکە بەبێ سەرەتا بوون و گوێ ئامادەی وەرگرتنی جوانییەکانیان نەبوو. نەشە و کەسەر و هیوابڕاوی و ئەشق و سەربەرزی بە شێوەیەکی زۆر نەشیاو هەروەك هەست و سۆزی شێتێك وەدیار دەکەوتن و بەبێ سەرەتا و چاوەڕواننەکراو، ڕاست وەك ئەوەی لە زەین و هۆشی شێتێکدا بێت، لەنێو دەچوو.

لەڤین لە تەواوی ئەو ماوەیەدا کە مۆسیقایان دەژنی هەستی وەك کەسێکی گوێگران وابوو کە چاو لە سەماکاران بکات. کاتێك کە ئاهەنگەکە کۆتاییی پێهات وەك مرۆڤێکی کاس و وڕ دەچوو، چونکە زۆری گوشار بۆ مێشکی خۆی هێنابوو و هیچ چێژێکی ڕۆحیی لێوەرنەگرتبوو، زۆری هەست بە شەکەتی و داهێزراوی دەکرد. دەنگی چەپڵەڕێزان لە هەموولایەکەوە بەرزبۆوە. هەموو هەستان و وەڕێکەوتن و دەستیانکرد بە قسەکردن. لەڤین کە دەیویست بە یارمەتیی بۆچوونی ئەموئەو شێواویی خۆی قەرەبوو بکاتەوە و تەمومژی زەینی خۆی بڕەوێنێ، بۆ دیتنەوەی مۆسیقاناسان وەڕێکەوت و کە دیتی یەکێك لە بەناوبانگترینیان لەگەڵ پێستسۆڤ[٦٢] کە یەکێك لە ئاشنایانی بوو ڕاوەستاوە و خەریکی دەمەتەقێن، دڵی خۆش بوو.

پێستسۆڤ بە دەنگە گڕەکەی خۆی گوتی: سەرسووڕهێنەر بوو! سلاو کۆنستانتین دیمیتریچ، بەتایبەت پێکهاتەکەی، هەروەها ڕێژەکی ئاوازەکە و ڕەنگە پڕ عەیارەکەی، لەو جێگایەدا کە هەست بە نزیکبوونەوەی کۆردلیا دەکەی، لەو جێگایەدا کە ژن، یانی ***ژنایەتیی***[٦٣] ***هەرمان*** بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵ چارەنووس رادەپەڕێ. وا نییە؟

لەڤین کە بە تەواوی لە بیری چووبۆوە کە ئەم پارچەیە حاڵی شالیر لە بیاباندا وەسف دەکات، شەرمنانە پرسیی: لێرەدا کوردلیا لەکوێوە پەیدابوو؟

---

62- Pestsov

٦٣- لە دەقەکەدا ئالمانییە.

پێستسۆڤ قامکی لەسەر بەرنامەی کۆنسێرتەکە دانا کە لەسەر کاغەزێکی ئەتڵەسی چاپ کرابوو و بە دەستییەوە بوو، دایەدەست لەڤین و گوتی: کۆردلیا لێرەوە پەیدابوو.

لەو کاتەدابوو کە لەڤین ناوی ئاهەنگەکەی وەبیرهاتەوە و بەپەلە وەرگێڕانی شێعرەکەی شکسپیێری بە رووسی خوێندەوە کە لە پشتی پێڕستی بەرنامەکە چاپ کرابوو.

پێستسۆڤ کە هاووتەکەی رۆیشتبوو و ئیتر بەردەنگی نەبوو، رووی لە لەڤین کرد و درێژەی پێدا: بەبێ ئەمە ناکرێ پارچەکە درێژەی پێبدرێ.

لە ماوەی پشووداندا لەسەر باشی و خراپیی حەز بە لاساییکردنەوەی ڤاگنێر لە مۆسیقادا دەمەتەقێ لەنێوان لەڤین و پێستسۆڤدا سازبوو. لەڤین دەیگوت هەڵەی ڤاگنێر و هەموو لایەنگرانی لەوەدایە کە هەوڵ دەدەن مۆسیقا ببەنە بواری هونەرەکانی دیکەوە وشاعیریش کاتێك دەیهەوێ روخساری کەسێك وەسف بکات تووشی هەڵە دەبێت، چونکە رەسمکردنی روخسار کاری وێنەگەرە و بۆ نواندنی ئەو هەڵەیە کاری پەیکەرتاشێکی بۆ نموونە هێنایەوە کە سێبەری ئیلهامی شاعیرانە وەکوو پەیکەرەگەلێك لە دەوروبەری پێچکەی کۆتەڵی شاعیر سەریان وەدەر نابوو و لە مەڕمەڕ دایتاشیبوو[٦٤]. گوتیشی: ئەو سێبەرانەی ئیلهامیش هیچ کوێیان شێوەی سێبەر نادات، بەتایبەت ئەوەی خۆیان بە لاجامەکاندا هەڵواسیوە ـ لەڤین زۆری کەیف بەو قسەیەی خۆی هات بەڵام بە جوانی لە بیری نەبوو کە پێشتر لەلای کێ ئەو قسەیەی کردووە و لەوانەیە هەر لەلای پێستسۆڤ بووبێ. کە قسەکەشی کرد بەخۆدا شکایەوە.

بەڵام پێستسۆڤ لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە هونەر تەنیا یەکێکە و لە یەکێتیی هەموو شکڵەکانی ئەودا بە باڵاترین شێوە خۆ دەنوێنێ.

لەڤین نەیتوانی لە بەشی دووهەمی کۆنسێرتەکە هیچ تێبگات چونکە پێستسۆڤ لە تەنیشتی راوەستابوو و لەپەستا قسەی لەگەڵ دەکرد و باسی سادەیی لەڕادەبەدەر و ناسروشتی و دزێوی ئاهەنگەکەی دەکرد و وەك ئاساییبوونی رافائیلییەکان لە وێنەگەریدا دایدەنا. لەڤین کاتی چوونەدەرێ دیسان گەلێك ئاشنا و ناسیاوی دیت و لەگەڵ ئەوان سەبارەت بە مەسەلە

---

٦٤- تۆلستۆی ئاماژە بەو پەیکەرەیە دەکات کە ئانتۆکۆلسکی (شدژدردرژێآ) پەیکەرەساز بۆ جێژنی رێزگرتن لە پووشکین، کە بڕیاربوو ساڵی ١٨٨٠ بەڕێوە بچێت، دروستی کرد و پێشکەش فەرهەنگستانی هونەری کرد. لەم پەیکەرەیەدا پووشکین لەسەر کورسییەکی بەردین لەسەر ڕەوەزێك دانیشتبوو و پەیکەرەگەلێکی چکۆڵە لە پاڵەوانانی نێو بەرهەمەکانی بەسەر بڕگە قاڵدرمە شێوەکاندا وەسەر دەکەوتن و تەنانەت دەڵێی بەسەر لاجامەی دەوری پەیکەرەکەدا هەڵواسراون.

سیاسییەکان و بەرنامەی کۆنسێرت و هەروەها سەبارەت بە ئاشنا هاوبەشەکانیان هێندێك دوا و کۆنت بۆلیش لەنێو ئەو ئاشنایانەدا بوو کە ئەو لە بیری چووبۆوە بچێت بۆ ماڵیان.

پرێنسس لۆوڤا کە لەڤین ئەو مەسەلەی لەگەڵ هێنایەگۆڕێ، گوتی: چاکە، کەوایە زۆر زوو سەرێك لە ماڵیان هەڵێنە، هەڵبەت وێدەچێ ئیجازەی چوونەژوورێت پێنەدەن، ئەگەر وابوو خێرا وەرە بۆ کۆڕەکەی ئێمە و لەوێوە پێکەوە دەڕۆینەوە بۆ ماڵێ. هێشتا کاتی ماوە.

## شەش

لەڤین، کە گەیشتە ماڵی کۆنتس بۆل پرسیی: وادیارە میوان راناگرن. دەرگاوان بە متمانەوە باڵتەکەی لێوەرگرت و گوتی: بۆچی قوربان، تکاتان لێدەکەم فەرموون!

لەڤین لە دڵی خۆیدا گوتی «قوڕ بەوناوچاوانەم.» هەناسەیەکی هەڵکێشا و دەستەوانەیەکی لە دەستی داکەند و کڵاوەکەی راستەوپاستە کرد، هەر لە دڵی خۆیدا گوتیشی «ئاخر بۆ هاتم؟ ئێستا چ قسەیەکم بۆ گوتن پێیە؟»

لە هۆڵی یەکەم تێپەڕی چاوی بە کۆنتس بۆل کەوت لەنێو دەرگانەکەدا بە روخسارێکی خەمبارەوە راوەستابوو و بە لەبزێکی جیددی دەستووری بە خزمەتکارێك دەدا. کە چاوی بە لەڤین کەوت زەردەیەکی گرت و داوای لێکرد کە بچێت بۆ هۆڵە چکۆڵەکەیان کە لە تەنیشت ئەو هۆڵە هەڵکەوتبوو و لەوێوە دەنگی ئاخافتن دەهات. لەو تەلارەدا دوو کچی کۆنتس و سەرهەنگێك کە یەکێك لە ئاشنایانی لەڤین و دانیشتووی موسکۆ بوو لەسەر کورسیلەی راحەتی دانیشتبوون. لەڤین چووە پێشێ و سڵاو و چاکووچۆنیی لەگەڵ کردن و لەسەر کورسییەکی نزیك قەنەفەکە دانیشت و کڵاوەکەی لەسەر چۆکی دانا.

ـ حاڵی خانمەکەت چۆنە؟ حەتمەن بۆ کۆنسێرت چووبووی؟ ئێمە نەمانتوانی بێین، دایەگیان دەبوو بۆ رێوڕەسمی پرسە بچێت بۆ کلێسە.

لەڤین گوتی: بەڵێ، بیستم، بەڕاستی مەرگێکی کتوپڕ و ناوادە بوو!

کۆنتس هات لەسەر قەنەفەیەك دانیشت و ئەویش پرسیاری حاڵی کیتی و کۆنسێرتەکەی لێ لێکرد.

لەڤین وەڵامیدایەوە و دیسان وتەکەی خۆی سەبارەت بە مەرگی ناوادەی ئاپڕاکسینا دووپاتکردەوە.

ـ هەڵبەت کۆنتس لە ماوەی تەمەنیدا زۆر کەمی لەشساخی بە خۆیەوە دی.

ـ ئێوە دوێنێ چوون بۆ ئۆپێرا؟

ـ بەڵێ چووم.

ـ لۆکا[٦٥] بێوێنە بوو، وانییە؟

لەڤین گوتی: بەڵێ بێوێنە بوو ـ چونکە گوێشی لێنەبوو چۆن لە بارەیەوە بیردەکەنەوە، ئەوەی سەدجار سەبارەت بە زەوق و هونەری ئەو گۆرانیبێژە بیستبووی دووپاتی کردەوە. کۆنتس بۆل واینواند کە گوێی گرتووە. دوای ئەوەی زۆری قسەکرد و بێدەنگ بوو، سەرهەنگ کە هەتا ئەو کاتە زمانی نەگەڕابوو دەستیکرد بە قسەکردن. ئەویش سەبارەت بە ئۆپێراکە و رووناکایی سەکۆکە دوا و پاشان ئاماژەی بە جێژنێکی پڕشادی و نەشە کرد کە بڕیاربوو لە ماڵی تیوورین[٦٦] بەڕێوەبچێت و دای لە قاقای پێکەنین و بەدەم قسەکردنەوە هەستا و رۆیشت. لەڤینیش هەستا بەڵام بە روخساری کۆنتسدا تێگەیشت کە هێشتا کاتی رۆیشتن نەهاتووە و یەك دوو خولەکی تر دەبوو لەوێ بێت. دانیشتەوە.

بەڵام بەوەدا کە بەردەوام لە بیری ئەوەدابوو هاتنی بۆ ئەوێ زۆر قۆڕ و بێمانەیە، مەبەستێکی بۆ قسەکردن نەدۆزییەوە و بێدەنگ ما. کۆنتس دیسان گوتی: ئێوە ناچن بۆ کۆڕی گشتی؟ دەڵێن زۆر سەرنجڕاکێشە.

لەڤین گوتی: نا، بەڵام بەڵێنم بە ژنخوشکم داوە بچم بەدوایدا ئەو لەوێیە.

دیسان هەموو بێدەنگ بوون. دایك و کچەکانی دیسان جارێکی تر چاویان لە یەکتر کرد.

لەڤین بەخۆی گوت «ڕەنگە ئێستا کاتی خۆی بێ.» هەستا. خانمەکان دستیان گوشی و داوایان لێکرد ***سڵاوی گەرمیان*** بە ژنەکەی بگەیێنێ.

---

٦٥- پاولین لۆکا (١٩٠٨ ــ ١٨٤١) لە بنەماڵەیەکی ئیتالیایی و لە ڤیەننا لەدایك بوو، گۆرانیبێژی ئۆپێرای بەناوبانگ و ئەکتەرێکی بەزەوق بوو و لە تەواوی ئەورووپادا ناوبانگی هەبوو.

66- Tyourine

دەرگاوان، لەگەڵ ئەوەی باڵتەکەی پێدەدایەوە لێیپرسی: تکایە ناونیشانی ماڵەکەتانم پێمەرحەمەت بفەرموون ـ هەر خێراش لە دەفتەرێکی جوان و شیرازەگیراودا یادداشتی کرد.

لەڤین لە دڵی خۆیدا گوتی «هەڵبەت بۆ من هیچ جیاوازییەکی نییە، بەڵام ئەم تەشریفاتە هەرچییەك بێ زۆر شتێکی قۆڕە و لەوەی کە خۆم لێداوە هەست بە شەرمەزاری دەکەم.» دڵی خۆشی بەوە خوش کرد کە کارێکە و هەمووان دەیکەن. چوو بۆ کۆڕی گشتی لێژنە کە بەڵێنی دابوو بچێت بەدوای ژنخوشکەکەیدا و پێکەوە بڕۆنەوە بۆ ماڵێ.

کۆڕەکە زۆری خەڵك لێبوو و دەکرێ بڵێین هەموو ناوبەدەرەوەکانی شار لەوێ بوون. لەڤین کورتەی دانووستانەکە کە هەمووان بە شتێکی سەرنجڕاکێشیان دەزانی بیستی. کاتێك خوێندنەوەی کورتەی دانووستانەکە کۆتاییی هات، ئاشنا و ناسیاو لە دەوری یەك کۆ بوونەوە و لەڤین چاوی بە سێڤیاژێسکی کەوت و داوای لێکرد ئەو شەوە بچێت بۆ کۆڕی کۆمەڵەی جووتیاران و پێداگرانە داخوازی لێکرد کە لەوێدا بەشداری بکات چونکە راپۆرتێکی زۆر گرینگ دەخوێندرێتەوە، چاوی بە ستیپان ئارکادیچیش کەوت کە تازە لە کێبەرکێی ئەسپسواری گەڕابۆوە و تووشی زۆر ئاشنا و دیوناسی دیکەش بوو لەگەڵیان دوا و بیروڕای زۆری سەبارەت بە دانووستانی کۆڕەکە و کۆنسێرت و بواری دادپرسی بیست و رەنگە بە هۆی سەرنجپێنەدان و سەرساردی و شەکەتییەك کە وردە وردە هەستی دەکرد خەریکە گیانی دادەگرێ، بۆیە کاتی باسکردن لەسەر دادپرسی تووشی هەڵەیەك بوو و پاشان ئەو هەڵەیەی چەند جار وەبیرهاتەوە و بەخۆدا شکایەوە و بەداخەوە بوو. کاتی باسکردن لە سزادانی غەوارەیەك کە لە یەکێك لە دادگاکانی رووسیا مەحکووم کرابوو و شاربەدەرکردنی بۆ دەرەوەی وڵات کارێکی زۆر نادروست بووە و ئەوەیکە رۆژی رابردوو لە وتووێژ لەگەڵ ئاشنا و رۆشناکانیدا بیستبووی هەمووی دووپاتکردەوە.[٦٧]

---

٦٧- غەوارەیەك کە لێرەدا ئاماژەی پێکراوە ناوی شتراوسبێرگ بووە. ئەو کاری خۆی وەك رۆژنامەنووس و نوێنەری بیمە لە لەندەن دەستپێکرد و لە سەرەتای ساڵانی پەنجادا بۆ پێشنیاری دروستکردنی هێلاسن نێردرا بۆ ئاڵمان و نەمسا. زۆر سامانێکی زۆری وەدەست هێنا و بە سوڵتانی هێلاسن ناوبانگی دەرکرد، زۆری کارگە و کان و هەروەها کوشتارگاکانی شاری بەرلین و رۆژنامەی پرخوێنەری فیەننای بە ناوی دێپۆست کڕی. لە رووسیا خەتێکی هێلاسنی دروست کرد و لە چەند بانکدا بوو بە شەریك. بە پەرەپێدانی کاروباری خۆی بۆ

لەڤین گوتی: بە بڕوای من دەرکردنی ئەو لە رووسیا وەك ئەوە وایە کە قازەماسییەك بە بەرەڵلاکردنی لەنێو دەریا سزا بدەی ـ دواتر بیری هاتەوە کە ئەم قسەیە، کە ئەو لە ئاشنایەکی بیستووە و وەك بیرێکی هەڵقولاو لە مێشکی خۆی دەریبڕیوە، دێڕێکە لە یەکێك لە نەقڵەکانی کریلۆڤ بووە و یەکێك لە ئاشناکانی لە ژێرنووسی رۆژنامەیەکدا خوێندبوویەوە و دووپاتی کردبۆوە.

لەگەڵ ژنخوشکی رۆیشتەوە بۆ ماڵێ و کە دیتی کیتی لەشساخ و بەدەماخە، خۆی رۆیشت بۆ باشگا.

## حەوت

لەڤین لە کاتی خۆیدا گەیشتە باشگا. میوانەکان و ئەندامانی باشگاش هاوکات لەگەڵ ئەودا گەیشتن. ئەو لەمێژبوو نەهاتبوو بۆ باشگا، لەوکاتەوە زانکۆی تەواوکردبوو لە مۆسکۆ هاموشۆی کۆڕەکانی دەکرد. ئەو باشگاکە و پاژە رواڵەتییەکانی بینای باشگاکەی لەبیربوو، بەڵام ئەو حاڵ و هەوایەی ئەو کات لەوێدا گیانی دادەگرت نەدەهاتەوە بیری. لەگەڵ ئەوەشدا کە لەنێو حەوشە بەرین و گردکەی لە فەیتوون دابەزی و بە پلیکانەکاندا وەسەرکەوت و دەرگاوانی پشتێن و حەمایەلبەستوو هات بەرەوپیری و بە کاوەخۆ دەرگاکەی کردەوە و سڵاوی لێکرد و چاوی بە باڵتە و کڵاش و کەلوپەلی ئەندامانی باشگا کەوت لەنێو دیوە چکۆڵەکەدا (لەپێکردن و لەبەرکردنی کەوش و جلوبەرگیان هەر لەوێ لەبەر دادەکەندن و ئەوێیان لە نهۆمی سەروو بە باشتر زانیبوو) هەروەها دەنگی رازاویی زەنگەکەی بیست کە بەر لە چوونەژووریێ هاتنی ئەوی راگەیاند و کە بەسەر پلیکانە فەرشپۆش و نەوییەکانی باشگادا وەسەر کەوت لەسەر پێگۆڕکەکە چاوی بە پەیکەرەیەك کەوت، لەبەر دەرگانەی دەرگای سەرووش دەرگاوانێکی ئاشنای دی کە پیر بووبوو و جلوبەرگی کەلبەدوونکراوی تایبەتی باشگای لەبەردا بوو، بە وردی چاوی لە سەرتا پای میوانەکان دەکرد و هاوکات بە شێنەیی و نەك بە

---

ڕۆمانی تووشی زیانێکی زۆر بوو و متمانەی خۆی لەدەست دا. ساڵی ١٨٧٥ لە مۆسکۆ دەستبەسەر کرا و دوای مایە پووچبوونی بانکی بازرگانیی مۆسکۆ، کە خۆی یەکێك لە شەریکەکانی ئەو بوو دادگایی کرا. دادگا حوکمی تاراندنی بۆ سیبری بەسەردا بڕی، بەڵام چونکە بیانی بوو لە ڕووسیا کردیانە دەرێ.

سستی دەرگاکەی بۆ دەکردنەوە، بە دیتنی هەموو ئەوانە ئەو هەستە قەدیمییە کە تایبەتی دۆخی باشگاکە بوو دڵی داگرت و ئەو هەستەش ئاسوودەیی و ڕەرزایەت و هێژایی و ئەدەب و حەیا بوو.

چونکە لەڤین دابونەریتی باشگای لەبیرچووبۆوە و کڵاوەکەی لەلای دەرگاوانەکە دانەنابوو، پێشخزمەتێك پێیگوت، تکایە کڵاوەکەتم بدەیە، لەمێژە تەشریفتان نەهێناوە بۆ ئێرە، پرێنس دوێنی ناوەکەتانی تۆمار کرد، پرێنس ستیپان ئارکادیچیش هێشتا تەشریفی نەهێناوە.

دەرگاوان نەك هەر لەڤینی دەناسی بەڵکوو خزمایەتی و پێوەندیی لەگەڵ دۆست و دیوناسەکانیشی لەبیربوو.

تەلاری یەکەم کە بە پاراوان لێك جودا کرابۆوە و دیوێکیش کە لەلای ڕاست هەڵکەوتبوو و بە تیغەیەك لە تەلارەکە جیا کرابۆوە و پێشخزمەتێك لێیدادەنیشت لەڤین بە بەریدا تێپەڕی و وەپێش پیرەپیاوێك کەوت کە بە کاوەخۆ دەڕۆیشت و خۆیکرد بە نێو تەلاری میوانداریدا کە لە میوان جمەی دەهات و دەنگ و ژاوەژاویان تەلارەکەی داگرتبوو.

بەدەم چاولێکردنی میوانەکانەوە بەلای مێزەکاندا تێپەڕی کە ئیتر خاڵی نەبوون. جێجێ میوانانی ئاشنا، لە هەمووجۆرێك، پیرو لاو دوور و نزیك دەهاتنە بەرچاوی. لە روخساری هیچیاندا شوێنەواری نیگەرانی و دڵتەنگیی نەدەدی. دەتگوت هەموو دڵتەنگی و قین و رقەکانیان لەگەڵ کڵاوەکانیان لە ژووری دەرگاوان بەجێهێشتووە و هاتوون تاکوو بەپەلە چێژ لە نێعمەتە ماددییەکان وەرگرن. سێڤیاژێسکی و ئیشچر باتسکی و نڤیدۆڤسکی و پرێنسی گەورە لەوێ بوون، هەروەها ڤرۆنسکی و سرگی ئیڤانڤیچیش.

پرێنسی گەورە بە پێکەنینەوە لە سەر شانییەوە دەستی ئەوی گوشی و گوتی: بۆ ئەوەندە درەنگ هاتی؟ کیتی حاڵی چۆنبوو؟ ـ کە ئەوەی گوت دەسرەی بەرسنگەکەی کە لە قۆپچەی هێلەگەکەی قایم کردبوو، ڕاستەوپاستەی کرد.

ـ زۆر باشبوو. خوشکەکان سێبەسێ لە ماڵێ نانینیوەڕۆ دەخۆن.

ـ ئەها، بەڵێ. دیسان هەر ئەو قسانەی «ئالین چییکرد، نادین چییگوت!» دەی، سەر مێزەکەی ئێمە ئیتر جێنییە. بڕۆ سەر ئەو مێزە و هەتا زووە جیگایەك بۆ خۆت بگرەوە. ـ ئەوەی گوت و سەری وەرسووڕاند و دەوریی سووپی ماسی کە دەیاندا دەستی بە پارێزەوە وەریگرت.

دەنگێکی خۆش و مێهرەبان لە مەودایەکەوە بەرزبۆوە: لەڤین، وەرە بۆ ئێرە! ـ تۆرۆڤتسین بوو. لەگەڵ ئەفسەرێکی لاو دانیشتبوو و لە پاڵ ئەواندا دوو کورسیی بەراوەژوو داندرابوو. لەڤین بە خۆشحاڵییەوە چوو بۆ لایان. لەڤین ئێستا ئیتر ئەم تۆرۆڤتسینەی خۆشدەویست کە

پیاوێکی خۆشڕابوێر و رووکراوە و مێهرەبان بوو. یادی ئەو لەگەڵ بیرەوەریی خوازبێنیی کیتی هاوکات بوو. بەڵام ئەو رۆژە دوای ئەو هەموو ئاخافتنە تاقەتبڕ و پڕهۆشانەیە دیتنی روخساری مێهرەبانی تۆرۆڤتسین گەش و سەرنجڕاکێش بوو.

ـ ئەم دوو کورسییە هی تۆ و ئابلۆنسکییە. ئەویش دەبێ ئێستا پەیدابێت.

ئەفسەرەکە، کە زۆر قیت دانیشتبوو و چاوانی شاد و پڕنەشە بوون، ناوی گاگین و خەڵکی پترزبۆرگ بوو. تۆرۆڤتسین بە یەکتری ناساندن.

ـ ئابلۆنسکی هیچکات لە وەختی خۆیدا نەدەچوو بۆ جێگایەك.

ـ ها، فەرموون، ئەوەش ستیڤا.

ـ ئابلۆنسکی بەلەز هات بۆ لایان و گوتی: تۆش هەر ئێستا گەیشتی؟ حاڵت باشە؟ لێویك تەڕ ناکەی؟ چاکە، کەوایە وەرە با بڕۆین.

لەڤین هەستا و لەگەڵی چوو بۆسەر مێزە گەورەکە کە هەموو چەشنە ڤۆدکا و مەزە و چەشەی جۆراوجۆر و رەنگین لەسەری چندرابوو. بیست جۆر چەشە ریز کرابوو و هەرکەس بەپێی مگێزی خۆی دەیتوانی شتێك هەڵبژێرێ. بەڵام ستیپان ئارکادیچ هیچیانی لەگەڵ ئیشتیای خۆی بە سازگار نەزانی و داوای شتێکی تری کرد و یەکێك لە پێشخزمەتەکان کە بە یۆنیفۆرمی تایبەتی باشگاکەوە لەوێ راوەستابوو لەڕێوە خواستەکەی بەجێ هێنا. یەکی پەرداخێکیان ڤۆدکا هەڵدا و گەڕانەوە بۆسەر مێزەکەیان.

هێشتا سووپی ماسییەکەیان تەواو نەکردبوو کە گاگین داوای شامپانیی کرد و گوتی کە چوار پەرداخم بۆ پڕ بکەن. لەڤین ئەو پەرداخەی لەبەر دەمیان دانا رەتی کردەوە و خۆی بەتلێکی تری داوا کرد. زۆری برسی بوو و زۆر بە ئیشتیا دەیخوارد و دەیخواردەوە و زۆر هۆگرانە لە دەمەتەقێی سادە و پڕجەفەنگی هاوڕێکانیدا بەشداریی دەکرد. گاگین دەنگی نزم کردەوە و نەقڵێکی تازەی پێکەنینی گێڕایەوە کە لە پترزبۆرگ بیستبووی. نەقڵەکە هێندە قۆڕ و دوور لە نەزاکەت و قەشمەرانە بوو کە لەڤین دای لە قاقای پێکەنین، بەجۆرێك کە مێزەکانی دەورووپشتیان ئاوڕیان دایەوە و چاویان لێکردن.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: بەڵێ، ئەمە لە ریزی ئەو نەقڵانەیە، «ئیتر ناتوانم ئەوە تامڵ بکەم» بیستووتە؟ حەح، نازانی چەند خۆشە!

بە پێشخزمەتەکەی گوت: بەتلێکی ترـ و دەستی کرد بە گێڕانەوەی نەقڵەکەی.

پێشخزمەتێکی پیر دوو جامی قەدباریکی شامپانی هێنا کە هێشتا وردە بلۆقەکانی لە ناوەوە هەڵدەچوو، بە کەشەفێکەوە لەبەر دەمیانی دانا و قسەکەی پێبڕی و رووی دەمی لە

ستیپان ئارکادیچ و لەڤین گوتی: پیووتێر ئیلیچڤینۆڤسکی فەرموویان بیهێنمە خزمەتتان ـ ستیپان ئارکادیچ جامەکەی هەڵگرت و ئاوڕیدایەوە بۆ لای پیاوێکی سەرساف و مووسوور کە لەوبەری مێزەکە دانیشتبوو، بە پێکەنینەوە سەری بۆ داخست.

لەڤین پرسیی ئەوە کێیە؟

ـ تۆ ئەوت جارێك لە ماڵی ئێمە دیتووە. زۆر کوڕێکی باشە.

لەڤینیش جامەکەی هەڵگرت و وەك ستیپان ئارکادیچ بۆ سپاسکردن روو بە کابرای سەرساف سەری دانەواند.

نەقڵێك کە ستیپان ئارکادیچ گێڕایەوە زۆر قۆڕ بوو. لەڤینیش نەقڵێکی گێڕایەوە کە ئەویش پێکەنینی بوو. پاشان باس هاتە سەر ئەسپ و کێبەرکێی ئەسپسواریی ئەو رۆژە و ئەوەیکە «ئەتلەسی» ئەسپەکەی ڤرۆنسکی، چەند بە ئاسانی خەڵاتی یەکەمی بردۆتەوە. لەڤین ئەوەندە سەرقاڵ بوو کە هەر تێنەگەیشت نیوەڕۆ چۆن تێپەڕی و فراوێنی چۆن خوارد.

کۆتاییی فراوێن بوو کە ستیپان ئارکادیچ گوتی: ئا! ئەوەش خۆی! ـ بەسەر پشتی کورسییەکەدا داهاتەوە و دەستی بۆ لای ڤرۆنسکی درێژ کرد کە لەگەڵ سەرهەنگێکی کەڵەگەتی گارد دەهاتن بۆ لای. شوێنەواری چاکەخوازی و خولکخوشیی تایبەتی دۆخی باشگاکە لە روخساری ڤرۆنسکیدا دیاربوو. بە شادییەوە هەنیشکی لەسەر شانی ستیپان ئارکادیچ دانا و سرتەیەکی بە گوێیدا کرد و هەر بەو پێکەنینە پڕنەشەیەوە بۆ تەوقەکردن دەستی بۆ لای لەڤین درێژ کرد.

گوتی: زۆر بە دیتنتان خۆشحاڵم. ئەو رۆژە کاتی هەڵبژاردنەکە بە دوای ئێوەدا دەگەڕام، گوتیان رۆیشتووی.

لەڤین گوتی: بەڵێ، هەر ئەو رۆژە رۆیشتم. هەر ئێستا باسی ئەسپەکەی ئێوەمان دەکرد. پیرۆزباییت عەرز دەکەم. کێبەرکێیەکی بێوێنە بووە. ئەسپێکی خۆشبەزە!

ـ بیستوومە ئێوەش ئەسپێکی خۆشبەزتان هەیە.

ـ نا، تا ئەو جێیەی لە بیرم بێ باوکم هەیبوو. بەڵام منیش حەزم لە ئەسپسوارییە.

ستیپان ئارکادیچ پرسیی: تۆ لەکوێ نانی نیوەڕۆت خوارد؟

ـ ئێمە، لەسەر مێزی دووهەم بووین، پشت کۆڵەکەکان.

سەرهەنگی باڵابەرز گوتی: هەموو پیرۆزباییان لێدەکرد. ئەوە دووهەمین جارە کە خەڵاتی سەڵتەنەتی وەردەگرێ. خۆزگە ئەو بەختەی ئەو لە ئەسپسواریدا هەیەتی من لە قوماردا

بمبوایە. بەڵام کات بەنرخە و حەیفە بەفیڕۆ بچێت. من ئەوا چووم بۆ جحەندەم[٦٨] ـ ئەوەی گوت و لە مێزەکە دوورکەوتەوە.

ڤرۆنسکی لە وەڵامی تۆرۆڤتسیندا گوتی: ئەمە یاشڤینە ـ پاشان لەسەر کورسییەکی خاڵیی تەنیشت ئەوان دانیشت. جامێك کە خوڵکیان کردبوو خواردییەوە و خۆی داوای بترییەکی دیکەی کرد. لەڤین، یان بە هۆی دۆخی زاڵ بەسەر باشگاکەدا یان بە هۆی شەڕابەوە، شەویلکەی گەرم داهاتبوو و سەبارەت بە باشترین ڕەگەزی ئاژەڵ دەدوا و زۆر بەکەیف بوو کە هیچ هەستێکی نەیارانەی دەرهەق بە ڤرۆنسکی لە دڵدا نییە. تەنانەت کاتی قسەکردن پێیگوت کە لە ژنەکەی بیستووە لە ماڵی پرێنسس ماریابارسیۆڤنا چاوی پێیکەوتووە.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: ئا، پرێنسس ماریابارسیۆڤنا، زۆر ژنی چاکە ـ نەقڵێکی سەبارەت بەو ژنە گێڕایەوە کە هەموویان دەستیانکرد بە پێکەنین، بەتایبەت ڤرۆنسکی وەها لە ناخی دڵەوە پێکەنی کە لەڤین هەستی کرد دڵی سەبارەت بە ئەو وەك ئاوێنەی لێهاتووە.

ستیپان ئارکادیچ هەستا سەرپێ و بە پێکەنینەوە گوتی: چاکە، تەواوبوو؟ کەوایە با بڕۆین.

## هەشت

لەڤین کە لەسەر مێزەکە هەستا هەستی بە ئۆخژنێکی تایبەت کرد. هێندە سووك و تیژباڵ بوو کاتی ڕۆیشتن کە دەستی رادەوەشناند دەتگوت بە حەوادا دەفڕێ. لەگەڵ گاگین بە ژوورە میچبەرزەکاندا تێپەڕین و چوون بۆ ژووری بیلیارد. کاتێك کە لە تەلارە گەورەکەوە تێپەڕین تووشی خەزووری بوو.

پرێنس دەستی نایە ژێر باسکی زاواکەی و گوتی: دەی، چۆنی؟ ئەم پەرستگە بێکەڵکەی ئێمەت پێچۆنە؟ وەرە با دەورێك لێدەین.

بەڵێ، راستتدەوێ منیش دەمویست پیاسەیەك بکەم و چاوم بە شوێنەکانی تر بکەوێ. زۆر سەرنجڕاکێشە.

---

٦٨- ئەوە ناوێك بوو کە لە دیوی قوماری باشگای ئینگلیزییان نابوو.

ـ بەڵێ، بۆ تۆ دەبێ سەرنجڕاکێش بێ، بەڵام بۆ من سەرنجڕاکێش شتێکی دیکەیە. تۆ ئەم پیرە پیاوانەت دیوە...ـ کە ئەوەیگوت پیرە پیاوێکی پشتکووڕی پیشاندا کە لچی داچۆڕابوو و بە زەحمەت قاچە جزمەپۆشەکانی دەجووڵاندەوە و دەهات بۆ لایان:... پێتوایە ئەمانە هەر ئاوا «شل و شەوێق» لەدایك بوون؟

ـ چۆن شلوشەوێق؟

ـ شلوشەوێق زاراوەی تایبەتی باشگایە. دەزانی، لە یاریی هێلکەتلێنەدا، کاتێك هێلکە کوڵاوەکان زیاتر تل دەخۆن و لە یەك دەدرێن و دەشکێن، ئەو کاتە شلوشەوێق دەبن. ئێمەش هەروایین. کاتێك عومرێك لە باشگا تلمان خوارد و لە هەموو لایەکەوە زەبرمان وێکەوت شلوشەوێق دەبین. تۆ پێدەکەنی بەڵام ئێمە، ئیتر ئاگادارین کە کەنگێ خۆشمان دەبینە بەشێك لەو شلوشەوێقانە. تۆ پرێنس چێچینسکی دەناسی؟

لەڤین بە حاڵەتی روخساری خەزووریدا زانیی کە دەیهەوێ قسەیەکی پێکەنینی بکات.

ـ نا، نایناسم.

ـ چۆن نایناسی؟ پرێنس چێچینسکی مرۆڤێکی ناوبەدەرەوەیە. دەی گرینگ نییە. زۆری حەز لە کایەی بیلیاردە. دووسێ ساڵ لەمەوبەر هێشتا لە شلوشەوێقەکان نەبوو و لە خۆی دەفشی و ئەموئەوی بە شلوشەوێق دەزانی. رۆژێك دێت بۆ باشگا و دەرگاوانەکەمان، مەبەستم ڤاسیلییە، ئەو قەڵەوە، خۆ دەزانی پیاوێکی قسەقوت و حازرجوابە. وەلحاسڵ پرێنس چێچینسکی لێیدەپرسێ: «دەی ڤاسیلی، پێمبڵێ بزانم کێ لێرەن؟ لەو شلوشەوێقانە کەسی لێیە؟ ڤاسیلی بەبێ سێ و دوو وەڵامی دەداتەوە: «بە تۆوە دەبنە سێ کەس.» بەڵێ براکەم، ئاوایە.

لەڤین و پرێنس سڵاو و چاکوخۆشییان لەگەڵ ئاشنا و دیوناسەکانیان دەکرد و سەریان لە هەموو تەلار و دیوەکان هەڵدەهێنا. لە ژوورێکی گەورەوە تێپەڕین کە مێزی یاری لەوێ ئامادەکرابوون و هاویارییەکانی هەمیشەیی یارییەکی چکۆڵەیان دەستپێکردبوو. پاشان چوون بۆ هولێکی چکۆڵە کە کەلوپەلی یاریی شەترەنجی لێداندرابوو، سرگی ئیڤانڤیچ لەوێ دانیشتبوو و لەگەڵ کەسێك قسەی دەکرد، پاشان چوون بۆ هۆڵی بیلیارد و لەوێ چاویان بە تاقمێك کەوت کە لە سووچێك لەسەر قەنەفەیەك کۆ بووبوونەوە و شامپانییان دەخواردەوە و خەریکی گاڵتە و جەفەنگ بوون، گاگینیش لەگەڵ ئەوان بوو. سەرێکیشیان لە «جحەندەم» هەڵێنا و لەوێ چاویان بە یاشڤین کەوت کە لە پشت مێزێك دانیشتبوو و تاقمێك یاریزان دەورەیان دابوو. بێدەنگ و بەبێ چرپە چوون بۆ ژووری متاڵاکردن کە پانتایەکی تاریکی هەبوو و لەبەر شۆقی چرای کڵاوە

بەسەر گەنجێك بە نیوچاوانی گرژەوە دانیشتبوو و رۆژنامەکانی یەك لەدوای یەك هەڵدەگرت و چاوێکی لێدەکردن، هەروەها ژینراڵێك کە سەرێکی بێتووکی هەبوو و سەرقاڵی خوێندنەوە بوو. پاشان چوون بۆ ژوورێك کە پرێنس ژووری پڕهۆشانی پێدەگوت و ئەویش سێ کەسی لێبوو کە بە تینوتاوێکی زۆرەوە سەبارەت بە دوایین هەواڵە سیاسییەکان قسەیان دەکرد.

یەکێك لە هاوڕییەکانی پرێنس کە ئەوی لەوێ دۆزیبۆوە گوتی: پرێنس، تکایە فەرموون، ئامادەیە ـ پرێنس خێرا چوو. لەڤین تۆزێ دانیشت و گوێی بۆ باسە سیاسییەکە راگرت، بەڵام کە باسەکانی سەرلە بەیانیی ئەو رۆژەی وەبیرهاتەوە، لەناکاو بێتاقەت بوو. بەپەلە هەستا و رۆیشت بە دوای تۆرۆڤتسین و ئابلۆنسکیدا، چونکە دانیشتن و ئاخافتن لەگەڵ ئەوانی پێخۆشتر بوو.

تۆرۆڤتسین پەرداخی ساردی بە دەستەوە، لە ژووری بیلیارد لەسەر قەنەفەیەکی بەرز دانیشتبوو، ستیپان ئارکادیچ و ڤرۆنسکی لەبەر دەرگاکە و لە سووچێکی دوور راوەستابوون و قسەیان دەکرد.

ـ خۆ باس لەسەر بێتاقەتی نییە، ئەوەی بۆتە هۆی دڵتەنگی و ئازاری ئەو، مەعلووم نەبوونی ئەو بارودۆخەیە و کێشەکەی لایەکی بەلایەکدا ناکەوێ کە دڵنیابێت و یەکچاو ببێتەوە... ـ ئەمە ئەو قسەیە بوو کە لەڤین گوێی لێبوو، بەپەلە ویستی دوورکەوێتەوە بەڵام ستیپان ئارکادیچ بانگی کرد.

ـ لەڤین... ـ لەڤین تێگەیشت کە ئابلۆنسکی چاوانی تەڕە. فرمێسك نەبوو. بەڵکوو خووی هەمیشەییی بوو هەرکاتێك بە بادە سەرخوش دەبوو یان هەستی دەبزوا ئاوا چاوانی تەڕ دەبوون. ئەو رۆژە هۆی فرمێسکتێزانی چاوی بە هەردوو هۆیەکەوە بوو. قۆڵی لەڤینی گرت و گوتیشی: لەڤین مەڕۆ ـ دیاریشبوو کە بە هیچ شێوەیەك بەری نادات.

پاشان رووی لە ڤرۆنسکی کرد و گوتی: ئەو هاوڕێی گیانیگیانیی منە. هاوڕێی لە ئەو نزیکترم نییە. تۆ لەویش بۆ من نزیکتر و خۆشەویستتری. من دەمهەوێ و پێداگریشی لەسەر دەکەم کە ئێوە پێکەوە ببنە هاوڕێی گیانیگیانی. چونکە هەردووکتان پیاوی چاکن.

ڤرۆنسکی بە رووخۆشی و مێهرەبانییەوە دەستی بۆ لای لەڤین درێژ کرد و بە گاڵتە گوتی: وایە، تەنیا کارێك کە ماوە ئەوەیە کە پێکەوە ماچوومووچەکە بکەین.

لەڤین دەستی بە توندی گرت و هەروا کە دەیگوشی گوتی: زۆر زۆر بە دۆستایەتیی و ئاشنایەتیتان خۆشحاڵم.

ستیپان ئارکادیچ دەنگی هەڵێنا: گارسۆن، بترییەك شامپانی.

ڤرۆنسکی گوتی: منیش زۆر خۆشحاڵم.

بەڵام سەرەڕای هۆگریی زۆری ستیپان ئارکادیچ بە نێوانخۆشیی ئەوان و هەروەها حەزی دوولایەنە، خۆیان قسەیەکیان بۆ گوتن پێنەبوو و هەردووکیشیان هەستیان بەوە دەکرد.

ستیپان ئارکادیچ بە ڤرۆنسکیی گوت: تۆ دەزانی ئەو لەگەڵ ئانا ئاشنایەتیی نییە؟ من دەمەوێ حەتمەن بە خوشکمی بناسێنم. وەرە با بڕۆین لەڤین.

ڤرۆنسکی گوتی: سەیرە! ئانا زۆر خۆشحاڵ دەبێ. من زۆرم حەزدەکرد هەرئێستا لەگەڵتان بێمەوە بۆ ماڵێ. بەڵام خەمی یاشڤینمە و حەزدەکەم هەتا یارییەکەی تەواودەبێ لێرەبم.

ـ چۆن؟ یانی لە دۆخێکی خراپدایە؟

ـ بەردەوام دەیدۆڕێنێ، منیش تەنیا کەسێکم دەتوانم لەو کارەی بگێڕمەوە.

ستیپان ئارکادیچ رووی لە لەڤین کرد و گوتی: دەی لەڤین لەگەڵ پیرامیدێك[٦٩] چۆنی؟ـ رووی لە بەرپرسی بیلیاردەکە کرد و گوتی: پیرامیدێکمان بۆ رێکبخە!

بەرپرسی بیلیارد کە تۆپیلکەکانی وەکوو سێگۆشەیەك چنیبوو و گۆیەکی سووری دەخولاندەوە و چاوەڕوانی یاریزان بوو بێتە پێشێ، وەڵامیدایەوە: دەمێکە ئامادەم کردووە.

ـ باشە، کەوایە با دەستپێبکەین.

دوای یارییەکە ڤرۆنسکی و لەڤین لە پشت مێزێك کە گاگین لێیدانیشتبوو هێندێك دانیشتن و لەڤین لەسەر قسەی ستیپان ئارکادیچ پارەی لەسەر ئاس دانا. ڤرۆنسکی هێندێ جار لە پشت مێزەکە دادەنیشت و ئەو ئاشنایانەی بەردەوام دەهاتن بۆ لای لە دەوری کۆزیلکەیان دەبەست و هێندێ جاریش هەڵدەستا و دەچوو بۆ «جحەندەم» تاکوو بزانێ یاشڤین چیدەکات. لەڤین خەریکبوو لە چنگ ئەو کێشە زەینییەی سەرلە بەیانی دەربازدەبوو و لەوەی کە کۆتاییهاتنی دوژمنایەتی لەگەڵ ڤرۆنسکی هەستێکی خۆش و هێمنایەتیی پێبەخشیبوو، هەستی بە حەسانەوە دەکرد، بەردەوام چێژی لەو خاترجەمی و بارودۆخە خۆشولەبارە وەردەگرت کە بەسەر باشگاکەدا زاڵ بوو.

کاتێك یاری تەواوبوو ستیپان ئارکادیچ قۆڵی لەڤینی گرت و پێیگوت:

---

٦٩- پیرامید: یەکێك لە یارییەکانی بلیلیاردە کە تۆپیلکەکان بە شێوەی سێگۆشە دادەنێن.

ـ دەی، ئێستا وەرە با بڕۆین بۆ لای خوشکم. هەر ئێستا. ئەو ئێستا لەماڵێیە. من لەمێژە بەڵێنم پێداوە بتبەم بۆ لای و بە یەکترتان بناسێنم. ئەمشەو دەتویست بۆ شوێنێك بچیت؟

لەڤین وەلامیدایەوە: نا، شوێنێکی تایبەتم نییە بچم. بەڵێنم بە سێڤیاژێسکی دابوو کە شەوێك بچم بۆ سەردانی لە مەکۆی کۆمەڵەی جووتیاران. بەڵام ئەگەر پێتخۆشبێ لەگەڵتدا دێم.

ـ زۆر چاکە، با بڕۆین. ـ بە پێشخزمەتێکی گوت: دابزانە، فەیتوونەکەی من ئامادەیە؟

لەڤین چووە بەرمێزەکە و ئەو چل رۆبڵەی لەسەر ئاس دۆڕاندبووی دای و هەروەها حیسابی پارەی باشگاکەشیدا بەو پێشخزمەتە بەسالاچووەی کە لە نزیك دەرگاکە راوەستابوو ـ سەیریش ئەوەبوو ئاگای لە هەموو حیساب و کیتابەکانی ئەو هەبوو ـ هەروا کە بە نەرمی دەستی رادەوەشاند بە نێو هۆڵەکاندا تێپەڕی و رویشت بولای دەرگای چوونەدەرەوە.

# نۆ

دەرگاوان بە دەنگێکی گڕو لەبزێکی تووڕەوە گوڕاندی: فایتوونی ئابلۆنسکی!

ـ فایتوونەکەیان هێنایە پێشێ و هەردووکیان سوار بوون. لەڤین تەنیا ئەو کاتەی کە فایتوونەکە لە دەروازەی باشگا چووەدەرێ لە هێمنایەتی و بارودۆخی باشگاکە و ئەو کردەوە جوانانەی کە لەوێ دیتبووی رازی بوو و هەستی بە ئاسوودەیی دەکرد، بەڵام هەرکە فایتوونەکە گەیشتە سەرشەقام و لەسەر کەندولەندی رێگاکە کەوتە هەڵبەزدابەز و دەنگی تووڕە و تۆسنانەی فایتوون ئاژۆیەکی بیست و تابلۆی پەرداخفرۆشێکی دی کە لەبەر شۆقی سارد و کەمرەنگی زەردەپەڕ بریقەی دەهات و دوکانەکانی گوێ شەقامی هێنایە بەرچاوی خۆی، ئەو هەستە خۆشەی لێتاراند کە دڵ و دەروونی داگرتبوو و دەستیکرد بە بیرکردنەوە لەو کارانەی کە دەیکرد و لە دڵی خۆیدا گوتی «یانی چوونی بۆ سەردانی ئانا کارێکی شیاوە؟ کیتی دەڵێچی؟» بەڵام ستیپان ئارکادیچ دەرفەتی بیرکردنەوەی پێنەدا و وەك ئەوەی دڕدۆنگی و دوودڵیی ئەوی بۆ دەرکەوتبێ هەوڵیدەدا ئەو بیر و خەیالانە لەسەری بڕەوێنێ.

گوتی: چەندەم پێخوشە کە لەگەڵ ئەودا ئاشنا دەبی! دەزانی دالی ماوەیەکی زورە حەزدەکات تۆ چاوت بە ئانا بکەوێ. لۆڤیش هاتووە بۆ سەردانی و دیسانیش هەر دێ بۆ لای

ـ پاشان گوتیشی: راستە ئەو خوشکی منە بەڵام من بە دڵنیاییەوە دەتوانم بڵێم ژنێکی بێوێنەیە. ئێستا خۆت دەیبینی. زۆر لە بارودۆخێکی خراپدایە، بەتایبەت ئێستا.

ـ مەگین چیبووە؟

ـ ئاخر لەگەڵ مێردەکەی خەریکی کێشە و دانووستانین بۆ جیابوونەوە. هەڵبەت مێردەکەی رازییە بەڵام لەمەڕ کوڕەکەیەوە تووشی ئاریشە بووە و کاری تەڵاقەکەی کە دەبوو زۆر لەمەوبەر کۆتاییی پێبهاتبایە، سێ مانگی خایاندووە بەڵام کارەکەی بۆ یەکلایی نەکراوەتەوە. هەرکاتێك کارەکەی کوتاییی پێبێت لەگەڵ ڤرۆنسکی ژیانی هاوبەش پێکدێنێ. ئەم دابە کونە، کە لە رۆژگاری بەنیئیسرائیلەوە بۆ ئێمە ماوەتەوە و ژیانی لێتاڵ کردووین زۆر دابێکی قۆڕ و گەوجانەیە. هیچ کەس بڕوای پێینییە و بۆتە کۆسپ و تەگەرەی سەرڕێگای بەختەوەریی خەڵك. لەوە گەڕێین، ئەگەر ژیانی هاوبەش پێکبێنن وەك من و تۆ ژیانیان پڕدەبێ لە تەبایی و بەختەوەری.

ـ کێشەکە لەکوێ دایە؟

ـ ئەها، ئەمە بەسەرهاتێکی دوور و درێژ و جاڕزکەری هەیە. لە وڵاتی ئێمە هیچ کارێك روون نییە و پیاو تێناگا ئەرك و تەکلیفی چییە. بەڵام مەسەلەکە ئەمەیە کە ئانا سێ مانگە لێرە، لە مۆسکۆ، کە هەمووان ڤرۆنسکی دەناسن چاوەڕوانی تەڵاقە. نە دەچێت بۆ شوێنێك و نە جگە لە دالی ژنێکی تر دەچێت بۆ سەردانی، چونکە، خۆت دەزانی، ناخوازێ کەسێك بە هۆی بەزەییەوە هاموشۆی بکات و ئەو پرێنسس ڤارڤارا دڵڕەقەش بەجێی هێشتووە و رۆیشتووە چونکە هاوڕێبوون لەگەڵ ئەو بە شوورەیی و بێئابڕوویی دەزانێ. هەر ژنێکی تر بووایە بەجێی ئانا لەو بارودۆخە تاڵەدا تاقەتی نەدەهێنا. ئێستا خۆت دەیبینی کە ئەو ژیانی خۆی چۆن رێکخستووە و چەندە ئارام و لێهاتووە ـ لەوکاتەدا سەری لە پەنجەرەی فایتوونەکەی بردە دەرێ و بە فایتوونئاژۆکەی گوت: بەلای چەپدا، کۆڵانەکەی رووبەڕووی کەنیسە ـ پاشان لەگەڵ ئەوەدا کە پلەی گەرما دوازدە دەرەجە لە ژێر سیفردا [٧٠] بوو بەرۆکی ئاوەڵای باڵتەکەی ئاوەڵاتر کرد و گوتی: پەککوو لەو گەرمایە!

لەڤین گوتی: بەڵام خۆ کچەکەی لەگەڵە. دەبێ خۆی بەوەوە سەرقاڵ بکات.

---

٧٠- لە رووسیا یەکەی دەرەجەی گەرما «ڕئومۆر» بەکار دێنن دوازدە دەرەجەی ڕئومۆر بەرانبەرە لەگەڵ پازدە دەرەجەی سلزیۆس (سانتیگراد)

ستیپان ئارکادیچ گوتی: تۆ وادیاره ژن تەنیا وەك ئاژەڵێکی مێوینه دەبینی، وەك مریشکێك کە تەنیا بۆ جووچك هەڵێنان باشبێ. یانی ژن جگە له گەورەکردنی منداڵ هیچ کارێکی تری نییه؟ نا، وا بیر مەکەوه ئەو زۆر جوان کچەکەی پەروەردە دەکات، بەڵام قەتی باس ناکات. گرینگترین کاری نووسینه. وادیاره رشقنجارانه پێدەکەنی. بەڵام پێکەنینه تەوساوییەکەت بێجێیه. خەریکی نووسینی کتێبێکه بۆ منداڵان، بەڵام سەبارەت بەو کتێبه لەگەڵ هیچ کەس قسەناکات. کتێبەکەی بۆ من خوێندۆتەوه. دەستنووسەکەیم دا به ڤۆرکوویف[71]. دەزانی خاوەنی پەخشانگایه و نووسەریشه. لەو کارەدا شارەزایه و دەڵێ کتێبێکی کەم وێنەیه. بەڵام تۆ پێتوایه ئەو یەکێك لەو ژنه هەرزەنووسانەیه کە قەڵەم خەسار دەکات. بەڵام قەت وانییه. ئەو بەرله هەموو شتێك ژنێکی دڵۆڤانه. ئێستا خۆت دیبینی. ئەو ئێستا کچێکی ئینگلیزی گەوره دەکات و بەرێوەهێنانی بنەماڵەیەکی تەواوی له ئەستۆ گرتووه.

ـ چۆن؟ یانی کاری خێر دەکات؟

ـ ئەوەتا، دیتووته؟ له هەموو کارێکدا تەنیا باری خراپه دەبینی. نا، کاری خێر ناکات، بەڵام دڵی لێورێژه له مێهرەبانی. ئەوان، یانی ڤرۆنسکی راهێنەرێکی ئەسپی بوو کە له کاری خۆیدا زۆر شارەزا بوو، بەڵام هەمیشه سەرخوش بوو. هێندەی ئارەق خواردەوه کە ئەقڵی گۆرا و وەك شێتی لێهات. بەردەوام قسەی هەڵیتوپلێتی دەکرد و گەشکەی لێدەهات و لەرزۆکیش بووبوو، تا وایلێهات بنەماڵەکەی به بێسەرپەرشت هێشتەوه و رۆیشت. ئانا ئەو بنەماڵەیەی دی و یارمەتییدان و وا هۆگریان بوو کە سەرپەرشتیی ئەوانی وەئەستۆ گرت. بەڵام نەك ئەوەی پارەیان بداتێ و فیزیان بەسەردا لێبدات. خۆی بەسەر دەرسی رووسیی کورەکاندا رادەگات و دەیهەوێ بۆ قۆناخی دواناوەندی ئامادەیان بکات، کچۆڵەکانیشی هێناوه بۆ لای خوی. ئێستا خۆت دەیبینی.

فایتوونەکه چووه حەوشه. کاشەیەك لەبەر دەرگای ماڵەکەیان راوەستابوو و ستیپان ئارکادیچ به توندی له زەنگی دەرگاکەیدا.

بەبێ ئەوەی لەو دەرگاوانەی دەرگاکەی کردەوه بپرسێ کە له ماڵێن یان نا، خۆیکرد به نێو دالانەکەدا. لەڤین به دوایدا چووه ژوورێ، هەنگاو به هەنگاو تووشی دوودڵی و دردۆنگی دەبوو کە هاتنی بۆ ئەو ماڵه کارێکی باشه یان نا.

---

71- Vorkuyer

چاوێکی لە ئاوێنەی نێو دالآنەکە کرد و دیتی ڕەنگوڕووی سوورهەڵگەڕاوە. بەڵام خاترجەم بوو کە مەست نییە و بە دوای ستیپان ئارکادیچدا بە پلیکانە فەرشکراوەکاندا وەسەر کەوت. کە گەیشتە سەرێ ستیپان ئارکادیچ لەو پێشخزمەتەی پرسی کە وەك یەکێك لە خزمە نزیکەکانی ماڵێ، کڕنۆشی بۆ برد کە میوانەکەی ئانا ئارکادیۆڤنا کێیە و پێشخزمەتەکە وەڵامیدایەوە جەنابی ڤارکۆیف لەوێیە.

ـ لەکوێن؟

ـ لە نووسینگەی کار.

ستیپان ئارکادیچ و لەڤین بە ژوورێکی چکۆڵەدا تێپەڕین کە رووپۆشی دیوارەکانی تەختە بوو و فەرشێکی نەرم لە تەرکەکەی ڕاخرابوو، چووە نێو نووسینگەیەکی نیوەتاریکەوە کە چرایەکی کڵاوەدار رووناکی کردبۆوە. چرایەکی دیکەش بەرەوڕووی دیوارەکە هەڵکرابوو و وێنەی بەژن و باڵای ژنێکی رووناك دەکردەوە، کە نەخوازراوانە سەرنجی لەڤینی ڕاکێشا. ئەو تابلۆیە وێنەی ئانا بوو کە میخائیلۆڤ لە ئیتالیا کێشابوویەوە. کاتێك کە ستیپان ئارکادیچ لە پشت پاراوانەکەوە هاتەژوورێ دەنگی پیاوێك کە قسەی دەکرد بە هاتنی ئەو بێدەنگ بوو لەڤین ماتووڕ لە جێی خۆی ویشك بووبوو و چاوی لەو وێنەیە دەکرد کە شۆقی چراکە رووناکی کردبۆوە و دەتگوت لە قەتحەکە هاتۆتە دەرێ و هێندە جوانبوو نەیدەتوانی چاوی لەسەر هەڵگرێ. تەنانەت لە بیری چووبۆوە لەکوێیە و ئاگای لێنەبوو قسە دەکەن یان بێدەنگ بوون و بەردەوام چاوی لە وێنەکە بڕیبوو. ئەوەی دەیدی وێنە نەبوو بەڵکوو ژنێکی زیندوو و شۆخوشەنگ بوو کەزیە ڕەشەکانی چینچین و شانوقۆڵی رووت و لێوانی جوان و پشت لێوی بە نەرمە تیسك داپۆشراوی بە شیلە بزەیەکی پەرۆشانە کەلێنی تێکەوتبوو و بە چاوانی دلڕفێن و مەستی و بە نیگایەکی نەرم و شیرینەوە چاوی لە چاوە شەرمنۆکەکانی ئەو بڕیبوو. لەڤین تەنیا بەوهۆیە بە زیندووی نەدەزانی، چونکە دڵنیابوو ژنێکی زیندووی ئاوا جوان نابێ هەبێ.

لەناکاو گوێی لە دەنگێك بوو لە نزیك خۆی کە وێدەچوو پێیبڵێ «زۆر خۆشحاڵم» دەنگی ئەو ژنەش بوو کە بە رۆح و گیانەوە ئاوێتەی بووبوو و سەرسامانە چاوی لێدەکرد. ئانا لە پشت پاراوانەکەوە هاتبوو بەرەوپیری و لەڤین لەنێو ژوورە نیوەتاریکەکەدا ڕاست ئەو خاتوونەی دەدی کە لەنێو وێنەکەدا بوو، لیباسی کەهووی چەند ڕەنگی تۆخی لەبەردا بوو بەڵام نەك بەو شێوەیەی کە لەنێو تابلۆکەدا ڕەسمکرابوو

و نه بەوحاڵەتەی روخساریشییەوە، بەڵام هەر بەوڕادەیە جوان و دەلال بوو کە وێنەکەی وەك تابلۆکە گەش و بەنەشە نەبوو بەڵام جوانیی روخسارە زیندووەکەی تەڕوبڕی و دڵڕفێنییەکی پێوەبوو کە لە تابلۆکەدا نەبوو.

## ده

بۆ پێشوازیکردن لە جێی خۆی هەستابوو و ئەو شادییەی کە بە دیتنی ئەو گیانی داگرتبوو نەیدەتوانی بیشارێتەوە. دەستە ناسك و نەرمەکەی بە توندوتۆڵی هێنایە پێشێ و ئەوی لەگەڵ ڤارکۆیڤ ئاشنا کرد و کچۆڵەیەکی جوانی قژ سووریش کە هەر لەوێ دانیشتبوو و سەرقاڵی کاری خۆی بوو پیشان لەڤینیدا و گوتی کە خۆی گەورەی کردووە و لەڤین لە هەموو جووڵان و هەڵسوکەوتەکانیدا تایبەتمەندییەکی دڵگر و ئاشنای دەدی کە لە خاتوونێکی پایەبەرز و خانەدان دەوەشایەوە کە هەمیشە لەسەرەخۆیە و ئاکاریشی سروشتییە.

دیسان گوتی: زۆر، زۆر خۆشحاڵم! ـ ئەم وشە ساکارانەشی بەو هۆیە کە لە گوێچکەی لەڤیندا مانایەکی تایبەتیان لەخۆ گرت: من ماوەیەکی زۆرە ئێوە دەناسم و بەهۆی دۆستایەتیتان لەگەڵ ستیڤا و هەروەها لەبەر خاتری خانمەکەشت خۆشمدەوێن... تەمەنی ئاشنایەتیی من لەگەڵ خانمەکەت زۆر کورت بوو، بەڵام ئەو وەك چەپکە گوڵێك شوێنی لەسەر من دانا، بەڵێ، بەڕاستی چەپکە گوڵێکی جوان بوو و ئێستا بەمزووانەش دبێتە دایك.

زۆر لەسەرەخۆ و بە ئاسوودەیی دەدوا و هێندێ جار چاوی لەسەر لەڤینەوە دەگوێستەوە بۆسەر براکەی و لەڤین هەستی دەکرد شوێنێکی باشی لەسەر دڵی ئانا داناوە و لە دڵی خۆیدا هەستی بە شادی و ئاسوودەیی دەکرد، وەك ئەوەی لە منداڵییەوە ناسیبێتی.

ستیپان ئارکادیچ لێیپرسی دەتوانن جگەرە بکێشن و ئانا لە وەڵامدا گوتی: ئیڤان پترۆڤیچ و من هەر بۆیە هاتووین بۆ نووسینگەکەی ئەلکسی بۆ ئەوەی بتوانین جگەرە بکێشین.ـ چاوێکیشی لە لەڤین کرد و بەجێی ئەوەی لێیبپرسێ جگەرە دەکێشێ یان نا، قوتووە جگەرەیەکی لە سەدەفی کیسەڵ کێشایە پێشێ و جگەرەیەکی ناسکی هەڵگرت.

براکەی لێی پرسی: ئەمڕۆ حاڵت چۆنە؟

ـ زۆر چاکم، تەنیا ئەعسابم وەك هەمیشە شێواوە.

ستیپان ئارکادیچ، کە دیتی لەڤین بەردەوام چاوی لە تابلۆکەیە گوتی: زۆر جوانە، وانییە؟

ـ من تابلۆی ئاوا جوانم قەت نەدیوە.

ڤارکۆیف گوتی: چەندەش لە ئەسڵەکەی دەچێت. وانییە؟

سەرنجی لەڤین لەسەر تابلۆکەوە چووە سەر ئەسڵەکە. کاتێك ئانا سەرنجی ئەوی لەسەر خۆی هەست پێکرد تروسکەیەکی سەیر روخساری گەشاندەوە. لەڤین سوورهەڵگەڕا و بە مەبەستی شارنەوەی شڵەژانەکەی خۆی ویستی بپرسێ کە لەمێژە داریا ئەلکساندرۆڤنای نەدیتووە؟ بەڵام ئانا هەر لەوساتەدا دەستیکرد بە قسەکردن و گوتی: ئێمە ئێستا لەگەڵ ئیڤان پترۆڤیچ باسی دوایین تابلۆکانی ڤاشچنکۆڤمان دەکرد. ئێوە ئەو تابلۆیانەتان دیتووە؟

لەڤین گوتی: بەڵێ من دیتوومە.

ـ ببوورە قسەکەم پێبڕین. خەریکبوون دەتانگوت...

لەڤین پرسیی: لەمێژە چاوتان بە دالی نەکەوتووە؟

ـ دوێنێ لەلام بوو. بەهۆی بارودۆخی قوتابخانەی گریشاوە زۆر بێتاقەت بوو. وادیارە مامۆستای لاتین ناهەقیی دەرهەق بەو بەستەزمانە کردووە.

لەڤین ئیتر بە هیچ شێوەیەك وەك ئەو رۆژە وشك و بێزەوق قسەی نەدەکرد. هەر وشەیەکی بە ئانای دەگوت مانایەکی تایبەتی لەخۆ دەگرت. چێژی لە ئاخافتن لەگەڵ ئەو وەردەگرت بەڵام گوێگرتن لە قسەکانی زۆر لە قسەکردن لەگەڵیدا شیرینتر بوو.

ئانا نەك شروشتی دەدوا و زاڵبوو بەسەر مەبەستەکەیدا، بەڵکوو سروشتیبوونی و قسەکانیشی زۆر ئازادانە بوو و زۆر دەروەستی بیر و فیکری خۆی نەبوو. بەپێچەوانە زۆری رێز بۆ قسەی بەرانبەرەکەی دادەنا و بە وردی سەرنجی پێدەدا.

باسەکە هاتەسەر بواری تازەی هونەر و بەتایبەت ئەو وێنە نوێیانەی کتێبی پیرۆز لەلایەن یەکێك لە هونەرمەندانی فەڕەنسییەوە کێشرابوونەوە[٧٢]. ڤارکۆیف رەخنەی لە وێنەگرەکە دەگرت و دەیگوت کاری رێئالیستی نەپۆڕ کردووە و ئەو جوانی و ناسکییە تایبەتەی هونەری پێوە نییە. لەڤین گوتی: فەڕەنسییەکان کاری پێڕەوی لە دابونەریتیان بە جێیەك گەیاندووە کە بەڕاستی لەلای هیچ هونەرمەندێکی تر وێنەی نییە و هەر بەو هۆیەش گەڕانەوە بۆ رێئالیسم

٧٢- ئاماژەیە بە گوستاڤ (Gustave Dore) کە ساڵی ١٨٦٥ وێنەکانی نێو کتێبی پیرۆزی کێشایەوە.

بە کارێکی بەجیٚ و پڕبایخ دەزانن. هەر بەوەدا کە هونەر بە مەجاز رمموودە ناکەن لە رۆحی شێعر دەگەن و دەیهێننە دنیای هونەرەکەیانەوە.

لەڤین تا ئێستا لەو قسە قەلەمی و کاکلّدارانەی کردبووی هیچیان وەك ئەمەیان چێژی پێنەبەخشیبوو. روخساری ئانا، کە لە قوولاّیی مانای ئەو وتەیە گەیشت تررووسکەیەکی تیژا و پێکەنی.

گوتی: ئەم پێکەنینەی من لەو پێکەنینانەیە کە بە دیتنی وێنەیەکی کە زۆر لە ئەسلّەکەی دەچێت مرۆڤ دەگەشێتەوە و پێکەنینی دێ. ئەم دەربازبوونە لە مەجاز کە ئێوە باسی دەکەن لە تایبەتمەندییەکانی هونەری ئەمڕۆی فەرەنسییەکان و بەتایبەت وێنەگەر و تەنانەت وێژە و ئەدەبەکەشیانە، بۆ وێنە زۆلاو دەوودە[73]. رەنگە هەمیشەش هەروا بووبێت. سەرەتا وێنەگەلێکی زەینی بەلاّم بەپێی بڕیاری دلّخوازی خۆیان وەدی دێنن و پاشان کاتێك هەموو ئەو وێنانە بە هەموو شێوەیەکی گونجاو پێکەوە ئاوێتە دەکەن لێیماندوو دەبن و کارێك دەکەن کە سروشتی تر و دروستتر بیر لە وێنەکان بکەنەوە.

ڤارکۆیڤ گوتی: ئەم قسەیەی ئێوە راستییەکی حاشاهەلّنەگرە!

ئانا رووی لە براکەی خۆی کرد و پرسیی: دەی، کەوایە ئێوەش لە باشگا بوون؟

لەڤین لە دلّی خۆیدا گوتی «عەجەب ژنێکە!» خۆی لەبیرچووبۆوە و چاوی لەسەر روخساری جوان و پڕشۆر و جوولّەی، کە ئێستا بە تەواوی گۆڕابوو، هەلّنەدەگرت. لەڤین ئانای دەدی کە بۆ لای براکەی وەرسووڕاوە و قسەی لەگەلّ دەکات، بەلاّم نەیدەزانی باسی چی دەکەن، ئەگەرچی سەری لەو گۆڕانەی رەنگوڕووی سوور مابوو. روخساری کە تاوێك لەمەوبەر ئەو هەمووە جوان و ئارام بوو، ئێستا تووڕەیی و فیز و کونچکاوی کە لەگەلّ ئەو جوانییەی سازگار نەبوو، دایگرتبوو. بەلاّم ئەوە تەنیا ساتێکی خایاند. وەك ئەوەی بیهەوێ شتێك وەبیر خۆی بێنێتەوە پێلّووی تێکپەڕاند.

گوتی: بەهەرحالّ گوێ بەو شتانە ناداتـ رووی لە کچەکە کرد و بە ئینگلیزی گوتی: ***بلّێ لە ژووری دانیشتن چاییەکەمان بدەنێ.***

کچۆلّەکە هەستا و لە نووسینگەکە چووەدەرێ.

ستیپان ئارکادیچ پرسیی: تاقیکردنەوەکەی باشبوو؟

---

73- Daudet

ـ بەڵێ، زۆر باشە. کچێکی زۆر خاوەن مرخە. زۆریش هێمن و لەسەرەخۆیە.

ـ ئاخری بەوجێیە دەگات کە تۆ ئەوت لە کچەکەی خۆت خۆشتر بوێ.

ـ ئەوە قسەیەکە کە تەنیا پیاو دەتوانێ بێکات. لە خۆشەویستیدا زیاتر و کەمتر بوونی نییە. کچەکەی خۆمم جۆرێك خۆشدەوێ و ئەم کچەش جۆرێکی تر.

ڤارکۆیڤ گوتی: من بە ئانا ئارکادیۆڤنا دەڵێم کە ئەگەر یەك لە سەدی ئەو ئەرکەی بۆ ڕاهێنانی ئەو کچە ئینگلیزییە دەیکێشێ بۆ منداڵانی ڕووسی بە گشتی بکێشایە کارێکی زۆر بەکەڵك دەبوو.

ـ دەی، چ بکەم؟ من ئەو کارەم لەدەست نایە. کۆنت ئەلکسیکیریلیچ زۆرم بۆ ئەو کارە هاندەدا (لەگەڵ هێنانی ناوی کۆنت ئەلکسیکیریلیچ شەرمنانە چاوێکی پڕپاڕانەوەی لە لەڤین کرد و لەڤین نەخوازراوانە ڕوانینەکەی ئەوی بە ڕوانینێکی پڕ لە ڕێز وەڵام دایەوە) کە بەڕێوەبەرایەتیی قوتابخانەیەکی گوند لە ئەستۆ بگرم. چەند جار چووم. ئەوان زۆر مێهرەبان بوون بەڵام نەمتوانی هۆگری بەو کارە پەیدابکەم. ئێوە باسی ئەرك دەکەن. مرۆڤ ئەرك لەسەر بنەمای ئەوین دەکێشێ. بەڵام خۆ ئەوین لەگەڵ هەوادا نایە. خۆ ناتوانی بیشیکڕی. بەڵام ئەم کچۆڵەیەم زۆر خۆشدەوێ. خۆشم نازانم بۆ.

دیسان چاوی لە لەڤین کرد. بە بزە و نیگای دەیویست پێیبڵێ کە بەردەنگەکەی تەنیا ئەوە و بیروڕای ئەوی زۆر بەلاوە بەڕێزە و هێشتا نەشیناسیوە دەزانێ کە باش لە قسەی یەکتر تێدەگەن.

لەڤین وەڵامیدایەوە: من زۆر باش لەو حاڵەی ئێوە دەگەم. مرۆڤ ناتوانێ هۆگریی ڕاستەقینە بە قوتابخانە و ئەو جۆرە شوێنانە پەیدابکات و پێموایە هەر بەوهۆیە ئەمجۆرە دامەزراوە خێرخوازانەیە قەت ئاکامێکی باشیان نییە.

ئانا تۆزێ بێدەنگ بوو و زەردەیەکی گرت.

پاشان قسەکەی لەڤینی سەلماند: بەڵێ، من هیچ کات نەمتوانیوە. بە دەردی فەڕەنسییەکان دەڵێن ***کوا من ئەوەندە بەجەرگم و تواناییی ئەوەم هەیە*** کە هۆگری هەتیوخانەیەکی منداڵانی لادێ بم. ***هیچ کات ئەوەم لەدەست نەهاتووە.*** زۆرن ئەو ژنانەی کە لەو ڕێگایەوە ***ناو و ناوبانگێکیان*** بۆ خۆیان پێکەوە ناوە. بەتایبەت ئێستا (لێرەدا ڕووی لە براکەی کرد بەڵام دیاربوو بەردەنگەکەی هەر لەڤینە و بە لەبزێکی خەمبار و هاودڵانە درێژەی بە قسەکانیدا) کە ئەوەندەم پێویستی بە سەرقاڵییە، ناتوانم ـ لەناکاو نێوچاوانی تێکنا (لەڤین تێگەیشت کە ئەو نێوچاوان پێکدادانە نیشانەی ناڕازیبون لە خۆیەتی، چونکە باسی خۆی

کردووه.) قسەکەی گۆڕی و رووی لە لەڤین کرد و گوتی: من ئاگام لە بارودۆخی ئێوه هەیە و دەزانم کە شارۆمەندێکی باش نین و هەتا ئەو جێیەی توانیومە بەرەڤانیم لە ئێوه کردووه.

ـ چۆن بەرەڤانیێت لە من کردووه؟

ـ پێوەندیی بە جۆری هەڵمەتەکەوە هەیە. ئێستا با واز لەو قسەیە بێنین. حەز ناکەن چایی بخۆنەوە؟ ـ خۆی هەستا و کتێبێکی بەرگچەرمی هەڵگرت و بەدەستییەوە گرت.

ڤارکۆیڤ ئاماژەی بە کتێبەکە کرد و گوتی: دا ئەو کتێبەم بدەیە، ئانا ئارکادیۆڤنا! زۆر حەیفە.

ـ ئەوە، نا، هێشتا تەواو نەبووه.

ستیپان ئارکادیچ ئاماژەی بە لەڤین کرد و بە خوشکی گوت: بە ئەوم گوتووه.

ـ کارێکی باشت نەکردووه. نووسراوەکانی من وەکوو ئەم زەنبیلە کەندەکارییانە وان کە لە زیندان دروستیان دەکەن و لیزا مێرستالڤا ئەوکات پێیفرۆشتم ـ رووی لە لەڤین کرد و درێژەی بە قسەکانیدا: ئەو لە کۆمەڵەی چاکەکاراندا سەرپەرشتی بەشی زیندانیانە. بەڵام کاری ئەو چارەڕەشانە زۆر گران و تاقەتپڕوکێن بوو.

لەڤین بەو شێوەیە دیاردەیەکی نوێیتری لەم ژنە دی کە بە نێو خوێن و رۆحیدا شۆڕبۆوە. ئەم ژنە جگە لە زیرەکی و جوانی و دلۆڤانی زۆریش راست و بێپێچ و پەنایە. هەوڵی ئەوەی نەدەدا دژواری و بارودۆخە رەشەکەی خۆی بشارێتەوە. ئانا دوای دەربڕینی ئەو قسەیە هەناسەیەکی هەڵکێشا و لە ناکاو روخساری حاڵەتێکی جیددی بەخۆوە گرت و وەك بەردی لێهات، ساردو سڕ. بەڵام ئەو حاڵەتەی روخساری لە پێشوو جوانتری کرد و تازەییی پێوەبوو. لەو حاڵەتە پڕ بەختەوەری و گەشاوەیەش نەبوو کە وێنەگەر تێیگەیشتبوو و لە روخساریدا نواندبووی. لەڤین کاتێك دیتی ئانا دەستی براکەی گرت و لەگەڵ ئەو لە دەرگا گەورەکەوە چووەدەرێ، جارێکی تر چاوێکی لە تابلۆکە و پاشان لە روخساری ئانا کردەوە و لە ناخی دڵەوە خۆشەویستی و بەزەیەکی دەرهەق بە ئەو هەست پێکرد کە خۆشی پێیسەیر بوو.

ئانا داوای لە ڤارکۆیڤ کرد کە بچن بۆ ژووری میوانداری و خۆی لەوێ مایەوە تاکوو لەگەڵ براکەی قسە بکات. لەڤین لە دڵی خۆیدا گوتی «ڕەنگە سەبارەت بە تەڵاقەکەی قسە بکات، یان سەبارەت بە ڤرۆنسکی کە بۆچی لە باشگا ماوەتەوە، یان سەبارەت بە من.» هۆشی هێندە لەلای بابەتی ئاخافتنەکەی ئانا بوو کە گوێی لە ڤارکۆیڤ نەبوو کە سەبارەت بە رۆمانەکەی ئانا ئارکادیۆڤنا کە بۆ منداڵانی نووسیبوو قسەی دەکرد.

کاتی چاییخواردنەوەش ئاخافتنی خۆش و پڕمانای نێوانیان درێژەی کێشا. بەڵام لەڤین، نەك بۆ ساتێکیش نەبوو کە بۆ قسە دابمێنێ و نەزانێ باسی چیبکات، بەڵکوو بەپێچەوانە ئەوەی دەیویست بیڵێ دەرفەتی گوتنی نەبوو و خۆی لێدەبوارد. بەڵام تامەزرۆیانە گوێی بۆ قسەی بەردەنگەکەی رادەگرت و ئەوەی دەگوترا، نەك هەر ئەوەی کە ئانا دەیگوت، بەڵکوو قسەکانی ڤارکۆیڤ و ستیپان ئارکادیچیش بەهۆی بەرەکەتی سەرنجی ئانا و ئاماژەکانییەوە مانایەکی تایبەتی بەخۆوە دەگرت.

لەڤین بە هۆگرییەکی زۆرەوە گوێی بۆ ئەم وتووێژە دڵگرە راگرتبوو و بەردەوام جوانی و زیرەکی و ژیری و لەگەڵ ئەوەشدا ساکاری و هاودڵییەکەی ئانا تووشی سەرسووڕمانی کردبوو. گوێی رادەگرت و قسەی دەکرد و بەردەوام بیری لە ئەو و لە ژیانە مەعنەوییەکەی دەکردەوە و هەوڵی دەدا بە بۆچوونی خۆی لە هەستەکانی بگات. ئەگەرچی لە رابردوودا ئەوی بە توندی مەحکووم دەکرد و بە تاوانباری دەزانی بەڵام ئێستا بیرو بۆچوونی ئاڵوگۆڕێکی تەواوی بەسەردا هاتبوو و لەلایەن خۆیەوە پاکانەی بۆ ئانا دەکرد و لەگەڵ ئەوەشدا خەمی ئەوەی بوو کە ڤرۆنسکی ئەم ژنەی بە باشی نەناسیوە و بە جوانی لە حاڵوباڵی ئەو نەگەیشتووە. سەعات یازدە کە ستیپان ئارکادیچ هەستا بڕوات (ڤارکۆیڤ بەر لە ئەوان رۆیشتبوو) لەڤین هەستی دەکرد کە تازە هاتووە و زۆر بە نابەدڵی هەستا.

ئانا دەستی ئەوی لە دەستی خۆی گرتبوو و لەگەڵ ئەوەی چاوی لە چاوی بڕیبوو گوتی: خواداحافیز، زۆر خۆشحاڵم کە بە دەردی فەڕەنسییەکان دەڵێن ***سەهۆڵی نامۆیی لەنێوانماندا توایەوە.***

دەستی بەردا و پێڵووەکانی تێکبەزاند.

ـ بە هاوسەرەکەت بڵێ من وەك رابردوو خۆشمدەوێ، و ئەگەر نەتوانێ لە تاوانم ببوورێ، هێوادارم قەت لێمخۆش نەبێت. چونکە بۆ ئەوەی بتوانێ لێم خۆشبێ دەبێ ئەوەی من چێشتوومە ئەویش بیچێژێ و لە خودا دەخوازم کە قەتی نەچێژێ.

لەڤین سوورهەڵگەڕا و وەڵامیدایەوە: حەتمەن، بەسەرچاو پێیدەڵێم.

## یازده

کاتێك لەڤین لەگەڵ ستیپان ئارکادیچ لە ماڵی ڤرۆنسکی چووەدەرێ و پێینایە سەر سەهۆڵبەندان و هەوای ساردو پڕتەزوو گوتی: چ ژنێکی خۆشەویست و سەیرو چارەڕەشە!

ستیپان ئارکادیچ، کە دیتی لەڤین نوقمی جوانی و ئاکاری خوشکی بووە گوتی: دیتت؟ نەمگوت؟

لەڤین، خەیاڵ هەڵیگرت و گوتی: بەڵێ، زۆر ژنێکی باش و بێوێنەیە. نەك بە هۆی زیرەکییەوە، کە جێی خۆی هەیە، بەڵکوو بە هۆی ئەو دڵفراوانی و هاودڵییە سەیرەیەوە سەرنجی راکێشاوم. زۆرم دڵ پێیدەسووتێ.

ستیپان ئارکادیچ لەگەڵ کردنەوەی دەرگای فایتوونەکە گوتی: ئێستا ئەگەر خودا یاربێ زوو کارەکان جێبەجێدەبن. بەڵام پێشتر با هەر باسی نەکەین. خوداحافیز، خۆ ڕێگاکەمان یەکنییە.

لەڤین بەردەوام بیری لە ئانا دەکردەوە و هەموو ئاخافتنە سادە و ساکارەکانی لەگەڵ ئەو لە زەینی خۆیدا لێك دەدایەوە و هەڵسوکەوت و بزە و روانینەکانی وەبیردەهاتەوە و بەردەوام خۆی لە جێی ئەو دادەنا و دڵی پێیدەسووتا هەتا گەیشتەوە ماڵێ.

کە گەیشتەوە ماڵێ کوزما هەواڵی پێدا کە کاترینا ئەلکساندرۆڤنا حاڵی باشە و خوشکەکانی تازە رۆیشتبوون و پاشان دوو نامەی پێدا. لەڤین هەر لەوێ، بەرلەوەی بچێت بۆ لای ژنەکەی، نامەکانی خوێندەوە بۆ ئەوەی لەلای ژنەکەی بە خوێندنەوە فیکر و خەیاڵی ئاڵۆز نەبێت. یەکێك لە نامەکان لەلایەن ساکارۆڤ، واتە گزیرەکەیەوە بوو، نووسیبووی گەنمەکەمان بۆ نافرۆشرێت چونکە لە پێنج رۆبڵ و نیو زیاتر نایکڕن و نازانێ ئیتر پارە لەکوێ پەیدابکات. نامەکەی تریش هی خوشکی بوو و پڕبوو لە گلەیی و بناشت چونکە گرێکوێرەی کارەکەی هێشتا نەکرابۆوە.

لەڤین خێرا لە دڵی خۆیدا گوتی «چاکە، ئەگەر بە زیاتر نایکڕن، بە پێنج رۆبڵو نیو دەیفرۆشین.» کێشە و گرفتی یەکەم کە لە گوندەکەیان چارەسەر نەدەکرا، زۆر بە ئاسانی بە شێوەیەکی نائاسایی چارەسەری کرد. بەڵام کە بیری لە نامەی دووهەم کردەوە لە دڵی خۆیدا گوتی «زۆر سەیرە لێرە قەت گرفتاریم کۆتایی نایە! لەوەی کە نەیتوانی کارەکەی خوشکی جێبەجێ بکات خۆی بە خەتابار دەزانی. «ئەمڕۆ دیسان نەچووم بۆ یانەی داد. بەڵام چ بکەم، خۆ دەرفەتم نەبوو.» کە بڕیاریدا سبەینێ حەتمەن پێوشوێنی کارەکەی خوشکی بگرێ، رۆیشت بۆ لای ژنەکەی. لەگەڵ ئەوەی دەچوو بۆ لای هەموو کارەکانی ئەو رۆژەی بە خێرایی لە مێشکی خۆیدا لێکدایەوە. ئەو رۆژەی هەمووی بە قسەکردن تێپەڕیبوو: ئەو قسانەی کە گوێی لێبووبوو یان خۆی کردبووی. ئاخافتنەکان هەمووی سەبارەت بەو شتانە بوو کە کاتی تەنیایی لە گوند قەت بیری لێنەدەکردەوە. بەڵام لێرە زۆر جێگای سەرنجبوو بۆی. وتووێژەکانی هەموویان خۆش و چێژبەخش بوون، جگە لە دووجێ: یەکیان ئاماژەی قازەماسی لە ئاودا و ئەوی تریش شتێکی نادروست بوو کە لە دڵسۆزییە پڕخۆشەویستییەکەی دەرهەق بە ئانادا هەبوو.

لەڤین دیتی ژنەکەی مات و خەمناکە. ئەو و سێ خوشکەکەی زۆر بە شادی و خۆشی نانی نێوەڕۆیان خواردبوو و پاشان ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانی لەڤین بووبوون بەڵام نەهاتبۆوە و هەموویان تاقەتیان بەسەر چووبوو، خوشکەکانی رۆیشتبوون و ئەو بە تەنیا مابۆوە.

کیتی پرسیی: دەی، چیتکرد؟ ـ چاوی لە چاوی بڕی و بریقەی گومان و دڵپیسی لە نیگایدا دیاربوو. بەڵام لەبەرئەوەی نەبێتە بەرگری قسەکانی ئەو، روانینە تیژ و تووڕەکەی شاردەوە و بە زەردەخەنەیەکی هاندەرانەوە گوێی بۆ شلکرد کە سەبارەت بە کارەکانی ئەو رۆژەی بدوێ.

ـ من زۆر دڵخۆشم کە چاوم بە ڤرۆنسکی کەوت. دیدارەکەمان زۆر سادە و ئاسایی بوو. دەزانی، ئێستا هەوڵ دەدەم کە ئیتر نەچم بۆ لای بەڵام حەزم دەکرد ئەو گرژی و ئاڵۆزییەی نێوانمان کۆتایی پێبێ ـ کە ئەوەی دەگوت، وەبیری هاتەوە کە ئەگەرچی **هەوڵی دابوو کە ئیتر چاوی پێینەکەوێ** لەڕێوە چووبوو بۆ دیدەنیی ئانا و سوورهەڵگەڕا: ئێمە هەمیشە دەڵێین ڤۆدکا بەڵای گیانی هەژار و لێقەوماوانە بەڵام نازانم ئەوان زیاتر ئارەق دەخۆنەوە یان ئێمە مرۆڤە دەوڵەمەند و تێگەیشتووەکان. ئەوان لانیکەم تەنیا رۆژانی جێژن دەخۆنەوە.

بەڵام کیتی دەروەستی ئەو باسە نەبوو کە هەژار و لێقەوماوان کەنگێ ڤۆدکا دەخۆنەوە. ئەو تەنیا سوورهەڵگەڕانی مێردەکەی دیتبوو و دەیویست هۆیەکەی بزانێ.

ـ دەی، دوای ئەوە بۆکوێ چووی؟

ـ نازانی ستیڤا چەندەی پێداگری کرد کە بچم بۆ دیدەنیی ئانا ئارکادیۆڤنا.

کە ئەوەی گوت لە پێشوو زیاتر سوورهەڵگەڕا و تەمی دڕدۆنگییەکەشی سەبارەت بەوەی کە چوونە سەردانی ئانا ئارکادیۆڤنا کارێکی باش بووە یان نا، بە تەواوی رەوییەوە. ئێستا بە روونی دەیزانی کە نەدەبوو ئەو کارەی بکردبایە.

بە بیستنی ناوی ئانا ئارکادیۆڤنا کیتی چاوانی زەق کردەوە و بریقەی لێهەستا بەڵام هەر خێرا رەنگبزرکانەکەی خۆی شاردەوە و لەڤینی هەڵخەڵەتاند.

تەنیا گوتی: ئاخ!

لەڤین درێژەی پێدا: خۆ ئەو چوونەی من بێتاقەتی نەکردووی. چ بکەم، ستیڤا تکای لێکردم و دالیش داوای کردبوو بچم.

کیتی گوتی: ها، نا! ـ بەڵام لەڤین لە چاوانیدا شوێنەواری ئەو هەوڵدانەی دی کە دەیویست ددان بە خۆیدا بگرێ و وەك شتێکی باشی نەهاتە بەرچاو.

گوتی: ئەو ژنێکی رۆحسووك و مێهرەبانە و زۆر زۆر چارەڕەش و جێگای بەزەییە. دۆخی ژیان و سەرقاڵییەکانی ئەوی باسکرد و راسپاردەکەشی پێگەیاند.

کاتێك لەڤین قسەکانی کرد کیتی گوتی: بەڵێ، هەڵبەت ژنێکی بەستەزمان و جێی بەزەییە. نامەکان هی کێ بوون؟

لەڤین وەڵامیدایەوە و چونکە فریوی لەبزە ئارامەکەی ئەوی خوارد چوو جلەکانی بگۆڕێ.

کاتێك گەڕایەوە دیتی کیتی هەروا لەسەر کورسییەکەی دانیشتووە. کە لێشی نزیکبۆوە کیتی سەری هەڵێنا و زووڕە زووڕ دەستیکرد بە گریان.

ـ چیبووە، بۆ وادەکەی؟ ـ بەڵام ئەو بەبێ وەڵامی ئەویش دەیزانی بۆ وادەکات.

ـ تۆ ئاشقی ئەو ژنە نارەسەنە بووی. جادووی لێکردووی. بە چاوانتدا دیارە. بەڵێ، بەڵێ، بەڵام ئاکامی ئەو کارە دەبێ بەچێ؟ تۆ لە باشگا زۆرت خواردۆتەوە پاشان قومارت کردووە و دوای ئەویش.... بۆ لای کێ؟ نا، دەبێ لێرە برۆین. من هەر سبەینێ لێرە دەڕۆم.

ـ لەڤین ماوەیەکی زۆر نەیدەتوانی ژنەکەی هێوربکاتەوە. ئاخری کاتێك کیتی هێوربۆوە لەڤین ددانی پێدانا کە هەستی بەزەیی و شەڕاب پێکەوە دەستیان دایە دەستی یەك و بوونە هۆی ئەوەی کە لە هەمبەر فێڵ و دەهۆی ئانادا خۆی بدۆڕێنێ و لە داهاتوودا خۆ لەقەرەی نەدات. تەنیا شتێك کە راستوێژانە ددانی پێدانا ئەمەبوو کە نیشتەجێبوونی درێژخایەن لە

مۆسكۆ و نەبوونی كارێك جگە لە قسەكردن و خواردن و خواردنەوە شوێنێكی خراپی لەسەر هەست و شعووری داناوە. هەتا سەعات سێی دوای نیوەشەو قسەیان كرد و هەر ئەوەندە ئاشتبوونەوە كە بتوانن خەویان لێبكەوێت.

## دوازده

ئانا كە میوانەكانی بەڕێ كرد هێور نەبۆوە و لەنێو ژوورەكەدا دەستیكرد بە پیاسەكردن. هەرچەند لە تەواوی ئەو ماوەیەدا كە لەڤین لەلای بوو بێ ئەوەی خۆی ئاگای لێبێ (هەر وەك لەم دواییانەدا لە پێوەندییەكانی لەگەڵ هەموو پیاوانی جحێڵدا وابوو) ئەوەی لە دەستی دەهات كردبووی بۆ ئەوەی لەڤین بكاتە شەیدای خۆی، ئەگەرچی دەیزانی ئەو توانایيەی بووە كە لە ماوەی شەوێكدا دڵ لە پیاوێكی خاوەن ژن و شەریف بستێنێ و ئەوەش كارێكی سەركەوتوانە بووە ئەگەرچی لەڤینیشی كەوتبووە بەردڵ (سەرەڕای جیاوازییەكی بەرچاو كە لە روانگەی پیاوانەوە لەنێوان لەڤین و ڤرۆنسكیدا هەبوو، ئەو، لە روانگەی ژنانەی خۆیەوە سەرنجی هەموو ئەو لایەنانەی دەدا كە دڵی كیتیی شەیدای هەردووكیان كردبوو) بەڵام هەركە لە ژوورەكەی چووەدەرێ ئیتر بیری لێنەكردەوە.

بیرێك، تەنیا بیرێك و بەس، تووشی وەسوەسەی كردبوو و دەستی لە كۆڵ نەدەكردەوە و بە شێوەی جۆراوجۆر بە زەینیدا تێدەپەڕی: «ئەگەر، پیاوانی تر، ئەگەر ئەم پیاوە خاوەن ژن و ماڵە كە ژنەكەی خۆشی ئەویندارانە خۆشدەوێ، ئاوا ئاشق و شەیدای من دەبێت، كەوایە بۆ ئەو دەرهەق بە من ئاوا ساردو سڕە؟... بەڵام، ساردیش نییە، دەزانم كە خۆشیدەوێم. بەڵام شتێكی تازە سەری هەڵداوە كە ئێمە لە یەكتر دووردەخاتەوە. بۆچی ئەمڕۆ هەتا ئەم درەنگانەی شەو نەهاتۆتەوە؟ بە سیتڤادا هەواڵی بۆ ناردووم كە ناتوانێ یاشڤین بەجێ بێڵێ و دەبێ ئاگای لە یارییەكەی بێ. مەگین یاشڤین منداڵە؟ بەڵام با وایدانێین راست دەكات. ئەو هیچ كات درۆناكات. بەڵام ئەم قسە راستەی ئەو قسەیەكی راستی تر دەشارێتەوە. ئەو خۆشحاڵە كە دەرفەتێكی بۆ هەڵكەوتووە تاكوو پێم نیشان بدات كە ئەركی تریشی لە ئەستۆیە. بەڵام خۆ من ئەوە دەزانم و هیچ دژایەتییەكم نییە. كەوایە بۆ دەیهەوێ ئەو شتە كە قەبووڵم كردووە پێمی بسەلمێنێ. دەیهەوێ پێمبسەلمێنێ كە ئەشق و خۆشەویستی نابێ ببێتە كوسپێك لەسەر رێی ئازادییەكەی. من هیچ پێویستییەكم بە بەڵگە و

بیانووهێنانەوە نییە. من ئەشقم دەوێ. ئەو دەبێ بزانێ ژیان لێرە لە مۆسکۆ چەندە بۆ من دژوارە. ئاخەر بەوەش دەڵێن ژیان کە من هەمە؟ من دەژیم، بەردەوام بە دوای ڕێگەچارەیەکدا دەگەڕێم کە نایدۆزمەوە. ئەمڕۆش وەڵامێك نەبوو ستیڤا دەڵێ ناتوانێ بچێت بۆ لای ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ و منیش ناتوانم دیسان نامەی بۆ بنووسم. هیچ کارێکم پێناکرێ. ناتوانم دەست بۆ هیچ کارێك بەرم یان شتێك بگۆڕم. تەنیا کارێك کە لە دەستمدێ ددان بەخۆداگرتن و چاوەڕوانی و خۆ سەرقاڵکردنە. بنەماڵەی ئەو کابرا ئینگلیزییە بەڕێوەدێنم، کتێب دەنووسم، کتێب دەخوێنمەوە، بەڵام بەو کارانە تەنیا خۆم فریودەدەم، ئەوانە هەمووی بە شێوەیەك ئازارشکێنن.» کە هەستیکرد فرمێسکی بەزەیی بە خۆداهاتن لە چاوانیدا قەتیس ماوە گوتی «ئەو دەبێ بەزەیی پێمدا بێت.»

کە گوێی لە دەنگی توند و لەپەستای لە دەرگادانی ڤرۆنسکی بوو بەپەلە چاوانی خۆی سڕی و نەك هەر فرمێسکەکەی وشك کردەوە بەڵکوو لەبەر چرایەك دانیشت و کتێبێکی لێککردەوە و واینواند کە ئاسوودە و بێخەمە. دەبوو پێی نیشان بدات چونکە وەفای بە بەڵێنەکەی خۆی نەکردووە و درەنگ هاتۆتەوە بۆ ماڵێ لێینارازییە. تەنیا دەبێ نارەزایەتی خۆی پێنیشان بدات و نەك خەفەت و گرینگتر لەویش هەستی بەزەییی خۆی دەرهەق بە ئەو بشارێتەوە. هەستی بەزەیی دەرهەق بە خۆی قەیناکا بەڵام بەزەییی ڤرۆنسکیی زۆر بەلاوە قورس بوو. ئەو سەری لە کێشە نەدەخورا و ڤرۆنسکیی سەرکۆنە دەکرد کە دەیویست لەگەڵیدا بکەوێتە کێشە، بەڵام نەخوازراوانە خۆی بۆ شەڕ و بەربەرەکانێ ئامادەدەکرد.

ڤرۆنسکی بە شادی و نەشەوە هاتە پێشێ و گوتی: دەی، بێتاقەت نەبووی؟ بەڵام ئەم قومارە بەڕاستی کارێکی قۆڕ و ترسناکە.

ـ نا، بێتاقەت نەبووم، لەمێژە فێر بووم کە بێتاقەت نەبم. ستیڤا و لەڤین لێرە بوون.

ڤرۆنسکی لە پەنای دانیشت و گوتی: دەزانم، دەیانویست بێن بۆ سەردانی تۆ. دەی، لەڤینت کەوتە بەردڵ؟

ـ زۆر! پێش هاتنەوەی تۆ ڕۆیشتن. دەی یاشڤین چیکرد؟

ـ بەختەکەی هێنابووی و بەردەوام دەیبردەوە. هەڤدە هەزار ڕۆبڵی بردەوە. بانگم کرد و زۆری نەمابوو رازیی بکەم کە دەست لە یاری هەڵگرێ و بڕوات، بەڵام دیسان گەڕایەوە و ئەم جارە سەرەی بەدشانسییەکەی بوو و لەپەستا دەیدۆڕاند و بە دەستییەوە نەدەهات.

ئانا لەناکاو سەری بەرزکردەوە و چاوی لە چاوی بڕی و پرسیی: کەوایە بۆ بە تەنیا بەجێت هێشت؟ ـ حاڵەتی روخساری گۆڕاو ساردی و تووڕەیی دایگرت: مەگین بە ستیڤات نەگوتبوو لەوێ دەبی، بۆ ئەوەی ئاگاداریی لێبکەی؟ کەوایە بۆ بە تەنیا بەجێت هێشت؟

ئەو حاڵەتە سارد و جینگیزییانەیە روخساری ڤرۆنسکیشی داگرت.

نێوچاوانی تێکنا و گوتی: خۆ من نەداوام لێکردبوو ئەو هەواڵەت پێبگەیێنێ، نە قەتیش درۆدەکەم. لەوەش گرینگتر تەنیا لەبەرئەوە لەوێ مامەوە چونکە حەزم دەکرد لەوێ بمێنمەوەـ دوای تۆزێ بێدەنگی خۆی بۆ لای ئانا خوار کردەوە و دەستی کراوەی بۆ لای درێژ کرد و چاوەڕێ بوو ئانا دەست بنێتە نێودەستی.

ئانا زۆری ئەو ئاشتی و مێهرەبانییە بەدڵ بوو، بەڵام وزەی ڤینێکی رازاوی لە دڵیدا سەری هەڵدابوو و نەیدەهێشت خۆی تەسلیمی ئەو ئاشتییە بکات، دەتگوت هەلوومەرجی شەڕ ئیجازەی پێنادات تەسلیم بێ.

ـ هەڵبەت تۆ دەتویست لەوێ بمێنیتەوە و مایەوە. تۆ هەرکارێکت پێخۆش بێ دەیکەی. بەڵام بۆ ددانی پێدا نانێی؟ ئاخر بۆ؟ ـ ئەو ئەم قسانەی دەکرد و بەردەوام لەبز و راوێژی پڕشۆرتر دەبوو: مەگین کەسێك نکوولّیی لە مافی تۆ کردووە؟ بەڵام تۆ دەتهەوێ قسە قسەی خۆت بێ، دەیباشە، با وابێ!

ڤرۆنسکی دەستی قووچاند. راست دانیشتەوە و شوێنەواری خیشەسەری لە سیمایدا ئاشکراتر وەدیارکەوت.

ـ تۆ تەنیا مەبەستت خیشەسەرییە ـ ئانا راست چاوی لە چاوی بڕیبوو و لە ناکاو دیتی کە بۆ ئەو حاڵەتە تووڕە و تۆسنانەیەی روخساری ئەو ناوێکی دیتۆتەوە: بەڵێ راست ***خیشەسەرییە***. بۆ تۆ مەسەلەکە تەنیا ئەوە نییە کە بەسەر مندا زاڵبی و هەمیشەش هەروا بەزافتە بی. بەڵام بۆ من... ـ دیسان دڵی بە خۆی سووتاو هێندەی نەمابوو دەستبکا بە گریان: خۆزگە دەتزانی کێشەی من چییە. کاتێك من، وەك ئێستا بۆم دەردەکەوێ کە ئاوا رقت لێهەڵگرتووم و دڵت لێم شلوێ بووە، بەڵێ، کاتێك وەك نەیار هەڵسوکەوتم لەگەڵدا دەکەی.... ئەگەر دەتزانی ئەو کارە چیم بەسەر دێنێ! ئەگەر دەتزانی من لەو کاتانەدا چەندە لە داماوی نزیکم! چەندە دەترسم! چەندە لە خۆم دەترسم! ـ کە گەیشتە ئێرە رووی لێوەرگێڕا تاکوو گریانەکەی خۆی بشارێتەوە.

ڤرۆنسکی ئەو بێتاقەتی و داماوییەی ژنەکەی تووشی ترسی کرد و جارێکی تر خۆی بۆ لای خوار کردەوە و دەستی گرت، ماچی کرد و گوتی: باشە من و تۆ لەسەرچی لەخۆڕا

دەمەقاڵێ دەکەین؟ باشە بۆ؟ من دەچم بۆ نەهەنگ و رابواردن؟ خۆ لە ژنان هەڵدەقووتێنم و تۆڵازی دەکەم؟

ئانا گوتی: تەنیا هەر ئەوە مابوو!

ڤرۆنسکی کە ئەو داماوییەی ئانا شوێنی لەسەر دانابوو گوتی: دەی، پێمبڵێ، من دەبێ چ بکەم کە تۆ ئاسوودە بی؟ هەر کارێك بڵێی بۆ بەختەوەریی تۆ دەیکەم. بڕوام پێبکە هەر کارێك بڵێی حازرم بیکەم تاکوو ئەم خەمەی کەنازانم بە هۆی چییەوەیە لە دڵت بێتەدەرێ.

ئانا گوتی: گوێی مەدەیە، هیچ نییە. خۆشم نازانم. رەنگە هۆی تەنیایی بێت یان هی ئەعسابە... با لەوە زیاتر لەسەری نەڕۆین.... ـ بەو مەبەستەی سەرکەوتن هەرچییەك بوو بە نسیبی ئەو بووبوو شاردییەوە و هەوڵیدا باسەکە بگۆڕێ و پرسیی: پێمبڵێ بزانم، کێبەرکێی ئەسپسواری چۆن بوو؟ بۆت باس نەکردم.

ڤرۆنسکی گوتی شێو بێنن و پاشان دەستیکرد بە گێڕانەوەی چۆنێتیی کێبەرکێی ئەسپسواری. بەڵام ئانا بە لەبز و راوێژ و روانینەکانیدا کە بەردەوام ساردوسڕتر دەبوو دەیدی کە ڤرۆنسکی بۆ ئەو سەرکەوتنەی ئەو لە خۆی خۆش نەبووە و ئەو خیشەسەرییەی ئەو (یانی ئانا دەیویست بەربەرەکانێی لەگەڵ بکات و دیسان لە دڵیدا سەریهەڵدابوو. ڤرۆنسکی لەچاو پێشوو ساردوسڕتر بووبوو و وێدەچوو لەو نەرمی نواندنەی خۆی پەشیمان بووبێتەوە. ئانا ئەو وشانەی کە بووبوونە هۆی سەرکەوتنی وەبیر خۆی هێنایەوە. وشەگەلێکی وەك «چەندە لە داماوی نزیکم... چەندە لە خۆم دەترسم!» بۆی دەرکەوت کە ئەو کێشەیە زۆر پڕمەترسییە و ئیتر نابێ بەکاری بێنێ. هەستی دەکرد لەپاڵ ئەو ئەشقەدا کە ئەوانی پێکەوە گرێ داوە رۆحێکی بەدئاکاری شەڕاشۆ لە دڵیاندا سەریهەڵداوە کە ئەو لە توانایدا نییە لە دڵی ڤرۆنسکیی وەدەرنێ و بۆی دەرکەوتبوو پاککردنەوەی دڵی خۆشی لەو دژوارترە.

## سێزدە

هیچ بارودۆخێك نییە کە مرۆڤ نەتوانێ خووی پێبگرێ، بەتایبەت کاتێك کە هەموو دەوروبەرییەکانی ژیانیان هەر لەو بارودۆخەدایە. سێ مانگ لەمەوبەر لەڤین بڕوای نەدەکرد بتوانێ لەو بارودۆخەی ئەمڕێدا بە ئاسوودەیی خەوی لێبکەوێ و بتوانێ بەو ژیانە بێئامانج و

بێ مانایە و ئەو هەموو تەخشانوپەخشان، زیاتر لە توانایی کیسە و گیرفانی، دوای ئەو بەدمەستییە (چونکە نەیدەتوانی ئەو کارەی کە لە باشگا کردبووی ناوێکی تری لێبنێ) و دوای ئەویش چوونی نابەجێ بۆ ماڵی ژنێك کە سەرتاپای شوورەیی بوو و فریوخواردن بە دەستی ئەو ژنە و هەروەها خەمبارکردنی ژنەکەی خۆی، دوای هەموو ئەوانە، چۆن دەیتوانی بە ئاسوودەیی خەوی لێبکەوێ. بەڵام شلوشەکەتی و بێخەویی شەوی رابردوو و کاریگەریی شەراب وایلێکرد کە بە ئاسوودەیی خەوێکی قووڵ دایگرێ.

سەعات پێنجی بەیانی بوو کە بە جیڕەی لاولاوەی دەرگای ژوورەکەی وەخەبەر هات. هەستا و چاوی لە تەنیشتی خۆی کرد و دیتی کیتی لەنێو جێگاکەیدا نییە. بەڵام لە پشت پاراوانەکە تیشکێکی بزۆکی دی و گوێی لە ترپەی هەنگاوی ئەوبوو.

لەنێوان خەو و بەخەبەریدا گوتی: چی؟... چی؟ کیتی، چییە؟

کیتی، مۆم بەدەستەوە لە پشت پاراوانەکە هاتەدەرێ و گوتی: هیچ، هیچ، هیچ نییە ـ بە بزەیەکی زۆر شیرین و ماناداره‌وە گوتیشی: تەنیا تۆزێ حاڵم باش نەبوو.

لەڤین تۆقیوانە پرسیی: دەی، یانی دەستی پێکردووە؟ دەستی پێکردووە؟ بنێرین بە دوای ماماندا؟ بەپەلەش دەستیکرد بە لەبەرکردنی جلەکانی.

کیتی هەروا بە پێکەنینەوە چووە بەردەمی و گوتی: نا، نا، پێویست ناکات، پێموانییە هیچ خەبەرێك ببێت. تەنیا تۆزێ دڵم تێکەڵ هات. بەڵام تەواوبوو.

گەڕایەوە سەرچرپاکەی و مۆمەکەی کووژاندەوە و بێدەنگ راکشا. ئەگەرچی بێدەنگییەکەی کە دەتگوت هەناسەی لە سنگیدا کۆکردۆتەوە و لە هەمووشی زیاتر وشیارییەکەی کاتێك لە پشت پاراوانەکە هاتەدەرێ و بە لەبزە نەرمونیان و شیرینەکەی گوتی «هیچ نییە» لەڤینی تووشی گومان کرد، بەڵام خەوەکەی هێندە بەسەریدا زاڵ بوو کە لەڕێوە خەوی لێکەوتەوە. زۆر دواتر کە لەڤین وەبیری هاتەوە کیتی بۆچی هەناسەی لە خۆی بڕیبوو، چاوەڕوانی بەرەژان بووە، یانی گەورەترین رووداوێك کە وێدەچێ لە ژیانی ژنێکدا روودبدات، بۆیە بەبێ جووڵە لە پەنای ئەودا سیچەنی گرتبوو و تێگەیشت ئەو کاتە چی لە رۆحی شیرینیدا رابردووە. سەعات حەوت بوو کە دەستی کیتی لە شانی درا و بە سرتەی لەسەرەخۆی ئەو خەبەری بۆوە. دەتگوت کیتی لەگەڵ خۆی لە کێشەدایە و دوودڵە لەوەی بەپێی مەیلی خۆی قسەی لەگەڵ بکات یان حەیفی بێت کە خەبەری بکاتەوە.

ـ کۆسیتا، مەترسە، هیچ نییە. بەڵام وادیارە کە... دەبێ بنێرین بە دوای لیزاوتا پترۆڤنادا.

دیسان مۆمەکە هەڵکرایەوە. کیتی لەسەر پێخەفەکەی دانیشتبوو و ئەو شاڵگەردنەی بە دەستەوە بوو کە لەم رۆژانەی دواییدا دەستیکردبوو بە چنینی.

بە دیتنی روخساری تۆقیوی لەڤین دەستی گرت و بە سینگی خۆیەوە گوشی، پاشان ماچی کرد و گوتی: تۆخودا مەترسە، هیچ نییە، من ناترسم، خەمت نەبێ.

لەڤین بەپەلە هەستا. پێی وەعەرز نەدەکەوت و چاوی لەسەر ژنەکەی هەڵنەدەگرت. ربدۆشامبرەکەی لەبەرکرد و راوەستا و چاوی لە چاوی بڕی. دەبوو بڕوات بەڵام نەیدەتوانی چاوی لەسەر هەڵگرێ. ئەو ئەم روخسارەی خۆشدەویست و حاڵەتەکانی و سەرنجەکانی زۆر بەلاوە ئاشنابوو، بەڵام قەتی بەو شێوەیە نەدیبوو. کاتێك دڵتەنگییەکەی شەوی رابردووی ئەوی وەبیرهاتەوە خۆی لە هەمبەر ئەودا بەم بارودۆخەی ئێستایەوە، وەك بوونەوەرێکی زۆر ناچیزە و هیچوپووچ و قێزەون هاتە بەرچاو. لە روخساری بزرکاویدا کە بسکە نەرمەکەی لە شەوکلاوەکەی هاتبووە دەرێ و دەوری گرتبوو بریقەی شادی و بڕیار دەبیندرا.

ئەگەرچی خووخدەی کیتی بەری لە رواڵەتسازی و هەوڵ و تەقەلا وەبەرخۆنان بوو، چونکە بە نزیکبوونەوەی کاتی منداڵبوونی لەناکاو رۆحی لەبەر چاوی لەڤین رووت بووبۆوە و قووڵاییی گیانی لە هەمبەر ئەودا وەدیارکەوت، لەڤین بە دیتنی گۆنای درەوشاوەی ژنەکەی تووشی سەرسووڕمان بوو، چونکە ئەو وجوودەی کە زیاتر لە هەموو شتێك لەلای خۆشەویست بوو ئاوا بە ساکاری و بە بێپەردە لە رابردوو جوانتر خۆی دەنواند. کیتی بە پێکەنینەوە چاوی لێکرد، بەڵام لە ناکاو برۆی لەرییەوە و سەری بۆ لای لەڤین بەرزکردەوە، بە توندی هەڵات بۆ لای و دەستی ئەوی گرت بە دەستییەوە و توند لە باوەشی گرت و بە خۆیەوە گوشی و هەستی بە گەرماییی هەناسەی کرد. ژانی هەبوو و دەتگوت لەبەر ژانی خۆی لەلای ئەو دەناڵێنێ و لەڤین سەرەتا بەپێی خووخدە ژانی ئەوی بە تاوانی خۆی دەزانی. بەڵام نەرمی و خۆشەویستییەك کە لە نیگای کیتیدا بوو دەیگوت کە نەك هیچ سکاڵایەکی لە دەست ئەو نییە بەڵکوو ئەوی بە هۆی ئەو ژانەوە خۆشدەوێ. لەڤین بێ ئیختیار بە خۆی گوت «ئەگەر ئەو ژانە خەتای من نییە ئەی خەتای کێیە؟» بە دوای خەتابارەوە بوو تاکوو سزای بدات. بەڵام خەتابارێك لەگۆڕێدا نەبوو. باشە، خەتابارێك نەبوو، بەڵام یانی رێگایەکیش نەبوو کە بە ئاسانی یارمەتیی بدات و ئەو لە دەست ئەم ژان و ئازارە دەربازبکات؟ بەڵام ئەوەش نەدەلوا و پێویستیش نەبوو. کیتی ئازاری دەکێشا و دەیناڵاند بەڵام ئەم ژانە مایەی سەربەرزی و هۆی دڵخۆشی بوو و بە دڵ حەزی پێدەکرد. لەڤین دەیدی لە رۆحی ژنەکەیدا جوانییەك خەریکە بەدی دێت، بەڵام ئەم جوانییە چیبوو؟ سەری لێیدەرنەدەچوو. ئەم شتە باڵاتر لە وزەی تێگەیشتنی ئەو بوو.

ـ من ناردم بە دوای دایەگیاندا. تۆش هەرچی زووتر بنێرە بەدوای لیزاوتا پترۆڤنادا... هیچ نییە کۆسیتا، خەمت نەبێ...

کیتی لێی دوورکەوتەوە و لە زەنگیدا.

ـ باشە، برۆ ئیتر، باشا دێت. من هیچم نییە.

لەڤین بە سەرسووڕمانەوە دیتی کیتی دەستی کردۆتەوە بە چنینی شاڵگەردنەکەی وا شەوێ هێنابووی.

کاتێك لەڤین لە دەرگای ژوورەکەی دەچووەدەرێ گوێی لە دەنگی خزمەتکارەکەیان بوو کە لە دەرگاکەی ترەوە چووە ژوورێ. لەبەر دەرگاکە راوەستا و گوێی لێبوو کە لەڤین بە وردی دەستووری پێدا و خۆی بە یارمەتیی ئەو دەستیکرد بە گۆڕینی جێگای قەرەوێڵەکان.

لەڤین چووەدەرێ و بەو بەیانییە زووە چونکە فایتوون پەیدا نەدەبوو، هەتا ئەسپەکانیان لە فایتوونەکە کرد بە دەرفەتی زانی و بە هەڵەداوان رۆیشت بۆ ژووری خەوەکەیان، هەڵبەت نەك بە پێدزکە، پێدزکە بەڵکوو بە تالۆوکە و وەك ئەوەی باڵی دەرکردبێ. دوو کەس لە کلفەتەکان لە ژووری خەوەکە جێگۆڕکێیان بە شتێك دەکرد. کیتی دەهات و دەچوو و خێراخێرا خەریکی چنین بوو و دەستووری دەدا.

لەڤین گوتی: من ئێستا دەچم بە دوای دوکتۆردا. کەسێکیان ناردووە بەدوای لیزاوتا پترۆڤنادا، بەڵام خۆشم بە سەرپێیەکەوە دەچم بۆ ئەوێ. هیچی دیکە پێویست نییە؟ بچم دالی بێنم بۆ ئێرە؟

کیتی چاوی لێکرد و دیاربوو کە تێناگا دەڵێچی.

خێراخێرا دەیگوت: ئەرێ، ئەرێ، بچۆ، بچۆ، ـ نێوچاوانی تێکنابوو و بە هەڵتەکاندنی دەستی دیسان ناردییەوە بۆ دەرێ.

لەڤین تازە گەیشتبووە تەلاری میوانداری کە لە ناکاو دەنگی ناڵەیەکی بەژان کە کتوپڕ بێدەنگ بۆوە ژووری خەوەکەی داگرت. راوەستا و ماوەیەك حەپەسا و هیچ تێنەگەیشت.

ئاخری گوتی: دەنگی ئەوە ـ بە هەردوو دەستیشی چنگی بە قژی خۆیدا کرد و بە پلیکانەکاندا بەغار داگەڕا.

ـ خودایە روحم بکە، لە تاوانی منیش خۆشبە، یارمەتیم بدە! ـ ئەو ئەم وشانەی کە بێ ئیختیار و چاوەڕواننەکراو لە زاری هەڵدەفڕین دووپاتی دەکردنەوە. ئەو بڕوای بە خودا نەبوو، بەڵام ئەو وشانەی تووتیئاسایی دەردەبڕی. لەمکاتەدا دەیزانی کە نەك تەنیا دڕدۆنگییەکانی

ئەو بەڵکوو داماویی خۆی بە هۆی نەبوونی ئیمانەوە و شەلبوونی قاچی ئەقڵی لەو گۆڕەپانەدا، بە هیچ شێوەیەك نابێتە بەرگری ئەوەیکە پەنا بۆ خودا نەبات. ئەم دڕدۆنگییە و ئەم لێڵییە وەکوو تەمتومانێك کە شنەی با رایماڵێ، رۆحی بەجێهێشت و رەوییەوە. پەنا بۆکوێ ببات جگە لە کەسێك کە هەستی دەکرد خۆی و رۆح و ئەشقی خۆی لە دەستی ئەودا دەبینێ.

ئەسپەکە هێشتا ئامادە نەکرابوو بەڵام ئەو حەزێکی زۆر و وزەیەکی جەستەیی بێپایانی لە خۆیدا دەدی و تەواوی هەست و خوستی لەسەر کارێك گیرسابۆوە کە لەپێشی بوو و نەیدەویست ساتێکی وەختی بەفیڕۆ بدات و چاوەڕوانی ئەسپ نەبوو بە پێیان وەڕێ کەوت و بە کۆزمای گوت کە هەرکاتێك ئەسپەکە ئامادەبوو بچێت بەدوایدا. لە سەری پێچی شەقامەکە کاشەیەکی شەوکاری دی کە بە پڕتاو دەهاتە پێشێ و لیزاوتا پترۆڤنا لەنێویدا دانیشتبوو. چارۆکەیەکی مەخمەریی بە شانیدا دابوو و لەچکەیەکی دابوو بە سەریدا. لەڤین کە روخساری ناسك و ئێستا بڕێك جیددی و تەنانەت تۆزێ گرژی مامانەکەی دی ناسییەوە و بە دەنگی بەرز گوتی: خودایە زۆر شوکر، خودایە زۆر شوکر! ـ دەستووری بە کاشەکەدا راینەگرێ و خۆی شانبەشانی کاشەکە بە هەڵاتن گەڕاوە بۆ ماڵێ.

لیزاوتا پترۆڤنا گوتی: کەوایە دوو سەعات دەبێ بەرەژان دەستیپێکردووە؟ زیاتر نییە؟ پیوتێر دیمیتریچ پەیداکەن بەڵام زۆری مەخەنە هەلەوپەلە. تەنیا لە دەواخانە تۆزێ تریاك بکڕن و لەگەڵ خۆتان بیهێنن.

لەڤین کە چاوی بە کاشەکەی خۆی کەوت لە دەروازەی ماڵێ دەهاتەدەرێ لە مامانەکەی پرسی: دەی، کەوایە تۆ پێتوایە بەخێر بگوزەرێ؟ خودایە، ببوورە، یارمەتیم بدە! ـ لە پەنا کۆزمادا سواری سورتمەکە بوو و گوتی بچێت بۆ ماڵی دوکتۆر.

## چاردە

دوکتۆر هێشتا لە خەو هەڵنەستابوو و نۆکەرەکەی گوتی: دوێشەو درەنگ خەوتووە و گوتوویانە خەبەریان نەکەمەوە. بەڵام ئێستا خۆیان لە خەو هەڵدەستن. ـ نۆکەرەکەی شووشەی چراکەی پاك کردەوە و دیاربوو زۆری حەز لەو کارەیە. ئەم هۆگرییەی نۆکەرەکەی بۆ خاوێنکردنەوەی شووشەی چراکە و خەمساردیی سەبارەت بەوەی لە دڵی ئەودا دەگوزەرا سەرەتا تووشی سەرسووڕمانی کرد. بەڵام کە تۆزێکی بیرکردەوە زۆر زوو تێگەیشت کە هیچ

کەس ئاگای لە هەستی دڵی ئەو نییە و ناچاریش نییە ئاگای لێبێ و هەر بەو هۆیەش ئەو دەبوو لێبڕاوانە بە خوێنساردی و ئاگادارییەوە هەڵسوکەوت بکات تاکوو ئەو دیواری خەمساردییە لەنێواندا هەڵگیرێ و بە مەبەستی خۆی بگات.

چونکە وزەی بەردەوام و لەڕادەبەدەری جەستەیی و زێدەبوونی سەرنجی خۆی بۆ ئەوەی لە پێشی بوو هەستی پێکرد و بە خۆی گوت «پەلەوهەلە مەکە با کارەکەت تووشی سستی و کەمتەرخەمی نەبێ.

لەڤین، کە دیتی دوکتۆر وادیارە ئاوا زوو لە خەو هەڵناستێ لەنێوان چەند کاردا کە دەیویست بیکات یەکیانی هەڵبژارد، بڕیاریدا یادداشتێك بۆ پزیشکێکی تر بنووسێ و بە کۆزمادا بینێرێ و خۆی بچێت بۆ دەواخانە تاکوو ئازارشکێنێك کە مامانەکە رایسپاردبوو بیکڕێت و ئەگەر هەتا کاتی گەڕانەوە دوکتۆر لە خەو هەڵنەستابوو دەمشیرینییەك بە نۆکەرەکەی بدات یان ئەگەر نۆکەرەکەی نەرم نەبوو بە زۆری و بە هەرشێوەیەك بێ دوکتۆر لە خەو هەستێنێ.

لە دەواخانە، دەوافرۆشێکی دالگۆشت راست وەکوو نۆکەرەکەی دوکتۆر کە خەریکی پاککردنەوەی شووشە لامپا بوو، ئەویش خەریکبوو چەند قوتووی خڕی بۆ فایتوونئاژۆیەك دەپێچایەوە کە لەوێ راوەستابوو و بە دەنگی لەڤینەوە نەهات کە داوای مۆرڤینی دەکرد. لەڤین کە هەوڵیدەدا پەلە نەکات و تووڕەش نەبێت بە سەبر و لەسەرەخۆیی ناوی دوکتۆر و مامانەکەی هێنا و بۆ دەوافرۆشەکەی روونکردەوە کە مۆرفینی بۆچییە و حەولی دا رازیی بکات. فرۆشیار بە زمانی ئاڵمانی لە کەسێکی کە خۆی دیارنەبوو پرسیاری کرد کە دەتوانێ مۆرفینی بداتێ، کە لە پشت پاراوانەکەوە دەنگی رازیبوونی بیست، شووشەیەکی چکۆڵە و رەحەتییەکی هەڵگرت و بە کاوەخۆ لە شووشەیەکی گەورەتر کە پڕبوو لە تراوی مۆرفین، شووشە چکۆڵەکەی پڕکرد و بەرچەسپێکی لێدا. لەڤین زۆر بەپەلە بوو و گوتی کە ئەوە پێویست ناکات و بەرچەسپی ناوێ. بەڵام کاتێك دیتی دەوافرۆش خەریکە شووشەکەی بۆ لە کاغەز دەپێچێ ئیتر نەیتوانی تامڵی بکات و شووشەکەی لە دەستی دەرکێشا و بە هەڵەداوان لە دەرگا شووشەییە گەورەکە چووەدەرێ. دوکتۆر هێشتا لە خەو هەڵنەستابوو و نۆکەرەکەی ئێستا خەریکی راخستنی فەرشێك بوو و ئامادە نەبوو ئەربابەکەی لە خەو هەستێنێ. لەڤین بە هێواشی ئەسکەناسێکی دە رۆبڵی دەرهێنا و پێیدا و بە نەرمی و لەسەرەخۆیی بەڵام بێ ئەوەی کات بەفیڕۆ بدات بۆی روونکردەوە کە پیوتێر دیمیتریچ (ئەو پیوتێر دیمیتریچەی کە زەمانێك بە مرۆڤێکی زۆر سووك و چرووکیان دەزانی ئێستا پلەوپایەیەکی باڵای

پەیدا کردبوو!) بەڵێنی پێدابوو هەرکاتێك پێویستی پێیهەبوو دەچێ بۆ لای و حەتمەن ئەگەر هەر ئێستا لە خەوی هەستێنێ تووڕە نابێت.

نۆکەرەکە رازی بوو و چووە سەرێ و لەڤینی بۆ ژووری چاوەڕوانی رێنوێنی کرد.

لەڤین لە پشت دەرگاکەوە گوێی لە کۆخەی دوکتۆر بوو و ترپەی هەنگاوی و شڵپە شڵپی دەموچاوشۆردنی و قسەکردنی بیست. سێ خولەك چاوەڕوان ما کە پێی وابوو سێ سەعاتی خایاندووە. ئیتر نەیدەتوانی سەبر بکات.

دەرگاکەی کردەوە و بە لەبزێکی پڕ لە پاڕانەوە گوتی: پیوتێر دیمیتریچ، پیوتێر دیمیتریچ! تۆ ئەوخودایە ببوورە، هەر جلێکت لەبەردایە قەیناکات ئیجازە بفەرموو بێمە ژوورێ، دوو سەعاتە ژان گرتوویەتی!

گوێی لە دەنگی دوکتۆر بوو کە گوتی: ئێستا. هەر ئێستا! ـ بە سەرسووڕمانەوە زەنگی پێکەنینی لە لەبزی دوکتۆردا هەست پێکرد.

ـ تەنیا خولەکێکی تر!...

ـ بەچاوان، هەر ئێستا!

دوو خولەکی تر تێپەڕی هەتا دوکتۆر جزمەکانی لە پێ کرد و دیسان دوو دەقیقەی تری خایاند هەتا دوکتۆر جلوبەرگی لەبەرکرد و سەری داهێنا.

لەڤین دیسان بە لەبزێکی سکاڵائامێزەوە گوتی: پیوتێر دیمیتریچ!... ـ بەڵام لەوکاتەدا دوکتۆر جلوبەرگی لەبەرکردبوو و بە سەرو قژی شانەکراوەوە، هاتەدەرێ. لەڤین لە دڵی خۆیدا گوتی «ئەم مرۆڤانە بەڕاستی بێویژدانن. ئەوا ئێمە لە کاتی گیانکەشتداین و ئەو جارێ خەمی سەرو قژیەتی!»

دوکتۆر دەستی گوشی و وەك ئەوەی بیهەوێ بە لەسەرەخۆیی خۆی گاڵتەی پێبکات گوتی: بەیانییت باش! پەلە مەکە قوربان! باشە؟ فەرموو...

لەڤین هەوڵیدا هەموو پاژەکانی حاڵی خێزانی هەتا ئەو جێیەی دەیتوانی بە وردی وەسف بکات و دەستیکرد بە روونکردنەوەی هەموو بارودۆخ و چۆنێتی و وردەکارییە ناپێویستەکانی ئەو بەیانییەی و بەردەوام قسەکەی دەبڕی و داوای لە دوکتۆر دەکرد خێراتر وەڕێ بکەوێ.

ـ ئەوەندە پەلە مەکە. ئێوە خۆ دەزانن هاتنی من پێویست نییە، بەڵام چونکە بەڵێنم داوە بێم، لەگەڵتدا دێم. ئەو هەموو پەلەوهەلەیەشی ناوێ. تکایە فەرموو دانیشە. قاوە ناخۆیەوە؟

لەڤین چاوی لێکرد و بەو روانینە دەیویست تێبگات کە دوکتۆر گاڵتەی پێدەکات یان نا. بەڵام دوکتۆر گاڵتە و پێڕابواردنی هەر لە بیرنەبوو.

دوکتۆر بە پێکەنینەوە گوتی: تێدەگەم، دەزانم، من خۆشم ژنم هەیە. بەڵام دەزانی ئێمە پیاوان لەوجۆرە کاتانەدا لە نەخۆشەکە داماوترین؟ من نەخۆشێکم هەیە مێردەکەی هەمیشە لەو کاتانەدا پەنا دەبا بۆ گەورِ و لەوێ خۆی دەشارێتەوە.

ـ بەڵام پیوتێر دیمیتریچ، بیر و رای تۆ چییە؟ پێتوایە کارەکە بە خێروخۆشی تەواوبێت؟

ـ رەوت و رووداوەکان نیشاندەری ئەوەن کە کارەکە بەخێر و خۆشی کۆتاییی دێت.

لەڤین کە دیتی پێشخزمەتەکە بە قاوەوە هاتەژوورێ بە رەقەوە چاوێکی لێکرد و پرسیی: دەی، کەوایە خێرا تەشریف دێنن؟

ـ سەعاتێکی تر دێمە خزمەتتان.

ـ نا، تۆخودا ئاوا درەنگی مەخە!

ـ باشە، بەڵام لێگەڕێ با قاوەکەم بخۆمەوە.

دوکتۆر خەریکی قاوەکەی بوو و هەردووکیان بێدەنگ بوون.

دوکتۆر لەگەڵ جاوینی نانەچەورەکە گوتی: بەڵام هێزی سەربازیی ئێمە چاك بە تورکەکاندا دێ. ئێوە راپۆرتە تێلگەرافەکەی دوێنێتان لە رۆژنامەدا خوێندەوە؟

لەڤین لە جێی خۆی هەستا و گوتی: نا، من ئەوەم بۆ تامڵ ناکرێ. کەوایە هەتا چارەگە سەعاتێکی تر دێی؟

ـ نیوسەعاتی تر.

ـ بەڵێنی پیاوانە؟

لەڤین لەگەڵ پرێنسسی گەورە گەیشتەوە ماڵێ. پێکەوە گەیشتنە بەردرگای ژووری خەوەکە. پرێنسس چاوی فرمێسکی تێزابوو و دەستی دەلەرزین. کە چاوی بە لەڤین کەوت باوەشی پێدا کرد و دەستیکرد بە گریان.

دەستی مامانەکەی گرت کە بە روخساری گەشاوە، بەڵام خەمبارەوە هاتبوو بەرەوپیریان و لێیپرسی: دەی، پێمبڵێ گیانەکەم، لیزاوتا پترۆڤنا!

ـ چاکە. بەڵام دەبێ رازیی بکەن بخەوێت. ئەگەر بخەوێ ئاسانترە.

لەڤین لەوکاتەوە کە لە خەو هەستابوو و زانیبووی خێزانی پێورۆژی خۆیەتی بڕیاری دابوو و بێ ئەوەی بەڵگە بێنێتەوە یان ئیجازەی پێشبینی بە خۆی بدات، بیر و هەستەکانی خۆی

بۆخۆی راگرێت و کارێکیوا نەکات کە ببێتە هۆی شڵەژانی ژنەکەی، بەڵکوو بە پێچەوانە، هێوری بکاتەوە و ورە و غیرەت و خۆڕاگری لە ناخێدا بەهێز بکات و بەو شێوەیە ئەو رێگا دژوارەی لەبەرێتی کۆتاییی پێبێنێ. بێ ئەوەی ئیجازە بە خۆی بدات کە سەبارەت بە داهاتوو و چۆنێتیی کۆتاییی کارەکە بیر بکاتەوە، بە پرسیارکردن سەبارەت بە ماوەی ئاسایی زایەمان لە خەیاڵیدا ئامادەبوو نزیکەی پێنج سەعات رەنج و ژان و خەم و چاوەڕوانی تاملێ بکات و پێیوابوو لەو کارەدا سەرکەوتوو دەبێ. بەڵام کە لە ماڵی دوکتۆر گەڕایەوە و دیسان چاوی بە ژان و ئازاری ژنەکەی کەوت زیاتر لە پێشوو پەنای بۆ خودا برد و دەستیکرد بە پاڕانەوە: خودایە، ببوورە، یارمەتیم بدە! ـ هەناسەی هەڵدەکێشا و سەری بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوە و ترس سەرتاپای داگرتبوو کە نەتوانێ تاقەت بێنێت و دەستبکات بە گریان و هەڵێ. ئازارەکەی زۆر گران بوو و هێشتا سەعاتێك تێنەپەڕیبوو.

بەڵام دوای ئەم یەکەم سەعاتە، سەعاتێك، دوو سەعات، سێ سەعاتی تریش تێپەڕی، پێنج سەعات کە ئەو بۆ دوایین رادەی تاقەتهێنانی لەبەرچاوی گرتبوو کۆتاییی پێهات و وەزعەکە هەر وەکخۆی بوو و ئەو هەروا سەبری دەکرد، چونکە جگە لە سەبر کارێکی تری لە دەست نەدەهات و سات لەگەڵ سات پێیوابوو دوایین رادەی تاقەتهێنانێتی و ئیتر ورەی لە دەستداوە و لە ژێر باری ئازاری ژنەکەیدا لە پێ دەکەوێ.

بەڵام خولەك و سەعات هەروا تێدەپەڕین و ئازار و ترس و شڵەژان و دڵەخورپەی پەرەی دەسەند.

بارودۆخی ئاسایی ژیان کە بەدەر لە ئەو هێنانە بەرچاوی هیچ شتێك نەدەلوا، ئیتر بۆ ئەو نەمابۆوە. ئیتر نەیدەزانی کات چۆن تێدەپەڕێ. هێندێ جار کە کیتی بانگی دەکرد بۆ لای خۆی و بە دەستە ئارەقەکردووەکەی دەستی ئەوی بە وزەیەکی کەم وێنەوە دەگوشی و هێندێ جاریش لە خۆی دەتاراند، پێیوابوو چەند سەعات تێپەڕێوە و هێندێ جاریش چەند سەعاتی پێ بە خولەکێك بوو. کاتێك لیزاوتا پترۆڤنا داوای لێکرد لە پشت پاراوانەکە مۆمی تازە دایسێنێ تازە تێگەیشت کە سەعات پێنجی دوانیوەڕۆیە و ئەگەر پێیانبگوتبایە سەعات دەی بەیانیشە هەر بەو رادەیە تووشی واقوڕمان دەبوو. تەنانەت نەیدەزانی لەو ماوەیەدا لەکوێ بووە و چیی کردووە و ئەو رووداوانەی کە روویاندابوو نەیدەزانی چەندەی خایاندووە. روخساری گەش و سوورهەڵگەڕاوی کیتیی دەدی کە هێندێ جار گوشاری ئازار ئاراوقارای لێهەڵدەگرت و برێ جاریش بە پێکەنینەوە هەوڵی دەدا دڵخۆشیی ئەو بداتەوە. پرێنسسی گەورەی دەدی کە لە حەژمەتان سوورهەڵگەڕاوە و چینی پرچە سپییەکەی ئاڵۆزاوە و لێوی خۆی

دەکورۆژێ و هەوڵیدەدا ددان بە جەرگی خۆیدا بنێ و بەر بە داوەرینی فرمێسکەکانی بگرێ. دالیی دەدی و دوکتۆریش کە جگەرەی ئەستووری دەکێشا و لیزاوتا پترۆڤنا کە روخساری هیوادار و لێبڕاو و هێورکەرەوەی بوو و پرێنسسی پیریش کە بە دڵێکی خەمبار و ناوچاوانی گرژەوە لەنێو تەلارەکەدا پیاسەی دەکرد. بەڵام هەموو ئەوانە چۆن دەهاتن و دەڕۆیشتن و لەکوێ بوون هیچی نەدەزانی. پرێنسس بڕێ جار لەگەڵ دوکتۆر لە ژووری خەوەکە بوو بڕێ جاریش لە ژووری کارەکە کە مێزێکی خواردنیان لێڕازاندبۆوە، هێندێ جاریش خەسووی نەبوو دالی بوو. پاشان لەڤین وەبیری هاتەوە کە بۆ زۆر شوێنیان ناردووە و کاریان پێسپاردووە. جارێك ناردیان بۆ گۆڕینی جێگای مێز و قەنەفەکان و ئەو کارەکەی زۆر خێرا و بە تینوتاو بە دەستەوە هات و پێیوابوو ئەو کارە بۆ ئاسوودەییی کیتییە و پاشان زانیی کە پێخەفی شەوانەی بۆ خۆی دروست کردووە. پاشان ناردیان بۆ نووسینگەی کارەکەی تاکوو شتێك لە دوکتۆر بپرسێ. دوکتۆر وەڵامیدایەوە و پاشان دەستیکرد بە باسکردنی کێشە و شەڕی نوێنەرەکان و تێکەولێکەی پەرلەمانی دۆما. دوای ئەوەش ناردیان بۆ ماڵی پرێنسس تاکوو وێنە پیرۆزەکەی کە لە قەتحەی زێوین و ئاڵتوونی گیرابوو لە ژووری خەوەکەی ئەو بێنێت و بە یارمەتیی کلفەتە پیرەکەی پرێنسس هەر لەگەڵ چوونە سەرمێزەکە تاکوو قەتحەکە داگرێ چراکەی ژوور سەری خەسووی شکا و خزمەتکارەکە بۆ شکانی چراکەش و بۆ بارودۆخەکەی کیتیش دڵخۆشیی دایەوە و خۆی وێنە پیرۆزەکەی هێنا و لە ژوور سەری کیتی داینا و بە جوانی لە بالیفەکەی گیر کرد بۆ ئەوەی نەخزێ. بەڵام هەموو ئەوانەی لەکوێ و کەنگێ و بە چ مەبەستێك کردبوو خۆشی نەیدەزانی. هەروەها تێنەدەگەیشت کە بۆچی خەسووی دەستی ئەوی گرتبوو و بە دڵسۆزییەوە چاوی لە چاوی کردبوو و داوای لێکردبوو کە ئارام بێت و بۆچی دالی هەوڵی دابوو رازیی بکات کە شتێك بخوات و لە ژوورەکە بردبوویە دەرێ؟ هەروەها سەری لەوە دەرنەدەچوو کە بۆچی دوکتۆر بەو حاڵەتە جیددییەوە بە شێوەیەکی دڵسۆزانە چاوی لێکردبوو و قەترەیەکی دەرخوارد دابوو.

ئەو تەنیا دەیزانی و هەستی دەکرد ئەوەی لە دەوروبەری رادەبرێ راست وەك ئەو شتە وایە کە ساڵی رابردوو لە میوانخانەی ناوەندی پارێزگا، ئەو کاتەی نیکولای برای لەوێ هیلاك و هێزلێبڕاو بە جێویان کەوتبوو، بەڵام جیاوازییەکەی تەنیا لەوەدابوو لەوێ خەم هەمووانی داگرتبوو و لێرەش شادی. بەڵام ئەو خەمە و ئەم شادییە هەردووکیان بەدەر لە بارودۆخی ژیانبوون و لەم ژیانەدا وەکوو درز و کەلێنێك وابوون کە لەوێوە شتێك وەدیار دەکەوێ. ئەوەی روویدەدا بە یەك رادە دژوار و پڕئازار بوو و رۆحی تواشاچییەکە کاتی روانین لە چۆنێتییەکەی هەر بەو رادەیە دوور لە زەین بوو و دەگەیشتە جێیەك کە بەرلەوە بە خەیاڵیشیدا نەهاتبوو لەوبارەوە قەت ئەقڵی بڕی نەدەکرد.

لەڤین بەردەوام لە دڵی خۆیدا دووپاتی دەکردەوە «خودایە، ببوورە، خودایە یارمەتیم بدە!» سەرەڕای نامۆبوونی لەگەڵ خودا و مەودای دووری نێوانیان پێیوابوو هێندە قووڵبۆتەوە کە هەستی دەکرد پێوەندیی لەگەڵ خودا وەکوو سەردەمی منداڵی پاك و قایم و رووناك بۆتەوە.

ئەو لە تەواوی ئەو ماوەیەدا دووحاڵی جیاوازی هەبوو، یەکیان ئەو کاتە بوو کە لە کیتی دوور بوو: لە هەنتەشی دوکتۆردا، کە لەپەستا جگەرەی دەکێشا و قوونچکی جگەرەکانی لەسەر لێواری تەپڵەکە پڕ لە قوونچك و سووتووەکە دەکووژاندەوە، یان لەلای دالی و خەزووری کە باسی فراوێن و سیاسەت و نەخۆشیی ماریا پترۆڤنایان دەکرد و لەڤین زۆر جار لە بیری نەدەما خەریکە چ رووداوێك دەقەومێ و پێیوابوو تازە لە خەو راپەڕیوە. حاڵەکەی تریشی ئەو کاتە بوو کە دەچوو بۆ لای کیتی و لە ژوور سەری دادەنیشت و لەوکاتەدا حەزی دەکرد لە داخا دڵی بتۆقێ بەڵام نەدەتۆقی و بەردەوام لە خودا دەپاڕایەوە و دۆعای دەکرد. هەرجارێك کە هاواری کیتی لە ژوورەکەوە هەڵدەستا و وەخۆی دەهێنایەوە تووشی هەڵە سەیروسەمەرەکەی پێشوو دەبۆوە، هەرجارێك کە گوێی لە هاوار و ناڵەی کیتی دەبوو لە جێی خۆی دەردەپەڕی و هەڵدەهات و دەیویست بیسەلمێنێ کە بێتاوانە و لەگەڵ راکردنەکەی وەبیری دەهاتەوە کە هیچ بە تاوانباری نەزانیوە و ئەو کاتە دەیویست پشتیوانیی لێبکات و یارمەتیی بدات. بەڵام کە چاوی پێیدەکەوت دیسان دەیدی هیچ یارمەتییەکی لەدەست نایە و ترس سەرتاپای دادەگرت و دەیگوت: خودایە، ببوورە و یارمەتیم بدەـ هەتا زیاتری دەخایاند جەخت و گوشاری ئەو دووحاڵە زیاتری تووشی تەنگژە دەکرد. کاتێك لە کیتی دووردەکەوتەوە هێندێ هێور دەبۆوە و لە بیری دەبردەوە، بەڵام کاتێك لەلای دەبوو ئازاری کیتی ژانی لە ئێسك و دەماری ئەو ئاژین دەکرد و هەستی بێدەسەڵاتییەکەی بەتین و تاوتر دەبوو و لە ناخەوە هەڵێدەچۆقاند. لەجێی خۆی هەڵدەستا و دەیویست هەڵێ و پەنا بۆ جێگایەك بەرێت و دەیدی جگە لە مانەوە و دانیشتن لە ژوور سەری ژنەکەی جێگایەکی تر نییە پەنای بۆ بەرێت و هەڵدەهاتەوە بۆ لای.

هێندێ جاریش کە کیتی دووسێ جاری لەسەریەك بانگکرد، دەیویست لۆمەی بکات بەڵام کە روخسارەکەی و بزەشیرینەکەی دەدی و گوێی لە دەنگی دەبوو کە دەیگوت «چەندەم ئازاردای» ئیمانهەردە دەبوو و کفری دەکرد و کە خوداشی وەبیردەهاتەوە لەڕێوە دەکەوتەوە دۆعا و لالانەوە و دەیویست لێیخۆش بێ و یارمەتیی بدات.

# پازده

لەڤین کاتی لێتێکچووبوو و نەیدەزانی درەنگە یان زووە. مۆمەکان ئیتر خەریکبوون تەواودەبوون. دالی هاتبوو بۆ نووسینگەی کار و پێشنیاری بە دوکتۆر کردبوو کە راکشێ. لەڤین دانیشتبوو و گوێی بۆ قسەکانی دوکتۆر راگرتبوو کە باسی دەهۆکارێکی دەکرد کە سوورە لەسەر ئەوەی دەتوانێ نەخۆشیی خەڵك بە خەوی مەگنەتسی شیفا بدات و چاوی لە سووتووی جگەرەکەی بڕیبوو. کاتی خەوتن بوو و لەبەر شەکەتی لەوانەبوو بەلادا بێت. بە تەواوی لە بیری بردبۆوە کە چی لە دەورووبەری رادەبرێ. گوێی بۆ قسەی دوکتۆر شل کردبوو و لە وتەکانی تێدەگەیشت. لە ناکاو قیژەیەك وڵاتی داگرت کە زۆر نامۆ بوو و تا ئێستا دەنگێکی ئاوای نەبیستبوو. قیژەکە هێندە ترسناك بوو کە لەڤین نەیتوانی لە جێی خۆی جووڵە بکات بەڵام هەناسەی خەریکبوو راوەستێ و بە روانینێکی تۆقیوانە و پرسیاراوی چاوی لە دوکتۆر بڕی. دوکتۆر سەری بۆ لایەك خوار کردەوە و گوێی رادەگرت و بزەی دەهاتێ. هەموو شتێك بەڕادەیەك نائاسایی بوو کە لەڤین ئیتر سەری لە هیچ شتێك سوور نەدەما. هەر وا دانیشتبوو و بە خۆی دەگوت «حەتمەن دەبێ هەروا بێ، ئەم قیژەیە لەکام گەروو هاتەدەرێ؟» لەجێی خۆی دەرپەڕی و بە هەڵەداوان رۆیشت بۆ ژووری خەوەکە. بە پشت لیزاوتا پترۆڤنا و خەسوویدا تێپەڕی و لە جێی خۆی لە ژوور سەری کیتی راوەستا. کیتی هێوربووبۆوە بەڵام شتێك گۆڕابوو. ئەی ئەو شتە چیبوو؟ نەیدەدی و تێنەدەگەیشت و نەیدەویست بیبینێ و تێبگات. ئەو شتەی لە سیمای لیزاوتا پترۆڤنادا دەدی. روخساری ئەو جیددی و هەڵبزڕکاو و هەروا توند و لێبڕاوانە بوو، ئەگەرچی چەنە و لێوی دەلەرزی و چاوی لەسەر روخساری کیتی هەڵنەدەگرت. بە روخساری سوورهەڵگەڕاو و گڕی ژانتێزاو و چینی بسکی بەئارەقە خووساوی کە بە هەنییە و لاجانگییەوە نووسابوو، ئاوڕی بۆ لای لەڤین دابۆوە و چاوانی لە روانینی ئەو دەگەڕان. دەستی هەڵێنابۆوە و دەیویست لەڤین دەستی بگرێ. کیتی بە دەستە گەرم و ئارەقەکردووەکانی دەستی ساردی مێردەکەی گرت و بە روومەتی خۆیەوە گوشی.

خێراخێرا دەیگوت: مەڕۆ، مەڕۆ، ناترسم، ناترسم. دایەگیان گوارەکانم لە گوێ داکەنە، ئازارم دەدا. بەڵام تۆ مەترسە، زۆر زوو، زۆر زوو لیزاوتا پترۆڤنا...

بەپەلە قسەی دەکرد و دەیویست زەردەیەك بخاتە سەرلێوی بەڵام کتوپڕ روخساری گرژ بوو و لەڤینی لە خۆی دوور خستەوە.

هاواری کرد: نا، نا، چەندە ترسناکە! خەریکە دەمرم، خەریکە دەمرم! برۆ لێرە برۆ...! ـ دیسان ئەو قیژەیەی کە لە دەنگی بنیادەم نەدەچوو لە ژوورەکەدا دەنگیدایەوە.

لەڤین چنگی بە قژی خۆیدا کرد و لە ژوورەکە چووەدەرێ.

دالی بەدوای ئەودا گوتی: هیچ نییە، هیچ نییە، هەموو شتێك تەواو و بەڕێوجێیە!

بەڵام ئەوان دەیانویست هەرشتێك بڵێن، ئەو دەیزانی کە کارەکە خراپ کەوتووە و ئیتر هیوایەك نەماوە. لە ژوورەکەی تەنیشت راوەستابوو و سەری بە چوارچێوەی دەرگاکەوە نابوو و دەنگێکی دەبیست کە قەتی نەبیستبوو. قیژە و ناڵە بوو و دەیزانی راست لەو شتە دێتەدەرێ کە هەتا تاوێك لەمەوبەر کیتی بوو. ماوەیەك بوو کە ئیتر حەزی نەدەکرد منداڵی هەبێ. ئێستا ئیتر لەو کۆرپەیە بێزار بوو. تەنانەت ئیتر هۆگرییەکی ئەوتۆی بە ژیانی کیتیش نەمابوو. تەنیا دەیویست ئەو ئازارە تاقەتپڕووکێنە کۆتاییی پێبێ.

دەستی دوکتۆری گرتبوو کە هاتبووە ژوورێ و دەیگوت: دوکتۆر! ئەمە چیبوو؟ ئەمە چیبوو؟ خودایەگیان، خودایە....

دوکتۆر گوتی: خەریکە تەواودەبێ ـ روخساریشی لە کاتی دەربڕینی ئەو وشانەدا جیددی بوو کە لەڤین پێیوابوو گوتوویە «خەریکە تەواودەبێ» یانی خەریکە دەمرێ.

بە شڵەژاوی هەڵات بۆ ژوری خەوەکە. یەکەم شت کە چاوی پێیکەوت روخساری لیزاوتا پترۆڤنا بوو. ئەو روخساری گرژ و تووڕە و جیددیتر لە پێشوو بوو. دەموچاوی کیتی دیارنەبوو. لەو شوێنەی کە پێشتر روخساری کیتی لێبوو شتێك وەبەرچاو دەهات کە بە هۆی هەوڵ و لەخۆنووسانی زۆرەوە شێوابوو و بەجارێ رەنگی بە رووەوە نەمابوو و بەو دەنگە سەیرەوە کە لێیدەهاتەدەرێ ترسی دەخستە دڵ و هەناوەوە. لەڤین سەری خۆی لە شانی قەرەوێڵەکە کۆتا و هەستی کرد کە خەریکە بەندی دڵ و جەرگی دەپسێ. قیژە ترسناکەکە هەروا بەردەوام بوو و جار لەگەڵجار دڵتەزێنتر دەبوو، لەناکاو وەك ئەوەی گەیشتبێتە دواین رادەی خۆی بێدەنگ بوو. لەڤین بڕوای نەدەکرد ئەو بانگوڕۆ و گریانە بێدەنگ بووبێ. باوەڕی بە گوێچکەی خۆی نەدەکرد. بەڵام بۆ دڕدۆنگی نەدەبوو. قیژە و شیوەن کۆتاییی هاتبوو و ترپەی لەسەرەخۆی هاتووچۆ و خشەخشی داوێنی کراس و هەناسەبڕکێ دەهاتە گوێ و هەروەها دەنگی زیندوو و پچڕپچڕ و شیرینی کیتی دەبیسترا کە بەختەوەرانە و بە نەرمی و دلۆڤانی دەیگوت: تەواو.... بوو...

لەڤین سەری هەڵبڕی. دەستی کیتی بێهێز لەسەر بەتانییەکە کەوتبوون و دەموچاوی جوان و ئارامی نائاسایی بوو و بێدەنگ چاوی لە ئەو بڕیبوو و دەیویست بۆی پێبکەنێ بەڵام نەیدەتوانی.

لەڤین هەستی کرد لەناکاو لەو شوێنە رازاوی و ترسناکەی کە تایبەتی ئەم دنیایە نەبوو و لە بیست و چوار سەعاتی رابردوودا دنیای ئەوبوو، دابڕاوە و هێنراوەتەوە بۆ دنیا ئاشناکەی پێشووی، بەڵام ئەم دنیایە ئێستا بە تیشکی بەختەوەرییەکی نوێ وەها رووناك و پڕشنگدار بووبوو کە تاقەتی تامڵکردنی نەبوو. هەودا درێژەکان لە ناکاو پسابوون. قوڵپەی گریان و فرمێسکی شادی کە پێشبینیی نەکردبوو وەها لە ناخەوە دەیکوڵاند و کوڵوکۆی پێهەڵدەڕشت کە هەنیسك جەستەی رادەتەکاند و هەتا ماوەیەك نەیتوانی قسە بکات.

لەبەر چرپاکەدا چۆکی دادا و دەستی ژنەکەی نابوو بە دەمییەوە و ماچی دەکرد، دەستی کیتی بە جووڵاندنی نەرمی قامکی وەڵامی ماچەکانی لەڤینی دەدایەوە. لەوکاتەدا لەلای لاقی چرپاکەوە ژیانی مرۆڤێکی تازەی بە دەستی چالاکی لێزاوتاپترۆڤناوە بینی، کە بەرلەوە بوونی نەبوو، هەروەکوو بلێسەی مۆمێك ترپەی دڵی دەهات و وەك ئەوان و هەر بەو ماف و گرینگایەتییەوە، دەژیا و دەیزانی لە کاتی خۆیدا ئەویش وێنەی خۆی وەدی دێنێ و بەرەی لێدەکەوێتەوە.

لەڤین گوێی لە دەنگی لیزاوتا پترۆڤنا بوو کە دەیگوت: زیندووە، زیندووە! کوڕیشە ـ بە دەستێکی لەرزۆك و بە هێواشی لە پشتی ساواکەی دەدا.

کیتی دەنگی هەڵبڕی و گوتی: دایەگیان راست دەکات؟

تەنیا دەنگی گریانی پرێنسس وەڵامیدایەوە.

لەنێو بێدەنگیی ژوورەکەدا دەنگێك جگە لە دەنگی ئامادەبووان کە بەپێی بارودۆخەکە زۆر بە هێواشی قسەیان دەکرد، دەتگوت وەڵامی پرسیارەکەی کیتیی داوەتەوە. دەنگی جەسوور و رووهەڵماڵدراوانەی مرۆڤێك کە گوێی لە بارودۆخەکە نەبوو و هیچ کەسیش نەیزانی لە کوێوە هاتبوو.

بەرلەوە ئەگەر بە لەڤینیان بگوتبایە کیتی مردووە و ئەویش لەگەڵیدا مردووە و منداڵانی ئەوان فریشتەن و ئێستا لە بارەگای خودای گەورەن پێیسەیر نەبوو. بەڵام ئێستاکە گەڕابۆوە دنیای راستەقینە، زۆری گوشاری بۆ زەینی خۆی هێنابوو تاکوو بۆی دەرکەوێ لەشساخ و زیندووە و تێبگات کە ئەو بوونەوەرەی کە ئاوا دەقیژێنێ کوڕی ئەوە. کیتی زیندوو بوو و ئازار و ژانەکەی کۆتاییی هاتبوو و بەختەوەریی ئەو (لەڤین) لەو بابەتەوە بە زمان بەیان

نەدەکرا. ئەو لەوحاڵە دەگەیشت و زۆر دڵخۆش و شیرینکام بوو. بەڵام ساواکە؟ ئەو ساوایە لەکوێوە و بۆچی هاتبوو؟ یان دەکرێ بڵێین کێبوو؟ ئەمە شتێك بوو کە تێینەدەگەیشت و نەیدەتوانی خووی پێبگرێ. بە شتێکی زیادی و بێکەڵکی دەزانی کە هەتا ماوەیەکی دوور و درێژ نەیدەتوانی لەگەڵی رابێ.

## شازدە

نزیك سەعات دە پرێنسی گەورە و سرگی ئیڤانڤیچ و ستیپان ئارکادیچ لە ماڵی لەڤین دانیشتبوون و دوای ئەوەی هێندێکیان سەبارەت بە ژنی زیستان قسەکرد چوونە سەر باسی تر. لەڤین گوێی بۆ قسەکانیان راگرتبوو و نەخوازراوانە رابردووی وەبیردەهاتەوە و بەتایبەت ئەوەی لەو رۆژەدا رووی دابوو و بیری لە حاڵی دوێنێ ئێوارەی خۆی کردەوە. دەتگوت لە دوێنێوە تا ئەمکاتە سەدساڵ تێپەڕیوە. هەستی دەکرد دەستی بە تەشق و بەرزاییەك راگەیشتووە کە بە خەیاڵیش بیری لێنەدەکردەوە و هەوڵدەدا لەو پەڕپەڕۆچکەیە بێتە خوارێ بۆ ئەوەی میوانەکانی ئازار نەدات. قسەی لەگەڵ دەکردن و لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام لە بیری ژنەکەیدا بوو، بیری حاڵوباڵی ئەوی دەکردەوە و هەروەها لە کوڕەکەشی و هەوڵی دەدا خۆی لەگەڵ بوونی ئەو رابێنێ. دنیای ژیان کە دوای زەماوەندەکەی گرینگایەتییەکی تازە و بێوێنەی بۆ ئەوە پەیدا کردبوو ئێستا گەیشتبووە پلەوپایەیەك کە لە خەیاڵیدا نەدەگونجا. میوانەکانی باسی فراوێنی رۆژی رابردووی باشگایان دەکرد و ئەو لە بیری ژنەکەیدا بوو «ئێستا چیدەکا؟ بڵێی خەوی لێکەوتبێ؟ حاڵی چۆنە؟ چۆن بیردەکاتەوە؟ بڵێی دمیتریی کوڕم هەستابێ لە خەو و ئێستا بگری؟» لەنێوان قسەکاندا، تەنانەت لە کاتی باس و بابەتێکدا لە ناکاو هەڵدەستا و لە ژوورەکە دەچووەدەرێ.

پرێنسی گەورە گوتی: بنێرە بزانە من دەتوانم بچم بۆ لای؟

لەڤین وەڵامیدایەوە: زۆر چاکە، هەر ئێستاـ بێ ئەوەی راوەستێ چوو بۆ لای کیتی.

کیتی نەخەوتبوو و بە هێواشی لەگەڵ دایکی سەبارەت بە بەرنامەی رێوڕەسمی سەرانشۆی ساواکە دەدوا.

کیتی پاکوخاوێن، بە قژی شانەکراو و شەوکڵاوێکی رازاوە بە رووبانی شین لە سەردا، هەردوو دەستی لەسەر بەتانییەکە دانابوو و لەنێو پێخەفەکەیدا راکشابوو. چاوی بە لەڤین

کەوت و بە چاو بانگی کرد بۆ لای خۆی. روانینی ئەو کە لە کاتی ئاسایشدا روون و پڕترووسکە بوو بە نزیکبوونەوەی ئەو زیاتر گەشایەوە. روخساری گۆڕانێکی تێدا بەدی هاتبوو. چۆنێتیی ئەم جیهانەی شانوشکۆیەکی ئاسمانیی بەخۆوە گرتبوو. راست ئەو گۆڕانەی کە لە روخساری مردوودا وەدی دێت، بەڵام لەلای مردوو ئەو گۆڕانە هاوڕێ لەگەڵ ماڵئاواییکردنە و ئێرە سەفای هاتن و ژیانی پێوە بوو. دیسان ئەو هەیەجانەی کە کاتی زایەمانی ژنەکەی هەستی پێکردبوو دڵی خستەوە نێو گێژاو و فەرتەنە. کیتی دەستی ئەوی گرت و لێی پرسی خەوتووە یان نا. لەڤین نەیتوانی وەڵامی بداتەوە و کە لە کەمغیرەتی خۆی ئاگاداربوو رووی وەرگێڕا.

کیتی گوتی: بەڵام من بوورامەوە و خەوم لێکەوت کۆسیتا، ئێستا حاڵم زۆر باشە.

چاوی لە ئەو دەکرد بەڵام لە ناکاو حاڵەتی سەرو چاوی گۆڕا.

کە دەنگی گریانی منداڵەکەی بیست گوتی: بیدەن بە من. لیزاوتا پترۆڤنا. لەڤین خێرا رووی وەرگێڕا و چاوی لێکرد.

لیزاوتا پترۆڤنا شتێکی سوور و نائاشنای هەڵگرت کە لاقەفرتێی دەکرد، هێنای بۆ لای و گوتی: زۆر چاکە، لێیگەڕێن با باوکەگیانی ببینێ، بەڵام سەبرێ بگرن، با جارێ خاوێنی بکەمەوە و پەڕۆکانی لێبگۆڕم ــ پاشان ئەو شتە سوورەی لاقەفرتێی دەکرد لەسەر چرپاکەی دانا و پەڕۆکانی کردەوە، لێیگۆڕی و بە قامکێکی خۆی بە چالاکی لاقی هەڵێنا و سووڕاندی و شتێکی لە بەینی لاقی پژاند.

لەڤین چاوێکی لەو بوونەوەرە وردیلە و بەزەییبزوێنە کرد و هەوڵێدا لە دڵی خۆیدا هەستی باوکایەتی دەرهەق بە ئەو بەدی بێنێ بەڵام هەوڵێکی بێئاکام بوو. لە دڵی خۆیدا جگە لە بێزاری هیچی تری نەدەدییەوە. بەڵام کاتێك رووتیان کردەوە و لەڤین جووڵەی چالاکانەی دەست و لاقی وردیلە و زەرنەقووتەئاسایی و قامکە باریك و ناسکەکانی و تەنانەت قامکە گەورەشی کە لەگەڵ قامکەکانی تری جیاواز بوو و لێك جیا دەکرانەوە، سەرنجی راکێشا و کە دیتی لیزاوتا پترۆڤنا ئەو دەستە وردیلانەی کە لێك بڵاو دەبوون و وەك فەنەری نەرم وێك دەهاتنەوە دەیگرتن و دەیکردن بە نێو کراسە هەولەییەکەدا وەها رەحمی بۆی بزووت و خۆشەویستیی ئەو بوونەوەرە بەستەزمان و بێدەسەڵاتە لە دڵیدا گوورا و ترسێکی وەهاش لەوەی نەکا بە دەستییەوە ئازاری پێبگات گیانی داگرت، کە دەستی مامانەکەی گرت و نەیوێرا منداڵەکەی لێوەرگرێ.

لیزاوتا پترۆڤنا دەستیکرد بە پێکەنین.

ـ مەترسە، مەترسە!

کاتێك منداڵە خاوێنەکە وەك بووکە باخە توندوتۆڵ مەلۆتکە کرا لیزاوتا پترۆڤنا لە کاری خۆی رازی بوو و لەگەڵ ئەوەی بە شارەزاییی خۆی دەنازی مەلۆتکەکەی لەو دەستەوە دایە دەستەکەی تری و سەری خۆی کێشایە دواوە بۆ ئەوەی لەڤین بتوانێ بە جوانی منداڵەکەی ببینێ.

کیتی کە نەیدەویست چاو لەسەر منداڵەکەی هەڵگرێ لەلایەکەوە چاوی لێدەکرد.

گوتی: بمدەنێ، بمدەنێ ئیتر ـ تەنانەت دەیویست لەجێی خۆی هەستێ.

ـ ئەوە چییە کاترینا ئەلکساندرۆڤنا، تۆ نابێ لە جێی خۆت بجووڵێی، سەبرکە دەیدەم بە تۆ! راوەستە با جارێ باوەگیانمان بزانێ چ شێرەکوڕێکین.

لیزاوتا پترۆڤنا ئەوەیگوت و ئەو شتە سەیر و زەڕنەقووتە ئاسایەی کە سەری لەنێو ملیوانەی کراسەکەیدا بەحاڵ دیاربوو لەسەر دەستێکی بۆ لای باوکی بەرزکردەوە (بە قامکی دەستەکەی تری ژێر ملی کۆرپەکەی گرت و سەری شل و خۆنەگرتووی هەڵێنا) کە نووکی لووت و چاوە هێشتا نەترووکاوەکانیشی دیاربوو و دەم و لێوە چکۆڵەکەی ملچەملچ دەجووڵاندەوە.

لیزاوتا پترۆڤنا گوتی: زۆر منداڵێکی جوانە!

لەڤین هەناسەیەکی تاڵی هەڵکێشا. ئەو کۆرپەڵە جوانە بێجگە لە بەزەیی و بێزاری هیچ هەستێکی تری لە دڵیدا نەدەبزواند. ئەوەش قەت ئەو هەستە نەبوو کە چاوەڕوانیی دەکرد لە دڵیدا سەرهەڵبدات.

لەگەڵ ئەوەی لیزاوتا پترۆڤنا منداڵەکەی دەخستە بەر ئەو مەمکانەی کە تازە بوو بەلایەوە، لەڤین رووی وەرگێڕا.

لە ناکاو قاقای پێکەنینێك سەرنجی راکێشا. کیتی بوو پێدەکەنی. منداڵەکە مەمکی دەگرت.

لیزاوتا پترۆڤنا گوتی: چاکە، بەسە، ئیتر بمدەرەوە ـ بەڵام کیتی کۆرپەکەی بەرنەدەدا. منداڵەکە لە باوەشیدا خەوی لێکەوتبوو.

کیتی منداڵەکەی بۆ لای لەڤین سووڕاند بۆئەوەی دەموچاوی ببینێ و گوتی: ئێستا چاوی لێبکە!ـ دەموچاوی کۆرپەڵەکە کە بەو چرچولۆچانەوە لە دەموچاوی پیر دەچوو بە توندی رێك گوشرابوو. زۆر بە ئارامی پشمی.

لەڤین زەردەیەکی گرت و پێشی بە داوەرینی فرمێسکی خۆشەویستی خۆی گرت یان نەگرت لە دیوەکە چووەدەرێ.

هەستێك کە سەبارەت بەو بوونەوەرە گچکە و بەستەزمانە لە دڵیدا بوو، قەت ئەوە نەبوو واچاوەڕوانی دەکرد. ئەو هەستە شوێنەواری شادی و نەشەی پێوە دیارنەبوو، بە پێچەوانە، ترسێکی پڕئازاری تازە لەوێدا خۆی حەشار دابوو. ئاگاداربوون لەوەی کە لە ژیانیدا شوێنێکی هەستیار و ناسك وەدی هاتووە. ئەو ئاگاداربوونەش لە سەرەتادا هێندە تاڵ و بەژان بوو و ترسی ئەوەش کە ئەو بوونەوەرە بەستەزمانە ئازار بکێشێ هێندە زۆر بوو کە شادییەکانی پووچەڵ دەکردەوە و تەنانەت غوروری باوکانەشی ئەو کاتەی منداڵەکە پشمیبوو لە پشت خۆیدا حەشار دابوو.

## حەڤدە

ستیپان ئارکادیچ بارودۆخیماڵیی زۆر لە کزیی دابوو و ئاهی بە بەرەوە نەمابوو. دوو لە سێی پارەی لێڕەوارەکەی وەرگرتبوو و هیچی بە دەستەوە نەمابوو. دەکرێ بڵێین بەشی سێهەمیشی بە سووتی دە لە سەد شینخۆر کردبوو، بەجۆرێك کە لەویش هیچی بۆ نەمابۆوە. ئەو بازرگانەی کە لێڕەوارەکەی لێکڕیبوو ئیتر پارەی پێنەدەدا، بەتایبەت ئەوەیکە داریا ئەلکساندرۆڤنا بۆ یەکەم جار و راشکاوانە داوای مافی خاوەندارییەتیی خۆی دەکرد و حازر نەبوو پسوولەی وەرگرتنی پارەی سێهەم بەشە کە واژۆ بکات. تەواوی مووچەی مانگانەکەی بۆ خەرجی رۆژانەی بنەماڵە و دانەوەی قەرزوقۆڵەکان تەرخان دەکرا و هیچ پارەیەکی تریان بە دەستەوە نەمابوو.

ئەم بارودۆخە بە بڕوای ستیپان ئارکادیچ زۆر ناخوش بوو و ئابڕووی خۆی لە مەترسیدا دەدی و نەیدەتوانی ئاوا درێژە بە ژیان بدات. هۆی ئەو کێشەیەش بە بڕوای ئەو تەنیا ئەمەبوو کە دەرماڵەی مانگانەکەی بە خەرجەکانی رانەدەگەیشت. پلەوپایەی ئیدارییەکەی پێنج ساڵ لەمەوبەر زۆر باش بوو بەڵام ئێستا ئیتر شایانی نەبوو. پترۆڤ، کە کارگێڕی بانگ بوو، مووچەی ساڵانەی دوازدە هەزار رۆبڵ بوو، سڤینتیتسکی کە ئەندامی وەڤدی بەڕێوەبەرایەتیی شەریکەیەك بوو حەڤدە هەزار رۆبڵی وەردەگرت و داهاتی میتین، دامەزرێنەری بانك، پەنجا

هەزار رۆبڵ بوو. ستیپان ئارکادیچ بە خۆی دەگوت «دیارە، من خۆم خەو دایگرتبووم و خەڵکیش لە بیریان بردوومەوە.» ئەوەبوو کە وەخۆ هاتەوە و وریا و چاوکراوە هەوڵیدا و لە کۆتاییی زستاندا پیشەیەکی باشی پەیدا کرد و بۆ وەدەستهێنانی ئەو پلەوپایەیە قۆڵی هەڵماڵی. سەرەتا لە مۆسکۆ لەلایەن پوور و خاڵ و دۆستانەوە و پاشان کە بوارەکە رەخسا خۆی لە بەهاردا چوو بۆ پترزبۆرگ. ئەو شوێنە تازەیە یەکێك لەو پلەوپایە تایبەتانە بوو کە تازە داهاتبوو و جیاوازیی دەرماڵەکەی لە هەزارەوە تا پەنجا هەزار رۆبڵ لە ساڵدا بوو و زۆریش پڕ داهاتتر لە پلەوپایە نان و ئاودارەکان بوو. ئەم پلەوپایەش بریتی بوو لە ئەندامەتیی کومیسیۆنی هاوبەشی هەماهەنگیی قەرز و داراییەکانی شەریکەی هێڵاسن و بانکەکانی باشوور، وەك پلەوپایە هاوشێوەکانی پێویستی بە زانیاری و تواناییی چالاکییەکی زۆر مەزن هەبوو کە کۆبوونەوەی لە کەسێکدا زۆر دژوار بوو، چونکە کەسێك کە هۆگری هەموو ئەو مەرجانە بێت پەیدا نەدەبوو و بە باشیان دەزانی کە خاوەنی ئەو پلەوپایەیە ئەگەر لێهاتوویی فەننیی پێویستی نەبێت لانیکەم کەسێکی شەریف و راست و دروست بێت و ستیپان ئارکادیچ نەك هەر کەسێکی شەرافەتمەند بوو بەڵکوو لەو کەسانەش بوو کە زۆر شیاوی متمانە بوو و ئەو شەرافەت و متمانەیەش کە لە مۆسکۆ جەختی لەسەر کرابوو مانایەکی تایبەتی هەبوو و بە فەرمانبەر یان نووسەر یا رۆژنامە یان رێکخراوەیەك دەدرا کە لە رابردوودا خاوەن شەرافەت و متمانە و بڕوا بووبێتن و بەپێی پێویست لە هەمبەر دەوڵەتیشدا قایمکاری وەلابنێن و رەخنەی لێبگرن یان هێرشی بکەنە سەر. ئەم لێکدانەوەیەی شەرافەت و متمانە لەو کۆڕانەدا کە ستیپان ئارکادیچ بەشداریی تێدا دەکرد بە چاوی رێزەوە تێیان دەڕوانی و ستیپان ئارکادیچ هەر بەو هۆیە خۆی بە شەریف دەزانی و خۆی لە هەمووان زیاتر بە شایانی ئەو پلەوپایەیە دەهێنایە ئەژمار.

ئەم پلەیە ساڵانە لەنێوان حەوت هەتا دە هەزار رۆبڵ دەرماڵەکەی بوو و ئابلۆنسکی دەیتوانی بەبێ لاگری لە کاری دەوڵەت ئەوە وەدەست بێنێ. بۆ وەدەستهێنانی ئەو پلەیە رەزایەتی دوو وەزیر و خاتوونێك و دوو بازرگانی جوولەکە پێویست بوو. ئەو کەسانە ئەگەرچی لەلایەن خزمان و دۆستانی دەستڕۆیشتووەوە پێشتر قسەیان لەگەڵ کرابوو و ئامادەبوون، پێویست بوو ستیپان ئارکادیچ خۆشی لە پترزبۆرگ چاوی پێیان بکەوێ. جگە لەوەش بەڵێنی بە خوشکی دابوو کە سەبارەت بە تەڵاقەکەی وەڵامی مسۆگەر لە کارنین وەرگرێ. پەنجا رۆبڵی لە دالی وەرگرت و رۆیشت بۆ پترزبۆرگ.

ستیپان ئارکادیچ لە نووسینگەکەی کارنین دانیشتبوو و گوێی بۆ پێشنووسی راپۆرتێك راگرتبوو کە کارنین سەبارەت بە هۆکاری خراپیی باری ماڵیی رووسیا دەیخوێندەوە و چاوەڕوانی کۆتاییهاتنی خوێندنەوەی راپۆرتەکە بوو تاکوو سەبارەت بە کارەکەی خۆی و داخوازیی خوشکی قسەی لەگەڵ بکات. کاتێك ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ خوێندنەوەی راپۆرتەکەی تەواوکرد و چاویلکە پێنسییەکەی لە چاوی داکەند کە بەبێ ئەو ئیتر نەیدەتوانی هیچ شتێك بخوێنێتەوە و بە چاوێکی پرسیاراوی لە ژنبرای پێشووی خۆی روانی، ئابلۆنسکی گوتی: بەڵێ، بەڕاستی وایە و لەو بارەوە گومانی تێدا نییە. کێشەکە لێرەدایە کە لە سەردەمی ئێمەدا ئەوەی گرینگە و دەبێ وەك مەسەلەی سەرەکی چاوی لێبکرێ بنەمای ئازادییە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: ئەوە وایە، بەڵام من ئەسڵێکی تر دێنمە گۆڕێ کە گشتیترە و دەبێتە داگری بنەمای ئازادی ـ کە ئەوەی گوت جەختی لەسەر وشەی «داگری» کرد و دیسان چاوێلکەکەی لە چاو کردەوە تاکوو بەشێکی دیکە لە نووسراوەکەی کە ئەو مەبەستەی تێدا بەیان کرابوو دیسان بۆ ئابلۆنسکیی خوێندەوە.

دەستنووسەکەی کە بە خەتێکی خۆش و پەراوێزی پان لە دوولاوە نووسرابوو دیسان پێیدا هاتەوە و بەشێکی کە پێوەندیی بەو بابەتەوە هەبوو دیسان خوێندیەوە.

لە سەرووی چاویلکەکەیەوە لە ستیپان ئارکادیچی روانی و گوتی: من سیستەمی پشتیوانیکارم نەك بۆ دەستەبەرکردنی قازانجی کەسانی تایبەت بەڵکوو بۆ دابینکردنی بەرژەوەندیی کۆمەڵگا دەوێ، یانی لەبەرچاوگرتنی بەرانبەری لەنێوان تەلاسی چینە پاییندەستەکان و باڵادەستەکان. بەڵام **ئەوان** ناتوانن لەوە بگەن، **ئەوان** تەنیا بیر لە قازانجی تاکەکەسیی خۆیان دەکەنەوە و ئەوەی رایاندەکێشێ بۆ لای خۆی قسەی زل و کەڵەکەڵەیە.

ستیپان ئارکادیچ دەیزانی کاتێك کارنین هاتە سەر شرۆڤەکردنی شێوەی بیرکردنەوە و کاری **ئەوان** ـ ئەو ئەوانەش کەسانێك بوون کە دژایەتییان لەگەڵ گەڵاڵەکانی ئەو دەکرد و هۆکاری هەموو بشێوییەکانی رووسیا ئەوان بوون ـ ئیتر کۆتاییی کارە. هەر بەو هۆیەش زۆر تاسەمەندانە بەرەڤانی لە بنەمای ئازادیی وەلانا و بە تەواوی نیشانیدا کە هەق بە ئەوە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بێدەنگ بوو و خەیاڵ هەڵیگرت و دەستیکرد بە هەڵدانەوەی لاپەڕەی دەستنووسەکەی.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: هاوڕێ راستت دەوێ دەمویست لەو دەرفەتە کەڵك وەرگرم و تکایەکت لێبکەم کە کاتێك چاوت بە پامۆرسکی کەوت پێیبڵێی هۆشێکی پێمانەوە بێت و رایسپێرە با یارمەتییەکم بدات، پێشی بڵێ کە زۆر حەزدەکەم شوێنێك کە لە کومیسیۆنی

هاوبەشی هەماهەنگیی قەرز و داراییەکانی شەریکەی هێلاسن و بانکەکانی باشوور خاڵی دەبێ، بێدەن بە من.

ستیپان ئارکادیچ زۆری دڵ بەوکارەوە بوو و زمانی بۆ دەربڕینی ئەو سەرناوە دوور و درێژە تەتەڵەی نەدەکرد و زۆر خێرا و بەبێ هەڵە دەریدەبڕی.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ پرسیی کاری ئەو کومیسیۆنە تازەیە چییە و خەیاڵ هەڵیگرت. لە بیری ئەوەدا بوو کە نەوەك چالاکییەکانی ئەم کومیسیۆنە لەگەڵ گەلاڵەکانی ئەو ناسازگار بێ. بەڵام بەوەدا کە چالاکییەکانی ئەو رێکخراوە نوێیە زۆر پێچەڵاوپووچ و ئالۆز بوو و گەلاڵەکانیشی زۆر گەورە و بەربڵاو بوون و زۆری چالاکیی جۆراوجۆر لەخۆ دەگرت، نەیدەتوانی خێرا بە ئاکام بگات و چاویلکەکەی لە چاوی داکەند و گوتی:

ـ بەڵێ دەتوانم هەوڵێکت بۆ بدەم. بەڵام بۆ دەتهەوێ ئەو پلەیەت هەبێ؟

ـ مووچەکەی زۆر باشە. نزیکەی نۆ هەزار رۆبڵە و منیش دەستو باڵم...

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دووپاتی کردەوە: نۆ هەزار رۆبڵ! ـ نێوچاوانی گرژ بوو.

ڕادەی بەرچاوی مووچەی ئەو ئیشەی وەبیرهاتەوە و ئەم پلەیەی کە ستیپان ئارکادیچ دەیویست وەدەستی بێنێ لەو روانگەیەوە لەگەڵ رۆحی سەرەکیی گەلاڵەکانی ئەو ناسازگاری هەبوو کە هەمیشە گرنگیی بە دەستپێوگرتن دەدا و دژی هەڵەخەرجی بوو.

ـ من لەسەر ئەو باوەڕەم و لەو بارەوە وتارێکم نووسیوە کە ئەو مووچە زۆر و زەوەندەی ئێستا بە کارگێڕان و فەرمانبەران دەدرێ نیشاندەری **سیاسەتی** ئابووریی حکوومەتی ئیمەیە.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: دەیباشە، چارە چییە؟ وایدانێ کارگێڕی بانك دەهەزار رۆبڵ مووچە وەردەگرێ و کارەکەی بایەخی ئەو مووچەیەی هەیە. یان بۆ وێنە فلان ئەندازیار بیست هەزار رۆبڵ مووچە وەردەگرێ. ئەمانە ئەو کارانە نین کە هەموو کەس بتوانێ بەڕێوەیان بێنێ. دەیباشە دەبێ چیبکرێ؟

من لەسەر ئەو باوەڕەم کە مووچە، نرخی کالایە (کالاش لەو بوارەدا کارمەندە) و دەبێ سەر لە پێناوی یاسای نواندن و داخوازی بێت. بەڵام دیاریکردنی مووچە بەپێی ئەم یاسایە سەرناگرێ، هەروەك دەبینین دوو ئەندازیار، کە هەردووکیان لە یەك زانکۆ بڕوانامەیان وەرگرتووە و زانیاری و لێهاتووییەکەیان یەکسانە، یەکیان چل هەزار رۆبڵ مووچە وەردەگرێ و ئەوی دیکەیان دەبێ بە دوو هەزار رۆبڵ قەناعەت بکات، یان دەبینین کە مافناسێك یان ئەفسەرێکی سوارەنیزام کە هیچ چەشنە پسپۆڕییەکیان لە کاروباری بانك و ژمێریاریدا نییە بە

مووچەی زۆر و زەوەندەوە دەبنە ئەندامی وەڤدی کارگێڕی فلان بانك، دیارە مووچەی ئەو کەسانە نە بەپێی یاسای نواندن و داخوازی بەڵکوو لە رووی بۆنە و پێوەندییە تایبەتەکانەوە دیاری دەکرێ، ئەوەش خۆی لە خۆیدا کارێکی نادروست و مەترسیدارە و بۆ چۆنێتیی خزمەتی دەوڵەت زۆر و وەزندارە. من پێموایە...

ستیپان ئارکادیچ بەپەلە پەڕییە نێو قسەی مێردی خوشکەکەی خۆی و گوتی: بەڵام خۆ ئەوەت قەبووڵە کاتێك رێکخراوەیەکی نوێ کە بە کەڵکبوونەکەی گومانی لەسەر نییە دادەمەزرێ، بتەوێ و نەتەوێ کارەکەی هەمووی هەوڵ و پێداگرییە و هەڵبەت بناغەدانەرانی ئەو دایرەیە زۆر هۆگری ئەوەن کە کاری بەڕێوەبەرایەتیی ئەو رێکخراوەیە بە دروستی و حیسابی بەڕێوەبچێ ـ جەختیشی لەسەر وشەی «دروست و حیسابی» کردەوە.

بەڵام ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لەگەڵ لێکدانەوەی مۆسکۆیی ئەم وشەیە ئاشنا نەبوو.

گوتی: «دروست و حیسابی» بەس نییە. دروستی ئاوەڵناوێکە کە چلۆنایەتیی ئەرێنی لە ژێر چاوەدێریی ئەودایە.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: چاکە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر کاتی ئاخافتن لەلای پامۆرسکی تکایەکمان بۆ بکەی منەتێکی گەورەت خستۆتە سەرشانم.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: بەڵام ئەو کارە زیاتر پێوەندیی بە بالگارینۆڤەوە هەیە.

ستیپان ئارکادیچ تۆزێ سوورهەڵگەڕا و گوتی: بالگارینۆڤ بە نۆرەی خۆی تەواو رەزایەتی لەسەرە.

هۆی سوورهەڵگەڕانی ستیپان ئارکادیچ بە بیستنی ناوی بالگارینۆڤ ئەمەبوو کە هەر ئەو رۆژە بەیانی چووبوو بۆ سەردانی ئەو جوولەکەیە و چاوپێکەوتنەکەی شوێنێکی ناخۆشی لەسەر دڵی بەجێ هیشتبوو. ستیپان ئارکادیچ لێی روون بوو ئەم کارەی کە دەیویست لە ئەستۆی بگرێ کارێکی تازەیە و هەوڵێکی زیاترە لە رادەی ئاسایی و راست و دروستی لەودا گرنگایەتییەکی زۆری هەیە. بەڵام ئەو رۆژە بەیانی کە بالگارینۆڤ، دیاربوو بە ئانقەست، ئەوی دوو سەعاتی تەواو لەنێو کارهێنەرەکانی تردا لە ژووری چاوەڕوانیی خۆی راگرتبوو، زۆری لە دڵ گران هاتبوو.

هۆی دڵگرانییەکەشی ئەمەبوو کە ئەو، پرێنس ئابلۆنسکی، کە خۆی بە تۆرەمەی ریوریکی مەزن دەزانی، ناچاربووبوو، کە دوو سەعات چاوەڕوانی بێ و تاکوو سەرمایەدارێکی جوولەکە وەریگرێ، یان ئەوەی یەکەم جار لە تەمەنی خۆیدا لە رێگای پێشینیانی خۆی کلا

بووبوو و دەیویست خزمەتێك جگە لە خزمەتی دەوڵەت لە ئەستۆ بگرێ؟ هەرچییەك بوو زۆری لە دڵ گران هاتبوو. لە ماوەی ئەو دوو سەعاتە چاوەڕوانییەدا لە تەلارەکەی بالگارینۆڤ بوێرانە پیاسەی دەکرد و دەستی بە ریشی لەسەر گۆناڕسکاوی خۆیدا دەهێنا و رێکوپێکی دەکرد و لەگەڵ کارهێنەرەکانی تر دەدوا و هەوڵی دەدا نەقڵێکی خۆش دروست بکات و بۆ هاوڕێکانی بگێڕێتەوە کە لە هۆڵی چاوەڕوانیی جوولەکەیەك هەوڵی دەدا تاقەتی بەسەر نەچێت و عەیبوعاری خۆی لە خەڵکی و تەنانەت لە خۆی بشارێتەوە.

بەڵام لە تەواوی ئەو ماوەیەدا ناڕەحەت بوو و تەنانەت زۆریش بێتاقەت بوو و خۆشی نەیدەزانی هۆیەکەی چییە. نەیدەزانی هۆیەکەی ئەوەیە کە نەقڵەکەی، کە لەودا جوولەکە و هەوڵ و تاقەت و عەیبوعار زۆر لە دڵ نەدەنیشت، یان هۆیەکی تری هەبوو. بەڵام ئاخری کاتێك بالگارینۆڤ زۆر بە رێز و حورمەتەوە وەریگرت و دیاربوو بەو کارەی و بە دیتنی زەبوونی و سووکیی ئەو هەست بە گەورەیی و سەرکەوتنی خۆی دەکات و دەکرێ بڵێین داواکارییەکەی رەتکردەوە بۆیە ئابلۆنسکی زۆر بەپەلە هەوڵیدا کە ماجەراکە هەرچی زووتر لەبیربەرێتەوە. ئێستاش کە ئەو یادە لە مێشکیدا زیندوو بووبۆوە هەستی بە شەرمەزاری دەکرد.

## هەژدە

ستیپان ئارکادیچ دوای ماوەیەك بێدەنگی تەکانێکی لە خۆیدا و شوێنەواری ناخۆشی تازەبوونەوەی ئەو بیرەوەرییە تاڵەی لە دڵی خۆیدا لێکدایەوە و گوتی: ئێستا کارێکی دیکەشم هەیە و تۆ دەزانی چ کارێکە و پێوەندیی بە ئاناوە هەیە.

ڕوخساری ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە بیستنی ناوی ئانا هەڵبزڕکا و گرژ بوو و شۆروحاڵی پێشووی جێگای خۆیدا بە شەکەتییەکی مەرگاوی.

لەسەر کورسییەکەی تۆزێ سووڕا و چاویلکە پێنسییەکەی خۆی نایەوە نێو قوتووەکەی و بە توندی دایخست و پرسیی: ئیتر چیت لە من دەوێ؟

ـ بڕیار، ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، ئاخری دەبێ بڕیاربدەی. من نەك وەکوو... (دەیویست بڵێ نەك وەکوو مێردێکی دڵشکاو، بەڵام ترسا بەو قسەیە کارەکە خراپ بکات و قسەکەی خۆی گۆڕی و درێژەی پێدا:)... پیاوی دەوڵەت (کە ئەمەش سەرناوێکی بەجێ نەبوو) بەڵکوو

وەکوو مرۆڤێکی باش و خاوەنکەرم و مەسیحییەکی ئیمانپاك لە تۆ دەڕوانم و هانام بۆ هێناوی. تۆ دەبێ روحمی پێبکەی و بەزەییت پێیدا بێ.

کارنین لەسەرەخۆ گوتی: مەبەستت چییە؟ روونتر قسە بکە.

ـ بەڵێ، دەبێ روحمی پێبکەی. ئەگەر تۆ ئەوت وەك من بدیبایە، ... (من ئەم زستانەم لەگەڵ ئەو رابواردووە)... دڵت پێیدەسووتا و نەرم دەبووی. کەوتۆتە بارودۆخێکی پڕمەترسییەوە، تووشی رۆژەڕەشی بووە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، تۆ خودا دەست لە (من چیمکرد و ئەو چییکرد) هەڵگرە. ئەوەی چوو چوو و تۆ دەزانی کە ئەو چییدەوێت و چاوەڕوانی چییە. ئەو داوای تەڵاق دەکات.

کارنین هەر بەو دەنگە گوێ ئازاردەرەی وەڵامیدایەوە: بەڵام پێم وابوو ئانا ئارکادیۆڤنا ئەگەر من پێداگری لەسەر ئەوە بکەم کوڕەکەم لەلای من بێت تەڵاقم لێوەرناگرێ. من لەسەر ئەو بنەمایە وەڵامم دایەوە و کارەکەم کۆتایی پێهێنا. کێشەکەش لە روانگەی منەوە تەواوبووە.

ـ تۆ خودا تووڕە مەبە ـ ستیپان ئارکادیچ کە ئەو قسەیەی دەکرد دەستی لەسەر چۆکی کارنین دانا: کارەکە کۆتایی پێنەهاتووە. ئەگەر ئیجازە بدەی من ئەوەی رابردووە وەبیرتی دەهێنمەوە. ماجەراکەش بەو شێوەیە بوو: کاتێك ئێوە لە یەکتر جیا بوونەوە تۆ گەورەییت نواند و گەورەییش لەوە باڵاتر نەدەبوو، تۆ بەو کەرەم و دڵفراوانییەی خۆت شەرمەزارت کرد، ئازادتت کرد و تەنانەت رازی بووی تەڵاقیشی بدەی. ئەویش رێزی ئەو کەرەمەی تۆی لەبەرە، بەڵێ، گومانت نەبێ، بەڕاستی دەرهەق بە تۆ ئەمەگناس بوو. لەبەر تۆ هێندەی ئەو تاوانەی خۆی بە قورس دەزانی و بە رادەیەکیش لە تۆ شەرمەزار بوو کە سەرەتا لە بیری هیچدا نەبوو، نەیدەتوانی بیر لە هەموو لایەنەکانی ئەو کێشەیە بکاتەوە و چاوپۆشیی لە هەموو شتێك بکات. بەڵام راستییەکان و تێپەڕینی زەمان نیشانیدا کە لە بارودۆخێکی تاڵ و بەژاندا پەلەقاژەیەتی و درێژەپێدانی ئەم بارودۆخە مەحاڵە بوێ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ برۆی هەڵێنا و گوتی: ژیانی ئانا ئارکادیۆڤنا بە هەرشێوە و چۆنایەتییەك بێت من کارم بەسەرییەوە نییە.

ستیپان ئارکادیچ بە نەرمی وەڵامیدایەوە: ئیجازە بدە با بڕوا بەو قسەیەی تۆ بکەم. بارودۆخی ژیان نەك هەر بۆخۆی تاڵ و پڕئازارە و ئەشکەنجەیەکی هەمیشەییە بەڵکوو قازانجی بۆ هیچ کەسی تریش نییە. تۆ دەڵێی ئەو تاوانبارە. ئەو خۆشی لەو تاوانە ئاگادارە و هیچی لە تۆ ناوێ. بەڵام من،

ئێمە کەسوکارەکانی ئەو و ئەو کەسانەی کەخۆشیان دەوێ داوا لە تۆ دەکەین و تکات لێدەکەین. ئەو ژنە فەقیرە بۆ ئەوندە ئازار بکێشێ؟ ئەم ئازارە قازانجی بۆ کێ هەیە؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: ئیجازە بدە، ئێوە وادیارە من بە تاوانبار دەزانن.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: نا نا، قەت وانییە، مەبەستەکەی من ئاوا لێکمەدەوە! ـ کە ئەوەی گوت دیسان دەستی لەسەر دەستی دانا. دەتگوت خاترجەمە کە ئەم وێکەوتنەی دەستی دەبێتە هۆی نەرمبوونی دڵی مێردەکەی خوشکی. من تەنیا شتێك دەڵێم: ژیانی ئەو ئەشکەنجەیەکی هەمیشەییە و تەنیا تۆی کە دەتوانی لەو ئازار و ئەشکەنجەیە رزگاری بکەی و بۆ تۆ هیچیشی تێناچێ. من کارەکان جۆرێك رێکدەخەم کە خۆشت نەزانی. تۆ مەگین خۆت بەڵێنت نەدا؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە رەنگێکی پەڕیو و لێوی لەرزۆکەوە گوتی: بەڵێن ئیتر بەسەرچوو. من پێم وابوو مەسەلەی کوڕەکەم کارەکەی یەکلایی کردۆتەوە. جگە لەوەش هیوادارbووم ئانا ئارکادیۆڤنا ئەوەندە گەورەیی...

ـ ئەو هەموو شتێکی بۆ گەورەیی تۆ هێشتۆتەوە. ئەو تەنیا شتێکی دەوێ و تکات لێدەکات کە لەو رۆژە رەشییەی ئێستای رزگار بکەی. ئەو ئیتر مافی خاوەندارێتیی کوڕەکەشی ناوێ. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، تۆ مرۆڤێکی دڵپاکی، هەوڵ بدە ساتێك خۆت لە جێی ئەو دانێی. تەڵاق لەم دۆخەی ئێستای ژیانیدا مەسەلەی مەرگ و ژیانە. ئەگەر بەڵێنی تەڵاقت پێنەدایە لەگەڵ ئەم دۆخەی ئێستای رادەهات و لە گوند دەمایەوە. بەڵام تۆ بەڵێنیت پێداوە و ئەو نامەی بۆ تۆی نووسی و ئێستاش هاتووە بۆ مۆسکۆ و ماوەی شەش مانگە لە مۆسکۆیە و لەوێ دیداری هەر ناسیاوێك خەنجەرێکە و لەسەر دڵی دەچەقێ و شەو و رۆژی بە هیوای تەڵاق تێپەڕ دەکات. بەڵام ئاخر ئەم بارودۆخە راست وەك ئەوە وایە کە مەحکووم بە مەرگێك چەندین مانگ لە ژێر سێدارەدا و پەت لە ئەستۆ راگری و چاوەڕوانی بەخشین بێت. روحمی پێبکە و من کارەکان وا راستەوپاستە دەکەم کە ئەو ***پارێزکردنەی ئێوە***...

کارنین بە بێزارییەوە گوتی: من باسی ئەوە.... ئەوە... بەڵام رەنگە بەڵێنێکم دابێ کە مافی دانەکەیم نەبووبێ...

ـ کەوایە لە قسەکەی خۆت پاشگەز بوویەتەوە؟

ـ من قەت لە کارێکی باش و گونجاو پاشگەز نابمەوە. بەڵام دەبێ مسەبایەکم لێبگرن بزانم ئەو بەڵێنەی داومە بە کوێ دەگا و چۆنم بۆ دەلوێ.

ستیپان ئارکادیچ هەستایە سەرپێ و گوتی: نا، ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، من ناتوانم بڕوا بەو قسەیەی تۆ بکەم. ئەو هێندە داماوە کە هیچ ژنێکی تر ناتوانێ لە بارودۆخێکی ئاوادا تاقەت بێنێ. تۆ ناتوانی دەرهەق بە ئەو ئاوا دڵڕەق بێ.

ـ هەتا ئەو جێیەی بۆم بلوێ... ***ئێوە خۆتان بە ڕووناکبیر و ئازادیخواز دەزانن***، بەڵام پیاوێکی ئیماندارم و لە کارێکی ئاوا گرینگ و پڕمەترسیدا ناتوانم بە پێچەوانەی یاسای مەسیحییەت بجووڵێمەوە.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: بەڵام هەتا ئەو جێیەی من دەیزانم لە کۆمەڵگای مەسیحیدا، تەنانەت لەنێو ئێمە ئورتۆدۆکسەکاندا، تەڵاق کارێکی ڕەوایە. تەنانەت کلیسای ئێمە ڕێگای بە تەڵاق داوە و ئێمە دەزانین کە...

ـ تەڵاق ڕێگای پێدراوە بەڵام نەك بەو شێوەیە...

ئابلۆنسکی دوای گتگرتنێك گوتی: ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، تۆ زۆر گۆڕاوی! تۆ نەبووی لە هەموو تاوانەکانی خۆش بووی (ئێمەش چەندەمان ڕێزی ئەو کارەی تۆ لەبەرچاو بوو!) و ڕاست بە هۆی ئەو ئەشقەی مەسیحییەتەوە بوو کە ئامادەبووی هەموو شتێك فیدا بکەی؟ تۆ خۆت گوتت کاتێك عەباکەت لێدەستێنن کەواکەشتیان پێبدە؟ ئێستاش...

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە ناکاو هەستا و بە ڕەنگی بزرکاو و شەویلاکەی لەرزۆکەوە بە دەنگێکی جیکن و گوێئازاردەر گوتی: تکات لێدەکەم... تکات لێدەکەم کۆتایی بەو باسە بێنە... کۆتاییی پێبێنە...

ستیپان ئارکادیچ دەستی بۆ لای کارنین بردەپێشێ و بە بزەیەکەوە کە شەرمەزاریی پێوە دیاربوو گوتی: نا، نا، ببوورە، ئەگەر بوومەتە هۆی دڵگرانیت داوای لێبوردن دەکەم. هەرچی بێ من تەنیا ڕاسپاردە بووم و پەیامێکم بۆ هێنابووی و ئەرکی خۆم بەجێ هێنا و ڕاسپاردەکەم گەیاند.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەستی ئابلۆنسکیی گوشی و تۆزێ خەیاڵ هەڵیگرت و گوتی: باشە لەوبارەوە بیری لێدەکەمەوە و ڕێنوێنی وەردەگرم، دووسبەی وەڵامی خاترجەمیت پێدەدەمەوە.

# نۆزدە

ستیپان ئارکادیچ دەیویست بڕوات کە کارنی، پێشخزمەتی کارنین هاتەژووریٚ و رایگەیاند: سرگی ئەلکسیڤیچ.

ستیپان ئارکادیچ لە ژێر لێوەوە گوتی: ئەم سرگی ئەلکسیڤیچە دەبیٚ کێبیٚ؟

بەڵام خێرا وەبیری هاتەوە و گوتی: ئەها، سریۆژا! کاتێك گوتی سرگی ئەلکسیڤیچ، پێم وابوو کارگێڕی گشتیی وەزەرتخانەیەکە هاتووە.

بەخۆی گوت «ئانا داوای لێکردبووم کە چاوم بە سریۆژا بکەویٚ.»

شەرمنی و حاڵی بەزەییبزوێنی ئانا کە کاتی خوداحافیزی پێیگوتبوو «هەرچۆنێکە سریۆژا ببینە. جوان لێیبکۆڵەوە بزانە لەکوێیە و کێپەرستاریی لێدەکات و... ستیڤا... ئەگەر بلویٚ... بەڵام یانی دەکریٚ، دەگونجیٚ؟» ستیپان ئارکادیچ تێگەیشت کە مەبەستی خوشکی لەم «ئەگەر بلویٚ»یە چبوو. لەگەڵ ئەوەشدا بە دیتنی خوشکەزاکەی گەشایەوە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ژنبراکەی حاڵیکرد کە هیچ کەس هەقی نییە سەبارەت بە دایکی قسە لەگەڵ سریۆژا بکات و داوای لێکرد تەنانەت یەك وشەش لەلای ئەو باسی ئانا نەکات.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: دوای ئەو دیدارە چاوەڕواننەکراوە لەگەڵ دایکی، تووشی نەخۆشییەکی قورس بوو. نەخوشییەکەشی هێندە قورس بوو کە تەنانەت دەترسام گیانی لە مەترسیدا بیٚ. بەڵام ماریجەی ئاقڵانە و مەلەکردن لە قەراغ دەریا لە هاویندا لەشساغییەکەی بۆ گێڕایەوە و من ئێستا بەپێی راسپاردەی دوکتۆرەکان ناردوومە بۆ قوتابخانە. بەڕاستی هەڵسوکەوت لەگەڵ هاوڕێیانی قوتابخانە شوێنێکی باشی لەسەر داناوە و ئێستا زۆر ساغ و سلامەتە و بە باشی وانەکانی دەخوێنیٚ.

ستیپان ئارکادیچ چاوی لە مێرمنداڵێکی جوان و سینگ و بەرۆك پان کرد کە کۆتێکی کەهووی لەبەردا بوو و پانتۆڵێکی درێژی لە پێدا بە گورجی و بەبیٚ شەرمکردن هاتەژووریٚ و بە پێکەنینەوە گوتی: بەە، بەە، لەو شێرە کوڕە! راست دەکات ئەمە ئیتر

سریۆژا نییه، سرگی ئەلکسیڤیچەـ مێرمنداڵێکی لەشساغ و بەنەشە بوو. بە نەزاکەتێکی نەناسیاوانەوە کڕنۆشێکی بۆ خاڵی برد بەڵام کە ناسییەوە سوورهەڵگەڕا و وەك ئەوەی لە شتێك زویربووبێ و رقی هەستابێ خێرا رووی وەرگێڕا. چوو بۆ لای باوکی و لیستەی نمرەکانی قوتابخانەی پێشاندا.

باوکی گوتی: زۆر چاکە، دەتوانی بڕۆی.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: تۆزێ کز بووە و باڵای کردووە. ئیتر منداڵ نییە، گەنجێکە بۆخۆی. چاوم پێی روون بۆوە. تۆ من دەناسییەوە؟

کوڕە بەپەلە چاوێکی لە باوکی کرد. پاشان رووی لە خاڵی کرد و گوتی: بەڵێ ***خاڵەگیان*** دەتناسم ـ دیسان سەری داخستەوە.

خاڵی بانگی کرد بۆ لای خۆی و دەستی گرت. دەیویست قسەی لەگەڵ بکات، بەڵام چونکە نەیدەزانی چیی پێبڵێ گوتی: دەی، چ دەکەی؟

کوڕە سوورهەڵگەڕا و وەڵامی نەدایەوە و بە پارێزەوە دەستی خۆی لە دەستی خاڵی دەرکێشا. ستیپان ئارکادیچ هەر دەستی بەردا کوڕە چاوێکی پرسیاراویی لە باوکی کرد و وەك مەلێك کە لە رکە دەربازبووبێ بە هەنگاوی توند و خێرا لە ژوورەکە دەرپەڕی.

لەو رۆژەوە کە سریۆژا چاوی بە دایکی کەوتبوو ساڵێك تێپەڕیبوو. لەو رۆژەوە تا ئەمڕۆ ئیتر هیچ هەواڵێکی لە دایکی نەبوو. هەر لەم ساڵەدا بوو کە چووبوو بۆ قوتابخانە و لەگەڵ هاوپۆلەکانی بووبووە هاوڕێ. خولیا و بیرەوەرییەکانی دایکی کە دوای ئەو دیدارە بووبووە هۆی نەخۆشینی ئیتر ئەویان بە خۆیانەوە خەریك نەدەکرد و هەر لەگەڵ وەبیری دەهاتەوە هەوڵی دەدا لە مێشکی خۆی وەدەریان بنێ، چونکە هەستی بە شەرمەزاری دەکرد و ئەو جۆرە هەستانەی بە سزاواری کچان دەزانی و پێی وابوو بۆ کوڕێك شوورەییە. دەیزانی ناکۆکی لەنێوان دایکی و باوکیدا بووە کە بۆتە هۆی لێکجودا بوونەوەیان. دەیزانی بڕیارە ئەو لەلای باوکی بمێنێتەوە و هەوڵی دەدا خۆی لەگەڵ ئەو بارودۆخە رابێنێ.

چاوپێکەوتنی خاڵی کە زۆری شێوەی دایکی دەدا پێی خۆش نەبوو، چونکە راست ئەو بیرەوەرییەی لە مێشکیدا زیندوو دەکردەوە کە ئەو بەلایەوە شوورەیی بوو. ئەو چاوپێکەوتنەی زیاتر بەو هۆیەوە حەزی پێنەدەکرد چونکە لە پشت دەرگاکەوە چەند وشەی گوێ لێبووبوو، کاتێك چاوەڕوانی هاتنەژوورێی ئەو بوون، بەتایبەت بە حاڵەتی روخساری باوکیدا تێگەیشتبوو کە باسی دایکی دەکەن، نەیدەویست باوکی تاوانبار بکات، چونکە لە ماڵەکەی ئەو دەژیا و خووی بە ئەو

گرتبوو، هەروەها نەشیدەویست خۆی بداتە دەست هەستی خۆی، چونکە ئەو کارەی بۆ پیاو بە شوورەیی دەزانی، هەولێدا چاو لە خالّی نەکات کە هاتبوو تاکوو هێمنایەتییەکەی لێبشێوێنێ و ئەوەی ئەو وەبیری دەهێنایەوە گوێی پێنەدەدا و بیری لێنەدەکردەوە.

بەڵام کاتێك ستیپان ئارکادیچ کە دوای ئەو لە نووسینگەکەی کارنین هاتەدەرێ، لەسەر پلیکانەکان بانگی کرد بۆ لای خۆی و لێیپرسی کاتی پشوودان لە مەدرەسە چۆن رادەبوێرێ. سریۆژا کە دوور لە چاوی باوکی بێخەمتر بوو دەستیکرد بە قسەکردن.

لە وەڵامی خاڵێدا گوتی: ئێمە ئێستا یاریی قەتار قەتارێن دەکەین. دەزانی چۆن، ئاوا: دوو کەس دەبنە مسافیر و لەسەر کورسییەك دادەنیشن و کەسێکی تریش هەر لەسەر ئەو کورسییە رادەوەستێ و ئەوانی تر هەموو وەك ئەسپ خۆیانی پێوە دەبەستن. یان بەرِیز دەست بە یەکەوە دەگرن یان بە پشتێنەکەیان خۆیانی پێوە دەبەستن. پاشان هەروا بە نێو هەموو ژوورەکاندا دەگەڕێن. دەرگاکان هەموویان پێشتر دەکرێنەوە، بەڵام بوونە لێخوڕ کارێکی ئاسان نییە.

ستیپان ئارکادیچ بە پێکەنینەوە پرسیی: لێخوڕیش ئەو کەسەیە وا رادەوەستێ؟

ـ بەڵێ، ئەویش دەبێ کەسێکی بەغیرەت بێت و زۆریش گورجو گۆڵ، بەتایبەت کاتێك قەتارەکە کتووپڕ رادەوەستێ یان کەسێك دەکەوێ.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: بەڵێ، گاڵتە نییە! بە چاوانی خەمناکەوە لە چاوە پڕشۆر و گەشەکانی سریۆژای روانی کە راست لە چاوی خوشکی دەچوون و ئیتر ئەو چاوە مەعسووم و منداڵانەیە نەبوون.

ئەگەرچی بەڵێنی بە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دابوو کە باسی دایکی نەکات بەڵام خۆی پێڕانەگیرا.

لە ناکاو گوتی: دایکت لە بیرە؟

سریۆژا سوور و شین هەڵگەڕا و بە توندی گوتی: نا، لە بیرم نییە ـ خێرا سەری داخست و خالّی هەرچیی کرد ئیتر نەیتوانی وەقسەی بێنێ.

نیو سەعات دواتر راهێنەرەکەی لەسەر پلیکانەکان کوڕەی دۆزییەوە و هەتا ماوەیەکی زۆر تێنەگەیشت بێتاقەتە یان دەگری.

گوتی: چیبووە؟ کەوتووی بە زەویدا جێیەکت ئازاری پێگەیشتووە؟ من گوتم ئەوە یارییەکی پڕمەترسییە. دەبێ بە کارگێڕی قوتابخانە راگەیێنین.

ـ ئەگەر جێیەکیشم ئازاری پێبگەیشتبایە هیچ کەس تێنەدەگەیشت، خاترجەم بە.

ـ ئەی چیتە؟

ـ لەکۆڵم بنەوە! لە بیرمە؟ لە بیرمە؟.... بەئەو چی؟ بۆ دەبێ لە بیرم بێ؟ لە کۆڵم بنەوە!

ـ هەڵبەت بەردەنگەکەی راهێنەرەکە نەبوو، ئەو لەدەست هەمووان سکاڵای دەکرد.

## بیست

ستیپان ئارکادیچ وەك هەموو جارێك کە دەهات بۆ پترزبۆرگ بێکار دانەدەنیشت. لەو سەفەرەدا، جگە لەو کارانەی هەیبوو، یانی مەسەلەی تەڵاقی خوشکی و هەوڵ بۆ وەدەستهێنانی ئەو پلەوپایەی کە بەهیوای بوو، دەیویست خۆی گوتەنی دوای تاملکردنی ئەو کرۆکپی و جارِزییەی مۆسکۆ تۆزێ دڵی خۆی مشتومالْ بدات.

مۆسکۆ، سەرەڕای ئەو نادی و بارانەی کە شوێنی سەما و گۆرانی بوون و ئەو پاسانەی کە بە شەقامدا دەگەڕان، زیاتر وەك زەلکاوێکی لیخن دەچوو. ئەمە هەستێك بوو کە ستیپان ئارکادیچ هەمیشە لە مۆسکۆ لە دڵیدا بوو. هەرکاتێك کە ماوەیەکی زۆر و بەردەوام لە مۆسکۆ دەمایەوە کارەکەی بەجێیەك دەگەیشت کە ئاڵەتیبوونی ژنەکەی و پرتە و بۆڵەبۆڵی یان بارودۆخی لەشساغیی منداڵەکان و دەرس و قوتابخانەیان و تەنانەت گیروگرفتە ئیدارییەکانی جارِزی دەکرد و تەنانەت خراپییەکانیشی دەبوونە هۆی ئاڵۆزیی هێمنایەتی و ئاسوودەییی. بەڵام هەرکە دەگەیشتە پترزبۆرگ و ماوەیەك لەوێ دەمایەوە و هاموشۆی ئەو کۆڕ و کۆبوونەوانەی دەکرد کە ژیانی لێبوو، بەڵێ، ژیانی مرۆڤانەی لێبوو، نەك وەکوو مۆسکۆ ژیانی گیایی، ئەم خەفەتانەی هەموویان لەڕێوە وەك مۆمی گوێئاور توانەوە و لەنێوچوون.

ژن؟... هەر ئەمڕۆ لەگەڵ پرێنس چچنسکی باسیان کرد. پرێنس چچنسکی ژن و منداڵی هەبوو. کوڕەکانی گەورە بوون لە دەربار پاژ و ئاجوودان بوون. بەڵام ژنێکی ناشەرعیشی هەبوو و لەویش چەند منداڵی هەبوو. ئەگەرچی بنەماڵەی یەکەمی زۆر باش بوون بەڵام لەو بنەماڵە ناشەرعییەی خۆشتری رادەبوارد و کوڕە گەورەکەی لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ ئەو ماڵە و بە ستیپان ئارکادیچی گوتبوو کە ئەو کارە بۆ گەشەکردنی کوڕەکەی بەکەڵکە. بەڵام ئەگەر شتێکی ئاوات لە مۆسکۆ باس بکردایە بە کێویاندا دەکردی!

منداڵەکان؟ لە پترزبۆرگ منداڵەکان نەدەبوونە ملۆزمی باوکیان. منداڵەکان لە قوتابخانەی شەوانەڕۆژی پەروەردە دەکران و ئەم بیروبڕوا سەیر و سەمەرانە، بۆوێنە وەك بیر و بڕوای لۆوڤ کە لە مۆسکۆ دەنگی دابۆوە و بەوپێیە پێداویستییەکانی ئاسوودەیی و بریقوباقی ژیان هەمووی بۆ منداڵان بوو و ڕەنج و کوێرەوەری هەمووی بۆ دایك و باب، لە پترزبۆرگ جێیان نەبوو. لێرە خەڵك لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە مروڤ ناچارە وەك هەموو خاوەن ژیارێك بۆخۆی بژی.

خزمەت؟ خزمەتی فەرمانگەش لێرە وەك مۆسکۆ بارێکی قورس و پڕ کوێرەوەری و بێخەڵات و بەرات نەبوو کە فەرمانبەر شانی بداتەبەر و لە ژێریدا بناڵێنێ. لێرە فەرمانبەران هۆگر و ئاشقی کاری خۆیانن. لێرە ئەو مرۆڤانەی کە دەیانبینی، خزمەتێکیان پێدەکەی و نەقلێکیان بۆ دەگێڕییەوە، بۆ چارەسەری کێشەکان توانایی لە خۆت نیشان دەدی و هەر ئەوەش بەسە بۆ ئەوەی بە خێرایی گەشە بکەی، وەك بریانتسێڤ[٧٤] کە ستیپان ئارکادیچ ڕۆژی رابردوو دیتبووی و ئێستا لە دەسەڵاتدارە پلە یەکەکان بوو. خزمەت ئەگەر ئاوابێ پیاو هۆگریی پێ پەیدا دەکات.

جگە لەوانە شێوەی هەڵسوکەوتی خەڵکی پترزبۆرگ لەگەڵ مەسەلەی ماڵی شوێنێکی هێمنکەرەوەی لەسەر ڕۆحی ستیپان ئارکادیچ دانابوو. بارتنیانسکی[٧٥]، کە بەو هەڵەخەرجی و تەخشان و پەخشانەی کە دەستیپێکردبوو ساڵانە پەنجاهەزار ڕۆبڵی خەرج دەکرد، ڕۆژی رابردوو قسەیەکی سەرنجڕاکێشی بۆ باسکردبوو.

بەر لە نانی نیوەڕۆ ستیپان ئارکادیچ لە کاتی ئاخافتندا پێیگوتبوو:

ـ تۆ وادیارە لەگەڵ مۆردڤینسکی[٧٦]ئاشنایەتیت هەیە. ئەگەر کەرەم بکەی و تکایەکم بۆ بکەی لەلای ئەو خزمەتێکی گەورەت پێکردووم. دەرفەتێکی کەسپ و کار هەڵکەوتووە و زۆر حەزدەکەم وەبەر من بکەوێ. ئەم کارە بوونە ئەندامە لە کومیسیۆنی...

ـ زەحمەتی گوتنی ئەو ناوە دوور و درێژە بە خۆت مەدە، من لە هەموو حاڵێکدا لە بیرم دەمێنێ. بەڵام مەگین بێکاری خۆت دەخەیتە نێو ئەرك و کاری هێڵاسنەوە و لەگەڵ تاقمێك جوولەکە تێدەکەوی و سەری خۆت دەماسێنی؟ هەرچییەکت دەوێ بیڵێ، بەڵام کارێکی قۆڕە.

---

74- Bryantsev

75- Bartnyansky

76- Mordvinsky

ستیپان ئارکادیچ پێینەگوت کە کارێکی پڕ چەرمەسەرێیە و هەوڵێکی زۆری گەرەکە. ئەگەر بیشیگوتبایە بارتنیانسکی لە مانای قسەکەی نەدەگەیشت.

ـ بەڵام چ بکەم پارەم پێویستە و گیرفانم گەسکی لێدراوە.

ـ بەڵام خۆ تۆ باری ماڵیت خراپ نییە. ژیانێکی ناخۆشیشت نییە.

ـ بەڵێ وایە، بەڵام زۆر قەرزدارم!

بارتنیانسکی بە دەربڕینی هاودەردییەوە گوتی: سەیرە، زۆر قەرزداری؟

ـ بەڵێ، زۆر! بیست هەزار ڕۆبڵ.

بارتنیانسکی دای لە قاقای پێکەنین و گوتی:

ـ جا ئەوە چییە. من قەرزەکانم خۆی لە ملوێن و نیوێك دەدا و کەوتوومەتە سەرساجی عەلی و دەبینی دەژیم و زۆریشی گوێ نادەمێ.

ستیپان ئارکادیچ ڕاستیی ئەو حاڵەی نەك بە بیستن بەڵکوو بە چاوی خۆی دەدی. ژیڤاخۆڤ سێسەدهەزار ڕۆبڵ قەرزدار بوو و کاپێکێکی لە عەرز و ئاسمان شك نەدەبرد و ژیانی بەردەوام بوو و لە ڕادەبەدەریش خەریکی هەڵەخەرجی و تەخشانوپەخشان بوو! کۆنت کریڤتسۆڤ[77] لەمێژ بوو دەستی لە هەموو شتێك داشتبوو، بەڵام دوو گراویشی هەبوو. پترۆڤسکی کە سامانەکەی پێنج ملوێن ڕۆبڵ بوو قرتەی لێبڕی و هەروا بەو دەمودەزگا و تەخشانوپەخشانەوە ژیانی خۆی درێژە پێدەدا و لەگەڵ ئەوەشدا بەرپرسایەتیی ڕێکخراوەیەکی سەرمایەگوزاریی لە ئەستۆ بوو و بیست هەزار ڕۆبڵی مووچە وەردەگرت. جگە لەوانەش پترزبۆرگ شوێنێکی باشی لەسەر جەستەی دادەنا و جحێڵی دەکردەوە. کە لە مۆسکۆ دەبوو هێندێ جار تاڵێ مووی سپیی لەسەری خۆیدا دەدی یان دوای نانی نیوەڕۆ خەوەنووچکە دەیبردەوە و باوێشکی دەدا و خۆی دەکێشایەوە یان نەیدەتوانی بە پلیکانەکاندا وەسەر کەوێت و دەکەوتە هەناسەبڕکێ، کە لەگەڵ ژنانی جوان و جحێڵ دەبوو هەستی بە کەسەر دەکرد و لە کۆڕەکانی سەمادا هەڵنەدەپەڕی. بەڵام لە پترزبۆرگ هەستی دەکرد دە ساڵ گەنج بۆتەوە و هەستی بە پیری و پەککەوتەیی نەدەکرد.

ئەو لە پترزبۆرگ ڕاست ئەو هەستەی پرێنس پیۆتێر ئابلۆنسکیی هەبوو کە پیاوێکی شەست ساڵان بوو و تازە لە سەفەری هەندەران گەڕابۆوە و ڕۆژی ڕابردوو بۆی باسکردبوو.

---

77- Krivtsov

گوتبووی: ئێمە نازانین لێرە ژیان چییە. باوەڕ دەکەی من هاوینم لە بادێن رابوارد و بەڕاستی هەستم دەکرد جحێڵ بوومەتەوە. کاتێك ژنێکی جحێڵ و شۆخوشەنگم دەدی نازانی چ هەوەس و حەزێك دڵی دادەگرتم. فراوێنم دەخوارد و لەگەڵ فراوێنەکە گەروویەکم تەڕ دەکردەوە و هەستم دەکرد ماسوولکە مردووەکانم ژیاونەتەوە و کەیفم سازدەبوو. کە گەڕامەوە بۆ مۆسکۆ دەبوو بچم بۆ لای ژنەکەم، ئەویش لە گوند. بڕوام پێبکە دوای حەوتوویەك دیسان ربدۆشامبرەکەم لەبەرکرد و ئیتر بۆ فراوێنیش تاقەتم نەبوو جلوبەرگی دروست و حیسابی لەبەر بکەم، ئیتر چبگا بەوەی بیر لە ژنانی جوان و لەبار بکەمەوە. بە تەواوی پیر بووبووم. ئیتر کارێکم نەبوو جگە لەوەی لە بیری ئەو دنیامدا بم. رۆیشتم بۆ پاریس و دیسان وەك خۆم لێهاتەوە و تینوگوڕ لە گیانم گەڕایەوە.

ستیپان ئارکادیچیش لە پترزبۆرگ راست ئەو هەستەی هەبوو کە پیوتێر ئابلۆنسکی هەیبوو. کاتێك لە مۆسکۆ بوو هەستی بە خەم و دڵتەنگی دەکرد، بەجۆرێك کە بەڕاستی ئەگەر ماوەیەکی دوور و درێژ لەوێ بمایەتەوە کارەکەی بەجێیەك دەگەیشت کە چارە نەبوو جگە لەوەی بیر لە ئەو دنیای بکاتەوە. کە دەهات بۆ پترزبۆرگ دیسان هەستی دەکرد بۆتەوە بە پیاوێکی دروست و حیسابی.

لەنێوان پرێنسس بێتسی تۆرسکایا و ستیپان ئارکادیچدا لە قەدیمەوە پێوەندییەکی زۆر سەیر هەبوو. ستیپان ئارکادیچ هەمیشە بە گاڵتە و گەپ فڕی بۆ دەهاویشت و دڵی نەرم دەکرد، هەروەها بە گاڵتە نەقڵ و نەزیلەی زۆر توند و تۆلازانەی بە گوێیدا دەدا، چونکە دەیزانی ژنە زۆری ئەو نوکتە و نەقلانە بەدڵە و کەیفی پێدەکات. رۆژی دوای دیدارەکەی لەگەڵ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ سەرێکی لەو ژنە شۆخە هەڵێنا و هێندە بەکەیف بوو هەستی بە تینوگوڕ و گەنجی دەکرد کە بێ ئەوەی بخوازێ بە گاڵتە هێندە لەو رێگایەدا چووە پێشێ و قسەی قۆڕ و هەرزەوێژانەی بەرەڵڵا کرد کە خۆشی نەیدەزانی چۆن پاشەکشێ بکات، چونکە بۆ بەدبەختی نەك حەزی بە تێکەلاوی لەگەڵ ئەو پرێنسسە نەدەکرد، بەڵکوو زۆریشی رق لێیبوو. گاڵتە و گەپەکانیان بەتایبەت بەو هۆیە زێدەڕەویی تێدا کرابوو کە پرێنسس لەلای ستیپان ئارکادیچ بە دەندووك پێوە بووبوو و خۆی بواری ئەو گاڵتە و رووهەڵماڵدراوییانەی رەخساندبوو. کارەکە بە جێیەك گەیشتبوو کە ستیپان ئارکادیچ زۆری پێخۆش بوو کە پرێنسس میاخکایا بێوەخت لێیان پەیدابوو و تەنیاییەکەی لێتێك دان.

پرێنسس میاخکایا کە چاوی بە ستیپان ئارکادیچ کەوت گوتی: ئێ، ئەوە ئێوە لێرەن؟ حاڵی خوشکە چارەڕەشەکەتان چۆنە؟ ـ پاشان گوتیشی پێویست ناکات ئاوا چاوم لێبکەی. لەوکاتەوە کە هەمووان کەوتوونەتە گیانی، بەتایبەت کەسانێك سەد هەزار جار لە ئەو خراپترن، من لەسەر ئەو باوەڕەم کە ئەو کارێکی زۆر باشی کردووە. من لە ڤرۆنسکی خۆش نابم چونکە ئەو کاتەی ئانا ئارکادیۆڤنا لە مۆسکۆ بوو خەبەری پێنەدام. ئەگەر بمزانیبایە دەچووم بۆ سەردانی و لە هەموو شوێنێکیش هاوڕێیەتیم دەکرد و لێی دوورنەدەکەوتمەوە. تکات لێدەکەم پێیبڵێ زۆرم خۆشدەوێ. دەی ئێستا باسی ئەوم بۆ بکە.

ستیپان ئارکادیچ لە رووی ساویلکەییەوە تکاکەی پرێنسس میاخکایای بە جیددی زانیبوو و باوەڕی پێکردبوو و خەریکبوو دەیگوت: بەڵێ، زۆر لە بارودۆخێکی خراپدایە...ـ کە پرێنسس بەپێی خووخدەی خۆی قسەکەی پێبڕی و خۆی دەستیکرد بە قسەکردن و گوتی: ئەو کارێکی کردووە کە هەمووان، جگە لە من، دەیکەن، بەڵام بە دزییەوە. بەڵام ئەو ئەهلی دووڕوویی و فێڵ و تەڵەکە نەبوو و زۆر کارێکی باشی کرد. ببوورە کە ئەو قسەیە دەکەم. ئەو کاتە هەموو دەیانگوت کارنین مرۆڤێکی بەهۆش و تێگەیشتووە. من تەنیا کەسێك بووم کە دەمگوت گەوجەپیاوە. ئێستا کە لەگەڵ لیدیا و ئەو لاندۆیە بۆتە هاوڕێ هەمووان دەڵێن گەوجە و من ئەگەرچی پێم خۆش نییە لەگەڵ هەمووان هاوڕا بم بەڵام ئەمجارە چارم ناچارە.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: تکایە ئێوە بۆم روون بکەنەوە. من سەرم لێیدەرناچێ. دوێنێ بۆ کاری خوشکم چووم بۆ لای و داوام لێکرد لێبڕاوانە وەڵامم بداتەوە. وەڵامێکی پێنەدامەوە و گوتی: دەبێ بیری لێبکاتەوە. ئەمڕۆ بەیانی بەجێی وەڵام نامەیەکیان بۆ ناردووم و بۆ شەوێ لە ماڵی کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا بانگهێشتن کراوم.

پرێنسس میاخکایا بە کەیفسازییەوە گوتی: چاکە، خۆ دیتووتە، نەمگوت؟ دەیانهەوێ لە لاندۆ بپرسن و ریش و مقەست بخەنە بەردەستی ئەو.

ـ چۆن لە لاندۆ؟ بۆچی؟ لاندۆ کێیە؟

ـ **چۆن؟ ژۆل لاندۆ، ئێوە ژۆل لاندۆ غەیبزانی ناودار** ناناسن؟ ئەویش شێتە. بەڵام چارەنووسی خوشکت لە دەستی ئەودایە. ئەمەش ئاکامی مانەوە لە قوژبنی شارستانە. کەوایە ئێوە چی دەزانن؟ ئەم لاندۆیە لە پاریس **دەفتەرداری** دووکانێك بوو. رۆژێك دەچێ بۆ لای دوکتۆر و لە ژووری چاوەڕوانیی دوکتۆر خەوی لێدەکەوێ و لە خەوەکەیدا دەست دەکات بە دانانی بەرنامە و پارێز بۆ نەخۆشەکان لەمەڕ نەخۆشییەکانیانەوە. ئەویش چ بەرنامە و

پارێزێکی سەیریش! پاشان ژنەکەی یووری مێلدینسکی[78] ئێوە ئەو دەناسن؟ ئەوی کە گردەنشین و کەلەلایە... ولحاسڵ، ژنەکەی یووری مێلدینسکی ئەوە دەبیستێ و دەچێ دەیبات بۆ لای مێردەکەی و لاندۆ ماریجەی دەکات. هەڵبەت بە بڕوای من ماریجەکەی هیچ کەڵکێکی نەبووە چونکە مێلدینسکی وەك پێشوو لاواز و دەردەدارە. بەڵام ئەوان بڕوای پێدەکەن و لەگەڵ خۆیان دەیهێنن بۆ رووسیا. لێرە هەمووان بە تینوتاوەوە دەوری دەگرن و ئەویش دەستدەکات بە ماریجەکردنی نەخۆشەکان. کۆنتس بیززووبۆڤا[79] ماریجە دەکات و کۆنتس هێندە هۆگری دەبێ کە دەیکات بە کوڕی خۆی.

ـ چۆن کردی بە کوڕی خۆی؟

ـ کردی ئیتر. ئەو ئێستا ئیتر لاندۆ نییە، کۆنت بیززووبۆڤە. بەڵام ئێستا مەسەلەکە ئەوە نییە. لیدیا ـ هەڵبەت من زۆرم لیدیا خۆشدەوێ، بەڵام مێشکی تۆزێ عەیبدارە. لەلایەکیشەوە لیدیا ئیتر نەیهێشت لاندۆ وچان بدات، بەجۆرێك کە ئێستا لیدیا و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بەبێ ئەو قامك بە ئاودا ناکەن. هەر بۆئەوەشە ئێستا چارەنووسی خوشکت لە دەستی ئەو لاندۆیە یان وەك دەڵێن کۆنت بیززووبۆڤدایە.

## بیست و یەك

ستیپان ئارکادیچ دوای ئەوەی لەلای بارتنیانسکی فراوێنێکی بەتامی خوارد و زۆری کۆنیاك خواردەوە، بە تۆزێ وەدرەنگکەوتنەوە خۆی گەیاندە ماڵی کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا و لە کاتی دیاریکراودا نەگەیشت.

چاوێکی لە باڵتەکەی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کرد کە ئاشنابوو بۆی و زۆر باڵتەیەکی سەیر و قۆڕ بوو و قوڵفوقەڕازەی پێوە بوو، لە دەرگاوانەکەی پرسی: ئیتر کێ لە خزمەت کۆنتسدایە؟ گەنجە فەڕەنسییەکە؟

---

78- Youry Meldinsky

79- Biezzoubova

دەرگاوان بە لەبزێکی جیددی وەڵامیدایەوە: جەنابی ئەلکساندرڤیچ کارنین و کۆنت بیززۆبۆڤ.

ستیپان ئارکادیچ بە پلیکانەکاندا هەڵگەڕا و بەخۆی گوت «پرێنسس میاخکایا چاکی بۆچووبوو. سەیرە. بەڵام وا چاکە خۆمی لێ نزیك بکەمەوە. ژنێکی زۆر وریا و دەستڕۆیشتووە. ئەگەر تکایەکمان لەلای پامۆرسکی بۆبکات کارەکەی من دروست دەبێ.»

لە دەرەوە هێشتا هەوا تاریك نەبووبوو، بەڵام پەردەکانی تەلاری چکوڵەی میوانداری ماڵی کۆنتس لە خوارەوە بوو و هەر بەو هویەش چراکانیان داییساندبوو.

کۆنتس لیدیا و ئەلکساندرڤیچ لە دەوری مێزێکی خڕی ژێر چراکە دانیشتبوون و لەسەرەخۆ پێکەوە قسەیان دەکرد. پیاوێکی بستەباڵای ریوەڵە کە سمت و کەفەڵێکی ژنانەی هەبوو و لاقی بۆ ناوەوە گەڕابوون، بە جۆرێك کە ئەژنۆی لە یەك نزیکبووبوونەوە، روخساری زەردەڵ و سەرنجڕاکێش و چاوانی گەش و جوان و قژی درێژی رژابوونە سەر ملیوانەی رێدنگوتەکەی، لەوسەری دیکەی ژوورەکە راوەستابوو و چاوی لە وێنەی سەر دیوارەکان دەکرد. ستیپان ئارکادیچ کە لەگەڵ خاتوونی خانەخوێ و ئەلکساندرڤیچ سڵاو و چاکوخۆشینی کرد بێ ئیختیار چاوێکی تری لە کابرا نەناسیاوەکە کرد.

کۆنتس بە نەرمی و لەبزێکی بەپارێزەوە کە ئابلۆنسکیی تووشی سەرسووڕمان کرد رووی لە ستیپان ئارکادیچ کرد و گوتی: **بەرێز لاندۆ**، پاشان بە یەکتری ناساندن[٨٠].

---

٨٠- تۆلستۆی ساڵی ١٨٥٧ کەسێکی بە ناوی د.د. هۆم (حێرب.ا.ا) کە ناوبانگی بەوە دەرکردبوو بانگی رۆح دەکات لە پاریس چاوی پێیکەوتبوو و بۆ وەسفی لاندۆ کەڵکی لە تایبەتمەندییەکانی ئەو وەرگرتووە. ئەم هۆمە لە پاریس سەرنجی ناپلئۆنی سێهەم و مەلەکە ئۆژێنی ڕاکێشا و زۆر زوو لە کۆمەڵگای خانانی فەڕەنسادا ناوبانگی دەرکرد. هەر ئەو ساڵە ڕووی کردە مەزهەبی کاتۆلیك بەڵام ساڵی ١٨٦٤ لە ئیتالیا تۆمەتی جادووگەریان لێدا و دەریانکرد. ساڵی ١٨٦٦ خاتوونێك بە ناوی مادام لیۆن کردی بە کوڕی خۆی و شەست هەزار لیرەی پێدا، کە دواتر لێیساندەوە. هۆم ساڵی ١٨٥٩ لەگەڵ پیاوێکی دەوڵەمەند بە ناوی کۆنت کۆشلیڤ بیکسبارۆدکا (ردحرزرحسحخآ سخدحخحس‌پ) کە لە فلۆرانس لەگەڵی ئاشنابووبوو چو بۆ ڕووسیا و لەگەڵ یەکێك لە خزمەکانی ئەو کۆنتە زەماوەندی کرد و لەو ڕێگایەوە پارەیەکی زوری وەدەست هێنا. شێوەی ناوی بیکس بارۆدکا (بێڕیش) لەگەڵ بیززوبۆڤ (بێددان) کە لە کتێبەکەدا هاتووە باس لەوە دەکات کە تۆلستۆی بۆ وەسفی لاندۆ، هۆمی ئینگلیزیی لەبەرچاو گرتووە.

لاندۆ بەپەلە ئاوڕیدایەوە و هاتە پێشێ و دەستی بێهەست و جوولّە و ئارەقە کردووی خستە دەستی ئابلۆنسکییەوە و خێرا لێی دوورکەوتەوە و دیسان دەستیکردەوە بە تەماشاکردنی وێنەی سەر دیوارەکە. کۆنتس و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ چاوێکی ماناداریان لێکرد.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا لە پالّ کارنیندا کورسییەکی خالّیی نیشان ئابلۆنسکیدا و داوای لێکرد دانیشێ و گوتی: زۆر خۆشحالّم کە بەتایبەت ئەمڕۆ چاوم بە ئێوە کەوت.

کۆنتس لیدیا چاوێکی لە پیاوە فەڕەنسییەکە و پاشان لە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کرد و گوتی: من کاتی ناساندن وتم ناوی لاندۆیە، بەلاّم ئەو ناوی هەروەك دەزانی، کۆنت بیززۆبۆڤە. بەلاّم ئەو ئەم ناوەی پێخۆش نییە.

ستیپان ئارکادیچ وەلاّمیدایەوە: بەلّێ بیستوومە. دەلّێن ئەو کۆنتس بیززۆبۆڤای بە تەوای شیفا داوە.

کۆنتس لیدیا رووی لە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کرد و گوتی: کۆنتس ئەمڕۆ لێرە بوو. نازانی پیاو چەندەی دلّ پێیدەسووتێ. ئەم دەردی جوداییە بۆ ئەو زۆر تالّ و تاقەتبڕە. رۆیشتنی ئەو زۆر زەبرێکی گورچووبڕ بوو بۆی.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ پرسیی: ئێستا رۆیشتنەکەی حەتمەییە؟

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا چاوی لە ستیپان ئارکادیچ کرد و گوتی: بەلّێ، دەچێ بۆ پاریس. دوێنێ هەوالّیان لێناردووە.

ئابلۆنسکی هەستی کرد لەو کۆڕەدا ئەوەندەی پێیدەکرێ بە پارێزەوە هەلّسوکەوت بکات چونکە رووداوێکی مەترسیدار، کە هێشتا نەیدەزانی چییە لەو کۆڕەدا دەقەومێ یان دەبێ بقەومێ. بەو هۆیەوە زۆر بە پارێزەوە دووپاتی کردەوە: ئاخ، هەوالّیان لێناردووە!

بۆ ساتێك هەموو بێدەنگ بوون. پاشان کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا وەك ئەوەی بیهەوێ بێتە سەر باسی سەرەکی، بە بزەیەکی ناسکەوە رووی لە ستیپان ئارکادیچ کرد و گوتی:

ـ من لەمێژە ئێوە دەناسم و زۆر خۆشحالّم کە ئەو دەرفەتەم بۆ هەلّکەوت تاکوو باشترتان بناسم. وەك فەڕەنسییەکان دەلّێن **دۆستانی دۆستانی ئێمە دۆستانی ئێمەن**. بەلاّم مەرجی دۆستایەتی ئەوەیە کە بە رۆحێکی دۆستانەوە تێوەچین بۆ ئەوەی لە رۆح و خدەی بگەین و من پێموایە بەداخەوە ئێوە لەمەڕ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچەوە ئەو کارە ناکەن ـ کە ئەوەی گوت چاوانی جوان و لێوڕێژ لە فکری خۆی هەلّێنا و درێژەی پێدا: خۆ تێدەگەی مەبەستم چییە و ئاماژە بە چی دەکەم؟

ستیپان ئارکادیچ بە باشی تێنەدەگەیشت مەبەستی چییە و هەر بەو هۆیە نەیدەویست لەو چوارچێوە گشتییە بچێتە دەرێ گوتی: هەڵبەت تاڕادەیەك، حەزرەتی کۆنتس، من تێدەگەم ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە چ بارودۆخێکدایە...

کۆنتسلیدیا ئیڤانۆڤنا لەگەڵ ئەوەی ئاشقانە چاوی لە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەکرد کە هەستابوو و دەچوو بۆ لای لاندۆ بە لەبزێکی وشك و جیددییەوە بە ئابلۆنسکیی گوت: گۆڕانی رواڵەتی نالێم. ئەوەی گۆڕاوە دڵێتی. دڵی بە پڕشنگێکی تازە رووناك بۆتەوە و من پێموایە تۆ لە ئەو گۆڕانە رۆحییەی کە لە ناخیدا سەری هەڵداوە بەباشی تێنەگەیشتووی.

ستیپان ئارکادیچ لە فیکری ئەوەدابوو کە کۆنتسلیدیا ئیڤانۆڤنا لەگەڵ کام لەو دوو وەزیرە نزیکایەتیی هەیە تاکوو تکای لێبکات کە قسەیەکی بۆ بکات و راسپێرێ کە ئاگایان لێبێت. بۆیە بە نیگایەکی شیرین و پڕ لە خۆشەویستی چاوی لێکرد و وەڵامیدایەوە: هەڵبەت دەتوانم ئەو گۆڕانە بە تەواوی بهێنمە بەرچاوی خۆم. ئێمە هەمیشە پێکەوە دۆست و هاوڕێ بووین و ئێستا...

ـ گۆڕانێك کە لەودا سەری هەڵداوە ناتوانێ ئەشق و خۆشەویستی لە دڵیدا دامرکێنێ، بەپێچەوانە، ئەم گۆڕانە دەبێتە هۆی گەشانەوەی ئەوین. بەڵام وادیارە ئێوە لە مەبەستی من ناگەن ـ ئاماژەی بە پێشخزمەتێك کرد کە بە کەشەفێك چاییەوە دەهات و پرسیی: چایی مەیلناکەی؟

ـ زۆر نا، حەزرەتی کۆنتس، هەڵبەت رووداوێکی ناخۆش و...

کۆنتس بە چاوانی پڕ لە شەیداییەوە لە ستیپان ئارکادیچی روانی و گوتی: بەڵێ، زۆر رووداوێکی پڕداخ و ناخۆش بوو کە بووە هۆی بەختەوەرییەکی مەزن بۆی، چونکە دڵی وەها لێوڕێژ بوو لەو ئەشقە کە گەشانەوەیەکی تازەی بەخۆوە بینی.

ستیپان ئارکادیچ لە دڵی خۆیدا گوتی «پێموایە دەتوانم داوای لێبکەم لەلای هەردووکیان تکام بۆ بکات.»

گوتی: هەڵبەت حەزرەتی کۆنتس، بەڵام من پێموایە ئەم گۆڕانە هێندە تایبەتە کە هیچ کەس، تەنانەت هاودڵترین دۆستان حەز ناکەن خۆیان تێکگەیێنن.

ـ بەپێچەوانە، ئێمە ئەرکی سەرشانمانە کە پێکەوە قسە بکەین و یارمەتیی یەکتر بدەین.

ئابلۆنسکی بە بزەیەکی نەرم و شیرینەوە گوتی: بەڵێ هەق بە حەزرەتی کۆنتسە بەڵام هێندێ جار جیاوازیی بیروڕا دێتە گۆڕێ و جگە لەوەش..

ـ له بواری هەقیقەتی پیرۆزدا جیاوازیی بیرورا دەبێ لەکوێدا بێ؟

ـ بەڵێ، بەڵێ، بەڵام... ـ ستیپان ئارکادیچ ئەوەی گوت و بێدەنگ بوو. بۆی دەرکەوتبوو مەبەستی کۆنتس دەبێ مەزهەب و ئەمجۆرە شتانە بێ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە لیدیا ئیڤانۆڤنا هاتە پێشێ و بە سرتەیەکی مانادار گوتی: دەڵێی دەیهەوێ بخەوێ.

ستیپان ئارکادیچ سەری بۆ ئەولایە وەرسوڕاند. لاندۆ لەبەر پەنجێرەکە دانیشتبوو و دەستێکی نابووە سەر دەسکی کورسییەکە و دەستەکەی تریشی لەسەر پشتییەکەی دانابوو و سەری داخستبوو. هەرکە زانیی هەموو حازریان چاوی لێدەکەن سەری هەڵێنا و بزەیەکی منداڵانە و ساویلکانە نیشتە سەرلێوی.

کۆنتسلیدیا ئیڤانۆڤنا گوتی: چاوی لێمەکەن، لێیگەڕێن.ـ پاشان بە هێواشی کورسییەکی بۆ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کێشایە پێشێ و گوتی: من بۆم دەرکەوتووە کە...ـ بەڵام لەوکاتەدا پێشخزمەتێك هاتەژوورێ و نامەیەکی هێنا. کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا بەپەلە نامەکەی خوێندەوە و داوای لێبوردنی کرد و بەپەلە پڕووزێ شتێکی نووسی و وەڵامی نامەکەی دایەوە و بۆ لای مێزەکە وەرسووڕایەوە و هاتەسەر باسەکەیان وا دەستییان پێکردبوو و گوتی: بۆم دەرکەوتووە کە خەڵکی مۆسکۆ و بەتایبەت پیاوانی مۆسکۆیی زۆر گوێیان لە مەزهەب نییە.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: نانا، شتیوا مەڵێن، حەزرەتی کۆنتس، بە بڕوای من خەڵکی مۆسکۆ ئیمان قایمییەکەیان ناوبانگی دەرکردووە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ رووی لە ئابلۆنسکی کرد و بە بزەیەکی ساردەوە گوتی: رەنگە وابێ بەڵام هەتا ئەو جێیەی من ئاگادارم ئێوە لەو کەسانەن کە ئەوەی بەلاتانەوە پووشێك ناهێنێ مەزهەبە.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا گوتی: چۆن دەکرێ پیاو گوێ بە مەزهەب نەدا؟

ستیپان ئارکادیچ بە بزەیەکی زۆر نەرمکەرەوە کە تایبەتی خۆی بوو وەڵامیدایەوە: من لەو بوارەدا کەمتەرخەم و سەرسارد نیم بەڵکوو چاوەڕوانم. پێموانییە بۆ من کاتی ئەو کارانە هاتبێ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ و لیدیا ئیڤانۆڤنا چاوێکیان لە یەکتر کرد. کارنین بە لەبزێکی قایم و سارد گوتی: ئێمە قەت ناتوانین بزانین کاتی هاتووە یان نا. ئێمە نابێ لە بیری ئەوە دابین، کە ئامادەین یان ئامادە نیین. کەرەمی خودا بەپێی حیساب و کیتابی بەندەکانی نییە.

هێندێ جار کەسانی تامەزرۆ بێبەش دەکات و روو لە کەسانێك دەکات کە وەك شائوول[٨١] هیچ ئامادەییەکیان نییە.

لیدیا ئیڤانۆڤنا کە چاوی لە هەڵسوکەوتی پیاوە فەرەنسییەکە خافڵ نەدەکرد گوتی: نا، وادیارە هێشتا کاتی نەهاتووە.

لاندۆ هەستا و هات بۆ لایان.

پرسیی: ئیجازە دەدەن گوێ بۆ قسەکانتان راگرم؟

لیدیا ئیڤانۆڤنا بە چاوێکی دلۆڤانەوە تێیڕوانی و گوتی: بەڵێ، فەرموو، من نەمدەویست مزاحیمتان بم، فەرموو.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ درێژەی بە قسەکانی خۆیدا: تەنیا دەبێ چاوبکەینەوە بۆ ئەوەی لە رووناکی بێبەش نەبین.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا بە بزەیەکی پڕ لە سەفاوە گوتی: ئاخ، ئەگەر دەتانزانی کاتێك هەنتەشی هەمیشەییی ئەو لە رۆحی خۆماندا هەست پێدەکەین چ بەختەوەرییەك وجوودمان رادەگرێ!

ستیپان ئارکادیچ گوتی: بەڵام جاری وایە مرۆڤ رەنگە خۆی بە شایانی ئەو جۆرە گەورەییە نەزانێ ـ لەگەڵ دەربڕینی ئەو قسەیەش هەستی دەکرد بە قەبووڵکردنی گەورەییی مەزهەب سەداقەتی خۆی پێشێل کردووە. سەرەڕای ئەوانەش، دیتی کە زۆر دژوارە لە هەنتەشی کەسێکدا کە بە گوتنی وشەیەك بە پامۆرسکی دەتوانێ ئەو پلەی کە حەزی پێدەکات بۆی دەستەبەر بکات دەم لە ئازادیی بیروڕا بکوتێ.

لیدیا ئیڤانۆڤنا گوتی: مەبەستتان ئەوەیە کە تاوان دەبێتە کوسپی سەررێی؟ بەڵام ئەو بیروبڕوایە دروست نییە. بۆ کەسێك کە ئیمانی هەبێ تاوان بوونی نییە. تاوانی ئیمانداران دەشۆرێتەوە ـ سەری بۆ لای پێشخزمەتەکە سووڕاند کە بە نامەیەکی دیکەوە هاتبوو، لێیوەرگرت و بەپەلە خوێندییەوە و هەروا سەرزارەکی وەڵامیدایەوە: بڵێن سبەینێ، بچێتە خزمەتی گرندۆشیس ـ گەڕایەوە سەر باسەکەی خۆی و گوتی: **ببوورن** ـ گوتیشی: بۆ ئیمانداران تاوان بوونی نییە.

---

٨١- یەکێك لە پاشاکانی یەهوود. بڕوانە کتێبی یەکەمی سمۆئیلی نەبی.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: بەڵێ، بەڵام ئیمان بەبێ کردەوەی باش خۆی لە خۆیدا مردووە. ـ ئەم رستەیەی فێرکاریی ئایینی کە بە منداڵی فێری بووبوو و هەر لە بیری مابوو، بە بزەیەکەوە دەربڕی و ئەو بزەیەی تەنیا بەرەڤانییەك بوو کە لە هەمبەر سەربەخۆیی ئەندێشەی خۆیدا پێیشك دەهات.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ رووی لە لیدیا ئیڤانۆڤنا کرد و گوتی: فەرموون، ئەمە کەلامێکە لە ریسالەی یەعقووبی حەواری ـ لەبزی بۆنی لۆمەی لێدەهات. دیاربوو ئاماژە بەو باسە دەکات کە زۆر جار پێکەوە دەمەتەقێیان لەسەر کردووە. لێکدانەوەی نابەجێی ئەم رستەیە سەرچاوەی گەلێ زیان بووە. من کاری باش ناکەم، کەوایە ناتوانم ئیماندار بم. ئەگەرچی قەتیش شتیوا باس نەکراوە بەڵکوو مەبەست راست بە پێچەوانەی ئەمە بووە.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا بە سووکایەتییەکی پڕ لە بێزارییەوە گوتی: تاملکردنی رەنج لەبەر خاتری خودا و رزگاریی رۆح بە یارمەتیی رۆژوو. ئەمانە فیکری سەیروسەمەرەی راهێنانی تەرکە دنیای ئیمەیە... بەڵام خۆ ئەو شتەش لە هیچ جێیەکدا باسی نەکراوە. کارەکە زۆر سادەتر و ئاسانترە ـ ئەوەی هەر بەو بزە هاندەرانەیە بە ستیپان ئارکادیچ گوت کە لە دەربار بۆ دڵخۆشیدانەوەی کلفەتە گەنج و تازەکارەکان کە لەگەڵ شوێنە تازەکە ئاشنا نەبوون گوتبووی.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە روانین قسەکانی پشتڕاست کردەوە و گوتی: مەسیح کە لەبەر خاتری ئێمە ئەشکەنجەی خاچی تاملێ کرد ئێمەی نەجات داوە.

لیدیا ئیڤانۆڤنا بە زەمانی فەڕەنسی پرسیی: **ئێوە لە ئینگلیزی حاڵی نابن؟**

چونکە وەڵامەکەی ئەرێنی بوو هەستا و لەنێو ئەو کتێبانەی سەر رەفحەکەدا بەدوای کتێبێکدا گەڕا.

بە سەرنجێکی پڕپرسیارەوە بە کارنینی گوت: دەمهەوێ **«رزگار و بەختەوەر»** یان **«داڵدەدراو»** بخوێنمەوە ـ کە کتێبەکەی دۆزییەوە لەجێی خۆی دانیشتەوە و کتێبەکەی لێککردەوە: کۆپلەیەکی زۆر کورتە. رێگای گەیشتن بە ئیمانی تێدا وەسف کراوە و بەختەوەرییەك کە لەورێگایەوە رۆحی مرۆڤ دادەگرێ، لە هەموو شیرینکامییەکانی سەرعەرز بەرزترە. مرۆڤێکی خاوەن ئێمان ناگونجێ و مەحاڵە رۆژە رەش بێت، چونکە بە تەنیا نییە. ئێستا خۆتان دەبینن ـ خۆی بۆ خوێندنەوە ئامادەکردبوو کە پێشخزمەت دیسان خۆی کردەوە بە ژووردا. بە پێشخزمەتەکەی گوت: بارازدینا! بڵێن سبەینێ سەعات دوو! قامکی خستە بەینی کتێبەکەوە بۆ ئەوەی لاپەڕەکەی لێ گوم نەبێت و هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: بەڵێ!

ـ به چاوه جوان و پڕ له خەیاڵەکانی له شوێنێکی پێشخۆی راما: ئیمانی راستەقینە ئاوا شوێندانەرە. ئێوە ماریسانی نەوا دەناسن؟ دەزانی چ بەڵایەکی بەسەر هاتووە؟ منداڵە تاقانەکەی لەدەستدا. خەم و خەفەت بڕستی لێبڕیبوو. چیی بەسەر هات؟ ئەم دۆستەی پەیدا کرد و ئێستا شوکری خودا دەکات کە منداڵەکەی لێساندووە. ئەو بەختەوەرییەی بە ئیمانەوەیە ئەمەیە.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: بەڵێ، هەڵبەت ئەمە زۆر... ـ زۆری پێخۆش بوو کە شتێك دەخوێننەوە و ئەو دەرفەتی ئەوەی هەیە کە بیر و خەیاڵە بڵاوەکەی خۆی کۆ بکاتەوە. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «نا، وادیارە واباشترە ئەمڕۆ هیچ تکایەکی لێنەکەم. ئەگەر کارەکەم تێکنەدەم و لێرە بڕۆمە دەرێ دەبێ شوکری خودا بکەم.»

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا رووی لە لاندۆ کرد و گوتی: بێتاقەتیش دەبن ئێوە ئینگلیزی نازانن. بەڵام کورتە زوو تەواودەبێ.

لاندۆ چاوی قووچاند و هەر بەو بزەیەوە گوتی: نا، تێدەگەم.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ و لیدیا ئیڤانۆڤنا چاوێکی ماناداریان لە یەکتر کرد و خوێندنەوە دەستی پێکرد.

## بیست و دوو

ستیپان ئارکادیچ بەو قسانەی کە دەیبیست و پێیسەیر بوو بەجارێ کاسووڕ بووبوو. پێچەڵاوپووچیی ژیان لە پترزبۆرگ شوێنی لەسەر دانابوو و ئەوی لەو ژیانە چەقبەستووەی مۆسکۆ دەهێنایە دەرێ. بەڵام لە کۆڕە ئاشنا و خووپێگرتووەکاندا لەو پێچەڵاوپووچییە دەگەیشت و زۆری پێخۆش بوو، ئێستاش لەم شوێنە کە زۆری بۆ نامۆ بوو ماق دەما و کاس و وڕدەبوو، بەجورێك، کە نەیدەتوانی لە هەموو شتێك بگات. کاتێك گوێی بۆ قسەکانی لیدیا ئیڤانۆڤنا شل دەکرد و چاوانی جوان و روانینی سایلۆحانە یان فێڵەبازانەی لاندۆی (خۆشی نەیدەزانی کامەیان) لەسەر خۆی هەست پێدەکرد، بارێکی تایبەت لە سەریدا قوورساییی دەکرد کە زەینی تاریك داگیرابوو.

فیکر و خەیاڵی جۆراوجۆر لە زەینیدا فەرتەنەیەکی سازکردبوو «ماری سانینا بە مردنی منداڵەکەی خۆشحاڵە... چخۆش دەبوو بمتوانیبایە جگەرەیەك بکێشم... بۆ رزگاربوون تەنیا دەبێ

ئیمانت هەبێ... راهیبەکان ڕێگای کار نازانن بەڵام لیدیا ئیڤانۆڤنا دەزانێ... ئاخەر ئەوەی لە سەری مندا قورسایی دەکات چییە؟ بە هۆی کۆنیاکەوەیە یان ئەم هەموو قسە سەیر و سەمەرەیە تێیدا کەڵەکە بووە؟ تا ئەم کاتە خۆ کارێکی نەشیاوم نەکردووە. بەوحاڵەوە ئەمڕۆ ناکرێ ئەو داوایەم لێی هەبێ. بیستوومە پیاو ناچار دەکەن دۆعا بکات. خۆزگە من ناچار نەکەن. زۆر بێتام دەبێ. ئەم وڕێنە و هەڵیتپڵیتانە چییە دەیخوێنێ؟ بەڵام زۆر جوانی دەخوێنێ. لاندۆ ناوی بۆتە بیززووبۆڤ. بۆ بیززووبۆڤ؟» لەناکاو ستیپان ئارکادیچ هەستی کرد شەویلکەکەی خوارووی بە هۆی گوشاری باوێشك وەها بە توندی دەلەرزێ کە بەرگریکردن لێیمەحاڵە. بە بیانووی ڕێکوپێك کردنی ریشی بە دەستی باوێشکەکەی شاردەوە و سەری خۆی بە توندی راوەشاند بۆ ئەوەی قورساییەکەی تووڕ هەڵداتە دەرێ. بەڵام پاشان هەستی کرد خەوی لێکەوتووە و هیچیوای نەمابوو دەستبکات بە پڕخوهۆڕ. کاتێك گوێی لە دەنگی کۆنتس بوو کە گوتی: «خەوتووە!» وەخۆ هاتەوە.

وەها داچڵەکی خەو لە سەری پەڕی. هەستی بە تاوان دەکرد و دەیدی کە زۆر شوورەییە. بەڵام لەڕێوە خەیاڵی ئاسوودە بوو چونکە تێگەیشت کە ئەو «خەوتووە» مەبەستیان لاندۆ بووە نەك ئەو. کابرای فەڕەنسیش وەك ستیپان ئارکادیچ خەو تەپی دابووە سەری. خەوتنی ئەو بە بڕوای خۆی دەبووە هۆی زویربوونی ئەوان (ئەگەرچی هەموو شتێك هێندە لەبەر چاوی سەیر بوون کە تەنانەت ئەم فیکرە بە زەینیشی نەدەگەیشت.) کەچی خەوتنی لاندۆ ئەوان و بەتایبەت کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنای زۆر خوشحاڵ کرد.

لیدیا ئیڤانۆڤنا هێواش و بەپارێزەوە گوتی: ***خۆشەویستەکەم، تۆقەی لەگەڵ بکە، دیتووتە؟*** ـ بەو مەبەستەی چرپە و خشەی نەیەت داوێنی کراسەکەی بەلادا کرد و وەها تووشی هەیەجان بووبوو کە بەجێی ئەوەی بە کارنین بڵێ «ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ» گوتی: خۆشەویستەکەم. رووی دەمیشی لەو پێشخزمەتە بوو کە هاتبووە ژوورێ و گوتی: وست! هیچ وەرناگرم.

کابرای فەڕەنسی سەری نابوو بە پشتیی کورسییەکەوە و لە حەوتسالاَن راست بووبۆوە. یان وای دەنواند خەوی لێکەوتووە. دەستە ئارەقە کردووەکەی لەسەر چۆکی دانابوو جۆرێك بە ئەسپایی دەیجووڵاند کە دەتگوت دەیهەوێ شتێك وەرگرێ. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە جێی خۆی هەستا و ئەگەرچی دەیویست بە پارێزەوە هەنگاو هەڵێنێتەوە بەڵام لاقی لە مێزەکە گیرا و لە پیاوە فەڕەنسییەکە نزیکبۆوە و دەستی نایە نێو دەستییەوە. ستیپان ئارکادیچیش هەستا و چاوانی خۆی بە زۆری هەڵێنابوو و دەترسا دیسان خەوی لێبکەوێتەوە و چاونی بە هەموویاندا دەگێڕا. ئەوانەی هەموو لە بەخەبەریدا دەدی. ستیپان ئارکادیچ هەستی دەکرد سەری بەردەوام قورستر و زەینی تاریکتر دەبێ.

کابرای فەڕەنسی بێ ئەوەی چاوی هەڵێنێ گوتی: ***ئەوەی لە دواییدا هات، ئەوەی وا داواکارییەکی هەیە، بڕواتە دەرێ!***

***ـ دەبێ ببوورن، بەڵام چاکە، خۆ دیتووتانە.... نزیك سەعات دە وەرنەوە، یان واباشترە سبەینێ بێنەوە.***

لاندۆ بە بێتاقەتییەوە دووپاتی کردەوە: ***بڕواتە دەرێ!***

***ـ مەبەستی منم، نا؟***

چونکە وەڵامەکە ئەرێنی بوو ستیپان ئارکادیچ نەك داخوازییەك کە دەیویست سەبارەت بە کارەکەی خۆی لە لیدیا ئیڤانۆڤنای بکات لە بیری چۆوە بەڵکوو کارەکەی خوشکیشی لە بیرنەما و تەنیا بەو قەستەی کە هەرچی زووتر لەوێ دوورکەوێتەوە بە پێدزکە و لەسەر نووکی لاقی، بەپەلە، وەك ئەوەی لە ماڵێکی رمووودەبوو دەرپەڕێتە دەرێ، بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە سەرشەقام و ماوەیەك لەگەڵ عارەبانەچییەکە دەستیکرد بە جەفەنگ و گاڵتە و گەپ و دەیویست هەرچی زووتر خەوەکە لە خۆی بتارێنێ و وەخۆ بێتەوە.

ستیپان ئارکادیچ لە شانۆی فەڕەنسی، کە گەیشتە پەردەی کۆتایی و پاشان لە ماڵی تاتاری لە هەمبەر بترییەك شامپانیدا لەو شوێنە ئاشنایە هەناسەی کێشا، هێندێك حاڵی هاتەوەجێ. سەرەڕای ئەوانەش ئەو شەوە حاڵی زۆر باش نەبوو.

کاتێك چوو بۆ ماڵی پرێنس پیوتێر ئابلۆنسکی کە لەوێ نیشتەجێبوو نامەیەکی لەلایەن بێتسییەوە بۆ هاتبوو. بێتسی نووسیبووی کە زۆر حەزدەکات ئەو وتووێژەی دەست پێکراوە لەگەڵی تەواوبکات و داوای لێکردبوو کە رۆژی دوایی بچێت بۆ دیدەنیی. هێشتا ئەو نامەیەی هەتا کۆتایی نەخوێندبۆوە و ناوەرۆکەکەی ناوچاوانی پێبەیەکدا دابوو کە لە نهۆمی خوارەوە ترپەی پێی قورسی تاقمێك کە بارێکیان هەڵگرتبوو کەوتە بەرگوێی.

ستیپان ئارکادیچ لە ژوورەکە هاتەدەرێ تاکوو بزانێ چ خەبەرە. پرێنس پیوتێر ئابلۆنسکی بوو کە دیسان جحێڵ بووبۆوە. هێندە سەرخوش بوو کە نەیدەتوانی بە تاقیتەنیا بە پلیکانەکاندا وەسەر کەوێ. بەڵام کە چاوی بە ستیپان ئارکادیچ کەوت دەستووریدا داینێن و دەستی لێبەردەن و خۆی بە ئەوەوە هەڵواسی و لەگەڵیدا چووە نێو ژوورەکەی و لەوێ بۆی گێڕایەوە کە شەوی چۆن رابواردووە و هەر لەوێ خەوی لێکەوت.

ستیپان ئارکادیچ ورەیەکی باشی نەبوو و ئەوەش حاڵێك بوو کە زۆر کەم بۆی دەهاتە پێشێ و هەتا ماوەیەك نەیتوانی راکشێ و خەوی لێبکەوێ. جگە لە شتە خراپەکان هیچی

تری وەبیرنەدەهاتەوە بەڵام لە هەمووی خراپتر لە بیری ئەو ماوەیەدا بوو کە لە ماڵی کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا رایبواردبوو و ئەم دیدارە شەرم و شوورەییی بە دواوە بوو.

رۆژی دوایی وەڵامی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی بەدەست گەیشت کە گوتبووی بە هیچ شێوەیەك حازر نییە ئانا تەڵاق بدات و بۆی دەرکەوت ئەو بڕیارەی بە هۆی کاریگەری ئەو قسانەی کابرای فەڕەنسییە کە شەوی رابردوو لە خەوی بەڕاستی یان درۆیینەیدا کردبووی.

## بیست و سێ

لە ژیانی بنەماڵەییدا ئەگەر بڕیاربێت هەنگاوێك هەڵگیرێ دەبێ لەنێوان ژن و مێرددا جیاوازی بیروڕا یان هاودڵییەکی رەزامەندانە هەبێ. ئەگەر پێوەندییەکان تەمومژاوی بن، یانی نە ئەمەیان و نە ئەوی تر، ژیانیان هیچ گەشەیەك ناکات و هیچ کاروبارێکیان سەرناگرێ.

زۆر بنەماڵە تەنیا بەو هۆیە ساڵانێکی زۆر لەسەر دۆخێك چەق دەبەستێ کە ژن و مێردەکە هەردووکیان لێیبێزارن، چونکە نە جیاوازیی بیروڕا لەنێوانیاندا هەیە و نە هاودڵییەکی رەزامەندانە.

ژیان لە مۆسکۆ بۆ ڤرۆنسکی و ئانا وای لێهاتبوو کە ئیتر نەیاندەتوانی تاملی بکەن. هەواکەی گەرم و لێڵ و پڕدومان بوو. هەتاویش ئیتر ئەو هەتاوەی بەهارێ نەبوو، هەتاوی هاوین بوو و گەڵا و پۆپی درەختی سەر شەقامەکان هەمووی تویژێك تۆزیان لەسەر نیشتبوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەرچی ئەوان لەمێژ بوو بڕیاریان دابوو لەوێ بڕۆن بەڵام بەرەو گوند بەڕێ نەدەکەوتن و هەروا بە بێزارییەوە لە مۆسکۆ مابوونەوە، چونکە لەم دواییانەدا هاودڵی و تەبایی لەنێوانیاندا نەمابوو.

زویربوونێك کە هۆی ناتەباییەکەیان بوو هیچ هۆکارێکی دەرەکیی نەبوو و هەموو ئەو هەوڵانەی بۆ ئاخافتن و روونکردنەوەی گرژی و کێشەکانیان دەیاندا نەك بە هیچ ئاکامێك نەدەگەیشت بەڵکوو دەبووە هۆی قووڵتر و ئاڵۆزتربوونی گرفتەکانیان. ئەو زیزبوونەیان لە یەکتر ریشەی لە پێوەندیی خۆشەویستییاندا بوو. ئانا لەوە رەنجابوو کە هەستی دەکرد ڤرۆنسکی بەقەد جارانی خۆشناوێ و ڤرۆنسکی پەشیمان بوو لەوەی کە بە هۆی ئەوەوە خۆی تووشی ئەو بارودۆخە دژوارە کردووە و ئاناش بەجێی ئەوەی هەوڵ بدات بۆ ئەوەی ئەوبارە قورسەی

سەرشانی سووك بكات قورستری دەكرد. هیچ كامیان هۆی زویربوونەكەی خۆیان دەرنەدەبڕی. بەڵام هەردووكیان یەكتریان بە خەتابار دەزانی و لە دەرفەتێك دەگەڕان كە خەتاكە بەسەر یەكتردا بسەپێنن.

ئانا، ڤرۆنسكیی بە هەموو خووخدە و بیر و تاسەوە و بە هەموو تایبەتمەندییەكانی ڕۆحی و جەستەییەوە بە سەرچاوەی ئەشقی ژن دەزانی و ئەو ئەشقەی كە دەیویست لە ژێر دەسەڵاتی خۆیدا بێ دەیدی لە كەمیی داوە. بۆیە پێیوابوو بەشێك لەو ئەشقە دەبێ فیدای ژنان یان ژنێكی تر كرابێت. ئەو حاڵە ئەوەندەی تر تووشی ئێرەیی و گومانی دەكرد. ئێرەییەكەی سەبارەت بە ژنێكی دیاریكراو نەبوو، هۆیەكەی ساردبوونەوەی ئەشقی ڤرۆنسكی بوو، چونكە ژنێكی وای پێشك نەدەهات كە ئێرەیی پێبەرێت و لەوە دەگەڕا. چكۆڵەترین ئاماژە بەس بوو كە تیری ئێرەییی خۆی لە ژنێكەوە بۆ ژنێكی تر بگۆڕێ. جاری وا بوو دڵپیسیی لە ژنانی زۆر هەڵە و هەرزە دەكرد كە ڤرۆنسكی بە كەڵكوەرگرتن لەو پێوەندییانەی كە لەگەڵ پیاوە ڕەبەنەكاندا هەیبوو بە ئاسانی دەیتوانی لەو جۆرە ژنانە نزیك ببێتەوە، هێندێ جاریش ئێرەییی بە ژنانی كۆمەڵگای ئەشراف دەبرد كە ڤرۆنسكی وێدەچوو لەگەڵیان بەرەو روو بێت و بڕێ جاریش ئێرەیی و گومانی كچێكی خەیاڵی بوو كە دەترسا ڤرۆنسكی واز لە ئەو (یانی ئانا) بێنێ و ژیانی هاوبەش لەگەڵ ئەو كچە پێكبێنێ. ئەم ئێرەییەی دواییان زیاتر لە هەمووان ئازاری دەدا و بەتایبەت بەو هۆیەی كە ڤرۆنسكی خۆی، لەڕووی كەمتەرخەمییەوە كاتی قوڵپەكردنی سەداقەت و نهێنی دركاندن، پێیگوتبوو كە دایكی هێندە لەگەڵ ڕۆحیاتی ئەو نامۆیە كە ئیجازەی بەخۆی داوە هەوڵ بدات و ئەو (یانی ڤرۆنسكی) ڕازی بكات كە لەگەڵ پرێنسس ساراكینا ژیانی هاوبەشی پێكبێنێ.

ئەو ئێرەییە بەجارێ ئاراوقارای لە ئانا هەڵگرتبوو و لە بیانوویەك دەگەڕا ئەو بە شیاوی بێزاریی خۆی بزانێ. ئەو تاوانی هەموو دژوارییەكانی ئەو بارودۆخەی خۆی دەخستە ئەستۆی ڤرۆنسكی. چاوەڕوانییەكی پڕئازار كە ئەو ناچاربوو لە مۆسكۆ، وەك لەنێوانی زەوی و ئاسماندا بێ، تامڵی دەكرد و هەروەها خاوەخاو و ساغنەبوونەوە لەسەر بڕیارێك و ڕاڕاییبوونی ئەلكسی ئەلكساندرڤیچ و تەنیاییی خۆی هەمووی بە تاوانی ئەو دەزانی. ئەگەر ڤرۆنسكی خۆشیویستبایە لەو بارودۆخە تاڵەی دەگەیشت كە تێیكەوتبوو و ڕزگاری دەكرد. تاوانی ڤرۆنسكی بوو كە ئانا هاتبوو بۆ مۆسكۆ و لە گوند نەبوو. ڤرۆنسكی نەیدەویست بەپێی ویستی ئەو خۆی لە گوند قەتیس بكات. ڤرۆنسكی حەزی نەدەكرد دوور لە كۆڕ و كۆبوونەوەی

گەوران بژی و هەر بەو هۆیە ئانای تووشی ئەو بارودۆخە ترسناك و نالەبارە کردبوو کە خۆی نەیدەویست لەو سەختی و دژوارییە بگات و هەروەها تاوانی ئەوبوو کە بووبووە هۆی ئەوەی هەتا هەتایە لە کوڕەکەی دوور بێت و ئەو ژانی دوورییە وەك خۆرە رۆحی دەخوارد.

تەنانەت ئەو ساتە کورت و زووتێپەڕانەی چێژ و خۆشەویستیی نێوانیان نەیدەتوانی ئاسوودە و دڵخۆشی بکات. ئانا لە مێهرەبانییەکانی ئەودا رەنگی ئاسوودەیی خەیاڵ و هێمنایەتییەکی دەدی کە لە رابردوودا نەبوو و هەر ئەوەش زیاتری ئازار دەدا.

هەوا بەرەو تاریکی دەچوو. ئانا چاوەڕوانی گەڕانەوەی ڤرۆنسکی بوو کە چووبوو بۆ کۆڕ و میوانداریيەك کە تەنیا پیاوانی سەڵت و رەبەن بەشدارییان تێدا دەکرد. لە ژووری کارەکەی ئەو دەهات و دەچوو (گرمە و هەرای شەقام کەمتر دەگەیشتە ئەو ژوورە) ئەو قسانەی کە کاتی دەمقڕە و چەلەحانێی شەوی رابردوو بە یەکتریان گوتبوو بە هەموو وردەکارییەکانییەوە لە زەینیدا وەردی دەدایەوە. دەگەڕایەوە سەر ئەو وشە دڵشکێنانەی کە لە کاتی دەمەقاڵێکەدا بە یەکتریان گوتبوو و هەوڵی دەدا هۆکارەکەیانی وەبیر بێتەوە. ئاخری گەیشتە سەرەتای شەڕە دەندووکەکەیان. ماوەیەکی زۆر نەیدەتوانی باوەڕ بکات کە ئاخافتنێکی ئاوا سادە و بێئازار و بابەتێك کە بۆ هیچ لایەکیان گرنگایەتیی نەبووە بۆچی ئاوا گەورەیان کردۆتەوە. بەڕاستیش هەروابوو. قسەکان لێرەوە دەستی پێکردبوو کە ڤرۆنسکی بە سووکایەتییەوە باسی قوتابخانەی کچانی کردبوو و بە شتێکی بێکەڵکی دانابوون و ئاناش بە شتێکی باشی دانابوون و بەرەڤانیی لێکردبوون. ڤرۆنسکی لەسەر یەك سووکایەتیی بە هەموو بابەتە فێرکاری و پەروەردەییەکانی ژنان کردبوو و گوتبووی کە هانا، هەر ئەو کچە ئێنگلیزییەی کە ئانا یارمەتیی دابوو و پەروەردەی دەکرد، هیچ پێویستییەکی بە فیزیك نییە.

ئەو قسەی زۆر لە دڵی ئانا گران هاتبوو، چونکە لەودا کینایەیەکی پڕسووکایەتیی دەرهەق بە خوێندنەوە و متالاکردنی خۆی دەدی و لە رستەیەك دەگەڕا کە وەك چزوو لە دڵی ڤرۆنسکیی راکات و تۆڵەی خۆی لێبکاتەوە و گوتبووی:

ـ من چاوەڕوانیی ئەوەم نییە تۆ حاڵی من و هەست و تاسەکانم بە دڵی پیاوێك هەست پێبکەی کە خۆشیدەوێم، بەڵام چاوەڕوانی ئەوەم لێتهەبوو کە زۆر توند نەڕۆی و شتێکی تێدا بهێڵیتەوە.

بەڕاستی ڤرۆنسکیش قسەکەی ئەوی لە دڵ گران هات و سوورهەڵگەڕا و قسەیەکی کرد کە دڵی ئانای تەزاند. بەڵام وەبیری نەدەهاتەوە چ وەڵامێکی پێدابۆوە. هەرچییەك بوو ڤرۆنسکیش راشکاوانە و بۆ ئەوەی بیڕەنجێنێ گوتی:

ـ من هیچ کارێکم بەسەر ئەم ئەشق و هەوەسە دەمارگرژانەیەوە نییە کە ئێوە بۆ ئەو کچەتان هەیە. راستییەکەی دەڵێم، چونکە دیارە ئەو هۆگرییەی ئێوە بۆ ئەو کچە سروشتی نییە.

ئەم دڵڕەقییە ئانای وا لێکرد کە ئەو ئاشتییەی ئانا زۆر بە زەحمەت مسۆگەری کردبوو تاکوو ژیانی دژواری خۆی بە یارمەتیی ئەو تامڵ بکات، ئەم بوختانە زاڵمانەیە بە خۆڕانان و بوونی خدەیەکی لاڕێیانە، بەجارێ ئانای ئاڵەتی کرد.

گوتی: زۆر بەداخەوەم کە ئێوە تەنیا لە توندوتیژی و لایەنە مادییەکانی ژیان تێدەگەن و بە شتێکی سروشتیی دەزانن ـ ئەوەی گوت و لە ژوورەکە چووەدەرێ.

کە شەو داهات ڤرۆنسکی هات بۆ لای، هیچ کام باسی دەمەقالێکەی رابردوویان نەکرد بەڵام هەردووکیان هەستیان دەکرد کە ژیلەمۆی رقێك لە ناخیاندایە و ئەو سکڵی رقە نەکووژاوەتەوە.

ئەو رۆژە ڤرۆنسکی هەتا ئێوارە رووی نەکردبۆوە ماڵێ و ئانا هێندەی هەست بە تەنیایی دەکرد و کێشەی دەروونی لەگەڵ ئەودا وەهای ماندوو کردبوو کە حەزی دەکرد هەموو شتێك لەبیربەرێتەوە و لێی خۆشبێ و لەگەڵی ئاشت ببێتەوە. دەیویست خۆی بە تاوانبار دانێ و هەق بە ئەو بدات.

لە دڵی خۆیدا دەیگوت «خەتای خۆمە. خۆم ئاڵەتی و جینگنۆکەم و ئێرەییەکەشم بێهۆیە. لەگەڵی ئاشت دەبمەوە و دەڕۆینەوە بۆ گوند. لەوێ هێدی تر دەبم.»

لەناکاو وتەکەی ڤرۆنسکی، کە زیاتر لە هەموو شتێك ئازاری دابوو هاتەوە بیری: «ناسروشتی». بەڵام وشەکە خۆی زۆر بەژان نەبوو بەڵکوو ئەو قەستی بریندارکردنە کە لە پشت ئەوەوەبوو ژانی خستبووە دڵییەوە.

بەخۆی گوت «دەزانم مەبەستی چییە. دەیویست بڵێ من کچەکەی خۆمم خۆشناوێ و خۆشەویستیم بۆ ئەو کچە بێگانەیە سروشتی نییە و خۆڕانانە. ئەو کوا لە ئەشقی دایکێك بۆ منداڵەکەی تێدەگات؟ ئەو کوا تێدەگات کە من سریۆژام کە لەبەر خاتری ئەو نایە ژێر پێ، چەندە خۆشدەویست؟ ئەو تەنیا دەیویست هەستم بریندار بکات. نا، ئەو ژنێکی تری خۆشدەوێ. دەبێ هەر ئەوەبێ.»

کە دیتی بۆ ئارامکردنەوەی خۆی، لەنێو جەغزێکدا دەخولێتەوە کە پێشتر زۆر جار تێیدا گەڕابوو و چووبۆوە سەر شوێنەکەی یەکەم و گرژی و ئاڵۆزییەکانی پێشوو و بیری لە حاڵی خۆی کردەوە و ترسی لێنیشت. بە خۆی گوت «یانی بەڕاستی توانای ئەوەم نییە؟ یانی بەڕاستی ناتوانم پێ بە تاوانی خۆمدا بنێم؟» ئەوەی گوت و دیسان دەستیپێکرد «ئەو درۆناکات. مرۆڤێکی شەرافەتمەندە و منی خۆشدەوێ. هەر ئەم رۆژانە کاری تەڵاقەکەم یەکلایی دەبێتەوە و ئیتر چیم دەوێ؟ تەنیا شتێك کە پێویستە

هێمنایەتی و متمانەیە. ئەوەش من وەئەستۆی دەگرم. بەڵێ، ئێستا دێتەوە و پێیدەڵێم کە من تاوانبارم. هەڵبەت تاوانی من نەبوو. بەڵام قەیناکا. قەبووڵی دەکەم و لێرە دەڕۆین.»

بەو نیازەی بیرنەکاتەوە و تەسلیمی هەستان نەبێ زەنگی لێدا و گوتی کە سندووقەکان بێنن تاکوو بارگەوبنە بپێچێتەوە و ئامادەبن بۆ گەڕانەوە بۆ گوند.

## بیست و چوار

ئانا بە روخسارێکی تاوانبار و مێهرەبانەوە بۆ پێشوازیی ڤرۆنسکی هاتەدەرێ و لێیپرسی: دەی، خۆشت رابوارد؟

ڤرۆنسکی بە روانینێك لە روخساری ئانا تێگەیشت کە خولکخۆشە. ئەو ئیتر خووی بەو گۆڕانە خێرا و حاڵەتە جینگنزییانەی گرتبوو و ئەمڕۆ بەو گۆڕانەی حاڵی ئانا زۆر دڵخۆش بوو چونکە خۆی زۆر بەکەیف بوو.

ئاماژەی بەو سندووقانە کرد کە لە سەرسەرا بوون و گوتی: ئەوە چییە؟ بەه، بەه، بژیی! زۆر چاکە!

ـ بەڵێ، دەبێ وەڕێ بکەوین! من چووبووم بۆ پیاسەکردن، ئەوەندە خۆشبوو کە دڵم کەوتە سەر هەوای گوند. هیوادارم تۆ ئیتر کارێکیوات نەبێ کە پەکی رۆیشتنەکەمان پێبخات.

ـ من هیچ ئارەزوویەکم جگە لەوە نییە. ئێستا دێم و قەراروبڕیەکەی دادەنێین. تەنیا جلەکانم دەگۆڕم. بڵێ چایی بێنن.

چوو بۆ ژوری کارەکەی خۆی.

لەبزی ئەو کاتەی گوتی «بەه، بەه، بژیی» شتێکی ئازاردەری پێوەبوو. وەك ئەوە وابوو کاتێك منداڵێك دەست لە وڕك گرتن هەڵدەگرێ خەلاتی دەکەن یان ئافەرەمی پێدەڵێن. لەوەش پڕئازارتر دژوازیی نێوان دداnپێدانانی خۆی بە تاوانباری و لەبزی متمانەی ڤرۆنسکی بۆ بەرهەقبوونی خۆی بوو، ئانا بۆ ساتێك هەستی کرد خەریکە گڕی تووڕەیی لە ناخیدا دادەگیرسێ. بەڵام ددانی بە جەرگیدا گرت و تووڕەییەکەی لە ناخی خۆیدا دامرکاند و بە رووخۆشی پێشوازیی لە ڤرۆنسکی کرد.

کاتێك ڤرۆنسکی پێینایە ژوورەکەوە ئانا ئەو کارانەی کە ئەو رۆژە کردبووی و پلانەکانی بۆ سەفەر بە بەیانێك کە تاڕادەیەك ئامادەی کردبوو، بۆی باسکرد.

گوتی: دەزانی، هەر دەڵێی پێمئیلهام کراوە... بەخۆم گوت بۆچی لێرە لەخۆڕا چاوەڕوانی تەڵاق بین. مەگین لە گوند ناکرێ چاوەڕوان بین؟ ئیتر نامەوێ سەبر بکەم. نامەوێ هیوادار بم و بەردەوام باسی تەڵاقم بۆ بکەن. خۆم ئامادەکردووە کە ئەم مەسەلەیە ئیتر هیچ شوێنێك لەسەر ژیانم دانەنێ.

ڤرۆنسکی بە دڵەدواییەوە چاوی لە روخساری شڵەژاوی ئانا کرد و گوتی: ئاخ، بەڵێ، زۆر چاکە.

ئانا دوای ئەوەی گتێکی گرت پرسیی: دەی ئێوە لەوێ چیتان کرد؟ کێ و کێ لەوێ بوون؟

ڤرۆنسکی میوانەکانی بۆ حیساب کرد.

ـ فراوێنەکەی زۆر بەتام بوو، پاشان پێشبڕکێی گەمیەوانی و هەموو شتێك زۆر خۆش و سەرنجڕاکێش بوو. بەڵام مەگین دەکرێ ئەو مۆسکۆییانە کارێك بکەن و نەیکەنە **رشقنجاڕی**. خانمێك لەوێبوو کە راهێنەری مەلەی مەلەکەی سوید بوو و هونەرەکانی خۆی نواند.

ئانا نێوچاوانی تێکنا و پرسیی: چۆن؟ مەلەی کرد؟

ـ بەڵێ، بە جلێکی سووری تایبەتی مەلەوە. نازانی چەندە پیرێژنێکی نالەبار بوو. دەی، ئێستا بڵێ بزانم، کەنگێ وەڕێ بکەوین؟

ئانا گوێی بە پرسیارەکەی ڤرۆنسکی نەدا و گوتی: چ فکرێکی گەوجانەیە! دەی، مەلەکردنەکەی شتێکی تایبەت بوو؟

ـ هەر هیچ شتێکی تایبەت نەبوو. گوتم شتێکی زۆر گەوجانە و قۆڕ بوو. دەی، ئێستا بیرت لێکردۆتەوە کەنگێ وەڕێ بکەوین؟

ئانا سەری خۆی راوەشاند، وەك ئەوەی بیهەوێ فیکرێکی ناخۆشی لێتووڕ بداتە دەرێ و گوتی: کەنگێ وەڕێ بکەوین؟ هەتا زووتر بڕۆین باشترە. سبەینێ فریا ناکەوین، دووسبەی.

ڤرۆنسکی گوتی: نا، راوەستە... دووسبەی یەکشەممەیە. من دەبێ بچم بۆ لای **دایەگیانم** ـ کە ئەوەی گوت حەپەسا، چونکە هەرکە ناوی دایکی دەهێنا هەستی دەکرد چاوی گوماناویی ئانا لە ناوچاوانی چەقیوە. عەبەسرانەکەی ئەو گومانەکەی ئانای قایمتر کرد. بە روخسارێکی هەڵبزڕکاوەوە لێی دوورکەوتەوە. ئەمجارەیان ئیتر راهێنەری مەلەی سوید نەبوو بەڵکوو پرێنسس ساراکینا بوو کە ماڵی لە ناوچەی مۆسکۆ بوو و کۆنتس ڤرۆنسکایا لەلای ئەو دەژیا و ئێستا لە هەمبەر چاوی خەیاڵی ئانادا خۆی قوت کردبۆوە.

ئانا گوتی: دەتوانی سبەینێ بچی بۆ ئەوێ.

ڤرۆنسکی وەڵامیدایەوە: نا، چۆن شتی وا دەبێ. من بۆ وەکالەتنامە و پارە دەمهەوێ چاوم بە دایکم بکەوێ و سبەینێ ئامادە نابێ.

ـ ئەگەروایە هەر ناڕۆین.

ـ باشە بۆچی؟

ـ هەر ئەوەی گوتم لە دووشەممە بەولاوە ئیتر ناڕۆین، یان دووشەممە، یان هیچ کاتێك!

ڤرۆنسکی وای نواند کە سەری سووڕماوە و گوتی: بەڵام ئاخەر بۆ؟ ئەو قسەیە زۆر بێ مانایە!

ـ بۆ تۆ بێ مانایە، چونکە تۆ هیچ کارێکت بە من نییە و ناتهەوێ لە ژیانی من تێبگەی و بۆشت گرینگ نییە. تەنیا شتێك کە لێرە سەرقاڵم دەکات هانایە و تۆ دەڵێی خۆم دەنوێنم. مەگین دوێنێ نەبوو گوتت من کچەکەمم خۆشناوێ و خۆم بە خۆشەویستیی ئەو کچە ئینگلیزییەوە رادەنێم؟ گوتیشت ئەو ئەشقە ناسروشتییە! من حەزدەکەم بزانم چ شتێك لێرە لەم بارودۆخەی ژیاندا دەکرێ بۆ من سروشتی بێت؟

بۆ ساتێك وەخۆ هاتەوە و لەوەی کە ئەو بڕیارەی دابووی لە بیری چووبۆوە ترسی لێنیشت. ئەگەرچی دەیزانی ئەو رێگایەی گرتوویەتە بەر بەرەو تێداچوونە بەڵام نەیتوانی ددان بە جەرگی خۆیدا بگرێ. نەیتوانی بێویژدانیی ئەو (واتە ڤرۆنسکی) بە خۆی نیشان نەدات و نەیتوانی پێملبێ بە تەسلیمبوون.

ـ من قەتم قسەیوا نەکردووە. من تەنیا گوتم ناتوانم وەك تۆ هوگری ئەو کچە بم و هەستم وەکوو تۆ وابێ.

ـ تۆ کە ئەوەندە شاتوشووت دەکەی و خۆت بە راستوێژ دەزانی بۆ ددان بە هەقیقەتەکەدا نانێی؟

ڤرۆنسکی هەولێدەدا ئەو گڕی تووڕەییە لە دڵیدا دامرکێنێ کە خەریکبوو بڵێسە بکێشێ، زۆر لەسەرەخۆ گوتی: من قەتم شاتوشووت نەکردووە و درۆشم لە دەم دەرنەهاتووە. زۆریش بەداخەوەم کە ناتوانی رێزی...

ـ رێزیان بۆ ئەوە داناوە تاکوو جێگای بەتاڵی ئەوینی پێپڕ بکەنەوە. تۆ ئەگەر منت خۆشناوێ چاکتر و شەرافەتمەندانەتر ئەوەیە کە راشکاوانە ددانی پێدابنێی.

ڤرۆنسکی لە جێی خۆی هەستا و دەنگی هەڵبڕی: نا، ئیتر خەریکە لە تامی دەردەکەی و بۆم تاملێ ناکرێ ـ لە هەمبەریدا راوەستا و هێواش و لەسەرەخۆ گوتی:

ـ بۆچی ئارامی و لەسەرخۆییەکەی من ئاوا تووشی تەنگژە دەکەی؟ ـ رواڵەتیشی جۆرێك بوو دەتگوت دەیهەوێ شتی توندتریش بڵێ بەڵام ددانی بەخۆیدا گرت: دەزانی تاقەتی منیش ئەندازەیەکی هەیە؟

ئانا بە ترسەوە چاوی لە روخساری کرد کە بە ئاشکرا شوێنەواری وەڕەزیی پێوە دیاربوو و گڕی دڵڕەقی لە چاوە تۆقێنەرەکانیدا بڵێسەی دەکێشا، گوڕاندی: مەبەستت لەو قسەیە چییە؟

ـ مەبەستم ئەوەیە کە... ـ بەڵام ئەو قسەی هات بیڵێ تەواوی نەکرد و گوتی: من دەبێ لە تۆ بپرسم کە چیت لە من دەوێ؟

ئانا کە نەگوتراو تێگەیشتبوو گوتی: من دەتوانم چیم لە ئێوە بوێ؟ تەنیا دەتوانم بڵێم وازم لێمەهێنە. چونکە ئەوە کارێکە کە دەتهەوێ بیکەی. بەڵام خواستی دڵم ئەوە نییە. ئەوەی گوتم خواستی دووهەمە. من خۆشەویستیم دەوێ، خۆشەویستیش ئیتر وشکاوی هاتووە. کەوایە هەموو شتێك تەوا بووە.

کە ئەوەی گوت بەرەولای دەرگاکە ملی پێوەنا.

ڤرۆنسکی، بێ ئەوەی نێوچاوانە گرژەکەی بکرێتەوە دەستی ئانای گرت و گوتی: سەبرکە... سەبر... کە. ئەوەچییە بۆ وادەکەی؟ من گوتم رۆیشتنەکەمان سێ رۆژ وەدوا دەخەین کەچی تۆ بە درۆزنم لەقەڵەم دەدەیت و دەڵێی بێشەرافەتم؟

ئانا ئەو قسانەی کە لە کێشەی پێشوودا گوتبووی وەبیری هاتنەوە و گوتی: بەڵێ، دیسان دەیلێمەوە کەسێك هەردەم منەتبارم دەکا و دەکێشێ بە سەرمدا کە هەموو شتێکی لە رێگای مندا فیدا کردووە، مرۆڤێکی ئەوتۆ لە بێشەرافەتیش خراپترە. ئەم مرۆڤە دڵی لە بەرد رەقترە و مانای ئەشق تێناگات و نازانێ چیشە.

ڤرۆنسکی دەستی ئانای بە توندی بەردا و گوڕاندی: نا، ئیتر بۆم تاملێ ناکرێ.

ئانا لە دڵی خۆیدا گوتی «دیارە، دڵی لە قین و رق زیاتر هیچی تێدا نییە.» بێدەنگ بوو و بێ ئەوەی رووی تێبکات بە هەنگاوی شل و دوودڵانە لە ژوورەکە چووەدەرێ.

کاتێك پێی دەنایە نێو ژوورەکەی خۆیەوە لە دڵی خۆیدا گوتی «دیارە حەز لە ژنێکی دیکە دەکات. ئیتر گومانم لەوە نییە.» ئەو قسانەی تاوێك لەمەوبەر کردبووی دووپاتی کردەوە: من خوشەویستیم دەوێ و خۆشەویستی ئیتر وشکاوی هاتووە. یانی هەموو شتێك تەواوبووە. دەبێ کارەکە یەکلایی بکرێتەوە.

لەسەر کورسیی بەر ئاوێنەکە دانیشت و پرسیی: بەڵام چۆن؟

فیکر و خەیاڵ لە زەینیدا فەرتەنەی سازکردبوو و نەیدەزانی چ بکات: ئێستا بچێ بۆکوێ؟ بۆ لای ئەو پوورەی کە گەورەی کردبوو؟ یان بۆ لای دالی؟ یان بە تەنیا بڕوات بۆ دەرەوەی وڵات؟ بیری کردەوە بێژی ئەو ئێستا لە دەفتەرەکەی چ بکات؟ یانی ئەمە دوایین کێشە و دەمەقاڵێ بوو؟ یان هێشتا دەکرێ ئاشت ببنەوە؟ ئێستا ئاشنا و ناسیاوانی پێشووی پترزبۆرگی چۆنی باس دەکەن؟ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ چۆن

بیردەکاتەوە؟ هەروەها زۆر فیکر و خەیاڵی تر سەبارەت بەوەی کە دوای جیابوونەوە لەوانەیە بێتە پێشێ" گێژاوی ئەو فیکرانە لە مێشکیدا بوو بەڵام ئەو بە تەواوی خۆی بۆ شل نەدەکردن. لە قووڵایی هەستیدا ئەندێشەیەکی لێڵ هەبوو و تاقە ئەندێشەیەك بوو کە زەینی ئەوی بۆ لای خۆی رادەکێشا، بەڵام ئەو نەیدەتوانی بە جوانی تێبیگات و بزانێ چییە. کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی هێنایەوە بیری خۆی نەخۆشینی کاتی زەیستانییەکەی وەبیرهاتەوە و هەروەها یادێك کە ئەو کاتە دەستی لە سەری هەڵنەدەگرت. هەستی ئەو کاتەی وەبیرهاتەوە و ئەوەی کە دەیگوت: «بۆ نەمردم؟» پاشان لە ناکاو بیرێك کە لە ناخی گیانیدا بوو ئاوێتەی فامی بوو و بۆی روون بۆوە. بەڵێ، ئەمە تاقە فیکرێك بوو کە کۆتاییی بە هەموو گرفت و کێشەکانی دەهێنا: بەڵێ، واچاکە بمرێ!

«لە لایەکەوە شەرم و ئابڕووچوونی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، لە لایەکی تریشەوە سەرشکستە بوونی سریۆژا و هەروەها شەرمەزاریی ترسناکی خۆشم، هەمووی بە مەرگ دەسڕدرێتەوە. بەڵێ، من دەمرم و ئەو لە ئاکاری خۆی پەژیوان دەبێتەوە، ئەو کاتە دڵی پێمدەسووتێ و خۆشیدەوێم و لە تاوی من ئازار دەکێشێ.» بە بزەیەکی پڕ بەزەیییەوە بۆ خۆی و لەگەڵ ئەوەی زۆری دڵ بەخۆی دەسووتا ئەنگوستیلەکانی لە قامکی دەستە چەپی داکەند و دیسان تێیکردەوە و حاڵی ئەوی دوای مەرگی خۆی لە زەینیدا وەردەدایەوە و لە هەموو بارێکەوە بە روونی هێنایە بەرچاوی خۆی.

ترپەی پێیەك نزیك دەبۆوە، ترپەی پێی ڤرۆنسکی بوو و ئەوی لە گێژەنی فیکر و خەیاڵ هێنایە دەرێ. واینواند کە خەریکی رێکوپێك کردنی ئەنگوستیلەکانییەتی و بەو بۆنەوە هیچ هەمیەتێکی پێنەدا.

ڤرۆنسکی لێیهاتە پێشێ و دەستی گرت و بە نەرمی گوتی:

ـ ئانا باشە، ئەگەر تۆ وات پێباشە دووسبەی دەڕۆین. هەرچۆنێك تۆ بڵێی وادەکەین.

ئانا هیچی نەگوت.

ڤرۆنسکی پرسیی: چییە بۆ وادەکەی؟

ئانا گوتی: خۆت باشتر دەزانی ـ ئیتر نەیتوانی ددان بە خۆیدا بگرێ و دای لە قوڵپەی گریان.

بەدەم گریانەوە دەیگوت: لە کۆڵمبەوە، چکارت بە من داوە. من سبەینێ لێرە دەڕۆم... لەوەش زیاتر... ئاخر من کێم؟ ژنێکی ناوزڕاو. گۆشتی گەردەمل. ئیتر نامەوێ لەوە زیاتر ئازارت بدەم و خۆمت پێوە هەڵواسم. نامەوێ. ئازادبە بۆخۆت. منت خوشناوێ، بڕۆ... تۆ حەز لە ژنێکی تر دەکەی.

ڤرۆنسکی دەستیکرد بە پاڕانەوە و داوای لێکرد ئارام بێتەوە و دڵنیای کرد کە ئەو گومان و ئێرەییەی شتێکی بێبنەمایە و لەخۆڕا ئاوا تووشی گومان و دڵپیسی بووە. گوتی کە هیچکات خوشەویستی ئەو لە دڵیدا کەم نابێتەوە و تا هەتایە هەروا خۆشیدەوێ و تەنانەت ئێستا زۆر لە پێشوو زیاتری خۆشدەوێ.

دەستی ئانای ماچکرد و گوتی: ئانا، بۆچی خۆشت و منیش ئازار دەدەی؟ ـ روخساری لەوکاتەدا پڕ لە سۆز و مێهرەبانی بوو. دەنگی لە گوێی ئانادا زایەڵەی گریانی پێوەبوو و دەتگوت تەڕاییی فرمێسك لەسەر دەستی خۆی هەست پێدەکات. ئێرەیی و گومانی ئانا بۆ ساتێك بوو بە دڵنەرمی و ئەشقێکی بەسۆز و ئاگرین. ڤرۆنسکیی لە باوەش گرت و سەر و مل و دەستی ماچباران کرد.

## بیست و پێنج

ئانا کە هەستی دەکرد ئاشتبوونەوەکەیان قووڵ و مسۆگەرە بۆ بەیانی زۆر بە دڵخۆشی و رووخۆشییەوە دەستیکرد بە خەبابەت و ئامادەکردنی بارگەوبنەی سەفەر. ئەگەرچی روون نەبوو ئاخری رۆژی دووشەممە دەڕۆن یان سێشەممە، چونکە هەردووکیان لەبەر دڵی یەکتری وازیان لە پێداگری هێنابوو، ئانا زۆر بە تینوتاو خەریکی ئامادەکردنی بارگەی سەفەر بوو و بەلایەوە هیچ جیاوازییەکیشی نەبوو رۆژێك زووتر وەڕێ بکەون یان درەنگتر. لە ژوورەکەی خۆی، لەبەر سندووقەکەدا راوەستابوو و کەلوپەلەکانی رێکوپێك دەکرد کە ڤرۆنسکی زووتر لە کاتی ئاسایی جلەکانی گۆڕی و هات بۆ لای.

گوتی: من هەر ئێستا دەچم سەرێك لە دایکم هەڵدێنم. دایکم دەتوانێ دواتر پارەکە بە یەگۆرۆڤدا بنێرێ. بەمشێوەیە ئامادەدەبین و سبەینێ وەڕێ دەکەوین.

ئەگەرچی ئانا رووخوش دیاربوو بەڵام چوونی ڤرۆنسکی بۆ ڤیلاکەی ساراکینا و چاوپێکەوتنی دایکی وەکوو نەشتەر لە دڵی رادەچوو.

گوتی: نا، من خۆشم ناتوانم بو سبەینێ ئامادەبم. ـ بەڵام لە دڵی خۆیدا گوتی «کەوایە دەیتوانی کارەکە وارێك بخات کە سەفەرەکەمان بەپێی مەیلی من بێت.» پێشیگوت: نا، خۆت چۆنت پێباشە وابکە. برۆ بۆ ژووری نانخواردن. منیش دێم. بەڵام دەبێ ئەو کەلوپەلانەی پێویست نین کۆیانبکەمەوە و وەلایان بنێم. ـ شتێکی تری خستە سەر ئەو باوەشە پەڕوپاڵە کە ئانووشکا هەڵیگرتبوو.

ڤرۆنسکی خەریکی خواردنی بیفتەك بوو کە ئانا هات بۆ ژووری خواردن.

لە پەنای ڤرۆنسکی و بەرەورووی پەرداخی قاوەکەی کە لەسەر مێزەکە بوو دانیشت و گوتی: نازانی چەندە لەم ژوورانە بێزارم! هیچ شتێك لەم **ژووره قەنەفانە** ناخۆشتر نییە. نە دڵ پێی دەکرێتەوە و نە رۆح! ئەو کاتژمێرە و ئەم پەردانە و لە هەمووشی خراپتر ئەو کاغەز دیوارییانە، هەموویان کامووسێکی دڵهەژێنن. ڤازدۆڤیژنسکۆیە بۆ من وەك جێژوان وایە. ئەسپەکان نانێری؟

ـ نا، ئەسپەکان بە دوای ئێمەدا دەیانهێنن. تۆ دەتهەوێ بۆ شوێنێك بچی؟

ـ دەمویست سەرێك لە ڤیسلۆن هەڵێنم. دەبێ جلوبەرگی بۆ بەرم ـ بە دەنگێکی پڕنەشەش گوتی: چاکە کەوایە بڕیارەکە دراوە؟ سبەینێ وەڕێ دەکەوین؟ ـ بەڵام لەناکاو رەنگی گۆڕا.

پێشخزمەتی ڤرۆنسکی هاتەژوورێ تاکوو پسوولەی وەرگرتنی ئەو تێلگەڕامە وەرگرێ کە لە پترزبۆرگەوە هاتبوو. گەیشتنی تێلگەڕامەکە شتێکی زۆر تایبەت نەبوو، بەڵام ڤرۆنسکی وەك ئەوەی بیهەوێ شتێك لە ئانا بشارێتەوە، گوتی کە پسوولەکە لە ژووری کارەکەیەتی و بەپەلە رووی لە ئانا کرد و گوتی: بەڵێ بڕیاردرا. هەتا سبەینێ هەموو کارەکان جێبەجێدەکەم.

ئانا ئیتر گوێی بۆ ئەو نەگرتبوو پرسیی: تێلگەڕامەکە لەلایەن کێوەبوو؟

ڤرۆنسکی بە نابەدڵی وەڵامیدایەوە: ستیڤا.

ـ ئەی بۆ نیشان منت نەدا؟ ستیڤا، دەبێ چ رازێکی هەبێ کە بیهەوێ لە منی بشارێتەوە؟

ـ من نەمویست نیشانتی بدەم چونکە ستیڤا ئازاری تیلگەڕافکردنی هەیە. کاتێك هێشتا کارەکە یەکلایی نەبۆتەوە تێلگەڕافی بۆچییە؟

ـ سەبارەت بە تەڵاق؟

ـ بەڵێ، نووسیویەتی کە هێشتا نەیتوانیوە کارەکە جێبەجێ بکات بەڵام بەڵێنیداوە هەتا چەند رۆژی تر وەڵامی تەواوبداتەوە. هانێ خۆت بیخوێنەوە.

ئانا تێلگەڕامەکەی بە دەستی لەرزۆکی خۆی گرت و هەر ئەو شتەی کە ڤرۆنسکی گوتبووی خوێندییەوە. لە کۆتاییی تێلگەڕامەکەدا ئەمەی زیادکردبوو: زۆر هیوادار نیم بەڵام بلوێ یان نەلوێ هەرکارێکم لە دەست بێت دەیکەم.

ئانا سوورهەڵگەڕا و گوتی: من دوێنێ گوتم کە ئیتر بۆ من جیاواز نییە کەنگێ تەڵاق وەردەگرم، یان وەریدەگرم یان نا، هیچ پێویستییەك نەبوو کە ئەم هەواڵە لە من بشاریتەوە ـ لە دڵی خۆیدا گوتیشی: «چەند چاکیش دەتوانێ شتەکانم لێبشارێتەوە! حەتمەن نامە و پێوەندی گرتن لە گەڵ ژنانیش ئاوا لە من دەشارێتەوە.»

ڤرۆنسکی گوتی: دەزانی یاشڤین دەیویست ئەمڕۆ بەیانی لەگەڵ ڤایتۆڤ[82] بێت بۆ ئێرە. وادیارە پارەی بەدەست پۆتسۆڤ نەهێشتووە و هەمووی لێبردۆتەوە و تەنانەت زۆر زیاتر لەوەی کە بتوانێ بیدات، نزیکەی شەست هەزار رۆبڵ.

ئانا لەوەی کە ڤرۆنسکی بە گۆڕینی باسەکە ئاوا بە ئاشکرا نیشانی دەدا کە ئەو (یانی ئانا) ناڕاحەت بووە، رقی هەستا و گوتی: نا، بەڵام بۆچی پێتوایە ئەو مەبەستە بۆ من زۆر گرینگە کە دەتهەوێ لە منی بشاریتەوە؟ من گوتبووم کە من بە هیچ شێوەیەك نامەوێ بیریشی لێبکەمەوە و حەزم دەکرد ئەو مەسەلەیە بۆ توش گرنگایەتیی نەبێ وەك بۆ من نییەتی.

ڤرۆنسکی گوتی: ئەم هەواڵە بۆ من بەو هۆیە گرینگە کە حەزدەکەم ئەم کێشەیە لایەکی بە لایەکدا بکەوێ و روون بێتەوە.

ئانا بەردەوام زیاتر بە رقدا دەچوو بەڵام توورەییەکەی نەك لە وشەکانیدا بەڵکوو لە ساردیی لەبز و وتەکانیدا خۆی دەنواند. گوتی: روون بوونەوە خۆ بە رواڵەت نییە، لە ئەشقدایە. تەڵاق بە کاری چیدێ؟

ڤرۆنسکی نێوچاوانی تێکنا و لە دڵی خۆیدا گوتی: «خودایە، دیسان هاتەوە سەر باسی ئەشق.»

گوتی: تۆ باش دەزانی بۆ بەلامەوە گرینگە. بۆ تۆش و بۆ ئەو منداڵانەش کە دەمانبێ.

ـ ئیتر منداڵمان نابێ.

ـ بەداخەوە.

ئانا تەواو لە بیری چووبۆوە یان هەر گوێی لێنەبوو کە ڤرۆنسکی گوتبووی: «بۆ تۆش و بۆ ئەو منداڵانەش کە دەمانبێ» گوتی: تۆ تەڵاقی منت تەنیا بۆ منداڵ دەوێ و بیر لە من هەر ناکەیتەوە.

مەسەلەی منداڵداری ماوەیەك بوو بووبووە هۆی دەمقڕە و کێشەی نێوانیان و هەموو جارێك دەبووە هۆی رقهەستانی ئانا. هۆگریی ڤرۆنسکیی بۆ منداڵداری بەوە لێکدەدایەوە کە سەبارەت بە جوانییەکەی ئەو خەمساردە.

ڕوخساری ڤرۆنسکی، وەك ئەوەی ژانێکی جەستەییی پێگەیشتبێ، گرژ بوو و دووپاتی کردەوە: پەککوو، من گوتم بۆ تۆ، بەر لە هەموو شتێك لەبەر خاتری تۆ. چونکە دڵنیام ئەم دڵناسکی و زووهەڵچوونەی تۆ زیاتر لە هەموو شتێك بە هۆی ئەو ناڕوونییەوەیە.

---

82- Voytov

ئانا کە گوێی بۆ قسەکانی ئەو ڕانەگرتبوو و تەنیا چاوی لە داوەرێکی کەمتەرخەم و بێبەزەیی دەکرد کە بۆ وروژاندنی ئەو لە چاوی ڤرۆنسکییەوە تێیڕامابوو، لە دڵی خۆیدا گوتی «ئەها، ئێستا ئیتر دەربەستی خۆڕانانیش نییە و تەواوی رقو قینی خۆی دەنوێنێ.»

ئانا گوتی: نا، هۆیەکەی ئەوە نییە. تەنانەت تێناگەم کە چۆنیش دەکرێ ئەوەی تۆ ناوی دەنێی زووهەڵچوون و دڵناسکی بە هۆی ناڕوونیی کێشەکەمانەوە بێ. من بە تەواوی گیرۆدەم لە چنگی تۆدا. ئەوە کوێی ناڕوونییە؟ بەپێچەوانە...

ڤرۆنسکی کە خیشەسەرانە دەیویست ئەوەی لە مێشکیدایە دەربڕێ، قسەکەی بە ئانا بڕی و گوتی: زۆر بەداخەوەم کە تۆ ناتهەوێ تێبگەی. کێشەکە لەوەدایە کە تۆ پێتوایە من ئازادم.

ئانا گوتی: لەو بارەوە دڵنیابە- رووی لێوەرگێڕا و دەستیکرد بە خواردنەوەی قاوەکەی.

پەرداخەکەی هەڵگرت، قامکە تیتۆڵەی خۆی دوور لە قامکەکانی تری ڕاگرتبوو، بە دوو قامك پەرداخەکەی برد بۆ دەمی. چەند قومی لێخواردەوە و چاوێکی لە ڤرۆنسکی کرد و بە حاڵەتی سیمایدا بە ڕوونی تێگەیشت کە ئەو لە حاڵەتی دەست و ئاکاری ئەو کاتی خواردنەوەی قاوە و مڵچەی دەمی بێزارە.

پەرداخەکەی بە دەستی لەرزۆکی لەسەر مێزەکە دانایەوە و گوتی: من بە هیچ شێوەیەك کارم بەسەر ئەوەوە نییە کە دایکت چۆن بیردەکاتەوە و چۆن دەیهەوێ ژنت بۆ بێنێ.

ـ بەڵام لێرەدا خۆ باس لەسەر دایکی من نەبوو.

ـ بۆچی، من ڕاست مەبەستم ئەوەیە. بڕوا بکە بەلای منەوە ژنێکی دڵڕەق، جا پیر بێت یان جحێڵ و دایکی تۆ بێت یان بێگانە پووڵێکی قەڵب ناهێنێ و هیچ ڕێزێکی بۆ دانانێم.

ـ ئانا تکات لێدەکەم سووکایەتی بە دایکم مەکە.

ـ ژنێك کە لە ڕێگای هەستی دڵەوە نەتوانێ لەوە بگات کە بەختەوەریی کوڕەکەی لە چیدایە و ویژدان و شەرافەتی چۆن حوکم دەکات ژنێکی ئاوا هەرکەسێك بێ دڵڕەق و بێبەزەییە.

ڤرۆنسکی بە ڕوانینێکی سەخت و دەنگی بەرز گوتی: تکاکەی خۆم دووپات دەکەمەوە. من ڕێزم بۆ دایکم هەیە و تکات لێدەکەم سووکایەتیی پێمەکە.

ئانا وەڵامی نەدایەوە. چاوی تێبڕیبوو و لە روخسار و دەستی دەڕوانی و تەواوی وردەکارییەکانی ئاشتبوونەوەی ڕۆژی دوایی و لاواندنەوە عاشقانەکانی ئەوی وەبیرهاتەوە

بەخۆی گوت «ژنانی دیکەشی ئاوا بە ئاسانی لاواندۆتەوە و رایموسیون و دوای ئەوەش هەر دەیکات و حەزیش دەکات بیکات.»

ئانا بە بێزارییەوە چاوی لێکرد و گوتی: تۆ دایکت خۆشناوێ. ئەوانە هەمووی قسەیە، قسەی پڕوپووچە و وتەی بێ مانا.

ـ ئەگەر وایە دەبێ...

ـ دەبێ کارەکە یەکلایی بکەیەوە و من بڕیاری خۆمم داوە ـ کە ئەوەی گوت دەیویست لە ژوورەکە بڕواتە دەرێ کە یاشڤین خۆیکرد بە ژووریدا. ئانا سڵاو و چاکوخوشیی لەگەڵ کرد و لەوێ مایەوە.

بۆچی کاتێك کە فەرتەنەیەك لە رۆحیدا سەری هەڵدابوو و هەستی دەکرد لە رێگای ژیاندا تووشی گەوەیەك بووە کە لەوانەیە ئاکامێکی تووش و نالەباری بەدواوە بێ، بۆچی لە ساتێکی ئاوا هەستیاردا لە هەمبەر بێگانەیەکدا کە درەنگ یان زوو ئاگاداردەبوو بە پێویستی دەزانی رواڵەتسازی بکات؟ ئەوە شتێك بوو کە هیچ وەڵامێکی بۆی نەبوو.

لەڕێوە تۆفانەکەی ناخی خۆی نیشاندەوە و دانیشت و لەگەڵ میوانەکە دەستیکرد بە ئاخافتن.

ڕووی لە یاشڤین کرد و پرسیی: دەی، وەزعت چۆنە؟ قەزرەکەت وەرگرتەوە؟

یاشڤین گوتی: وەزعم خراپ نییە. پێموانییە هەموو قەرزەکەم بۆ وەرگیرێتەوە و چوارشەممەش دەبێ لێرە بڕۆم. ئێوە کەی وەڕێدەکەون؟ ـ جاروبار چاوێکی لە ڤرۆنسکی دەکرد و دیاربوو تێگەیشتووە کە نێوانەکەیان ساردە و دەمەقاڵێیان بووە و گرژ بوو.

ڤرۆنسکی گوتی: وادیارە دووسبەی وەڕێ دەکەوین.

ـ ئێوە خۆ لەمێژە قەستی رۆیشتنتان هەیە.

ئانا گوتی: بەڵام ئەمجارە ئیتر حەتمییەـ راست چاویشی لە چاوی ڤرۆنسکی بڕی و بە نیگای دەیویست تێیبگەیێنێ کە خەیاڵی ئاشتبوونەوەی لە مێشکی خۆی دەربکات.

ڕووی لە یاشڤین کرد و چووە سەر باسەکەی پێشوویان و پرسیی: بەڵام هەر بەڕاستی بەزەییت بەو پووتسۆڤە داماوەدا نایە؟

ـ دەزانی ئانا ئارکادیۆڤنا، من هیچ کات لە خۆمم نەپرسیوە کە دڵم بۆ خەنیمی یارییەکەم دەسووتێ یان نا. ئەو جۆرەی کە لە مەیدانی شەڕدا بەزەیی بێ مانایە ـ کە ئەوەی گوت ئاماژەی بە گیرفانی باخەڵی کرد و درێژەی پێدا: هەموو سامانی من لێرەدایە. من ئێستا مرۆڤێکی دەوڵەمەندم. بەڵام ئەمشەو دەچم بۆ باشگا و لەوانەیە بە دەستی خاڵی بگەڕێمەوە. خەنیمەکەی منیش جگە لە رووتکردنی من هیچ قەستێکی نییە. منیش هەروا. شەڕ و پێکدادانە و چێژ و خۆشییەکەشی هەر لەوەدایە.

ئانا گوتی: ئەگەر ژنت ببوایە، ژنەکەت چ حالێکی دەبوو؟

یاشڤین دەستیکرد بە پێکەنین و گوتی: جادیارە. هەر بۆیە ژنم نەهێناوە و قەتیش بیرم لێنەکردۆتەوە.

ڤرۆنسکی پەڕییە نێو قسەکانیان و چاوێکی لە ئانا کرد کە پێدەکەنی و گوتی: کەوایە هێلسینگفۆرس[٨٣] کێبوو؟

ڤرۆنسکی کە چاوی بە روخساری ئانا کەوت هێندە سارد و سەختی هاتە بەرچاو کە دەتگوت دەڵێ: لە بیرت بێ، شەڕ و کێشەکەمان هەروا لەجێی خۆیەتی.

ئانا بە یاشڤینی گوت: راست دەکەی! تۆش ئەویندار بووی؟

ـ ئاخ، خودایەگیان، زۆریش! بەڵام سەرنجی ئەو خاڵە بدە، هێندێکەس کاتێك لەسەر مێزی قومار دادەنیشن کە وەختی ژوان لەگەڵ گراوەکەیان دێ لەڕێوە مێزی قومار بەجێ دەهێڵن و دەڕۆن. بەڵام من بە پێچەوانە، ئەشق و خۆشەویستی بە خراپ نازانم بەڵام بەشەرتێك شەوێ بۆ گەیشتنە سەرمێزی قومار وەدرەنگ نەکەوم. بەڵێ، قەرار و بڕیەی دڵداریی من ئاوایە.

ـ نا من باسی ئەو جۆرە ئەشقە ناکەم. مەبەستم ئەشقی راستەقینەیە ـ دەیویست بڵێ «مەبەستم هێلسینگفۆرس بوو» بەڵام نەیدەویست ئەوەی ڤرۆنسکی گوتبووی ئەو دووپاتی بکاتەوە.

ڤایتۆڤ، کە دەیویست ئەسپێك لە ڤرۆنسکی بکڕێ هاتەژوورێ. ئانا بە دەرفەتی زانی و خێرا هەستا و لە ژوورەکە چووەدەرێ.

ڤرۆنسکی بەر لەوەی لە ماڵێ بڕواتە دەرێ هات بۆ لای ئانا. ئانا دەیویست وابنوێنێ کە لەسەر مێزەکە لە شتێك دەگەڕێ بەڵام چونکە رواڵەتسازیی پێعەیب بوو بە نیگایەکی سارد راست چاوی لە چاوی بڕی.

بە زمانی فەڕەنسی پرسیی: **چیت دەوێ؟**

ـ قەواڵەی گامبیتا. فرۆشتم ـ لەبزیشی جۆرێك بوو کە روونتر لە هەموو وتەیەك دەریبڕی: ئێمە هیچ قسەیەکمان نییە پێکەوە بیکەین و ئیتر قسەش بە هیچ کوێ ناگا.

ڤرۆنسکی بەخۆی گوت «من هیچ خەتایەکم دەرهەق بە ئەو نەکردووە. ئەگەر ئەو دەیهەوێ خۆی سزا بدات، **خۆی دەزانێ.**» بەڵام کاتێك دەیویست لە ژوورەکە بڕواتە دەرێ پێیوابوو ئانا شتێکی گوت و دڵی هێندە پێیسووتا کە ئازای ئەندامی کەوتە لەرزین.

---

83- Helsingfors

پرسیی: ئانا، چیت گوت؟

بەڵام ئانا هەر بەو ساردی و ئاسوودەییە گوتی: من؟ نا، هیچم نەگوت.

ڤرۆنسکی لە دڵی خۆیدا گوتی «ئاخ، هیچت نەگوت؟ باشە، **کەوایە هیچ.**» دیسان گڕی سۆزەکەی دامرکایەوە و رووی وەرگێڕا و رۆیشت.

کاتێك لە دیوەکە دەچووەدەرێ دەموچاوی ئانای لە ئاوێنەکەدا دی کە رەنگی هەڵبزرکابوو و لێوی دەلەرزین. دەیویست راوەستێ و بۆ دڵخۆشیدانەوە شتێك بڵێ. بەڵام لاقی لە فەرمانی خۆیدا نەبوون و بەر لەوەی رستەیەك بۆ دڵدانەوەی ئەو بدۆزێتەوە لە ژوورەکە چووبووە دەرێ. ئەو رۆژە هەتا ئێوارە سەری نەکردەوە بە ماڵێدا. شەوێ درەنگ هاتەوە بۆ ماڵێ و خزمەتکارەکەی پێیگوت ئانا ئارکادیۆڤنا ژانەسەرێتی و دەستووری داوە هیچ کەس نەچێتە ژوورەکەی.

## بیست و شەش

ئەو رۆژە هەتا ئێوارێ جگە لە ماوەیەك کە چوو بۆ سەردانی خانمی ڤیلسۆن و نزیکەی دوو سەعات لەوێ مایەوە، بەردەوام دوودڵ و راڕا بوو کە بڵێی کارەکە بەڕاستی کۆتاییی هاتبێ یان هێشتا هیوایەك بۆ ئاشتبوونەوە هەیە و نەیدەزانی هەر ئێستا لە ماڵێ بڕواتە دەرێ یان راوەستێ و جارێکی تر چاوی پێیبکەوێ؟ ئەو رۆژە هەتا ئێوارێ چاوەڕوانی ڤرۆنسکی بوو بەڵام کاتێك چووە وەتاغەکەی خۆی و پەیامی بۆ دانا کە سەری دێشێ و بە خۆی گوت ئەگەر سەرەڕای ئەم پەیامەش بێت بۆلام ئەوا دیارە هێشتا خۆشیدەوێم. بەڵام ئەگەر نەیەت ئەوا دیارە کارەکە تەواوبووە و ئەو کاتە بڕیاری خۆم دەدەم کە چ بکەم و چینەکەم.

شەو بەسەردا هات و تەقوکوتی راوەستانی فایتوونەکەی و پرمەی ئەسپەکان و زرەی زەنگلێدانەکەی و ترپەی هەنگاونانی و قسەکردنی لەگەڵ کڵفەتەکەی بیست. ئەوەی پێیان گوت باوەڕی کرد و پرسیارێکی دیکەی نەکرد و هیچ زانیارییەکی لێنەویستن و رۆیشت بۆ ژوورەکەی خۆی. کەوایە کۆتاییی هاتووە.

دیسان بیری مەرگ، وەکوو تاقە کەرەسەی گەشاندنەوەی ئەوینی خۆی لە دڵی ئەودا و سزادانی ئەو و سەرکەوتن لە شەڕێکدا کە رۆحی ناپیرۆزی سەنگەر گرتوو لە دڵیدا لەگەڵ ڤرۆنسکی سازی دەکرد، روون و زیندوو دەیهێنایە بەرچاوی خۆی.

ئێستا ئیتر هەموو شتێك بەلایەوە یەکسان بوو: بچێت بۆ ڤاژدۆنسکۆیە یان نا، مێردەکەی تەڵاقی بدات یان نا، ئیتر پێویستی بە هیچ کامیان نەبوو. تەنیا شتێکی دەویست، ئەویش سزادانی ڤرۆنسکی بوو.

کاتێك تراوی ئاسایی و خۆراکی مۆرفینەکەی کردە نێو لیوانەکەوە بیری کردەوە شووشە مۆرفینەکە یەکبین بنێ بە سەرییەوە و بمرێ، ئەم فیکرەش هێندە سادە و جێبەجێکردنیشی لەبەر چاوی بەرادەیەك ئاسانی نواند کە ئازار و پەشیمانیی ڤرۆنسکیی بە چێژەوە هێنایە بەرچاوی خۆی و بیری کردەوە کە ئەو کاتە ئەو (ڤرۆنسکی) عەشقە گەرم و بەسۆزەکەی وەبیردێتەوە و بە بەرد بە چۆکی خۆیدا دەدا بەڵام تازە کار لەکار ترازاوە. بە چاوی ئاوەڵاوە لەسەر پێخەفەکەی راکشا و لەبەر سۆڵەی تەنیا شەمی بەحاڵ گیان تێداماوی ژوور سەری، چاوی لە گەچبڕیی قەراغی بنمیچەکە و ئەو سێبەرە بڕی کە پاراوانەکە خستبوویە سەری و حاڵی ڤرۆنسکیی بە روونی هێنایە بەرچاو کاتێك کە خۆی مردووە و ئیتر جگە لە بیرەوەری هیچ شتێك بۆ ڤرۆنسکی نەماوەتەوە. بە خۆی دەڵێ «چۆن توانیم ئەو قسەڕەقانەی بە گورچوودا بدەم؟ چۆن توانیم بێ ئەوەی هیچی پێبڵێم لە ژوورەکەی هاتمە دەرێ؟ ئێستا ئیتر نەماوە و بۆ هەمیشە بەجێی هێشتووین، ئەو لەوێ...» لە ناکاو سێبەری پاراوانەکە لەرییەوە و تەواوی کەناری بنمیچەکە و هەموو بنمیچەکەی داگرت. سێبەری دیکەش لەولایانەی ترەوە جووڵانەوە و بۆ پێشوازیکردن لەو سێبەرە کەوتنە جموجۆڵ، بەڵام دواتر خێراتر جووڵانەوە و گەیشتنە لاییەك و تێکەڵ بوون و تاریکی ژوورەکەی داگرت. ئانا بەخۆی گوت «مەرگ!» ترسێکیواش کەوتە دڵییەوە کە هەتا ماوەیەك نەیزانی لەکوێیە و دەستە لەرزۆکەکانی هەتا ماوەیەکی زۆر نەیاندەتوانی شقارتەکە بدۆزنەوە و مۆمێکی تر لە جێی مۆمە سووتاوەکە هەڵکەنەوە. «نا. هەموو شتێك قەبووڵ دەکەم، تەنیا مەرگ نەبێ! ئاخەر خۆشمدەوێ، ئەویش منی خۆشدەوێ! ئەو تاڵییانە هەمووی بەجێی خۆی، بەڵام هەروا نابێ.» هەموو ئەوانەی دەگوت و هەستی دەکرد کە فرمێسکی گەڕانەوە بۆ ژیان بە روومەتیدا دێتە خوارێ و بۆ رزگاربوون لەو ترسە هەستا و بە هەڵەداوان چوو بۆ ژوورەکەی ئەو.

ڤرۆنسکی لە ژوورەکەی خۆی خەوێکی قووڵ دایگرتبوو. ئانا لێی نزیکبۆوە و مۆمەکەی بەرزکردەوە و دەموچاوی رووناك کردەوە و ماوەیەکی زۆر راوەستا و چاوی تێبڕی. ئێستا کە خەوی لێکەوتبوو ئەوەندەی خۆشدەویست کە نەیدەتوانی بە دیتنی روخسارە ئارامەکەی ددان بە خۆیدا بگرێ و فرمێسك بە چاویدا نەیەتە خوارێ و لەسەر گۆنای لیزگە نەبەستێ. بەڵام دەیزانی ئەگەر ڤرۆنسکی لەو کاتەدا خەبەری بێتەوە، بە روانینێکی ساردوسڕ و ئاگادار لە

دروستکاریی خۆی، چاوی تێدەبڕێ و ئەو دەبێ بەر لەوەی باسی خۆشەویستییەکەی خۆی بکات تاوانی ئەو دەرهەق بە خۆی پێبسەلمێنێ. هەربۆیە خەبەری نەکردەوە و گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی و دوای ئەوەی قومێکی تری مۆرفین خواردەوە، بەریبەیانی خەوێکی قورس و ئالۆز دایگرت کە لەودا بۆ ساتێك خۆی لە بیرنەچۆوە.

بەیانی، خەونێکی هاشەوپاشە کە بەر لە ئاشنایی لەگەڵ ڤرۆنسکی چەند جار خەوەکەی ئالۆز کردبوو دیسان دیتییەوە و لە خەوی راچڵەکاند. مووژیکێکی پیر بە ریشێکی ئالۆزاوەوە بەسەر شتێکی ئاسنیندا داهاتبۆوە و خەریکی کارێك بوو و بە زمانی فەڕەنسی رستەگەلێکی بێ مانای دەردەبڕی و ئانا، وەکوو هەموو جارێك لەگەڵ دیتنی ئەو خەونە هەستی دەکرد (ترسناکیی خەونەکەش هەر ئەوەبوو) کە ئەم مووژیکە بێ ئەوەی گوێ بە ئەو بدات بەو شتە ئاسنینە خەریکی کارە کرێتەکەی خۆی بوو و ئەو کارەشی لەگەڵ ئەو دەکرد، بۆیە سەرتاپای لە ئارەقەدا دەخووسا و لە خەو رادەچەنی.

کاتێك هەستا رووداوەکانی رۆژی رابردوو، دەتگوت لەنێو تەمووژێکەوە دیارن و لەبەرچاوی قوت دەبوونەوە.

بەخۆی گوت «شەڕمان کرد، هەر ئەو قسانەی زۆر جار کردبوومان دیسان بە دەمماندا هاتنەوە. من گوتم سەرم دێشێ و ئەو نەهات حاڵم بپرسێ. سبەینێ لێرە دەڕۆین. دەبێ چاوم پێیبکەوێ و بارگەوبنەی سەفەر بپێچینەوە.» کە زانیی ڤرۆنسکی لە ژوورەکەی خۆیەتی چوو بۆ لای. کە بە ژووری میوانداریدا تێدەپەڕی گوێی لە تەقوکوتی فایتوونێك بوو کە لەبەر دەرگای ماڵەکەیان راوەستا. لە پەنجێرەکەوە چاوی لێکرد و فایتوونەکەی دی کچێك بە کڵاوێکی بنەوشەوە سەری لە پەنجێرەکەی دەرهێناوە و دەستوور بە خزمەتکارێك دەدا کە لە پشتی فایتوونەکە دابەزێ و دەیهەوێ لە دەرگاکە بدا. پاشان لەسەر پێگۆڕکەکە گوێی لە دەنگی ئاخافتن بوو و کەسێك بە پلیکانەکاندا دەهاتە سەرێ و ترپەی پێی ڤرۆنسکیش لە ژووری تەنیشت ژووری میوانداریەوە دەهات. ڤرۆنسکی بە هەڵەداوان رۆیشتە خوارێ. ئانا دیسان چووەوە بەرپەنجێرەکە و روانیی. دیتی ڤرۆنسکی بەبێ کۆت و کڵاو دەرپەڕی بۆ دەرێ و هەڵات بۆ لای فایتوونەکە. ئەو کچە جحێڵەی کە کڵاوی بنەوشی لەسەر نابوو بەستەیەکی پێدا و ڤرۆنسکی بە پێکەنینەوە شتێکی پێگوت. فایتوونەکە رۆیشت و ئەو بە هەشتاو بە پلیکانەکاندا هاتەسەرێ.

تەموومژێك کە زەینی ئانای داگرتبوو لەناکاو رەوییەوە و زەینی روون بۆوە. هەستە تاڵەکانی رۆژی رابردوو دڵە پڕژانەکەی بە برِك و تەزوویەکی نوێ تەزاند. ئەو ئێستا وا سەری

لێشێوابوو نەیدەزانی چۆن دەتوانێ سووکایەتی و هاومالّەتیی ئەو تاقە رۆژێکی تر تاملّ بکات. چوو بۆ ژوورەکەی تاکوو لە بڕیاری خۆی ئاگاداری بکات.

ڤرۆنسکی لەسەرەخۆ گوتی: پرێنسس ساراکینا بوو لەگەلّ کچەکەی لەلایەن دایکمەوە هاتبوو و پارە و بەلّگەنامەکانی کە دەمویست بۆی هێنابووم. دوێنێ نەمتوانی وەریان بگرم. سەرت چۆنە؟ باشتر بووی؟ ـ ئەوەی گوت بەلاّم نەیدەویست دەموچاوی پێکدادراو و نێوچاوانی گرژی ببینێ و لە هۆکارەکەی بگا.

ئانا لەنێوەڕاستی ژوورەکە راوەستا بوو و چاوی تێبڕیبوو و هیچی نەدەگوت. ڤرۆنسکی چاوێکی لێکرد و بۆ ساتێك نێوچاوانی تێکنا و درێژەی بە خوێندنەوەی نامەکەدا. ئانا وەرسووڕا و بە هێواشی بەرەولای دەرگاکە رۆیشت. ڤرۆنسکی هێشتا دەیتوانی بیگێڕێتەوە بەلاّم ئانا گەیشتە دەرگاکە و ئەو هەروا بێدەنگ بوو و تەنیا خشەخشی هەلّدانەوەی کاغەزی بەرگوێ دەکەوت.

ڕاست لەوکاتەدا کە ئانا لە دەرگاکە دەچووەدەرێ ڤرۆنسکی گوتی: ئا، ئانا، سبەینێ ئیتر حەتمەن وەڕێدەکەوین.

ئانا ئاوڕیدایەوە و گوتی: ئێوە رەنگە، بەلاّم من نا!

ـ ئانا، ئاخر ئاوا چۆن دەتوانین بژیین.

ئانا دووپاتی کردەوە: ئێوە رەنگە، بەلاّم من نا!

ـ ئەم بارودۆخە ئیتر تاملّ ناکرێ!

ئانا گوتی: تۆ لەو قسەی کردت پەشیمان دەبیتەوە ـ پاشان لە دەرگاکە چووەدەرێ.

ئەو هیوابڕاوییەی لە لەبز و قسەکردنی ئانادا بوو ترسی خستە دلّی ڤرۆنسکییەوە و لە جێی خۆی راپەڕی و دەیویست بە دوایدا هەلّێ بەلاّم پاشگەز بۆوە و دیسان لە جێی خۆی دانیشت و بە نێوچاوانی گرژەوە لێوی خۆی دەکورۆشت. ئەم هەڕەشەیەی ئەوی بە شتێکی دزێو و نەشیا و دەزانی و رقی هەستابوو. بە خۆی گوت «من هەر رێگایەك کە پێم شك دەهات تاقیم کردەوە. تەنیا رێگایەك ماوە ئەویش سەرساردی و گوێ پێنەدانە.» خۆی ئامادەکرد بچێت بۆ شار، دەیویست بچێت بۆ لای دایکی تاکوو وەکالەتنامەکەی پێ واژۆ بکات.

ئانا ترپەی پێی ئەوی لە ژوورەکەی خۆی و لە ژووری خواردن گوێ لێبوو. بە ترپەی پێیدا زانیی لە تەلاری میوانداری راوەستا و نەهات بۆ لای ژوورەکەی ئەو. تەنیا دەستووریدا ئەگەر ڤایتۆڤ لە کاتی لەمالّ نەبوونی ئەودا هات ئەسپەکەی پێبدەن. پاشان گوێی لە تەقوکوتی فایتوونەکە بوو هاتە پێشێ و دەرگاکە کرایەوە و ڤرۆنسکی دیسان چووەدەرێ. بەلاّم دیسان گەڕایەوە بۆسەر پێگۆڕکەکە و کەسێك بە

هەڵەداوان بە پلیکانەکاندا هاتەسەرێ. پێشخزمەتەکە بوو هاتبوو دەستکێشەکانی بۆ بەرێت کە لە بیری چووبوو. ئانا چووە بەرپەنجێرەکە و دیتی ڤرۆنسکی بێ ئەوەی چاو لە دەستکێشەکان بکات لێیوەرگرت و کێشای بە پشتی فایتوونئاژۆکەدا و شتێکی پێگوت. پاشان بێ ئەوەی چاو لە پەنجێرەکە بکات هەر بەو حاڵەتە ئاساییەی خۆیەوە سواری فایتوونەکە بوو و لاقی لەسەر لاقی دانا و یەکێك لە دەستکێشەکانی لە دەست کرد و فایتوونەکە بە سووچی شەقامەکەدا بایدایەوە و بزر بوو.

## بیست و حەوت

ئانا، کە لە پشت پەنجێرەکە راوەستابوو، بەخۆی گوت «ڕۆیشت! کەوایە تەواوبوو؟» لە وەڵامی ئەم پرسیارەی خۆشیدا بیری ئەو تاریکییەی کاتی کووژانەوەی مۆمەکە و خەونە هاشەوپاشە و ترسناکەکەی پێکەوە ئاوێتە بوون و رەشی و ساردییەکەی دڵی داگرت.

هاواری کرد: نا، شتیوا ناگونجێ، ـ ڕۆیشت بۆ ئەوسەری تری ژوورەکە و پەتی زەنگەکەی بە توندی کێشا. هێندە لە تەنیایی دەترسا کە چاوەڕوانی هاتنی خزمەتکار نەمایەوە و خۆی بەرەوپیری چووەدەرێ.

پێیگوت: بپرسن بزانن کۆنت چووە بۆکوێ؟

خزمەتکارەکە وەڵامیدایەوە: کۆنت چووە بۆ گەوڕەکە. دەستووریاندا عەرزت بکەین زۆر زوو فایتوونەکە دەنێرێتەوە بۆ ئەوەی ئەگەر حەزتان لێبوو بڕۆن بۆ دەرەوە.

ـ زۆر چاکە! سەبر بکەن. ئێستا نامەیەك دەنووسم. بیدەن بە میخائیلا با بیبات بۆ گەوڕەکە. زووکەن.

دانیشت و نووسیی:

«بمبوورە. بگەڕێوە بۆ ماڵێ، دەبێ پێکەوە قسە بکەین. تۆ خودا بگەڕێوە. دەترسم.»

نامەکەی چەسپ کرد و دای بە خزمەتکارەکە.

ئێستا لە تەنیایی دەترسا و کە خزمەتکارەکەی بەڕێ کرد لە ژوورەکەی هاتەدەرێ و چوو بۆ ژووری منداڵەکەی.

«یانیچی؟ ئەوە چ وەزعێکە؟ ئەمە خۆ ئەو نییە! ئەی چاوە شینەکانی، بزە شەرمین و شیرینەکانی چییان لێهات؟» ئەمە یەکەم بیر بوو کە بە زەینی شێواویدا تێپەڕی، کاتێك بەجێی سریۆژا کە چاوەڕێ بوو لە ژوورێ چاوی پێیبکەوێت کچە خرپنە سوورهوولەکەی خۆی

دی بە قژی رەش و لوولەوە. کچە لە پشت مێزەکە دانیشتبوو و منجڕانە و بە توندی بە چێوپەمۆیەك لە مێزەکەی دەدا و وەك گێژوکاس بە چاوانی کە دەتگوت دوو گلارەی ترێڕەشەن لە دایکی دەڕوانی. وەڵامی هەواڵپرسیی پەرستارە ئینگلیزییەکەی دایەوە کە حاڵی زۆر باشە و رۆژی داهاتوو دەچن بۆ گوند و خۆی لە پاڵ کچەکەی دانیشت و دەستیکرد بە هەڵخولاندنی چێوپەمۆی زارکی شووشە لە بەردەمی. بە قریشك و هۆڕی منداڵەکە و جووڵانی برۆکانی ئاوا بە روونی وێنەی ڤرۆنسکیی هێنایە بەرچاوی کە بە زەحمەت توانیی ددان بە خۆیدا بگرێ و زووڕە زووڕ دەست نەکات بە گریان و هەستا لە ژوورەکە چووەدەرێ. بە خۆی گوت «یانی بەڕاستی هەموو شتێك تەواوبووە؟ نا، شتیوا هەرنابێ. ئەو دەگەڕێتەوە، بەڵام ئاخەر چۆن دەتوانێ پاکانە بۆ ئەو بزە و شادی و نەشەیەی خۆی بکات دوای قسەکردن لەگەڵ ئەو کچە؟ بەڵام ئەگەر نەتوانێ بۆشم روون بکاتەوە من باوەڕ بە قسەکەی دەکەم. ئەگەر باوەڕ نەکەم تەنیا رێگایەکم بۆ دەمێنێتەوە و منیش ئەو رێگایە قەبووڵ ناکەم.»

چاوی لە کاتژمێر کرد. دوازدە خولەك تێپەڕیبوو. «ئێستا حەتمەن یادداشتەکەی خوێندۆتەوە و دەگەڕێتەوە. زۆر ناخایێنێ. دە خولەکی تر... بەڵام ئەگەر نەیەت چ دەبێ؟ نا، شتیوا هەر نابێ. بەڵام نابێ بە چاوی فرمێسکاوییەوە ببینێ. دەچم دەموچاوم دەشۆم. بەڵێ بەڵێ، هەر بەڕاستی سەر و قژم داهێناوە یان نا؟» بەڵام وەبیری نەهاتەوە. دەستێکی بە قژی خۆیدا هێنا. «ئەرێ، قژم داهێناوە. بەڵام کەنگێ؟ لە بیرم نییە.» بڕوای بە دەستی خۆی نەکرد و چوو بۆبەر ئاوێنە دیوارییەکە تاکوو بزانێ سەروقژی رازاوە و شانەکراوە یان نا. سەروقژی جوان و رازاوە بوو بەڵام وەبیری نەدەهاتەوە کەنگێ دایهێناوە و گوڵ و قردیلەی لێداوە. لە ئاوێنەکەدا دەیڕوانی و روخسارێکی هەڵبزڕکاوی دی و چاوانێك کە تررووسکەیەکی سەیریان لێهەڵدەستا و ترساوانە لە ئەویان دەڕوانی. بە خۆی گوت: «ئەمە کێیە؟» پاشان لە ناکاو تێگەیشت و گوتی «ئەیەڕۆ، ئەوە خۆمم!» بە وردی لە سەرتاپای خۆی روانی، ماچەکانی ئەوی لەسەر روومەت و لاجانگ و لاملی هەست پێکرد و لەرزی و شانی هەڵتەکاند. پاشان دەستی بۆ لای لێوی بەرزکردەوە و ماچی کرد.

بە خۆی گوت «یانیچی؟ خەریکە شێت دەبم؟» رۆیشت بۆ ژووری خەوەکەی خۆی کە ئانووشکا خەریکی خاوێنکردنەوە و رێکوپێك کردنی بوو.

لە بەردەمی ئانووشکا راوەستا و لەگەڵ ئەوەی چاوی تێبڕیبوو گوتی: ئانووشکا ـ بەڵام نەیدەزانی چیی پێبڵێ.

کڵفەتەکەی کە وێدەچوو لە مەبەستەکەی گەیشتبێ گوتی: دەتویست بچێ بۆ سەردانی داریا ئەلکساندرۆڤنا.

ـ سەردانی داریا ئەلکساندرۆڤنا؟ باشە، دەچم.

«پازدە خولەك چوون و پازدە خولەك گەڕانەوە، دەبێ بە ڕێگاوەبین. ئێستا دێت» کاتژمێرەکەی دەرهێنا و چاوێکی لێکرد. «بەڵام چۆن توانیی من لەو بارودۆخەدا بەجێ بێڵێ و بڕوات؟ چۆن دەتوانێ دەنگ لە من داگۆڕێ و لەگەڵیشم بژی؟» چووە بەرپەنجێرەکە و چاوەڕوان چاوی لە شەقامەکە بڕی. «تا ئێستا دەبێ گەڕابێتەوە. بەڵام ڕەنگە حیسابەکەی من ڕاست نەبێ.» دیسان خەیاڵ هەڵیگرتەوە و ویستی وەبیری بێتەوە کەنگێ لە ماڵێ چۆتە دەرێ و دیسان دەستیکردەوە بە بژاردنی ساتەکان.

کاتێك ڕۆیشت بۆ لای کاتژمێرە گەورەکە تاکوو کاتژمێرەکەی خۆی لە رووی ئەوەوە میزان بکات فایتوونێك گەیشتە بەردەرگای ماڵەکەیان. ڕۆیشتەوە بۆ بەرپەنجێرەکە و چاوی بە فایتوونەکەی ئەو کەوت. بەڵام هیچ کەس بە پلیکانەکاندا وەسەر نەکەوت. لە خوارەوە دەنگی دەبیست. ئەو پێشخزمەتە بوو کە فایتوونەکەی هێنابۆوە. ئانا چووە خوارێ تاکوو چاوی پێیبکەوێ.

ـ نەیانتوانیوە کۆنت بدۆزنەوە. دەڵێن بەرەو جادەی نیژێنی گاردۆ ڕۆیشتووە.

میخائیلا کە دەموچاوێکی سوور و پڕبزەی هەبوو و دەیویست یادداشتەکەی پێبداتەوە، ئانا پێیگوت: چیت دەوێ؟ ئەوە چییە؟

لەڕێوە تێگەیشت کە «ئەرێ، وادیارە نەیتوانیوە یادداشتەی پێبگەیێنێ.»

ئانا بە راسپاردەکەی گوت: هەربەو نامەیەوە بچۆ بۆ خزمەتی کۆنتس ورۆنسکایا لە ڤیلا، و نامەکە بدە بە کۆنت و خێرا وەڵامەکەی بێنەوە و وەرەوە.

بە خۆی گوت «بەڵام ئێستا خۆم چ بکەم؟ چاکە، دەڕۆم بۆ لای دالی، بەڵێ، وادەکەم، دەنا لێرە شێت دەبم. بەڵێ، دەتوانم تێلگەڕامێکیش بنێرم.» دەقی تێلگەڕامەکەشی بەمشێوە نووسی: من حەتمەن دەبێ قسەت لەگەڵ بکەم. هەرچی زووتر وەرەوە.

کە تێلگەڕامەکەی بەڕێ کرد خێرا ڕۆیشت جلەکانی لەبەر بکات. خۆی رازاندەوە و کڵاوی لەسەر کرد و چاوێکی لە ئانووشکا کرد کە لە پێشوو قەڵەوتر دیاربوو و ئارام و هێدی تری دەنواند. لە چاوە شین و چکۆڵە و مێهرەبانەکانیدا بە ئاشکرا شوێنەواری دڵسۆزیی خوێندەوە.

داماوانە لەسەر قەنەفەیەك دانیشت و بە گریانەوە گوتی: ئانووشکا... خۆشەویستەکەم... پێمبڵێ، دەبێ چ بکەم؟

ئانووشکا گوتی: ئەیەڕۆ، ئانا ئارکادیۆڤنا، دڵی خۆت نارەحەت مەکە. ژیانە ئیتر. ئەو شتانەش هێندێ جار روو دەدەن... بچۆ بۆ گەڕان، هەوایەك بگۆڕە، ئارام دەبیەوە.

ئانا هاتەوە سەرخۆ و گوتی: بەڵێ، دەچم. ئەگەر لێرە نەبووم و تیلگەڕاف هات خێرا بینێرە بۆ ماڵی داریا ئەلکساندرۆڤنا.... بەڵام نا، خۆم دەگەڕێمەوە.

بە ترسەوە گوێی بۆ کوتە و ترپەی دڵی خۆی راگرتبوو، بەخۆی گوت «بەڵێ، نابێ بیری لێبکەمەوە، دەبێ خۆم بە شتێکەوە سەرقاڵ بکەم. لە هەمووی گرینگتر دەبێ لەم ماڵە دوور بکەومەوە.» بەپەلە لە ماڵێ چووەدەرێ و سواری فایتوونەکە بوو.

پیوتێر بەر لەوەی سواری فایتوونەکە بێت و لەسەر جێگاکەی خۆی دانیشێ پرسیی: دەفەرمووی بۆ کوێ بچم؟

ـ بۆ شەقامی زنامنکا، ماڵی پرێنس ئابلۆنسکی.

## بیست و هەشت

هەوا ساف و ساماڵ بوو. لە بەیانییەوە نەرمە بارانێك دایدابوو و ئاسمان تازە روون بووبۆوە و هەوری سەر تەوێڵی رەویبوو. شیروانی و سەنگفەرشی شۆستە و شەقامەکان و هەروەها تایە و سەروبەر و لاتەرافی چەرمین و برنجی و تەنەکەی فایتوون و عارەبانە و هێلینگەکان هەموو لە ژێر پڕشنگی خۆری بەهاردا دەدرەوشانەوە. سەعات سێی دوانیوەڕۆ بوو و شەقامەکان لە هەموو کاتێك قەرەباڵغتر بوون.

ئانا لە سووچێکی فایتوونەکە و لەسەر کورسیی نەرم و شل دانیشتبوو کە جووڵانی لەسەر فەنەرە نەرمەکانی و وێرغەی خێرای ئەسپە خۆڵەمێشینەکان بەحاڵ هەست پێدەکرا و لەنێو خڕوهۆڕی تایەکان و دیمەنی زووتێپەڕی شەقامدا و لەو هەوا پاك و ساماڵەدا رووداوەکانی چەند رۆژ لەمەوبەری لە مێشکی خۆیدا وەردادایەوە و بارودۆخی خۆی بە چاوێکی تر دەدی و لەگەڵ ئەوەی لە ماڵێ بیری لێدەکردەوە تەواو جیاواز بوو. ئێستا تەنانەت خەیاڵی مەرگیش زۆر ترسناك و حەتمی نەدەهاتە بەرچاوی و مەرگ خۆشی ئیتر شتێکی ناچاری نەبوو. ئێستا بە هۆی ئەو سووکایەتییەوە کە خۆی قەبووڵی کردبوو خۆی سەرکۆنە دەکرد. «بە پاڕانەوە داوای لێبوردنم لێکرد. پێملی فەرمانەکانی بووم و تاوانێك کە نەمکردبوو گرتمە ئەستۆی خۆم. ئاخەر بۆ؟ یانی بەڕاستی ناتوانم بەبێ ئەو بژیم؟» بێ ئەوەی بۆخۆی روون بکاتەوە کە چۆن بە بێئەو دەژی دەستیکرد بە خوێندنەوەی تابلۆکانی شەقام. «نووسینگە... هەمار... و مەتەبی ددانسازی. بەڵێ، هەموو شتێك بە دالی دەڵێم. ئەو حەز بە چارەی ڤرۆنسکی ناکات. بۆ من هۆی

شەرمەزارییە و تەنانەت زۆر پڕ ئازاریشە. لەگەڵ ئەوەشدا هەموو شتێکی بۆ باس دەکەم. منی خوشدەوێ و هەرچی ئەو بیڵێ بەقسەی دەکەم. ئیتر سەری بۆ دانانەوێنم. ئیجازە نادەم بمعاملێنێ. فیلیپۆڤ، نانەوا. دەڵێن ئەمانە هەویر دەنێرن بۆ پترزبۆرگ. چونکە ئاوی مۆسکۆ زۆر باشە. بەڵێ، چاڵاوەکانی میتیشچی و کولیرەناسکە کە بە ئاوی ئەو چاڵاوانە هەویرەکەی دەشێلن.» وەبیریشی هاتەوە کە ماوەیەکی ئازگار بەرلەوە، کاتێك تەمەنی حەڤدە ساڵ بوو لەگەڵ پووری دەچوون بۆ پەرستگەی سێپیرۆزان. «هێشتا هێلاسن لە گۆڕێدا نەبوو و دەبوو بە ئەسپ بچن. یانی بەڕاستی من بووم ئەو کچەی دەستەکانی سوور بوون. گەلێ لەو شتانەی کە ئەو کاتە بە شتێکی باش و بێوێنە و دەگمەنم دەهاتە بەرچاو ئێستا بێنرخ و ئابڕوون و زۆر شتی دیکەش کە ئەو کاتە بەلامەوە بێئاکام بوون و ئێستا بۆ هەتا هەتایە لە کیسم چووە. یانی ئەو رۆژە باوەڕم دەکرد کە رۆژێك بتوانم بەو رادەی سووکایەتی و کەساسییە بگەم؟ کاتێك ئەو نامەکەم بخوێنێتەوە چەندە هەست بە غروور دەکات و دڵخۆش دەبێ! بەلام من پێیدەسەلمێنم کە... ئەم رەنگە چ بۆگەنێکی لێدێ! ئەم هەموو ماڵە بۆچی دروست دەکەن و رەنگی دەکەن؟» دیسانیش خوێندییەوە. هۆڵی مۆدە. پیاوێك کرنۆشی بۆ برد. مێردی ئانووشکا بوو. ڤرۆنسکیی وەبیرهاتەوە کە بەوانەی دەگوت «مشە خۆرەکانی ئێمە.» مشەخۆرەکانی ئێمە؟ بۆچی ئێمە؟ بەڕاستی شوورەییە کە ناتوانین لە ریشەی رابردوو دابڕێین. هەڵبەت دابڕان مەحاڵە. بەڵام دەکرێ شوێنەوارەکەی بشارییەوە، یان تازەی نەکەیەوە. من دەیشارمەوە.» وەبیر رابردوو کەوتەوە ئەو کاتەی لەگەڵ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بوو، کە بیرەوەرییەکەی لەسەر لاپەڕەی مێشکی پاك کردبۆوە: «دالی پێیوابوو کە دەمهەوێ واز لە مێردی دووهەمیشم بێنم. ئەوەش دیارە کارێکی نەشیاوە. بەڵام من بەڕاستی چ کارێکم هەیە؟ من ئیتر ناتوانم.» کە ئەوەی دەگوت دەیویست بگری. بەڵام لەڕێوە خەیاڵی بۆ لایەکی تر چوو. «ئەم دوو کچە بیر لە چی دەکەنەوە کە ئاوا پێدەکەنن؟ رەنگە بیر لە ئەوین بکەنەوە. نازانن ئەوین چەندە شتێکی سووك و خەمهێنەرە!... چاو لەو منداڵانە بکە. سێ منداڵ بەسەر بلۆارەکەدا هەڵدەهاتن و ئەسپەدارینەیان پێبوو. سریۆژا! منیش هەموو شتێکم لەدەست دەدەم ئەوی لێناستێنمەوە. بەڵێ، ئەگەر نەگەڕێمەوە هەموو شتێکم لەدەست دەدەم. رەنگە درەنگ فریای قەتار کەوتبێت و ئێستا گەڕابێتەوە. بەڵام تۆ دیسان دەتهەوێ خۆت سووك بکەی؟... نا، من دەچم بۆ لای دالی و بە راشکاوی پێیدەڵێم چارەڕەشم و سزاشم هەر ئەوەیە. تاوانبارم، بەڵام لەم بارودۆخەدا داماو و چارەڕشم. یارمەتیم بدە. ئاخ، ئەم ئەسپانە، ئەم فایتوونە... چەندە لە خۆم بێزارم کە لەم فایتوونەدا دانیشتووم! هەمووی هی ئەوە. بەڵام من ئیتر چاوم بەوانە ناکەوێتەوە.»

لەگەڵ ئەوەی جەختی لەسەر ئەو وشانە دەکرد کە دەردەدڵی خۆی پێهەڵدەڕشتن لەلای دالی و بە قەستی ئەوەی خوێ لە زامی خۆی پڕژێنێ بە پلیکانەکانی ماڵی براکەیدا وەسەر کەوت.

کە پێینایە سەر پێگۆڕکەکە پرسیی: میوانیان هەیە؟

پێشخزمەت وەڵامیدایەوە: کاترینا ئەلکساندرۆڤنا لەڤینا.

ئانا لە دڵی خویدا گوتی: «کیتی! هەر ئەو کیتییەی کە ڤرۆنسکی ئاشقی بووبوو. هەر ئەو ژنەی کە ڤرۆنسکی بە ئەشقەوە ناوی دێنا. ئەو ئێستا بەداخەوەیە کە بۆچی لەگەڵ کیتی ژیانی هاوبەشی پێکنەهێنا. بەڵام کە بیر لە من دەکاتەوە زۆر بە ئاخ و داخە کە بۆچی دڵیدا بە من.»

کاتێك ئانا چووە ژووری خوشکەکانی سەبارەت بە شیرپێدانی منداڵ راوێژیان دەکرد. دالی بە تەنیا هات بەرەوپیری ئەو میوانە کە ئاخافتنەکەی لێ تێکدابوون.

گوتی: تۆ هێشتا نەڕۆیشتووی؟ من خۆم دەمویست بێم بۆ سەردانت. ئەمڕۆ نامەیەکی ستیڤام بەدەست گەیشت.

ئانا کە چاوی بە هەموو بارێکدا بۆ کیتی دەگێڕا، گوتی: تێلگەرامێکیشی بۆ ئێمە ناردبوو.

ـ نووسیویەتی کە سەری لە کاری ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەرناچێ و نازانێ بەڕاستی چییدەوێ، بەڵام ئەو بەبێ وەڵام لە پترزبۆرگ نایەتەوە.

ـ پێموایە میوانتان هەیە. دەکرێ نامەکە بخوێنمەوە؟

دالی بە نارەحەتییەوە وەڵامیدایەوە: بەڵێ، کیتی لێرەیە. ئەو لە ژووری منداڵەکەیە. ماوەیەك زۆر نەخۆش بوو.

ـ بیستم. دەکرێ نامەکە بخوێنمەوە؟

دالی گوتی: هەر ئێستا بۆتی دەهێنم ـ لە دەرگانەی ژوورەکەدا راوەستا و دیسان گوتی: بەڵام دەزانی، داوای تۆ رەت ناکاتەوە، بە پێچەوانە، ستیڤا زۆر هیوادارە.

ئانا گوتی: من هیچ هیوایەکم نییە. بەڵام ئیتر هیچ هۆگرییەکم بە رازیبوونەکەشی نییە.

کاتێك ئانا تەنیا کەوت بەخۆی گوت «یانیچی؟ یانی کیتی پێی شوورەییە چاوی پێمبکەوێت؟ رەنگە هەقیشی بێت. بەڵام ئەگەر هەقیشی بێت، ئەو خۆی ئاشقی ڤرۆنسکی بووە و نابێ ئەوە بە چاوی مندا بداتەوە. من دەزانم هیچ ژنێکی خاوەن ئابڕوو ناتوانێ لەم بارودۆخەی ئێستامدا وەرمبگرێ و رێزم بۆ دابنێ. من دەزانم هەر لە سەرەتاوە هەموو شتێکی خۆمم فیدای ئەو کرد و سەرم بۆ دانەواند. ئەوەش پاداشەکەم بوو. چەندە لەو پیاوە بێزارم! بۆچی هاتم بۆ ئێرە؟ حاڵم لێرە شڕتر بوو و باری دڵێشم قورستر.» گوێی لە دەنگی دالی و کیتی بوو لە ژوورەکەی ترەوە دەهات. بە خۆی گوت «ئێستا چی بە دالی بڵێم؟ بە باسکردنی چارەڕەشییەکانم دڵی کیتی بە خۆم خۆش بکەم؟ خۆم بدەمە پاڵی و بەهیوا بم دالدەم بدات؟ نا، دالیش لەو بارودۆخەی من ناگات. چیی پێبڵێم؟ تەنیا ئەوە باش بوو کە چاوم بە کیتی

دەکەویٚ و پیشانی دەدەم کە چەندە هیوابڕاو بووم و هەموو شتێك لەبەرچاوم سووك بووە و بۆ هەموو شتێك خەمساردم و گوێی پێنادەم.»

دالی نامەکەی هێنا و هاتەوە. ئانا خوێندییەوە و هیچی نەگوت و نامەکەی پێدایەوە.

گوتی: ئەوانەم دەزانی. شتێکی تازەی تێدا نەبوو، تەلاٌقم بدات یان نەدات، ئیتر بۆ من فەرق ناکات.

دالی بە واقوڕمانەوە چاوی لێدەکرد، گوتی: ئاخەر بۆ؟ من بە پێچەوانە، ئێستا زۆر هیوادارمـ تا ئێستا قەتی ئاوا لە بارودۆخێکی سەیر و تا ئەوڕادەیە پەشۆکاویدا نەدیتبوو. لێیپرسیی: کەنگیٚ دەتانهەویٚ بڕۆن؟

ئانا پێلووی تێکبەزاند و چاوی لە خالێکی رووبەڕووی خۆی بڕی و وەلاٌمی نەدایەوە.

چاوی لەلای دەرگاکە کرد و سوورهەلگەڕا و پرسیی: ئەریٚ وادیارە کیتی نایهەویٚ چاوی بە چاوم بکەویٚ؟

دالی گوتی: ئەیەڕۆ ئەوە چ قسەیەکە! شیر بە منداڵەکەی دەدا، بەلاٌم شیرپێدانەکەی پێناکەویٚ. من داوام لێکرد کە... بە پێچەوانە، زۆر خۆشحالّە کە... دالی دەستەپاچە بوو، چونکە نەیدەتوانی درۆبکات، گوتی: ئەوەتا، هات.

کیتی کاتێك زانیی ئانا هاتووە نەیدەویست لەگەلّی بەرەوڕوو بێت. بەلاٌم دالی پێملی کرد. کیتی بە ناچار خۆی ئامادەکرد و بە دەموچاوێکی هەلّبزڕکاوەوە لە ژوورەکە هاتەدەریٚ و دەستی ئانای گوشی.

بە دەنگێکی لەرزۆك گوتی: زۆر خۆشحالّم.

کیتی شێوابوو، کێشەیەك لەنێوان بێزاری لەو ژنە ناپاکە و تاسەی لێبوردن لە تاوانەکەی لە دەروونیدا هەلّگیرسابوو، بەلاٌم کە روخساری جوان و دلّگری ئانای دی تەموومژی بێزاری لەرێوە لەسەر دلّی رەوییەوە.

ئانا گوتی: پێمسەیر نەبوو کە حەز بە چارەم نەکەی و لێمبێزار بی. من خووم بەوانە و بە خراپتر لەوەش گرتووە. نەخۆش بووی؟ چەندە گۆڕاوی!

کیتی هەستی دەکرد کە بە چاوی نەیارانە و بە رقەوە لێیدەڕوانیٚ. ئەو ئەم دوژمنایەتییەی لە بارودۆخی تالّی ئانایەك دەزانی کە زەمانێك ئەوی دالّدە دابوو و ئێستا سووك و ئابڕووتکاو لە هەمبەریدا راوەستابوو و بەزەییی پێیدا دەهات.

باسی نەخۆشییەکەی ئەویان کرد و هەروەها منداڵەکە و ستیڤا، بەڵام ئەوانە هیچیان بۆ ئانا سەرنجڕاکێش نەبوون.

ئانا هەستا و گوتی: هاتبووم ماڵئاواییت لێبکەم.

ـ مەگین کەنگیٚ وەڕیٚ دەکەون؟

بەڵام ئانا دیسان وەڵامی ئەو پرسیارەی نەدایەوە و رووی بۆ لای کیتی وەرسووڕاند و گوتی: زۆر خۆشحاڵم کە چاوم پێتکەوت. لە هەموو لایەك باسی تۆم دەبیست، تەنانەت لە مێردەکەشت. ئەو هات بۆ ماڵی ئێمە. چ مێردێکی باشت هەیە. زۆر کەوتە بەردڵم. راشکاوانە بۆ ئەوەی کیتی بڕەنجێنیٚ گوتیشی: ئێستا لەکوێیە؟

کیتی سوورهەڵگەڕا و گوتی: چووە بۆ گوند.

ـ سڵاوی منی پێبگەیێنە. لەبیرت نەچیٚ.

کیتی بۆ هاودەردی چاوی لە چاوی ئانا بڕی و بە دڵسافییەوە گوتی: بەسەرچاو.

ـ دەی، خوداحافیز، دالی ـ ماچوومـوچی لەگەڵ دالی کرد و دەستی کیتی گوشی و بەپەلە لەویٚ رۆیشت.

کیتی کە لەگەڵ خوشکی تەنیا کەوت گوتی: وەك رابردوو جوان و شیرین و دڵڕفێنە. زۆر شۆخوشەنگە. بەڵام خەمێکی قورسی لە دڵدایە. خەمێکیوا کە مرۆڤ بەزەییی پێدادیٚ.

دالی گوتی: نا، ئەمڕۆ خەمێکی تری لە دڵدا بوو. کاتێك هەتا سەر پێگۆڕکەکە بەڕێم کرد هەستم کرد خەریکە دەستدەکات بە گریان.

## بیست و نۆ

ئانا کاتێك سواری فایتوونەکە بوو زۆر لەو کاتە زیاتر حاڵی شێوا کە لە ماڵی ستیڤا هاتەدەریٚ. ئازارەکەی رابردووی ئێستا هەستی رەنجان و وەلانرانیشی پێزیاد بووبوو کە بە هۆی ئەو چاوپێکەوتنەی کیتییەوە بوو.

پیووتێر پرسیی: بۆکویٚ دەستوور دەفەرمووی بچم؟ ماڵیٚ؟

ئانا بیٚ ئەوەی بیر لە شوێنی مەبەستەکەی بکاتەوە وەڵامیدایەوە: بەڵیٚ، ماڵیٚ.

چاوی به دوو ڕێبوار کەوت، بەخۆی گوت «ئەوانە چۆنیان چاو لێدەکردم، هەر دەڵێی نەدیوبدین، شتێکی سەیر و بێ مانا! ئەوەی دیکە یانی ئاوا بە تینوتاو باسی چیی دەکرد بۆ هاوڕێکەی؟ مەگین دەکرێ ئەوەی هەستی پێدەکەی بە کەسێکی بڵێی؟ چەندەم قسە لە دڵدا بوو بە دالیی بڵێم، باشبوو پێمنەگوت! ئەگەر بمگوتبایە ئەو چارەڕەشییەم دڵخۆشی دەکرد. هەڵبەت خۆشحاڵیی خۆی دەشاردەوە، بەڵام گرینگترین هەست کە لە دڵیدا سەری هەڵدا شادییەك بوو لەوەی کە من، لەجیاتی داخێك کە بە شیرینکامیی خۆم لە دڵی ئەودا گووراندم، سزا دریم. بەڵام کیتی لەویش کەیفخۆشتر دەبوو. چەند بە ڕووناکی ناخی دڵی دەخوێنمەوە. ئەو دەزانێ من زیاتر لە ڕادەی ئاسایی بە ڕووخۆشی و باوەشی ئاوەڵاوە میوانداریم لە مێردەکەی کردووە و دڵیم ڕفاندووە. ئەو ئێرەیی بە من دەبات و ڕقی لێمە و جگە لەوەش بە سووك و چرووکم دەزانێ. لەبەر چاوی ئەو ژنێکی بەستۆکەم. بەڵام ئەگەر من ژنێکی سۆتە بوایەم و بمویستبایە دەمتوانی مێردەکەی هەڵخەڵەتێنم. دەشمویست.» کە چاوی بە پیاوێکی دەموچاو سووری قەڵەوە کەوت بە سواری هێلینگەیەك بەرەوڕوویان دەهات و ئەوی لەگەڵ ژنێکی ئاشنا لێتێکچوو بە سڵاوکردنەوە کڵاوە بریقەدارەکەی لە سەری داگرت و سەرە بێتووك و لووسەکەی وەدیارخست و پاشان بۆی دەرکەوت بەهەڵە چووە، ئانا لە دڵی خۆیدا گوتی «چەندە لەخۆ ڕازییە! پێم وابوو دەمناسێ. ئەگەرچی هیچ پیاوێك لە دنیادا نییە کە من بناسێ. من خۆشم خۆم ناناسم. من وەك فەڕەنسییەکان دەڵێن تەنیا لەگەڵ هەوەسەکانی خۆم ئاشنام.» دوو کوڕی مێرمنداڵی دی دۆڵدرمە فرۆشێکیان ڕاگرت و دۆڵدرمەفرۆشەکە تەپەدۆری پڕ لە دۆڵدرمەی لەسەر سەری داگرت و لەسەر عەرزی دانا و بە لۆیەکی خاولییەکەی ئارەقەی نێوچاوانی سڕی. بەخۆی گوت «ئۆو، ئەم منداڵانەش ئیشتیای ئەو دۆڵدرمە پیسانەیان کردووە و دڵنیان کە دۆڵدرمەیان دەوێ. دڵی ئێمە ئیشتیای شتی شیرین و خۆش دەکەن. بەڵام نوقڵمان ناوێ. دۆڵدرمەی پیسمان دەوێ. کیتیش هەروایە. ڤرۆنسکی نەبوو، لەڤین. ئێرەییش بە من دەبات و لێم بێزارە. ئێمە هەموومان لە یەکتری بێزارین. من ڕقم لە کیتییە و ئەویش لە من. ئەوە هەقیقەتە.» تابلۆی جوانکارییەکی خوێندەوە: **هۆڵی جوانکاریی** تیووتکین.[٨٤] «قژم لەلای تیووتکین چاك دەکەم... کاتێك ئەو هات ئەمەی پێدەڵێم.» «کە ئەوەی دەگوت زەردەیەکی گرت. بەڵام هەر ئەو کاتە وەبیری هاتەوە کە ئەو

84- Tyoutkin

ئێستا ئیتر قسەی پێکەنینی بە هیچ کەس نالێ.«ئەوەش هیچ، خۆ قسەی پێکەنینی و دڵخۆشکەرانە بوونی نییە. هەموو شتێك کرێت و رەشە. ئەمەش گەڕناڵی نوێژی عەسر. چاو لەو دووکانداره بکە چەندە بە پارێزەوە خاچی خۆی دەکێشێ! دەڵێی دەترسێ ئەو شتەی بە دەستییەوەیە لێی بەربێتەوە. ئەو کەنیسانە و ئەم کەڵە زەنگانە و ئەم درۆیانە چییە؟ تەنیا بۆ شاردنەوەی بێزارییەکانمانە لە یەکتری. راست وەکوو عارەبانەچییەکان کە لەسەر مسافیرێك دەیانهەوێ ورگی یەکتری بدڕن، لە یەکتری وەڕەزین. یاشڤین دەڵێ حەزدەکات خەنیمەکەی رووت بکات و خەنیمەکەشی، ئەو هەقیقەتیش جگە لەوە هیچی تر نییە.»

لەو فیکرانەدا بوو کە گەیشتەوە ماڵێ. وەها نوقمی ئەو خەیاڵانە بووبوو کە تەنانەت خەمەکانی خۆی لەبیرچووبۆوە. کاتێك چاوی بە دەرگاوانەکە کەوت کە بۆ پێشوازیی لە ماڵێ هاتبووە دەرێ، تازە وەبیری هاتەوە کە نامەیەك و تێلگەرامێکی بۆ ڤرۆنسکی ناردووە.

پرسیی: نامەی بۆ نەهاتووە.

دەرگاوانەکە گوتی: هەر ئێستا چاولێدەکەم. ـ چاوێکی لە مێزی ژوورەکەی خۆی کرد و پاکەتێکی چوارگۆشەی ناسکی تێلگەرامی هەڵگرت و دایەدەستی.

ئانا هەڵیپچڕی و خوێندییەوە: «ناتوانم بەر لە سەعات دە بێمەوە. ڤرۆنسکی.»

ـ کەسێك کە ناردبووم هێشتا نەگەڕاوەتەوە؟

دەرگاوان وەڵامیدایەوە: نا، نەگەڕاوەتەوە.

ئانا لە دڵی خۆیدا گوتی «چاکە، کەوابێ دەزانم چ بکەم.» هەستی کرد رقێکی شارە لە ناخیدا هەڵدەقوڵێ و گڕی حەزکردن بە تۆڵە لە سینگیدا بڵێسە دەکێشێ و بە هەڵەداوان بە قاڵدرمەکاندا وەسەر کەوت. «من خۆم دەچم بۆ لای ئەو. بەر لەوەی بۆ هەمیشە لێی دوورکەومەوە، ئەوەی لە دڵمدایە پێیدەڵێم. هیچ کات بەو رادەیە لە هیچ کەس بێزار نەبووم.» بە دیتنی کڵاوەکەی کە بە مهینەکەدا هەڵواسرا بوو رق و بێزاری گیانی داگرت و لەرزی. نەیدەزانی ئەم تێلگەڕامە وەڵامی تێلگەرامەکەی خۆیەتی و نامەکەی هێشتا بە دەستی ڤرۆنسکی نەگەیشتووە. ئێستا ڤرۆنسکیی هێنایە بەرچاوی خۆی کە بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە قسە لەگەڵ دایکی و ساراکینا دەکات و حەز بەو ئازارە دەکات کە ئەم دەیکێشێ. بە خۆی گوت «بەڵێ، هەتا زووتر بڕۆم باشترە.» بەڵام نەیدەزانی بۆکوێ بچێ. دەیویست هەتا زووە لە چنگ ئەو هەست و خەیاڵانە خۆی دەربازبکات کە لەم لانەی ترسەدا ئاراوقارایان لێهەڵگرتبوو. خزمەتکارەکان و دیوار و کەلوپەلی ماڵەکە هەموو رقیان دەخستە دڵییەوە و چنگیان لە رۆحی گیر دەکرد.

«بەڵێ، دەبێ بچم بۆ وێستگەی شەمەندەفەر، یان دەبێ بچم بۆ ماڵی دایکی و ئابڕوو و حەیای بەرم.» چاوی لە بەرنامەی وەڕێکەوتنی قەتار کرد کە لە ڕۆژنامەدا چاپ کرابوو. شەوێ قەتارێك سەعات هەشت و دوو خولەك وەڕێ دەکەوت. «بەڵێ، فریا دەکەوم.» دەستووریدا ئەسپی فایتوونەکە بگۆڕن، و خۆشی دەستیکرد بە پێچانەوەی جانتا و کەلوپەلی سەفەرێکی دووسێ ڕۆژە. دەیزانی ئیتر بۆ ئەو ماڵە ناگەڕێتەوە. لەنێو لێلایی ئەو پلانانەدا کە بە زەینی دەگەیشت، ئەو گریمانەشی بە مێشکدا دەهات کە دوای ئەوەی لە وێستگەی شەمەندەفەر یان ڤیلاکەی کۆنتس روو دەدا بەرەو نیژێنی گاردۆ وەڕێ دەکەوێ و لە یەکەم شاری سەرەڕێ نیشتەجێ دەبێ.

مێزی خواردنیان رازاندبۆوە. لێی نزیکبۆوە و کە بۆنی نان و پەنیر هات هەستی کرد بە بۆنی هەموو خواردنێك دڵی لە خێڵەوە دێ. گوتی فایتوونەکە بێنن. لە ماڵێ هاتەدەرێ. سێبەری خانووبەرەکە ئێستا هەموو شەقامەکەی داگرتبوو. ئاسمان ساماڵ و خۆرەتاوی دەمەوئێوارە گەرم بوو. لە ئانووشکا کە ئەسپەکانی ئەوی لەگەڵ خۆی دەهێنا و پیوتێر کە جانتاکانی دەخستە نێو فایتوونەکەوە و فایتوونئاژۆکە کە دیاربوو دڵخۆش نییە، بێزار بوو و هەموویان بە هەڵسوکەوت و ئاکاریان دەیانڕەنجاند و رقیان هەڵدەستاند.

ـ پیووتێر کارم بە تۆ نییە.

ـ ئەی کێ بلیتەکەت بۆ وەردەگرێ؟

ئانا بە تووڕەیی گوتی: باشە، چۆنت پێباشە با وابێ، بۆ من فەرقی نییە.

پیووتێر لە قەراغی فایتوونەکەوە خۆی هەڵداسەرێ و دەستێکی نایە کەلەکەی و دەستووری وەڕێکەوتنیدا.

## سی

لەگەڵ وەڕێکەوتنی فایتوونەکە و هەڵبەزدابەز کردنی لەسەر سەنگفەرشی شەقامەکە، تەقوکوتی تایەکانی لەسەر ورکەبەرد بەرزبۆوە و دیسان دیمەنە جۆراوجورەکانی شار لەبەر چاوی کەوتنە جموجۆڵ، ئانا بە خۆی گوت «ئاخ، دیسان زەینم روون بۆوە. دیسان لە هەموو شتێك تێدەگەم.»

هەولێدا وەبیر خۆی بهێنێتەوە «دەی، بیرم لەچی دەکردەوە؟ تیووتکین و هۆڵی جوانکارییەکەی؟ نا، ئەمە نەبوو. ئەها، بیرم لە قسەکانی یاشڤین دەکردەوە. سەبارەت بە خەبات بۆ ژیان و بێزاری، کە تەنیا

وزەیەکە کە مرۆڤەکان پێکەوە پێوەند دەدا.» ئەو تاقمەی کە بە سواری فایتوونێکی گەورە دیاربوو دەچن بۆ دەرەوەی شار بۆ گەشت و سەیران لە دڵی خۆیدا پێیگوتن «نا، لەخۆڕا دەچن. ئەو سەگەی دەشیبەن بە کەڵکتان نایە. ناتوانن لە دەست خۆتان دەربازبن.» چاوێکی لەولایە کرد کە پیووتێر لێیدەڕوانی و کرێکارێکی بەدمەستی دی کە خۆی بەسەر پێوە نەدەگرت و سەری بۆ هەموولایەك دادەکەوت و لاکەی دەهات، پاسەوانێك قۆڵی گرتبوو و رایدەکێشا. ئانا بە خۆی گوت «ئەمەیان رێگایەکی باشتری بۆ دەربازبوون لە چنگ خۆی هەڵبژاردووە و زووتر بە مەبەستی خۆی دەگات. من و کۆنت ڤرۆنسکیش لە چێژ و کەیفی ئەو حاڵە بێبەش بووین، ئەگەرچی هیوایەکی زۆر باشمان پێیهەبوو» ئێستا بۆ یەکەم جار پێوەندیی خۆی لەگەڵ ڤرۆنسکی، کە لە رابردوودا خوی لە بیرلێکردنەوەکەشی دەبوارد، لە هەمبەر پڕشنگێکی روون و سەرسووڕهێنەردا راگرت کە هەموو شتێکی لەبەر ئەو رووناکییەدا دەدی. «ئەو لە چی دەگەڕا لە ناخی مندا؟ ئەوین زۆر نا، رازی کردنی هەستی خۆپەرستانەی خۆی.» قسەکانی ڤرۆنسکیی وەبیرهاتەوە و شێوەی روخساری لە سەرەتای دامەزرانی پێوەندییاندا پێکەوە، ئەو کاتە لە سەگێکی دەستەمۆ دەچوو و ئێستاش هەموو شتێك نیشاندەری ئەو قسەیە بوون. «ژیانی ڤرۆنسکی جێژنی سەرکەوتنی خۆپەرستی بوو. هەڵبەت ئەوینیش بوو بەڵام زۆربەی بەهۆی هەوا و دەماری سەرکەوتنەوە بوو. من بیانوویەك بووم بۆ شاتوشووتەکانی. بەڵام ئێستا ئیتر ئەوانە تێپەڕین. ئیتر هیچ شتێك نییە کە شاتووشووتی پێوە بکات. ئیتر لەخۆبایی بوون بێجێیە، دەبێ شەرمەزار بێ. ئەوەی لە منی دەویست وەدەستی هێنا و ئێستا ئیتر پێویستی پێمنەماوە. من بە گۆشتی گەردەمل دەزانێ و تەنیا هەوڵ دەدا لەگەڵم ناڕاست بێت. دوێنێ پەتەی خۆی خستە سەر ئاو، گوتی دەیهەوێ تەڵاق لە مێردەکەم وەرگرم و ژیانی ژن و مێردایەتیم لەگەڵ پێکبێنێ تاکوو رێگای گەڕانەوەی نەبێ. منی خۆشدەوێ، بەڵام چۆن؟ **ئیتر گڕی ئەشقەکەی نیشتۆتەوە.**» لەگەڵ ئەوەی چاوی لە پیاوێکی بازاڕی دەکرد کە سواری ئەسپێك بووبوو بە خۆی گوت «ئەمەش دەیهەوێ بەو ئەسپسوارییەی خۆی هەمووان تووشی سەرسووڕمان بکات و چەندەش لەخۆ رازییە.» دیسان کەوتەوە سەر رێچکەی بیر و خەیاڵەکانی رابردووی و گوتی بەڵێ، من ئیتر ئەو بۆن و بەرامە و دڵگرییەی رابردووم نەماوە. ئەگەر وازی لێبێنم لە ناخی دڵەوە رازی و دڵخۆش دەبێ.»

ئەم قسەیەی ئەو گریمانەیەکی بێبنەما نەبوو. ئەو ئەم دۆخەی لەبەر تیشکێکی گەش و رێکەرەوە دەدی کە ئێستا مەتەڵی ژیان و رازی پێوەندیی مرۆڤانەی بۆ هەڵدەهێنا.

کەوتەوە سەر رێچکەی فیکر و خەیاڵەکانی خۆی «ئەشقی من بەردەوام شێتانەتر و خۆپەرستانەتر دەبێ و ئاگری ئەو بەردەوام روو لە دامرکانە. هۆی جودایی دڵەکانیشمان هەر ئەوەیە. هیچ چارەیەکیش نییە. بۆ

من تەواوی ژیان لە وجوودی ئەودا کۆبۆتەوە و دەیهەوێت تەواوی وجوودی خۆی بە من بسپێرێ. بەڵام ئەو دەیهەوێ ئازادتر بێت و دووری لە من دەکات. بەرلەوەی یەك بکەوین بەردەوام لە یەکتر نزیك دەبووینەوە بەڵام پاشان وەزیەکی بێباشار بەردەوام ئێمە لە یەکتر دووردەخاتەوە و هەرکامیان بەرولایەك دەبات و ئەو دۆخەش بە هیچ جۆرێك ناگۆڕدرێ. ئەو دەڵێ من بە ئێرەییم و ئێرەییەکەشم بێ مانایە. منیش پێم وابوو ئێرەیی بردنەکەم بێ مانایە. بەڵام ئەمە وانییە. من بە ئێرەیی نیم، ناڕازیم، بەڵام...›› دەمی کردەوە و بە هۆی هەیەجانێکەوە کە لە ناکاو ئەو خەیاڵە لە دڵیدا بەدیی هێنابوو جێگاکەی خۆی گۆڕی. ‹‹خۆزگە بمتوانیبایە شتێك بم جگە لە گراو بۆ ئەو کە تامەزرۆیانە بۆ لاواندنەوەکانی حەول دەدات. بەڵام من ناتوانم و ناشمهەوێ شتێکی تر بم. من بەو حەز و ویستەی خۆم ئەو بێزار دەکەم و ئەویش کوورەی رقم نێڵ دەدات و هیچ رێگا چارەیەکیش نییە. مەگین من نازانم کە ئەو نایهەوێ هەڵمخەڵەتێنێ و دڵیشی لەلای ساراکینا نییە، ئەشقی کیتیشی لە دڵدا نەماوە و خەیانەت بە من دەکات؟ هەموو ئەوانە دەزانم بەڵام ئەو زانینانە باری دڵم سووك ناکات. ئەگەر ئەو منی خۆشنەوێ و تەنیا وەك ئەرکێك لەگەڵ من مێهرەبان بێ و بملاوێنێتەوە، سەدجار لە رق و بێزاری خراپترە، دۆزەخە و منیش شتی ئاوام ناوێ. ئەمەش راست ئەو شتەیە کە ئێستا یەخانگیرم بووە. ئەو ماوەیەکی زۆرە ئیتر خۆشیناوێم. لە هەرجێیەك خۆشەویستی تەواوبێ رقو نەفرەت دست پێدەکات. من ئەم شەقامانەم نەدیوە. شەقامی سەرەوژوور و ئەو هەموو خانووبەرە و باڵەخانەیە! ماڵانی پڕمرۆڤ! چەندەش زۆرن، لە حیساب نایەن و هەمووشیان لە یەکتری بێزارن. ئێستا با بیری لێبکەمەوە بزانم بۆ بەختەوەری چ کەمایەسییەکەم هەیە؟ چاکە، گریمان تەڵاقم وەرگرت و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ سریۆژاش بدات بە من و لەگەڵ ڤرۆنسکی ژیانی ژنومێردایەتی پێکبێنم.›› کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی وەبیرهاتەوە ئەوەی زۆر بە روونی و ئاشکرایی، وەك ئەوەی زەقوزیندوو لەلای بێت، هێنایە بەرچاوی خۆی. هەر بەو چاوە مێهرەبان و بێنوور و پێلووە پەنەمیوانەیەوە وهەر بەو دەستە سپی و ناسکانە و رەگە شینەکانییەوە، بەو لەبز و راوێژە تایبەتەی خۆی و قامك تەقاندنەکانی‌‌‌” هەروەها پێوەندییە سۆزدارەکەیانی وەبیرهاتەوە کە ناوی ئەشقیان لێنابوو، هێندە قێزەونی هاتە بەرچاو کە لەبەر گوشاری نەفرەت لەرزی. ‹‹دەی وایدانێین تەڵاق وەرگرم و شووبکەم بە ڤرۆنسکی. ئەو کاتە دەبێ بە چی؟ کیتی ئیتر وەك ئەمڕۆ چاوم لێناکات؟ بۆچی؟ سریۆژا ئیتر سەبارەت بە دوو مێرد پرسیارم لێناکات؟ گریمان پرسیار نەکات، ئەو پرسیارە لە زەینیدا گەڕا داناخا؟ دەتوانم بیر لە چ هەستێکی تازە بکەمەوە کە لەنێوان من و ڤرۆنسکیدا سەرهەڵدەدا؟ یانی هەستێکی ئەوتۆ هەیە کە بەختەوەری نەبێت بەڵام ئیتر ئازاریش نەبێت؟›› بەبێ هیچ چەشنە دوودڵییەك وەڵامیدایەوە ‹‹نا، شتیوا مەحاڵە. ژیان ئێمە لێکجیا دەکاتەوە. من هۆکاری چارەڕەشیی ئەوم و ئەویش هۆکاری نامرادیی من. نە ئەو دەتوانێ خۆی بگۆڕێ نە من. ئەوەی

دەبوو ببێ هەوڵمان بۆدا. پێچی پێوەندییەکەمان هەرز بووە... بڕوانە، ئەو ژنە سواڵکەرە بە منداڵەکەیەوە. پێیوایە دڵم پێیدەسووتێ. چ هەڵەیەك! هەمووومانیان لەسەر ئەم دنیایە هەڵڕشتووە کە لە یەکتر بێزار بین و خۆمان و خەڵکی ئازار بدەین. بڕوانە ئەو قوتابییانە، دەڕۆن و پێدەکەنن.» سریۆژای وەبیرهاتەوە. «من پێم وابوو خۆشمدەوێ و خۆشەویستیی ئەو دڵم نەرم دەکات. بەڵام بەبێ ئەو ژیام و ئەوم بە ئەشقێکی دیکە فرۆشت و هەتا ئەو کاتەی کە ئەو ئەشقە رازیی بکردایەم لەو مامەڵەیە پەشیمان نەدەبوومەوە.» بە بێزارییەوە ئەو شتەی وەبیرهاتەوە کە پێیدەگوت «ئەشقێکی تر.» لەوەی کە ئێستا ژیانی خۆی و خەڵکی ئاوا بە روونی دەدی خۆشحاڵ بوو. بەخۆی گوت «هەمووان هەروان»، منیش و ئەو پیووتێرەش و فیۆدۆری فایتوونئاژۆش و ئەو دووکاندارەش و هەموو ئەو خەڵکەی لە کەناری ڤولگا دەژین و ئەو ئاگاداری و پڕووپاگەندانەی خەڵك بەرەو ئەو شوێنە رادەکێشن و لە هەموو شوێنێك و هەمیشە هەروایە.» بەڵام لەوکاتەدا لە بینای نزمی ویستگەی هێلاسنی نیژێنی گاردۆ نزیکبوونەوە و کۆڵبەران هەڵاتن بەرەوپیریان.

پیووتێر پرسیی: دەفەرمووی بلیت بۆ ئۆبیرۆلۆڤکا[85] وەرگرم؟

ئانا بە تەواوی لە بیری چووبۆوە کە بۆکوێ و بە چ مەبەستێك دەچێ، بە هەوڵێکی زۆر توانیی لە مانای پرسیاری خزمەتکارەکەی تێبگات. جزدانی پارەکەی پێدا و گوتی: بەڵێـ پاشان کیفە سوورە چکۆڵەکەی خۆی بە دەستەوە گرت و لە فایتوونەکە دابەزی.

لەگەڵ رۆیشتن بەرەو هۆڵی دەرەجە یەك و تێپەڕین بە نێو ئاپۆرەی خەڵکدا، وردە وردە هەموو پاژەکانی بارودۆخی خۆی و ئەو بڕیارانەی کە لەنێوانیاندا دوودڵ مابوو هەمووی وەبیرهاتەوە و دیسان هومێد و ناهومێدی زامی کۆنی دڵەشکاوەکەی هێنایەوە سۆ و خوێی لێپڕژاند. لە هۆڵەکەدا لەسەر کورسیەکی ئەستێرەیی دانیشت و چاوەڕێی شەمەندەفەر ما و بە بێزارییەوە چاوی لەو مسافیرانە دەکرد کە دەهاتنە ژووری یان دەچوونە دەرێ (لە هەموویان وەڕەز بوو) هێندێ جار بیری لەوە دەکردەوە کە کاتێك گەیشتە ئەوێ و لە وێستگە دابەزی پسوولەیەکی بۆ دەنووسێ و دەبێ چی بنووسێ و هێندێ جاریش لە بیری ئەوەدابوو کە ڤرۆنسکی (بێ ئەوەی لە ئازاری ئەو بگات) لەلای دایکی لە دەستی ئەو (یانی ئانا) سکاڵا دەکات و ئانا راست لەوکاتەدا کە ئەو خەریکی گلەیی و بناشتە خۆدەکات بە ژووریدا و ئەوەی بە دەمیدا بێت پێیدەڵێ. برێ جاریش لە دڵی خۆیدا دەیگوت ژیان هێشتا دەکرێ شیرین بێت و ئەشق و رقی ئەو دەرهەق بە ڤرۆنسکی ئاوێتەی ئازارێکی بەژان بووە و هەروەها ئاگای لە دڵی خۆشی بوو کە چۆن بە پڕتاو لێیدەدا و خستبوویە دڵەکوتێ.

---

85- Obirilovka

## سی و یەك

زرەی زەنگی یەکەم هەستا. چەند لاو بەبەر دەمیدا تێپەڕین. ئەو لاوانە خوێنتاڵ و رووهەڵماڵدراو هەڵدەهاتن و لەگەڵ ئەوەشدا ئاگایان لێبوو کە ئەو هەڵسوکەوتەیان چ شوێنێك لەسەر خەڵکەکە دادەنێ. ئانا چاوی بە پیووتێر کەوت کە بە جلوبەرگی کەلبەدووندارەوە و پزلووخ لەپێ بەو روخسارە گێژ و حەپۆلانەیەوە دەتگوت جانەوەرێکی قوشقییە و بە نێو هۆڵەکەدا تێدەپەڕێ و بەرەولای ئەودێت بۆ ئەوەی هەتا بەرسەکۆکە لەگەڵی بچێت. ئەو گەنجە بەیتەشە و چەتاوەڕووانە کاتێك ئانا گەیشتە سەرسەکوی وێستگە و بە پەنایاندا تێپەڕی بێدەنگ بوون و یەکێکیان بە سرتە شتێکی بە ئەوی تریان گوت، کە قسەیەکی پیس بوو. ئانا لە پلیکانی بەرزی فارگۆنەکە چووە سەرێ و بە تەنیا لە کووپەیەکدا لەسەر قەنەفەیەك دانیشت کە کاتی خۆی سپی بووبوو بەڵام ئێستا چڵکوپەڵە داپۆشیبوو. کیفەکەی لە پاڵ خۆیدا لەسەر قەنەفەکە دانا و کیفەکە لەسەر فەنەری قەنەفەکە هێندێك هەڵبەزییەوە و لە جووڵە کەوت. پیووتێر لە پشت پەنجێرەکەوە خۆی هەڵێنا و کڵاوە زەڕچنەکەی لەسەری داکەند و بە بزەیەکی گەمژانەوە خوداحافیزیی لێکرد. فەرمانبەرێکی رێلاس و چەقاوەسوو دەرگای کوپەکەی بە توندی پێکدادا و دایخست. ژنێکی ناحەز و قەدوباڵا نالەبار (ئانا بە سەرنجێك رووتی کردەوە و بێزی لە ئەندامە ناتەرزەکەی هەستا) لەگەڵ کچۆڵەیەك کە پێکەنینەکەی زایەڵەیەکی نائاسایی پێوەبوو بە هەڵەداوان بەبەر پەنجێرەی ڤاگۆنەکەدا تێپەڕین.

کچە بە دەنگی بەرز گوتی: هەموو شتەکان لەلای کاترینا ئاندریۆڤنان، میمکەگیان.

ئانا بە خۆی گوت «کچە بەم چکۆڵەییە لە ئێستاوە ئەندامی لە دۆخی ئاسایی دەرچووە و چەندەش بە ئەدا و ئەتوارەوە قسە دەکات.» کە ڤاگۆنەکە خاڵی بوو ئانا بەپەلە هەستا و لەبەر پەنجەرەی رووبەڕووی دانیشت بۆ ئەوەی چاوی بە هیچ کەس نەکەوێ. مووژیکێك بە سەر و رووی چەور و چڵیك و دووکەڵاوییەوە، کە کڵاوێکی چڵکنی لەسەردا بوو و قژە ئاڵۆزاوەکەی لە ژێرییەوە هاتبووە دەرێ، کە گەیشتە بەرپەنجێرەکە دانەوی و چاوی لە تایەکانی ڤارگۆنەکە کرد. ئانا بە خۆی گوت «ئەم مووژیکە چڵکنە زۆر ئاشنا دێتە بەرچاوم.» کە خەونەکەی خۆی وەبیرهاتەوە لە ترسانا لەرزی و هەستا و رۆیشت بۆ بەردەرگای رێڕەوەکە کە بەرەوڕووی بوو. کارگێڕی شەمەندەفەر خەریکبوو دەرگاکەی بۆ ژن و مێردێك دەکردەوە.

ـ خاتوون دەتانەوێ دابەزن؟

ئانا وەڵامی نەدایەوە. کارگێڕ و ژن و مێردەکە لە ژێر تۆڕەکەی دەموچاویەوە تێنەگەیشتن چ ترسێك روخساری داگرتووە. ئانا چووەوە جێگاکەی خۆی و دانیشت. ژن و مێردەکە لەسەر قەنەفەی رووبەڕووی ئەو دانیشتن و بە وردی و لە ژێرەوە چاویان لە جلو بەرگەکەی دەکرد. هەردووکیان لەبەر چاوی ئانا زۆر جاڕزکەر بوون. پیاوەکە لە ئانای پرسی کە ئیزن دەدات جگەرەیەك داگیرسێنێ؟ بەڵام دیاربوو کە حەزی لێنییە جگەرە بکێشێ تەنیا بەهانەیەك بووە بۆئەوەی قسەی لەگەڵ بکات. ئانا کە ئیزنی پێدا کابرا دەستیکرد بە قسەکردن لەگەڵ ژنەکەی بە زمانی فەڕەنسی. بەڵام ئەوەی دەیگوت لە جگەرەکێشانەکەی ناپێویست و بێ ماناتر بوو. ئەوان بۆ رواڵەتسازی و خۆڕانان قسەیان دەکرد و ئەوەی دەیانگوت هەمووی هەڵیتوپڵیت بوو و مەبەستیان تەنیا ئەوە بوو کە ئانا گوێی لێبێ. ئانا سوورسوور دەیزانی کە ئەوانە لە یەکتری بێزارن و یەکتریان لەبەر چاو کەوتووە و نەشدەکرا کەسێك هەبێ و لەو بوونەوەرە دزێوانە بێزار نەبێ.

زڕەی زەنگی دووهەم هەستا و بە دوای ئەودا تەپوکوت و دەنگی دانانی بار و جانتاکان و ئاخافتن و پێکەنین، دەوروبەر و رێڕەوی ڤاگۆنەکەی داگرت. ئانا لێی روون بوو کە هیچ کەس هۆیەکی بۆ دڵشادی نییە و ئەم قاقای پێکەنینە تاڕادەیەکی زۆر ئازاری دەدا و ئەو دەیویست گوێی خۆی بئاخنێ تاکوو نەیبیستێ. ئاخری زەنگی سێهەم لێدرا و پاشان هۆڕن و فیشکە و هەڵمی لۆکۆمۆتیڤ وێستگەی داگرت. دوای ئەویش تەکانی زنجیری ڤاگۆن و کابرای هاوکووپەی خاچی خۆی کێشا. ئانا چاوێکی پڕقینی لێکرد و لە دڵی خۆیدا گوتی «حەزم دەکرد لێیبپرسم کە مەبەستی لەوکارە چییە؟» لەولای ژنەکەوە و لە پەنجێرەکەوە چاوی لەو کەسانە دەکرد کە شانبەشانی شەمەندەفەرەکە دەهاتن یان لەسەر سەکۆکە راوەستابوون و بۆ دواوە دەخوشین. ئەو ڤاگۆنەی کە ئانا تێیدا دانیشتبوو، بە شێوەیەکی یەکهاوی لەسەر ماچڵەکی رەیلەکە بە تەکانێکی ئەستەم و لەرەیەك بەپاڵ سەکۆی وێستگە و دیواری بەردین و پاڵ دیسکی رێنوێنی لۆکۆمۆتیڤ و ڤاگۆنەکانی تردا تێپەڕی. گەڕانی تایەکان ئارام و نەرمتر دەبوونەوە و ژنگێکی نەرمی لە رەیلەکان دەردەکێشا. پەنجەرەی ڤاگۆن لەبەر پڕشنگی هەتاوی ئێوارە بریقەی دەهات و شنەیەکی نەرم و فێنك یاریی بە پەردەی ڤاگۆنەکە دەکرد. ئانا هاوکووپەکانی لەبیرچووبۆوە و لەگەڵ لەرەی نەرم و رێکوپێکی ڤاگۆنەکە هەوای تازەی هەڵدەمژی و دیسان کەوتەوە سەر رێچکەی بیر و خەیاڵەکانی.

«دەی، بیر و خەیاڵەکانم بە کوێ گەیشتبوون؟ لێرەدا ناتوانم ئەو دۆخەی کە دەیهێنمە بەرچاوی خۆم پڕ لە ئازاری نەبینم، ئێمە هەموومان بۆ ئەوە ئافرێندراوین کە ئازار بکێشین و

هەموو لەوە ئاگادارین و بوارێك دەدۆزینەوە بۆ ئەوەی خۆمان هەڵخەڵەتێنین. بەڵام کاتێك راستییەکان دەبینی، چیت لەدەست دێ؟»

خاتوونێك کە بەرەوڕووی دانیشتبوو بە زمانی فەڕەنسی گوتی: مرۆڤ بۆیە ئاوەزی پێدراوە تاکوو خۆی لە چنگ ئەو تەنگووچەڵەمانە دەربازبکات کە ئازاری دەدەن ـ دەیاربوو زۆریشی ئەو قسەیەی خۆی بە دڵە و لەگەڵ دەربڕینی، زمانی جۆرێك دەگێڕا کە نەبرە و راوێژی دەستکردی دەنواند.

ئەم قسەیە دەتگوت رەنگدانەوەی فکر و خەیاڵی ئانایە و هەقی پێدەدا. ئانا لە زەینی خۆیدا دووپاتی کردەوە: «دەربازبوون لە چنگ ئەو تەنگووچەڵەمانەی ئازارت دەدات.» چاوێکی لە مێردە سوورهوول و ژنە لاوازەکە کرد و بۆی دەرکەوت کە ئەو ژنە دەردەدارە خۆی بە ژنێك دەزانێ کە هیچ کەس ئاگای لە رۆحی نییە و مێردەکەی فریوی دەدات و وایلێکردووە کە ئەو باوەڕە زیاتر لە ناخیدا رەگاژو بکات. ئانا دەتگوت ئەوانی داوەتەبەر تیشکی ژیرڤانیی خۆی و چیرۆکی ژیان بە وردی و بە روونی دەخوێنێتەوە و هەموو کەلو قوژبنی رۆحیان دەپشکنێ. بەڵام شتێکی سەرنجڕاکێشی لەواندا نەدۆزییەوە و گەڕایەوە سەر خەیاڵەکانی خۆی.

«بەڵێ، زۆر شت هەیە دڵگرانم دەکات و بۆیە ئەقڵ و ئاوەزم پێدراوە تاکوو خۆم لە دەست ئەو ئازارانە دەربازبکەم. یانی دەبێ خۆم رزگار بکەم. کاتێك شتێکی سەرنجڕاکێش نەماوە و ئەوەی ماوە لێیوەڕەزم بۆ مۆمەکە نەکوژێنمەوە؟ ئەو لاتولووتانە لەو ڤاگۆنەدا ئەو هەرا و زەنازەنایە چییە سازیان کردووە؟ بۆ ئەوەندە قسە دەکەن؟ ئەو هەموو پێکەنینە چییە؟ هەمووی درۆیە و فێڵ و تەڵەکە و دەهۆ، هەمووی شەیتانی و شەڕاشۆیی...»

کاتێك شەمەندەفەر گەیشتە وێستگە، ئانا دابەزی و رۆیشت بۆ نێو مسافیرەکانی تر، بەڵام هێندەی پارێز لێدەکردن، دەتگوت کەوتۆتە نێو کۆمەڵی گولان. لەسەر سەکۆکە راوەستابوو و هەوڵی دەدا وەبیر خۆی بێنێتەوە بۆچی هاتووە بۆ ئێرە و دەیهەوێ چ بکات؟ هەموو ئەو کارانەی لە رابردوودا پێیوابوو ئاسانن و لە دەستی دێ، تەنانەت بیر لێکردنەوەشیان، بەتایبەت لەم نێو ئاپۆرە و ژاوەژاوی خەڵکەدا کە ناهێڵێ تاوێك ئاسوودە بێت، زۆر دژوار بوو. هێندێ جار کۆڵبەران دەهاتن بۆ لای تاکوو ئەگەر بارێك یان جانتایەکی هەیە بۆی هەڵگرن، یان ئەو لاتولووت و بەڕەڵڵایانە پاژنەیان بە تەختەی سەر سەکۆکەدا دەکێشا و تێدەپەڕین و بە دەنگی بەرز قسەیان دەکرد و رووهەڵماڵدراوانە چاویان لە بەژن و باڵای دەکرد، یان ئەو کەسانەی کە بەرەوڕووی دەهاتن و دەیانویست رێی بۆ چۆڵ بکەن و لەسەر رێگاکەی لادەچوون بەڵام شانیان لە شانی دەدرا، لە هەموویان بێزار بوو. وەبیری هاتەوە کە

دەیویست ئەگەر وەڵامێکی ڤرۆنسکیی بە دەست نەگات درێژە بە ڕێگای خۆی دەدات. پێشی بە کۆڵبەرێك گرت و لێیپرسی کە فایتوونەوانێکی نەدیوە کە نامەیەك بۆ کۆنت ڤرۆنسکی ببات؟

ـ کۆنت ڤرۆنسکی؟ یەکێك لە پیاوەکانی ئێستا لێرە بوو. هاتبوون بەدوای پرێنسس ساراکینا و کچەکەیدا. فایتوونەوانەکەی چ بەژن و قەڵافەتێکی هەبوو!

کاتێك ئانا لەگەڵ کۆڵبەرەکە قسەی دەکرد میخائیلای فایتوونئاژۆ بەو دەموچاوە سوور و خەندانەیەوە و بەو کۆتە خۆڵەمێشینە جوانەوە کە لەبەریدا بوو زنجیری کاتژمێرەکەی بە لاگیرفانیدا شۆڕکردبۆوە، زۆر لە خۆی دەفشی کە ئەو ئەرکەی بە باشی بەڕێوەبردووە، هات بۆ لای و نامەیەکیدایە دەستی. ئانا بە دڵێکی پڕ لە قرتوفرتەوە کە هێشتا نامەکەی نەخوێندبۆوە و بە پرتاو لێیدەدا و لەوانەبوو سینگی کون بکات، پاکەتەکەی هەڵپچڕی.

ڤرۆنسکی بەپەلە پرووزێ نووسیبووی: «زۆر بەداخەوەم کە نامەکەی پێشووتم بە دەست نەگەیشت. سەعات دە لە ماڵێ دەبم.»

ئانا بە بزەیەکی پڕ لە رقو قینەوە بە خۆی گوت «دەی، چاوەڕوانییەکم جگە لەوە لێینەبوو.»

ڕووی لە میخائیلا کرد و لەسەرەخۆ گوتی: باشە، تۆ بڕۆوە بۆ ماڵێ ـ زۆر بە هێواشی قسەی دەکرد، چونکە دڵی وا بە پرتاو لێیدەدا نەیدەتوانی بە جوانی هەناسە بکێشێ و وەهەناسەبڕکێ کەوتبوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: «نا، ئیتر ئیزنت پێنادەم ئازار و ئەشکەنجەم بدەی!» بەڵام ئەو هەڕەشەیە نە رووی لە خۆی بوو نە لە ڤرۆنسکی، بەڵکوو لە کەسێك بوو کە ناچاری دەکرد ئازار بکێشێ. پاشان بەسەر سەکۆی وێستگەدا و بەپاڵ بیناکەیدا وەڕێکەوت.

دوو ژنی خزمەتکار کە لەسەر سەکۆکە پیاسەیان دەکرد ئاوڕیاندایەوە و سەرتاپا تێیان ڕووانی و سەبارەت بە جلوبەرگەکەی پێکەوە دووان. سەبارەت بەو دامتەلەی کە دابووی بەسەر جلەکانیدا گوتیان: لە ئەسڵەکانە ـ لاوانی خوێڕی و بێکارە لە کۆڵی نەدەبوونەوە. دیسان بە پاڵیدا تێپەڕین و چاویان لە چاوی دەبڕی و پێدەکەنین و بە دەنگی سەیروسەمەرە دەیاننەڕاند. سەرۆکی وێستگەکە لەولایەوە تێدەپەڕی لێیپرسی کە دیسان سواری قەتار دەبێتەوە یان نا؟ کوڕێکی مێرمنداڵ کە کواسی دەفرۆشت چاوی لێنەدەتروکاند. ئانا بەسەر سەکۆی وێستگەکەدا هەروا هەنگاوی دەنا و بەخۆی دەگوت «خودایە، روو لەکوێ بکەم؟» کە گەیشتە ئەوسەری سەکۆکە راوەستا. چەند ژن لەگەڵ منداڵەکانیان کە هاتبوون بەرەوپیری کابرایەکی چاویلکە لەچاو و بە دەنگی بەرز قسەیان دەکرد و قاقایان دەکێشا، کە ئانا گەیشتە لایان بێدەنگ بوون و هەموو چاویان تێبڕی و بە چاو وەدوای کەوتن. ئانا هەنگاوی توندتر کرد، لێیان

دوورکەوتەوە و گەیشتە لێواری سەکۆکە. قەتارێکی باری نزیك دەبۆوە و سەکۆی وێستگەکەی دەلەرزاندەوە و ئانا هەستی دەکرد دیسان لەنێو قەتارەکەدا دانیشتووە و بەرێوەیە.

لەناکاو یەکەم دیداری ڤرۆنسکی هاتە بیری و مووژکێك کە لە ژێر شەمەندەفەرەکەدا پلیشابوو و زانیی دەبێ چ بکات. بە هەنگاوی سووك و خێرا بە پلیکانی پاڵ ئەستووندەکی ئاوبەندەکەدا چووە خوارێ و گەیشتە پەنا ئەو رەیلانەی کە ئەو قەتارەی دەهات راست بە پەنایدا تێدەپەڕی و لەوێ راوەستا. چاوی لە ژێر ڤاگۆنەکان دەکرد و قولاپ و زنجیر و تایەی بەرزی ڤاگۆنی یەکەم کە بە هێواشی دەسوورا و دەچووە پێشێ، هەولێدەدا بە چاوی خاڵی نێوەڕاستی ڤاگۆنەکە، نێوان تایەی پێشەوە و دواوە دیاری بکات و ئەو چرکە ساتەی کە ئەو خاڵە دەگاتە بەردەمی بەراوردی بکات.

لەبەر سێبەری ڤاگۆنێك چاوی لە خیزی تێکەڵ بە خەڵووز دەکرد کە بەسەر تراڤێرسەکاندا پژابوون و بە خۆی گوت «ئەوێ، ئەوێ راست نێوانی دوو تایەکەیە، بەو کارە ئەو سزا دەدەم و خۆشم لە چنگ هەمووان و لە چنگ خۆم رزگار دەبم.»

دەیویست خۆی فڕێداتە نێوان ئەو دوو تایەی کە گەیشتبوونە بەردەمی، بەڵام جانتایەکی سووری چکولە کە بە قۆڵیدا کردبوو و دەیویست داینێت و نەیدەتوانی بەرگری بوو و فریانەکەوت. خاڵی نێوانی دوو تایەکە تێپەڕی و ناچاربوو چاوەڕێی ڤارگۆنی دوای ئەوبێت. هەستێکی وەك ئەو کاتەی کە لە چۆمدا مەلەی دەکرد و بۆ خۆفرێدانە نێو ئاوەکە ترس و دوودڵی دایدەگرت و نەیدەهێشت خۆی فڕێدا دڵی داگرتبوو، خاچی خۆی کێشا. ئەم خاچکێشانە نائاساییە زنجیرەیەك بیرەوەریی سەردەمی منداڵی و عازەبیی لە رۆحیدا زیندوو کردەوە و لە ناکاو پەردەیەکی رەش کە هەموو شتێکی بۆ ئەو لە پشت خۆیدا شاردبۆوە دادڕا و ژیان بۆ ساتێك بە هەموو شادی و رووناکی و شیرینییەکانی رابردوویەوە لەبەرچاوی خۆی نواند. بەڵام ئەو چاوی لەسەر تایەی ڤاگۆنەکانی دووهەم هەڵنەدەگرت کە دەهاتە پێشێ. راست لەو ساتەدا کە خاڵی نێوانی تایەی ڤاگۆنی دووهەم گەیشتە بەردەمی جانتا سوورەکەی تووڕهەڵدا و سەری بە پشتدا خست و خۆی هاویشتە سەر هەردوو دەستی و بە لەز وەك ئەوەی بیهەوێ دیسان هەستێتەوە چۆکی دادا. راست لەوکاتەدا بە هۆی ئەو کارەیەوە ترس دایگرت. «لەکوێم؟ چیدەکەم؟ بۆچی؟» ویستی هەستێتەوە و خۆی بکێشێتە دواوە. بەڵام شتێکی نەرم و رەش کە رەحم و بەزەییی نەدەزانی کێشرا بە تەپڵی سەریدا و هەڵیگێڕایەوە و خستی بە پشتدا و هەروا لەسەر پشت بەسەر خیزەکەدا راکشا. ئانا کە توانایی خۆڕاپسکاندنی نەمابوو گوتی: خودایە، لە تاوانەکانم خۆشبە! مووژیکێك کە قسەکانی بێ مانا بوون خەریکی شتێکی ئاسنین بوو و مۆمێك کە لەبەر شۆقەکەی کتێبێکی پڕ لە خەم و فێڵ و شەڕاشۆبی و دڵەخورپەی دەخوێندەوە، بڵێسەی کێشا و لە هەموو کاتێك رووناکتر بوو و ئەو شتانەی کە لە رابردوودا بۆ ئەو لە تاریکیدا شاردرابوونەوە رووناکی کردنەوە و پاشان شۆڵەکەی لەرزی و تاریك داگەڕا و بۆ هەمیشە کووژایەوە.

## یەك

دوو مانگ تێپەڕی، نیوەڕاست مانگی هاوین و هەوا زۆر گەرم بوو، بەڵام سرگی ئیڤانئیچ تازە وەبیری هاتبۆوە مۆسکۆ بەجێ بێڵێ.

لەو ماوەیەدا هێندێك رووداویش لە ژیانی سرگی ئیڤانئیچدا قەومابوو. ساڵێك بەر لە نووسینی کتێبەکەی کە شەش ساڵی رەبەق و بەردەوام پێوەی سەرقاڵ بوو، وەکوو «لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بە بنەما و شێوەی دەوڵەتداری لە ئەورووپا و رووسیا!» گرنگیی پیدابوو. بەشێك لە دەقی کتێبەکە و هەروەها پێشەکییەکەی لە رۆژنامەکاندا چاپ کرابوون و سرگی ئیڤانئیچ بەشەکانی دیکەشی بۆ دۆستانی هاوقەتاری خۆی خوێندبۆوە، ئەندێشە و فیکرەکانی لەم بەرهەمەدا بۆ خوێنەرانی ئەو کاتە شتێکی تازە نەبوون. لەگەڵ ئەوەشدا سرگی ئیڤانئیچ چاوەڕێ بوو بڵاو بوونەوەی کتێبەکەی شوێنێکی بەرچاو لەسەر کۆمەڵگا دابنێ و ئەگەر بواری زانست بە گشتی نەگۆڕێ لانیکەم لە جیهانی زانستدا فەرتەنەیەکی بەهێز بەدی بێنێ.

ئەم کتێبە دوای پێداچوونەوە و هەڵەچنی بە وردی، ئاخری ساڵی رابردوو چاپ کراو هاتە بازاڕی کتێبەوە.

سرگی ئیڤانئیچ بیروڕای هیچ کەسی لەسەر کتێبەکەی قەبووڵ نەدەکرد و زۆر کەمتەرخەمانە و بە سەرساردییەوە وەڵامی پرسیاری هاوڕێیانی سەبارەت بە پێشوازیی خەڵك دەدایەوە و تەنانەت لە کتێبفرۆشەکانی نەدەپرسی کە کتێبەکەی فرۆشی چۆن بووە. بەڵام هەر لەوکاتەدا زۆر بە وردبینی و سەرنجەوە ئاگای لەو کاریگەرییانە بوو کە کتێبەکەی لەسەر زەینی خەڵك و بڵاڤۆکەکانی دادەنا.

بەڵام حەوتوویەك، دوو حەوتوو، سێ حەوتوو تێپەڕی و هیچ شوێنێکی لەسەر خەڵك دانەنا. هاوڕێکانی و خاوەنڕایان و بیرمەندان هێندێ جار و بە ئاشکرا لە بواری ئەدەبەوە لەسەری دەدوان بەڵام ئەو هاوڕێ و دۆستانەی تری کە هیچ هۆگرییەکیان بە کتێبە زانستییەکان نەبوو خۆیان لەو دارەتە نەدەدا. بەڵام کۆمەڵگا، کە بەتایبەت لەو سەردەمەدا سەرقاڵی بابەتێکی تر بوون زۆر بێموبالاتانە چاویان لێکرد. لە بڵاڤۆکەکانیشدا لە ماوەی مانگێکدا یەك وشەشی لەسەر نەنووسرا.

سرگی ئیڤانئیچ بە وردی حیسابی کردبوو کە چ ماوەیەك پێویستە تاکوو نرخاندێك لەسەر کتێبەکەی بنووسرێ. بەڵام مانگێك و تەنانەت دوو مانگیش گووزەرا و هەروا بێدەنگی لەو بوارەدا بەردەوام بوو.

تەنیا لە گۆڤاری **گوگلێنەی باکوور**دا نووسەرێکی حەنەکنووس لە پەراوێزی نووسراوەیەکی گاڵتەجارانە سەبارەت بە گۆرانیبێژێك بە ناوی درابانتی[86] کە دەنگی کەوتبوو، بەو بۆنەوە چەند رستەی داشۆرینیشی لەسەر کتێبەکەی کازنیشۆڤ نووسی و لەو بارەوە سوور بوو لەسەر ئەوەی کە هەموو کتێبخوێنەکان لەمێژە ئەو بەرهەمەیان مەحکووم کردووە و تەنیا بۆ گاڵتەجاری جاروبار قسەیەکی لەسەر دەکەن.

ئاخری لە مانگی سێهەمی دوای بڵاوبوونەوەی کتێبەکە لە گۆڤارێکدا وتارێکی رەخنەیی سەبارەت بەو کتێبە چاپکرا. سرگی ئیڤانڤیچ نووسەری وتارەکەی دەناسی. جارێك لە ماڵی گۆلووبتسۆڤ[87] چاوی پێیکەوتبوو.

نووسەری وتارەکە پەراوێز نووسێکی زۆر گەنج و کەمئەزموون بوو. لە کاری نووسینی پەراوێزدا زۆر شارەزا بەڵام لەرادەبەدەر بێفەرهەنگ و کاتی چاوپێکەوتن لەگەڵ کەسایەتییەکان زۆر شەرمێون بوو.

ئەگەرچی سرگی ئیڤانڤیچ نووسەری وتارەکەی زۆر بە کەسێکی هیچوپووچ دەزانی بەڵام بە رێزێکی زۆرەوە دەستیکرد بە خوێندنەوەی وتارەکە و دیتی وتارەکە زۆر ناحەز و قێزەونە.

لێی روون بوو کە نووسەری وتارەکە لە کتێبەکەی نەگەیشتووە یان زۆر خراپی تێگەیشتووە. بەڵام رستە و سارستەی تایبەتی هێندە شارەزایانە لێدەرکێشا بوو و لە پاڵ یەکدا چنیبووی کە بۆ کەسانێك کە کتێبەکەیان نەخوێندبۆوە (دەکرێ بڵێین هیچ کەس نەیخوێندبۆوە) وا دەردەکەوت کە کتێبەکە هیچ نییە جگە لە کۆمەڵێك رستە و دێری بەقاوقو و پێچەڵاوپووچ، ئەویش بێبایەخ و سواو (نیشانەگەلی پرسیاری زۆری نووسەر ئاماژەی بەو مانایە بوو) هەروەها بەو ئاکامە گەیشتبوو کە نووسەری کتێبەکە پیاوێکی زۆر بێفەرهەنگ و دواکەوتووە. بەڵام هەموو ئەوانە بە تیزوتەوسێکی زۆر توند نووسرابوون و سرگی ئیڤانڤیچ ناچاربوو لەو بوارەوە پەسندی بکات و توندییەکەی بەباش بزانێ. هەر ئەوەش کارەکەی خراپتر کرد.

سەرەرای ئەو دڵفراوانییەی سرگی ئیڤانڤیچ هەیبوو چاکخوازانە دەیویست بەڵگە هێنانەوەکانی نووسەر تاقی بکاتەوە، تەنانەت هەڵوەستەیەکی لەسەر ئەو عەیب و هەڵانە نەکرد کە تیخی تەوسەکە پێکابوونی. دیاربوو ئەمانەش هەموو بە ئانقەست بەو شێوەیە لە پاڵ یەکدا چندرابوون و بێ ئیختیار هەوڵیدا تاکوو دیدار و ئاخافتنی خۆی لەگەڵ ئەو نووسەرە بە وردی وەبیر خۆی بهێنێتەوە.

---

86- Drabanti
87- Goloubttsov

سرگی ئیڤانڤیچ بە خۆی گوت «بڵێی نەمزانیبێ و بەجۆرێك دڵیم رەنجاندبێ؟»

کە وەبیری هاتەوە لەو دانیشتنەی ماڵی گۆلووبتسۆڤ و لە ئاخافتنەکەیاندا وشەیەك کە نیشاندەری نەزانیی ئەو گەنجە بوو بۆی راست کردبۆوە، بۆیە مەسەلەکەی بۆ روون بۆوە.

دوای ئەو وتارە ئیتر نە هیچ کەس ناوی ئەو کتێبەی بە دەمدا هات و نە لە نووسراوەیەکیشدا ئاوڕی لێدرایەوە. بێدەنگییەکی چڕ، سرگی ئیڤانڤیچ دیتی زەحمەتی شەش ساڵ ماندووبوونی کە بەو هەموو تامەزرۆییەوە لەسەر ئەو کتێبەی دانابوو بە فیڕۆ چووە.

بەو بۆنەوە سرگی ئیڤانڤیچ تووشی بارودۆخێکی ناخۆش بووبوو، کە نووسینی کتێبەکەی تەواوبوو ئیتر وەك پێشوو خۆی بە کاری رێکوپێك کردن و هەڵوەژارتنی بابەتەکانییەوە ماندوو نەکرد.

سرگی ئیڤانڤیچ پیاوێکی وریا و زانا و لەشساغ و تێکۆشەر بوو و نەیدەزانی توانایی قولێپدەری خۆی چۆن لەکار بکات. ئاخافتن لە میوانی و کۆبوونەوەکان و کۆمەڵە و لیژنەکاندا و هەرشوێنێك بۆ قسەکردن شیاو بوایە بەشێك لە کاتی ئەوی دەگرت. بەڵام ئەو چونکە لەمێژ بوو دانیشتوی شار بوو ئیزنی نەدەدا کە تەواوی کاتی، وەك برا بێئەزموونەکەی (واتە لەڤین) لە ماوەی مانەوەی لە مۆسکۆ، هەمووی بە قسەکردن بە فیڕۆ بچێت و دەرفەت و تواناییی کاری زۆر بۆ دەمایەوە.

بەختەوەرانە هەر لەوکاتەدا کە بە هۆی پێشوازی نەکردن لە کتێبەکەی زۆر دڵگران بوو مەسەلەی پانئیسلاویسم[88] کە لە رابردوودا وەك ژیلەمۆی ژێر خۆڵەمێش لە کۆمەڵگادا شاراوە بوو بە توندی بڵێسەی کێشا و جێگای مەسەلەی جیاوازیی ئایین[89] و رووداوی شاندی

---

٨٨- مەسەلەی پانئیسلاویسم بزووتنەوەیەك بوو بۆ بۆ یارمەتیدانی گەلانی ئیسلاو کە لەگەڵ شۆڕشی خەڵکی بۆسنیا و هێرزەگۆڤین بە دژی تورکانی عوسمانی لە ساڵی ١٨٧٥دا دەستییپێکرد و ساڵی دوایی لەگەڵ شۆڕشی بولغارەکان و دسپێکردنی شەڕی سیربەکان و تورکەکان پەرەی سەند و لەو کاتەدا مەسەلەکە زۆر دژوار بوو. ئەم بزووتنەوەیە لە کۆمەڵگای ڕووسیادا بە شێوەیەکی بەربڵاو دەنگی دایەوە و بووە هۆی ئەوەی خەڵکی بۆ یارمەتیدانی برایانی سیرب لەو شەڕەدا مینەق بن و ئاخری لە ساڵی ١٨٧٧دا دەوڵەتی ڕووسیای هاندا کە بە دژی ئیمپڕاتۆریی عوسمانی بکەوێتە شەڕەوە.

٨٩- ئاماژەیەکە بە کەنیسەکانی کاتۆلیکی سەربەخۆی لەهێستان کە لە ساڵی ١٨٧٥ ڕوویان لە کلیسای ئۆرتۆدۆکس کرد. پاشان دەرکەوت کە ئەو هۆگرایەتییە تەنیا باری سیاسیی بووە و بنەمای خەڵکی نەبووە و خەڵك بۆ ڕێوڕەسمی زەماوەند و سەرانشۆ و ناشتنی مردووەکانیان و کاروبارە ئاینییەکانی دیکەی خۆیان هەروا لایەنگری لە ڕووحانییە گەڕۆکانە دەکەن کە وەفادارن بە کەنیسەی ئۆرتۆدۆکسی پێشوو و ئەوەش بووە هۆی ئەوەی لە لایەن کەنیسەی ئۆرتۆدۆکسی ڕووسییەوە شوێنگێڕی بکرێن کە زۆری کێشە و باس لێکەوتەوە.

ئەمریکایی[٩٠] و قاتوقڕیی پارێزگای ساراما[٩١] و پیشانگا و بانگکردنی ڕۆحی گرتبۆوە و سرگی ئیڤانڤیچ کە لە ڕابردوودا یەکێك لە بانگەشەکارانی ئەم بزووتنەوەیە بوو هەموو توانای خۆی بۆ ئەو کارە تەرخان کرد.

لە کۆڕێکدا کە سرگی ئیڤانڤیچ سەر بە ئەوێ بوو لەو کاتەدا جگە لە مەسەلەی پانئیسلاویسم و سێربەکان نە باسی شتێیکی تر دەکرا و شتێکیان لەوبارەوە دەنووسی. هەموو ئەو کارانەی کە بە شێوەی ئاسایی مرۆڤە بێکارەکان بە مەبەستی خۆشڕابواردن دەیکەن ئێستا کەوتبووە خزمەتکردن بە بانگەشە بۆ مەسەلەی پانئیسلاویسم. کۆڕی سەما و کۆنسێرت و میوانداریيەکان و وتاردان و هۆڵی جوانکاریی ژنان و مەیخانە و بادەنۆشی و قاوەخانەکان هەمووی نیشانەی هاودەردی لەگەڵ برایانی سربیان پێوە دیاربوو.

---

٩٠- بریتی بوو لە شاندێکی تایبەت کە لە ژوییەی ساڵی ١٨٦٦ لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە هات بۆ ڕووسیا بۆ پیرۆزباییکردن لە ئەلکساندری دووهەم بۆ نەجاتبونی لەو پیلانەی کە بۆ کوشتنی داڕێژرابوو، ئەمەش بۆ وەڵامی پشتیوانیی ڕووسەکان لە حکوومەتی فیدراڵ لە ماوەی شەڕی ناوخۆی ئەمریکادا بوو (ڕووسیا ساڵی ١٨٦٣ یەکەیەکی سوارەنیزامی بۆ ئەمریکا ناردبوو کە زۆری شوێنی لەسەر ورەی خەباتگێڕانی باکوور دانابوو) ئەم وەفدە تایبەتە بە سەرۆکایەتیی ملازم فاکس لەگەڵ پێشوازییەکی زۆر گەرموگوڕ بەرەوڕوو بوو.

٩١- لە مانگی ژوئەنی ١٨٧٣دا تۆلستۆی و بنەماڵەکەی چوون بۆ قەزای بۆزۆلۆك لە پارێزگای سامارا تاکوو چاویان بەو ملکە تازەیە بکەوێ کە لەوێ کڕیبوویان. تۆلستۆی کە هەمیشە لە خەمی بارودۆخی نالەباری گوندنشینەکاندا بوو بە دیتنی ئەو مەترسیە گەورە کە وێدەچوو بە زوویی ڕووبدات ترس دایگرت. دوو ساڵ بوو باری داهات و کشتوکاڵ باش نەبوو و ئەوەی کە لە ساڵانی ڕابڕدوو مابۆوە و لە هەمارەکاندا بوو گوندنشینەکان هەموویان تەواوکردبوو. داهاتی ئەو ساڵەش بە هۆی وشکەساڵییەوە هەموو لەنێوچووبوو مەترسیی قاتیوقڕی ترسی خستبووە دڵی گوندنشینەکانەوە چونکە هیچ پاشەکەوتێکیان بۆ نەمابۆوە. پارێزگاش بۆ بەرگری لەو مەترسییە هیچ کارێکی نەدەکرد و حکوومەتی ناوەندیش تەنانەت ئاگاشی لەو بەڵایە نەبوو کە هەڕەشەی لە خەڵکی ئەو ناوچەیە دەکرد. تۆلستۆی خۆی بۆ لێکۆڵینەوە لەو بارەوە قۆڵی هەڵماڵی و بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەو ناوچەیەدا بە بەرینایی هەشتا کیلیۆمەتر کەوتە گەڕان و نامەیەکی سەرئاوەڵای پڕشۆر و هەژێنەری بۆ ڕۆژنامەی **زانیاری مۆسکۆ** نووسی و بە وردی باسی بارودۆخەکەی کرد و ئەو نامەیە دەنگ و هەرایەکی زۆری لێکەوتەوە و خەڵکی هاندا و لە ئاکامدا دەوڵەت ناچاربوو بە خێرایی دەستبەکاربێت و بە هۆی هەوڵەکانی ئەویشەوە نزیکەی دوو ملوێن ڕۆبڵ یارمەتیی ماڵی لەلایەن خەڵکەوە کۆکرایەوە و هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی خەڵکی ئەو مەڵبەندە بتوانن ئەو ساڵە سەختە تێپەڕ کەن و داهاتی زۆری دوو ساڵی دوایی دەرفەتی ئەوەی پێدان دیسان هەستنەوە.

سرگی ئیڤانڤیچ لەگەڵ ئەو وردەکارییانەی لەو بوارەدا بە قسە و بە نووسین لە گۆڕێدا بوون بەدڵی نەبوو، دەیدی کە مەسەلەی پانئیسلاویسم وەکوو مەسەلەیەکی سەرگەرمی و رابواردنی لێهاتووە کە لە هەموو سەردەمێکدا مۆدەی رۆژن و دەبنە جێگری یەکتری و هۆی سەرقاڵیی کۆمەڵگان و هەروەها دەیدی کە گەلێك لایەنی دەغەزدار ئەم بابەتەیان کردۆتە کەرەسەی ناودەرکردن بۆ خۆیان. ددانیشی پێدانا کە رۆژنامەکان زۆر بابەتی پڕ شاتووشووت و ناپێویست چاپ دەکەن و مەبەستیان تەنیا ئەوەیە سەرنجی خوێنەران بۆ رۆژنامەکەیان راکێشن و هەروەها بە سازکردنی هەڵڵا و بگر و ئاژاوەنانەوە دەنگی خەنیمەکانیان کپ بکەن. دەیدی کە دژداماوان و دەمکوت کراوان و سپاسالارانی بێسپا و وەزیرانی بێوەزارەتخانە و رۆژنامەنووسانی بێرۆژنامە و رێبەرانی بێلایەنگر هەموویان سوودیان لەو کەفوکوڵە گشتیگیرەی کۆمەڵگا وەرگرتووە و کەوتوونەتە پێشەوە و لە هەمووان بەرزتر هاوار دەکەن. دەیدی کە زۆربەی ئەو قسانەی کە دەکرێن قۆڕ و گەوجانەن، بەڵام ئەو شۆر و کەفوکوڵەی بەردەوام پەرە دەستێنێ و هەروەها هەموو چینەکانی کۆمەڵگای پێکەوە گرێدابوو و یەکێتی لەنێوانیاندا سازکردبوو دەیدی و پەسندی دەکرد و نەیدەتوانی لەگەڵی هاودڵ نەبێ. قەڵاچۆکردنی هاوئایینان و برایانی ئیسلاو هەستی هاودەردیی لە دڵەکاندا دەرهەق بە قوربانییەکان و هەروەها دژایەتی و بێزاری دەرهەق بە زۆردار و مرۆڤکوژان وەئاگا هێنابوو. لەخۆ بوردوویی و گیانفیداییی سیربەکان و مۆنتەنگرییەکان کە لە رێگای ئامانجێکی مەزندا خەباتیان دەکرد هەموو رووسەکانی وا دەنە دەدا کە نەك بە قسە بەڵکوو بە کردەوە بچن بۆ یارمەتیی برایانی خۆیان.

بەڵام دیاردەیەکی تریش هەبوو کە دڵی سرگی ئیڤانڤیچی شاد دەکرد ئەویش بیروڕای گشتی بوو. کۆمەڵگا بیروڕای خۆیان بە ئاشکرا دەردەبڕی. خۆی گوتەنی رۆحی گەل وەزمان دەهات و هەرچی لەو بەستێنەدا زیاتر ورد دەبۆوە روونتر بۆی دەردەکەوت کە ئەم مەسەلەیە شیاوی ئەوەیە کە چەندە رەهەندی بەربڵاو هەڵبژێرێ و چارەنووسساز بێ.

تەواوی توانای خۆی بۆ خزمەتکردن لەو بوارەدا خستە گەڕ و خەمی کتێبەکەی لەبیرچۆوە.

تەواوی کاتی خۆی لەسەر ئەو کارە دانابوو. بەجۆرێك کە دەرفەتی نەبوو وەڵامی هەموو ئەو نامە و داواکارییانە بداتەوە کە بە دەستی دەگەیشتن.

سێمانگەی بەهار و نیوەی هاوین سەرقاڵی کار بوو و تازە مانگی ژوئیە کەوتە بیری ئەوەی کە بچێ بۆ گوند و سەردانی براکەی.

چوو بۆ سەردانی براکەی لە گوند کە لەلایەکەوە دووحەوتوو پشوو بدات و لەلایەکی تریشەوە لەنێو لادێییەکاندا کە ئەو ئەوانی بە پاکترین خەڵك دادەنا، بە دیتنی ئەو شۆرەی کە رۆحی گەلی

بەرز رادەگرت و ئەو و هەموو دانیشتوانی پێتەخت و شارەکان ئیمانیان پێیهەبوو، شادی لە دڵی بگەڕێ. کاتاڤاسۆڤیش کە ماوەیەك بوو بڕیاری دابوو ئەو وادە و بەڵێنە بەرێتەسەر کە بە لەڤینی دابوو و بچێ بۆ گوند و سەری لێهەڵێنێ، لەگەڵ سرگی ئیڤانڤیچ کازنیشۆڤ وەڕێکەوت.

## دوو

سرگی ئیڤانڤیچ و کاتاڤاسۆڤ گەیشتنە وێستگەی هێڵاسنی کۆرسك کە ئەو رۆژە لە هەموو کاتێك قەرەباڵغتر بوو و لە فایتوون دابەزین و کە ئاوڕیان بۆ لای ئەو نۆکەرە دایەوە کە بە عارەبانەیەك لە دوای خۆیانەوە بارەکانیانی دەهێنا چاویان بە گورووپێکی لاوانی گیانفیدا کەوت کە بە سواری چوار هێلینگە گەیشتە وێستگە و ژنان بە چەپکەگوڵەوە پێشوازییان لێکردن و لەگەڵ ئاپۆرەی ئەو خەڵکەی هاتبوون بۆ بەرێکردنیان و بەرەولای هێلینگەکانیان خێزەریان بەستبوو گەیشتنە بەرسەکۆی وێستگەکە[92].

یەکێك لەو ژنانەی کە هاتبوون بەرەوپیری ئەو لاوانە لە تەلاری چاوەڕوانیی وێستگە چووەدەرێ و رووی لە سرگی ئیڤانڤیچ کرد و بە زمانی فەرەنسی لێیپرسیی:

ـ ئێوەش هاتوون بۆ بەرێکردنیان؟

سرگی ئیڤانڤیچ بە بزەیەکی زۆر کەمڕەنگەوە وەڵامیدایەوە: نا، پرێنسس، من خۆم مسافیرم. بۆ پشوودان دەچم بۆ لای براکەم. ئێوە هەمیشە دێن بۆ بەرێکردنیان؟

پرێنسس وەڵامیدایەوە: بەڵێ، چارەم نییە؟ راستە دەڵێن هەتا ئەمڕۆ هەشتسەد کەس چوونە ریزی شۆڕشگێڕانی یەکگرتووەوە؟ مالڤینسکی باوەڕ ناکات.

---

٩٢- ئاماژەیە بە رووداوی ساڵی ١٨٧٦ کە سێربەکان و مونتەنگرییەکان و گەلی هێرزەگۆڤین بە دژی حوکوومەتی تورکانی عوسمانی راپەڕین. گەلێك لە لاوانی رووسی لەسەر داخوازیی خۆیان بۆ یارمەتیدان و خەباتکردن چوونە ریزی شۆڕشگێڕانی بەرەی یەکگرتووەوە لە ئاکامدا لە ئاڤریلی ساڵی ١٨٧٧دا رووسیا بە دژی ئیمپڕاتۆری عوسمانی شەڕی راگەیاند تاکوو پارێزگای مەسیحینشینەکان لە چنگ دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆری عوسمانی رزگار بکەن و سەربەخۆییان بۆ دابین بکەن.

سرگی ئیڤانڤیچ گوتی: زیاتر لە هەشتسەد کەس. ئەگەر ئەو کەسانەش حیساب بکەین کە لە شارەکانی دیکەوە چوون هەزار کەسیش زیاتر دەبن.

ژنە بە خۆشحاڵییەوە سەلماندی: دیتووتە، منیش هەر ئەوەم گوت. راستە دەڵێن یارمەتییەکان گەیشتۆتە یەك ملوێن رۆبڵ؟

ـ لە یەکملۆێن رۆبڵێش تێپەڕیوە، پرێنسس!

ـ راپۆرتە تیلگەڕافییەکەی ئەمڕۆت لە رۆژنامەدا خوێندەوە؟ وادیارە دیسان هەڵبڕ دابڕیان بە تورکەکان خستووە.

سرگی ئیڤانڤیچ وەڵامیدایەوە: بەڵێ خوێندمەوە.

باس لە دوایین راپۆڕتێك بوو کە بەپێی ئەو لە ماوەی سێ رۆژی رابردوودا تورکەکان لە هەموولایەکەوە تێکشکا بوون و لە هەڵاتن بوون، چاوەڕوانیش دەکرا کە شەڕی رۆژی دوایی کاری ئەو جەنگە یەکلایی بکاتەوە.

ـ هەر بەڕاست دەزانی، لاوێکی زۆر هێژا و لێهاتوو لە ریزی ئەو گیانفیدایانەدایە، بەڵام نازانم بۆچی تەگەرەی تێدەخەن. من دەیناسم. دەمویست تکا لە ئێوە بکەم کە نامەیەك بنووسن و تکای بۆ بکەن. کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا ناساندوویەتی.

سرگی ئیڤانڤیچ دوای ئەوەی ئەو وردەکارییانەی سەبارەت بە لاوە داوخوازەکە دەیزانی لە پرێنسسی پرسی، چوو بۆ تەلاری دەرەجە یەك و نامەیەکی بۆ ئەو کەسە نووسی کە کۆسپی دەخستە سەر رێگای ئەو لاوە داوخوازە و دای بە پرێنسس.

کاتێك کە سرگی ئیڤانڤیچ دیسان پرێنسسی دیتەوە و نامەکەی دایەدەستی پرێنسس بە بزەیەکی سەرکەوتووانە و مانادارەوە گوتی: کۆنت ڤرۆنسکیی بەناوبانگیش... هەر بەم شەمەندەفەرە دەڕوا.

ـ بیستبووم کە ئەویش دەڕوا، بەڵام نەمدەزانی کەنگێ. کەوایە هەر بەم شەمەندەفەرە دەڕوات؟

ـ من چاوم پێیکەوت. لێرەیە. تەنیا دایکی هاتووە بۆ بەڕێکردنی. چاکە، هەرچییەك بێ ئەمە باشترین کارە کە ئەو دەتوانێ بیکات.

ـ بەڵێ، وایە!

لەگەڵ ئەوەی ئەوان خەریکی ئاخافتن بوون خەڵکەکە بە پەنایاندا تیپەڕین و بەرەو مێزێك ورووژمیان هێنا کە لە تەلاری چاوەڕوانی خواردنیان لەسەر چنیبوو. ئەوانیش بەرەو ئەولایە

هەنگاویاننا و گوێیان لە دەنگی بەرزی پیاوێك بوو کە پەرداخێکی شەڕاب بە دەستەوە بوو و مژۆلیایشی بۆ لاوە داوخوازەکان دەکرد: «گیانفیدایی لە رێگای ئیماندا، لە رێگای مرۆڤایەتی و بۆ سەرکەوتنی براکانمان.» بەردەوام زیاتر دەنگی هەڵدێنا تاکوو بە لەبزێکی گریاناوی و بەو وتەیە قسەکانی خۆی کۆتایی پێهێنا: «... دایکی پیرۆزی ئێمە مۆسکۆ لەمرێگایەدا تەبەڕوك دەدات و دۆعای بەخێرتان بۆ دەکات. دروود!»

گوڕە و هاواری هورڕڕا لە هەموو لایەکەوە بەرزبۆوە. کۆمەڵێکی تر بەرەو تەلارەکە ورووژمیان هێنا و هێندەی نەمابوو پرێنسس بدەن بەعەرزدا.

ستیپان ئارکادیچ کە لە ناکاو لەنێو خەڵکەکەدا وەدیار کەوتبوو بە روخسارێکی گەشاوە و بزەتێزاوەوە گوتی: ئاخ، پرێنسس پێتچۆن بوو؟ زۆر چاکی قسەکرد، سۆز و شۆری قسەکانی دڵی گەرم دادەهێنا، وانییە؟ ئێئێ! خۆ سرگی ئیڤانڤیچیش لێرەیە! دەی بۆ ئێوەش هێندێکتان قسەنەکرد. ورەت وەبەر بنایەن ـ بە بزەیەکی پڕ لە رێز و خۆشەویستی و پارێزەوە دەستی ئەوی گرت و بە نەرمی و لەسەرەخۆ بۆ پێشەوە پاڵی پێوەنا و گوتیشی: ئێوە لەو کارەدا مامۆستان.

ـ نا، من ئیتر دەبێ بڕۆم.

ـ بۆ کوێ؟

ـ دەچم بۆ دێ، بۆ لای لەڤینی برام.

ـ ئەها، کەوایە چاوت بە ژنەکەی منیش دەکەوێ، من بۆم نووسیوە بەڵام ئێوە بەرلە گەیشتنی نامەکە دەیبینن. تکایە پێیبڵێ دیدارەکان زۆر باش بوو و **کارەکە جێبەجێبووە.** خۆی تێدەگات. ئەگەرچی، تکات لێدەکەم پێیبڵێ من بۆ ئەندامی کومیسۆنی فلان دەستنیشانکراوم. خۆی تێدەگات ـ وەك ئەوەی بۆ داوای لێبوردنبێ رووی لە پرێنسس کرد و بە زمانی فەرەنسی گوتیشی: دەزانی، **وردە دەردەسەرییەکانی ژیانە** ئیتر ـ دیسان رووی دەمی لە سرگی ئیڤانڤیچ درێژەی پێدا: نازانم بۆم باسکردی یان نا، میاخکایا، هەڵبەت لیزا، نا بیبیچ[٩٣] ئاخری بڕیاریدا هەزار قەبدە چەك و دوازدە پەرستار بنێرێ.

سرگی ئیڤانڤیچ بە ساردی وەڵامیدایەوە: بەڵێ، بیستوومە.

---

93- Bibiche

ستیپان ئارکادیچ گوتی: بریا نەرۆیشتبایەن. سبەینێ میواندارییەك بۆ ریزگرتن لە دوو کەس لەو دۆستانەی کە وەڕێدەکەون ساز دەکەین. یەکیانی دیمربارتیانسکی[94] لە پترزبۆرگ و ئەوی دیکەشیان ڤسلۆڤکیی[95] خۆمان، گریشا. هەردووکیان دەچن بۆ بەرەی شەڕ. ڤسلۆڤسکی تازە ژنی هێناوە. زۆری غیرەت و لەخۆبردوویی دەوێ ـ پاشان رووی لە پرێنسس کرد و درێژەی پێدا: وا نییە، پرێنسس؟

پرێنسس وەڵامی پێ نەدایەوە و چاوی لە کازنیشۆڤ کرد. سرگی ئیڤانڤیچ و پرێنسس دەتگوت دەیانهەوێ هەرچی زووتر لە چنگ ئەو گیروبەندەی حوزووری ئەو رزگار بن، بەڵام ئەوە بە هیچ شێوەیەك نارەحەتی نەدەکرد. جارجار بە بزەیەکەوە چاوی لە پەڕی کڵاوەکەی پرێنسس دەکرد و هێندێ جاریش دڕدۆنگانە چاوی لە دەور و پشت دەکرد، دەتگوت دەیهەوێ خاڵێکی فەرامۆشکراوی وەبیر بێتەوە. کە چاوی بە ژنێك کەوت قاپێکی بە دەستەوە گرتبوو و دەگەڕا و یارمەتیی کۆدەکردەوە، بانگی کرد بۆ لای خۆی و ئەسکەناسێکی پێنج رۆبڵیی خستە نێو قاپەکەیەوە.

گوتی: ناتوانم کاتێك پارەم لە گیرفاندایە و ئەم قاپانە دەبینم شتێکیان تێنەخەم. راپۆرتە تێلگەڕافییەکەی ئەمڕۆتان لە رۆژنامەکاندا خوێندەوە؟ ئەو مۆنتەنگرییانە بۆ بوێری و ئازایەتی وێنەیان نییە!

کاتێك پرێنسس پێی گوت کە ڤرۆنسکیش مسافیری ئەو شەمەندەفەرەیە، سەری سووڕ ما و گوتی: ئەوە دەڵێی چی! ـ بۆ ساتێك شوێنەواری خەم لە سەر روخساری وەدیار کەوت بەڵام دوای خولەکێك کە بە ئاکارێکی خۆڕاگرانەوە، سووك و توندوتۆڵ وەك ئەوەی بە سەر فەنەردا هەنگاو بنێ، ریشی سەر لاجانگی راستەوپاستە کرد و رۆیشت بۆ ئەو تەلارەی کە ڤرۆنسکی لەوێ بوو، گریان و شیوەنی خۆی لە سەر تەرمی خوشکی بە تەواوی لەبیرچووبۆوە ولەگەڵ ڤرۆنسکی جۆرێك بەرەوڕوو بوو وەك ئەوەی لەگەڵ ئەفسەرێکی بوێر و دۆستێکی قەدیمی بەرەوڕوو بووبێ.

هەرلەگەڵ ستیپان ئارکادیچ لێیان دوورکەوتەوە، پرێنسس بە سرگی ئیڤانڤیچی گوت: لەگەڵ هەموو عەیبەکانی ناکرێ نکوولّی لە هەق بکەی، رووسێکی ئێسلاودۆستی بە تەواومانایە. تەنیا دەترسم چاوپێکەوتنی لەگەڵ ڤرۆنسکی ناخۆش و دڵئازار بێت. ئێوە هەرچیتان پێخۆشە بیڵێن، بەڵام چارەنووسی ئەو لاوە زۆری شوێن لە سەر داناوم. لە رێگا هەوڵ بدەن قسەی لەگەڵدا بکەن.

ـ بەڵێ، زۆر چاکە، ئەگەر هەلێکمان بۆ هەڵکەوت.

ـ من هیچ کات حەزم بە چارەی نەکردووە. بەڵام بەو کارەی زۆربەی تاوانەکانی خۆی دەشواتەوە. نەك تەنیا خۆی دەڕوا بۆ بەرەی شەڕ، بەڵکوو خەرجی گورووپێکی سوارەنیزامیشی لە گیرفانی خۆی دەدا.

---

94- Dimer Bartyanski

95- Vecelovski

ـ بەڵێ بیستوومە!

زرەی زەنگەکە هەستا و هەموو بەرەو لای دەرگاکە وورووژمیان هێنا.

پرێنسس ئاماژەی بە ڤرۆنسکی کرد و گوتی: چاوی لێبکەن، هاتەدەرێ ـ باڵتەیەکی درێژی لەبەردا و کڵاوێکی هەراوی لێوارەڕەشی لە سەردا و قۆڵی دایکی گرتبوو. ئابلۆنسکی شان بە شانیان دەهات و زۆر بە تینوتاو قسەی دەکرد.

ڤرۆنسکی نێوچاوانی گرژ کردبوو و چاوی لە پێش خۆی بڕیبوو. دەتگوت قسەکانی ئابلۆنسکی نابیستێ.

وێدەچوو بە ئاماژەی ئابلۆنسکی بێ بۆیە سەری بۆ ئەو لایە سووڕاند کە پرێنسس و سرگی ئیڤانڤیچ لێی راوەستابوون و بێ ئەوەی قسە بکات کڵاوەکەی لە سەری داگرت. دەموچاوە خەمبار و تێکچرژاوەکەی دەتگوت لە داروبەردە.

ڤرۆنسکی لە سەر سەکۆی وێستگە هەتا پەنای قەتارەکە رۆیشت و دایکی بردە پێشێ و خۆی کرد بە یەکێك لە کووپەکاندا و بزر بوو.

لە سەر سەکۆکە هاواری دروشمێك بەرزبۆوە: «خودایە پشتیوانی ئیمپراتۆر بە!» لە وەڵامیشدا دەنگی هوڕڕا و بژی تەواوی وێستگەی داگرت. یەکێك لە گیانفیداکان کە لاوێکی کەڵەگەت و کەمتەمەن بوو و لەڕ و لاواز و سینگی تێکقوپابوو، بە شێوەیەکی زۆر بەرچاو دروشمی دەدا و کڵاوە لبادەکەی خۆی لەگەڵ چەپکە گوڵێك هەڵێنابوو و رایدەوەشاند، دوو ئەفسەر و پیاوێکی بەساڵاچووی ریشپانیش کە کڵاوێکی چڵکن و چەوری لە سەر نابوو لە پشت سەری ئەوەوە ملیان هەڵێنابوو، ئەوانیش دروشمیان دەدا.

## سێ

سرگی ئیڤانڤیچ خوداحافیزیی لە پرێنسس کرد و لەگەڵ کاتاڤاسۆڤ کە هاتبوو بۆ لای چوونە نێو ڤاگۆنی پڕ لە مسافیرەوە و شەمەندەفەرەکە وەڕێکەوت.

لە وێستگەی تساریتسینۆ تاقمێك لاو کە یەکدەنگ سروودی نەتەوەیی سلاڤسیایان[٩٦] دەخوێندەوە پێشوازییان لە قەتارەکە کرد. لێرەش گیانفیداکان سەریان لە پەنجێرەکان هێنابووە

96- slavsia

دەریّ و دروشمیان دەدا، بەلاّم سرگی ئیڤانڤیچ هیچ سەرنجێکی پیّ نەدان. لەگەلّ ئەو داوخوازانە زۆری هەلّسوکەوت کردبوو و لەگەلّ تایبەتمەندییە گشتییەکانیان بوو و ئیتر هیچ شتێکی سەرنجڕاکێشی پێوە نەدەدین بەلاّم کاتاڤاسۆڤ کە بە هۆی کاروباری زانستیی خۆیەوە دەرفەتی نەبووبوو تاکوو سەرنجی هەلّسوکەوتی ئەوان بدات، زۆر هۆگری تایبەتمەندییەکانی ئەوان بوو و سەبارەت بەو لاوانە پرسیاری لە سرگی ئیڤانڤیچ دەکرد.

سرگی ئیڤانڤیچ داوای لیّ کرد بچێتە ڤاگۆنی دەرەجە دوو و خۆی قسەیان لەگەلّ بکات. کاتاڤاسۆڤ لە وێستگەی دوایی ئەم پێشنیارەی ئەوی بە کار هێنا.

ئەو لە یەکەم وێستگە دابەزی و سواری ڤاگۆنی دەرەجە دوو بوو و لەگەلّ داوخوازە گیانفیداکان ئاشنابوو. ئەوان دوور لە مسافیرەکانی تر لە سووچێکی ڤاگۆنەکە دانیشتبوون و بە دەنگی بەرز قسەیان دەکرد و دیاربوو دەیانزانی سەرنجی کاتاڤاسۆڤ و مسافیرەکانیان راکێشاوە. لاوێکی کەلّەگەتی کز و لاواز کە سینگی تێکقوپابوو لە هەمووان زیاتر دەنگی هەلّێنابوو. دیاربوو سەرخۆشە و باسی رووداوێکی دەگێڕایەوە کە لە قوتابخانە قەومابوو. ئەفسەرێکی بەسالاّچوو بەرەوڕووی دانیشتبوو کە یۆنیفۆڕمێکی نەمسایی لەبەردا بوو. بە پێکەنینەوە گوێی بۆ قسەی لاوەکە راگرتبوو و هەولّی دەدا بێدەنگی بکات. ئەفسەرێکی دیکەش کە یۆنیفۆڕمێکی تۆپخانەی لەبەردابوو لە پالّ ئەواندا لە سەر جانتایەك دانیشتبوو. ئەفسەرێکی تریش لە تەنیشت ئەوان خەوتبوو.

کاتاڤاسۆڤ سەری قسەی لەگەلّ لاوەکە کردەوە و زانیی کە کوڕە بازرگانێکی مۆسکۆییە و هەر لەو تەمەنی بیستودوو سالّییەوە تەواوی مالّوسامانە زۆر و زەوەندەکەی خوی لە دەست داوە. بەلاّم ئاکاری کچانە و نازداری و دەستوپیّ سپیلکەییەکەی زۆر بە لای کاتاڤاسۆڤەوە ناخۆش و دزێو بوو. دیاربوو ئەو لاوە، بەتایبەت لە کاتی سەرخۆشیدا، دلّنیا بوو کە هەنگاوێکی بوێرانەی هەلّگرتووە و بە ناحەزترین شێوە خەریکی شاتوشووتە.

ئەوی دیکەشیان کە ئەفسەرێکی خانەنشینکراو بوو شوێنێکی ناخۆشی لە سەر دلّی کاتاڤاسۆڤ دانا. دیاربوو لە ماوەی تەمەنی خۆیدا هەموو کارێکی تاقی کردۆتەوە و سەری بە هەموو کەلوقوژبنێکدا کردووە. لە وێستگەی هێلاّسنیش کاری دەکرد و گزیری خاوەنملّکێکیش بوو و هەروەها بووبووە کارگێڕی کارگایەکیش و باسی هەموو مەبەستێکی دەکرد و بیّ ئەوەی پێویست بیّ لە خۆڕا زاراوەی زانستیی بەکار دەهێنا.

بەلاّم سێهەمی، کە ئەفسەری تۆپخانە بوو، زۆر کەوتە بەردلّی کاتاڤاسۆڤ. مرۆڤێکی لەسەرەخۆ و خاکەڕا بوو و بە ئاشکرا رێزی بۆ ئەفسەرە خانەنشینکراوەکە و گیانفیدایی

قارەمانانەی لاوە بازاڕییەکە دادەنا و باسی خۆی نەدەکرد. لە وەڵامی کاتاڤاسۆڤدا کە لێیپرسیبوو چ شتێك هانی دای بچی بۆ بەرەی شەڕی سێربستان خاکەڕایانە گوتی:

ـ ئەی چ بکەم؟ هەمووان دەچن. جگە لەوەش دەبێ یارمەتیی سێربەکان بدەین ئیتر.

کاتاڤاسۆڤ گوتی: بەڵێ، ئەوان بەتایبەت پێویستیان بە ئێوەی تۆپچی هەیە.

ـ بەڵام من ماوەیەکی زۆر لە پەلی تۆپخانەدا خزمەتم نەکردووە. ڕەنگە من بنێرن بۆ پەلی پیادە یان سوارەنیزام.

کاتاڤاسۆڤ کە بەپێی تەمەنی ئەفسەری تۆپچی وەك ئەفسەرێکی باڵا چاوی لێدەکرد، گوتی: پیادەی چی. ئەوان زیاتر لە هەموو شتێك پێویستیان بە تۆپچییە.

ئەفسەرەکە گوتی: پێشینەی خزمەتی من لە تۆپخانە زۆر نییە. من یۆنکێری خانەنشینم ـ روونیشی کردەوە کە بۆچی لە تاقیکاریی تۆپخانەدا دەرنەچووە.

ئەوانە هەمووی شوێنێکی باشی لەسەر کاتاڤاسۆڤ دانەنا و کاتێك لاوە گیانفیداکان لە وێستگەی دوایی دابەزین تاکوو پێکێك هەڵدەن ئەو دەیویست راستبوونی بیروڕای خۆی کە زۆریش بەجێ نەبوو بە پیوانەی بیروڕای سێهەمکەس هەڵسەنگێنێ. چاوی بە مسافیرێکی بەساڵاچوو کەوت کە باڵتەیەکی سەبازیی لەبەردا بوو و بەردەوام گوێی بۆ ئاخافتنی ئەو لەگەڵ داوخوازەکان راگرتبوو. کاتاڤاسۆڤ کاتێك لەگەڵ ئەو تەنیا کەوت، چونکە دەیویست بیروڕای خۆی دەربڕێ و هەروەها ئەویش بۆ دەربڕینی بیروڕای خۆی هان بدات، رووی لە کابرا کرد و بە لەبزێکی تەمومژاوی گوتی: ئەو داوخوازانەی دەچن بۆ بەرەی شەڕ یەکهەڤییەکیان پێکەوە نییە.

پیرەپیاو کە نیزامی بوو و لە دوو شەڕدا بەشداریی کردبوو و لەگەڵ ئاکار و خولقوخووی نیزامییەکان ئاشنابوو، هەربە شکڵ و شێوە و چۆنێتیی قسەکردنیان و رواڵەتسازی و خۆڕانانی رووهەڵماڵدراوانەیان و ئارەقخواردنەوەیاندا، زۆر دێزەی هاتنە بەرچاو و بە سەربازی خراپی دەزانین. جگە لەوەش، دانیشتووی شارێکی چکۆڵە بوو و دەیویست کوڵی دڵی بۆ کاتاڤاسۆڤ هەڵڕێژێ و بڵێ کە لە شارەکەی ئەوان تەنیا کەسێك داوخواز بووە و لەرێوە قەبووڵیان کردووە و ئەویش دزێکی هەمیشە مەست بووە کە هیچ کەس کاری پێنەدەسپارد و لە هیچ کوێ رایاننەدەگرت. بەڵام بە ئەزموون دەیزانی کە دژایەتی کردن لەگەڵ بیروڕای خەڵك و بەتایبەت زەمکردنی ئەو داوخوازە گیانفیدایانە لەوکاتە هەستیارەدا کارێکی مەترسیدارە و بەو هۆیە ئەویش چاوی لە کاتاڤاسۆڤ بڕی و هیچی نەگوت.

ـ وایە ئیتر، لە بەرەی شەڕ پیاویان پێویستە و دەڵێن ئەفسەرانی سێرب شارەزای کاروباری سەربازی نین و توانای هیچ کارێکیان نییە.

کاتاڤاسۆڤ بە بزەیەکەوە گوتی: ئەها، بەڵێ، ئەم داوخوازانەی ئێمە زۆر کەسانێکی بوێر و چاونەترسن ـ پاشان هاتنە سەر باسی دوایین هەواڵەکانی بەرەی شەڕ. هەواڵەکان نیشاندەری ئەوەبوون کە توورکەکان لە هەموولایەکەوە تەفروتوونا بوون و هەردووکیان سەرسووڕمانی خۆیان لەوەی کە «ئەو خەنیمەی شەڕی رۆژی داهاتوو کە دەڵێن مەترسیدارە دەبێ کێبێ» لە یەکتری دەشاردەوە. بەو شێوەیە بێ ئەوەی بیروڕای خۆیان بە یەکتری بڵێن لە یەکتر هەڵبڕان.

کاتاڤاسۆڤ گەڕایەوە بۆ ڤاگۆنەکەی خۆی و لەگەڵ ئەوەی نەخوازراوانە بڕوای خۆی دەشاردەوە و ئاکامی سەرنج و بۆچوونەکانی خۆی بۆ سرگی ئیڤانڤیچ دەربڕی و دەسکەوتی وتەکانیشی ئەمەبوو کە ئەو داوخوازانە هەموویان بەجەرگ و لێهاتوون.

لە وێستگەی هێلاسنی شارێکی گەورە دیسان خەڵك بە خوێندنەوەی سرود و هاتو هاوار و درووود پێشوازییان لە سەربازانی داوخواز کرد و دیسان ژنان و پیاوانی قاپ بەدەست کەوتبوونە گەڕان و یارمەتی کۆکردنەوە و ژنانی خانەدان چەپکە گوڵیان هێنابوو و مێزی خواردنیان رازاندبۆوە. بەڵام ئەمانە هیچ کامیان وەکوو مۆسکۆ پڕشکۆ نەبوون.

# چوار

شەمەندەفەرەکە لە وێستگەی ناوەندی یەکێك لە پارێزگاکان راوەستا، سرگی ئیڤانڤیچ نەچووە چاپخانەکە و لەسەر سەکۆکە دەستیکرد بە پیاسەکردن.

یەکەم جار کە بەبەر ئەو ڤاگۆنەدا رۆیشت کە ڤرۆنسکی لەوێدا بوو بۆی دەرکەوت کە پەردەی پەنجەرەی قەمارەکەی ئەو دادراوەتەوە. بەڵام جاری دووهەم کە بەوێدا گەڕایەوە دیتی کۆنتسی پیر لەبەر پەنجێرەکەیە. کۆنتس، کازنیشۆڤی بانگکرد بۆ لای خۆی.

گوتی: ئەو هەتا کۆرسك بەڕێدەکەم.

سرگی ئیڤانڤیچ لەبەر پەنجێرەکە راوەستا و چاوێکی لەنێو ڤاگۆنەکە کرد و گوتی: بەڵێ گوێم لێبوو ـ کە بۆیدەرکەوت ڤرۆنسکی لەنێو قەمارەکەدا نییە گوتیشی: بڕیارەکەی جێگای رێزە.

ـ بەڵێ، دوای ئەو بەڵایەی کە بەسەری هات جگە لەوە دەتوانێ چ بکات؟

سرگی ئیڤانڤیچ گوتی: بەڵێ، بەڕاستی کارەسات بوو!

کۆنتس گوتی: ئاخ، نازانی چمکێشاوە! بۆ نایەیتە سەریٚ؟ فەرموو تاوێك لێرەـ کاتێك سرگی ئیڤانڤیچ چووە نێو کووپەکەوە و لەسەر قەنەفەی تەنیشت ئەو دانیشت کۆنتس دووپاتی کردەوە: نازانی چمکێشاوە! ناتوانی بیهێنیتە بەرچاوت. شەش حەوتووی تەواو قسەی لەگەڵ هیچ کەس نەکرد و تەنیا بە تکا و پاڕانەوەی من پارووپەك نانی دەخوارد. نەمدەوێرا ساتێك بە تەنیا بەجێی بهێڵم. ئەوەی شکی بۆ دەچوو کە بتوانیٚ بەلایەکی پیٚ بە سەری خۆی بێنیٚ، لێمان دوور خستبۆوە. ئێمە لە نهۆمی خواریٚ بووین بەلام هیچ شتێك پێشبینی نەدەکرا. ئێوە خۆتان دەزانن کە ئەو جارێك هەر لەبەر ئەو ژنە ویستبووی خۆی بکووژیٚ و گوللەیەکیشی لە خۆیدا ـ پیرێژن بەوەبیرهێنانەوەی ئەو رووداوە گرژ بوو ـ بەڵیٚ، ئەو جۆرە ژنانە هەر دەبیٚ ئاوا بەو دەردە بچن، تەنانەت مەرگی خۆشی بە شێوەیەکی سووك و رەزیلانە هەڵبژارد.

سرگی ئیڤانڤیچ هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: ئێمە نابیٚ داوەری لەسەر مەرگی هیچ کەس بکەین. بەلام من باش تێدەگەم کە باری ئەو رووداوە دەبیٚ بۆ ئێوە زۆر تاڵ و قورس بووبیٚ.

ـ ئاخ، وامەڵیٚ، کاتێك لە ملکەکەی خۆم بووم رۆژێك هات بۆ سەردانم. نامەیەکیان بۆ هێنا و ئەویش وەلامەکەی نووسییەوە و ناردی. نەماندەزانی کە ئەو هەر لەویٚ و لەو وێستگەیە بووە. شەویٚ کە چووم بخەوم خزمەتکاری تایبەتم کە ناوی مێرییە گوتی لە وێستگەی هێلاسن خاتوونێکی خانەدان خۆی داوەتە بەر شەمەندەفەر. دەتگوت بە کوتك کێشاویانە بە سەرمدا. داچڵەکیم. زانیم ئەوە. یەکەم شت کە گوتم ئەوەبوو کە بە ڤرۆنسکی نەڵێن. بەلام ئەو ئاگادارکرابوو. ئەو فایتوونئاژۆیەی کە لەویٚ بووبوو هەموو شتێکی دیبوو. کاتێك بە هەڵەداوان خۆم گەیاندە ژوورەکەی بەجاریٚ شڵەژابوو و رەنگی مردووی لێنیشتبوو. مرۆڤ بە دیتنی دەتۆقی. لە ئەلفەوە نەهاتە بیٚ و بە تاڵووکە خۆی گەیاندە ئەویٚ. من خۆم نازانم لەویٚ چیی دیبوو. هەر ئەوەندە دەزانم ئەویان وەکوو تەرمێك هێنایەوە بۆماڵیٚ. وایلێهاتبوو پیاو نەیدەناسییەوە. دوکتۆری پسپۆڕ گوتی: **تەواو تاساوە.** دواتر خەریکبوو شێت دەبوو.

پاشان کۆنتس دەستی هەڵتەکاند و گوتی: ئاخ، بڵێمچی! تووشی بەدبەختی و رۆژەڕەشی بووم. نا، هەتا لەسەری دانێن ژنێکی خراپ و بێڕەوشت بوو. ئاخەر ئەوە چجۆرە گەللایی و چ دەردێکی بێدەرمانە؟ هەمووی دەیویست شتێك بسەلمێنیٚ. چاکە، فەرموو، بیسەلمێنە. خۆشی لەنێو برد و دوو پیاوی نازەنینیشی تووشی رۆژەڕەشی کرد. یەکیان مێردەکەی خۆی و ئەوی دیکەشیان کوڕە چارەڕەشەکەی من.

سرگی ئیڤانڤیچ پرسیی: ئەی مێردەکەی چییکرد؟

ـ کچەکەی برد بۆ لای خۆی. ئالیووشا سەرەتا هەرچییان دەگوت قەبووڵی دەکرد، بەلام ئێستا کە وەخۆ هاتۆتەوە و دەبینیٚ کچەکەی خۆی داوە بە پیاوێکی بێگانە، خەریکە دیسان شێت دەبێتەوە.

بەڵام ناتوانیٚ لە قسەی خۆی پاشگەز بێتەوە. کارنین بۆ ڕێورەسمی بەخاکسپاردنی ئانا ئامادەبوو، بەڵام هەوڵماندا نەهێڵین لەگەڵ ئالیووشا بەرەوڕوو بیٚ. بۆ ئەو کە مێردی بوو زۆر بە قازانجی تەواوبوو، باری قورسی شەرم و شوورەیی لەسەر شانی لاچوو. بەڵام کوڕە چارەڕەشەکەی من هەموو شتێکی خۆی کردە فیدای ئەو. داهاتووی، من و هەموو شتێکی خۆشی لە ڕێی ئەودا دانا، بەڵام دڵی ڕەشی ئەو ژنە بە تۆزیش ڕەحم و بەزەیی تێدا نەبوو و لەسەر ئەوە پێداگر بوو کە بەجاریٚ لەنێوی بەریٚ. نا، هەرچی بیلێی کەمە، مەرگەکەشی مەرگی ژنێکی بێڕەوشت و بێدین بوو. خودایە لێمببورە، بەڵام کاتێك چاوم بە کوڕە چارەڕەشەکەم دەکەویٚ ناتوانم لەو ژنە بێزار نەبم.

ـ ئێستا حاڵت چۆنە؟

ـ ئەم شەڕەی سێربەکان نێعمەتێك بوو کە خودا بۆی ناردین. من کە پیرم و سەرم لە کێشە و سیاسەت دەرناچیٚ، بەڵام بۆ ئەلکساندرنیۆڤسکی نیعمەتێك بوو کە خودا ناردی. هەڵبەت بۆ من کە دایکم، چوونی کوڕەکەم بۆ شەڕ شتێکی ترسناکە و گرینگتر لە هەمووشی ئەمەیە کە دەڵێن لە کۆڕە باڵاکانی پترزبۆرگ سەبارەت بەو شەڕە **بیروڕایەکی باشیان نییە**. یاشڤینی هاوڕێی، کە دارونەداری خۆی بە قومار دۆڕاندووە، ڕۆیشتووە بۆ سێربستان. هات بۆ سەردانی و ڕازیی کرد. ئێستا ئەمە بۆ ئەو جۆرێك سەرگەرمییە. ئێوەش تکاتان لێدەکەم تۆزێکی لەگەڵ بدوێن. زۆر حەزدەکەم ئەو کارەساتەی لەبیربچێتەوە. زۆر خەم دەخوا. بۆ بەدبەختی ئێستا ددانیشی کیسی کردووە. ئەگەر ئێوە قسەی لەگەڵ بکەن زۆری پێخۆش دەبیٚ. تکات لێدەکەم قسەی لەگەڵ بکە. لەولای شەمەندەفەرەکەوە پیاسە دەکات.

سرگی ئیڤانڤیچ گوتی: بەسەر چاو و ڕۆیشت بۆ ئەوبەری دیکەی شەمەندەفەرەکە.

## پێنج

ڤرۆنسکی، باڵتەی درێژ لەبەردا و کڵاوەکەی هەتا سەربرۆی داکێشابوو، دەستی لە گیرفانی نابوو، لەبەر سێبەری کلاوی ئەو کەسانەی کە لەسەر سەکۆکە داندرابوون، وەکوو جانەوەرێکی کێویی لە قەفەسکراو هەنگاوی دەنا و هەر بیست هەنگاو جارێك بەپەلە وەردەسووڕایەوە. سرگی ئیڤانڤیچ کە لێی نزیکبۆوە پێیوابوو ڤرۆنسکی ئەو دەبینیٚ بەڵام وادەنوێنیٚ کە نەیدیوە. بەڵام ئەو گوێی بەو حاڵەتە نەداو خواستی دەروونیی گرینگتر لەم چەشنە تێبینییە تاکە کەسییانە بوو سەبارەت بە ڤرۆنسکی.

ڤرۆنسکی ئێستا لەبەرچاوی سرگی ئیڤانڤیچ هۆکارێکی بەهێز بوو بۆ گەیشتن بە ئامانجێك و ئەو بە ئەرکی خۆی دەزانی کە دڵخۆشیی ئەو لاوە بداتەوە و هەوڵ بدات بۆ ورە وەبەرنانی.

ڤرۆنسکی راوەستا و چاوێکی لێکرد و کە ناسییەوە چەند هەنگاو هاتە پێشێ بۆ لای و دەستی بە توندی گوشی.

سرگی ئیڤانڤیچ گوتی: رەنگە ئێوە حەز نەکەن چاوتان پێمبکەوێ، بەڵام خزمەتێکم بۆ ئێوە لە دەست دێ؟

ـ ببوورن، من لە هەموو شتێك وەڕەزم، بەڵام چاوپێکەوتنی ئێوەم وەك ئەو شتانەی تر بەلاوە ناخۆش نییە.

سرگی ئیڤانڤیچ چاوی لە چاوی ڤرۆنسکی بڕی و تێگەیشت کە زۆر پەرۆش و دڵتەنگە، گوتی: تێدەگەم. دەمویست پێتان بڵێم کە حازرم بۆ خزمەت. حەزناکەی نامەیەك بۆ ریستیچ[٩٧] یان میلان[٩٨] بنووسین؟

ڤرۆنسکی، وەك ئەوەی زۆر بە سەختی لە مەبەستی سرگی ئیڤانڤیچ تێگەیشتبێ، گوتی: نا، نا. ئەگەر بۆتان فەرقناکات وەرە با پێکەوە پیاسەیەك بکەین. هەوای نێو ڤاگۆنەکە زۆر خەفەیە پیاو خەریکە بخنکێ. گوتت نامە؟ نا، سپاست دەکەم. بۆ مردن هیچ داواکاری و داخوازینامەیەك پێویست نییە ـ بە تەوسەبزەیەکەوە گوتیشی: مەگین داخوازینامەیەك بۆ تورکەکان بنووسی ـ تەنیا دەمی بە پێکەنین کرایەوە و چاوانی هەروا پڕ ئازار و خەمتێزاو بوون.

ـ بەڵێ، بەڵام لەوانەیە دامەزراندنی پێوەندی لەگەڵ کەسێك پێویست بێت و نامەکە لەوانەیە ئەو کەسە لە پێشدا لەگەڵ حاڵوباڵی تۆ ئاشنابکات و دامەزراندنی پێوەندییەکە ئاسانتر بکات. هەڵبەت ئەوە دەگەڕێتەوە سەر ویستی خۆت. کاتێك بیستم ئەو بڕیارەت داوە زۆر خۆشحاڵ بووم. دەزانی ئەو گیانفیدایانە چونکە لە هەموو لایەکەوە کەوتوونە بەر تانە و پلاری دوژوازان، چوونی ئێوە بۆ ئەوان لەنێو بیروڕای گشتیدا وایان لێدەکات هەست بە سەربەرزی بکەن.

ڤرۆنسکی گوتی: هەفیازیی من وەکوو ئەفسەرێکی تەنیا ئەوەیە کە ژیان بەلامەوە هیچ بایەخێکی نییە. ئەوەندەشم توانایی و وزەی جەستەیی هەیە کە هێرش بەرمە سەر ریزی نەیارانی پەلاماردەر و بکوژم یان بکوژرێم. ئەمە شتێکە کە سوورسوور دەیزانم. بەوە خۆشحاڵم کە شتێك هەیە تاکوو ژیانی خۆم کە نەك هیچ بایەخێکی بۆم نییە بەڵکوو لێشی بێزارم لەو رێگایەدا بکەمە

---

٩٧- Jovan Ristich گەورە پیاوی دەوڵەتی سێرب بوو لە کاتی شەڕی سێربستان لەگەڵ عوسمانی وەزیری کاروباری دەرەوە بوو و سیاسەتی باڵی سەر بە ڕووسیای بەڕێوەدەبرد.

٩٨- Mila Obrenovich پاڵێوراوی سەڵتەنەتی سێربستان بوو بەڵام بەو پلەوپایە نەگەیشت.

قوربانی. گیانی من لەوانەیە بۆ کەسێك بەکەڵك بێ ـ کە ئەمەی دەگوت شەویلاکەی جووڵایەوە و نیشاندەری ژان و وەزاڵەهاتن بوو، ژانێك کە بەردەوام ئازاری دەدا و نەیدەهێشت قسەکەی بەو لەبزە دەربڕێ کە خۆی دەیویست.

سرگی ئیڤانڤیچ کە دڵتەنگی بە روخسارییەوە دیاربوو گوتی: بەڵام من لە ئێستاوە ئەو مزگێنییەتان پێدەدەم کە دیسان هەڵدەستیتەوە. رزگارکردنی براکانتان لە ژێر چەپۆکی دوژمن ئامانجێکە کە شایانی گیانفیدایی و ژیانە ـ پاشان دەستی خۆی بردە پێشێ و گوتیشی: هیوادارم خودای مەزن لە بەرەی شەڕ و دنیای دەروونداـ سەرکەوتن و سەربەرزیتان پێبەختا بکات.

ڤرۆنسکی دەستی سرگی ئیڤانڤیچی بە توندی گوشی.

بە لەبزێکی نەرم و لەسەرەخۆ گوتی: بەڵێ، بۆ شەڕ و خەبات هێشتا کەڵکێکم هەیە بەڵام وەکوو مرۆڤ حیسابی بکەی لە کەمیش کەمترم و هیچم بۆ نەماوەتەوە.

دەمی ڤرۆنسکی بە هۆی ژانی تاقەتپڕووکێنی ددانە قایمەکانییەوە پڕ بووبوو لە تف و نەیدەتوانی بە جوانی قسە بکات. بێدەنگ بوو و چاوی لە تایەی ڤاگۆنی ئەمباراو و هەمارە خەڵووز بڕی کە بە نەرمی بە سەر رەیلەکاندا دەڕۆیشتن.

لەناکاو ژان نا، بەڵکوو هەستێکی تەواو لەوە جیاواز، هەستی شڵەژانێك لە ناخەوە، بۆ ساتێك ژانی ددانئێشەکەی لەبیربردەوە. بە دیتنی ڤاگۆن و رەیلەکان و قسەکردن لەگەڵ ناسیاوێك کە لەکاتی رووداوی ئەو کارەساتەوە چاوی پێینەکەوتبوو خەم دایگرت و لەناکاو ئانای وەبیرهاتەوە، یانی نەك وەبیرهاتنەوەی ئانا بەڵکوو وەبیرهاتنەوەی شتێك کە کاتێك وەك شێت و هار خۆی کرد بە نێوی هۆڵی وێستگەدا، لە ئانا مابۆوە. وەبیرهاتنەوەی جەستەی شەلاڵی خوێنی، کە هێشتا بە هۆی ژیانی تاوێك لەمەوبەرییەوە گەرم بوو و بێشەرمانە و لەبەرچاوی ئاشنا و بێگانە لەسەر مێزی هۆڵی وێستگەکە تخێڵ بووبوو. سەری کە بە ساغی مابۆوە و بەو پرچە رەش و پڕەیەوە و ئاڵقەی ناسك و ئەگریجە شێوەی سەر لاجانگی کە بۆ دواوە خوار بووبوونەوە و دەموچاوە جوانەکەی بە دەم و لێوی سوور و نیوە ئاواڵەوە و حاڵەتێکی سەیر و بەزەییبزوێن کە بەسەر چاوی بە مۆلەق وێستاو و لێویکراوە و زراو بەریەوە مابۆوە دەتگوت ئەو قسەیەی دوایین دەمەقاڵێکەیان دووپات دەکاتەوە. «پەشیمان دەبیتەوە!»

هەوڵیدا ئەو بەو دیمەن و بەژن و بالایەوە بهێنێتە بەرچاوی خۆی کە یەکەم جارلە وێستگەی هێلاسن دیتبووی، ئەو دەمە جوان و لەبار و بەشکۆ و سەرتاپا ئامادەی خۆشویستن بوو و چێژی دەبەخشی و چێژی وەردەگرت و وەکوو ئەو دوایین دیمەنەی کە لە زەینیدا بوو دڵڕەق و

جینگنۆکە و تۆڵە ئەستێن نەبوو. دەیویست شیرینترین ساتەکان کە لەگەڵ ئەو رایبواردبوو وەبیری خۆی بهێنێتەوە، بەڵام ئەو ساتانە بۆ هەمیشە ژاراوی و زایە بووبوون. ئەو ئانای تەنیا سەرکەوتوو دەهاتە بەرچاو، چونکە هەڕەشەی پەشیمانیی ئەو کە پێویست نەبوو و کاریگەرییەکەشی نەدەسڕدرایەوە بردبوویە سەر. ئیتر ژانی ددانی هەست پێنەدەکرد و شوێنەواری ئۆناقێك لە گەروویدا رەنگی روخساری شێواندبوو.

دووجار هەتا پاڵ کیسەکانی سەر سەکۆکە رۆیشت و گەڕایەوە و کە وەخۆ هاتەوە رووی لە سرگی ئیڤانڤیچ کرد و لە سەرەخۆ گوتی: ئێوە جگە لە راپۆرتەکەی دوێنێ هەواڵێکی ترتان نەبیستووە؟ دەڵێن، تورکەکان سێ جار تێکشکاون و چاوەڕوان دەکرێ تێکشکانی سبەینێیان یەکجاری بێ و بۆ هەمیشە تەفروتوونان بن.

دوای ئەوەی هێندێکیان قسەکرد سەبارەت بە پاڵێورانی میلان بۆ سەڵتەنەتی سێربستان و ئاکامێکی گرینگ کە دوای لەسەر تەختدانیشتنی ئەو لەوانەیە لێیبکەوێتەوە، بە دەنگی هۆڕنی دووهەم لێك هەڵبڕان و هەرکام چوونەوە بۆ ڤاگۆنەکەی خۆیان.

## شەش

سرگی ئیڤانڤیچ چونکە نەیدەزانی کەنگێ دەتوانێ لە مۆسکۆوە وەڕێ بکەوێ تێلگەرامێکی بۆ براکەی نەنارد کە فایتوونێکی بۆ بنێرێ بۆ وێستگە. کاتێك لەگەڵ کاتاڤاسۆڤ نیوەڕۆ عارەبانەیەکیان لە وێستگە بەکرێ گرت و وەك عەرەبی بیابان سەرتاپا تۆز و خۆڵاوی گەیشتنە پاکرۆڤسکۆیە لەڤین لە ماڵێ نەبوو.

کیتی کە لەگەڵ باوکی و دایکی لەبەر هەیوانەکە دانیشتبوون شووبراکەی لە دوورەوە ناسییەوە و بۆ پێشوازیکردن بە هەڵەداوان رۆیشتە خوارێ. دەستی سرگی ئیڤانڤیچی گوشی و نێوچاوانی هێنایە پێشێ کە ئەو ماچی بکات و گوتی: چۆن رازی بووی بێخەبەر تەشریف بێنی، بەڕاستی عەیبە.

سرگی ئیڤانڤیچ وەڵامیدایەوە: ئێمە زۆر بە ئاسوودەیی هاتین و ئێوەشمان نەخستە زەحمەتەوە. وا سەرتاپام لە خۆڵ و خاك هەڵکشاوە ناوێرم دەستت لێبدەم. هێندە گرفتار بووم نەمدەزانی کەنگێ دەتوانم خۆم لە چنگ تەنگوچەڵەمەکانی مۆسکۆ دەربازبکەم ـ بە

پێکەنینەوە پرسیی: ئێوەش وەك رابردوو بەدوور لە گێژاو و فەرتەنە، لەو تەنکاوە ئارامەی خۆتاندا چێژ لە بەختەوەریی پاقژی خۆتان وەردەگرن؟ ئەمەش هاوڕێی خۆشەویستمان فیۆدۆرڤاسیلیڤچ کە ئاخری کەوتە سەرڕێ.

کاتاڤاسۆڤ پێکەنی و ددانەکانی کە بە هۆی تەپوتۆزاوی بوونی دەموچاویەوە زیاتر لە هەمووکاتێك دەدرەوشانەوە، وەدیاری خستن و بەو لەبزە گاڵتەجارانەی هەمیشەی خۆیەوە گوتی: پێتان وانەبێ قولەڕەشەم. هەر خۆم بگەیەنمە ئاو و دەموچاوم بشۆم دەبمەوە بە کوڕەخاسە.

ـ کۆسیتا زۆری پێخۆش دەبێ. چووە بۆ مەزرا، حەدوسەدی ئەوەیە بێتەوە.

کاتاڤاسۆڤ گوتی: بەردەوام خەریکی کاروباری کشتوکاڵە؟ ئەمە راست ئەو تەنکاوە ئارامەیە... بەڵام لە شار جگە لە شەڕی سێربەکان هیچ هەواڵێك نییە. ئێستا دەبێ بزانین هاوڕێکەمان لەوبارەوە چۆن بیردەکاتەوە؟ حەتمەن لەگەڵ هەمووان جیاوازە!

کیتی هێندێك ناڕەحەت بوو و چاوێکی لە سرگی ئیڤانڤیچ کرد و گوتی: بیروڕایەکی تایبەتی نییە، وەك هەمووان. باشە، کەوایە دەنێرم بە دوایدا. باوکەگیانم لێرەیە، تازە لە سەفەری هەندەران گەڕاوەتەوە.

کەسێکی نارد بە دوای لەڤیندا و هەروەها گوتی کەلوپەلی خۆشۆردنی مسافیرە تەپووتۆزاوییەکان ئامادەبکەن و هی یەکیان لە ژووری لەڤین و هی ئەوی دیکەشیان لە ژوورەکەی دالی دابنێن و هەروەها دەستووری ئامادەکردنی نان و چێشتی نیوەڕۆی بە خزمەتکارەکاندا و بۆ یەکەم جار لە مافی جموجۆڵی خێرا کە لە کاتی دووگیانیدا لێیبێبەش بوو کەڵکی وەرگرت و بە هەڵەداوان رۆیشت بۆ هەیوانەکە.

گوتی: سرگی ئیڤانڤیچ و کاتاڤاسۆڤ هاتوون.

پرێنس گوتی: ئا... بەو گەرمایە کارێکی زۆر دژوارە.

کیتی کە شوێنەواری رشقنجاریی لە سیمای باوکیدا دی بە پێکەنین و لەبزێکی کە دەتگوت تکای شتێك لە باوکی دەکات گوتی: باوەگیان، زۆر پیاوی چاکە، کۆسیتاش زۆری خۆشدەوێ.

ـ باشە خۆ من هیچم نەگوتووە.

کیتی رووی لە خوشکی کرد و گوتی: خۆشەویستەکەم، تۆ بچۆ بۆ لایان و سەرگەرمیان بکە. ئەوان لە وێستگە چاویان بە ستیڤا کەوتووە. حاڵی باشبووە. من دەبێ بڕۆم بۆ لای میتیا. بۆ بەدبەختی لە کاتی چاییەوە شیرم پێنەداوە. ئێستا حەتمەن هەستاوە و دەقیژێنێ. ـ

ئەمەی گوت و چونکە هەستی کرد مەمکی بزووتووە بە هەڵەداوان ڕۆیشت بۆ ژووری منداڵەکەی.

لە ڕاستیدا قسەکەی کیتی تەنیا لە رووی بۆچوون و گومانەوە بوو (پێوەندیی لەگەڵ کۆرپەکەی هێشتا هەڵنەبڕا بوو.) هەر بەو مەمك بزووتنەی خۆیدا دڵنیا بوو کە منداڵەکەی برسییەتی.

هێشتا نەگەیشتبووە ژووری منداڵەکە دەیزانی دەگری و بەڕاستی دەشگریا. گوێی لە دەنگی گریانەکەی بوو توندتر هەنگاوی هەڵێنایەوە. بەڵام هەرچی خێراتر رای دەکرد گریانی کۆرپەکەی توندتر دەبوو. دەنگی نەخۆشی و ناساغی نەبوو، بەڵام نیشاندەری برسییەتی و بێئۆقرەیی بوو.

کیتی لەسەر کورسییەك دانیشت و بەپەلە مەمکی دەرهێنا و بێسەبرانە پرسیی: لەمێژە دەگری دایە، لەمێژە؟ بیدە بە من، زووکە. ئاخ، بێتاقەتم دەکەی. دواتر کڵاوەکەی لەسەرکە، جارێ نایهەوێ.

منداڵەکە خەریکبوو شین و رەش دەبۆوە.

ئاگافیا میخائیلۆڤنا کە دەکرێ بڵێین هەمیشە لە ژووری منداڵەکە بوو گوتی: نابێ دایکەگیان، دەبێ منداڵەکە سەر و وەزعی رێکوپێك بێـ بەبێ سەرنجدانیش بە کیتی لەگەڵ لاسایی کردنەوەی منداڵەکە گوتی: گخ، وانییە؟... گخ...

دایەن منداڵەکەی برد بۆ دایکی و ئاگافیا میخائیلۆڤنا، بە روخسارێکی بە خۆشەویستی گەشاوەوە رۆیشت بە دوایدا و دەیگوت: دەمناسێ، من دەناسێ، بەخودا، باوەڕ بکە، دایکەکەم کاترینا ئەلکساندرۆڤنا، منی ناسی، ـ وەهاش دەنگی هەڵبڕیبوو کە قیژەی منداڵەکە نەدەبیسترا.

بەڵام کیتی گوێی بۆ قسەکانی ئەو رانەدەگرت. بێئۆقرەیی ئەو لە منداڵەکە زیاتر بوو.

هێندە بەپەلە بوون کە هەتا ماوەیەك کارەکە جێبەجێ نەدەبوو. ساواکە گژنیژەی مەمکی دایکی نەدەگرت و رقی کردبوو.

ئاخری دوای گریان و قیژەیەکی زۆر خەریکبوو رەشوشین دەبۆوە و چەند جار پیرانی گریان خەریکبوو دەیخنکاند، مەمکی دایکی گرت و دایك و کۆرپە بۆ ساتێك هەردووکیان هەستیان بە ئاسوودەیی کرد و ئارام بوونەوە.

کیتی دەستی بە سەر و دەموچاوی کۆرپەکەیدا هێنا و لاواندییەوە و لەسەرەخۆ گوتی: بڕوانە بەستەزمانە لە ئارەقەدا خووساوەـ لە بنەوە چاوێکی لە چاوی ساواکە کرد و وریا و زیرەکی هاتە بەرچاو و لە ژێر شەوکڵاوی بۆ پێشەوە داخزاوی لێیدەڕوانی و لەگەڵ ئەوەی چاوی

له کوڵمە ناسکەکانی دەکرد کە لەکەڵ مژینی مەمکی بە شێوەیەکی یەکهاوی دەجووڵان و لەپی دەستە خنجیلەکانیشی وەکوو پەلکی گوڵی سوور وابوون و بە نەرمی دەیسووڕاندن، پرسیی: بەڵام ئێوە بۆ پێتانوایە دەتانناسیٚ؟

ئاگافیا میخائیلۆڤنا چونکە لەسەر ئەوە پێداگریی دەکرد گوتی: ئەگەر ئەقڵی بوایە دەیناسیم ـ گرژینەوەکەشی بەو هۆیە بوو کە ئەگەرچی دەیگوت منداڵ لەو تەمەنەدا مەحاڵە کەسێك بناسیٚ لە دڵی خۆیدا خاترجەم بوو کە نەك هەر ئاگافیا میخائیلۆڤنا دەناسیٚ بەڵکوو هەموو شتێك دەزانیٚ و لە زۆربەی شتەکان دەگات کە هیچ کەس تێیان ناگات و ئەو کە خۆی دایکە لە سایەی ساواکەیەوە تازە لەوانە تێدەگات. میتیا لەبەر چاوی ئاگافیا میخائیلۆڤنا و دایەنەکەی و باوەگەورەی و تەنانەت لەبەرچاوی باوکی بوونەوەرێکی زیندوو بوو و پێویستییەکانیشی ماددی بوون، بەڵام بۆ ئەو کە دایکی بوو لە زۆر لەمەوبەرەوە بوونەوەرێکی رۆحانی بوو و لەگەڵ ئەودا پێوەندییەکی رووحانی و دوور و درێژی هەبوو.

ئاگافیا میخائیلۆڤنا گوتی: باشە، ئێستا ئەگەر خودابکا و لە خەو هەستیٚ خۆتان دەیبینن، کە ئاوا دەکەم پێدەکەنیٚ، وەکوو خۆری بەربەیانی.

کیتی لەسەرەخۆ گوتی: باشە، باشە، دەیبینین. ئێستا برۆ، خەریکە خەوی لێدەکەویٚ.

## حەوت

ئاگافیا میخائیلۆڤنا بەبیٚ چرپە و بە پێدزکە چووەدەریٚ و دایەنەکە پەردەی پەنجەرەکەی دادایەوە و مێشەکانی لە ژێر پەردەی مەخمەری چرپاکە و هەنگەژاڵەیەکی گەورەش کە سەری بە پەنجێرەکەدا دەدا لە ژوورەکە کردە دەریٚ و بە لقێك غان خەریکی باوەشێنی دایك و کۆرپە بوو.

گوتی: پەککوو لەدەست ئەو گەرمایە! خودابکا نمێك باران بباریٚ.

کیتی تەنیا وەڵامیدایەوە: بەڵیٚ، بەڵیٚ، وسست... ـ بە هێواشی کۆرپەکەی لە باوەشیدا رادەژەند، دەستی زارۆکەکە لەبەر قەڵەوی دەتگوت بەنێکت لە مەچەکی بەستووە و توند کراوە و لەگەڵ هەڵێنان و قووچاندنی ئارامی چاوانی هەروا بە ئارامی رایدەژەند و بە نەرمی دەیگوشی. ئەو دەستە ناسك و خرپنە هۆشی بە خۆیەوە خەریك کردبوو. حەزی دەکرد ماچی بکات بەڵام دەترسا خەبەری بێتەوە. دەستی ئاخری لە جووڵە کەوت و پێلووی نیشتە سەریەك. تەنیا جاروبار کۆرپەکە درێژەی بە کاری خۆی دەدا و مژۆڵە درێژ و هەڵگەڕاوەکانی خۆی هەڵدەهێنا و بە چاوە تەڕەکانی کە لە تاریکیدا رەشیان دەنواند لە

دایکی دەڕوانی. دایەنەکە دەستی لە باوەشێن هەڵگرتبوو و وەنەوزی دەدا. گوڕە و هەرای قسەکردنی پرێنسی گەورە و خورۆشی پێکەنینی کاتاڤاسۆڤ لە نهۆمی سەرەوە دەبیسترا.

کیتی لە دڵی خۆیدا گوتی: «وادیارە دوور لە من گەرم داهاتوون و چاك كردوویانەتە سەری و نایبڕنەوە. بەڵام حەیفێ کۆسیتا لە ماڵێ نییە. حەتمەن دیسان چووە بۆ لای پلوورەکان. ئەگەرچی حەزناکەم زۆر بچێ بۆ ئەوێ بەڵام رازیم. زۆر سەرقاڵە و ئێستا لەچاو زستانێ زۆر باشتر و بەنەشەترە.»

پاشان بە پێکەنینەوە بە خۆی گوت «لەم دواییانەدا هێندە دڵتەنگ بوو و ئازاری دەکێشا کە تەواو خەمم لێنیشتبوو. بەڵام زۆریش پێکەنینییە.»

کیتی دەیزانی هۆی ئازاری مێردەکەی چییە. بە هۆی بێئیمانیی خۆیەوە ئازاری دەکێشا. ئەگەر لە کیتییان بپرسیبایە بەپێی ئەوەی بێئیمانەکان لەو دنیا دەچن بۆ دۆزەخ، ئەو مێردەکەی بە دۆزەخی دەزانی، ناچار دەیسەلماند، لەگەڵ ئەوەشدا بە هۆی بێئیمانیی مێردەکەیەوە هەستی بە چارەڕەشی نەدەکرد و ئەگەرچی لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە بێبڕواکان رزگار نابن و هیچ شتێکی لە دنیادا بەقەد رۆحی مێردەکەی خۆشنەدەویست، سەرەڕای ئەوەش پێکەنینی بەو بێباوەڕییەی مێردەکەی دەهات و لە دڵی خۆیدا ئەوی بە قەشمەر دەزانی.

بە خۆی گوت «هیچ تێناگەم بۆ ساڵێکە کاتی خۆی تەرخان کردووە بۆ خوێندنەوەی بەرهەمی ئەو فەیلەسووفانە؟ ئەگەر ئەو قسانەی لەو کتێبانەدا نووسراون راستبێ تێگەیشتنی نابێ زۆریش دژوار بێت و ئەگەر راستیش نییە بۆ دەیانخوێنێتەوە؟ خۆی دەڵێ حەزدەکات باوەڕدار بێت. کەوایە بۆ نییەتی؟ حەتمەن هی ئەوەیە زۆر بیردەکاتەوە. بە هۆی تەنیاییشەوەیە کە ئەوەندە بیردەکاتەوە. هەمیشە بە تەنیایە. ناتوانێ لەگەڵ ئێمە باسی هەموو شتێك بکات.

پێموایە کۆڕی ئەم میوانانەی بەدڵ دەبێ و حەز بە ئاخافتن دەکات لەگەڵیاندا. بە تایبەت کاتاڤاسۆڤ. حەزدەکات لەگەڵ ئەو دەمەتەقێ بکات.» کە گەیشتە ئێرە کەوتە بیری ئەوەی کە کاتاڤاسۆڤ لە کوێ بخەوێنێ باشترە. بەجیا یان هەر لە ژوورەکەی سرگی ئیڤانڤیچ؟ ئەو کاتە بیرێك بە زەینیدا هات کە بە هۆی هەیەجانەوە داچڵەکی و میتیا لە باوەشیدا چاوی هەڵێنا و بە توندی لە دایکی روانی. «وادیارە جلشۆر هێشتا جلە شۆراوەکانی نەهێناوەتەوە و هەموو مەلافە خاوێنەکانیش کەڵکیان لێوەرگیراوە. ئەگەر حەولێك نەدەم ئاگافیا میخائیلۆڤنا بۆ جێوبانەکەی سرگی ئیڤانڤیچ لەو مەلافە نەشۆراوانە کەڵك وەردەگرێ.» کە ئەوەی هێنایە بەرچاوی خۆی خوێن گوشاری هێنا بۆ دەموچاوی و سوورهەڵگەڕا.

بە خۆی گوت «باشە، کارەکە جێبەجێدەکەم.» دوای ئەویش گەڕایەوە سەر خەیاڵەکەی خۆی کە ئەو فیکرە گرینگەی لە بواری کاروباری ئاینیدا بوو بە ناتەواوی هێشتبوویەوە و هەوڵیدا وەبیری بێتەوە کە ئەو فیکرەی چیبووە و لەپڕ وەبیری هاتەوە و زەردەیەکی گرت و بە خۆی گوت «ئەها، بێبڕواییی کۆسیتا!»

«دەی با بێبڕوا بێ. لێیگەڕێ با هەمیشە هەر ئاوا بێبڕوا بێ، ئاوا باشترە یان وەکوو مادام ئێشتاڵ بێت یان ئەو جۆرەی کە من دەمویست وابم کاتێك کە لە هەندەران بووم. نا، ئەوە هەرچییەك بێ ڕاست و بێتەڵەکەیە و دووڕوو نییە.»

یەکێك لەو دیاردانەی کە نیشاندەری ڕەوشتپاکیی لەڤین بوو و تازە بۆی دەرکەوتبوو لەپڕ لە زەینیدا زیندوو بۆوە. دوو حەوتوو لەمەوبەر نامەیەکی پەشیمانیی ستیپان ئارکادیچ بە دەستی دالی گەیشتبوو. ئەو لەو نامەیەدا بە پاڕانەوە داوای لە ژنەکەی کردبوو کە مڵکەکەی خۆی بفرۆشێ تاکوو ئەو بتوانێ قەرزەکانی بداتەوە و تووشی ئابڕووچوون نەبێ. دالی وەزاڵە هاتبوو. لە مێردەکەی بێزار بوو و بە سووکوچرووکی دەزانی و سەرەڕای ئەوەش بە زەییی پێیدا دەهات و تەنانەت کەوتبووە بیری ئەوەی لێشی جیا ببێتەوە و نەیدەویست بچێتە ژێربار. بەڵام ئاخری پێملبوو بەشێك لە مڵکەکەی خۆی بفرۆشێ. کیتی بە بزەیەکی پڕ لە ئەشقەوە، شڵەژاویی مێردەکەی خۆی وەبیرهاتەوە و هەروەها ئەو ئاڵۆزییە بەردەوامانەی کە ئەو کاتی بەرەوڕووبوونی لەگەڵ ئەو کێشەیە تووشی بووبوو دیاربوو شتێکی لە دڵدایە و حەجمانی لێهەڵگرتووە، تا ئەوەی تاقە ڕێگای یارمەتیدانی پەیدا کرد و بەجۆرێك کە دالی بە دڵییەوە نەگرێ، پێشنیاری پێکردبوو، ئەویش ئەمەبوو کە ئەو، یانی کیتی، بەشەماڵەکەی خۆی بدات بە خوشکی و ئەمە شتێك بوو کە خۆی قەتی بە مێشکدا نەهاتبوو.

«ئەمە چ جۆرە بێبڕواییەکە؟ بەو دڵە پاك و بێگەردەوە کە ئەو هەیەتێ، ئەو ترسەش کە لە دڵیدایە نەکا کەسێك، تەنانەت منداڵێك ئازار بدات” هەموو کارێك بۆ ئاسوودەیی خەڵك و بۆ خۆی هیچ! سرگی ئیڤانڤیچ بە ئەرکی کۆسیتای دەزانێ کە پێشکاریی ئەو لە ئەستۆ بگرێت و خوشکیشی هەروا و ئێستا باری سەرپەرشتی دالی و منداڵەکانیشی کەوتبووە سەرشانی ئەو. تەنانەت ئەو مووژیکانەش کە هەموو ڕۆژێك دێن بۆ لای، دەڵێی بە ئەرکی ئەوی دەزانن کە خزمەتیان پێبکات.»

پاشان لەبەرخۆیەوە گوتی: «بەڵێ، ڕاست وەکوو باوکی خۆت وابە، تەنیا وەکوو ئەو.» زۆر بە نەرمی لێوی بە ڕوومەتی میتیاوە نا، ماچی کرد و دای بە دایەنەکەی.

# هەشت

لەوکاتەوە کە لەڤین دیتی برا خۆشەویستەکەی لەجێدا کەوتووە و لە حاڵی گیانکەشتدایە، بۆ یەکەم جار خۆی گوتەنی لە دەرووی بیروبڕوای نوێوە چاوی لە مەسەلەی مەرگ و ژیان کرد کە لە مەودای نێوان بیست هەتا سیوچوار ساڵان، کە خۆشی نازانێ چۆن، جێگای بیروباوەڕەکانی سەردەمی منداڵی و مێرمنداڵیی ئەوی گرتبۆوە و ترس دڵی داگرت و ترسەکەشی لە مەرگ نەبوو بەڵکوو زیاتر لە ژیانێك بوو کە ئەو سەری لە سەرچاوە و هۆکار و چیەتی و فەلسەفەکەی دەرنەدەچوو. ژینەوەری گیاندار و لەبەر یەك هەڵوەشان و لەنێوچوونی ئەو و هەروەها هەرمانی ماك و یاسای مانی وزە و گووران و کامڵبوونی زیندەوەران، وشەگەلێك بوون کە جێگای باوەڕەکانی پێشووی ئەویان گرتبۆوە. ئەم وشانە و واتایەك کە لە پشتیانەوە بوو بۆ هەوڵی فیکر زۆر باش بوون، بەڵام بۆ ژیان بەکار نەدەهاتن و لەڤین لە ناکاو خۆی لە دۆخی کەسێکدا هەست پێکرد کە باڵتەی تیسکنی خۆی بە کراسێکی جاوی ناسك گۆڕیوەتەوە و کاتی سەرماوسۆڵ و سەهۆڵبەندان بەسەردا هاتووە و ئەو یەکەم جار، نەك لە ڕێگای بەڵگەهێنانەوەوە بەڵکوو بە شایەدیی لەشی خۆی بۆی دەرکەوێ کە تاڕادەیەك رووتە و جگە لە تەسلیمبوون و مەرگێکی پڕئازار هیچ چارەیەکی تری نییە.

لەوە بەدواوە بێ ئەوەی خۆی ئاگاداربێت لە کاتی درێژەپێدانی بەردەوام بە هۆی ئەو نەزانییەی خۆیەوە تووشی ترس بووبوو.

بێجگە لەوەش بە شێوەیەکی لێڵ هەستی دەکرد کە ئەوەی ئەو بە باوەڕی خۆی دەزانێ نەك هەر نەزانی بوو بەڵکوو جۆرێك بوو کە بۆ وەدەستهێنانی زانستێك کە ئەو پێویستی پێی بوو کۆسپ و تەگەرەی دروست دەکرد و نەیدەهێشت دەستی پێی رابگات.

لە سەرەتای ژیانی ژنومێردایەتیدا، چێژ و ئەرکێك کە لەگەڵ ئەم ژیانەدا بوو ئەو جۆرە ئەندێشانەی بە گشتی لە بیری بردبۆوە، بەڵام لەم دواییانەدا، دوای زایەمانی ژنەکەی، ئەو رۆژانەی کە لە مۆسکۆ کاتی رادەبوارد بەردەوام پێویستیی هەڵێنانی ئەو مەتەڵە زیاتر لە دڵیدا سەری هەڵدەدا.

مەتەڵەکە بۆ ئەو بەمشێوەیە بوو «ئەگەر ئەو پەرسڤانەی کە ئایینی مەسیح بۆ مەسەلەی ژیان بڵاوی دەکاتەوە قەبوولم نییە کەوایە چ پەرسڤێکم قەبووڵە؟» بەڵام لە تەواوی قوەی بیروباوەڕیدا نەك هیچ وەڵامێکی نەدەدۆزییەوە بەڵکوو تەنانەت شتێکی نەدەدۆزییەوە کە شێوەیەکی لە پەرسڤ بچێت.

ڕاست وەکوو برسییەك دەچوو کە لە دووکانی لەیستۆکفرۆشی یان کارگای چەك و تەقەمەنی بۆ خواردن بگەڕێ.

بێ ئیختیار و بێ ئەوەی بزانێ لە هەر کتێبێکدا کە دەیخوێندەوە و لە هەر قسە و ئاخافتنێکدا و لە هەر کەسێکدا کە چاوی پێیدەکەوت لە ڕێگایەك بەرەو ئەو مەتەڵە و ناونیشانێك بۆ هەڵێنانی دەگەڕا.

ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر بووبووە هۆی پەشێوی و سەرسووڕمانی ئەمەبوو کە زۆربەی هاوڕێیان و هاوتەمەنانی کە وەکوو ئەو پشتیان لە بیروبڕوای پێشووی خۆیان کردبوو و وەکوو ئەو بیروبڕوایەکی تازەیان هەڵبژاردبوو لەو کارەدا هیچ شتێکی ئەوتۆیان نەدەدی کە ببێتە هۆی ناڕەحەتی و زۆر دڵنیا و ئاسوودە و لە کاری خۆیان رازی بوون، بەجۆرێك کە جگە لە کێشەی سەرەکی مەسەلەگەلێکی تریش بە ئازارەکەی زیاد دەبوون: یانی ئەو کەسانە بەڕاستی سادق بوون؟ یانی وایان نەدەنواند کە بێخەم و دڵنیان؟ یانی ئەو وەڵامانەی زانست بەو مەسەلانەی دەدایەوە کە زەینی ئەویان بە خۆیانەوە خەریك کردبوو بە شێوەیەکی جگە لە ئەو و روونتر لە ئەو تێی دەگەیشتن؟ بە هەوڵێکی زۆر بیر و بڕوای ئەو کەسانە و ئەو کتێبانەی کە وەڵامی ئەو پرسیارانەیان دەدایەوە هەموویانی موتاڵا دەکرد.

لەو کاتەوە کە ئەو مەسەلانە مێشکی ئەویان بە خۆیانەوە خەریك کردبوو چەند خاڵی بۆ دەرکەوتبوو. یەکیان ئەوەبوو کە گریمانەی ئەو بە هۆی متمانەی بیرەوەریی سەردەمی گەنجی و بیروبڕوای هاوڕێیانی زانکۆی شتێکی هەڵە بوو کە دینی بە بنەمایەکی کۆن دەزانی و پێیوابوو کاتی بەسەرچووە و بۆ ئەم سەردەمە نابێ. هەموو کەسە نزیکەکانی ئەو کە ژیانێکی پاکیان هەبوو دیندار و بەدوور لە خراپە بوون. هەر لە پرێنسی گەورەوە بگرە هەتا دەگاتە لۆوڤی ئاوەڵزاوای و سرگی ئیڤانڤیچی برای کە هەموویانی خۆشدەویست. ژنەکانیش هەموویان ئیماندار بوون و ژنەکەی کە ئیمانی وەکوو سەردەمی منداڵیی خۆی پاك و قایم بوو و نەودونۆ لە سەدی خەڵکی رووسیا و هەموو ئەو خەڵکەی کە ژیانیان لە دڵی ئەودا ڕێزی هەڵدەخڕاند، هەموو خاوەن بیروبڕوا بوون.

خاڵێکی تر ئەمەبوو کە لەگەڵ خوێندنەوەی کتێبی زۆر بەو ئاکامە گەیشتبوو کە کەسانێك لەگەڵ ئەو هاوبیروڕان و لەوپەڕی ئەم ئەندێشانەوە دەستیان بە راستییەك رانەگەیشتووە و بێ ئەوەی روونکردنەوەیەك بۆ کێشەکان بە دەستەوە بدەن تەنیا حاشا لەو مەسەلانە دەکەن کە ژیان بەبێ دۆزینەوەی وەڵامێك بۆیان بۆ ئەو ناگونجێ و هەوڵ دەدەن کێشەگەلێکی تر چارەسەر بکەن کە ناتوانێ گرنگایەتییەکی بۆ ئەو هەبێ، بۆ وێنە گوورانی بوونەوەران و روونکردنەوەی ماکی رۆح و ئەوشتانە.

جگە لەوەش کاتی زایەمانی ژنەکەی بۆ ئەو رووداوێکی سەیر قەومابوو. ئەو کە هیچ باوەڕێکی بە بوونی خودا نەبوو دەستیکرد بە دۆعاکردن و لە کاتی پاڕانەوەکەدا بڕوای بە بوونی خودا هەبوو. بەڵام ئەو کاتە تێپەڕیبوو و ئەو نەیدەتوانی لەوساتە لە ژیاندا بۆ حاڵی خۆی جێگایەك بدۆزێتەوە.

ئەو نەیدەتوانی قەبووڵی بکات کە لەو کاتەدا دەستی بە هەقیقەت راگەیشتووە و ئێستا گومڕایە، چونکە هەرکاتێك دەیویست بە خاترجەمی لەوبارەوە بیر بکاتەوە هەستی دەکرد کە هەموو شتێك لەبەریەك دەچێت و تەفرووتوونا دەبێت. لە لایەکی تریشەوە نەیدەتوانی قەبووڵی بکات کە لەو کاتەدا بەهەڵە چووە، چونکە زۆری حەز لەو حاڵە دەکرد و چێژی لێوەردەگرت و ئەگەر ئەوحاڵەی بە لاوازی و بێورەیی خۆی بزانیبایە سەفای ئەو کاتەی دەشێواند و لەناوی دەبرد. لەگەڵ ویژدانی خۆی تووشی شێواوییەکی پڕئازار بووبوو و تەواوی وزە و توانایی زەینی خۆی وەکار دەخست تاکوو لەو تەنگژەیە دەربازبێت.

## نۆ

ئەم فیکر و خەیاڵانە توانا و تاقەتیان لێبڕیبوو و هێندێ جار بە توندی و هێندێ جاریش کەمتری ئازار دەدا و لەسەریەك بۆ ساتێك دەستیان لە بەرۆکی بەرنەدەدا. کتێبی دەخوێندەوە و بیری دەکردەوە و هەتا زیاتری دەخوێندەوە زیاتری بیردەکردەوە و خۆی لە مەبەستی خۆی بە دوورتر دەزانی.

لە کوتایی نیشتەجێبوونی لە مۆسکۆ و پاشان لە گوند چونکە بەو ئاکامە گەیشت کە ناتوانێ گرفتی خۆی لەلای ماڵپەرستان چارەسەر بکات دەستیکرد بە خوێندنەوەی بەرهەم و ئاسەواری بیرمەندانێکی وەك ئەفلاتوون و سپینۆزا و کانت و سلینگ و هێگڵ و شۆپێنهاور

یانی ئەو بیرمەندانەی کە ژیانیان بە شێوەیەکی بەدەر لە ماك روون دەکردەوە، هەتا کۆتایی خوێندییەوە و دیسان خوێندییەوە.

چ ئەو کاتەی کە ئەو کتێبانەی دەخوێندەوە و چ ئەو کاتەی خۆی لە ڕێگای ڕەتکردنەوەی مەکتەبەکانی تر و بەتایبەت ڕەتکردەنەوەی ماتریالیسمدا، دەدی و بیری دەکردەوە، ئەندێشەکان لەبەر چاوی زەڤۆك و بەهرەدەر بوون. بەڵام لەگەڵ خوێندنەوەی شتێك لە بواری چارەسەری کێشەکانیدا یان کاتێك خۆی ڕێگە چارەیەکی بۆ دەدۆزینەوە هەمیشە خاڵێك بەردەوام دووپات دەبۆوە. کاتێك لەسەر ئەو تاریف و ناساندنانە هەڵوەستەی دەکرد و لە واتای لێڵی وشەگەلێکی وەك ڕۆح و ئیرادە و ئازادی و جەوهەر ورد دەبۆوە و بە ئاگادارییەوە دەکەوتە داوی وتەیەکەوە کە فەیلەسووفان دەیاننایەوە یان خۆی لە بەردەمی خۆیدا دەینایەوە، پێیوابوو خەریکە شتێك تێدەگات. بەڵام هەر ئەوەندە بەسبوو کە ئەو ڕێچکە دەستکردەی ئەندێشە لەبیربەرێتەوە و لە ڕوانگەی ژیانی ڕاستەقینەوە بەو شتە بگات کە کاتێك بەو ڕێچکە فەرزکراوەدا دەڕۆیشت بەباشی دەهاتە بەرچاو، تاکوو تەواوی ئەو بینا دەستکردەی کە وەکوو قەڵایەك دیوارەکانی بە وەرەقی پاپەز هەڵچندرابێ تێکبڕووخێ. بە ڕوونی دیاربوو کە ئەو بینایە هەر بەو وشانە، بەڵام بە شێوە دانانێکی تر هەڵچندراوە و لەودا ئەو شتە مەزن و پیرۆزە وەبەرچاو ناکەوێ کە لەوپەڕی ئاوەز و مەنتقەوەیە.

جارێك کاتی خوێندنەوەی شوپنهاوێر، بەجێی وشەی «ئیرادە» وشەی «ئەوینی» دانا و ئەم فەلسەفە نوێیەش، نزیکەی دوو ڕۆژ، هەتا ئەو کاتەی خۆی لێی دوورنەکەوێتەوە، پێی ڕازی بوو. بەڵام دواتر، کاتێك لە ناخی ژیانەوە لەوپەڕی ڕوانی، ئەویش داڕما و بووەوە بەو کراسە جاوە تەنکەی کە گەرمی نەدەکردەوە.

سرگی ئیڤانڤیچی برای داوای لێکرد کە بەرهەمە دینییەکانی خامیاکۆڤ بخوێنێتەوە. لەڤین بەرگی دووهەمی کۆمەڵە بەرهەمی خامیاکۆڤی خوێندەوە و ئەگەرچی سەرەتا شێوەی شەڕەقسە و قاوقووی ناسکی، نەکەوتە بەردڵ، کەچی فێرکارییەکانی ئەو سەبارەت بە کەنیسە تووشی سەرسووڕمانی کرد. لەم کتێبەدا وترابوو کە دەستڕاگەیشتن بە هەقیقەتی خودا بۆ دانە بە دانەی خەڵکی ناگونجێ، کەچی تێگەیاندنی ئەم هەقیقەتە بە تەواوی ئەو مرۆڤانەی کە لەگەڵ پێوەندی ئەشق نامۆن، یانی لەگەڵ کەنیسە، دەبەخشرێت. بەو فیکرە خۆشحاڵ بوو کە بڕوادار بوون بە کلیسایەکی هەبوو و هەر ئێستا زیندوو، بە هۆی عەشق و ئیماندارانەوە دەگووڕێ، کلیسایەك کە خودا لە سەرووی ئەوەوە جێیگرتووە و هەر بەو هۆیە پاقژە و لە تاوان بەرییە. تێگەیشتن لە هەقیقەتی خودا و خولقێنەری و تاوانی مرۆڤ و

تۆبە لە ڕێگای کلیسایەکی ئەوتۆوە ئاسانترە لە دەسپێکی کار و هەوڵدان بۆ تێگەیشتنی خودایەکی دوور و ڕەمزاوی و تێگەیشتن لە داهێنەریی خودا و هتد. بەڵام پاشان کە مێژووی کەنیسەی نووسەرانی کاتۆلیك و پاشان مێژووی کەنیسەی نووسەرانی ئۆرتۆدۆکسی خوێندەوە و دیتی کە ئەم دوو کەنیسەیە کە هەردووکیان بە ئیحتووباری چیەتیی خۆیان لە هەڵە و تاوان بەدوورن، حاشا لە یەکتر دەکەن، بۆیە هیوای بە فێرکارییەکانی خامیاکۆڤ نەما و ئەم بینایەش بۆ ئەو وەکوو بیناکانی حیکمەتی فەیلەسووفان داڕما.

ئەو ئەوساڵە بەهاریٚ زۆر شێواو بوو و کاتەکانی لە ڕادەبەدەر بەتاڵی ڕابوارد.

بە خۆی دەگوت «ژیان بە شێوەیەکیوا کە نەزانی کێی و بۆچی هەی مەحاڵە. زانینی ئەو ڕازە لە دەست من نایە. لە ئاکامدا ژیان بۆ من ناگونجیٚ.

لە ساتێکی هەرماندا و لەنێوان ماکێکی بێکۆتاییدا و لە خاڵێکی پانتای بێسنووردا بلۆقێکی چکۆڵە بەدی دیٚ و دوای ساتێك دەتۆقیٚ. من ڕاست ئەو بلۆقەم.»

ئەو بیرە هەڵەیەکی پڕئازار بوو، بەڵام تاقانە و دوایین ئاکامی چەند سەدە هەوڵی فیکری مرۆڤ بوو لەو بوارەدا. ئەمە دوایین باوەڕێك بوو کە هەموو شتێك لە نزیك تەواوی لقەکانی تۆژینەوەی بیری مرۆڤ لەسەر بنەمای ئەو ڕۆنرا بوو. ئەم بیرە حاکم بوو و لەڤین ئەوی لە شرۆڤەکانی تر بە ڕووناکتر دەزانی و نەخوازراوانە و بیٚ ئەوەی خۆی بزانیٚ چۆن و کەنگیٚ بۆ خۆی هەڵبژاردبوو.

بەڵام ئەم بیرە نەك هەر نادروست بوو، بەڵکوو تەوسەبزەی دڵڕەقانەی وزەیەکی شەیتانی بوو، وزەیەکی دڵڕەش و نەگەویس بوو کە نەدەگونجا سەری بۆ دانەوێنیٚ.

پێویست بوو خۆی لە دیلیەتی و ژێرچەپۆکەیی ئەو وزەیە ڕزگار بکات و دەربازبوون لەو تەنگژەیەش لە توانای هەمووان‌دا بوو. بۆی دەرکەوت کە دەبیٚ کۆتایی بەو ڕێبەرییە شەیتانییە بێنێت. بۆ ئەم ڕزگارییە تەنیا ڕێگایەکی بوو ئەویش مەرگ بوو.

لەڤین، ئەگەرچی پیاوێکی لەشساخ و بنەماڵەخۆشەویست و بەختەوەر بوو بەڵام چەند جار وەها لە سنووری خۆکوژی نزیکبووبۆوە کە پەت و گوریسەکانی دەشاردەوە نەکا خۆی پێهەڵواسیٚ و زۆر دەترسا بە چەکەوە بڕواتە دەریٚ چونکە دەترسا خۆی بکووژیٚ.

بەڵام نە خۆی هەڵواسی و نە بە تفەنگ خۆکووژیی کرد و زیندوو مایەوە.

کاتێك لەڤین بیری دەکردەوە کە کێیە و بۆ زیندووە سەرەندەری لێنەدەکرد. هیوابڕاو دەبوو. بەڵام کاتێك دەستی لەو پرسیارە هەڵدەگرت وەك ئەوە وابوو کە بزانێ کێیە و هەروەها بۆچی زیندووە، چونکە کار و ژیانی لەگەڵ ئاگاداری و خۆڕاگری ئاوێتە بووبوو و لەم دواییانەدا لەچاو رابردوو بە خۆڕاگری و ئاگادارییەکی زیاترەوە دەژیا.

سەرەتای مانگی ژوئەن گەڕایەوە بۆ گوند و کارە ئاساییەکانی خۆی دەستپێکردەوە و کاری کشتوکاڵ و پێوەندی لەگەڵ رەعیەتەکان و جیرانەکانی و کاروباری ناوماڵ و بەڕێوەهێنانی مڵکی خوشکی و براکەی کە لە ئەستۆی ئەوبوو و هەروەها پێوەندی لەگەڵ هاوسەر و خزم و کەسانی و دڵگرانییەکانی بۆ منداڵەکەیان و سەرگەرمییە تازەکەی کە هەنگداری بوو و لە بەهاری رابردووەوە هۆگری ئەو کارە بووبوو کاتی ئازادی بۆ نەهێشتبۆوە.

ئەو بەو هۆیە رووی لەو کارانە نەکردبوو کە وەکوو رابردوو بە یارمەتیی هێندێك بیروڕای گشتی ئەو کەسپە بە ئەرکی سەرشانی خۆی بزانێ، بەڵکوو بەپێچەوانە، چونکە لەلایەکەوە لە بەرنامەکانی پێشووی واتە خزمەتکردن بە قازانجی گشتی دڵسارد بووبۆوە و لەلایەکی تریشەوە مێشکی لە رادەبەدەر لە بیری ئەندێشەکانی خۆی و بارستایی ئەو کارانەدا بوو کە بە سەریدا رژابوو، کە بایەخپێدانی رابردووی خۆی لە بواری بەرژەوەندییە گشتییەکاندا بە تەواوی وەلا نابوو و ئەو چەشنە کارانەی تەنیا بەو هۆیە دەگرتە ئەستۆ کە پێیوابوو دەبێ لە ئەستۆی بگرێت و جگە لەوە چارەیەکی تری نییە.

لە رابردوودا (ئەو مەسەلەیە لە منداڵییەوە دەستیپێکردبوو هەتا تەمەنی کامڵبوونی بەردەوام گەشەی کردبوو) کاتێك هەوڵی دەدا کارێك بکات کە قازانجی خەڵك و مرۆڤایەتی و روسیا و پارێزگا و گوندەکەیان لەخۆ بگرێت بۆی دەردەکەوت کە بیر و فیکری لە بواری ئەو کارەدا و ئاکامەکەی زۆری دڵخۆش دەکات، بەڵام کارەکە خۆی هەمیشە ناخۆشە و لە کردەوەدا تەواو دڵنیانەبوو، کە ئەو کارە بەڕاستی پێویستە و کارێك کە لە سەرەتادا زۆر گەورە و گران بوو لەبەرچاوی بەردەوام چکۆڵە دەبۆوە هەتا ئەو جێیەی کە گرنگایەتیی خۆی بە یەکجاری لە دەستدا. بەڵام ئێستا دوای ژنهێنان، کە چالاکییەکانی زیاتر لەسەر ژیانی خۆی

چڕ کردبۆوە، ئەگەرچی هیچ چێژێکی لە بیرکردنەوە لە کارەکانی خۆی وەرنەدەگرت، دڵنیا بووبوو کە کارەکانی بەکەڵك و پێویستن و دەیدی کە زۆر زیاتر لە رابردوو دەڕواتە پێشێ و بەردەوام لە رادەی خۆی زیاتر دەبێت.

ئێستا، دەتگوت بە پێچەوانەی ویستی خۆی، بەردەوام زیاتر و زیاتر بە زەویدا رۆدەچێ، بەجۆرێك کە وەکوو گاسن، بەبێ هەڵدڕینی خاك هاتنەوەدەرێی مەحاڵ بوو.

ژیانی بنەماڵە بێگومان دەبوو هەر بەو شێوەیە بڕواتە پێشێ کە لە سەردەمی باوك و باوەگەورەیدا باو بوو، یانی راست ئەو گرینگایەتییەی کە ئەوان بە زانستیان دەدا، ئەویش دەبوو پێیبدات و منداڵەکانیشی دەبوو هەر بەو شێوەیە پەروەردە بکرێن. پێویست بوو مەکینەی کشتوکاڵ لە پاکرۆسکۆیە جۆرێك وەگەڕ بکەوێ کە داهاتی باشی هەبێت“ ئەوەش ئاشکرابوو، بەو رادەیە ئاشکرا کە کاتێك برسیمان دەبێت دەبێ خواردن بخوێن و خواردنەکەش بۆ ئەوەی بەتاموچێژ بێ دەبێ بکرێتە چێشت“ بەو رادەیە کە دانەوەی قەرز ئاشکرا بوو بەو رادەیەش دەبێ میراتی بنەماڵە لە دۆخێکدا ئاگاداریی لێبکرێ کە کاتێك ملکێك بە کوڕ دەبڕێ دەبێ بەو رادەیە سەبارەت بە باوکی هەقناس بێت و رێزی بۆ دابنێ، کە لەڤین خۆشی سەبارەت بەو شتەی باوکی دروستی کردبوو و چاندبووی بە ئەمەگ و هەقناس بوو. هەر بەو هۆیەش نەدەبوو زەوییەکە بە ئیجارە بدات، دەبوو خۆی لەسەر زەوییەکە کاری کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بکات و بە کوودی ئەو ئاژەڵانە زەوییەکە بەهێز بکات و پاشان بیکاتە باخ و دارستان.

نەدەکرا بەڕێوەبردنی ملکی خوشکی و سرگی ئیڤانڤیچی برای لە ئەستۆ نەگرێت و ئەو رەعیەتانەی کە خوویان بەوە گرتبوو بۆ رێنوێنی بێن بۆ لای ناهومێدیان بکات، راست وەك ئەوەی کۆرپەیەکت لە باوەشدا بێت و نەکرێ بیدەی بە زەویدا.

ناچاربوو بۆ ئاسوودەییی ژنخوشکی و منداڵەکانی و هەروەها ژن و کوڕەکەی خۆی شان بداتەبەر بارێك و ئەگەر بلوێ رۆژی سەعاتێك کاتی خۆی لەگەڵ ئەوان رابوێرێ.

ئەوانە و راو و سەرگەرمییە نوێیەکەی کە هەنگداری بوو تەواوی ئەو لایەنە لە ژیانی ئەوی، پڕ دەکردەوە و کاتێك بیری لێدەکردەوە زۆر بێ مانا بوو.

بەڵام جگە لەوەی لەڤین دڵێنابوو کە دەبێ «چ کارێك» بکات، هەر ئاواش دڵنیابوو کە ئەم کارانە «چۆن» بکات و چ کارێك لە کارەکەی تر گرینگترە.

دەیزانی کە کرێکاران دەبێ بە هەقدەستێکی زۆر کەم بەکرێ بگرێ، بەڵام پێدانی هەقدەستەکەیان لە پێشدا و کەمتر لە بایەخی کارەکەیان و لەو رێگایەوە بە کۆیلەکردنیان، ئەگەرچی زۆر پڕقازانج بوو بەڵام ناڕەوا بوو. فرۆشتنی کا و ئالیك بە رەعیەتەکان لە کاتی

بێتفاقیدا، ئەگەرچی بەزەییی پێیاندا دەهات، رەوابوو بەڵام دەرگای مەیخانەکان ئەگەرچی پڕقازانج بوو دایدەخست. بڕینی داری لێرەواری بە توندترین شێوە سزا دەدا بەڵام کاتێك رەعیەتەکان مەڕ و ماڵاتیان دەکردە نێو لێڕەوارەکەوە، رەوا نەبوو بەو تاوانە سزایان بدات، ئەگەرچی بۆ ئەو کەمتەرخەمییە مێشەوانەکان زۆر دڵگران بوون و هەروەها دەبووە هۆی پەرەپێدانی بێبەندوباری، لەگەڵ ئەوەشدا رەوا نەبوو دەست بەسەر ئاژەڵە زیانی کردووەکاندا بگرێت.

دەبوو قەرز بدات بە پیووتێر کە مانگی دە لە سەد سوودی دەدایەوە. تاکوو خۆی لە چنگ سووتخۆرەکە دەربازبکات، بەڵام نەدەبوو ئیجازە بدات کە ئیجارەی زەویی رەعیەتە حیسابناخۆشەکان وەدوا بکەوێ. ئەگەر گزیرێك کەمتەرخەمی کرد و گیاجاڕێکی لە کاتی خۆیدا نەدەدوورییەوە و ئالفەکەی زایە بوو نابێ لە تاوانی خۆشبێت و بەڵام گیاوگژی ئەو هەشتا دسیاتین زەوییەی کە لەودا نەمامیان لێداوە نابێ بدوورێتەوە. نەدەبوو لە خەتای کرێکارێك خۆشبێت کە لە جەنگەی دروێنەدا کارەکەی بەجێ دێڵێ و دەڕواتەوە بۆ گوند تاکوو لە رێوڕەسمی ناشتنی باوکیدا بەشداری بکات، ئەگەرچی سەرەخۆشیی لێدەکرد و هەستی هاودەردیی خۆی بۆ دەردەبڕی و دەبوو بەجێی ئەو مانگانەی کە هەقدەستەکەیان زۆر بووە و کاریان نەکردبوو لە هەقدەستەکەی بگێڕێتەوە، بەڵام لەلایەکی ترەوە نەدەکرا مانگانەی ئەو خزمەتکارە پیرە ببڕێت کە تواناییی هیچ کارێکی نەبوو.

لەڤین هەروەها دەیزانی کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ ماڵێ دەبێ بەر لە هەموو شتێك سەر لە ژنە نەخۆشەکەی هەڵێنێ و ئەو گوندنشینانەی کە سێ سەعات بوو چاوەڕوانی بوون دەبوو هەروا چاوەڕێ بن. کاتێك شەڵغەیەك مێشەنگوێنی دەدیتەوە کە بە لقە دارێکەوە وەکوو هێشوو پوورەیان داوە تامەزرۆیانە دەیگرت و لە پلوورەی دەکردن و لە خۆشیانا پێی وەعەرز نەدەکەوت، بەڵام ئەوەی دەزانی کە ناچارە چاوپۆشی لەو کارە بکات و هەنگەوانە پیرەکە دانێ کە ئەو ئەرکە بەڕێوەبەرێت. چونکە خۆی دەبوو لەگەڵ ئەو گوندنشینانە قسە بکات کە هاتبوون بۆ لای.

بیری لەوە نەدەکردەوە کە ئەو هەڵسوکەوتەی باشە یان خراپ و نەك هەر زۆری گوێ نەدەدایە کە دروستیی ئەو ئاکارەی خۆی بە کەسێك بسەلمێنێ بەڵکوو خۆی لە باس و بیرکردنەوە لەو بارەشەوە دەبوارد.

باس و بەڵگەهێنانەوە لەوبارەوە تووشی دڕدونگیی دەکرد و دەبووە هۆی ئەوەی لە چاکی و خراپیی کارەکانی بگات. کەچی کاتێك بیرکردنەوەی وەلادەنا و مێشکی تەنیا بە ژیانەوە خەریك دەکرد بەردەوام بوونی داوەرێکی راستبینی لە رۆحی خۆیدا هەست پێدەکرد کە دەیتوانی لێکی بکاتەوە کە لەو دوو رێگایە کامیان باشە و کامیان خراپە، لەگەڵ رێگایەکی دەگرتەبەر کە نەدەبوو پێیدا بڕوات لەڕێوە دڵی خەبەری پێدەدا کە ئەو کارە هەڵەیە.

ئەو بەو شێوەیە دەژیا و نەیدەزانی کێیە و بۆچی زیندووە، ڕێگای تێگەیشتنەکەشی بۆ نەدەدۆزرایەوە، بەهۆی ئەو نەزانییەوە ئازاری دەکێشا و هەتا ئەو جێیەی کە دەترسا پەنا بۆ خۆکوشتن بەرێ و لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگایەکی دیاریکراو کە تایبەتی خۆی بوو بە ئیمان و دڵنیاییەوە لە ژیاندا دەیگرتەبەر.

## یازدە

ئەو ڕۆژەی کە سرگی ئیڤانئیچ گەیشتە پاکرۆسکۆیە یەکێك لە ڕۆژە هەرە ناخۆش و پڕئازارەکانی لەڤین بوو.

جەنگەی کارە گرینگ و بەپەلەکان، وەرزێك کە تینوتاوی هەوڵ و تێکۆشانێکی نائاسایی و لەخۆبردوویی لە کاردا لە خوێن و دڵی هەموو خەڵکیدا وەگەڕ دەکەوێ و ئەوە لە هیچ بارودۆخێکی تری ژیاندا وەبەر چاو ناکەوێ و چەندە پڕبایەخ دەبوو ئەگەر ئەو خەڵکەی ئەو توانایییەیان هەیە و وەدەری دەخەن خۆیان گرینگی پێبدەن و هەروەها ئەگەر ئەو ئەرکە هەمووساڵێك لە کاتێکی دیاریکراودا دووپات نەبوایەتەوە ئاکامەکەی ئاوا سادە و ئاسایی نەدەبوو.

دوورینەوەی جۆ و گەنم و کۆکردنەوە و گێرەوکێشە و خەرمان و شەنوکەو دوای ئەویش شێوبڕینی زەویی بەیار بۆ چاندنی پایزەکێڵ و ئامادەکردنی گەنم و جۆ بۆ بنەتوو، ئەوانە هەموو ئاسان و ئاسایی دەهاتنە بەرچاو، بەڵام بۆ ئەوەی ئەم کارانە بە جوانی بەڕێوەبچن دەبوو هەموو خەڵکی گوند، بە پیر و جحێڵەوە، لە ماوەی ئەو چوار حەوتووەدا سێ هێندەی کاتی ئاسایی کار بکەن و لەو ماوەیەدا جگە لە نانی وشکی و پیواز و کواس دەم لە هیچی تر نەدەن. تەنانەت شەوانەش تا بەیانی خەریکی کوڵۆشکێشان بۆسەر خەرمان و گێڕەکردن بن و لە شەو و ڕۆژدا لە دووسێ سەعات زیاتر نەخەون. ئەوەش کارێکە کە هەموو ساڵێك لەم جەنگەیەدا لە سەرانسەری ڕووسیا بەڕێوەدەچێت.

لەڤین کە زۆربەی ژیانی خۆی لە گوند ڕابواردبوو و لەگەڵ گوندنشینەکان تێکەڵاوییەکی زۆری هەبوو هەمیشە لەو ماوەیەی قەیرانی کار و ئارەق ڕشتنندا هەستی دەکرد ئەم حاڵوهەوایەی خەڵك شوێنی لەسەر ئەویش داناوە و ڕۆح و گیانی داگرتووە.

بەیانی زوو سواری ئەسپەکەی دەبوو و خۆی دەگەیاندە ئەو مەزرایەی کە خەریکی داچاندنی جۆ بوون، پاشان دەچوو بۆ لای وێنجەکان کە بەری دووهەمیان دووریبۆوە و خەریکی کۆکردنەوەی قەرخ و مەلۆکان بوون و باقە وشکەکانیان بە عەرابە دەکێشا بۆسەر خەرمان و لە

گیشەیان دەدا. کاتی لە خەوهەستانی ژنەکەی و ژنخوشکی دەگەڕایەوە بۆ ماڵێ و بەرچایی لەگەڵ دەخواردن. پاشان بە پێیان دەچوو بۆ قەڵا، تاکوو مەکینەی خەرمانهەڕی تازە ئامادەبکەن و بیبەن بۆسەر خەرمانەکە.

لەڤین ئەو ڕۆژە لە بەیانییەوە، کاتی ئاخافتنی لەگەڵ گزیر یان ڕەعیەتەکان و لە ماڵێ کاتی قسەکردن لەگەڵ کیتی و دالی و منداڵەکانی و هەروەها لەگەڵ خەزووری، تەنیا بیرێك لە مێشکیدا بوو، ئەو بیرەش هەروا دەستبەرداری نەدەبوو و لە هەموو حاڵێکدا بە دەست گرفتەکانییەوە جینگڵی دەدا و وەڵامێکی بۆ ئەو پرسیارە نەدەدۆزییەوە کە من کێم و لە کوێم و بۆچی زیندووم؟

لە ژێر چوارچێوەی فێنکی کەپرێکی نیوە دارەڕاکراودا وەستابوو کە دەستەکە چنارە تازە تێخوڵ داماڵدراوەکانی میچەکەی بە هەڵاشی پەلك و گەڵای بۆنخۆشی فندق داپۆشرابوو و لە چوار دەورییەوە تۆزی وشك و تاڵی خەرمانهەڕەکە دەهاتەدەرێ و بە حەواوە دەخولایەوە، هێندێ جار چاوی لەو کاوکۆتەی تەرکی کەپرەکە دەکرد کە جێجێ لە ژێر تیشکی خۆردا دەبریقانەوە و کای تازە کە لە ژێر کەپرەکەیان دەهێنا دەرێ و هێندێ جاریش لەو پەڕەسێلکە سەر خەنەییە بنزگ سپییانەی دەڕوانی کە بە جریوە جریو دەهاتن و بە بنمیچی کەپرەکەوە دەنیشتنەوە و لە ڕووناکایی سەردەرانەی کەپرەکەدا سووکە لەنگەرێکیان دەگرت، هێندێ جاریش چاوی لەو گوندنشینانە دەکرد کە لە ژێر سێبەری پڕ لە تەپوتۆزی کەپرەکەدا دەهاتن و دەچوون و بە شەنە باقە گەنمیان دەکرد بە گەرووی خەرمانهەڕەکەدا و هەروا لە بیر و خەیاڵە سەیرەکانی خۆیدا نوقم بوو.

بە خۆی گوت «ئەم هەموو کارە بۆچییە؟ من بۆ لێرە ڕاوەستاوم و چاو لە کارکردنیان دەکەم؟ ئەمانە بۆ ئاوا هەڵدەسووڕێن و هەوڵ دەدەن و هەدادانیان نییە و دەیانهەوێ لەبەر چاوی من خۆیان ئازا و بەغیرەت نیشان بدەن؟» چاوی لە پیرێژنێکی ڕەقەڵە کرد کە بە پێی پەتی و لاقوقولی تاوەسووت و ڕەشداگەڕاوەوە بە توندی لە ژێر سێبەری کەپرەکە و لەسەر تەرکی ناتەکووزی کەپرەکە کاری دەکرد و بە شەنە، باقە هەڵپێچڕاوەکانی بۆ لای زارکی مەکینەکە ڕادەدا، بە خۆی گوت «ئەوە ماتریۆڤنای پیرە، کە دەیناسم.» (لە سووتمانەکەدا دەستەکی دارەڕای بە سەردا کەوت و من ماریجەم کرد.) بۆ ئاوا تێدەکۆشێ؟ ئەو ڕۆژە لەو ئاوەرەدا نەسووتا و نەجاتی بوو، بەڵام ئەمڕۆ یان سبەی، یان دە ساڵی تر هەر دەچێتە ژێر خاکەوە و هیچی لێنامێنێتەوە، نە ئەو ئاسەواری دەمێنێ و نە ئەو کچە گورجە پاکوخاوێنە کراسسوورەی کە نەرم و لێزانانە باقەبێنەکان دەکاتەوە و بە باوەش دەیهێنێتە پێشێ، ئەویش دەکرێ بەژێر خۆڵەوە.» چاوی لەو یەسترە ئەبڵەقەش کرد کە زگی بە توندی هەڵدەستا و دەنیشتەوە و لە بڕناخی لێکڕەویوییەوە بە توندی هەناسەی

دەردەدا و بەسەر پللەی بزۆك و ئەو تەركە مارودووەی لە ژێر پێیدا دەگەڕا و دەزگاكەی هەڵدەسووڕاند، پاشان خەیاڵ هەڵیگرتەوە «ئەو یەسترەش زۆر زووتر، بەڵێ، ئەم فیۆدۆرەش كە كولۆشەكە دەكاتە زاركی مەكینەكەوە، بەو ریشە لوول و پڕ لە كاوكۆتەوە و بەو كراسە دڕاوەیەوە كە شانە پیسەكەی لێوەی وەدیار كەوتووە، دەچێتە بن گڵ. ئەو ئێستا باقەكان بڵاو دەكاتەوە و دەستوور بە ژنەكان دەدا و بە سەریاندا دەگوڕێنێ و چالاكانە تاسمەكە لەسەر تەوەرەی لەنگەر میزان دەكات. بۆ دوور بڕۆم. نەك هەر ئەوانە بەڵكوو خۆشم رۆژێك دەمرم و وەك نەبوویێتم وایە. ئاخەر بۆچی؟»

ئەو بیر و خەیاڵانەی لە مێشكیدا وەرد دەدایەوە و چاوی لە كاتژمێرەكەی دەكرد تاكوو بزانێ لە سەعاتێكدا چەند باقە ورد دەكرێ. ئەو دەبوو كاركردی مەكینەكە حیساب بكات تاكوو بە پێی ئەو رادەكارەی كە كرێكاران لە رۆژێكدا دەبێ بیكەن هەقدەستیان بۆ لەبەرچاو بگرێ.

بە خۆی گوت «خێرا سەعات تێدەپەڕێ و تازە دەستیان كردووە بە خەرمانی سێهەم.» چوو بۆ لای فیۆدۆر و نەڕاندی تاكوو لەبەر خڕوهۆڕی مەكینەكە گوێی لە دەنگی بێت، گوتی كەمتری كولۆش تێرێژە.

ـ فیۆدۆر، زاركی مەكینەكە زۆری تێدەرێژی. دیتووتە، لە گەرووی دەگیرێ. هەر بۆیە كارەكەی رەوان نییە. دەستت میزان بكە.

فیۆدۆر كە روخسارە لە ئارەقدا شەڵاڵەكەی بە تۆزی كاوكۆت رەش داگەڕابوو و بەحاڵ كونی چاوی بە دەرەوە بوو، بە دەنگی بەرز شتێكی گوت بەڵام هەروا كارەكەی خۆی، نەك بەو شێوەی لەڤین دەیگوت، درێژە پێدا.

لەڤین رۆیشت بۆ لای تەپڵەكی خولۆكی مەكینەكە و شەنەكەی لە دەستی وەرگرت و خۆی دەستبەكاربوو.

لەڤین هەتا كاتی فراوێنی مووژیكەكان كە زۆری نەمابوو، شان بە شانی فیۆدۆر كاری كرد و لە مەكینەكە دوورنەكەوتەوە. كاتێك دەستیان هەڵگرت لەگەڵ فیۆدۆر بە قسەكردن چوون بۆ لای خەرمانی زێڕینی جۆی تازە دروێنەكراو كە بۆ بنەتوو لەبەرچاو گیرابوو و بە رێكوپێكی باقەكان لەسەریەك هەڵچندرابوون، لەوێ راوەستان.

ئەم فیۆدۆرە خەڵكی ئەو گوندە دوورەدەستە بوو كە لەڤین سەردەمێك زەوییەكانی خۆی بە شێوەی زبارەیی دەدا بە خەڵكی ئەوێ. ئێستا زەوییەكەی وەرزێڕێك بە ناوی كیریلۆڤ، كە كەسپی دالانداری بوو لێی بە ئیجارە گرتبوو.

لەڤین سەبارەت بەو زەوییە لەگەڵ فیۆدۆر قسەی دەكرد و لێیدەپرسی كە بڵێی پلاتۆن بۆ ساڵی داهاتوو زەوییەكەی لێ بە ئیجارە بگرێ؟ ئەو پلاتۆنە وەرزێڕێكی باش و زەحمەتكێشی ئەو گوندە بوو.

فیۆدۆر لەگەڵ ئەوەی گوڵە جۆیەکی لە زگە بەئارەقە خووساوەکەی کردەوە وەڵامیدایەوە: ئیجارەکەی گرانە. لە توانای پلاتۆندا نییە.

ـ ئەی بۆ لە توانای کیریلۆڤدا هەیە؟

ـ میتیۆخا؟ (کابرای لادێیی بۆ سووکایەتیی ئاوای ناوی کیریلۆڤ هێنا) کۆنتستانتین دیمیتریچ، بۆ لە توانایدا نابێ؟ ئەو تۆێخی کرێکار دەبات و دیقی پێدەکات هەتا بەشەکەی خۆی دەداتێ. ئەو خۆ بەزەیی بە مووژیکی داماودا نایە. بەڵام خاڵە فۆکانیچ (مەبەستی پلاتۆن بوو) خۆ وانییە. جاریوایە دەکەوێتە ژێر باری قەرز و جاریواش هەیە چاوپۆشیی لێدەکات. ئەو خوێنی فەقیر و هەژار نامژێ. بەڵێ، هەموو جۆرە مرۆڤێك پەیدا دەبێت.

ـ بەڵام ئاخر چۆن چاوپۆشی دەکات؟

ـ دەی، دەیکات ئیتر. هەرکەسەی جۆرێکە. هێندێ کەس تەنیا لە بیری گیرفانی خۆیاندان، وەکوو ئەم میتیۆخایە. زگی خۆی تێربێت کاری بە کرێکاری داماو نییە. بەڵام فۆکانیچ پیرە پیاوێکی راست و بێفرو فێڵە. پیاوێکی لە خودا ترسە. لە بیری ئەو دنیاشیدایە.

لەڤین کە تووشی هەیەجان بووبوو دەنگی هەڵێنا: چۆن لە خودا دەترسێ؟ چۆن لە بیری ئەو دنیادایە؟

ـ چۆنی ناوێ. بێدەغەڵەیە ئیتر. هەمیشە خودای لە بیرە. دەی هەرکەسەی جۆرێکە. بۆ دوور برۆین؟ مەگین خۆتان جەنابی کۆنستانتین دیمیتریچ لە بیریدا نین؟ مەگین ئێوە دڵتان بروایی دەدا خەڵکی هەژار برسی و لێقەوماو بن؟

لەڤین لەبەر هەیەجان هەناسەی سوار بووبوو و گوتی: باشە، باشە، خوداحافیزلـ وەرسوورِا و گۆچانەکەی خۆی هەڵگرت و بە هەڵەداوان رۆیشتەوە بۆ ماڵێ.

هەستی شادی لە دڵی گەڕابوو. قسەکانی کابرای لادێیی کە گوتبووی فۆکانیچ لە بیری ئەو دنیای خۆیدایە و بە رێگای راستدا دەڕوا و بێدەغەڵە و لە خوداترسە، بیر و ئەندێشەیەکی لێڵ بەڵام کاریگەری لە زەینیدا وەئاگا هێنا. دەتگوت ئەم ئەندێشانە لە قوژبنێکی بیرگەیدا بەند بوون و کتوپڕ ئازاد بوون و هەموویان روویان کردۆتە لایەك و ئاژاوەیەکیان لە مێشکیدا سازکردووە و بە رووناکاییی خۆیان وەشەوارەیان خستووە.

# دوازده

لەڤین بە هەنگاوی خێرا بەسەر جادەی سەرەکیدا دەڕۆیشتە پێشێ و نەك زۆر سەرقاڵی بیرەکانی خۆی (کە هێشتا بە باشی سەری لێیدەرنەدەچوو) بەڵکوو سەرقاڵی دڵی بوو کە هەتا ئەو کاتە ئاوا بیری لێنەکردبۆوە.

قسەکانی کابرای وەرزێڕ وەکوو برووسکەیەك شوێنی لەسەر رۆحی دانابوو کە ئەندێشەی جیاواز و بێهێز و نابەجێ کە قەت لە زەینی دوورنەکەوتبۆوە، لە ناکاو گۆڕانی بەسەردا هاتبوو و هاوپێوەندی سازکردبوو و وەکوو رەوەیەك باڵندە پێکەوە لە شەقەی باڵیان دابوو. بێ ئەوەی خۆی ئاگای لێبێ، کاتێك کە باسی بە ئیجارەدانی زەوییەکانی دەکرد و دەیویست بیدا بە رەعیەتەکان ئەو فیکرانە بیر و مێشکیان دادەگرت.

هەستی دەکرد شتێکی تازە لە رۆحیدا سەری هەڵداوە و بێ ئەوەی بە باشی بزانێ ئەوە چییە بە چێژەوە لە ناخیدا لێکیدەدایەوە.

«مرۆڤ دەبێ، نەك بۆخۆی، بەڵکوو بۆ خودا بژی. بەڵام کام خودا! قسەی لەوە بێ ماناتر هەر نییە. گوتبووی: مرۆڤ نابێ لەبەر خۆی بژی، یانی بۆ شتێك بژین کە تێیدەگەین و دڵمان هۆگرێتی، بەڵکوو دەبێ بۆ شتێك بژین کە تێیناگەین، بۆ خودایەك کە هیچ کەس ناتوانێ تێیبگات و وەسفی بکات. دەی مەگین من لەو قسە بێ مانایانەی فیۆدۆر نەگەیشتم؟ مەگین کاتێك کە تێگەیشتم راستییەکەی تووشی گومانی کردم؟ یانی ئەم قسانەم بە شتێکی گەوجانە و لێڵ و ناڕاست زانی؟

نا، من لە قسەکانی گەیشتم و راست ئەو جۆرە تێگەیشتم کە ئەو خۆی تێگەیشتبوو. بە تەواوی تێیگەیشتم، روونتر لە هەموو شتێك و لە ژیاندا قەت گومانم لێنەکردووە و ناتوانم گومانیشی لێبکەم. نەك هەر من، بەڵکوو هەموو دنیا بە جوانی لەوە تێدەگەن و تەنیا لەوەدایە کە شك و گومانیان نییە و هەمیشە پێکەوە هاوبڕوان.

فیۆدۆر دەڵێ کیریلۆڤ تەنیا لە بیری زگی خۆیدایە و تێرە و ئاگای لە برسی نییە. ئەم قسەیە بەجێ و عاقڵانەیە. ئێمە کە بوونەوەرێکی خاوەن ئاوەزین هەموو ناچارین لە بیری زگماندا بین. هەروەها فیۆدۆر دەڵێ زیندووبوون لەبەر خاتری زگ شتێکی خراپە و مرۆڤ دەبێ تەنیا لەبەر خاتری هەقیقەت و خودا بژی و من زۆر باش لەو قسەیەی دەگەم. من و

ملوێنان مرۆڤ، که سەدان ساڵ بەر لە من ژیاون یان ئێستا زیندوون، گوندنشینان و هەژاران لە ڕۆحیاندا[٩٩] و ئەو زانایانەی کە لەو بوارەدا بیریان کردۆتەوە و نووسیویانە بە زمانی لێڵی خۆیان هەموو شتێکیان گوتووە. ئێمە هەموومان تەنیا لە خاڵێکدا هاوسەنگین، لەوەدا کە بۆچی دەبێ بژیین و چ شتێك باشە. من و خەڵکی هەموومان، تەنیا شتێك بە ڕوونی و بە ڕاستی و بەبێ گومان دەزانین و ئەو شتە بە یارمەتیی زانست روون ناکرێتەوە. ئەو شتە لەوپەڕی زانستەوەیە و هیچ هۆکارێکی نییە و ناتوانێ هیچ ئاکامێکیشی هەبێ.

ئەگەر چاکە ئاکامی هۆکارێك بێت ئیتر چاکە نییە. ئەگەر ئاکامێك و پاداشتێکی بەدواوە بێت و لەبەر پاداشەکەی ئەنجام بدرێ، دیسان چاکە نییە. کەوابێ چاکە لە جەغزی هۆکار و بەرهۆ بەدەرە.

ئەوەش ڕاست ئەو شتەیە کە من دەیزانم و هەمووانیش دەیزانن.

منیش لە دووی پەرجۆ دەگەڕام و بەداخەوەم کە پەرجۆیەك نەهاتە یارمەتیم کە قانعم بکات. ئەگەرچی هەر ئەو پەرجۆیە، تەنیا پەرجویەك کە دەلوێ و هەمیشە لەبەر چاومە و لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی داوم و من پێشتر نەمدەدی. چ پەرجۆیەك لەوە باڵاترە؟»

لەڤین بە ڕێگا خۆڵەپۆتەکەدا دەڕۆیشت و نە هەستی بە گەرما دەکرد و نە شەکەتی و دەیدی کە لە دەست ئەو ئازارە درێژخایەنە ڕزگاری بووە. بەخۆی دەگوت «یانی بەڕاستی پەرسڤی هەموو گرفتەکانم دۆزیوەتەوە؟ یانی ئێستا هەموو ئازارەکانم کۆتاییيان پێهاتووە؟» ئەو هەستە هێندە نەشەبزوێن بوو کە باوەڕی پێنەدەکرد. لەبەر هەیەجان دڵی بە پڕتاو لێیدەدا و کەوتبووە هەناسەبڕکێ و نەیتوانی درێژە بە ڕۆیشتنەکەی بدات، لە ڕێگاکە کلا بوو و چووە نێو مێشەکەوە و لە ژێر سێبەری ئەسپیندارەکان و لەسەر گژوگیای بژوێن دانیشت. کڵاوەکەی لە سەرە ئارەقە کردووەکەی داگرت و هەنیشکی چەقاند و سەری کردە سەر لەپی دەستی و لەسەر گیاوگژی گەڵاپان و تەڕ و پاراوی لێڕەوارەکە خۆی لە گەزدا.

چاوی لە گیاوگژی دەستلێنەدراوی بەردەمی بڕی، لە جووڵانەوەی بوونەوەرێکی سەوزی چکۆڵە ورد بۆوە کە بە ساقەتەی هەرێزێکدا وەسەر دەکەوت و گەڵایەکی تر ڕێگای لێگرتبوو و لە دڵی خۆیدا گوتی«دەبێ ئارام ببمەوە و بیر بکەمەوە.» کۆسپی سەر ڕێگای مێرووەکەی لابرد تاکوو مێرووەکە بتوانێ درێژە بە وەسەرکەوتنی خۆی بدات، لقە گیایەکی دیکەی

---

٩٩- زاراوەیەکی ئینجیلە.

نووشتاندەوە تاكوو مێرووەكە بچێتە سەری، پاشان بە خۆی گوت «لە سەرەتاوە بزانم بۆچی ئەوەندە دڵخۆش بووم؟ چ شتێكی تازەم دۆزیوەتەوە؟»

سەرەتا دەمگوت لە جەستەی مندا و لەم گیایەدا و لەم مێرووە گچكەیەدا كە (ئاخ، نەیدەویست پێبنێتە سەر ئەو لقە گیایە كە من خستمە بەرپێی، باڵی كردەوە و فڕی و رۆیشت.) بەپێی یاسای فیزیك و كیمیا و فیزیۆلۆژی، ماك لە حاڵی جیابوونەوە و تێكەڵبوون و گۆڕاندایە. هەموو ئێمەش، یانی مرۆڤ و ئاژەڵ و ئەم ئەسپیندارە و هەور و تەمومژ هەموو لە حاڵی گۆڕاندایین. بەڵام گۆڕان لە چییەوە بۆ چی؟ گۆڕانی بێپایان و خەبات بۆ ژیان... دەتگوت لە گۆڕەپانی بێسنووری خەبات و بوارەكەی بەرگومانە! منیش پێمسەیر بوو كە سەرەڕای هەوڵی زۆر لەم رێگایەدا نەمتوانی دەستم بە مانای ژیان و مانای هانە و هەوڵەكانم رابگات، ئەگەرچی مانای هانەكانم لە وجوودمدا هێندە رووناكە كە بە بۆنەی ئەوەوە زیندووم و كاتێك ئەو وەرزێڕە پێیگوتم كە دەبێ بۆ خودا و بۆ رۆحی خۆمان بژیین تووشی سەرسووڕمان بووم و خۆشحاڵیش بووم.

من هیچ شتێكی نوێم نەدۆزیوەتەوە. تەنیا لە شتێك گەیشتم كە دەمزانی، لە وزەیەك گەیشتم كە نەك هەر لە رابردوودا بنۆسی ژیانم بوو بەڵكوو ئەمڕۆش ژیانم پێدەبەخشێ. من خۆم لە چنگ فێڵ و فریو ئازادكرد و خودای خۆم ناسی.»

پاشان بە بیر و فكرەكانی ئەم دوو ساڵەی رابرادووی و هەروەها دیتنی برا خۆشەویستەكەی تووشی ئەو دەردە بێدەرمانە ببوو و لەوكاتەوە بیری مەرگ بە روونی و وەك شتێكی ئاشكرا لە زەینییدا سەری هەڵدابوو، هەموو ئەوانەی هێنایەوە بەرچاوی خۆی و پێیاندا هاتەوە.

ئەو كاتە، چونكە یەكەم جار بە روونی بۆی دەركەوت كە مرۆڤەكان و خۆشی جگە لە ئازار و تاڵی و مەرگ، دوای ئەویش فەوتانێكی هەتاهەتایی هیچی تریان لە پێش نییە. بۆیە بەو ئاكامە گەیشتبوو كە ژیان بەو شێوەیە ناگونجێ و تەنیا دوو رێگای لەبەرە: یان دەبێ ژیانی خۆی جۆرێك روون بكاتەوە كە چزەبزەی شەیتانی ئیبلیسی پێوە نەبێ، یان خۆكوژی بكات.

بەڵام ئەو نە ئەم كارەیانی كرد نە ئەویان. بەڵكوو درێژەی بە ژیان و بیركردنەوە و هەستپێكردندا و تەنانەت راست لەو سەروبەندەدا زەماوەندی كرد و گەلێكی چێژ لەو ژیانە هاوبەشە وەرگرت و هەتا ئەو كاتەی كە بیری لە مانای ژیانی خۆی نەدەكردەوە زۆر بەختەوەریش بوو.

مانای ئەو دۆخەش چبوو؟ ئەمە بوو كە رێگای ژیانی دروست و حیسابی بوو بەڵام شێوەی بیركردنەوەی دروست نەبوو.

ئەو (بێ ئەوەی خۆی ئاگاداربێ) لەگەڵ هەقیقەتگەلێکی پاك و ڕۆحانی دەژیا کە لەگەڵ شیری دایکی ئاوێتەی گیانی بووبوو بەڵام بیرکردنەوەکەی نەك خۆی لە قەرەی ئەو هەقیقەتانە نەدەدا و قەبووڵی نەبوو بەڵکوو کاتی بیرکردنەوە هەوڵی دەدا خۆ لەو هەقیقەتانە ببوێرێ.

ئێستا بۆی روون بووبۆوە کە تەنیا بە یارمەتیی ئەو بیروباوەڕانە دەتوانێ بژی کە بنەمای پەروەردەکردنەکەی بووە.

«ئەگەر ئەم باوەڕانە بەسەر دڵمدا زاڵ نەبووایەن و نەمزانیبایە دەبێ بۆ خودا بژیم یان بۆ خۆم، مرۆڤێکی چۆن دەبووم و چۆن دەژیام؟ درۆم دەکرد و ماڵی خەڵکم دەخوارد و دەستمدەکرد بە خەڵککوشتن. هیچ کام لەو شتانەی کە سەرچاوەی بەختەوەرین بۆم، هیچیانم نەدەبوو.» سەرەڕای هەوڵ و خەباتێکی زۆر نەیتوانی بوونەوەرێکی دڕندەخوو بێنێتە بەرچاوی کە خۆی دەبوو، ئەگەر باوەڕی بەو شتە نەبوایە کە بۆی دەژیا.

«من بە دوای وەڵامێکدا دەگەڕام بۆ پرسیارەکەم و ئەندێشە نەیدەتوانی ئەو پەرسڤەم بداتەوە، چونکە پرسیارەکەی من بە پێوەری ئەندێشە پێوانە ناکرێت. وەڵامی پرسیارەکەم ژیان دایەوە و ئەم وەڵامەش لێککردنەوەی چاکە و خراپە بوو، ئەم تواناییی لێکجیا کردنەوەیەش خۆم بە دەستم نەهێناوە، بەڵکوو لەگەڵ هەموو شتەکانی دیکە پێمدراوە. ئەو تواناییەی من وەدەستم نەخستبوو، پێمدرابوو چونکە من نەمدەتوانی لە شوێنێك وەدەستی بهێنم.

من دەتوانم ئەو توانایییە لەکوێ وەدەست بخەم؟ یانی لە ڕێگای بەڵگەهێنانەوە و ئاوەزەوە بەو ئاکامە دەگەیشتم کە دەبێ مرۆڤم خۆشبوێ و نەیخنکێنم؟ خۆشویستنی مرۆڤم لە منداڵییەوە پێ فێر کراوە و بە خۆشحاڵییەوە قەبووڵم کردووە و لەگەڵی ڕاهاتووم، چونکە لەگەڵ ئەو شتەی لە ڕۆحمدا هەبوو یەکیدەگرتەوە. بەڵام چۆن بوو کە من لەوە گەیشتم؟ هەڵبەت لە ڕێگای ئەقڵەوە نەبوو. ئەقڵ لە خەباتێکدا ڕێبەرە کە بۆ مان و ژیان کەڵکی هەبێ. ئاوەز گەورە یاساکە کە حوکم دەکات هەرکەسێك بووە کۆسپی سەرڕێگای مەیل و ئارەزووەکانم لەنێوی بەرم. ئەمە ئاکامێکە کە لە ڕێگای ئەقڵەوە مرۆڤ دەتوانێ پێی بگات. ڕێگای بەڵگەهێنانەوە ناگاتە مرۆڤدۆستی چونکە مرۆڤدۆستی کارێکی ئاوەزمەندانە نییە.»

تلێکیدا و لەسەر زگ خەوت و هەوڵیدا لقە گیایەکی نەرم بێ ئەوەی بیشکێنێ گرێی بدات، بە خۆی گوت «بەڵێ، بایی بوون!»

نەك هەر بایيبوونی ئاوەز، بەڵكوو نەزانیی ئاوەز! لەوەش گرینگتر فیڵەبازی، بەتایبەت فیڵەبازیی ئاوەز.» دیسان دووپاتیشی کردەوە «بەتایبەت مەکری ئاوزە!»

## سێزدە

لەڤین ئەو ماجەرایەی دالی و منداڵەکانی وەبیرهاتەوە کە چەند رۆژ لەمەوبەر رووی دابوو. منداڵەکانی بێسەرپەرشت مابوونەوە و بۆ رابواردن توودرکیان لەسەر گڕی مۆم برژاندبوو و شیریان بە لووزەو وەك ئەوەی لە بەلۆعە داڕژێ، کردبووە دەمی یەکترەوە. دایکیان لە کاتی ئەو یارییەدا بە سەریاندا چووبوو و بۆ ئامۆژگاریکردن لە هەنتەشی لەڤیندا بۆی روونکردبوونەوە کە ئەوەی ئەوان بەو یارییە خەساری دەکەن دەسترەنجی گەورەکانە و گەورەکان لەبەر خاتری ئەوان ئەو هەموو زەحمەتە دەکێشن و ئەگەر لە کاتی ئەو یارییەدا پەرداخەکە بشکێنن ئیتر هیچیان نابێ چایی پێبخۆنەوە و ئەگەر شیرەکە برێژن هیچیان بۆ خواردن دەستناکەوێ و لە برسانا دەمرن.

باوەڕ نەکردنی خەمناکانەی منداڵەکان کاتی گوێگرتن لە ئامۆژگارییەکانی دایکیان لەڤینی تووشی سەرسووڕمان کردبوو. خەمی ئەوان تەنیا بۆ ئەوە بوو کە ئەو یارییە خۆشەیان لێتێك چووبوو و ئامۆژگارییەکانی دایکیان وەك با بەلای گوێیاندا تێپەڕیبوو و باوەڕیان بە قسەکانی نەکردبوو. نەشیانتوانیبوو باوەڕ بکەن چونکە نەیاندەتوانی زۆر و زەوەندیی ئەو نێعمەتانە بهێننە بەرچاوی خۆیان کە کەڵکی لێ وەردەگرن و لە ئاکامدا نەیاندەتوانی لەوە تێبگەن کە ئەوەی بە فیڕۆی دەدەن راست ئەو شتەیە کە بژیوی ژیانیانە.

ئەوان لە دڵی خۆیاندا دەیانگوت «ئەم قسانە بۆ گوتن نابێ. هیچ شتێکی سەرنجڕاکێش و گرینگ لەو قسانەدا نییە. ئەم شتانە هەمیشە بووە و هەمیشەش هەر دەبێ و قەتیش گۆڕانی بەسەردا نایەت. ئێمە نابێ بیر لەو شتانە بکەینەوە. توودرك و شیر هەمیشە هەیە. ئێمە شتێکی تازەمان دەوێ و حەزی پێدەکەین کە خۆمان پەیدامان کردبێ. تازە بە بیرماندا هاتبوو کە توودرك بخەینە نێو پەرداخەوە و لەسەر گڕی مۆم بیکولێنین یان شیر بە لووزەو بکەینە دەمی یەکترەوە. ئەم کارە پێکەنینییە و شتێکی تازەیە، هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ خواردنەوەی شیر بە پەرداخ نییە.»

لەڤین درێژەی بە بیرکردنەوەی خۆیدا «یانی ئێمە خۆمان، یان هەر خۆم، کاتێك بە یارمەتیی ئاوەز بە دوای مانای وەزەی سروشت یان واتای ژیاندا دەگەڕێین، هەر ئەو کارە ناکەین؟»

یانی بیرۆکە فەلسەفییەکان هەر ئەو کارە ناکەن، کە دەیانهەوێ لە ڕێگای بەڵگەهێنانەوەوە، کە بۆ مرۆڤ شتێکی نابەدڵە و زاتی نییە، ئەو بۆ ڕێگایەك ڕێنوێنی بکەن کە خۆی لە پێشدا دەیزانی و ئەوەندەش بە جوانی دەیزانی کە بەبێ ئەو ژیانی مەحاڵە؟ یانی لە بەستێنی بیرۆکەی هەموو فەیلەسووفێکدا بە روونی دیار نییە کە ئەو لە پێشدا و هەر بەو دڵنیاییەی فیۆدۆری گوندنشینەوە و نەك روونتر لە ئەو لە مانای سەرەکیی ژیان ئاگادارە و تەنیا لە ڕووی گومان و دڕدۆنگیی بەڵگەهێنانەوەوە دەیهەوێ بەو ئاکامە بگات کە هەموو دەیزانن؟

باشە، وایدانێن کە منداڵەکان بە تەنیا دەمانەوە و ناچاربوون پەرداخێك کە دەیانهەوێ خۆیان دروستی بکەن و ئەو شیرەی دەیخۆنەوە خۆیان بەدەستی بێنن، یانی ئەو کاتە هەروا خەریکی ڕابواردن و هاروهاجی دەبوون؟ نا، لە برسانا دەمردن. ئێستا وایدانێن ئێمە بە خەیاڵ و ئەندێشەکانمان تواناییی تێگەیشتنی خودای تاقانە و ئەفرێنەرمان نەبێ و لە چاکە بێخەبەر بین و تواناییی ئەوەمان نەبێ ئاکاری خراپ روون بکەینەوە. باشە، ئێستا بێین و بەبێ ئەم بۆچوونانە شتێك دروست بکەین، دیارە جگە لە خراپکردن هیچ کارێکی ترمان لەدەست نایە، چونکە رۆحمان تێرە، راست وەکوو منداڵەکان.

ئەم شادییەی کە ئاکامی ئەو دڵنیاییەیە و لە من و ئەو کابرا وەرزێڕەدا هاوبەشە و تەنیا شتێکە کە بۆتە هۆی ئۆخژنی رۆحیم، لە کوێوە هاتووە؟

من وەکوو مەسیحییەك پەروەردە کراوم و لە شوێنێك گەشەم کردووە کە ئیمان هەبووە و تەواوی ژیانم بە لەخۆبردوویی و بەخشندەییەکی رۆحی و مەسیحانە پاراو کردووە و ئەگەرچی ئەو بەخشین و لەخۆبردووییانە هەموو گیانی داگرتووم و لەگەڵیان ژیاوم، بەڵام چونکە ئەوەی پێیانداوم تێینەگەیشتووم، وەکوو ئەو منداڵانە خەسارم کردووە یان هەوڵمداوە بەفیڕۆی بدەم. بەڵام کە تووشی تەنگانە دەبین، وەك منداڵ کە کاتی سەرما و برسیەتی پەنا بۆ دایکیان دەبەن، ئێمەش پەنا بۆ «ئەو» دەبەین. دایك بە بۆنەی هاروهاجییەوە منداڵەکانی سەرکۆنە دەکات، بەڵام من لەبەر تێری جووتە دەهاوم، بەقەد ئەو منداڵانە هەست ناکەم کە بە هۆی هاروهاجیی منداڵانەمەوە شیاوی سەرکونە و سزادرانم.

بەڵێ، ئەوەی دەیزانم ئاکامی ئەقڵ و بیرکردنەوە نییە، بەڵکوو پێمدراوە و بۆم ئاشکرا بووە. ئەوەی دەیزانم لە ڕێگای دڵەوە فێر کراوم، لە ڕێگای ئیمانیشەوە گەورەترین شت ئەوەیە کە کلیسا فێرمان دەکات.

لەڤین لەبەرخۆیەوە دووپاتی کردەوە «کلیسا؟... کلیسا!» تلێکیدا سەر لاتەنیشتەکەی تری و هەنیشکی لە ژێر سەریدا کردە کۆڵەکە و چاوی لە دوور بڕی، چاوی بە مێگەلێك کەوت کە لەولای چۆمەکەوە بەرەو ڕۆخەکە دەهاتن.

بە مەبەستی تاقیکردنەوەی خۆی بیری لە هەموو ئەو شتانە دەکردەوە کە وێدەچوو شادییەکانی ئێستای لێتێك بدات و بەخۆی گوت «بەڵام دەتوانم بڕوام بە هەموو فێرکارییەکانی کەنیسە هەبێ؟» بە ئانقەست ئەو کۆمەڵە فێرکارییە نەگۆڕەی کەنیسەی وەبیر خۆی هێنایەوە کە هەمیشە و لە هەوموو شتێك زیاتر پێیسەیر بوو و تووشی بیرەبیرەی دەکرد. «خولقان؟ چۆن دەتوانم بوون بۆ خۆم روون بکەمەوە؟ هەر بەو خولقانە؟ بە هیچ. ئەی شەیتان و تاوان دەبن بەچی؟ خراپە چۆن دەتوانین روون بکەینەوە؟ ئەی رزگاریدەر کە هەموو تاوانەکانی ئێمەی بە خوێنی خۆی کڕی؟...

بەڵام من هیچ نازانم، هیچ، ناتوانم بزانم، مەگین هەر ئەو شتانەی کە بە من گوتراوە، هەروەك چۆن بە خەڵکیش گوتراوە.»

دیتی کە لەو باوەڕە، نەگۆڕانەی کلیسا تەنانەت ناکرێ یەکێکیان رەتکرێتەوە، تاکوو بە رەتکردنەوەی بتوانێ باوەڕی سەرەکی، یانی ئیمان بە خودا و چاکە، کە تاقە پێغەمبەرایەتیی مرۆڤە، زایەی بکات.

هەرکام لە بیرە نەگۆڕ و چەقبەستووەکانی کلیسا دەکرا داگری بیروبڕوایەك بێ نەك لە خزمەت پێویستییماڵیدا، بەڵکوو لە ڕێگای خزمەت بە راستیدا هەنگاو هەڵگرێ و هەرکامیشیان نەك تێکدەری ئەو بیروبڕوایە نەبوون بەڵکوو بۆ وەدیهاتنی گەورەترین پەرجۆکان کە بەردەوام لە دنیادا روو دەدەن پێویست بوو. ئەم پەرجۆیەش ئەمەبوو کە هەرکام لە مرۆڤەکان لەگەڵ ملوێنان مرۆڤی زۆر جۆراوجۆر هەر لە حەکیمەوە بگرە هەتا دەلووکار و لە مندالەوە هەتا پیر، هەروەها لە رەعیەتەوە هەتا دەرەبەگ و لە سواڵکەرەوە هەتا تیزار و لۆوڤ و کیتی، هەر هەموویان دەتوانن بە دڵنیایی تەواوەوە لە شتێکیی تاقانە تێبگەن و ژیانێکی پاك و رۆحانی بۆ خۆیان دروست بکەن کە تەنیا شتێکە بە کەڵکی ژیان دێت و تەنیا شتێکیشە کە ئێمە ڕێزی بۆ دادەنێین.

ئێستا لەسەر پشت خەوتبوو و چاوی لە ئاسمانی بەرز و ساماڵ و بێسنوور بڕیبوو. بەخۆی گوت «مەگین من نازانم ئەوەی لەبەر چاومە پانتایەکی بێپایانە و گومبەزێکی گرۆڤەر نییە؟ بەڵام

هەرچەندی گوشار بۆ چاوم دەهێنم و چاوم زیت دەکەمەوە ناتوانم بیهێنمە بەرچاوم کە تاقێکی گرۆڤەر و سنووردار نییە و لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانم پانتای ئاسمان بێسنووره ناهەقم نییە کە ئاسمان وەکوو گومبەزێکی ئەستوور و کەهوو ببینم و شکم لە جواندیتنی چاوی خۆم نەبێ. ئەم بۆچوونەم راستترە. هەتا ئەو کاتەی هەوڵ دەدەم ئەوپەڕی گومبەزە سنووردارەکە بهێنمە بەرچاوی خۆم.»

لەڤین دەستی لە بیرکردنەوە هەڵگرتبوو و دەتگوت گوێی بۆ دەنگێکی رازاوی راگرتووە کە دڵتەنگانە و بەڵام بە شادییەوە سەبارەت بە شتێك دەدوێن.

نەیدەوێرا بڕوا بە بەختەوەریی خۆی بکات، بە خۆی دەگوت «یانی بەڕاستی ئەمە ئیمانە؟ خوداگیان، زۆر زۆرت سپاس دەکەم!» ئەوەی دەگوت و ئەو ئۆناقەی کە گەرووی ڕێکدەگوشی قووتی دایەوە و فرمێسکی لە چاودا قەتیسماوی بە هەردوو دەستی سڕی.

# چاردە

لەڤین دەیڕوانی و مێگەلەکەی لەبەرچاوی خۆی دەدی. پاشان هێلینگەکەی خۆی دی کە رەشەی تێکرابوو. (ناوی ئەسپەکەی بوو). هێلینگەوانەکە کاتێك گەیشتە لای مێگەلەکە شتێکی بە شوانە گوت. پاشان لە نزیکی خۆی تەقوکوتی تایە و پڕموهۆڕی ئەسپێکی بیست کە دیاربوو زگی تێرە. بەڵام هێندە سەرقاڵی فیکر و خەیاڵ بوو کە تەنانەت لە بیری ئەوەدا نەبوو هێلنگەوانەکەی بۆچی هاتووە بۆ لای.

کاتێك ئەو خەیاڵەش هەڵیگرت هێلینگەوانەکە بە تەواوی لێی نزیکبۆوە و بە دەنگی بەرز گوتی: خاتوون منی نارد. براکەت لەگەڵ پیاوێکی تر تەشریفیان هێناوە.

لەڤین وەك ئەوەی لە خەو هەستابێ ماوەیەك نەیدەتوانی بێتەوە سەرخۆ. چاوی لە ئەسپەکە دەکرد کە برسیەتیی نەچێشتبوو و بەینی رانی و ملی ئەو شوێنەی کەژووی خامووتەکە دەیگرت گرێژی هەڵدابوو، هەروەها چاوی لە ئیڤانی خزمەتکاری کرد کە لە پەنایدا دانیشتبوو و وەبیری هاتەوە کە چاوەڕوانی هاتنی براکەی بووە و بە خۆی گوت رەنگە بۆ ئەو وەدرەنگکەوتنە کیتی نیگەران بووبێ و ناردوویە بە دوایدا و هەوڵی دا بە شك بزانێ ئەو میوانەی براکەی لەگەڵ خۆی هێناویەتی کێیە و براکەی و ژنەکەی و ئەو میوانە غەوارەیە ئێستا هەموویان بەلایەوە جۆرێکی تر بوون و پێیوابوو ئێستا پێوەندیی لەگەڵ هەموو کەس بە شێوەیەکی تر دەبێ.

له دڵی خۆیدا گوتی«من و براکەم ئیتر وەکوو رابردوو ناهاودڵ نابین. ئیتر پێکەوە ناکەوینە دەمەتەقێ و چەلەحانێ، لەگەڵ کیتی ئیتر قەد دەمەقالێ ناکەم. ئەو میوانە هەرکەسێك بێ بە نەرمی و مێهرەبانییەوە میوانداریی لێدەکەم. هەڵسوکەوتم لەگەڵ خزمەتکارەکان و ئەم ئیڤانە و لەگەڵ هەمووان دەگۆڕدرێ.»

هەوساری ئەسپەکەی توند بە دەستەوە گرتبوو کە ئەسپەکە بێتاقەت بووبوو و پڕموهۆڕی دەکرد و ملی بادەدا و دەیویست غار بدات و چاوی لە ئیڤان دەکرد کە لە پەنایدا دانیشتبوو و نەیدەزانی دەستە بێکارەکانی چییان پێبکات و بەردەوام کراسەکەی بە لەشی خۆیەوە دەگوشی کە با هەڵیماساندبوو. لەڤین لە بەهانەیەك دەگەڕا کە سەری قسەی لەگەڵ بکاتەوە. دەیویست پێیبڵێ کە پێویست ناکات ئەوەندە تەنگە و خامووتی ئەسپەکە توند بکات. بەڵام ئەو قسەیە بۆنی سەرکۆنەی لێدەهات و ئەو دەیویست بە مێهرەبانییەوە لەگەڵی بدوێ و دۆستانە قسەی لەگەڵ بکات. بەڵام هیچ قسەیەکی نەدۆزییەوە.

ئیڤان گوتی: بێزەحمەت بەلای راستیدا بای دەوە، لە پێشەوە کۆلکەیەك لەسەر رێگاکەیە ـ و خۆی هەوسارەکەی بۆ لای راست کێشا.

لەڤین ئەو خۆتێهەڵقووتاندنەی ئیڤانی لە دڵ گران هات و گوتی: تکایە هەوسارەکە بە دەستی منەوەیە تۆ دەستی لێمەدە و کاریش فێری من مەکە ـ راست وەك رابردوو رقی لە خۆتێوەردانی عارەبانەچییەکەی هەستا و خەم دایگرت، بۆی دەرکەوت گریمانەی ئاڵوگۆڕە رۆحییەکەی کە پێیوابوو لەرێوە دەبێتە هۆی گۆڕانی ئاکاری لە کاتی بەرەوڕووبوون لەگەڵ راستییەکاندا، وانییە و بە هەڵە چووە.

هێشتا نەگەیشتبوونە چوارسەد مەتریی ماڵێ چاوی بە گریشا و تانیا کەوت کە بە هەڵاتن دێن بۆ لای.

لەگەڵ ئەوەی خەریکبوون سواری هێلینگەکە بن گوتیان: خاڵە کۆستیا، دایەگیان و باوەگەورە و سرگی ئیڤانڤیچ و پیاوێکی تر خەریکن بۆ ئێرە دێن.

ـ پیاوەکەی تر کێیە؟

تانیا کە سواری هێلینگەکە بوو گوتی: پیاو لێی دەترسێ. لەپەستا دەستی ئاوا و ئاوا لێدەکات ـ لاسایی کاتاڤاسۆڤی کردەوە.

لەڤین کە بە دیتنی لاساییەکانی تانیا کەسێکی وەبیرهاتبۆوە بە پێکەنینەوە پرسیی: دەی، پیرە یان جحێڵ؟

له دڵی خۆشیدا گوتی «خۆزگه مرۆڤێکی نابار نەبێت.»

که له پێچی ڕێگاکه تێپەڕین چاوی بەو کەسانە کەوت که بەرەوپیری دەهاتن، کاتاڤاسۆڤی ناسییەوە که کڵاوێکی حەسیریی لەسەردا بوو و دەهاتە پێشێ و ڕاست ئەو جۆرەی که تانیا گوتبووی دەستی رادەوەشاند.

کاتاڤاسۆڤ زۆر هۆگری باسی فەلسەفی بوو بەڵام زانیارییەکانی لەو بوارەدا ئاکامی ئەو باسوخواسانە بوو که لەگەڵ سروشتزانەکان بووبووی و قەتیان کار بە فەلسەفە نەبوو و لەڤین لەم دواییانەدا ئەو کاتەی له مۆسکۆ نیشتەجێبوو زۆری باس و دەمەتەقێ لەگەڵ کردبوو.

یەکەم بیرەوەری که لەگەڵ ناسینەوەی ئەو له زەینیدا سەری هەڵدا یەکێك لەو باسانەی لەگەڵ ئەوبوو که کاتاڤاسۆڤ، هەڵبەت بە گومانی خۆی، سەرکەوتووانە هاتبووە دەرێ.

له دڵی خۆیدا گوتی «نا، بە هیچ شێوەیەك دەمەتەقێی لەگەڵ ناکەم و له رووی دڵسافییەوە بیر و فکری خۆمی لەگەڵ ناهێنمە گۆڕێ.»

لەڤین له هێلینگەکه دابەزی و لەگەڵ براکەی و کاتاڤاسۆڤ سڵاو و چاکوخۆشیی کرد و حاڵی ژنەکەی لەوان پرسی.

دالی گوتی: میتیای بردووە بۆ کالك (ناوی باغێکی نزیك ماڵەکەیان بوو.) دەیویست لانکەکەی لەنێو باخەکە دانێ. ماڵێ زۆر گەرمە.

ئەم هەواڵە بۆ لەڤین، که هەمیشە پێیدەگوت منداڵەکە نەبات بۆ نێو دارستان و جێگای مەترسییە، زۆر ناخۆش بوو.

پرێنسی گەورە گوتی: منداڵەکەی بە باوەشەوە گرتووە و لەملا بۆ ئەولا دەیگێڕێ. من پێشنیارم پێکرد بیبات بۆ ئاڤسارك.

دالی گوتی: دەیویست بێت بۆ لای پلوورەکان. پێیوابوو تۆ لەوێی. ئێمەش دەمانویست بێین بۆ ئەوێ.

سرگی ئیڤانڤیچ کەوتە دوای ئەوانی دیکەوە و شانبە شانی لەڤین دەڕۆیشت و پرسیاری لێکرد: دەی، ئێستا چیدەکەی؟

لەڤین وەڵامیدایەوە: کارێکی تایبەتم بەدەستەوە نییە، وەك هەمیشە سەرقاڵی کاروباری کشتوکاڵم. تۆچی؟ چەندە لێرە دەمێنیتەوە؟ ئێمە لەمێژە چاوەڕوانین.

ـ دە رۆژ، یان دوو حەوتوو لێرە دەبم. له مۆسکۆ کار زۆرە.

لەوکاتەدا چاویان بە یەکتر کەوت و لەڤین سەرەڕای ئەوەی هەمیشە و بەتایبەت ئێستا زۆری حەزدەکرد لەگەڵ براکەی هاودڵی بکات و بەتایبەت لەگەڵیدا پێوەندییەکی سادە دامەزرێنێ، هەستیکرد کە ناتوانێ چاو لە چاوی ببڕێ. سەری داخست و نەیتوانی هیچ بڵێ.

لەڤین بابەتێکی لە زەینیدا دێنا و دەبرد کە وێدەچوو بۆ سرگی ئیڤانڤیچ سەرنجڕاکێش بێ و وایلێبکات کە خۆ لە قەرەی باسی سێربستان و پانئیسلاویسم نەدات کە سەرەڕای باسی ئیشی زۆر لە مۆسکۆ ئاماژەی بەوەش کردبوو، بۆیە باسی کتێبەکەی هێنایە گۆڕێ.

لێیپرسی: دەی، سەبارەت بە کتێبەکەت وتار و رەخنەیەك نووسراوە یان نا؟

سرگی ئیڤانڤیچ گوتی: هیچ کەس کاری پێینەبووە و ئاوڕیان لێنەداوەتەوە و خۆشم لە هەمووان کەمتر ـ بە نووکی چەترەکەی چەند گەواڵە هەوری لۆکەیی نیشاندا کە لە پشت لکوپۆپی سپیدارەکانەوە دیاربوون و گوتیشی: بڕوانە، داریا ئەلکساندرۆڤنا، ئەو هەورانە مزگێنیی بارانن.

هەر ئەو چەند وشەیەش بەس بوو تاکوو پێوەندیی نەك تۆسنانە بەڵکوو سارد کە لە رابردوودا لەنێوانیاندا بوو و لەڤین زۆری حەزدەکرد لەنێوانیاندا نەمێنێ، دیسان دامەزرێتەوە.

لەڤین لە کاتاڤاسۆڤ نزیکبۆوە و گوتی: چ کارێکی باشت کرد هاتی بۆ سەردانمان.

ـ لەمێژ بوو بڕیارم دابوو بێم. جارێ کاتمان زۆرە بۆ قسەکردن. با بزانین چۆن دەبێ سپەنسەرت خوێندەوە؟

لەڤین وەڵامیدایەوە: تەواوم نەکردووە. ئەگەرچی، ئێستا زۆر دەروەستی نیم.

ـ چۆن؟ پێمسەیرە. بۆچی؟

ـ من زۆر دڵنیام کە سپەنسەر و وێنەی ئەو ناتوانن کێشەکان چارەسەر بکەن.

بەڵام خوێنساردی و روخساری کراوەی کاتاڤاسۆڤ لە ناکاو زۆر سەیر هاتە بەرچاوی و هێندە بەداخەوە بوو بۆ سەفای دڵی خۆی کە کاتاڤاسۆڤ بەو ئاخافتنە لێڵی کردبوو، کە بڕیارەکەی خۆی وەبیرهاتەوە و کۆتاییی بە باسەکە هێنا و گوتی: هەڵبەت کات زۆرە، پاشان لەوبارەوە قسە دەکەین ـ رووی دەمی لە هاوڕێیانی بوو گوتی: ئەگەر دەتانهەوێ بچن بۆ هەنگستانەکە دەبێ لێرەوە لادەن، لەو توولە رێیەوە.

کە بەو توولەڕێیەدا رۆیشتن و گەیشتنە جارێکی بەربڵاو کە گیاوگژەکەی نەدووردرابۆوە و لایەکی بە گوڵاڵەی گەش و چڕوپڕی شیروشەپاڵ داپۆشرابوو و بنجی سەوز و بەرزی هەڵاڵە لەو نێو جارە گوڵەدا دەدرەوشانەوە. میوانەکانی برد بۆ ژێر سێبەری فێنك و چڕی سپیدارەکان و

لەسەر کورسیی دارین و کۆلکەدار داینیشاندن کە بۆ ئەو کەسانە ئامادەکرابوون وا بۆ دیتن و سەردانی مێشەنگوێنەکانی دەهاتن و لێیان دەترسان، ڕۆیشت بۆ لای تەیمانی پلوورەکان تاکوو بۆ منداڵ و گەروەکان نان و خەیارشۆر و هەنگوینی تازە بێنێ.

لەگەڵ ئەوەی هەوڵێدەدا تا ئەو جێیەی دەتوانێ لەسەرەخۆ بێ و خۆ لە هەڵسوکەوتی توند بپارێزێ، گوێی بۆ ویزەویزی ئەو مێشەنگوینانە شل کرد کە هەتا دەچووە پێشێ زیاتر بە پەناگوێچکەیدا تێدەپەڕین، بە توولە ڕێی نێوان دارستانەکە و کۆخی پلوورەخانەکەدا تێپەڕی و گەیشتە بەردەرگای کۆخەکە و ویزەویزی هەنگێك پەیدابوو، کە لە ڕێشیدا گیری کردبوو بەڵام لەڤین بە ئارامی گرتی و ئازادی کرد. چووە نێو داڵانی فێنکی کۆخەکەوە و کڵاوە تۆڕەکەی خۆی لێکردەوە کە بە بزمارێکدا هەڵواسرابوو، لە سەری کرد و دەستیکرد بە گیرفانیدا و ڕۆیشت بۆ گۆڕەپانی پلوورەکان کە لەوێ کەندووی قەدیمی لەسەر عەرزی پڕ لە گیاوگژ بە ڕێکوپێکی ریز کرابوون و هەرکامەیان بە کەندرێکی کندێلە بەسترابوو و سنگێکیان بۆ داکوترابوو و بەسترابوونەوە و هەرکام ژومارەیەکیان لەسەر بوو و لەڤین هەمووییانی بە باشی دەناسی و دەوراندەوری تەیمانەکە کەندووی تازەی لێڕیز کرابوو کە هەر ئەو ساڵە داندرابوون و پوورەی تازەیان تێکرابوو. لەبەر زارکی کەندووەکاندا مێشەنگوین و هەنگەنێرەکان بە حەواوە دەسووڕانەوە یان لە شوێنێك دەنیشتنەوە تێکدەهاڵان، بەجۆرێك کە پیاو بە دیتنیان چاوی لە ڕەشەوە دەهات و مێشەنگوینە کاریگەرەکان بە نێوانیاندا دەهاتنە دەرێ و بەرەو لێڕەوار و دارستانی زیزفۆن دەفڕین کە پڕبوو لە گوڵ و چرۆ و شیلە و هەڵاڵەیان کۆدەکردەوە و بەرەو لای کەندووەکان دەگەڕانەوە.

بەردەوام دەنگی جۆراوجۆری دەهاتە گوێ، هێندێ جار ویزەویزی هەنگی کاریگەر کە سەرقاڵی کاری خۆیان بوون و بە پڕتاو دەهاتن و دەڕویشتن و هێندێ جاریش ویزەی گڕی هەنگەنێرە بە دەماخەکانی دەبیست و بڕێ جاریش وڕەی توندی هەنگە ئێشکگرەکان کە ئاگایان لە ماڵ و خەزێنەی خۆیان بوو و لە هەمبەر دوژمندا بەرەڤانییان لێدەکرد و ئامادەبوون تاکوو چزووی ڕقیان لە جەستەی بێگانەی دەستدرێژکەر هەڵچەقێنن. لەولای کەندووەکانەوە پیرە پیاوێك خەریکی تاشینی شانەی دارین بوو و لەڤینی نەدی. لەڤین بێ ئەوەی بانگی لێبکات لەنێوەڕاستی کەندووەکان ڕاوەستا.

خۆشحاڵ بوو کە تەنیا کەوتووە و دەرفەتی هەیە کە ئەو تاساوییەی بە هۆی ڕاستییەکانەوە ئاوقای رۆحی بووبوو و هەر لەو ماوە کورتەدا تووشی خەم و دڵگرانیی کردبوو لە خۆی دوور بخاتەوە و وەخۆ بێتەوە.

وەبیری هاتەوە کە هەر لەو ماوە کورتەدا بە پێچەوانەی ویستی خۆی بە گژ ئیڤاندا چووبوو و سارد و سڕانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ براکەی کردبوو و سووکەسەرانەش قسەی لەگەڵ کاتاڤاسۆڤ کردبۆوە.

لە دڵی خۆیدا گوتی «یانی بەڕاستی تەمەنی ئەو سەفایە لە خولەکێك زیاتر نەبوو؟ یانی تێدەپەڕێت و هیچ ئاسەوارێکی نامێنیٚ؟»

بەڵام هەر ئەو کاتە، کە هاتەوە سەر حاڵی تاوێك لەمەوبەری خۆی دڵخۆشانە هەستی کرد کە گۆڕانکارییەکی سەیر و نوێی بەسەردا هاتووە. ڕاستی، تەنیا بە شێوەی کاتی سەفای ناخی تاریك و لێڵ داگیرابوو و ئێستا وەکوو پێشوو بە روونی و زوڵاڵی دەهاتە بەرچاوی.

ڕاست وەکوو ئەو مێشەنگوینانەی کە ئێستا بە دەوریدا دەفڕین و دەیانترساند و هۆش و بیریان دەشێواند و هێمانایەتیی جەستەیان تێکدابوو، کە ناچار دەبوو خۆی مات دەکرد و لە دڵەوە رایدەکرد لە دەستیان، هەر بەو شێوەیەش لەو کاتەوە کە سواری هێلینگەکە بوو خەم و دڵتەنگی گەمارۆیاندا و لە ئازادیی دەروونی بێبەشیان کرد، بەڵام ئەو حاڵە تەنیا تا ئەو کاتە درێژەی کێشا کە لەنێو مێشەنگوینەکاندا بوو. هەر ئەو جۆرەی کە لەگەڵ بوونی مێشەنگوینەکان وزەی جەستەییی لە جێی خۆی بوو وزەی رۆحیشی کە ئەو تازە لە بوونی ئاگاداربووبوو هەروا لە جێی خۆی بوو.

## فەرهەنگۆك

**ئاباژۆر:** کلاوەی چرا بۆ ئەوەی شۆقەکەی بۆ خوارەوە بێ (آباژور)

**ئارمووش:** هەورێشم. (ابریشم)

**ئاریشە:** کێشە، دەمرگە. (چالش)

**ئاژر:** رق، تووڕەیی، رك، قین. (خشم)

**ئاڤسارك:** سارداو. (سردابە)

**ئاڵفتە:** تووشیار، توشبوو. (مبتلا)

**ئاڵەتی:** تووڕە و تۆسن، کەسێك کە زوو رقی هەڵدەستێ. (آتشي)

**ئاوەزبنەما:** شتێك لەسەر بنەمای ئەقڵ دامەزرابێ. (خردبنیاد)

**ئەدیاڵ:** بەتانی، پەتوو. (پتو)

**ئەستێودان:** کۆڕەوڵە، (دخمە)

**ئیمان هەردەبوون:** لە دین دەرچوون، بریتی لە زۆر تووڕبوون. (کفری شدن)

**با لە قول کردن:** تاریفکردنی بەدرۆ بۆ فریودان، (هێندەی با لە قولی کرد هەتا لە رێ هەتلەی کرد.)

**بڕناخ:** کونە لووتی ئاژەڵ، کونە کەپۆ. (منخرین)

**بڕەدار:** بوێر، ئازا، نەترس (رشید)

**بڵاچە:** برووسکە، هەورەبرووسکە (آذرخش)

**بلەوەز:** لاسار، خیشەسەر، عیناد (سرسخت)

**بنەوەشی:** جیددی (جدی)

**بنۆس:** هۆ، سۆنگە، هاوا. (سبب)

**بوخچەدار:** ئەوکەسەی لە گەرماو و نەخۆشخانە و... بەرپرسی دیوی جلانە. (مسئول رختکن)

**بەترەف:** بەتلاو، بە فیڕۆچوو، خەسار. (ضایع)

**بەدەو:** جوان، دەلال، شۆخوشەنگ. (زیبا)

**بەرەڤانی:** بەرگری، خۆپاراستن لە مەترسی (دفاع)

**بەرهۆ:** شتێك کە دەبێتە دیاردە بۆ هۆکارێك (معلول)

**بەفرکوش:** شوێنێك کە بەفری زۆر لێدەمێنێتەوە و عەرزەکەی رەق و پتەو دەبێ.

**بۆرەکە:** بوودەڵە، بۆرەپیاو (مردك)

**بۆغمە:** ئۆناق. (عقده)

**بیفتەك:** ئیستەیك، گۆشتی بە پانی سوورەوە کراو (استیك)

**پاچەکۆڵە:** چەرمەسەری، کۆڵەمەرگی (مشقت)

**پاراوان:** پەردوو، پەردەی کێشراو بۆ جیاکردنەوەی هۆدە. (پاراوان)

**پاروو:** یەکەی ژماردنی سابوون، پاروویەك سابوون. (واحد شمارش صابون)

**پارێزەك:** چوارچێوەیەك بۆ راگرتنی کەلوپەل و... (محفظه)

**پاڵوو:** سووچ. (زاویه)

**پالێت:** تەختەی رەنگی وێنەکێشان. (شستی)

**پڕاوی:** لەبەریەك هەڵوەشان و پووکانەوە. (تلاشی)

**پەرپەڕۆچکە:** تەشق، حەوێق، بەرزایی ئاسمان (اوج)

**پەرجۆ:** پەرجوو، مۆجیزە. (معجزه)

**پەرستگای سێ پیرۆزان:** پەرستگەی خودا و مەسیح و جوبرائیل (صومعه تثلیث)

**پەرگەنە:** پرژو بڵاو، پژکو بڵاو. (پراکنده)

**پەڵك:** دارێکی بەرزە لە تیرەی چنار.

**پۆپۆلی:** لاوی لووسکە و ئاکار کچانە و ژنانیلە. (سوسول)

**پیرەکوڕە:** گەنمی کەمباڵا کە زەوییەکەی خیزەڵانە و زوو گوڵ دەکات.

**پیزە:** تۆل، منداڵ لەنێو زگی ژندا (جنین)

**تارۆز:** چیرۆك و شێعری تیزانە، حەنەك. (طنز)

**تانۆك:** تەیمان، پەرژین. (پرچین)

**تخووب:** سنوور، کەوشەن. (مرز)

**تلماسانەوە:** دووری کردن لە یەکتری. (اجتناب)

**تولتۆلە:** نانێکە وەك کەلانە بە جێی پیواز و سیر رۆن دەکەنە توێیەکەیەوە و بە تەندوورییەوە دەدەن (پیراشکی)

**تەپەدۆرە:** فیبری سپی بۆ راگرتنی سەهۆڵ و ساردەمەنی (یونیلیت)

**تەرگە:** کەرِکە. (شنل)

**تەلاس:** زێدەرِەوی، سەرچڵی. (افراط)

**تەن:** رادەی ئەو ماکەی لە شتێکدا کۆدەبێتەوە. (جرم)

**تەنی ئاسمان:** ئەوەی بە ئاسمانەوە دیارە، وەك: مانگ و خۆر و ئەستێرەکان. (جرم آسماني)

**تەوسەبزە:** بزەی تەوساوی و مانادار. (پوزخند)

**جانکوش:** مجێوری کلیسا. (شماس)

**چزەبزە:** بزەی تاڵ و گاڵتەجارِی. (نیشخند)

**چەقەسرۆ:** زۆربڵێ، هەڵەوەرِ. چەنەوەر. (وراج، پرگو)

**چیرِ:** چرِوپرِ، پرِایی زۆری دار و گیا لە جێیەك (انبوە)

**حەنبەڵی:** عەبا، عابا. (عبا)

**خاپینۆك:** هەڵخەڵەتێنەر، فریودەر. (فریبکار)

**خایەم:** مجێور، خادەم. (خادم)

**خولۆك:** شتێك کە هەڵدەخولێ (چرخان)

**خەبابەت:** ئامادەبوون. (مهیا)

**خەرکاو:** خەریك، مژووڵ. (مشغول)

**خەسپاڵ:** لەکار کەوتە، زورهان، کەنەفت. (پریشانحال، ازکار افتادە)

**خەنیم:** رەقیب، حەریف. (حریف)

**خۆژیك:** جوان، شەنگ، شەپال، دەلال. (خوشگل، زیبا)

**خۆماك:** غەریزە (غریزە)

**داخۆیانی:** روونکردنەوە. (توضیح دادن)

**دانووستان:** کۆبوونەوە وتووێژکردن لەسەر بابەتێك. (مذاکرە)

**درژانگ:** شەکەتی، بێهێزی، بێحاڵی. (ضعف)

**درۆکامین:** درۆیین. (دروغین)

**دژواز:** دژایەتی، دژیەتی. (تضاد)

**دمبڵ:** بریتی لە لاڵ و زمانچەوت، کەسێك کە زۆر دەمورِاوێژی ناخۆشە و بەردەوام زمانی تەتەڵە دەکات.

**دووشاخە:** ملەخڕە، پێران. (خناق)

**دەژباو:** شتێك کە بە پێچەوانەی باوی ڕۆژ بێت. (نامتعارف)

**دەلووکار:** شێت، دین (دیوانە)

**دەمهەڵماڵین:** بەبێ شەرم و شکۆ قسەکردن و جنێودان.

**دیوناس:** ناسیاو، ئاشنا، ناسراو. (آشنا)

**ڕازان:** راکشان، تخێڵبوون، رەهێڵبوون. (درازکشیدن)

**ڕاژە:** کاریتە. (شاەتیر)

**ڕاژۆر:** یاسا و سیستەمێك کە پێڕەویی لێ دەکرێ (متبوع)

**ڕمۆسك:** مۆسك، ڕێمۆسك، گیایەکە لە تیرەی کەرەوز و کەلەم کاشوول لاسکەکەی دەخورێ.

**ڕووپامایی:** لە روو دامان. (رودربایستی)

**ڕووشهەڵبوون:** دەرهەڵبوون، تووڕە بوون و پەلاماردان.

**ڕەشایی:** قەرە، خۆشنشین، گوندنشینی بێمووچەومەزرا (خوشنشین)

**ڕەهیشتە:** خانەدان، نەجیبزادە. (اشراف)

**ڕێژەك:** پێکهاتە. (پیکرە)

**ڕێلاس:** چەنەوەر، دەمەوەر، رووهەڵماڵدراو و چەقاوەسوو (حراف)

**زگهانك:** زگزل، سکەڕۆ (شکمگندە)

**زەڤۆك:** ئەو بوونەوەرەی دەزێ. (زایندە)

**زەنتۆڵ:** زەبەلاح، تەژە. (لندهور)

**زۆرژی:** وشەیەکی فیزیکییە بەو کەسانە دەڵێن کە بە رەچەڵەك زۆر دەژین و درنگ پیر دەبن.

**زێسانگە:** شوێنی زایەمان. (زایشگا)

**ژیرڤانی:** وریایی و زیرەکیی دەروونی (بصیرت)

**سارۆکی:** هەمیشە سەرمابوو، کەسێ کە زوو سەرمای دەبێ (سرمایی)

**سرووت:** کلۆشی بەجێماو لە جاڕەگەنم و جاڕە جۆ، ساقەتەی گەنم و جۆ. (ساقەی گندم و جو)

**سوورەیاو:** کەوتوویی، (تیفوئید)

**سەرانشۆ:** وسڵدانی منداڵی مەسیحی بە ئاوی متفەرك. (غسل تعمید)

**سەربەشایەتی:** هەڤیازی. (امتیاز)

**سەرقۆق:** سەرتاس، سەرساف. (طاس)

**سەماخ:** بێنیاز لە خەڵك، بەوەج (دارای عزت نفس)

**سۆتە:** بێدین، تاوانبار (فاسق)

**سۆتەك:** دارێكی جەنگەڵییە. (سعد)

**سیچەنگرتن:** ئۆقرەگرتن، ئارام گرتن. (آرام گرفتن)

**شبرەو:** شمراو، چەرمی نەرم و بریقەدار بۆ كەوش و جانتا و... (چرم لطیف و براق)

**شەكاڵ:** شیڕۆخ، كالك، پاتاوە، پاپێچ، پێتاو (چارق، چارغ)

**شەوتێ:** تاویاوی شەوانە. چەقوچۆی شەوانە. (تب و لررز شبانه)

**شینیۆن:** پرچی دەستكرد كچان بە قردیلەوە لە سەری خۆیانی دەدەن. (شینون)

**شەنگەڕۆژ:** كۆلكەزێڕینە، پەلكەڕەنگینە (رنگین كمان)

**عەیبلۆ:** ناڕاست (نادرست)

**فهێت:** شەرم، حەیا. فەدی. (شرم)

**ڤژۆكەر:** دەرمانی رەوانی. (مسهل)

**قاڕوونە:** گازیر، مێرووی وردی جلك و خوریخۆر (بید)

**قازەماسی:** جۆرە ماسییەكە دەمی وەك دەنووكی قاز و مراوی وایە (اردكماهی)

**قەمارە:** كووپەی قەتار. (كوپه)

**كاپۆ:** هێلانە، هیلین. (آشیانه)

**كاشە:** خێشك، خێشكی سەر بەفر. (سورتمه)

**كامووس:** خەونی هاشە و پاشە، مۆتەكە (كابوس)

**كرێت:** دزێو، ناحەز، ناشیرین. (زشت)

**كلوومنجڕ:** كلا، چەفتوور، كەشوتووش. (اریب)

**كندێلە:** گیاكندر، كەنەف (كنف)

**كودان:** تەواوبوو (تكمیل)

**كەرپووچ:** خشتی سوور. (ئاجر)

**كەڕكە:** عەبا و باڵتەی چارۆكەشێوە (شنل)

**كەلبەدوون:** زەڕی چنكردنی دەوری ملیوانە و بەرۆكی عەبای خانەدانەكان. (گلابتون)

**كەهوو:** شینی مەیلە و خۆڵەمێشی. (كبود)

**کۆڤێتی**: دڕندەیی، نەفامییەکی شێتانە. (توحش)

**کۆماج**: مۆغاری، کوانووی دیواری (شومینە)

**کۆمبێژ**: گۆرانیوتنی بە کۆمەڵ. (ترانە دستەجمعی)

**کەڵتە**: چاك کردنەوە (تعمیر کردن)

**گازیر**: قاڕوونە (بید)

**گت گرتن**: سووکە وەستانێك لە قسەکردندا. (مکث کردن)

**گرانەتا**: گرانەتیٚ. (تیفوس)

**گڕتێئاڵاندن**: شەڕ پێفرۆشتن. قەڵسە لێگێڕان.

**گرۆڤەر**: گلیل، خڕو لووس. (استوانە)

**گژنیژە**: نووکی مەمکی ژن، ئەو جێیەی منداڵ دەیمژیٚ. (نوك پستان)

**گلیل**: گرۆڤەر. (استوانە)

**گلێرە**: کزن، گاڕس. دانەوێڵەیەکە ئاژەڵی پیٚ قەڵەو دەبیٚ. (کرسنە)

**گوربزە**: بەکەیف و بەدەماخ. (چاق و سرحال)

**گووگلێنە**: گووخلێنکە، گووخلێرکە (سرگینغلطان، جعل)

**گوێلینج**: کەمتەرخەم، بێموبالات، خەمسارد، سەرسارد. (بیاعتنا)

**گەڕانە**: ڕەوت و چۆنێتیی بڕینی مەودایەك (سیر)

**گەڕناڵ**: کەڵەزەنگ، گازەنگ، زەنگی گەورەی کەنیسە (ناقوس)

**گەللایی**: گوێنەبیستی، لاساری، (کلەشقی)

**گەمار**: چەپەڵ، پیس. (کثیف)

**گیرۆ**: نەخۆشییەك کە مەترسی گرتنەوەی هەیە. (واگیر)

**لامجوومی**: لاری، سەرپێچی (سرپیچی)

**لاوەچ**: دڕناڵ، کەنداو، دڕناو (خلیج)

**لە دەستودوو کەوتن**: هێز و تاقەت پێنەمان و نابووت بوون. داماوی و نەمانی توانای لەش و تەنانەت قسەکردنیش

**لۆسە**: مەڵغە، لێهاز، کوسکی، ماڵیلە. (اهرم)

**ماچڵەك**: شوێنی پێوەندیی ڕەیلەکانی هێڵاسن لە وێستگە. (مفاصل ریل)

**ماڵەپیتکێنیٚ**: خانووچکەی منداڵان.

**مرێس:** تەکووز، رێکوپێك (منظم)

**مزوور:** کاردار، بەکرێ گیراو، کرێکار. (مزدور)

**مژوولیایش:** وتاردان. (سخنرانی)

**منجڕ:** پێداگر و دەستهەڵنەگر. (سمج)

**مووژیك:** کرێکار و جووتیاری بێمووچە و مەزرا، رەشایی، رەعیەت. (موژیك)

**مەزاخ:** مەزێخ، خەرج. (هزینه)

**مەزێخ:** خەرج. (هزینه)

**مەمکبزووتن:** شیرتێگەڕان و بێ ئیختیار هاتنەخوارەوەی شیر بە مەمکی ژندا کاتێك لە وەختی شیرپێدانی منداڵەکەی لادەدا. (رگ کردن پستان)

**مهین:** رەختاوێز، ئەو تەختەی قتیکە و قولاپی پێوەیە و جلوبەرگی پێوە هەڵدەواسن

**مۆڤەت:** ئەوین، خۆشەویستی. (محبت)

**مینەق:** یەکێتی و هێزی بەرگری لە لایەن خەڵکەوە بۆ کاتی پێویست (بسیج مردمی)

**مێروو:** زیندەوەری بچووك و بێخوێن (حشره)

**ناچیزە:** هیچوپووچ، خوێڕی، (پست)

**نژوە:** دیکتە، ئیملا. (املاو، دیکته)

**نوانە:** خشتە. (نمودار)

**نووسیار:** میرزابنووس (منشی)

**نەبرە:** لەبز، راوێژ، جۆری ئاخافتن (لحن)

**نەپۆڕ:** قەبەو نالەبار، رەقوتەق و نارێك، ناتەکووز، زبر و ئەستوور، دژی ناسك (زمخت)

**نەترە:** ورە، زەندەق (روحیه)

**نەرێسات:** پێچەوانەی راشکاوی و رەپ و راست. (غیر صریح)

**نەگەویس:** شووم، نەخس (منفور)

**نیوداشت:** نەکۆن نە تازە. زیاتر بۆ لیباس دەگوترێ. (نیمدار)

**نەتەوی:** نەیار، دژ، دوژمن (دشمن)

**واژین:** ئینشا. (انشاو)

**واقوڕمان:** سەرسووڕمان، ماقمان. (تعجب کردن، متحیر شدن)

**وڕك:** بیانوو، پەڵپ، گوڕوو، گرنە (بهانه)

**وەزەن:** زیان، زەرەد، زەرەر (ضـرر)

**وەژارە:** خەیاڵ، (وهم)

**وەکهەفی:** هاوڕەنگی، هاوشکڵی. (تجانس)

**هانە:** ئەنگێزە، دنە. (انگیزە)

**هەپلەگون:** گەمژە، حەپۆل، گەوج، ناهیر. (ابلە)

**هەژەند:** سەسووڕهێنەر، (شگرف، عجیب)

**هەڤیازی:** سەربەشایەتی. (امتیاز)

**هەڵەمووت:** هەڵەت، هەڵدێر (پرتگاه)

**هەمەت:** لێڕوانین، سەیرکردن. (ملاحظە)

**هێڵەقوونێرە:** نێرو ئاموور، یەرەق و نێڵە. (خیش و یوغ)

**هێم:** بناغە، بنەما (اساس)

**یاندز:** گیایەك وەك تالوو وایە.

سپاس بۆ هاوڕێی خۆشەویست و دڵسۆزم کاك محەمەدئەمین شاسەنەم کە بۆ تایپ و ئامادەکردنی ئەم بەرهەمە زەحمەتێکی زۆری کێشا.

((وەرگێڕ))

## بەرهەمی بڵاوکراوەی وەرگێڕ:

١ـ تاپۆی وەرزێکی سەوز، شیعر، ١٩٩٧
٢ـ شەوەژانی ئەستێرەیەك، شیعر، ٢٠٠٠
٣ـ مەرگەخەون، شیعر، ٢٠٠٣
٤ـ دیسان لەو شەقامانەوە، کۆچیرۆکی بیژەن نەجدی، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٥
٥ـ تەپڵی ئاور، کۆچیرۆکی بیانی، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٥
٦ـ جێگەی بەتاڵی سلووچ، رۆمان، مەحموود دەوڵەتئابادی، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٦
٧ـ خۆر و لاولاو، کۆشیعری منداڵان، ٢٠٠٧
٨ـ برایانی کارامازۆف، رۆمانی داستایۆڤسکی، وەرگێڕان ٢٠٠٧
٩ـ یەککگرتن، چیرۆکی منداڵان، قودسی قازی نوور، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٧
١٠ـ خولیای نووسین، رەزا بەراهەنی، کۆمەڵەوتار، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٨
١١ـ فەرهەنگی رێژگە (ئەو وشانەی لە هەمبانەبۆرینەدا نین)، ٢٠٠٩
١٢ـ کەڵەشێری ورگن، گێڕانەوەی چیرۆکێکی فۆلکلۆر، ٢٠١٠
١٣ـ تازیەبارانی بەیەل، رۆمان، غوڵامحوسێن ساعیدی، وەرگێڕدراو، ٢٠١٠

**ئەم بەرهەمانەش ئامادەی چاپن:**

١ـ نارنجیفڕین، کۆچیرۆك

٢ـ دار و پەپوولە و ڕووبار، چیرۆکی منداڵان، فەریدە شەبانفەڕ، وەرگێڕدراو

٣ـ سترانی شەپۆلەکان، شیعری هاوچەرخی فارسی، وەرگێڕدراو